## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشغوڵی سەر ڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کوردە بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیەتی لەگشت کوت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێزتر بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تاتوانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیرو ڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیرو بۆچونەکانیان بین .

بادەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# پێشەکی وەرگێڕ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

درودو سڵاو بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرو یارانیو شوێنکەوتوانی.

خوێنەری سەنگین!

حەزدەکەم سەبارەت بەو کتێبە سێ خاڵت بخەمە بەرچاو:

خاڵی یەکەم: لەمەڕ هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەری لەوبارەوە دەڵێم: زۆربون ئەوانەی ئەسرینیان بۆ ژیان هەڵدەڕشتو، لە دورەوە هەناسەی ئازادیان هەڵدەمژتو، تامی بەختەوەریان هەڵدەچەژت، بەڵام کاتێ بە خواستو مەبەستیان گەیشتن دڵنیا بون ئەوەی ساڵانێکە بەدوایدا وێڵن، خەوو خۆراکیان لە پێناویدا لێ تاڵ بوە، ئێستاکە دەبینن تەنیا تراویلکەی بیابانەو، جیالەوەی تینوێتی ڕێگایان بشکێنێ شەنگ وتینیان لە بن دێنێ، دڕکو داڵی سەر ڕێگایان بەباخو گوڵشەن هاتە بەرچاو بەڵام کاتێ پێی گەیشتن جیالەوەی ماندوێتی ڕێگایان وەحەسێ، چیان پێ نەما ئەوە نەبێ چقڵو دڕکیان لەپێ چەقێ، زۆرێك لەوانەی ئەویندار یان بە پەخشانو هۆنراوە دەلاواندەوە، ئاخو داخیان بۆ هەڵدەکێشا، چەندجار دڵیان دێشا، شەوان شەونخونیان بۆ دەکرد، چونکە ئەو خۆشەویستیە شیاوی خۆشویستن نەبو، ڕێزی ئەو ڕەنجەی نەکرت.

لە زۆر ڕێگاو لە زۆر لاوە هەوڵیان داوە بەختەوەری وەدەست بێنن، ئەوکاتەش پەیان پێ نەبرد، ئەوسامنیش بۆ ئەو کتێبە سەرنجت ڕادەکێشم، بەڵکە بە ڕێگای بەختەوەریت ئاشنا بکات.

خاڵی دوەم: دەربارەی گرنگی ئەو کتێبە، گرینگیەکەی لەوەدایە هەرگیز خوێنەر بێزار ناکا، چونکە جێباسەکانی کورتو پوختن، وشەکانی هەڵقوڵاوی ناخو هەستن، چارەی دەردوئازارە، لەناو خەمو خەمینی دەرت دێنێو، بەرەو ئاسودەییو، بەختەوەری دەستت دەگرێ، باوەڕناکەم کەسیش لە ئێمە ڕۆژێ لە

ڕۆژان دڵی هەڵنەقرچابێ، بەڵام خوا دەردی داوەو دەرمانی داوە، بۆیە بە خۆمو بەتۆش دەڵێم: گەر دەتەوێ کۆتو زنجیری خەمباریت بپچڕێو، ئارەقەی شەکەتی ڕێگات بسڕێو، ماندوێتی چەند ساڵەت وەحەسێ، وەرە لە ژێر سایەو سێبەری ئەم کتێبە هەنسکێك بدە، لەو گوڵزارەدا چەپکێ گوڵاڵە بچنەو پڕ بە دڵ بۆنیان بکەو، بۆسۆی دڵی بڕژاوت بەبابکە، چونکە ئەو کتێبە شەماڵێکە بۆنو بەرامی گوڵو وەنەوشەو سەوزەگیای کوێستانانو گیابەندی قەدی کێوەکانت بەسەردا دەپرشێنێ، پەندو ئامۆژت لە دەمی ئامۆژیارانەوە بە دیاری بۆ دێنێو دڵی زامدارت پێ دەلاوێنێ، شەونمی سەر ڕوخساری گوڵە بەسەر هەستو دەرونەکاندا دەتکێ، فرمێسكو ئەسرینی شادییە درەختی هێوای پێ دەڕوێ، ڕێژنەو گەواڵەی بەهارە گەڵای ناسۆریو خەمی پێ دەڕوێ، دڵۆپەی قەتیس ماوی سەر ڕیشە گیای دوای بارانە لەبەر تیشکی هەتاو وەکو دەنکی مرواری دەدرەخشێ.

<u>خاڵی سێیەم</u>: سەبارەت بە وەرگێڕانی کتێبەکە بەلای منەوە کارێکی ئاسان نەبو، جا چۆن کەسێکی وەکو من دەتوانێ بەتەواوی مافی کتێبێکی ئاوابدا، کە لەسەر بەرگەکەی نوسراوە: لە هەمو کتێبێك زیاتر لە جیهاندا بڵاوبۆتەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ منیش قۆڵم لێ هەڵکرد، ئەگەر چی بەر لە دەستبەکاربونی حەزم نەدەکرد دەست لەو کارانە وەردەم، بەڵام ئەم کتێبە سەرنجی ڕاکێشامو ناچاری کردم، جا بەش بەحاڵی خۆم ئەوەندەی پێم کرابێ هەوڵم داوە بە کوردییێکی پەتیو پاراو ویستو مەبەستی نوسەر بخەمەڕو، لە وەرگێڕانی حەرفی پیت بە پیت خۆم بەدور گرتوە، لەهەر شوێنێکی ئەم کتێبەش ئەگەر هەست بە زەحمەتیو توندی بکرێ پێم وایە هۆکاری بۆ خودی کتێبەکە دەگەڕێتەوە، چونکە خاوەنەکەی کەسێکی ئەدیبو شارەزایەو بەسادەو ساکاری نەنوسیوە. دەربارەی شیعرەکانیش لە زۆر شوێندا شیعرەکانم بڕیوەو بەشێکیانیشم هەر بە شیعر وەرگێڕاوە.

لە کۆتاییشدا دەڵێم: خوێنەرانی سەنگین!

گومان لەوەدا نیە کەموکوڕیم هەردەبێ، بەڵام دیارە من هەر ئەوەندەم لێزانیوەو یەکەم جاریشمە خۆم لە قەرەی کارێکی ئاوا بدەم، ئەگەر ئێوەش دڵسۆزانە

ڕەخنەیـەکتان وەدی کـرد منـیش بـە سـینەیەکی فراوانـەوە وەری دەگـرم، ئەگـەریش هەر بەهرەو قازانجێکیش وەدی بکرێ هونەری منی تێدا نیە یەکەم بەهرەی خوایەو دووەمیش قەدرو ڕێزە کە بۆ نوسەر دەگەڕێتەوە، ئـیتر لـە خـوام داوایـە هەڵەو کـەم و کوڕییم بپۆشێ و، ویست و مەبەستم بۆ ئەو بێ و دوارۆژی نەبڕاوەشمان مسۆگەر بێ.

وەرگێـڕ

## ئەم کـتێـبـە

لێکۆڵینـەوەیێکی پـڕ بـە بایـەخو گـرنگو بەرپرسـیارە، بایـەخ بـە لایـەنی خـەمو ناسۆری دەدات لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، لایەنی دو دڵیو نیگەرانی، سەر لێتێـك چونو بێ متمانەیی، ڕەشبینیو ماتەمینی، کلۆڵو پەرێشانی، کەساسیو دلگرانی، دەسـت لـە خۆبەردانو هیوا بڕانو دارمان.

لە ژێر تیشکی نیگاو، ڕێنوێنیێ پەیامی خوادا چارەی کێشەی سەردەم دەکا، لەگـەڵ سروشتی ڕاستو، ئـەزمونی بـە ئـەنجام گەیـشتو، داسـتانی سـەرنـج ڕاکێشو، نمونـەی زینـدو، وێـژەی دڵ ڕفـێن بەیەکـەوە دەسـازێن، وتـە گـەلێکی هـاوەڵانی شـکۆدارو، شـوێنکەوتوانی چـاکە کـارو، بـۆنو بـەرامی شـیعری گـەورە شـاعیرانو، نـوژداری پزیشکانی ناودارو، ئامۆژیاری کاراشناو ڕێنوینی زانایانی تێدایە.

هـەر لـە نـاو ئـەو کتێبـە گوتـاری ڕۆژهـەڵاتیو ڕۆژئـاواییو، زانایـانی کۆنو نـوێی تێدایـە کـە هـەمویان لەگـەڵ ڕاسـتی تێـك دەکەنـەوە، کـە دەزگایـەکانی ڕاگەیانـدنو پـەیامو گۆڤارەکـان بڵاویـان کردۆتـەوەو، ئەوانـەش کـە چـەند خولێـكو پـشکینینو بڵاوکراوە دیاریان داوە.

ئەو کتێبە ئاوێتەو پێك هاتوێکی ڕێكو پێکە، هەوڵێکی ساخ کراوەو بێ خلتە. بـە کورتی پێت دەڵێ:

((ئاسودەو دڵارام بە، مژدە بدەو گەشبین بەو، خەمبار مەبە)).



# پێشەکی چاپی دووەم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وآله و صحبه

دوا بە دوای ستایشو درودو سلاو:

گەلێك لە نوسەران خویان پێ وەگرتوە بە نوسراوەکانیان دا هەڵدەڵێنو، باس لەوە دەکەن چاپی یەکەمیان لە بازاڕ نەماوەو، خەڵك زۆر پێشوازی لێ کردوەو بایەخی پێ داوە، ئەوەش کارێکە بەسەر دەرونەوە گرانەو بە پێی نەریت دزێوەو، سروشتیش بە چەپەڵی دەزانێ.

ئەوەندەش بۆ من بەسە کە دەربارەی کتێبی خۆم (لا تحزن) بڵێم: ئەو کتێبەم بۆ خۆمو بۆ هاوێنەی خۆم نوسیوە، یەکەم کەسیش کە سودی لێ وەرگرتبێ خۆم بوم، ئەگەر چی من بە دەستی خۆم نوسیومە بەڵام هەر کاتێ پێی دا دێمەوە، سەیر دەکەم شتێکی نوێیە بەلامەوە هەروەکو بڵێی یەکەم جارە دەی خوێنمەوە:

**مەگەر نامبینی هەر کاتێ دیدەنی یارم دەکەم**
**گەر گوڵاویش نە پرشێنێ هەست بە بۆنی خۆشەکەم**

هەر کاتێ بێزار بوم یا توڕە بوم یادلگران بوم خۆم بە خۆم دەڵێم:

باشە تۆ دانەری کتێبی (لا تحزن)نی جا دڵم ئۆقرە ئەگرێو، توڕەییم دەڕەوێتەوە.

وامدەزانی من لەمەڕ گومان چاکیم بەرامبەر کتێبەکەمو، سەرسامیم لە ئاستی نوسینیدا زێدە ڕۆییم کردوە، هەتا ئەو کاتەی لەلایەن ئەوانەی متمانە بە زانستیان دەکەمو، ڕێزی بۆچونیان دەگرمو سوپاسی هەڵوێستیان دەکەم، سوپاسنامەو پیرۆزباییم پێ گەیشتو نزایان بۆ کردم، ئەوساکە لەسەر ئەو سۆزو یارمەتییەی خوا سوپاسم کردو، هیچیش لە هونەری خۆمو دەستی خۆمو توانای من نیە، هەرچی بەهرەو توانایە هەر هەموی ئی خوایە، هەر ئەویش شیاوی سوپاسە.

بێ گومان مەسەلەی بەختەوەری مەسەلەیەکی جیهانیو، خواستێکە هەموو هۆشمەندان لەسەری کۆکو یەک دەنگن، هەموتاکو کۆمەڵو بەرەیێك هەوڵی دەستەبەرکردنی بەختەوەری دەدەن، جا هەیانە بە دەستی هێناوەو، هەشیانە چاوەڕوانە.

ئەو کتێبە سەدان پەیامی لێ کۆڵینەوەی دەربارەی بەختەوەری لە خۆوە گرتوە، گوتارێکی کراوەیە بۆ هەر یەکێ ڕێز لە ژێری خۆی بگرێ، وتەکانی لە دڵێکی هەڵقرچاو ماران گەزیو هەڵقوڵاون، بەو شێوەیە هەروەکو (موتەنەبی) باوکی (تەیب) دەڵێ:

کەسێ سەرزەنش مەکە لە خواستی تامەزرۆیە
تاوەکو بیدرکێنێ هەرچیێ کە ڕازی خۆیە

خوایە کردەوەم لەگەڵ کەمیدا، تێکۆشانم لەگەڵ کزیدا، کردو کۆشم لەگەڵ خەوش و نەنگیدا گیرا بکە، تۆ بەرزو شکۆداری شایستەی پێدا هەڵدانی، هەر تۆش ئەو خوایەی شیاوی پەرستنی.

عائیزی قەرنی
نوسیوێتی



## پێشـەكی چاپی یەكـەم

**الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله و صحبه،**

**دوای ستایش‌و درودو سڵاو:**

**(خوێنەری بەڕێز):**

**ئومێـد وایـە كـەڵك‌و سـود لـە كتـێبی (لا تحـزن) وەرگـری‌و بـە سـای خوێندنـەوەی ئاسودە بـی، دەشـتوانی بـەر لـە خوێندنـەوەی بـە پێـوەری ژیـری‌و عـەقڵێكی ڕاسـت‌و دروست بیپێوی، بەڵكە لەوە زێتر دەتوانی بە تەرازوی فەرمودە هەڵی سەنگێنی.**

**ئامـاری بێویژدانیـشە بەرلـەوەی شـتێك تـام‌و بـۆ بكـرێ‌و تـاوتوێ بكـرێ فـەرمانی لەسـەر بـدرێ، ستەمێكیـشە دەرهـەق بـە زانـست دەكـرێ كـە بەرلـەوەی تێفكـرین‌و لێكۆڵینـەوە بكـرێ‌و گـوێ بـۆ شـكاتكار بگـیرێ‌و بـسەلمێنرێ‌و سـەرنجی بەڵگـە بـدرێ، بڕیاری لەسەر بدرێ.**

**مـن ئـەو گوتـارەم بـۆ یـەكێ نوسـیوە گـیرۆدەی دەسـتی خـەم‌و پـەژارە بـێ‌و لـە نـاو تەنگـژەدا بگوزەرێنـێ، یـا بـەڵاو مەینـەتی دەوری بگـرێ، یـا بـە سـای نیگـەرانی‌و دڵپەسـتی جێی پێ لەق بێ‌و خـەو لە چاوی بـزڕێ، جا كێمـان هەیـە لـەو دەردە بـە دور بێ؟!**

**چەندین ئایەت‌و كوپڵە شیعرو پەندو نمونەو، وتەی نەستەق‌و بەسودو، داسـتان‌و ئـامۆژی تێدایـە، پوختـەو پاڵاوتـەی ئـەزمونی كاراشـنایانم تێـدا نوسـیوە، ئەوانـەی دەرمانی دەردی دڵ سوتاوو، دەرون بەزیوو، داماوو بێ ئومێدانن.**

**ئەو كتێبە پێت دەڵێ: مژدەت لێبێ ئومێدەوارو گەشبین‌و ئاسودە بە.**

**بەڵكە پێت دەڵێ: ژیان چۆنە ئاوا بگوزەرێنە، بە ڕازەمەندی‌و بە پاكی‌و بە خۆشی بژێی.**

ئـەو هەلاّنـەی پێـچەوانەی سروشـتن لەمـەڕ هـەڵس‌و کـەوت لەگـەڵ خوڕەوشـت‌و خەڵك‌و، شوێن‌و سەردەم‌و، هەر شتێکی تر، ئەم کتێبە بۆت ڕاست دەکاتەوە.

ئەم کتێبە زۆر بە توندی ڕێت پێ دەگرێ لەوەی پـێدا نـەگری لەسـەر تێـك گـیران لەگەڵ ژیان‌و پێچەوانە بون لەگەڵ قەزاو قەدەری خواو، دژایـەتی کردنـی بەرنامـەو یاساو ڕەت کردنەوەی بەڵگە.

بەڵکـە هـەر لـە نزیکـەوە بانگـت دەکا لـە هـەمو دەرگاکـانی دڵـت دەداو، لـە هـەمو لایەکـەوە سـەرنجت ڕادەکێـشێ بـۆ ئـەوەی دەرەنجـامێکی ڕوناکـت هـەبێ، ئۆمـدت بـە خواستەکانت ببێ، بەری بەهرەکانت وەبەر بێ، تالاّیی ژیان‌و ناسۆری ڕابردوت لە یاد چێ، ماندو شەکەتی ڕێگات وەحەسێ.

دەمەوێ لەسەرەتاوە بۆ چەند بابەتێکی گرنگ سەرنجت ڕاکێشم:

یەکەم: مەبەست لەو کتێبە دەسـتەبەر کردنـی بەختـەوەری‌و هێمنـی‌و هـەداری‌و دڵ شــادییە، کردنـــەوەی دەروازەی ئومێــدو گەشــبینی‌و داهــاتوێکی درەوشــاوەو ڕزگارییە.

وە یـاد خـستنەوەی میهـروو سـۆزی خوایـەو، پـشت پـێ بەسـتن‌و نیـەت پاکییـە، مەبەست بە قەزاو قەدەر باوەڕ هێنانەو، لە سنوری ئـەو ڕۆدا ژیانـە، واز هێنانـە لە نیگەرانی لەمەڕ داهاتوداو یاد کردنەوەی بەهرەی خوایە.

دوەم: ئـەو نوسـینە هـەوڵ دانـە بـۆ فـرێ دانـی دڵ پەسـتی‌و دڵگرانـی، کەساسـی‌و پەرێشانی، دلاّو دڵی‌و نیگەرانی، دڵ توندی‌و دارمان‌و بێ ئومێدی، دەست لـە خـۆ بەردان‌و هەرەس هێنان‌و هیوا بڕان.

سێیەم: ئەو ئایەتانەی لە ئاسمانی ئـەو بابەتـە دەخولێتـەوە، هەنـدێ لـە فـەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هەندێ وتەی نەستەق‌و ناوازە، داستانی پەند دادەرو، هەڵبەسـتی کاریگـەرو، قـسەو لێ دوانـی کاراشـنایان‌و پزیـشکان‌و ویـژەران، لـەو کتێبـەدا کـۆم کردونـــەوەو، دەدرەوشــێنەوە دەســتە چــیلەپێك[1] لـە بەڵگـەی ڕۆن‌و ئاشـکراو ئەزمونـی سەرکەوتو، دەستەواژەی ڕاست‌و دروستی تێدا باس کراوە،

---

١) دەستە چیلکەییێکی وشکی باریکە، کە ئاگری پێ بکرێتەوە.

تەنیا ئامۆژگاریو بابەتێکی فیکریو گوتارێکی رامیاری نیە، بەڵکە لە پێناو ئاسودەیی تۆ بانگێشتێکی بە گورە.

چوارەم: ئەو کتێبە بۆ موسڵمانو نا موسڵمانە، هەستو نەستی مرۆڤایەتیم لێ رەچاو کردوە، ئەو هەڵوێستەشم لە پەیرەوی راستو دروستی پەروەردیار وەرگرتوە کە ئایینی سروشتە.

پێنجەم: لەو کتێبەدا چاوت بە چەند وتەیەکی رۆژهەلاتیو رۆژئاواییەکان دەکەوێ، ئومێدیش وایە گازاندەم لێ نەکرێ، چونکە تێگەیشتن بزربوی بڕوادارە، لە هەر شوێنێ بیدۆزێتەوە بۆ ئەو لە هەمو کەس شیاوترە.

شەشەم: پەراوێزم بۆ ئەو کتێبە دانەناوە، تاوەکو بۆ خوێنەر سوكو سانا بێ، بۆ ئەوەی هەمیشە زەینی لەسەر بێو بەردەوام وەی خوێنێ.

هەر لە خودی کتێبەکەش سەرچاوەی وەرگرتنم دیاری کردوە.

حەوتەم: ژمارەی لاپەرەو بەرگەکەم نەنوسیوە، چونکە چاوم لەوانەی پێش خۆم کردوە، واشدەزانم ئەوە سوكو سودمەندترە، جاری وایە دەق بە دەق بابەتەکەم گوازتۆتەوە، یا دەست کاریم کردوە، یاخود واتاو مانای کتێبەکە یا گوتارەکەم گوازتۆتەوە.

هەشتەم: ئەو کتێبەم باس باسو بەش بەش نەکردوە، بەڵکە شێوەی دەرخستنی جۆراو جۆرە، جاری وایە برگەکان لێك جیا دەکەمەوە، لە باسێکەوە بەرەو باسێکی تر دەرۆم دوای چەند لاپەرەیەك بۆی دەگەرێمەوە، بۆ ئەوەی کەسی خوێنەر پتر چێژی لێ وەرگرێو لەبەرچاوی شیرن تر بێ.

نۆیەم: بەهۆی دەرهێنانی ژمارەی ئایەتەکانو دەرهێنانی فەرمودەکان درێژەم پێ نەداوە، ئەگەر فەرمودەکە بێهێز بێ رۆنم کردۆتەوە، ئەگەریش بەهێز بێ یا حەسەن بێ باسم کردوە یا لێی بێ دەنگ بومە.

ئەوەش هەموی بە مەبەستی کورت کردنەوەو، دور کەوتنەوە بوە لە دوبارەو زۆر بە دوادا رۆیشتنو بێ زار کردن، ((والمتشبع بما لم يعط كلابس ثوب زور.... ئەوەی تێر نەبێو بە تێر خۆی نیشاندا وەکو ئەوە وایە بەرگی درۆینی لەبەرکردبێ.

دەیەم: خوێنەر هەست پێ دەکا هەندێ ماناو مەبەست بە چەند شێوەو چەشن دوبارە بوینەوە، ئەو کارەشم بە ئەنقەست ئەنجام داوە تاوەکو ئەو بۆچونە بە چەند شێوە بخرێتە ڕو، ئەو شتەش کە بە خوڕ[٢] دەگوازرێتەوە[٣] چاتر لە دڵدا جێی دەبێتەوە، کەسێ لە قورئانیش وردبێتەوە ئەو شێوازە دەرك پێ دەکا.

ئا ئەمانە دەی تەواون، پێشکەش بن بەو کەسەی بیەوێ ئەو کتێبەی وەخوێنێ، ئومێدیش وایە ئەو کتێبە ڕاستی وەخۆ هەلگرتبێ‌و بە وێژدانەوە دوابێ‌و دادوەرانە بڕیاری دابێ، بە دڵنیاییەوە زانیاری ببەخشێ‌و، بۆچونی ڕاست‌و دروست بێ‌و، بۆ چاوکراوەیی چرایەك بێ.

مـن لەو کتێبەدا هەموکەسێ دەدوێنم‌و لەگەڵ هەموچینێك دا قسە دەکەم، مەبەستم چین‌و توێژێکی تایبەت‌و تەنیا کۆمەڵێك نیە، مەبەستم شارو وڵاتێکی تایبەت نیە، بەڵکە بۆ هەموئەوانەیە دەیانەوێ بەختەوەرانە بگوزەرێنن.

بە مرواریم هۆنیەوە کاتێ دەستم لێ هەڵگرت
بێ تیشکی خۆر تیشکی داو بێ هەیڤ شەوڕەوی کرد
ڕوخساری ڕەونەق دەداو چاوی وەك بەری بەیانن
ئای لە سۆمای چاوان‌و گەردنی چەندە جوانن

عائیزی کوڕی (عبدالله)ی قەرنی
نوسیوێتی
٥/ مانگی ڕەمەزان

---

٢) بەلێزمە .
٣) دەگێڕدرێتەوە .



## خوایــە هـــاوار

کاتــێ دەریـا هـەژا شــەپۆلیدا زریـانیش شـاڵاوی هێنـا کەشــتیوانان هـاوار دەکـەن خوایــــــە هـــــاوار، ﴿ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ... هەر کێ لەناو ئاســمانەکانو زەمیــنن هــەمو کارێکیــان هــەر بــەوەو ئــەو گـشت ڕۆژێ بــە کارێکــەوە خەریکە ﴿٢٩﴾ الرحمن ﴾.

کاتــێ لاڕێ لـە بیابـان دا سـەرگەردان بـو ڕێبـواران‌و خەربەنـدان[٤] ڕێ یـان کەوتـە کوێرەڕێیان هاوار دەکەن: خوایە هاوار.

کاتێ یـەکێ خـەم بیـچزێنێ[٥] کارەسـات‌و کۆسـتێ دای ڕۆشـێنێ[٦] لـە میهـری خـوا ڕادەمێنێ دەڵێ: خوایە هاوار.

کاتێ دەرگاکان لە ڕوی خوازیاراندا داخران، ویست‌و خواستیان پـەردە پـۆش کـران هاوار دەکەن: خوایە هاوار کاتــێ وزەو توانـا لـەبار چون، ڕێگـە چارە تـارو مـار بـون پەتی خۆزگەکان پچڕاو، گەلای ئومێدان هەڵوەرا هاوار دەکەن خوایە هاوار.

**کاتێ زەمینت لــێ وێك هاتــە خــۆ لــە نــاخ‌و سینەت هاتــەدەر**
**بۆن ســۆ،[٧] بـابە هاواری خواوە زمانت بێتە گۆ بڵێ خــوایە هاوار**
**بێ گومـــــان یادی تۆم کــرد کــاتێ ناخۆشیەکـــان توند بون،**
**ڕەش بون، ڕوی ڕۆژگــاریش تۆزاوی‌و گـــۆڕاو،**

---

٤) کاروانچیان.
٥) ئازاری پێ بگەیەنێ.
٦) بریندار‌ی بکا.
٧) بۆنی سوتان

**دەنگم هەڵبـڕی لە پێش بەیاندا بە ناوی تۆ، بەهاوارەوە،**
**لە ناکـاو ڕوخـساری هەمو بەیانیـیەك دەگـرژایەوە.**
**وتـەی پـــاكو تكای بێ خـلـت**
**هاوارو نزای ڕاسـتو ڕەوا، ئەسـرینی چاوی بێ نەوا،**
**هەر بۆ لای خـوا بەرزەبنـــەوە.**
**لە دەمە دەمی بەیانیـــان دا، لە بێ دەرەتـانیو ئاتـاجیاندا**
**دەسـتو لە پی پێداویسـتان هەر بۆ لای خـوا ئەکـرێنەوە،**
**لە کارەساتو پەژاراندا پێلـوی چاوان بە ڕوی ئاســـمان**
**هەڵدێنەوە، داواو خواستیش بەرەو خوا دەکرێنــــەوە**

هەر بە ناوی ئەوەوە زمانەکان دێنە ئاواز، بانگی ئەکەن، لای دەردەبـڕن ڕازو نیـاز، بـە یـادی ئـەوەوە دڵەکان ئـارام دەبـن ڕۆحـەکانیش هەسـتو نەسـتو پـەیاکانیش[٨] ئۆقرە دەگرن، هۆشو جۆش دێنەوە خۆو، باوەڕو متمانە دامەزراو خۆگر دەبن.

﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ ...خودا دەربارەی عەبدانی بە ڤیانە ﴿١٩﴾ الشورى﴾.

ٱللَّهُ: خۆشـتـرین ناوو جوانتـرین پیتو ڕاستتـرین وشـــەو بەهـــادارترین واژەیـە ﴿... هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ... ئاخۆ ئاگات لێیە هاوناوێکی هەبێ؟ ﴿٦٥﴾ مريم﴾.

کەوایـە جـا ویـدانیو بێنیـازی[٩] شـکۆمەندیو کـار لـە جێیـیو باڵادەسـتی، تـینو توانـاو سەرخـستن، لـە ٱللَّهُ وە سەرچـاوە دەگـرن ﴿...لِّمَنِ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ... لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایی بۆ کێیە؟ هەر بۆ خودای تـاكو تـەنیای بەسـەر هەمو شتێدا زاڵە، ﴿١٦﴾ غـافر﴾.

کەواتــە سـۆزو خۆشەویـستیو میهرەبـانی، کۆمـەکیو هاریکـاری، فریـا دڕەسـیو چاکەکاری، ڕەوشتی بەرزی ئەون.

---

٨) وردە دەماری هەست.

٩) بێنیازی/دەوڵەمەندی.

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ... بەهرەیەك ڕو تێدەكـا لە خواوەیـــە ﷻ: خاوەنی پایەبەرزیو بڵنـدی هـەرە زاڵو شـكۆمەنـدی ناچار كـردنو گـەورەیی ﴾ (٥٣) النحل.

**لە هەر ساتێ بە چەند پیتێ گەورەیی تۆ دەنوسـرێ**
**ئەوا پیـرۆزیـێكـــە گـیان و ڕۆح ئۆقرەی پێ ئەگـرێ**
**تۆ زۆر لـــەوە بەرزتریشـی پەروەردگـــارا**
**هەمو توانـاو لێكدانەوە بێ ڕێ دەبن كـاتێ نـاوت دەهێنرێ**

خوایە ناخۆشی بەی شادی بـێنی، دڵ سـوتاوان بـسرەوێنی، نمـەی بـاوەڕ بپرشـێنێ، پۆلی دڵان دامركێنی.

پەروەردگارا چـاوانی لـە خـەو تـۆراو بـە نـاردنی سـوكە خـەوێ لـە لایـەن خۆتـەوە بخەوێنە، ئارامی بۆ دڵە ڕاڕاكان بێنەو موژدەی ڕزگاریان بە ڕودا بچرپێنە.

پەروەردگارا: چاو خەڵەتاوان بۆ ڕۆشـنایی و گومڕابـوان بـۆ ڕێـی ڕاسـتو دروسـتیو لاملانی لە ئایینت بۆ ڕێنماییت ڕێنوێنی كەی، خوایە بە بەرەبەیانی دانی ڕۆناهیت[10] تەمو لێڵی دڵاو دڵی لادەی، بە پرشنگی ڕەوای خۆت گەندەڵیو بودەڵی دڵان.

ڕادەی[11]، بـە كۆمـەكی سـەربازە فریـشتەكانت كەڵەكـەو تەڵەكـەی شـەیتانەكان بپوكێنی[12]و لە كارخەی.

خوایـە خـەمی دڵمـان هـەڵوەرێنی، پەسـتی دڵمـان بتـارێنی، نیگـەرانیو ڕاڕاییمـان بڕەوێنی.

پەنا دەگرین بە تۆ لە ترسو بیم جگە لە تۆ، لە ملكەچیو لەسەر شۆڕی تەنیا بۆ تۆ ، لە پشت بەستن تەنیا بە تۆ، لە كۆمەكیو داواكاری تەنیا لە تۆ، تۆ یارو یـاوەری ئێمەی، چاترین ڕزگار كارو دۆستی مەی.

---

١٠) ڕوناكیت.
١١) ڕامـــاڵی.
١٢) پوچەڵ كەیتەوە.

## بیرکەوەو سوپاسگوزار بە

واتە بیر لەو بەهرەو بەخششانەی خوا بکەوە کەبەسەرت داباریون هەست دەکەی تۆیان داپۆشیوە، هەر لەسەر سەرتەوە تا بەری پێتەوە ﴿...وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ ... ئەگەر بێنە سەر ژمارەی چاکەی خودا، لە ژماردن دادەمێنن ﴿٣٤﴾ إبراهيم﴾.

بەهرەی تەندروستیو لەش ساخی، ئاسایشو هێمنی، خۆراکو پۆشاك ئاو هەوا، هەر چی لە بونەوەر دایە، لە بەرژەوەندی تۆ دایە، کەچی هەستی پێ ناکەی، خاوەنێتی ژیان دەکەیتو دەرکی پێ ناکەی، ﴿...وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۚ ... گەلێ بەهرەی بەسەر تانارژاندوە﴿٢٠﴾ لقمان﴾.

تۆ خاوەنی دو دیدەی گەشی، خێوی زمانێكو دو لێو دو دەستو دو پێی بێ خەشی.

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ... دەسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەرندەو حاشا دەکەن؟ ﴿٥٥﴾ الرحمن﴾ .

بۆ مەگەر کارێکی ئاسانە تۆ لەسەر پێیەکانت گوزەر بکەیتو بەسەر قاچەکانتەوە بوەستی؟

کەچی زۆر کەس قاچو قول براو بێ پێن؟!

شتێکی کەمە تۆ بە پڕاو پڕی چاوەکانت بخەوی

گەدەت لە خۆراکی بە چێژ پڕکەی

ئاوی ساردو سازگاریش نۆشکەی

کەچی کەسانێکی زۆر هەن لە تاو ئێشو ژانیان خەو لە چاویان زڕاوە. تامی خواردنیان لە دەمدا تاڵو گۆڕاوەو، ئاوی زوڵاڵ لە قورگیاندا وێنەی زوخاوە؟!

ورد بەوە لە بیستن‌و بینایت، سوپاس بۆ خوا کەڕو کوێر نیت، تەماشای پێستی لاشەت کە سوپاس بۆ خوا گولوگڕو بەڵەك نیت، لاکەوە بە لای ژێریتدا کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوی بەوەی هۆشت لەسەر خۆیەو دێوانەی چۆڵ‌و هەردو شێتی کوچو کۆڵا نەو گاڵتە جاڕی خەڵك نیت، ئایە دەتەوێ لە بەرابەری تەنیا چاوێکت دا بە قەد چیای هەڵگوڕد ئاڵتونت پێ بدرێ؟!

ئایە پێت خۆشە گوێچکەکانت بەسەنگایی چیای کارۆخ لە زیو بفرۆشی؟!

حەز دەکەی زمانت بدەی لە پای چەندان کۆشك‌و باڵە خانەی ڕازاوەو بێ زمان‌و لاڵ بیت؟!

خوازیاری: دو دەستەکانت بکەیتە قوربانی لە پێناو چەندان ملوانکەو خەناوکە لە دوڕو گەوهەرو مرواری بێ دەست‌و قۆڵ بیت؟!

بە ڕاستی تۆ لە ناو نازو گۆزی زۆرو زەوەنددای، کەچی لێی نەبانی‌و[١٣] بێ ئاگای، دڵشکاو دڵ سوتاو دڵ ڕەنجاوی دەست لە ئەژنۆو دۆشدا ماوی، ئەگەر چی خودان ئاوی ساردو نانی گەرمی، خەو خۆش‌و بێ‌لەکەو خەشی، ئاخ هەڵدەکێشی لەسەر شتی نەبو لە دەست چو سوپاسگوزار نی لەسەر هەبو،

پشی سوارو هەراسانی لەتاو زیانێکی سامانی کەچی کلیلی بەختەوەریت لە دەستەو خێوی[١٤] چەندین بەهەرەو بەخششی بێ وێنەو بەهاداری، دەسا بیر کەوەو سوپاسگوزار بە ﴿وَفِىٓ أَنفُسِكُمْۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ... هەروەها لە ناو خۆشتاندا زۆر هەن ئاخۆ لە خۆتان ناڕوانن؟ ﴿٢١﴾ الذاريات﴾. ورد بەوە لە خودی خۆت، لە ماڵ‌و حاڵ‌و خێزانت لە کردارو گوزەرانت، لە هاوڕێ‌و خۆشەویستانت لە دنیاو دەوروبەرت ﴿يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ... بە بەهرەی خودا ئاشنان کەچی سەرپێچی لێ دەکەن.﴿٨٣﴾ النحل﴾.

---

١٣) پێی ئاشنانی/داماوی بیر دەکەیتەوە.

١٤) خاوەن .

## لە دوا چــوان مــەچو

یادکردنەوەی ڕابردو تاو توێ کردنی لە بیرو هزردا، سوێ بونـەوەو دڵ پەسـتی لـە پێنـاو ئـاخو داخیـدا[١٥]، گـەوجیو گێلـیو نەفامیـە، بـن بـڕ کردنـی ویـستو خواسـتو پرشو بڵاوە کردنی ئێستای ژیانە.

بێ گومان ژیرو هۆشمەندان ناچن لاپەڕە بەسەر چوەکانی ژیان بخوێننـەوەو کۆنـە بریبان بکولێننەوە، بەڵکو لە کونجی زیندانی فەرامۆشیدا دەپێچرێنەوەو کۆت بەنـد دەکرێن، دەرگا لـە ڕویـان دادەخـەنو پـشت گوێ دەخـرێن، تـا هەتایـە نایێنـەدەر لـە بینینی تیشکی خۆریش بێ بەش دەکرێن.

چونکە ڕابردو ناگەڕێتەوە، نە بە دڵ پەسـتی دێتـەوە نـە بـە پـەژارەو سـوتو سـوێ کەلو پارچەی وێك دێتەوەو گیانی بە بەر دەکرێتەوە.

ئیتر چی تر لە دەست دێوەزمەی ڕابردوداو لە ژێر چەتری لە دەست چودا مەگوزەرێنە، گیانت لە ژێر چەپۆکی تارماییە ترسناکەکەی دەربێنە.

ئایە دەتەوێ پێچەوانەی ڕەوشی ژیان مامەڵەبکەی ئاوی ڕوبار بەرەو ژورو خۆر بەرەو خۆرهەڵاتو منداڵ بۆ سکی دایکو شیر بۆ گوانو فرمێسکو ئەسرین بۆ چاو بگێڕیەوە؟!.

بێ گومان هەڵسو کەوتت لەگەڵ ڕابردوداو ڕاڕاییت لە ئاستیداو سوتانت لە ئـاهو گڕیداو خۆ هەڵدانت بۆ ئەودیوی کۆسپو لەمپەرانیدا، دۆخێکی نالەبارو بە ئازارو تۆقێنەرو ڕاچڵەکێنەرە.

خوێندنەوەو تێفکرین لە روپەڕی ڕابردودا بەهەدەردا نـەبۆ هەنوکـەو، دابـڕ دابـڕ کردنی کۆششو بە بادانی کاتو ساتێکە ئێستا لە ڕودا.

خوای گەورە باسی نەتەوە ڕابردوەکانو کردارو ڕەفتاریان دەکات پاشان دەفەرموێ ﴿ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ... ئەوانە کۆمەڵانێك بون کە ڕابردون. ﴿١٣٤﴾ البقرة ﴾.

---

١٥) ئاخ هەڵکێشان، یا دەگوترێ داخەکەم.

دەهۆڵ دڕاو تەقەی بڕا دادڕینو توێ كاری لاشەی ڕۆژگار دادناداو گێڕانەوەی ڕەوڕەوەی مێژو بێ هودەیە.

ئەو كەسەی بۆ ڕابردو دەگەڕێتەوە وەك ئەوە وایە دوبارە ئارد بهاڕێتەوەو پوشكەی دارى بڕاو ببڕێتەوە هەر لە كۆنەوەش گوتراوە بەوانەی ئەسرین بۆ ڕابردۆ دەڕێژن:"مردوی پار هاوینێ ئەمڕۆ بۆی مەگێڕە شینێ" بە هەمان شێوەیەكێ لەسەر زمانی ئاژەڵان سەر بوردەیەك دەگێڕێتەوە، گوایە بە گوێ درێژیان گوت: بۆ كاوێژ[١٦] ناكەی؟ ئەویش گوتی چونكە ڕقم لە درۆیە.

دەردی ئێمە لەوەدایە لەمەڕ ئێستا دەستەوسانین لەسەر قاڵ بون بە ڕابردوش بێو چانین، چاومان بە كۆشكو تەلارە جوانەكان پڕنابێو هەردەم بۆ كەلاوە دارماوەكان بە پەرۆشو پەرێشانین، خۆ ئەگەر مەردمو پەری كۆببنەوە بۆ ئەوەی ڕابردو بگێڕنەوە نەبوەو ناكرێ بی هێننەوە.

نەبۆتە باو خەڵكان ڕوەو دواوە بڕوانو بۆ دواوە لاكەنەوە، چونكە ژیان وا ڕەخساوە باو بۆران ڕوەو پێشەوە هەڵدەكاو ئاو سەرەو ژێر دادەڕژێو كاروان بەرەو پێش دەگوزەرێ هیچێك لەوانە ناتوانێ پێچەوانەی ڕەوشی ژیان ئاوەژوبێ.

## هەر ئەو ڕۆژەی ئێستات ڕۆژە

كاتێ بەیانیت كردەوە چاوەڕێی ئێوارە لێ داهاتن مەبە وادانێ هەر ئەو ڕۆ دەژی، نەوەك دوێنێی بە فەڕو شەڕی خۆی تێپەڕی، نەوەك سبەی كە نەبۆتە مێوانی ژین.

تەنیا ئەو ڕۆژە ڕۆژی ژیانتە، كە پرشنگی خۆری بەسەرت دا هەڵاتوەو تۆی لە ئامێزی خۆی گرتوە، كەوابو تەمەنت تەنیا ڕۆژێكە، دەسا هەر بۆ ئەوڕۆ بژی، هەروەك بڵێی لەو ڕۆژەدا چاوت بە دنیا هەڵێناو هەر لەو ڕۆژەشدا سەر دەنێیەوەو دەمری، با ماوەی ئەو ڕۆژە خلیسك بە ژیانت نەباو وریا بە نەبیە قوربانی لە نێوان بەرداشی بیر كەوتنەوەو خەمو پەستی ڕابردوداو لە نێوان بەرداشی پێشبینیو حەپەسانو پەلكێشانی داهاتو

---

١٦) دوبارە خواردنەوەی خۆراكی ناو هەناوە، زۆرێك لە ئاژەڵان خواردنی ناو گەدەیان یان دوبارە دەخۆنەوە لەكاتی پاڵكەوتن و حەسانەوەیاندا، دیارە ئەو جۆرە خواردنەش خواردنێكی بەدرۆیە.

هەر بۆ ئەورۆ جەختو هەوڵو داهێنانت کردو کۆشو ڕەنجی شانت بخەرە گەڕ.

جا هەر ئەو ڕۆ ڕو لە ڕوگەو ملکەچانەو بە ترسەوە نوێژ ئەنجام دەو قورئان بە تێفکرینەوە بخوێنە، هۆشو ژیریت لە موتالاو خوێندنەوەدا بەکاربێنە، جوانکاریێ لە کردارو لە ڕەفتارو لە ڕوکارت دا بەدی بێنە، ئەو بەشەی خوا پێی داوی ڕەزامەندی لێ بنوینە کەڵكو سودت هەم بە خۆتو هەم بە خەڵکیش بگەیێنە. دەشێ لەم ڕۆژەدا ساتەکانی بەر فراوان کەی، هەر خولەکێ بکەی بە ساڵێ، هەر چرکەیێ بکەی بە مانگێ، تۆوی چاکەی تێدا بچێنێ، هەڵسو کەوتی جوان بڕوێنی، فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنێ، پەروەردیارت[17] بە دەم یادەوە بدوێنی، توێشوی کۆچی یەکجارەکی بەرهەم بێنی.

خەمان لە دڵ هەڵوەرێنی، ئاسودەیی‌و دڵ نەوایی بۆ خۆت بێنی، ڕەزامەندی لە ئاستی بژێوی ژیانت، ماڵو منداڵو خێزانت، پلەو پایەو گوزەرانت دا، بنوێنی، ﴿...فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ .... چم پێداوی، وەری بگرەو لە شوکرانە بژێران بە ﴿١٤٤﴾ الأعراف﴾. ئەو ڕۆژە بە بێ خەمو خەمینی، بە بێ ڕقو کینەیی، بە بێ گرژی‌و چاوتێبڕی دەگوزەرێنی جا پێویستە لەسەر تابلۆی دڵت تاکە ڕستەیەك بنوسی، بیکەیە ملوانکەی پەڕتوك خانەکەتو هەڵی واسی بڵێی (هەر ئەو ڕۆژەی ئێستات ڕۆژە... کەوابو ئەگەر ئەمڕۆ نانێکی گەرمو نەرمت لە خوان بێ، لە داخی نانە وشکەی دوێنێ‌و لە چاوڕاوی نانی سبەینێ بۆچی گیانت هەراسان بێ.

ئەگەر ئەمڕۆ ئاوێکی شیرن‌و سازگار نۆشکەی، بۆ دەبێ لە ئاهی ئاوە سوێرو تاڵەکەی دوێنێ خەمان لە خۆ بارکەی، یا لە پێناو ئاوی گەرمو زەلکاوی سبەینێ هاتو هاوارکەی.

ئەگەر تۆ بە هەستو ویستی پۆڵایینەوە هەوەسو هەواو ئارەزوت توند بگری دەتوانی بیرۆکەی (هەر ئەمڕۆ دەژیم... وەك ئەڵقەیەك لە گوێ بگری، هەموچرکەیێ دەستەبەرکەی، بنچینەی کەسایەتیت توندو تۆڵ کەی، زیاتر خۆت بەهرەوەرکەی، کردارو ڕەفتارت پالاوتەکەی، ئەوسا دەڵێی: لەمەولا تەنیا بۆ ئەورۆ

17) پەروەردگارت.

وتەکانم بژار دەکەم، قسەی پڕوپوچ و وڕێنان ناکەم، پاشمندە باسی کەس ناکەمو، جوێن نادەم،

تەنیا بۆ ئەو ڕۆ ئەژیم، ناو ماڵو پەڕتوك خانەم ڕێك ئەخەم، نە گرژیەو نە پەڕشی[18] بەڵکو ڕێکیو لێكو پێکی.

تەنیا بۆ ئەوڕۆ دەژیم، بایەخ دەدەم بە خاوێنیو بە ڕوکارم، بە ڕوخسارم، بە لفتو لێوو گوفتارم، بە ڕۆیینو جوڵەو کارم.

هەر بۆ ئەوڕۆ دەژیم، لە گوێ ڕایەڵی پەروەردگارمو بەجێ هێنانی فەرمانی درێخی ناکەم، لە شوێن پێ هەڵگرتنی پەیام بەرم کۆشش دەکەم، وا بەستەی خوێندنی قورئان دەبم، لە توێژینەوەی پەڕتوكو موتالای کتێبی بەسودو لەبەرکردنی وتەی نەستەق سرێ ناکەم.

هەر بۆ ئەوڕۆ دەژیم، بۆیە کاری پەسند لە نێو دڵمدا دەڕوێنم

دڕكو داڵێ خراپە کاری، لەخۆ پێ زۆریو بەزلزانی

ڕوپاماییو چاوتێبڕی[19]، گومان خراپیو ڕقە بەری، بە ڕیشاڵەوە دەردێنم. هەر بۆ ئەوڕۆ دەژیم

بۆ خەڵکی دەبمە داری بە بەر لە هەڵۆێستو کرداری چاك لە سەردانی نەخۆشو ناشتنی مردو سڵی ناکەم،

شێواوێ ڕاستە ڕێ دەکەم، برسیو بێ نانێ تێر دەکەم کۆست کەوتوێ[20] ڕزگار دەکەم، دلگیرێ[21] دڵنەوایی دەکەم ڕێز لە زانایەك دەگرم، سۆز دەنوێنم بۆ گچکەیێ، گەورەیێ بە گەورە ئەگرم.

**من هەر بۆ ئەوڕۆ دەژیم کەواتە ئەی ڕابردوی لە دەست چو تۆش ئاوا بە هەروەك ڕۆژت ئاوابو، تازە چی تر فرمێسکت بۆ نابارێنم، یادی ڕۆژە ڕەشەکانت ناکەمەوەو**

---

۱۸) بلاوی.

۱۹) چاوچنۆکی حەسودی.

۲۰) خەمبار.

۲۱) خەفەت بار.

تەنیا چرکەیەکیشت نالاوێنم، چونکە تۆ ئێمەت بەجێ هێشتو بارگەو بارت پێچایەوە نایێیتەوە تا هەتایە.

تۆش ئەی داهاتوی دا نەهاتو هێشتا لە دونیای پەنهانی

من مامەڵە لەگەڵ خەونان ناکەم، خۆم بە خەیاڵ سەرقاڵ ناکەم

پەلە لە دایك بونی نەبوێ ناکەم، چونکە سبەی لە بوندا بونی نیەو شەڕو فەڕی لە ڕو نیە.

ئەی مرۆڤی هۆشیارو ژیر وتەی (هەر ئەو ڕۆژەی ئێستات ڕۆژە... لە فەرهەنگی بەختەوەریدا جوانترین پەندو ئامۆژە، بۆ یەکێ لە جوانترین شێوەو خشڵدا ژیانی گەرەکە.

## خۆت بە داهاتو سەرقاڵ مەکە

﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ ... ئەوا فەرمانی خوا هات پەلەی مەکەن.(١) النحل﴾.

پێشبرکێ لەگەڵ ڕوداوان مەکە، خۆناتەوێ کۆرپەی ناوسگ لەبار چێ بەر لەوەی کاتی دابێ؟!، یا میوەی دارێ هەڵچنی بەر لە پێ گەیشتنی؟! خۆ هێشتا سبەینێ ڕاستێتی بۆ نیەو جێگای قسەو باس نیە، تامو ڕەنگو بۆی نیە، دەی کەوایە بۆ خۆی پێ سەرقاڵ کەین‌و، خەمانی لەخۆ بار کەین، چارەی خۆمان ناچار کەین‌و، ژیان لە خۆتارو مار کەین، خۆ نازانین ئاخۆ مەرگ ئەکەوێتە نێوانمان یا بە خۆشی پێی ئەگەین،؟! هەرچی بێ لێمان نادیارە، هێشتا هەر لە ئاسمانەو نەگەیشتۆتە سەر زەمین، تاوەکو بۆ پێش بینی‌و دادو بێ دادی پەست بین، لەسەرمانە بەسەر پردێکدا ڕەت نەبین هەتاوەکو پێی نەگەین،کێ دەزانێ؟ دەشێ بەر لە پێگەیشتنی وچان دەین یا دابڕمێ بەر لەوەی پێی وەسەرخەین، دەش بێ پێی بگەین‌و بە بێ زیان بەسەری داگوزەر کەین.

بێ گومان دیاری کردنی ڕوبەرێکی فراوانتر لە ئاستی بیرو هۆشدا بۆ بیر لە داهاتو کردنەوەو، سەر بەسەر لاپەڕەی نهێنیدا گرتنەوە، پاشان خۆ داخ کردن بە پێش

بینیە شومەکانی، هەم بە پێی یاسای خوا ناپەسندە هەم نیشانەی ئومێد گەلێکی نادیارو بێ سنورن بە ئایندە، ژیریش بە ڕەوای دانانێ، چونکە زۆرانبازێ کردنە لەگەڵ سێبەردا، زۆرێك لە خەڵکان لەمەڕ داهاتودا ڕەش بینو بەد بینن، وا دەزانن نانێ نابێ لە دەمی خەن پۆشاك نابێ لەبەری کەن نەخۆشو بێ دەستمایە دەبن، بەرە بەڵاو پەڕپوت دەبن نازانن ئەوانە وانەی شەیتانن لە قوتابخانەی ئەودا دەرخ کراون:

﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ ... شەیتان ئێوە لە نەداری دەترسێنێو بۆ خراپە هانو دەدا. خواش بەڵێنی لێخۆشبونو خۆشی ژیانو پێدەدا. ﴿٢٦٨﴾ البقرة ﴾.

زۆرن ئەوانەی شیوەن دەگێڕن، پێیان وایە سبەی بە زگی خاڵی ڕادەبوێرن، یا وا ئەزانن دوای ساڵێ تر بە دەردان دەتلێنەوە، یا ماوە بۆ بڕانەوەی جیهان دادەنێنەوە، بەڵام ئەوەی مانو بونی خۆی لە دەست نیە گرەو کردنیشی لەسەر نەبو ڕەوا نیە، ئەوەش کە نازانێ چۆنو کەی دەمرێ جێی خۆی نیە بە دوای نەبوێ دا سەرقاڵو وێڵ بێ کە دەرکی پێ نەکاو خەونو خەیاڵو خێو بێ[٢٢].

داهاتو بەلاوە نێ لە بیرت دا هەتانێ، باسو خواسی قەت مەپرسە، لە هەڕەشەو گوڕەشەو لەسەر ڕوکشانی مەترسە، چونکە تۆ بەو ڕۆوە سەرگەرمی.

## جگـە لەوڕۆ سەرقاڵ بونت داڕمانو هێنانی هەرەسـە

تەماشاکەن چەندە جێگای سەرسوڕمانو تێڕامانە، ئەوانە چەند سەیرو سەمەرەن کە دەستاو دەست خەمان دەکڕن، هەتا دەکرێ لە کۆڵێ خۆیانی بار دەکەن.

تاوەکو ژیانی ئایندەیان پەرتو پێوار کەن، لە ڕۆژێ ئەو قەرزە هەڵدێ هەر خوا دەزانێ کەی خۆری هەڵدێ دەی کەوایە بۆ خۆت وریا بەو مەگۆڕێ بە خەیاڵ پلاوان مەدۆڕێ.

---

٢٢) مێردەزمە، شتێکی مەترسی دارە بە خەیاڵ.

## (( لە ڕەخنە بەهێزتر بە ))

گەوج و گێل و بێ ئابروان بەرامبەر خوای ڕۆژی دەریان قسە پوچ و دەم شڕن بێ ئەمەك و سپڵەن و نان خۆری ناندێن دڕن، بەرامبەر خوایەك تاك و تەنیا یەو بەدی هێنەری ئاسمان و ڕێسمانە، من و تۆیەك چاوەڕوانی چیان لێ بکەین کە سەرتاپا گیانمان نوقمی ستەم و تاوانە، دڵنیا بە بە تۆ ڕوبەڕوی جەنگێکی وێرانکارانە دبیەوە، کە نەبڕێتەوە.

بە ڕەخنەو پەلاری تاوانکاری بە چڕو پڕی شالاو دێنن، دەیانەوێ سەر لەبەرت بونیەو کەساتیت لە بناغەوە هەڵتەکێنن بەسەر کۆنەو ڕوی مورچ و مۆنەوە هەرچی ئاکاری بەرزە لێت داتەکێنن،و تۆ لە دیدی ئەواندا تاوانباری چونکێ خاوەنی ویژدان و هەستی، بنیات دەنێیی و دەبەخشی، تیشك دەدەیوە دەدرەوشێی ئەوان لە تۆ بێ دەنگ نابن هەتا ژێر کۆڵێ لێ نەدەیوخۆتی تێدا حەشار نەدەی، یا پەیژەیێ بە ڕوی ئاسمانەوە هەڵنەپەسێری و لەبەر دەستیان ڕانەکەی، یا گەر بتەوێ لە ناویا نابمێنی ئەوا دەبێ هەرچی ناسۆری و ئەشکەنجەیە لێیانەوە چاوەڕێ کەی، لە داخان ئەسرین بە خوێن هەڵڕێژێ یا شەو تا بەیانی ئاخ و داخان ببێژی.

بزانە کەسی دانیشتو بەرنابێتەوەو تۆڵە لە مردو ناکرێتەوە، دیارە بێ هودە نیە لە ئاقارتۆدا دوژمن کارن چونکە تۆ بەهۆی ئاکار بەرزی و ڕەوشت چاکی بە زانست و زانیاری بە زەنگینی و ماڵ داری لەوان زۆر بالاتری.

لە دیدی ئەواندا تاوانبارێکی وای ماڧ پەشیمانیت بۆ نیە هەتا دەست بەرداری بەهرە پێ بەخشراوەکانی خوا نەبیت و خۆت لە هەرچی ئاکارو ڕەفتاری بێ وێنەیە دانەڕنیت و کەسێکی نەدان و کەودەن و بێ دەستمایەو داڕماو داهێزراوت لێ دەرچێت، دڵنیا بە هەر ئەوەیان لێت دەوێت؟

دەسا داسەپاوو خۆڕاگر بە، سەبارەت بە هەڵپە گۆیی و دەم دڕاوی، تیرو توانج و ڕەخنەی ورە ڕوخێن مەڕوخێ وەك چیای (احد... بەو مەهەژێ، وەك تاشە بەردان بەو مەپوکێ، کاتێ دەنکە تەرزەی پێوە دەشکێن و کار لە بون و مانی ناکاو دەیسەلمێنێ پشت قایم و خۆڕاگرە.

ئەگـەر تـۆ گـوێ قـوڵاغی وتـەی وان بـێو ورە ڕوخـاو هەراسـان بـی ئـەوا خـەونی لەمێژینـەیان دێنیـە دیو بـۆ تـاڵكردنی ژیانـتو لێڵـی تەمـەنت دەسـتباریان لەگـەڵ دەگری.

وریا بە چاوپۆشیان لێ بنوێنەو پشت یان تێكەو مەیاندوێنـەو خۆت بـە داوی وان مەخنكێنە. بێگومان ڕەخنەو وتەی كرچو كاڵیان خۆی لە خۆی دا بەڵگـەو نیـشانەی سەنگو ڕێزی تۆن لە پای وان.[٢٣]؟

تۆ ناتوانی قوڕیان لە دەم بپەستیو زمانیان لە گۆ ببەستی بەڵام دەگری هەسـتو ویسـتیان لە گۆڕ خـەی، هەوڵی نەزۆكیـان لـە پـێ خـەی، وتـەی بـێ جێیـان پـشت گـوێ خەی: ﴿ ...قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ... بێژە: دەك لە ڕكان بمـرن. ﴿١١٩﴾ آل عمران ﴾.

بـەڵكو دەكـرێ بـە ئاكـارو شـاكاری جـوان، بـە ڕاسـت كردنـەوەی هەڵـەكان تـاڵایی مەرگیان پێ چێژكەی.

گەر بتـەوێ لای گـشت كەسـێ خۆشەویـست بـی ئێـسك سوكو بـێ لەكە بـی دیـارە خەیاڵ پڵاوان دەكەی بە دوای كڵاوی بابردودا ڕادەكەی.

## ( چـاوەڕێی سـوپاسـی كـەس مەكـە )

خوای بەخشندەو دلۆڤان بەندەكانی تەنیا بۆ ئەوە فەراهەم هێناوە وە یادی خـەن، ڕۆزی داون بـۆ ئـەوەی سوپاسـی كـەن، كەچـی بەنـدە گـەلێ بـۆ جگـە لـەو ڕوی بەندایـەتیان دادەخـەن، بـۆ جگـە لـەو سـەری نـەوازش شـۆڕ دەكـەن، چونكە ڕەوشـی دەرونی سەركەش وایە لاسارو سەرپێچی كارە سپڵەییو بێ ئەمەكی بەسەردا زاڵە.

كەواتە تۆش هێدمە مەگرە گەر دەبینی ئەو كەسانە بەهرەكانت دەشارنەوە، چاكە كاریـت دەسـوتێنن، مەردایـەتیت دەڕەوێـنن، لـەوەش زیـاتر جـاری وایـە سـەنگەری دوژمنایـەتیت لێ دەگـرن بـە گەلـە كـۆیی بـە ڕقو كینـەی خـۆ خـۆیی بـەردەبارانت دەكەن، تەنیاو تەنیا لەبەرئەوەی كارامەییت وەدی دەكەن:

---

٢٣) لەبەرامبەر ئەوان.

﴿..وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ ... هەر بۆبەش ڕکیان بۆتەوە کە خوداو پێغەمبەری خوا بەو چاکەی دەگەڵی کردون، ناگوزوری بۆ نەهیشتون. ﴿٧٤﴾ التوبة﴾.

دەی تۆش دڵی خۆت بەوە بدەوە، سەر بوردەی بێ وەفایی لە تۆمارگەی ئەو جیهانە جەنجاڵەدا بخوێنەوە.

لە یەکێ لە لاپەڕەکانی سەربوردەی کوڕو باوکێك سەرنجت ڕادەکێشێ باوکە هەر لەو ساتەی کوڕەی چاوی بە دنیا هەڵدێنێ، چاوی سۆزو میهرەبانی تێ دەبڕێ هەنگاو بە هەنگاو لە هەرچی قۆناغی ژیانێتی دەستی دەگرێ، تێر نان دەکرێ، تێر ئاو دەکرێ، زۆر بە جوانی پۆشتە دەکرێ، بەڵەد دەکرێ، وتەی جوانی لە گوێ دەخرێ، تا پێی دەگرێ، شەو بێدارە تابخەوێ، برسیە تا ئەو تەسەل بێ، ماندوە تا بسرەوێ، بەڵام لەو ساتەی کوڕە تاق لاوێتی هەڵات، لە دژی باوکی وەکو سەگی هاری لێهات، کەوتە گیانی لە پای وەڵامی چاکەکانی، هەتا توانی، بە سوكو چروکی زانی، بو بە کوڕێکی سەرکەشو دڵ ڕەقو بێ مروەتو بە هەنجەتو بە نەگبەت.

دەبا هێور بن ئەوانەی لاپەڕەی چاکەکانیان بە دەستی ویست ڕوخاو سروشت وا ژیان[٢٤] سوتێنراوە، با گوشاد بن بەو پاداشتەی وەری دەگرن لەو خوایەی هەمو نازو فەڕێ لە گەنجینەی بێ سنوری ئەودا سەرچاوە دەگرێ.

ئەو گوتارە گەرمو گوڕە لەمەڕ ئەوە نیە تۆ لە کردەوەی چاك وازبێنی، یا هەڵوێستی جوان لە ئاستی خەڵکدا نەنوێنی، بەڵکو بۆ ئەوەیە دڵنیا بی کە هەمیشە لەو دژەکاریەت چاو لە ڕێ بی تا تۆوی چاکە بچێنیو هەڵوێستی جوان بنوێنی، وە لێ[٢٥] نائومێدی نەت گرێ لەبەرئەوەی خەڵکی ناحەز لێت دەخوێنێ.

لە پێناوی خوا ڕەفتاری باشە ئەنجام دە، هەر تۆ گرەوی خۆت دەبەیتەوە، نە نکوڵیو سەرپێچی وان، نە بە کەم زانیو ئێرەییان کار لە بەرەو پێش چونت ناکەن، سوپاس گوزاری خوا بە چونکێ تۆ چاکە ویستو ئەوان شەڕ ویستن، تۆ باڵا دەستی[٢٦] و ئەوان تەنك دەستن[٢٧].

---

٢٤) ئاوەژو.

٢٥) بەڵام.

[٢٦] هەر بویی و بێ کرایی.

﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ...ئێمـە -هـەر لـە راهـی خـودا- ئـەم خۆراکەتان دەدەینێ، نە پاداشتێکمان لە ئێوە دەوێ نە شوکرانەش. ﴿٩﴾ الإنسان﴾.

زۆرێ لە هۆشمەندو ژیران لە داخی بێ ئەمەك و ڕەخنـەگیران کپ و کلۆڵ دامـاون، هـەروەکو بلێیـی گوێ بیستی نیگـای خـوای بـالا دەسـت نـەبون، کاتـێ لـە بـارەی لـوت بەرزیو خۆ پێ زۆریو سپلەیی ئەوانەوە هۆشـداری داوە، هەسـتو ناخیـان بـەدەر ڕا وەرکــــــراوە ﴿...مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ... وەها دەڕوا هەروەك هیچ لەبـەرمان نەپاڕابێتـەوە، بـۆ بـەلایێك توشـی بوە! ئا بەم جۆرە کردەوەمان بۆ ئەوانەی هەڵە ڕۆن، ڕازاندۆتەوە. ﴿١٢﴾ یونس﴾.

سام گرتومە بە کاتێ قەڵەمێکت بۆ کەودەنێ کردە دیاری دژی تۆی پێ بنوسـێ بـە نالەباری، یا گۆپالێ بدەیتە گێلو لاساری بۆ ئەوەی خـۆی پێـوە بگـرێو مـەڕو مـالاتی پێ بلەوەڕێنێ لە پاداشی ئەوە پێتدا بکێشێو سەرو گوێلاکت بـشکێنێ، مـەردومێکی بێ ئەمەك هەر ئەوەی پێ ڕاستو ڕەوایە کە لە نێو کفنی سپڵە کاری دا خۆی مۆمیا کردوەو لە فەرمانی خوای کار لە جێ خۆی بواردوە، دەبێ بۆ منو تۆ چۆن بێ؟!.

## ( چاکە شادی بەخشی دلانە )

چـاکە کـاریو ئاکـار جـوانی جـوامێریو سـینە فراوانـی نـاوو ناوەڕۆکیـان یـەکن، سودمەندترین کەس ئەوانەن هەڵگری ئەو ڕەوشتانەن، سینەو ناخیان شێوەی باخـە بـەروبومی لێ هەڵدەچـنن، وێنـەی نزارگـەو سـەهەندن هەسـتو ڕۆحیـان لـە ژێـر سێبەریدا ئۆقرە دەگرن.

کاتـێ خـەمێ دەورەی گرتـی، یـا بـەلایێ یەخـەی گرتـی، لـە ڕاسـت کەسـێکدا هەڵوێستێکی جوان بنوێنە، یا یەکێ بە ڕوی خۆشەوە بدوێنە، هەست دەکـەی دەروی خێرت لە ڕودا دەکرێتەوەو شادیێ بە دڵت دا وەردەبێتەوە.

٢٧) هەژار و بێ دەستمایە.

دەستی کۆمەکی بۆ یەکێ درێژ کە، برینداری سارێژ کە، کۆست کەوتوێ ڕزگار کە، برسیو بێ نانێ تێر کە، نەخۆشێ دڵخۆش کە دەستبارلە لەگەڵ یەکێ بگرە،[28] هەست دەکەی چەند بەختەوەری گیانت نوقمی شادیە سەرلەبەری[29].

بێ گومان کردەی باشە، هەروەکو بۆنی خۆشە، هەم کڕیارو فرۆشیار لێی سودمەندە هەم ئەوەی خۆشی خاوەندە، جا ڕاهاتنە دەرونیەکان لەسەر چاکە، داودەرمانێکی پیرۆزن بەکار دەبرێن لە دەرمانخانەی دڵ بێداراندا دابەش دەکرێن.

پەخش کردنی بزەو خەندەی درەوشاوە لە ڕوی کەم دەرامەتانی ڕەوشتدا چاکەیەکی نەبڕاوەیە لە جیهانی ڕەوشتدا "ولو ان تلقى اخاك بوجه طليق... ئەگەر چی بە ڕوی گەشەوە ڕوبەڕوی براکەت ببیتەوە".

کەچی ڕوگرژی شەڕێکی نەپساوەیە لە ئاستی خەڵکانی تردا کە هەر خوا دەزانێ مەودای ئەو شەڕە چەندە.

تەماشا! تەنیا قومە ئاوێ بە دەستی داوێن پیسێ بۆ دەمی سەگێکی دڕندە، بوە هۆی مسۆگەر کردنی بەهەشتێکی پانو پۆڕ لە ئایندە، چونکە خاوەنی ئەو پاداشتە خوایەکی لێ بوردەیەو سوپاسندە، جوانەو جوانیشی لاپەسندە، ستایش کراوو بێ نیازو دەوڵەمەندە.

ئەی ئەوانەی لە دەست دێوەزمەی بەدبەختیو ترسو لەرزو کڵۆڵی دا حەپەساون وەرن بۆ گوڵشەنی چاکەکاری، خۆتان بە کەسانی ترەوە سەرقاڵ کەن، بە بەخشینو مێوان داری، بە دڵ نەواییو خزمەتگوزاری، ئەوسا دەچێژن تامو ڕەنگو بۆی بەختیاری، ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ الليل﴾.

بۆیەش بە کەسی نەبەخشی کە پاداشتی بدرێتەوە، هەر ویستویە ڕەزامەندی پەروەرندەی هەرە بەرزی بە دەس بێنێ، بەم زوانەش ڕازی دەبێ.

---

٢٨) یارمەتی یەکێ بدە.

٢٩) هەرهەموی.

## بەئەنجام دانی کارێ لە بێکاری دەست هەڵگرە

ئەوانەی لە ژیاندا کات بە تاڵو بێ کارن، هەر ئەوانن بـە بـڵاو کردنـەوەی هـەواڵی نا دروستو پڕوپاگەندە سـەرقاڵن، چونکە زەیـن پـرشو پـەرتو بـڵاون ﴿رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ ... بەوە ڕازی بون لەگەڵ بەجێ ماوەکان بن.. (٨٧)(٩٣) التوبة﴾.

ترسناك ترین حاڵەت کە بەسەر بیرو هۆش بێ، ئەو ڕۆژەیە پیـاو بـێ کـردو کـۆش بێ، ئەوسا وەکو ئەو ئۆتۆمبێلەی لێدێ بە توندو تیژی بە بێ شوفێر سەرەو لێژ بـێ جارە بە لای چەپو جارە بە لای ڕاستدا لا شۆڕ بێ.

هەر ڕۆژێ لە ژیانتدا بەتاڵ بێ، دەبـێ ئـەو ڕۆژەت لێ تفـتو تـاڵ بـێ، چونکە ئـەو بەتاڵیـە بـەرەو هەرچـی دەردەسـەریو کولەمـەرگی ڕابـردو ئێـستاو داهـاتوە، پـەلت دەگـرێ، ئامۆژگـاریم بـۆ خـۆمو بـۆ تـۆش ئەوەیـە خـۆت بـە کـرداری بەرهـەم دارەوە سـەرقاڵ کـەی لـە جیـاتی ئـەو خاوەلیـچکەییە[٣٠] کوشـندەی، ئـەگینا چـاڵێ بـۆ خـۆ لێ دەدەی بە ئەسپایی خۆی تێ دەخەی یا وەك ئـەوە وایـە بـە دەنکـە دەرمـانێکی هێـور کەرەوە خۆت لەناوببەی.

کات بەتاڵی بەو سزایە خاوە خاوە[٣١] دەچێ کە لە بەندیخانەکانی وڵاتی چـین پیـادە دەکرێ بەو شێوە بەند کراوەکە لە ژێر بۆڕیە ئاوێ دادەنـێن لەهـەر خولـەکێ دڵۆپـێ ئاو دێتە خوارێ، لە ئەنجامی چاوەڕوانی ئـەو دڵۆپانـە بەندیخانـەی لێ دەبێتـە شـێت خانە.

سرەوتن بێ ئاگاییە، بەتاڵی دزێکی پیشە گەرە، هەستو ژیری تۆش نێـچیرێکی بـێ ئەمانە لە دەست ئەو جەنگە خەیاڵیانە، کەواتە دەی هەستە ڕابە نوێژ بـەجێ بێنـە، یـا قورئـان بخوێنـە، یـا پاکانـەی خـوا بنوێنـە، یـا بنوسـە، یـا پـەرتوکێ وەخوێنـە، یـا پـەرتوك خانـەکـەت وەڕازێنـە، یـا نـاو ماڵەکـەت بلوێنـە، یـا سـود بـە جگـە لـە خـۆت بگەیێنە، تا بەسەر بەتاڵیدا زاڵ دەبی، بۆ خوا ئامۆژگاریت دەکەم گوێت لێم بی.

---

٣٠) شلو خاوی.

٣١) ئارام ئارام/وردە وردە.

کات بەتاڵی بـە چـەقۆی کـار سـەربڕە، تەنانـەت لـە پێنـاو ئـەو هـەنگاو نانـەو زات کردنەتدا سەرلەبەری پزیشکانی جیهان دەستەبەری سەدا پەنجای ٥٠٪ بەختـەوەریت بۆ دەکەن، ڕامێنە لە جوتیارانو نانەواچیانو بناسازان، سەر لە بەیانیان چۆن بەرەو کاریـان دەڕۆنو وەك چۆلەکەو پاساریان دەچریکێنن هەرچی خـەمو خەفەتـە بـە ئیش کردنێی دەرەوێنن تۆش لە ژێر پێخەفەکەتدا ماتو خامۆشی ئەسرین دەسڕیو ماران گەزیوی تاڵایی بێ کاری دەنۆشی.

## ( ڕەگـەڵکـەوتە مەبـە )

بـە پۆشـتەی کەسـایەتی کەسـێکی تـر خـۆت مەپۆشـەو لـە کەسیـشدا نەتوێیتـەوە. چونکە دەبێتە هۆی سزایەك بەسەرت دا نەبڕێتەوە، زۆرن ئەوانەی خۆیانو ڕەنـگو ڕویـان بـەهرەو وتـەو جوڵـەو خویـان پـشت گـوێ دەخـەن دەیانـەوێ لـە کەسـایەتی کەسانی تردا خۆ بزر کەن، ئینجا دەبێ بڵێین داخـی گـرانم بـۆ قـەوارەو خۆشـیەکان خۆ لەبار چونو پەت کرانو سوتێنران.

لە ئادەمەوە تا دوایین بەدی هێنـراو دو مرۆڤ لە یەك وێنەدا هاوشان نین، ئەی چۆن لە بەهرەو ڕەوشتو خودا یەك بن.

**تۆ کەسێکی وێنەت نەبوە لە مێژودا نایەتـە بونیش لەمـەو دوا تـۆ تـەواو جیـای لەگەڵ ئەمو ئەودا لـە شـێوەی کەسـدا مەڕەخسێ خـۆت مەخـە قـەرەی چـاولێکەری کوێرانەو با ڕەنگو ڕوت بە کەس نەچێ.**

بۆ خۆت چـۆنی ئـا بـەو شـێوە دەرکـەوە ﴿...قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ... هـەر تیرەیەك جێی وەخواردنی خۆی زانی. ﴿٦٠﴾ البقرة ﴾ .

﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ... هـەر لایـە شـوێنێکیان هەیـە ڕوی تێدەکەن، دەسا ئێوە بۆ چاکە کێبەڕکێ بکەن. ﴿١٤٨﴾ البقرة ﴾.

چۆن ڕەخساوی ئاوێ بژیێ، دەنگت چۆنە ئاوا بدوێ چۆن چێنراوی ئاوا بڕوێ، پێچەوانەی سروشتی ڕۆینیت مەگوزەرێ، دەرونت بەوەحی خوا پالاَوتە کە، بەلاَم بونت هەلاَمەوەشێنەو سەر بە خۆییت بێ سەر مەکە.

تۆ خاوەنی چێژێکی تایبەتو ڕەنگێکی تایبەتی، تۆمان بەو ڕەنگو ڕووەوە دەوێ، چونکە بەو شێوە دروست کراوی، لە ناو ئێمەشدا هەروا ناسراوی "با هیچ کام لە ئێوە کەسێکی ڕەگەلّ کەوتە نەبێ".

خەلّك لە سروشتو شێوەیاندا بە جیهانی درەخت دەچن، هەندێ شیرینو هەندێکیان ترشن، هەندێ درێژو هەندێکیان کورتن، دەی ئێوەش هەر بەو شێوە بن.

ئەگەر تۆ تامو بۆت وەك داری مۆز بێ هەولّ مەدە وەك داری بەهێت لێ بێ، چونکە جوانیو نرخی تۆ لەوە دایە شێوەت وەك داری مۆز بێ.

لە ڕاستیدا لێك جیایی ڕەنگو زمانمان بەهرەو تواناو دەسەلاَتمان، یەکێکن لە نیشانەو بەلّگەی کار لە جێی پەروەردیارمان، دەی تۆش سەرپێچی ئەو بەلّگەو نیشانانە نەکەی.

## قەزاو قەدەر

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ... هەر بەلاَیێك ڕودەدا لەم سەرزەمینەو هەر بەلاَیێك کە بەسەر خودی خۆتان دێ - بەرلەوەی وەدی بهێنین- لە دەفتەرێك دا نوسراوە. (٢٢) الحديد ﴾.

مەرەکەبی پێنوس وشکەوە بو، نوسراوەکە پێچرایەوەو، بڕیاری خوا جێبەجێ بو، بەرێوە چو ﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ... بێژگە ئەوەی خوادا بۆی نوسیبین توشمان نایە. (٥١) التوبة ﴾.

هەر بەلاَیێ بۆ تۆ بێ بەسەرت دا ڕەت نابێ، ئەوەی کە بۆ تۆش نەبێ ڕادەبورێو هەرنابێ.

ئەگەر ئەو باوەڕە لە ناخدا ڕواو لە دڵدا جێی خۆی کردەوە، بەڵا دەبن بە خەڵات، ناخۆشی دەبێتە شادی، کارەسات‌و ژین ژاری[32] دەبێتە بەخشش‌و دیاری، (ومن يرد الله به خيـرا يصب منه... هەریەکێ خوا بیەوێ چاکەی لەگەڵ دا بکا بەربەڵای دەکا.

با نیگەرانی نـەت گـرێ بـەهۆی نـەخۆش کـەوتنێ، یـا کەسـێکت لێ دەمـرێ، یـا کـە هـەژاریت دێتـە ڕێ، یـا خانوەکـەت گـڕ دەگـرێ، چـونکە خـوای کردگـار چارەنوسـی کـردوەو، بڕیـاری جێبـەجێ بـوەو، مـەردوم هـەڵی بـژاردوەو، خـوا دەسـت نیـشانی کردوەو، پاداش مسۆگەر بوەو، ژەنگی تاوانیش لاچوە.

دەسا خۆشی بۆ ئەوانەی لەبەر خەمان چۆکیان دانـەداو، ڕەزای خوایـان وە دەسـت هێنا، ئەو خودایەی دەگرێتەوەو دەبەخشێ، بە ویستی ئەو ژیانمان لێ وێك دێتەوە[33] و بە ویـستی ئـەو دەروی خێـر والا دەکـرێ، ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ ... چـی ئـەو بیکـا ناشێ پرسیاری لێ بکرێ‌و ئەوانن کە بەرپرسیارن. ﴿٢٣﴾ الأنبيـاء﴾.

پەیـەکانت ئـارام نـابن[34]، خورپـەی دڵـت داناحـەجمێ، خوتوکـەی دەرونیـت ئـۆقرە ناگرێ تاوەکو باوەڕت بە (قەزاو قەدەر) دانەسەپێ، ئەوەی بەسەرت دێ قەڵەمی لـێ هەڵگیراوە، وشـك بۆتـەوە ئـەوەی نوسـراوە، کەواتـە گیانـت ئاوێتـەی خـەم نەکـەی، وا مەزەنـدە نەکـەی ئەوەنـدەت لـەبار دابـێ دیـوارێ ڕابگـری خـەریك بـێ نـسکۆ بـێنێ، یانەیەڵی ئاو لە شوێنی خۆی هەڵرژێ، یالێنەگەڕێی با هـەڵکا، یـا شوشـە بەربێتـەوەو نەتەوێ بشکێ، بێ دەستی من‌و تۆ دەبـێ ئەوانـە بێنـە دی، ئـا بـەو شـێوە چارەنوسـی خوا هەردەبێ‌و بڕیاری ئەو هەر دێتە جێ‌و نوسراوی ئـەو پیـادە دەکـرێ ﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... کێ بڕوای پێدەکا، بیکاو کێش بڕوا ناکا هەر نەیکا. ﴿٢٩﴾ الكهف﴾ .

ملت کەچ کـە بـۆ قـەدەر، بـەر لـەوەی بـە لەشـکری تـوڕەیی‌و دەسـتەو یەخـەو بـە هات‌و هاوار گەمارۆ بدرێی دان بنێ بە بڕیاری خوا بەرلەوەی بە شەپۆڵی پەشـیمانی

---

٣٢) ژیانی تاڵ و ناخۆش.

٣٣) تەنگ دەبێتەوە.

٣٤) دەماری هەست.

لول بدرێی، کەواتە با دڵت بسرەوێ ئەگەر هۆکارەکانت بە دەست هێناو، وزەو توانات خستە گەڕ، دوای ئـەوە دەردو بـەڵات هاتـە سـەر، چونکە دەبوایـە هـەر بێتـە ئـاراوە ئەوەی خوا بڕیاری داوە، وا مـەڵێ: "لو أني فعلت كذا لكان كذا، ولكـن قـل: قَـدَّر الله وما شاء فعل... ئەگەر ئـاوام بکردایـە وا دەبـو، بـەڵام بێـژە: خـوای هێنـا بـوی ئـەوەی حەزیش بکا دەی کا.

## ( دڵنیــابە ناخۆشی خۆشـی لە دوایە )

ئەی مرۆڤی دەستە پاچە، لە ژین هیوا بڕ مەبە، دوای برسی نونێ تێریە، دوای تێنوێتی تێر ئاویە، دوای خەو زڕان خەو خۆشیە، دوای نەساخی لەش ساخیە، ڕۆژێ دێ ون بو کە بگاتەوەو، بێ سەرو شوێن خودا بەرەو ڕێی کاتەوەو، بێوڵەت[٣٥] دەروی لـێ ببێتەوەو، تاریکایی برەوێتەوە ﴿... فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ... هیچ دور نیە خودا ڕۆژێ سەرتان بخا، یاخۆ کارێکی تر بکا.(٥٢) المائدة ﴾.

موژدە[٣٦] بۆ شەو بەرەو نەق دانی بەرەبەیان کە یاوە یاوە[٣٧] بەسەر لوتکە چیاکاندا هەڵدەگەڕێو بە کونجی دۆڵاییەکاندا شۆڕ دەبێتـەوەو تـاریکی ڕاو دەنـێ، مـوژدە[٣٨] بـۆ کەساس و ڕەنگ هەڵبزرکاوان بە ئاوڕ لێ دانەوەیەکی پەنهانی خودایی و بە دەست بەر داری لە خراپەو ماڵ ئاوایی لـێ کردنی.

ئەگەر بینیت بیابان دەکشێو دەکشێ[٣٩] بزانە بەرو بـاخی سـەوزو سـێبەر پـڕی لـە دواوە دێ.

ئەگەر پەتێکت بینی جار لە دوای جار توند دەبو، دڵنیا بە ئەو پەتە لە ئەنجامـدا دەپچڕێ.

بزانە دوای ئەسرین سڕین خەنـدە وەرینە لە دوای ترس و بیم دڵ سرەوینە[٤٠].

---

٣٥) هەژار/نابوت/بەدبەخت.

٣٦) موژدە لێرەدا بە واتای هەڕەشەیە.

٣٧) وردە وردە/ئارام ئارام.

٣٨) موژدە بە مانای هەواڵ پێدانی خۆشە لێرەدا.

٣٩) دور دەکەوێتەوە.

ئیبراهیم پێغەمبەری دۆستی خوا بە گڕی ئاگر نەسوتا، چونکە دەرگای چاودێری پەروەردگاری لێ والآ کرا بەو فەرمانە ﴿... وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ... ئاگر! دەبێ ساردو بێ زیان بی بۆ ئیبراهیم. ﴿٦٩﴾ الأنبياء﴾.

دەریا پێغەمبەر موسای ئاخافتەر لەگەڵ[41] خوای بەخشندەی نغرۆ[42] نەکرد چونکە راستگۆیانە بە گوڕ دەنگی بەو دروشمەوە هەڵدەبڕێ ﴿...كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ... نابێ بترسن چون پەروەرندەم دەگەڵەو بەم زوانە دەروێکم لێ دەکاتەوە. ﴿٦٢﴾ الشعراء﴾.

پێغەمبەری بێ هەڵەو پەڵە (ﷺ... لە ناو ئەشکەوتدا لە دژوارترین حاڵەتدا، موژدەی لاگری[43] خوای تاقانەی بە یاوەرەکەیدا، جا ئارامیو ڕزگاریو هەدادایی[44] ڕژابە سەریاندا.

ئەوانەی بەندەو کۆیلەی ئێستایانن، دەسخەڕۆی ژێر چەپۆکی ڕۆژە ڕەشەکانیانن، تەنگو تروسكو كورت دەڕوانن، مەودای بینایی چاویان تا دیواری ژوریانەو، تەنیا تا بەر دەرویانە[45].

دەبا پەردەی بەر ڕویان لادەنو دور بڕوانن، با جڵەوی هۆشو ژیریان شل کەنو بەرەو ئەودیوی شورەو دیوارەکانیان بەری هەڵدەن.

کەواتە کتو مت دامەمێنە، چونکە ناشێ لە ڕەوشێ[46] بارو دۆخەکە بوەستێ، چاترین نواندنی بەندایەتیش ئەوەیە چاوت لە لێبونەوەی دەروی خێر بێ، ڕۆژانی ژین دەستاو دەستیان پێ دەکرێو، ڕۆژگار هەر دەمە بە ڕوخساری خۆی دەڕەنگێنێ، شەوگار بە ڕوداو گەلێکی نادیارەوە خۆی دەئاوسێنێ[47]، ئەوەی نادیاریشە بە پەردەی

---

٤٠) ئارام گرتنە.

٤٢) نقوم.

٤٣) دەرگەیانە.

٤٤) ئاسودەیی.

٤٥) لایەنگری.

٤٦) لە حاڵەتێکدا.

٤٧) لە ناوەخۆ دەگرێ.

نهێنی (غیب) داپۆشراوەو، خوای کار لە جێش هەموساتێ لە کاردایەو، ئاسۆی ئومێدانیش ڕۆنە، بەڵکو خودا شتێکی تر بە ئەنجام بگەیێنێ، دڵنیا بە ناخۆشی خۆشی لە دوایە، دەسا دڵنیا بەناخۆشی خۆشی لە دوایە.

## لە لیمۆی ترش خۆشاوی شیرین بسازێنە

مەردمی زیت و[٤٨] ژیر دەیەوێ زەرەر مەندی بەرەو قازانج وەرسوڕێنێ، بەلاّم مەردمی نەزانو بێ هەڕمێن[٤٩] هەر مەینەتیو پەتەرێك[٥٠] دوچەندانە دەكاتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ: لە شاری مەکەوە ڕەهەندە کرا[٥١] کەچی لە شاری مەدینەدا دەوڵەتێکی پێکهێنا گوێچکەی مێژوی کاس کردو چاوی مێژوی زەق کردەوە.

(ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) زیندانی کراو دارکاری کرا بە سای ئەوە بو بە ڕێبەری فەرمودە، (ئیبنو تەمیمە) بەند کرا بەهۆی ئەوە زانستی (فقە)ی ڕەنێو هێناو هێنایە بەر، (ئیبن ئەسیر) خانەنشین کرا لە پاڵ ئەوە کتێبی (جامع الاصول) و کتێبی (النهایة)ی دانا کە سودمەنترینو ناوداترین کتێبن دەربارەی فەرمودە (ئیبنو جەوزی... لە بەغدا شار وەدەر کرا لە دوای ئەوە زانیاریەکی زۆری کۆ کردەوە دەربارەی هەر حەوت شێوە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، بە هەمان شێوە (مالیکی) کوڕی (ڕەیب) دوچاری تاولەرزێکی کوشندە هات لەگەڵ ئەوەدا پارچە هەڵبەستێکی هۆنیەوەو بە گوێچکەی جیهانیدا چرپاند کە بەرامبەر هەمودیوانە شیعری بوێژانی دەوڵەتی (عەباسی) دادەنرێ، (ئەبو زوئەیبی هوزەلی) مەرگی کوڕەکانی بە چاوی خۆی بینی بە کۆپڵە هۆنراوەیەك لاواندن یەوە کە ڕۆژگار گوێی بۆ هەڵخست و[٥٢] جەماوەری سەرسام کردو چەپڵە ڕێزانەی بۆ کرا.

---

٤٨) وریا و توند و تۆڵ.

٤٩) بێ ڕەواج.

٥٠) ناخۆشیەك.

٥١) دەربەدەر کرا.

٥٢) گوێی بۆ گرت.

ئەگەر مەینەتی‌و کلۆلی دای پلۆسی لای ڕۆژهەڵاتەکەی ڕەچاوکە، ئەگەر یەکێ لێوانێکی[٥٣] پڕ لە ئاوی لیمۆی ترشی پێ دای تۆ مشتێ شەکری تێکە، ئەگەر یەکێ مارێکی بە دیاری بۆ ناردی کەڵك لە پێستەکەی وەرگرەو ئەوەی تریشی فەرامۆش کە، ئەگەر دوپشکێ پێتی وەدا وا بزانە ژەهرەکەی زەرداوی خوێنەو پارێزەرو بەربەستێکە لە دژی ژین‌و ژاری ژیان.

لە بارودۆخی ناهەموارتدا برەخسێ، بۆ ئەوەی گوڵ‌و گوڵزارو یاسەمینت لە گوڵشەندا وەبەر بێ ﴿...وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ... ڕەنگە لە شتێك حەز نەکەن بەڵام بۆتان وە خێر گەڕێ. ﴿٢١٦﴾ البقرة﴾.

دەوڵەتی فەڕەنسا بەر لە شۆڕشە دژواریەکەی دوشاعیری[٥٤] شکۆداری بەند کردن یەکیان گەشبین‌و یەکیان ڕەشبین بو، لە کەلەبەرێکی[٥٥] زیندانەکەدا هەردووك سەریان هێنایەدەر ئەوەی گەشبین یەکسەر چاوی بڕیە ئەستێرەکان‌و خەندە ڕوی وی داگرتەوە.

بەڵام ڕەشبینەکە چاوی بڕیە قوڕو لیتەی شەقامەکە یەکسەر خەم هەناوی بەردایەوە.

تۆش تەماشای ئەو دیوی مەینەتیەکانت بکە، خۆ هێشتا خواست‌و ئومێدت هەڵنەوەراون، بەڵکە سەرکەوتن‌و هیواو ئاواتت لەو دیوی مەینەتیەکانتدا دێنە ئاراوە.

## (هەر خوایە پەنای بێ پەنایانە...[٥٦]

ئاخۆ کێ بێ ئەو کەسەی مرۆڤی بێ چارەو مەفەر بە ڕویدا ڕابچڵەکێ‌و ڕازی خۆی لابدرێکینێ، کێ بێ ئەوەی بێ نیاز بێ‌و هەموبونەوەریش ئاتاجی ئەو بێ، کێ

---

٥٣) پەرداخێك.

٥٤) دو شاعیر.

٥٥) کەلێن.

٥٦) پەنای بێ پەنایان هەر خوایە.

بێ هەموکەس لێی وەپارێتەوەو زمانیان بە یادی ئەوەوە بلەرێتەوە، ئەوە تەنیاو تەنیا هەر لە خوای تاقانە دەوەشێتەوە.

مافێکە بەسەر منو تۆوە، لە هاتو نەهاتیدا، لە شینو لە شاییدا، داواو نزا لە خوا بکەین، لە تەنگانەو چەڵەمەدا پاڕانەوەو زریكو هۆڕمان ڕوەو خوا کەین.

لە بەر قاپیەی میهرو سۆزی ئەودا خۆمان بە گوڕێ دادەینو، بەلاَنەوەو نوزانەوەو چاوی فرمێسکاویەوە ڕومان دا خەین، لەو ساتەدا یارمەتیو کۆمەکی خوا دەگاتە جێ، بە خێرایی دەروازەی دەهەندەیی[٥٧] ئەو والاَ دەکرێ ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ...ئا ئەو کەسەی چاترە کە هەر وەختێ هومێد بڕوایك لە بەری بپارێتەوە دەهانای دێ ﴿٦٢﴾ النمل ﴾. بە فریای نغرۆ بو[٥٨] دەگا، ون بو بەرەو ماڵ دەکا، بەلاَ بار بێ بەلاَ دەکا، ستەم دیدە ڕزگار دەکا، گومڕا ڕێنوێنی دەکا، دەردە دار تیمار دەکا، تەم بارو[٥٩] بێ چارە چار دەکا.

﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ... هەر کاتێ سواری کەشتی دەبن، بە دڵی پاك لەبەر خودا دەپاڕێنەوە ﴿٦٥﴾ العنكبوت ﴾.

مـن نامەوێ لێرەدا ئەو نزاو پاڕانەوانەی بۆ لابردنی پەژارەو دەردە سەریو نیگەرانین بەسەرتدا بخوێنمەوە بەلاَم ڕەوانەی لای گەنجینە پڕ بەهایەکانی گوڵزاری فەرمودەت دەکەم، تا بتوانی لەگەڵ خوای پەروەرێنتدا جوان گۆ بی، هاواری کەی، لێی وەپاڕێی، داوای لێ بکەی ئومێد گەلێکی لێ چاوەڕێ کەی، جا ئەگەر توانیت خودات یار بێ وا دانێ هەرچی خۆزگەو ئومێدی هەتە هەموی لەبار بێ، ئەگەر بیرو باوەڕیشت بەرامبەری لار بێ، وا دانێ ڕەوشی هەموژیانت لەبار چێ، دڵنیا بە وێڕای ئەوەی بەو نزاو پاڕانەوەیە ئاواتو خواستەکانت وەبەر دێنی، لەوەش زیاتر ئەو پەڕی بەندایەتیو گوێ ڕایەڵی خوا وەدەست دێنی، سا هەر کەسێ لە هونەری نزاو پاڕانەوە وێرا هات[٦٠] جێی خۆیەتی دڵ پڕ نەبێ، جا ڕس[٦١] نەبێ، نیگەران نەبێ،

---

٥٧) بەخشندەیی.

٥٨) نقوم بو.

٥٩) خەم بار.

٦٠) شارەزا بو.

چونکە هەموپـەتیٚ دەپـچڕێ جگـە پـەتی ئـەو نـەبیٚ، هـەمودەرگایێ دائـەخرێ تـەنیا دەرگای ئەو نەبیٚ، ئەو نزیکەو ئەبیستیٚ، لە داوای بیٚ دەرەتانان گویٚ دەگرێ.

دەرامێنە لە سـۆزو میهـری ئـەو خوایـە، پێـت دەڵـێ لێـی وەپـارێی داوای لیٚ بکـەی، ئەگەر چی تۆ هـەژاری‌و نـەداری، بـەلاَم هـەر شـیاوی ئـەوە بـیٚ نیـازی و[62] هـەرەزاڵی، شـکۆمەندی‌و توانـاداری، لەگـەڵ ئـەوە پێـت دەفـەرموێ: ﴿...وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ...لەبەرم بپارێنەوە، ئەوسا بە دەنگ تانەوە دێم، ﴿٦٠﴾ غافر﴾.

کاتیٚ خـەم‌و خەفـەتت بەسـەردا بـاری، یـا چـورتم‌و[63] کارەسـاتیٚ حاڵیـان بـیٚ حـاڵ کردی بە یـادی خـوا خـۆت ڕابێنـە، نـاوی ئـەو بەسـەر زارت دابێنـە، لـە پێنـاوی ڕێـز لێنـانی ئـەودا ناوچاوانت لـە تـۆزو خۆڵـدا بـە کڕنـوش بـردن تـۆزاوی کـەو تـاجی گەوهەربەندی سەربەخۆیی لەسەر کەو، با فرمێسك‌و تۆزی سەر ڕوت ئاوێتەی یـەك بـن‌و، ڕوخـسارت بـە قـوڕاوی بەندایـەتی بنەخـشێنە، بـە سـای ئـەوە سـەرفرازی یەکجارەکی وەدەست بێنە، دەست‌و لـەپت بـەرەو ئاسمـان بەرزکـەوەو، زۆر داوا بکـەو زۆر بخوازە، پێـت دابگـرەو بـەر قاپیـەی ئـەو بـەر مـەدە، بـا دەنگـت وەکـو شـنەی بـا بشنێتەوە، وەك کزەی با بکزێتەوە، با ڕازو نیازت بەرامبەری جوان بیٚ‌و، خـۆتی بـۆ یەك لاکـەوە، لـە بەندایـەتی کردنـی جگـە لـە خـوا دابـڕێ‌و، بـۆ لای بەندایـەتی ئـەو دابـڕێ[64] ئومێـد وایـە خـوا ناڵـەو نـوزەت بلاوێـنی، بـەردەوام بـە تـا دوایـین قۆنـاغی بەختەوەری بەرهەم دێنی.

---

٦١) بێزار.
٦٢) دەوڵەمەندی.
٦٣) بەلاَ.
٦٤) ئەو وشەیە دوجار بەکارهاتوە جاری یەکەم بـە مانـای لیٚ دور کەوتنەوەیـە وە جـاری دوەم بـە مانای لیٚ نزیك بونەوەیە.

## با ماڵــت ئارام گـــە بێ

ئەو گۆشە گیریەی بە پێی یاسای خواو فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ پەسندە ئەوەیە: لە شەڕو شەڕان گێزان دور کەویەوەو، تێکەڵاوی کەسانێ نەبی کە کاتە پڕ بەهاکانیان لە گاڵتەو گەپو بەربەرەڵایی بەسەر دەبەن، ئەوجا تواناو بەهرەکانت دەگەڕێنەوەو، هەستو ناخت پشو دەدەن، باری نالەبارت لەبار دەبیو، زەینو هۆشت بە شتی سود مەند دەڕازێنیەوەو فراوان دەبن، چاوەکانت لە باخی بەرهەم داری پڕ لە زانیاری دا ئۆقرە دەگرن.

خۆ بە دور گرتن لە هەر شتێ لە چاکەو پەرستش پەراوێزت دەکا، دەرمانێکی سودبەخشە پسپۆڕانی شارەزا لە ڕازی[٦٥] دڵ بە ئەزمونیان گەیاندوە[٦٦] و بە ڕێژەیەکی ناوازە[٦٧] سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، منیش پێت دەڵێم بە سای چی ئەو دەرمانە بە دەست دێنی، بەوەی خۆت لە خراپە کاریو گاڵتە جاڕیو خەڵکی دەبەنگو هەرزەو پوچ بە دور بگری، ئینجا داری بیرو هزرت بەردەگرێ، سروشتی ترسان لە خوا ڕاستە ڕێ دەبیو، ئاهەنگی بەخۆدا هاتنەوەو گەڕانەوە لای خوا دەگێڕدرێ، تێکەڵاویو گرژ بونەوەیەك[٦٨] کە سودمەندەو پەسندە، لە هەر چاکە کاریێدا وەدی دێ بە هەرەوەز ئەنجام بدرێ، وەکو کۆبونەو بۆ وتاری هەینی لە ڕۆژانی هەینیدا، نوێژی بە کۆمەڵو کۆڕی زانستی، بەلام ئامان سەد ئامان[٦٩] نەکەی تێکەڵاوی کەسانێ بی کە بێ هودە تەمەنیان لە بێ کاریو چەقەخانەکاندا[٧٠] بە هەدەر دەدەن، بەڵکو لە دەستیان ڕاکەو، بۆ ڕابردوی پڕ لە هەڵەی خۆت بگریێو، زمانت لە وتەی بێ سود ببەستەو، با ماڵت ئارامگەت بێ.

تێکەڵاو بونی کوێرانە مایەی ئاڵۆزیو شێواندنی ژیانەو، هەڕەشە لە جیهانی هێمنیو هەداری[٧١] دڵو دەرونت دەکا، چونکە تۆ هاونشینی کەسانێکی وەستای درۆ هەڵبەستنو،

---

٦٥) نهێنی دڵ.
٦٦) تاقیان کردۆتەوە.
٦٧) بێ وێنە.
٦٨) کۆبونەوە.
٦٩) بۆ ڕەجا کردنێکی بە گوڕ دەگوترێ.
٧٠) بەو شوێنانە دەگوترێ تێی دا کۆدەبنەوە بۆ کات بەسەربردن.
٧١) هێواشی.

بڵاو كردنەوەی پڕوپاگەندەن، وا نەگۆی[72] هەواڵی دڵتەزێن‌و باس‌و خواسی جەرگ بڕو یەخەدا دڕێنن، تا وات لێ دەكەن بەرلەوەی ئەجەلت بێ ڕۆژی حەوت جار تاڵایی مەرگ بچێژی ﴿ لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا ... گەر ویڕای ئێوەش هاتبان بۆ خەزایە، تەنیا كاریان لە ئێوە تێك دەدا. (٤٧) التوبة ﴾.

كەواتە تاكە داواكاریم ئەوەیە ڕو لە پیشەی خۆت كەی، یا لە ماڵی خۆت دا وچان دەی، تەنیا بۆ دەربڕینی گوتەی بە سود ئەنجام دانی كردەی[73] بەردار[74] بەدەركەوە، ئەوسا هۆشت لەسەر خۆ دەبێ‌و كات‌و تەمەنت نابێتە ئاردی ناو دڕوێ، زمانت لە دژی هیچ كەس ناگەڕێ‌و، دڵە ڕاوكێت توش نایێ‌و، گوێت لە وتەی پڕوپوچ نابێ‌و، كەسێكی بەد گومانت لێ دەرناچێ، تاقی كردنەوەش باشترین بەڵگەیە، هەر كەسێكیش گومان‌و دڵاو دڵی[75] كردە پیشەو لەگەڵ خەڵكی ڕەشۆكی[76] بۆی دەرچو، بڵێ خوای لێ خۆشبێ.

## ( پـــاداش لە خــواوەیە )

خوا هەر شتێكت لێ بسێنێ‌و تۆش، ئارام بگری‌و خۆڕاگری، دڵنیا بە باشتر لەوە پاداشتت لە خواوە وەردەگری "من أخذت حبيبتيه عوضته منهما الجنـة، من سلبت صفيه من اهل الدنيا ثم احتسب عوضته من الجنـة ... هەر كەسێ دو خۆشەویستەكانیم لێ وەرگرتەوە[77] لە بری ئەوە بەهەشتی پێ دەبەخشم، هەر كەسێكیش خۆشەویستێكی دنیای لێ بسێنمەوەو، دوای ئەوە دان بە خۆدابگرێ، لە پاداشتی ئەوە بەهەشتی پێ دەدەم.

هەر كەسێ مەرگی ڕۆڵەی بینی‌و ئارامی گرت خوا لە پاداشتی ئەوە ماڵێكی لە بەهەشتدا بۆ دەسازێنێ‌و ناوی لێ دەنێ ماڵی سوپاس گوزاری، ئەمە تەنیا نمونە هێنانەوە بو، بەم شێوەیە هەرچی بڵایێ ببێ پاداشت مسۆگەر دەبێ. بە توش هاتنی

---

٧٢) مامۆستا.

٧٣) كار.

٧٤) بە قازانج.

٧٥) دو دڵی.

٧٦) سادە و عەوام.

٧٧) دو چاوەكانیم لێ سەندەوە.

کارەساتێ داخـدار مەبـە چـونکە ئـەوەی بەسـەری هێنـاوی بەهەشـتێکی نـەبڕاوەو پاداشتێکی بێ سنوری بۆدا ناوی. دۆستانی خوا سەرگەردانو بەربەلا بون کەچی بە بەرزترین پلەی بەهەشت[٧٨] شاد بون:

﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ... هەر لـە سای هـێمنی دابـن، چـونکە ئێـوە خۆڕاگر بون، پیرۆزتان بێ دوا ڕۆژی ڕون، ﴿٢٤﴾ الرعد ﴾.

پێویـستە لەسـەر ئێمـەش تفـتو تـاڵی ئـارامگری ببیـنین، تـاوەکو لـە داهـاتودا بەرهـەمی شـیرینی بـچێژین ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ... خێرو بێرو بەزەیی پەرورنـدەیان بـۆ دەبـارێو شـارەزا لـە ڕێ ئـەوانن، ﴿١٥٧﴾ البقرة ﴾ .

جا موژدەو خۆشی بۆ ئەوانەی بە چەرمەسەریو پەتەریەوە[٧٩] خرۆشاون[٨٠].

ژیانی دونیا پێـنجو دو ڕۆژێکـە بـەهاو گەنجینەشـی هـەر سـەرێکە، دوا ڕۆژ زیـاتر جێی ئومێدەو نەبڕاوەیە هەر موسڵمانێکیش توشی نسکۆیێ هات لـە دوا ڕۆژدا لـەوە زیاتر خوا بۆی قەرەبو دەکاتەوە، ماندوی ئێرە حەساوەی ئەوێیە، بەلام ئەوانـەی بـە دونیاوە پەیوەستن، بۆی وێڵو سەودا سەرو مەستن، دژوارتـرین بـاری دەرونیـان ئـەو کاتەیـە بەرژەوەنـدێیکیان لـە دەسـت چـێ، یـا ئالۆزێیکیـان بێتـە ڕێ، هـەر دونیایـان گەرەکە، بۆیە نیسکیان لێ دەبێتـە گیـسكو مێـشیان لێ دەبێتـە گامێش، هـەر سـەرەو ژێـر دەڕوانـن بۆیـە بـەس فـاقو بریقـی دونیایـان دێتـە بەرچـاو کـە مایـە پـوچ بـێ بەهایەو بێ هەڕمێنە[٨١]، ئەی ئەوانەی ئالۆدەی[٨٢] دەردو خەمانن هەر نوچدانێ[٨٣] بێتە ڕێتـان ئێـوە تـێی دا بـەرقازانجن، دڵ گوشـاد بـن نامەیـەکی پـڕ لـە هەسـتو سـۆزو میهرەبانیو هیوابەخشتان بۆ ناردراوە. پێتـان دەڵێ هۆ ئەوانـەی لـە ژێـر چاودێری

---

٧٨) فردەوس.

٧٩) کلۆڵی.

٨٠) برینیان کولاوەتەوە.

٨١) بێ قازانجە.

٨٢) گیرۆدەی.

٨٣) نسکۆیێ.

مەینەت باریدا خۆتان لەمە کۆناوە[٨٤] بەسیە ئیتر سەر هەڵبڕن ئاسۆ ڕونەو سەرەنجامی خەفەتباریش ئاوا بونە. ﴿... فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ... ئیتر ئەوسا دیوارێکیان لە نێوان دەبێتە لەمپەر، دەرگای هەیە، لە ژورەوەی بەزەیی یەو لە دەرەوەی جەزرەبەیە ئەو بەڵێنەی خوا پیی داون زۆر لە دونیا بەردارترو سودمەندە دەیانو سەدان ئەوەندە[٨٥]، (١٣) الحديد﴾.

## هەر باوەڕ ژیانە

بەدبەختو چارە ڕەشانی هەرە چارە ڕەش ئەوانەن لەمەڕ گەنجینەی باوەڕ داریو دڵنیاییدا دەستبادن[٨٦] تا هەتایە کەساسو پەشۆکاون زەبونو سەرشۆڕماون ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ... هەر کەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگا نەدایە، (١٢٤) طه﴾.

هەر باوەڕهێنان بە خوای کردگار دڵو دەرون دەشواتەوەو پاکو پاراوی دەکا، نیگەرانی نایێلیو ژینو زاری[٨٧] لادەبا، ژیانمان بۆ دەرەنگێنیو تامو بۆی[٨٨] پی وەردەگا.

ئەوانەی لەناو بی باوەڕیدا پەنگیان خواردوە[٨٩] ئەگەر خۆیان دەرباز نەکەن چاترین چارە ڕێگایان ئەوەیە خۆ هەڵدێرن[٩٠] یاپەت بخەنە ملیانو خۆ هەڵواسن تاوەکو لە دەست کێشمەکێشی[٩١] خەمانو کۆتو زنجیری ڕەشبینیو تاریکاییو کارەساتو حەپەسان خۆیان بحەسێننەوە، ئای لەو ژیانە کوێرەوەریەی کە بە بی

---

٨٤) لە کەمین داناوە.
٨٥) مەبەستم ڕێژەیەکی بی سنورە.
٨٦) دەست بلاون/هەرزە پوچن.
٨٧) ژیانی تاڵ و ناخۆش.
٨٨) بۆنی.
٨٩) ڕاوەستاون.
٩٠) لە بەرزاییەوە خۆ هەڵدەن.
٩١) دەردەسەری.

باوەڕی دەچێتە سەر، ئای لەو نەفرەتو ڕەنجبەخەسارییەی دێتە ڕێی کەسانێ لە دەرەوەی بازنەی باوەڕداریدا ژیان بەسەردەبەن ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ... هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد، (ئێمەش) دڵو دیدەی ئەوان لە کاردەخەین. هەروەك هەن وازیان لێ دێنین کە هەر بە نافەرمانییەوە سەرگەردان بن، ﴿١١٠﴾ الأنعام﴾.

ئەوڕۆ ڕۆژی ئەوەیە هەموجیهان پەردەی چەواشەکاری لەسەر ڕوی دابڕنێو بەو پەڕی ناخو کرۆکیانەوە[٩٢] ئاوێتەی باوەڕداری ببنو دڵنیا ببن کە هیچ پەرستراوێکی شایستە نیە جگە لە (ﷲ) نەبێ، لە ئەنجامی ئەو هەموتاڵیو سوێرییەی لە چاخەکانی ڕابردو دابینراوە ژێری دەرکی بەوە کردوە بێ باوەڕیو بت پەرستیو خوانەپەرستی تەنیا درۆو دەلەسەیەو، پێغەمبەران ڕاست گۆو ڕاستی هێن بوینەو، هەر خوا شیاوی پەرستشو خاوەنێتیو سوپاس کردنەو، هەر ئەو بەسەر هەمو شتێدا زاڵە.

تۆ ڕێژەو پلەی باوەڕداریت چەندە، نزمە یان بڵندە گەرمو گوڕە یاساردە[٩٣] بەختەوەریو هەداریشت[٩٤] هەندە.

﴿مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ... هەر کەسێ کرداری باشەو بە باوەڕە -چ نێر، چ مێ- هەتا دەژی وا دەکەین بە خۆشی بژی، دیاریشە باشتر لەوەی وا کردویانە، ئێمە پاداشیان دەدەینێ، ﴿٩٧﴾ النحل﴾.

ئا ئەو ژیانە پاکژەیە کە لە ژێر سایەیدا زیاتر بە بەڵێنی پەروەردیاریان دادەحەجمێنو، دڵیان بە ئەوینی پەروەردگاریان دادەسەپێو، بە سینەی پاکیان لە چنگی چەپەڵکاری لاڕێ ییدا ڕزگار دەبنو، ناخو ویژدانیان لە ئاقار تەنگو چەڵەمەدا هێورە دەبن، لە بڕیارو چارەنوسی خوا لاملی ناکەن، چونکە هەر خوا بە پەروەردگارو ئیسلام بە ئایینو (ﷺ) بە پێشەوایان قەبوڵە.

---

٩٢) ناوەڕۆك.

٩٣) ساردە.

٩٤) هێمن.

## هەنگوین دەربێنەو شانە مەشکێنە

هەر شتێ نەرمو نیانی تێدا بێ جوانو ڕازاوەو بەرچاوە، لەهەر شتێکیشدا وەدی نەکرێ قێزەونو نا بەرچاوە، ئینجا قسەی خۆشو وتەی جوان، خەندەو بزەی سەر ڕوان، پاك گۆیی لە ڕوی دۆستان، ڕەختو [95] خشڵێکی خەملاون[96].

بەختەوەران خۆیانی پێ ئارایش دەدەن، ڕەوشتی باوەڕدارانن، ئەوانەی وەکو هەنگن، کە شیلەی گوڵان هەڵدەمژێو هەنگوینی پاکی لێ بەرهەم دێنێ، ئەگەر بچێتە سەر پوپەی گوڵانیش لقەکانی ناشکێنێ، چونکە خوای کار لەجێ نەرمو نیانی وا ڕەخساندوە بێ زەڕو زیان بێ، کەچی توڕەیی‌و توندی ئەوەی لێ ڕەچاو ناکرێ.

کەسانێ هەن بە ئامادە بونو هاتنیان بۆ دیتنیان خەڵك سەری هەڵدەکێشێو چاویان لەبەردا دەنوێنێ، دڵو ڕۆحیان دێنە پێشوازیو بەو پەڕی ڕێزەوە بەڕێ دەکرێن، چونکە بەهۆی جوڵەو خویان قسەی خۆشو ڕەنگو ڕویان دڵیان بۆ بوینە هێلانەو لەبەر دڵانو خۆشەویستن.

هونەری پەیدا کردنی هاوەڵو دۆستان زانیارییێکە بیر بڕ و[97] هوشداران باش دەتوانن بەجێی بێنن، بۆیە هەمیشە بە کۆمەڵێکی ناوازەوە دەور دراون هەرگیزاو هەرگیز لایان چۆڵ نابێ.

ئەگەر ئامادەی کۆڕێ بون ڕویان لەبەر دەگەشێتەوە، ئەگەر نادیارو بزریش بون بە چاکە باسیان دەکرێو بۆیان دەپارێنەوە.

ئەوان خودان بەختان خاوەنی دابو نەریتێکن ئەوە ناو نیشانێتی: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ... تۆ هەمیشە وەرامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێ لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت، (٣٤) فصلت﴾.

---

٩٥) هەنجارە بەو زێڕ و جلکە دەگوترێ کە بۆ بوکان دەکرێ.

٩٦) ڕازاوەن.

٩٧) تێگەیشتو.

ئـەوان بـەهێزو شـەپۆلی هـێمنیو نـەرمو نیـانی بەرگـەی ڕقو کینـە دەگـرن، لێ بوردەنـەو چاودەپۆشـن، خراپـەی دەرحـەق کراویـان پـشت گـوێ دەخـەن، چـاکەی بەرامبەر کراویان لە گوێ دەخەن، گوێ بۆ قسەی توڕڕە هات هەڵناخەن[98] بـەڵکو لـەو گوێچکەیان دەچێتە ژوریو لەوی تردا وەدەری دەخەن.

حاڵیـان خـۆشو هـەمیوارە، خـەڵکیش لـە دەسـتیان نـە بێـزارە، ((المـسلم مــن سـلم المسلمون من لسانه، يده، والمؤمن من أمِنَهُ الناس على دمائهم واموالهم... موسـڵمان ئـەو کەسەیە موسڵمانان لە زمانو دەستیان بێ وەی بن، باوەرداریش ئەو کەسەیە خەڵکان لێیان نەترسن کە خوێنیان بە ناڕەوا بڕێژنو ماڵیان بە ناحەق بخۆن)).

"ان الله امرني ان اصل من قطعني وان اعفو عمَّن ظلمني وان اعطي من حَرمني... خوا فەرمانی بەسەردا داوم ئـەوەی پەیوەنـدی لەگـەڵ پـچراندوم پەیوەندیەکە بگەیـەنم، ئەوەی ستەمی لێ کردوم لێی ببورم، ئەوەی لێی گرتومەوە پێی ببەخشم.

﴿... وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ ... ئەوانـەش کـە ڕقـی خۆیـان دەخۆنەوەو لـە مـەردم چاوپۆشـی دەکـەن، ﴿١٣٤﴾ آل عمـران﴾. خۆشـی لەوانـەی دەسـت بـەجێ هـەداریو دڵارامـی بۆ بـە خـەڵاتی کـردو کۆشـیان. خۆشـی لـە خۆیـان لـە دوا ڕۆژیـشدا بـەروبومی دنیایـان دەدورنـەوەو لـە نێـو بـاخو کانیاوەکـانی بەهەشـتدا دراوسـێی پـەروەردگاریانن ﴿ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ... لـە نـشیمەنی[99] پەسندو لای خونکاری[100] بە دەسەڵاتن، ﴿٥٥﴾ القمر﴾.

---

٩٨) گوێ ناگرن.

٩٩) جێگا.

١٠٠) پاشا/گەورە.

## هەر بە یادی خوا دڵان دەگەشێنەوە

بە ڕاستی کە ڕاستاڵی[١٠١] خۆشەویستی خوایە، بێ پێچ و پەنا کە بێ پێچ و پەنایی پاك گەرەوەی ژەنگ و ژاری دڵانە، بە پێی تاقی کردنەوە کە تاقی کردنەوەش باشترین بەڵگەیە، بە ڕاستی دەدوێم کە چاوساغ و دیدەوانیش[١٠٢] لەگەڵ هۆزی خۆی بە درۆ نادوێ، یادی خوا لە هەمو کردەوەیێ پتر تەم و لێڵی دڵان دەڕەوێنێ و پاداشتی هەرە گەورە وەبەردێنێ ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ... سا ئێوە یادی من بکەن، تا منیش لە بیرتان نەکەم، ﴿١٥٢﴾ البقرة﴾.

گەر دەتەوێ لە باخ و باخاتی بەهەشتدا بەشت هەبێ وەرە پاکانەی خوا بنوێنەو لە گوڵزاری یادەوەری ئەودا خۆت وەسێنە، چونکە ئەو یادە دڵ سرەوێنەو تەم ڕەوێنەو ماندو حەسێنەو دڵ دا سەپێنە، بەڵکو نزیک ترین و ساناترین ڕێگای سەرفرازیەو ئازادی هێنە.

بە دوای پەڕاوەکانی نیگای خوادا بگەڕێ، تا سودەکانی یادی ئەوت بەرچاو کەوێ و زوخمەکانتی[١٠٣] پێ تیمار کەو ئارام لەسەر ئازاری تیمار کردن بگرە، هەتاکو زامەکانت سارێژ بن.

بە یاد کردنەوەی خوای بێ هەڵە ترس و تۆقین دەتارێ و هێمنی و هەداری دەبارێ. تەنیا بە یادی ئەو چیای خەمان دەتوێتەوەو دڵسوتاوان هەنیسکیان[١٠٤] وەبەردێتەوەو ئەسرین لە چاویان دەسڕێتەوە.

جێی سەرسامبونێ نیە کە دەبینی یادەوەران دڵ گوشادن، ئەوە بنەمایەکی ڕەسەنە لەواندا بەدی دەکرێ، بەڵام سەیرە ئەوانەی نائاگان لە یادی خوا چۆن چۆن دەژین!

---

١٠١) ڕاستی و دروستی.

١٠٢) گەڕیدە و شارەزا.

١٠٣) برینەکانتی.

١٠٤) هەناسە.

﴿ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ... مـردوێکن گیانیـان بـە بـەردا نەکراوە، هەستیش ناکەن کەنگێ زیندو دەکرێنەوە،(٢١) النحل ﴾.

ئـەی ئـەو کەسـەی لـە ئـاهی بـێ خەویـدا دەنـاڵیو لـە تـاو ئـێشو ژانـدا ئەسـرین دەڕێژی، لەبەر کارەساتان تاسـاویو ڕەنـگ هـەڵبزرکاوو دامـاوی، دەی تـازوە بـە نـاوی پیرۆزی خواوە هاوارو چـریکەت هەڵبـڕە ﴿...هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا ... ئـاخۆ ئاگات لێیـە هاوناوێکی هەبێ؟ (٦٥) مریم ﴾.

بە ئەندازەی یاد کردنەوەت هەستو ناخت فـراوان دەبـێو دڵە خورپێت نامێنـێ، هـەدادایی بەسـەرتدا دەبـارێو تەمومـژی سـەر ڕێی ژیانـت دەتـارێ، چـونکە هـەمو پاڵپشتیو یارمەتیەك لە یاد کردنەوەی ئەودا وە دەست دێ، بڕواو متمانە پتەو دەکا، دڵان ڕوەو خوا دەکا، ڕازو نیـازت پـاك دەکـا، چـرای ئومێـدت هەڵدەکا، ئـەو خوایـەی هاواری بۆ دەکەی لێت نزیکەو وەرامگۆی[105] خواستەکانە، دەسا بنوزێیـوەو بکرِوزێـوە ملکەچی بەو بلاڵێوە چەند جار چەنجار ناوی پیرۆزی بەسەر زمانتدا بێنـەوە، خـودا هەر بە یەك بناسە، بە ستایشەوە بی دوێنە، نزاو سکاڵات بەرەو بارەگـای خـوا بکـەو فرمێسکی ژیوانی[106] هەڵڕژێنە، ئەو هەلە گەر خـوا یـار بـێ ئومێـد وایـە بـاری ژیانـت لەبار بێو لە دوای سەرماو سوّڵی ژیانـت بـەهار بـێ ﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ ... ئەوسا خودا پاداشی ئەم دونیـاو چاکەو پاداشـتی ئـەو دنیـای پێـدان. (١٤٨) آل عمران ﴾.

---

١٠٥) وەڵامگـۆ.

١٠٦) پەشیمانی.

## بە قازانجی کـەس چاویان هـەڵنایێ

چاو چنۆکی ڤایرۆسێکە یەکێ پێی گرفتار بێ لە ئێسکانی ڕۆ دەچێو هەمولاشەی دادەڕزێنێ، هەر بۆیە ئەو وتەیە هەڵدراوە، دەڵێن: مرۆی چاوچنۆك قەت دڵی وچان نادا، چونکە گورگەو لە ناو پێستی مەڕێدا، خۆی وا حەشارداوە دوژمنـەو بـە دۆسـت ناسراوە. گوتراویـشە ئـای چاوچـنۆکی چـەند نـەبێرە[١٠٧] هـەتا خاوەنەکەشـی بـاز نـادا لەویەوە دەست پێ دەکا، تا دەی گوژێو لە ناوی دەبا.

من دڵ سۆزی خۆمو تۆشم بەر لە خەڵکی با بەسای چاوتێبڕیو ئێرەیی[١٠٨] نەبینـە خۆراکی خەمانو خوێنمان نەبێتە نۆشابی مەینەتیو پەتەران[١٠٩]با خـەو لـە چـاومان نەتۆریو خەڵکی تر پێی وەحەسێو پرخو هۆڕەی بێ.

مرۆی چاونزێر[١١٠] بە دەستی خۆی کورە دا دەگیرسێنێو خۆی تێدا هەڵدەقرچێنێ.

ژیانتاڵیو دەردەسەری دڵ پەستیو چەرمەسەری هەنوکە چەند دەردو پەتایـەکن ڕۆڵەی چاوچنۆکی لەمەوبەرن تاوەکو ئاسودەیی بن بڕ کەنو خۆشی ژیان لێڵو وێـڵ کەن.

مرۆیـی چاوبرسـی دەردی لەوەدایـە مـل ملانێـی بڕیـاری خـوا دەکـاو تۆمـەتی نایەکسانی دەداتە لای، لە ئاستی یاسا پـاكو پاراوەکەیـدا بێڕێـزی ئـەنوێنێ لەگەڵیـدا تێکهەڵدەچێ.

ئای لە دەردی چاوچنۆکی کـردو کۆشـی خاوەنەکـەی بـە بـا دەچـێ، چـەندە جێـی داخو خەفەتە ئەگەر خاوەنەکەشی داپلۆسێنێ هـەرزە پـوچو بـێ دەسـتمایە دەمێنـێ، هەر بەو جۆرە دەژیێ دەسوتێتو دەبرژێ تا مـەرگ یەخـەی دەگـرێ، یـا لـە هەرچی بەهرەو بەخششە بێ پشك دەبێ.

---

١٠٧) جیاوازی ناخاتە نێوان کەس.

١٠٨) چاوچنۆکی/حەسودی.

١٠٩) خەفەتان.

١١٠) چاوچنۆك.

هەمو کەسێ ئاشتەوایی لەگەڵ دەکرێ تەنیا چاوچنۆك نەبێ، ئەو تەنیا بەوە لێت دەبورێ وەکو داری بێ پەلکت لێ بێ‌و هەرچی بەهرەیە لێت داوەرێ، هەر ئاگاری پێی سەربەرزو ناسراوی هەر جوامێرێکت لێ ڕەچاو دەکرێ لە خۆی دابڕەوێنی، ئەگەر ئامادە بوی خۆت ئاوا شپرزەکەی پێ دەچێ بە نا بە دڵی ڕەزامەندی دەربڕێ، پەنا بە خوا لە چاوی چاوچنۆکان وەکو ڕەشەماری ژار پیس وان، داناحەجمێ تاکو کوڵی دڵی بە هەژارێکی بێ سوچ‌و تاوان نەڕێژێ.

دادو بێ داد ئاگادار بە لە چاوپیسی خۆ دور بگرەو پەنا بگرە بە خوا لە چاوی چاوپیسان چونکە هەمیشە بۆت لە سەنگەردان.

## ژیان وەکو خۆی بنرخێنە

سروشتی ژیان وایە خۆشیەکانیشی هەر تاڵن، بەربەستی زۆری لە ڕێیە، ڕێگای سەخت‌و دژوارە، بە زۆر ڕەنگ خۆی دەنوێنێ‌و، پڕ لە ئەشکەنجەو ئازارە، شڵەژاو ئاڵۆزە، تۆش بە شەکەتی لە ناو گێژاویدا دەخولێیەوە.

هەرچی دێتە بەرچاوت هەر لە باوکەوە تا خێزان، لە دۆستان‌و جوامێران، ماڵ‌و پیشەو گوزەران، دەبێ بەربەستێکیان لە ڕێدا هەبێ ژیانی پێ لێڵ‌و وێڵ بێ، دەی تۆش بە ئاوی ئەو ژیانە شەڕو گڕی بکوژێنەوەو، تۆڵە بە تۆڵە هەر زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە[111].

خوا ئەو جیهانەی وا هەڵخستوە دوشتی دژ بە یەك‌و دو جۆرو دو ڕەنگ‌و دو کۆمەڵ‌و دو بۆچون لە خۆ بگرێ، وەکو چاکەو خراپە، بنیات نان‌و ڕوخاندن، ئاسودەیی‌و دڵ پەستی، کەچی لە ڕۆژی سەڵادا هەرچی چاکەو بەختەوەریە دەپاڵێورێن‌و بەرەو بەهەشت دەبرێن وەلێ[112] هەرچی تێك دەری‌و دەردە سەریە بەرەو دۆزەخ بەرێ دەکرێن لە فەرمودەشدا هاتوە ((لدنیا ملعونة ملعون ما فیها الا

---

111) مەبەست ئەوەیە با خۆشی ناخۆشی بەرامبەر بن.

112) بەلام.

ذکر الله وما والاه و عالم و متعلم... دنیاو ئەوەی تیایەتی وەبەر نەفرەتی خوا ئەکەوێ تەنیا یادی خواو ئەوەی لەگەڵ یادی خوا تێك دەکاتەوەو زاناو ئەوەی خۆی فێردەکا، نەفرەت نایگرێتـەوە)). لەو بارودۆخـەی تێـی دای بگوزەرێو خـۆت مەخـە گێـژاوی خەیاڵانو لە جیهانی ئەفسانەدا سوڕ مەخۆوە، دونیا وەکو خۆی هەڵسەنگێنە، لەگەڵ کەشو هەوای دابرەخسێو، خۆی تێدا بحاوێنە، بـۆ هـیچ کـەس ناچـێتە سـەر خـەڵك لەگەڵی دا وەك گوڵی بێ گەرد بێو، هەمو کارو فەرمانێکی بێ دەردی سەر بێ.

سەد لەسەد هاوسەرێکی بێ هەڵەو پەڵەت دەست ناکـەوێ، لـە فەرمودەشـدا هـاتوە ((لا یفرك مؤمن مؤمنة ان کره منها خلقا رضي منها آخر... بـا هـیچ پیـاوێکی بـاوەڕدار لـە ئاسـتی هاوسـەرە بڕوادارەکەیـدا ڕقو کینـە نـەنوێنێ خـۆ ئەگـەر هەڵـسوکەوتی خراپی لێ بەدی بکا لە هەندێ شت ڕەزامەندی دەنوێنێ)).

جا پێویستە کە لەنو کۆیان بگـرینو لێـك نزیـك بـین، چاوپۆشو لێ بـوردە بـین، ئاسـانکاری هەڵبـژێرینو گرانبـاری هـەڵبوێرین، هەنـدێ جـار چـاو بنـوقێنینو هەنگاونانمان بوەستێنین، لە زۆر شتیشدا بێ ئاگایی بنوێنین.

## بە گیـرۆدەبوان دڵـت بدەوە

بە لای چەپو ڕاستدا لاکەوە[113] کێ دەبـینی مەگـەر گیرۆدە نـەبێ، کەسـت بەرچـاو دەکەوێ مەگەر کۆست کەوتونەبێ؟!

لە گشت ماڵێکدا شیوەنێ هەیە، لەسەر هەمو کوڵمەیێ فرمێسکێ قـەتیس مـاوە[114]، لە هەمو شیوێ دا "بنو سـعد" یێك هەیە[115].

بەڵاو مەینەتی چەندە زۆرن، ئارامگرتنیش چەندە زەوەنـدەن، تـۆ بـە تـەنیا بـەر بەلاّنی، بەڵکە مەینەتی تۆ لـە بەرابـەری جگـە لـە تـۆ هـەر کەمێکە چـەند کەسـانێ

---

١١٣) ئاوڕ دەوە.

١١٤) فرمێسکی ڕاوەستاوە.

١١٥) شیوی بەنی سعد بەو دۆڵاییە دەگوترێ کە لە شاری مەککەیـە کـاتی خـۆی پێغەمبـەرو یـارانی تێدا گەمارۆ درابون.

چەندان ساڵە لەسەر جێگا کەوتونو، بە دەست دەردەوە بێ حاڵن، جارە بە لای چەپو جارە بە لای ڕاستدا خۆ وەردەگێڕن، لە تاوان دەچریکێننو دەناڵن.

چەند کەس لە تاریکایی زیندانەکاندا ساڵانێکە ژیان بەسەر دەبەن ڕۆشنایی خۆریان نەبینیوەو تەنیاو تەنیا لە تاقو دیواری زیندانەکەیان ڕادەمێنن.

چەندین دایكو باوك ڕۆڵە جگەر گۆشەکەیان لەو پەڕی هەرەتی لاوێتیدا لە دەست دەدەن.

قەرزارو مەینەت بارو بەڵا بارو دەردەدار چەندە زۆرن تۆش کاتی ئەوەت هاتوە دڵت بەوانە بدەیتەوەو، دڵنیابی ئەو ژیانە بەندیخانەی باوەڕدارانە، جێگای پەژارەو جەوروخەمانە، کۆشكو تەلارەکان بە پڕاو پڕی دانیشتوانی بەیانی دەکەنەوەو بە چۆڵو هۆڵی ئێوارەیان بەسەر دادێ، یەکێ لەوپەڕی شەنگو هێزیدا، لەش ساغو بێ وەی، ماڵو مناڵ زۆر، کەچی لە پڕێ هەژاری بەرۆکی دەگرێ، یا دەردو بەڵا دێتە ڕێی، یا مەرگ دەبێتە مێوانی ژینی ﴿...وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ الْأَمْثَالَ ... تێش گەیشتن کە چیمان بەسەروان هێناو زۆر نەزیلەشمان[116] بۆ گوتون، ﴿٤٥﴾ إبراهيم﴾.

دەبێ خۆت واڕابێنی، لەسەر تاتە بەردێکی ڕەقو ڕوتیشبێ بگوزەرێنی، ئازارو مەینەتی ئەوانەی لە پێش تۆدا ڕابرانو ئەوانەی ئێستاش لە دەوروبەری تۆدا دەژین بێنە بەرچاوت تاوەکو بزانی تۆ بە ساخی قوتار بوی خەمی تۆ لە چاوی ئی وان هەر خەڵاتەو تەنیا سوکە دەردرێکە، بڵێ: سوپاس بۆ خوا کە سۆزو میهرەبانی لەگەڵ دانواندم، ستایشی ئەو بکە خۆ ئەگەر هەندێ نازو گۆزت لە دەستداوە هێشتا زۆرترت لاماوە.

سەرنجی گەورە خەمی خەڵکان بدەو خەمی خۆت بە چوك لە قەڵەم دە، گەر بتەوێ ئاهو حەسرەتت لە دڵ دەرکەی وەرە سەرگوزشتەی پڕ مەینەتی پێغەمبەری خوا بکە سەر مەشقی ڕێگای ژیانت، کاتێ لە ناو کڕنۆش بردنا هورگو ڕێخۆڵەیان

---

١١٦) نمونەمان بۆ هێناونەوە.

خستە سەر سەر، پێیەکانی لە خوێن هێنران، ڕوی پیرۆزی بە خوێنی گەشیو ئاڵی ڕەنگا، لە یەکێ لە دۆڵاییەکانی شاری مەککەدا گەمارۆ دراو ئەوەی بە زاران بخورێ لێی بێ بەش کرا تاوای لێ هات لە جیاتی نان گەڵای دارانی دەخوارد، بەوەش نەوەستان تا لە خاكو زێدی خۆی وەدەریان نا، دانی پیرۆزیان شکاند، هەرزە پوچو مایە پوتان[117] وتەی ناشایستە یان لە ئاستی هاوسەرە پاکەکەی دا فرتاند، حەفتا لە هاوەڵە شکۆدارەکانی شەهید کران، بە چاوی خۆی مەرگی کوڕە تاقانەکەیو زۆربەی کچەکانی بینی، بە ئەندازەیەکی وا برسێتی دیت بەردی لەسەر سگی پێچا، تۆمەتی شاعیرێتیو جادوگەریو سیحربازیو درۆزنی خرایە پاڵ، بەڵام بە کۆمەکی خوای باڵا دەست هەمو مرازو مەرامی گلاویان تەنیاو تەنیا وەکو بڵقی سەر ئاو نرخێنران، ئەوەی بەسەرەتۆش هاتوە بەلاییکەو دەبێ هەر بێ، لە بێژینگ دانەو پاداشتی هەرە گەورەی پێ وەبەردێ، سەربوردەی پڕ لە ئەشکەنجەی پێغەمبەران بخوێنەوە دەبینی پێغەمبەر زەکەریا کوژراوە، پێغەمبەر یەحیا سەربڕاوە، پێغەمبەر موسا هەڵوەدا[118] بوە، پێغەمبەر ئیبراهیم فڕێ درایە ناو ئاگر، پێشەواکانیشمان بە ڕێگای ئەواندا تێپەڕین، پێشەوا عومەر بە ناڕەوا خوێنی ڕژا، پێشەوا علی شەهید کرا، زانا پێشینەکان دارکاری کرانو، هەڵکەوتەو جوامێران زیندانی کرانو بە پەند بران ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ ... ئاخۆ ئێوە لاتان وایە (بە ئاسانی... دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا ئەوەی بەسەر پێشینانتان هاتوە، بەسەر ئێوە نەهاتوە ئەوان توشی گەلێ تەنگانەو ئازارو نەداریو چەوسانەوە بون، زۆر بە توندی تەکان دران، ﴿٢١٤﴾ البقرة ﴾.

---

117) هیچ و پوچان.

118) ئـاوارە.

## (وریای نوێژ بە..نوێژ)

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ...﴿١٥٣﴾ البقرة﴾ ئەگەر لە ترسان چ جێت پێ جێ نەبو، هەورو هۆڵی خەفەت باڵی بەسەر داکێشای، دەردو بەڵا یەخەی بەرنەدای، دەستبەجێ ڕابە دو ڕکات نوێژ بخوێنە، راستەوخۆ گیانو ڕۆحت دێنەوە، خۆو، ئارامی دات دەپۆشێ، بەیارمەتی خوا نوێژ دەردو بەڵا ڕیشەکێش دەکاو ڕەوێنەری تەمو مژی خەمانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دڵی پەست ببوایە دەیفەرمو (( أرِحْنا بالصلاة يا بلال... ئەی بلال بانگمان بۆ بدەو با بەهۆی نوێژ دڵ ئارام))، بین ئەو نوێژە بیلبیلەی چاوی بو، مایەی شادیو گوشادی بو، لاپەڕەی ژیانی کەسانێکی جوانمەردو دڵفراوانم خوێندۆتەوە کاتێ توشی مەرگەساتو کارەساتێ دەهاتن بە سایەی نوێژ کڵپەی ئەشکەنجەو ئازاریان دادەمرکاندەوە، ئینجا شەنگو وزەیان بۆ دەگەڕایەوەو ئومێدو ورە بەرزیان بە بەردا دەهاتەوە.

نوێژە ترسە[119] بە ئەرك دانراوە تاوەکو لە تەنگانەدا ئەنجام بدرێ، ئەو کاتەی شەڕ کڵپە دەسێنێو کاژەڵەی[120] سەران بە هەوا هەڵدەچێو لەگەڵ مەرگدا گیانبازێ دەکرێ، دیارە نوێژێکی مل کەچانە مایەی ئەوپەڕی ئاسودەییو هەداری دڵانە.

ئەوانەی بەهۆی نەخۆشیە دەرونیەکان هیواو ئومێدیان بە بادا چون بەر لە هەمورێگا چارەیێ پێویستە بەرەو مزگەوت ئاراستە بکرێنو ناوچاوانیان بۆ خوا لە ناو خۆڵدا بنیشێننو ڕەزامەندی خوا وەدەست بێنن، خۆیان لە چنکی ئەو سزایە دژوارە دەربێنن، ئەگینا دەبێ هەندە فرمێسکان هەڵرێژن تا پێلوی چاویان دەسوژێن[121]، هەندە ئاخان هەڵکێشن تا هەستو ناخیان دادەڕمێن، هیچ وزەیەکی واشیان لەبەردا نیە بەرەو هێمنو ئارامی دەستیان بگرێ تەنیا نوێژ کردن نەبێ.

---

١١٩) ئەو نوێژەیە تایبەتە بە حاڵەتی شەڕو ترسان لە دوژمن.

١٢٠) کەللەی سەران.

١٢١) دەسوتێن.

ئـەو پێـنج نوێـژەی لـە شـەووڕۆژێکدا ئـەنجام دەدرێـن گـەورەترین خـەڵاتی خـوان ئەگەر دەرگی پێ بکەین، ڕەشکەرەوەی تاوانن، بەرزکەرەوەی پلەوپایەن، چارەسەرێکی بێ وێنەی ناسۆریو ژانن، داودەرمانێکی سارێژکارن، باوەڕیو متمانە بەخشن.

بەڵام ئەوانەی لە مزگەوتو نوێژ دورەپەرێزن، جار لە دوای جار حاڵیان شلۆق تر دەبێو، خەمیان دێتە سەر خەمانو، بەدبەختو چارە ڕەش تر دەبن ﴿... فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ... بەشیان هەر نەگبەتی دەبێو کارەکانی لێ پوچ کردون ﴿٨﴾ محمد﴾ .

## بەســە خوا یاوەرمــان بێ

خۆدانە لای خواو پشت پێ بەستنی، باوەڕیو متمانە پێ کردنی، پێڕازیبونو، نـاو بە پاك ڕاگرتنی، ئومێدی دەست گیرۆییو سەرخستنی، گەورەترین بەروبومی باوەڕو دەست کەوتن، شکۆدارترینی ڕەوشتی بڕوادارانن.

ئـەو سـاتەی بەنـدە ئومێـدەوار بـێو ئاسـۆی ڕۆنـی لێ دیـار بـێو تاکـە پاڵپـشتی پـەروەردگار بـێ، هەسـت دەکـا خـوا بەسـەریەوە چـاوەدێرەو، لـە گـشت کـرداری ئاسانکارێتی، یاریدەدەرو، پشتوانێتی.

کاتێ ئیـبڕاهیم پێغەمبـەر ﷺ خرایـە ئـاگر پـەنای بـۆ خـوا بـرد فـەرموی: "خـوا بەسمانەو چاترین پشت گیرمانە" خـوای میهرەبـان تـینی ئـاگری بـۆ کـردە فێنکایی، پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ بـەخۆیو هـاوەڵانی بـە شـاڵاوی لەشـکرو سـوپای کـوفر ترسـێنران هانایـان بردەبـەر خـواو گوتیـان: ﴿...حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ... خودامان بێ بەسمانەو پشت پەنامان تەنیا ئەوە. هاوڕێ دەگەڵ نیعمەتو چاکەی خـوادا -بـێ ئـەوەی توشـی زیـان بـن- گەڕانـەوەو هـەڵوەدای ڕەزای خـودا بـون، هـەر خوداشە چاکەی گرنگی بە دەستە، ﴿١٧٤﴾ آل عمران﴾.

مرۆڤـی بـێ چـارە ئەوەنـدەی لەبارەنیـە شـان بداتـە بـەر ڕوداوانو، بەرگـەی مەینـەتیان بگـرێو، زۆرانبـازێ لەگـەڵ کارەسـاتاندا بکـات، چـونکە بـێ هێـزو لاواز

خولقێنراوە، تەنیا ئەو دەمە خۆی بە گوستاخ[١٢٢] و چاپوك[١٢٣] دەزانێ، پشتیوانیو پشت ئەستۆریو كۆمەكی هەر لە خواوە بزانێ، ئەگینا ئەو بەندە دەستە پاچەو هەژارە كێی لە پشتەو كێی لێ دیارە ئەگەر دەردو بەلا لە خۆی بگرنو خەمو خەفەت دەورەی بگرن ﴿...وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەیە، خۆتان بە خوا بسپێرن، ﴿٢٣﴾ المائدة﴾ المائدة/٢٣.

ئەی ئەو كەسەی دەتەوێ خۆت ئامۆژیاری خۆت بی، پشت بەو خوایە ببەستە كە بێ نیازەو[١٢٤] خاوەنی ئەوپەڕی هێزەو هەرە زاڵە، تاوەكو فریاڕەست[١٢٥] بێ لە هەمو ناخۆشیێ بە هانات وەبێ، با دروشمیشت ئەو دروشمە بێ ﴿...حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... خودامان بێ بەسمانەو چاكترین پشتو پەنامان تەنیا ئەوە. ﴿١٧٣﴾ آل عمران﴾.

ئەگەر هەژارو نەدار بوی، بێ دەرەتانو قەرزار بوی، بنجو بناوانی بژێویت دا چۆڕانو وشك بون، دەنگت هەڵبڕەو بڵێ ﴿...حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... خودامان بێ بەسمانەو چاكترین پشتو پەنامان هەر ئەوە﴾.

ئەگەر لە دوژمن ترسای، یا لەبەر ستەمكاریێ ڕاچڵەكای، لە داخی مەرگەساتێ تۆقای هاوار كەو بڵێ ﴿...حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... خودامان بێ بەسمانەو چاكترین پشتو پەنامانە﴾.

﴿... وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ... پەروەردیارت بۆ شارەزایی كردنو هاریكاری بەسی تۆیە، ﴿٣١﴾ الفرقان﴾.

---

١٢٢) ئازا.

١٢٣) لێ هاتو.

١٢٤) دەوڵەمەندە.

١٢٥) دادڕەس/ئەو كەسەیە بە هاواری كەسێكەوە بچێت.

## بەسەر زەویدا گەشت و گوزار کەن

لەوانەی گوشادی هێنن، خەم‌وپەژارە ڕەوێنن، گەشت‌وسەیرانە لە شارو لادێ، ڕێگا بڕینە لە چۆڵ‌و هەردێ، هەلگەڕان‌و داگەڕانە لە بەندەن[١٢٦] و نشێوان، ورد بونەوەیە لە پەڕتۆکی ئەو بونەوەرە بەرفرەدا، تاوەکو پێنوس دەسەلاتی خوات بەرچاو کەوێ کە لەسەر لاپەڕەکانی بون دا نیشانەو بەلگەی جوانی دەنوسێ، تاوەکو باخ‌و باخاتی دڵ ڕفێن‌و چیمەن زارو مێرگی ڕەنگاو ڕەنگ ببینی، لە مالی خۆت بە دەرکەوەو لە هەر چوار دەورت وردبەوە، بە کەژو کێواندا هەلگەڕێ، بە دۆڵاییاندا شۆڕ بەوە، بە قەدی درەختاندا سەرکەوە، تێر لە ئاوی زوڵاڵ‌و سازگار بنۆشە، بۆنی خۆشی گوڵان هەلمژە، ئەوسا هەست دەکەی گیانت بەرهەڵ‌و ئازادەو، وەکو باڵندەی دەم بە جریوە دەخولێتەوە لە بۆشایی ئاسمانی بەختەوەریدا، بە دەرکەوە، پەردەی ڕەشی بەرچاوت هەلمالە، پاشان ڕێگەو ڕێچکەکان بگرە بەر لەو زەمینە بەر فرەدا بە دەم یادو ستایشەوە بگوزەرێ.

ئەگەر ئامادەی لەو ژورە تەنگە بەرەدا خۆت مەلاسدەی[١٢٧] لەگەڵ ئەو کات بەتالیە کوشندەی ژیان بەسەربەی چاترین چارە ڕێگایە بۆ ئەوەی خۆت لەناوبەی، ئەو ژورەی تێی دای بریتی نیە لە هەموجیهان، نە تۆش بریتی لە هەموخەلك، کەوایە بۆچی ئەوەندە لە دەستی شالاوی دڵ پەستیدا چەپرەك‌و لەرزۆکی، دە هەستە بێدار بەوەو دەنگ هەلبڕە، چاو هەلێنەو گوێچکەو دلت بەکاربێنە ﴿ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ... سوك بار بن یان گرانبار بن، ڕێ دابگرن[١٢٨]، ﴿٤١﴾ التوبة﴾ التوبة/٤١.

دەوەرە لە ناو ئەم جۆم‌و جۆبارانەدا، لەو بیشەلانەو دارستانەدا، قورئان بخوێنەو با دەنگ‌و ئاوازت ئاوێتەی چریکەو دەنگی بولبولان بێ، کە گوتاری خۆشەویستی

---

١٢٦) هەوراز.

١٢٧) خۆت حەشار دەی.

١٢٨) ڕاپەڕن.

دەخوێننـەوە، بـا دەنگـت ئامێتـەی[129] خـۆڕەو هـاژەی ڕوبـار بـێ کـە سەرگوزەشـتەی داڕژانی لە بەرزاییەوە دەگێڕێتەوە.

بێگومان گەڕانو سوڕان بە شوێنەواری زەویدا تامو چێژێکی وای هەیـە پزیـشکان ئامۆژگاری کەسانێکی پـێ دەکـەن دڵ تونـدن، کـپو کـڵا[130] لـە تاریکـایی ژورەکەیانـدا داماون، ئـەی ئـەو کەسـەی بـەو شـێوە خـۆت حەشـارداوە ڕەگەڵمانکـەوەو بـا گەشـت کەین، با کەمێ دڵخۆش بینو وچان دەیـن وردبینـەوەو ئەندێشــەمان وەکارخـەین ﴿...وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ ... لـە سـازدانی ئـەم عاسمـانو زەمینـەش ڕادەمێـنن، دەڵـێن: ئـەی پەروەرنـدەمان! تـۆ ئـەم دەزگایەت بە فیڕۆ سازنەداوە، پاکیو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە، (١٩١) آل عمران ﴾.

## بە ئارامگـرتن خۆت بلاوێنــەوە

خـۆ خەملاّنـدن[131] بـە ئـارام گـرتن لـە خوڕەوشـتی ئـەو لێ هاتوانەیـە بـە دڵێکـی بەروەدەو[132] هەستێکی پۆلاّیینو بەرگرییێکی بەتینەوە لە ڕوی ناخۆشیاندا دەوەستن.

دەی کە منو تۆ ئارام گر نەبین چمان لە دەست دێ؟ هیچ دەرەتانو پـەنایێ هـیچ چارەو توێشوێ گومان دەبەی تەنیا ئارامگری لێ بترازێ؟.

گەورە پیاوی وا هەبوببوە شانۆیەك مەینەتیەکان پێ کۆڵـەیان لـێ دەکـردو، ببـوە گۆڕەپانـێ ئەشکەنجەکان پێـشبڕکێیان تێـدا دەکـرد، لـە دەسـت دەردێـك ڕزگـار دەبـو دەردێکی تر دەبوە مێوانی، بەلاّم ئەو ئارامگری دەکردە مەتاڵو، بە ئومێدو کۆمەکی خوا خۆی زرێ پۆش دەکرد.

---

١٢٩) ئاوێتەی/تێکەڵاوی.

١٣٠) بێ دەنگ و جودا.

١٣١) خۆ ڕازاندنەوە.

١٣٢) فراوان.

هەر ئەوە نەریتی ئەو مەردانەیە، ملـملانێی کارەساتان دەکەن‌و خەمان لە دڵ بەبا دەکەن.

کاتێ ئەبو بەکر ﷺ نەخۆش کەوت سەردانیان کرد، پێیان گوت: پزیشکێکت بۆ بانگ نەکەین؟ لە وەڵامدا گوتی: پزیشك منی بینیوە[١٣٣]. گوتیان: چی پێ گوتی؟ لە وەڵامدا گوتی: پێم دەڵێ: من هەرچی بمەوێ ئەنجامی دەدەم.

ئارام بگرەو ئارامگریت تەنیا بە خوایە، ئارام بگرە وەکو ئارامگرتنی کەسێ کەلی[١٣٤] ڕونی لێ دیارە، بۆ پاداشتی خوازیارە، ئارەزومەندی نەمانی تاوان‌و سوك بونی بارە، ئارام بگرە هەرچەندە مەرگەساتی ڕەشت لە پێش بێ، ئارام بگرە هەرچەندە ڕێ‌و بانی ژیانت تاریك بێ، چونکە سەرکەوتن لە دوای ئارامگرتنە، سەرفرازی لە دوای خەفەت خواردنە، لە دوای هەمودەردە سەرێی حەسانەوەو سرەوتنە.

سەربوردەی چەندین کەسایەتی هەڵکەوتەم خوێندۆتەوە کە بەو ژیانەدا ڕابڕاون لەبەر خۆگری‌و ئارامی وان هیدمە گرو سەرسام ماوم، کاتێ بەڵاو چورتم بەسەریاندا دەبارین هەروەکو بلێی دلۆپە بارانی فێنکی بەهارین، وەکو کەژو کێوان بون نەهەژان، وەکو حەق‌و ڕاستی بون دا دەسەپان، تەنیا ماوەیەکی کورتی پێ دەچو لە ناکاو وەکو خۆر ڕویان بەسەر کەلو ئاسۆکاندا دەدرەوشایەوە، بەیانی ئازادیان لێدا دەهات‌و سپێدەی[١٣٥] ڕزگاری‌و سەرکەوتنیان لێ هەڵدەهات. بگرە لەوەش زیاتر ئی وا هەبو وێڕای ئارامگرتنی زۆرانبازێی لەگەڵ خەماندا دەکردو بەرەو ڕوی دەردو بەڵایان هاواری دەکردو ئەو سەری مەیدانێ‌ی دەگرت.

---

١٣٣) مەبەستی لەو پزیشکە خوابو.

١٣٤) ئاسۆی.

١٣٥) بەرەبەیانی.

## ( گوێ زەوی بەسـەر، سـەرتەوە هەڵمەگرە )

کەسـانێ هـەن جـەنگێکی جیهـانی لـە دەرونیانـدا دەگـەڕێ، کەچـی لەسـەر پێخەفەکەیان پاڵ کەوتون، هەر کاتێ ئەو جەنگە دامرکا دەست کەوتەکانیان بریتین لە برینی گەدەو پاڵەپەستۆی خوێنو نەخۆشی شەکرە.

لەگەڵ ڕودانی ڕوداوێ هەڵدەقرچێن[١٣٦]، بـە گـران بـونی نـرخـی کـەلو پـەل مـرچو مۆنن، بە درەنگ بارینی باران دادوهاواریان لێ هەڵدەستێ، بە دابەزینی نرخی دراوان کێچیان دەکەونە کەولّی، هەمیشە لە ژیان بێزارن، بـێ ئـۆقرەو نیگـەرانن، ﴿ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ... هەرهەرایەك لە دژی خۆیان دەزانن ﴿٤﴾ المنافقون ﴾.

ئەو وتەی من لە گـوێ بگـرە، گـۆی زەوی بەسـەر سـەرتەوە هەڵمـەگرە، کارەسـاتو ڕوداوان بەلاوە نێو لە ناو هەناوانی مەنێ. جۆرە کەسانێ هەن دڵیان وەکو ئیسفەنج پڕوپاگەنـدە هەڵدەمـژێ، لـە مـشتێ ئـاو بـە مـەلـە دەکـەوێ، سـەبارەت بـە ڕوداوێ دەهەژێ، بەرگەی چوکترین ئازار ناگرێ، ئا ئەو دڵە بـەڵێنی دەرە، کـە خاوەنەکـەی داڕوخێنێو قەوارەی داتەپێنێ.

ئەوانـەی خـاوەنی ڕێـبیری ڕاسـتن بـە داخو کەسـەران هەڵناچـن، بەڵکە پەنـدی لێ وەردەگرنو باوەڕیو متمانەیان خەسـت تـر دەکـەن، ئەوانـەش کـە خـاوەنی نـاخێکی داڕماون بە ناخۆشـیان دەشـێوێنو پـتر لـە جـاری پێـشو دەتـۆقێن، ئەومنـدەی دڵێکـی بوێرو بێ پەروا[١٣٧] لە زریانو گەردەلولی مەرەگەساتدا لە هانات دێ، هیچ شـتێکی تـر ئەومنـدە دادت نـادا، جـا مـەردو ئـازا ئـەو کەسـەیە کـۆڵ نـادا، دەرونـاخی فراوانـەو هەستو نەستی ئاوەدانە، دڵنیایەو داسەپاوە، ئاسـودەیەو دڵ حەسـاوە، بـەلام مرۆڤـی بێ جەرگو نەوێر ڕۆژێ چەند جار خۆی دەکاتە قوربانی هەواڵی ناڕاسـتو خـەونو خەیاڵی نادروست.

---

١٣٦) دەسوتێن.

١٣٧) بێ ترس.

ئەگەر تـۆش خـۆش گوزەرانیـت گەرەکـە لـە ڕوی مەینەتیەکانتـدا بوەسـتەو پـشت هەڵ مەکە، با ئەوانەی لە ناو گێژاوی دڵاو دڵیدان[138] بە سوكو چروکت نەزانن، تۆش بە سایەی داوتەڵەی وان دڵ تونـد مەبـە، لـە ڕوی مەینـەتیو کلۆڵیدا وەکو چیا بـە مەلەخشێ، بە تەوژمی خەمان مەشڵەژێ، تونـدو تـۆڵ بـەو بـە گـەردەلولی پەتـەران لول مەدرێ، ئای چەندە جێی دڵ پـێ سـوتانو سـۆز بـۆ نوانـدنن! ئەوانـەی خـاوەنی دڵێکـی لاوازن بەروەسـتی هـیچ ناخۆشـییێکی ڕۆژگـار نایـەن ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ ... بێگومان دەیانبینی لە هەموکەس لە دنیادا بۆ ژیانێ تامـەزرۆترن ﴿٩٦﴾ البقرة ﴾.

بـەڵام ئەوانـەی دڵنـەوازو [139] گوشـادن، لـە لایـەن خـواوە هـاریکاری کـراون، پـشت ئەسـتورن بەو بەڵێنـــەی خـوا پێـی داون ﴿ ...فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ... سا ئۆقرەو دڵنیایی ناردە سەریان، ﴿١٨﴾ الفتح ﴾.

## بە شــتی کــەم بایەخ مــەڕوخێ

چەندین کەس کە خەمبارن ســەبارەت بـە شـتێکی بـێ هـەڕمێنو نەشــیاوە، کـە بەڵا بارن!!.

سەرنجی دو ڕوەکان بدە چەند ورە داتە پیو دڵسـت[140] و بەزیون.

ئا ئەوە گوتەو هەڵوێستیانە: ﴿ ...لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ... لـەم گەرمایـەدا دەرمەکـەون، ﴿٨١﴾ التوبـة ﴾. ﴿ ...ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ... ئیزنمـان بـدە بـا نەیـەین نـەوەك توشـی گوناهان بین، ﴿٤٩﴾ التوبة ﴾. ﴿ ...إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ ... کـەسمان لەسـەر ماڵـەکانمان دانـەناوە

---

١٣٨) دو دڵی.

١٣٩) دلگوشادی.

١٤٠) ترسنۆك.

ئاگـای لێ بـێ. ﴿١٣﴾ الأحـزاب ﴾.﴿ ...نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞ ... دەڵـێن: ئێمـە دەترسـین توشـی بـەڵا بـین، ﴿٥٢﴾ المائـدة ﴾. ﴿ ...مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ... ئـەو بەڵێنـەی خـوداو پێغەمبـەر دەیانـدا هـەر بـۆ فریـوی ئێمـە بـو. ئـای لـە ئـابڕوی تکاویـان لـە زەبونیو دەرونی داڕماویان! ﴿١٢﴾ الأحزاب ﴾.

ویستو خواستیان تەنیا تەژی[141] هورگەو، کۆشكو تەلارو باڵەخانەی بەرزە، جاریٚ چاویان بەرەو ئاسمانی سـەرەوەیان هـەڵنایێنن، لـەو هەموبـەهرەو بەخششانەی وەك ئەستێران درەخشانن[142] ڕانامێنن.

خەمی هەریەك لەوان پلەی هەرەژوری هۆشو بیریان: تـەنیا ئاژەڵەکانو، بـەرگـو پۆشاکی بەریانو ڕازاندنەوەی خوانیانە، دەبینی خەڵکانێکی زۆر لە بەیانی تا ئێـوارە تـەنیا لـەوە خەفـەت بـارن لەگـەڵ هاوسـەریان، یـا منـداڵیان، یـا خـزمو خۆیـشییان، ناڵـەبارن، یـا گـویٚ بیـستی وتەیـەکی ناهـەموارن، یـا لەبـەر نوانـدنی هەڵوێـستێکی ناشایستەیە بێزارن.

هەر ئەوە بەڵاو مەینەتی وانە، هیچ مەبەستو ئـاواتێکی باڵایـان نیـە خـۆی پێوە سەرقاڵ کەن، ئاشنای هیچ کردەوەیەکی بایەخدارو شکۆدار نین کاتی بـەتاڵی پـڕ پـڕ کەن، هەر بۆیە گوتویانە: ئەگـەر جامـێ ئـاوی لێ بـەتاڵ بـێ پـڕ لە هـەوا دەبـێ، دەی کەوایە بزانە ئەو کارەی پێیەوە سەرگەرمیو هەراسانی، ئـەو هەموهـەوڵو کۆشـشەی دەویٚ؟ چـونکە تـۆ بـیرو هـزرت خـوێنو گۆشـتت، کـاتو سـاتو سـرەوتنت، کردۆتـە قوربانی ئەو کارە، ئـەوە تێشکانو دۆڕانـی مامەڵەیـەو، بەرهەمەکـەی بـێ بایەخـەو، زیانیشی ڕونو دیارە، زانایانی دەرونناسیش دەڵێن: بۆ هـەمو شـتێ سنورێکی شـیاو دابنێ، لـەوەش ڕاسـتتر وتـەی خوایـە کـە دەفـەرموێ ﴿... قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ... دیارە خودا بۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە، ﴿٣﴾ الطلاق ﴾.

---

١٤١) پڕ کردنی.

١٤٢) تروسـکەدارن.

جا هەمو کردارو فەرمانێ بە پێی سەنگو بەهاو پلەو ڕێزی هەڵسەنگێنە، وریای زیادە ڕۆیی بەو سنوریش مەبەزێنە.

ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی لە ژێر دارەکەدا پەیمانو بەڵێنیان بە پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوەی بە بیریان دا دەهات تەنیا بەجێ هێنانی ئەو بەڵێنە بو، بە سای ئەوە ڕەزامەندی خوایان وەدەست هێنا، بەڵام پیاوێ کە هاوڕێیان بو، خەمی لە پێناو وشترەکەی دابو، بۆیە ئەو هەلە زێڕینەی لە دەست چو سەرەنجامی بێ بەشیو خەشمو ڤین بو.

تۆش شتی بێ بەها بەلاوە نێ خۆتی پێ سەرقاڵ مەکە هەست دەکەی زۆربەی خەفەتت لە کۆڵ دەبێتەوەو ئارامو بێ وەی سەر دەنێیتەوە.

## لە بەشی خوا پێداوت ڕەزامەندی بنوێنە لە گشت کەسێ زەنگین تری

هەندێ لە هۆکاری ئەو مەبەستە ڕابران، بەڵام بۆ بەرچاو ڕۆنی بە تێروتەسەلی لەوبارەوە دەدوێم: بێ سۆ[143] پێویستە ئەو بەشەی لە لایەن خواوە بوە بە خەڵاتت هەر لە شێوەی لەشو لارت، ماڵو منداڵو گوزەرانت، خانو بەرەو بەهرەکانت، ڕەزامەندی لێ بنوێنیو دڵ لە دڵ نەدەی، ئەوەش خوازراوی قورئانە کە دەفەرموێ ﴿...فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ الأعراف﴾، زۆربەی زانایانی پێشینیو زۆرەهای وەچەی یەکەم، گوزیرو[144] کەم دەرامەت بون، نە خاوەنی دارایی زۆرو، نە خانوبەرەی پان پۆڕو، نەپێڕۆو چارەوێی[145] جۆراو جۆرو، نە خاوەنی دەستو پێوەند بون، لەگەڵ ئەوەشدا نمونەی جوانکاری ژیان بون، خۆیانو مرۆڤایەتیان پێ بەختەوەر بون، چونکێ ئەو بەهرەو پشکەی خوا پێی بەخشیبون، لە جێگای خۆیدا بەکاریان دێنا.

---

١٤٣) بێگومان.

١٤٤) دەست کورت.

١٤٥) وەڵاخی سواری.

لـە بەرامبـەر ئـەو كۆمەڵـە نـاوازەدا كۆمـەڵێكی تـر هـەبون، خـوای گـەورە مـاڵو سامانێكی زۆرو نـازو گۆزێكی زەوەنـدی بەسـەردا ڕشـت بـون، بـەڵام لـە جیـاتی پێـی ئاسودە بن، پێی بەد بەختو چارەڕەش بون، چونكێ خۆیان لە یاسای پاكو پـاراوی خـواو سروشـتی خۆڕسـكیان هـەلبوارد بـو، ئـەوەش باشـترین بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی دەرامەتو سامانداری هەموكەلەبەری ژیان پڕ ناكاتەوە، سەرەنجدە كەسانێ هـەڵگری چەندین بڕوانامەی جیهانین، كەچی لە بەهرەو زانـستو پلـەو پایەیانـدا بـێ گـرێو گـاڵ نـین، ئەگـەر چـی كەسانێكی تـر هـەن خـاوەنی زانـستێكی سـنوردارن، بـەڵام بـە سایەی ئەوەی لێی سود مەندو بەهرەمەندن بە باشی ڕەنێویان هێنـاوە، لـەو زانـستە كەمە ڕوبارێكی بە تەوژمی لێ هەڵقوڵاوە.

ئەگەر بەختەوەریت گەرەك بێ قایل بە بەو شـێوەی خـوا تـۆی تێـدا نەخـشاندوە، ڕەزامەندی بنوێنە لە دەنگـو ڕەنگـو هۆشو بیرت، لەو حـاڵو گوزەرانـەی خـوا تـۆی تێدا ڕەخساندوە، بەڵكە هەنـدێ لـە پـەروەردەكارو دنیـا بـە كـەم گـران، لـەوە دورتـر سەرنجیان داوە پێت دەڵێن: قایل بە بە كەمترو نزمتر لەوەی خوا پێی داوی.

فـەرمو ئـەوە لیـستێكی سـەر سـوڕمێن پـڕە لەوانـەی بـەهۆی هەڵوێـستی جوامێرانـەیانو دنیـا بـە كـەم سـەیر كردنیـان دەتروسـكێن: (عـەتائی...ی كـوڕی (ڕەباح...یەكێ بو لە هەرە زانا بـا نـاو بانگـەكانی چـاخی خۆیـدا كەچی كۆیلەیـەكی ڕەشی نا بەرچاو بو لە ڕواڵەتدا.

(ئەحنـەف)ی كـوڕی (قـەیس) بـە نـەرمو نیـانو لەسـەرخۆی هەموعـەرەب نـاوی دەركرد بو، كەچی لە ڕواڵەتدا كەسێكی كزو لاوازو بە لەباریكە بو[١٤٦].

یەكێكی تر لە كۆیلەكان بە ناوی (ئەعمەش) فەرمودە ناسێكی نـاوداری دونیـا بـو، كەچی كەسێكی چاو كزو دەست كورتو جل شڕو نابەرچاو بو.

بەڵكە پێغەمبەرانی شكۆدار ﷺ هەمویان مەڕو ماڵاتیان لەوەڕانـدوەو شـوانەتیان كـردوە، بەهـەمان شـێوە پێغەمبـەر داود ئاسـن گـەری كـردوەو زەكـەریان دارتاشـی كردوەو پێغەمبەر ادریس بەرگ دوری كردوە، كەچی ئەوان سەردەستەو هەڵبژاردەی مرۆڤایەتی بون.

---

١٤٦) ڕەق و باریكە بو.

کەواتە نرخو سەنگی تۆ لە بەهرەو کردە چاکەکانتداو لە سودمەندیو ڕەوشتی بەرزتدا وەدی دەکریٚ، بەهۆی لەدەستدانی جوانی یان زیانێکی گیانی یا سامانی مەرِنجیٚ، ڕەزامەندی بنوێنە لەو پشکەی لە لایەن خواوە بڕیاری لەسەر دەدریٚ ﴿ ...نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ... ئێمە بژێوی ئەوانمان لەسەر دنیا بۆ بەش کردون، (٣٢) الزخرف ﴾.

## ( ئەو بەهەشتە وەیادخەوە پانتاییەکەی بارتەقای ئاسمانەکانو زەویە )

ئەگەر لە ژیانی ئەو دنیایەدا ڕوتو ڕەجاڵ بوی، یا دڵ پەستو بەربەڵا بوی، یا لە مافی ڕەوای خۆت بێ بەش بوی، بە ستەمی ستەمکارێکە وە گرفتار بوی، خۆشیو شادی بەهەشتێکی بێ وێنە وەیاد خەوە، جا ئەگەر ئەو بیرو باوەڕەت لە دڵدا بسەپیٚو کردو کۆشت بۆ ئەو سەرەنجامە بیٚ، زیانباریشت بەرەو قازانجو دەرامەت وەردەچەرخیٚ، کلۆڵیو کارە ڕەهات[١٤٧] دەبنە بەخششو خەڵات.

ژیریارترین کەس ئەوانەن هەوڵو ڕەنجیان بۆ دوا ڕۆژە، چونکە دوا ڕۆژ نەبڕاوەیەو پتر جێگای ئومێدە، گەلۆر[١٤٨]ترین کەسیش ئەوانەن لایان وایە دنیا جێی پشودانی یەکجارەکیو ئاسودەیی هەمیشەییەو بەوپەڕی خۆزگەو خواستیان شاد دەبن، بەڵام لە کاتی توشهاتنی کارەساتدا بیٚ زاڵە[١٤٩]ترین مرۆڤن، لە مەینەتیو کزوریدا[١٥٠] ژێوانی[١٥١] دەیانگریٚو پەنجەی پەشیمانی دەگەزن.

١٤٧) پەرێشانی.
١٤٨) بیٚ کەڵك/گێل.
١٤٩) ترسەنۆك.
١٥٠) پێویستیدا.
١٥١) پەشیمانی.

لەبەرئەوەی دەستخەڕۆی ئەم ژیانە بێ ڕەواجەن، تێڕوانین‌و بیری کورتیـان تـەنیا لەو دنیایە بێ بنجەدا[152] کاری گەرە، هەوڵ‌و ڕەنجیان تەنیا بۆ ئەو ژیانـە دوابڕاوەیـە، ئـەوان نایانـەوێ ژیـانی دنیایـان لـێخن بـێ، ئەگـەر بـێ‌و ئـەوان توێـژی[153] سـەر دڵیـان ڕامـاڵن، پـەردەی ڕەشـی بەرچـاویان هـەڵماڵن، چـاودڵیان دەکرێنـەوەو، نـازو نـۆزی بەهەشـت‌و کۆشـك‌و تـەلارەکانی وەبیـر خۆیـان دێننـەوەو، گـوێ قـوڵاخی نیگـای خـوا دەبن کە دەربارەی باس‌و خواسی ئەو بەهەشتە دەدوێ، جا سوێند بە خـوا هـەر ئـەو دوا ڕۆژەیە شیاوی ئەو هەوڵ بۆدانەو ڕەنجەیە.

ئایا بە بیرو هزرێکی قوڵەوە بیرمان لە بـاس‌و خواسـی بەهەشـتیان کردۆتـەوە کـە نە دەردە سەری‌و خەفەتباری دەیان گرێ‌و، نە مەرگ بـەرۆکیان لێ دەگـرێ، هەمیـشە هەر گەنج‌و لاون، بەرگ‌و پۆشاك دانەڕزاون، لە خانوبەرەی وادا ژیـان بەسـەر دەبـەن دەروژوریان لە یەك دیارن، شتی وای تێدا ڕەخساوە بـە هـیچ چـاوێ نـەبینراوەو بـە هیچ گویچکەیێ نەبیستراوەو بەسەر دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا ڕانەبراوە، ئەگـەر سـوارێ لە ژێر یەکێ لە درەختەکانی سەد ساڵ بڕوا ئەو ڕێگایـەی پـێ نـابڕێ، چادری وای لێ هەڵـدراوە درێـژی سـەد میلـی تـەواوە، ڕوباراوەکـانی هەمیـشە بـە خـوڕ دادەڕژێـن، کۆشکەکانی باڵا بەرزن‌و دەدرەوشێن، هەڵچنینی میـوەی ئاسـانە، کارێزو کانیاوەکـانی هەمیشە هەڵقوڵاون، تـەخت‌و تـاراجی بـەرزن، لێـوان‌و پـەرداخی بـۆ پـێ خواردنـەوە ئامادە کراون، سەرینەکانی بۆ پاڵکـەوتن ڕیز کـراون، ڕایەخـەکانی ڕاخـراون، ببـڕای ببـڕ[154] ئاسودەیی نەبڕاوەیە، نازو گۆزی بەرفرەیـــە، بـۆنی خۆشـی بەروەدەیـە[155]، بـە زمان باسی لـێ وەناکرێ، هەرچی ئاوات‌و خۆزگەیە لەوێندەردا وەدەست دێ، بـۆ کـام لاچوە هۆش‌و بیرمان بۆ بە لای ئەو باسەدا ناچێ؟! جا بۆچی ئەو بـاس‌و خواسـەمان لەیاد چێ؟!

ئەگەر سەرەنجامامان بۆ ئـەو دوا ڕۆژە بـێ، دەبـا بـەرە بـەڵاو مەینـەت بـاران بـاری خەمیان لەسەر سوك بێ، با دڵیان شادو چاویان ڕۆن بێ.

---

152) بێ بناغە.

153) توێکلی.

154) تا هەتایە.

155) بەربڵاوە.

ئەی ئەوانەی بەهۆی هەژاریەوە دڵشكاون، بە سای نەداریەوە دڵڕەنجاون، بە دەست دەردەوە حەپەساون، هەوڵ دەن لەو ژیانەدا تۆوی چاكەی بچێنن، تاوەكو لە بەهەشتی خوادا -پاكیو شكۆداری بۆ ئەو- داهاتو بەرهەمەكەی بدورنەوەو لە ئارامگەی ئەودا خۆوە حەسێنن ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ... هەر لە سای هێمنی دا بن، چونكە ئێوە خۆڕاگر بون، پیرۆزتان بێ دوا ڕۆژی ڕون، ﴿٢٤﴾ الرعد ﴾.

## ئێمە بە نەتەوەیەكی مام ناوەندی خوڵقاوین[156]

یەكسانی خوازراوێكی ژیریەو بە پێی یاسای خوا پەسندە، جا پێویستە نە زیادەڕۆیی نە سنور بەزێنی، نە قرچۆكی و[157] نە دەست بلاَوی، بەڵكە مام ناوەجێتی بنوێنین، هەر كەسێكیش مرازی[158] بەختەوەری بێ، دەبێ بەسەر هەستو سۆزیدا زاڵ بێ، هاوسەنگی لە نێوانی هەڵچونو داچونیدا ڕابگرێ، لە شینو لە شاییدا دانی بە خۆدا بگرێ، چونكە زیاد پێ ڕاكێشان لە بەرێ خۆتو هەڵچون لەگەڵ ڕوداوان ستەمێكە دەرحەق بە گیانو دەرونت ئەنجامی دەدەی، سەیر كە ژیان بە یەكسانیو هاوسەنگی چەند جوانو ڕازاوەیە، بێگومان یاسای خوا بە یەكسانی دابەزیوەو ژیانیش لەسەر دادوەری ڕەخسیوە،ماندوشەكەت ترین كەسیش ئەو كەسەیە بەندەی هەواو هەوەسێتیو دەستەمۆی هەستو خواستێتی، لەو كاتو ساتەدا ڕوداوەكانی لە لا گەورە دەبێو هەر چوار چێوەی ژیانی دەبێتە تاریكایی ئەنگوستە چاو، لە ناو دەرونیدا شەڕێكی دەستەویەخەی كینەو ڕقە بەری پیادە دەكرێ، لەبەرئەوەی لەناو خەونو خەیاڵدا ژیانی بەهەدەر دەدا، هەتاوەكو ئی وایان هەیە بە ئەندازەیەكی وا بیر دەكاتەوە پێی وایە هەموخەڵك نەیارێتیو، شەوو ڕۆژێ پیلانی لە دژ دەگێڕنو هەموجیهان بۆی لە سەنگەردا، هەر لەبەر ئەوەیە لەناو تەمومژێكی ڕەشو گێژەی[159] خەمو خەفەتو پەژارەدا ژیان بەسەردەبا.

---

١٥٦) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا ﴿١٤٣﴾ البقرة ﴾.

١٥٧) ڕەزیلی.

١٥٨) مەبەستی.

١٥٩) گێژەلۆك/گێژاوی.

شێواندنو شڵەژاندن ئەگەر چی بە پێی سروشتی مرۆڤ کارێکی ئاسانە بەڵام بە پێی یاسای خوا یاساخەو،[١٦٠] تەنیا کەسانێکی بێ سەرمایە لە خوونەریتی بەرزو بنەما خواییەکان پیادەی دەکەن ﴿يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ ... هەر هەرایەك لە دژی خۆیان دەزانن. ئەو دوژمنن، ﴿٤﴾ المنافقون﴾.

با دڵت لە شوێنی خۆی ئۆقرە بگرێ، زۆربەی ئەو مەترسیانەی چاوەڕێ دەکرێن نایێنە جێ، دەشێ بەر لە ڕودانی ئەو مەترسیەی چاوەڕێی دەکەی، پێشبینی خراپترینی بواری نالەباری بۆ بکەی، پاشان خۆت ناچارکەی کە باوەڕکەی، لەو ساتەدا سەرت لەو گێژاوە شومانە دەردەچێ کە دڵ هەپڕون بە هەپڕون دەکەنو هێشتاش ڕوداوەکە هەر لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوەو ڕوی نەداوە.

ئەی کەسی ژیریارو هۆشمەند هەموشتێ بە قەبارەی خۆی هەڵسەنگێنەو بارودۆخو گرفتەکان لە خۆیان گەورەتر مەکە، بەڵکە مام ناوەنجیو بە ویژدان بە سنورت مەبەزێنەو، خۆت لەگەڵ گومانو خەیاڵدا مەڕەوێنە، بە دوای تراویلکەی ١٦١ هەڵخەڵەتێنەردا مەگەڕێ، گوێ بگرە لەو هاوسەنگیەی نێوانی ڕقەبەریو خۆشەویستی لەو فەرمودەیەدا ((احبب حبيبك هونا ما، فعسى ان يكون بغيضك يوماً ما، وابغض بغيضك هوناً ما، فعسى ان يكون حبيبك يوما ما... با ئاستی خۆشەویستیت بەرامبەر خۆشەویستەکەت سنوردار بێ، چونکە دەشێ ڕۆژێ دابێ ببێتە ناحەزت، ڕقت لە ئاستی نەیارتدا سنوردار بێ دەشێ ڕۆژێ ببێتە خۆشەویستت)) ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجۡعَلَ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ عَادَيۡتُم مِّنۡهُم مَّوَدَّةٗۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٞۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ... شایەد خودا لەناو ئێوەو ئەو کەسانەی دوژمنایەتیو دەکردن، دۆستایەتی دامەزرێنێ. خوا توانایەو خوا دەبورێو دلۆڤانە، ﴿٧﴾ الممتحنة﴾. دڵنیابە زۆرێك لە هەواڵی مەترسیدارو پڕوپاگەندەی نابەجێ ناگاتە جێ.

---

١٦٠) قەدەغەیە.

١٦١) سەراب/بەو شوێنە دەگوترێ دور بە دور لە بیاباندا بتریسکێ وابزانن ئاوە بەڵام هەونەبێ.

## ( خەمو پەژارە نە سـودمەندە، نە بە پێی یاسای خوا پەسندە )

خوای بێ هاوتا لە چەندین جێگا خـەمو خەفـەت یاسـاخ دەکا دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ ... با سـستی ڕوتـان تـێنـەکاو خەمیـش مـەخۆن، ﴿١٣٩﴾ آل عمران﴾.

﴿... وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ ... خەميان مەخۆ، ﴿١٢٧﴾ النحل﴾.

بە هەمـان شـێوە بـە دوری دەگـرێ لـە دۆسـتانی خـۆی ڕوبـدا، دەفـەرموێ: ﴿...فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ... نـە هـيـچ ترسـيان لەسـەر هەيـەو نـە خـەم دەخۆن، ﴿٦٩﴾ المائدة﴾.

کلۆڵی مایەی خامۆش کردنی کڵپەی خوازیاریەو، کپ کردنی گیـانی بـەر خـودانو ورە بەرزیە، مایەی پەشۆکانو خەم ساردیە، پەتایێکە جەستەو پێکهاتـەی ژیـان لـە پەلو پۆ دەخات.

نهێنی ئەو دیاردەیە ئەوەیە: خەمۆکی لێت ناگـەڕێ بـەرەو پـێش هـەنگاو هـەڵێنی بەڵکە ڕێت پێ دەگرێو دەتوەستێنێ، بارو کەسەری سـەر دڵانـەو خۆشەویـست تـرین کردەی شەیتانە: تاوەکو بەندە دڵگێش[١٦٢] بکـاو لـە ڕێـڕەوی ژیانیـدا بیپـچڕێنێو بـی کەوێنێ، خوای کردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ... سـرتە[١٦٣] لە شەیتانەوەیە، هەتا خاوەن باوەڕانی پێ خەمگین کا، ﴿١٠﴾ المجادلة﴾.

هەروا پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە نێوان سێ کەسدا دویان بە سـرتە بدوێنو ئەوی تریش فەرامۆش کەن، چونکێ پێی دەڕەنجێ.

دڵڕەنجاندنی برواداریش شـیاوی ئـەوە نیـە بخـوازرێو کەسـیش لـە پێناویـدا هـان بدرێ، لەبەر ئەمە دەردو ئازارێکە دەرونی پێ گرفتار دەبێ، هەر سەبارەت بـە مەیـە لـە موسـڵمان دەخواسـترێ ئـەم خەمۆکیـە تـوڕداو[١٦٤] ڕامـی ژێـر دەسـتی نـەبێ، بەڵکـە

---

١٦٢) دڵگیـر.

١٦٣) قسەی بە ئەسپایی .

١٦٤) فڕێ دا.

بەرەنگاری ئەم دیاردەیە ببێتەوەو هەرچی هۆکاری پەسندە دەستەبەری کاو خەفەتباری پێ قەلاَ چۆ کاو هەلَوەدری کا.

هەر لەم پێناوەدا کە خەم نەخوازراوەو، نە ویستراوەو، ڕەچاوی دەستکەوتو بەهرەی لێ نەکراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لێ پەناداوە، دەفەرموێ: ((اللّهم إني اعوذ بك من الهم والحزن... خوایە پەنات پێ دەگرم لە خەمو پەژارە)).

وشەی "الحزن" لەگەلّ وشەی "الهم" دا هاو واتان تەنیا لەوەدا جیاوازن، ئەگەر خەمو پەژارە لە پێناوی داهاتودا بێ ئەوە بە وشەی "الهم" ناوزەد دەکرێ، بەلاَم کە لە پێناوی ڕابردودا بێ بە وشەی "الحزن" ناوی دەبرێ، کەچی هەردوکیان ڤایرۆسی وزەی دلّن لەبەرەو پێش چونیدا ڕێی پێ دەگرن، سەرکوت کاری ئارەزوو نیازن.

هەرچیەك بێ خەم تێك دانی گوزەرانو تالّ کردنی ژیانە، زرینچکاوی[١٦٥] ژەهراوی گیانە، هۆکاری ڕەنجەڕۆیی‌و شلەژانە، ئەو کەسەی گیرۆدەی ئەم دەردە بێ هەمیشە دلّ پەستو ماتو لێو بەبارە، لە کاتی بینینی شتی سەرنج ڕاکێش‌و دلّ ڕفێن دا لە بری ئەوەی شادو گەش بێ، بەسەر ڕودا دەکەوێ‌و، وەك بلّقی سەر ئاو دەپوکێ، ناچار لێوانێك لە بێولّەتی[١٦٦] و داخ‌و خەفەت دەنوشێ.

بەلاَم با ئەوەمان لە یاد نەچێ سروشتی ژیان وایە خەم‌و خەفەت هەردەبێ، هەر لەبەر ئەمەیە بەهەشتیەکان لە کاتی چونە بەهەشتدا دەلّێن: (( الحمد لله الذي اذهب عنّا الحزن)).

ئەوە وا دەگەیەنێ ئەوان لە ژیانی دونیادا بە بێ خەم سەریان نەنایەوە، هەروەکو بێ بەش نەبون لەو دەردەسەری‌و چەرمە سەریەی، کە بێ دەستی وان هاتە سەریان، جا ئەگەر بە ناچاری بە بێ دەستی خاوەنەکەی خەم‌و خەفەت دا ببارێ بێ ئەوەی دەست کێشی بێ‌و ڕێ خۆشکاری بێ، بەلّکە پاداشتیشی لەسەر وەردەگرێ، چونکە ئەوەش جۆرێکە لەو بەلاَ باریەی بە سەر بەندەدا دێ، جا پێویستە هەر کاتێ بەندە دلّی پەنگ‌و پەست بێ، نزاو تکای دلّ سرەوێن‌و هۆکاری زیندوی خەم ڕەوێن بە دەست بێنێ.

---

١٦٥) زەرداوی.

١٦٦) بەدبەختی.

بەڵام سـەبارەت بەو فەرمودەیـەی خوا: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّواْ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ... هـیچ گلـەییش لەوانــە نــاکرێ، کـە هاتنــە لات هـەڵیانگری‌و گوتـت: چوارپێی[١٦٧] وام نیە چونکە هیچی وایان نەبو بەختی بکەن، ﴿٩٢﴾ التوبة﴾.

ئـەوەی لـەو فەرمودەیـە دەفامرێتـەوە ئەوەیـە ئـەو باوەڕدارانـە لەمـەڕ خەفـەت باریـەوە سـتایش نـەکراون، تـەنیا لەبـەر ئـەوەی پێیانـدا هـەڵگوتراوە، سـەبارەت بـە هەژاری‌و نەداری لە پێغەمبەری خـوا ﷺ دواکەوتن‌و، باوەڕیـشیان تونـدو تـۆڵ بـو. هـەروەها ئامـاژەی تانـەو تەشـەر لێدانـە لـەو دو ڕوانـەی بـەهۆی دواکـەوتنیان لـە پێغەمبەری خوا: هەر خۆیان لە گورە نـەبرد[١٦٨] ، بـەڵکو لایـان وابـو هـەر خـوا خـەنی کردونی. گریمان خەمباری ئەگەر ڕویدا -کارێکی پەسندیش بێ، ئـەو شـێوەیانە، بـە سای لە دەست چونی نواندنی بەندایەتی، یـا تـوش هـاتنی تاوانێـك بـێ، بێگومـان دڵ پەسـتی بەنـدە لـە پێنـاو سـستی نوانـدن‌و کـەم تەرخـەمی کردنـی لـە ئاسـتی پەروەردیاریـدا، نیـشانەو بەڵگەیـە لەسـەر هـەبونی دڵێکـی زینـدوو، پـێ ڕازی بـە ڕێنمایی‌و ڕۆشنایی خودایی.

هەروەها ئەو فەرمودە نەستەقەی پێغەمبەری خوا ﷺ : ((ما یصیب المـؤمن مـن هم ولا نصب ولا حزن الا كفّر الله به من خطایاه... بڕوادار توشی هـەر خـەم‌و پـەژارەیێ، هـەر شـەکەتی‌و دەردەسـەرییێ ببـێ بـێ سـۆ خـوا تـاوانی پـێ ڕەش دەکاتـەوە)) ئـەوە بەڵگەو نیشانەی ئەوەیە خەم‌و خەفەت، بـەڵاو کۆسـتێکە لـە لایـەن خـواوە، بەنـدەی پێ تاقی دەکاتەوەو تـاوانی پـێ ڕەش دەکاتـەوە، ئـەوە ناگەیـەنێ خەفـەت پلـەو پایـە بێ‌و، گەرەك بێ بەندە هەوڵی بۆ بداو لە خۆیدا بێنێتە دی، جا کـەی ڕەوایـە بەنـدە بۆ خەم تێ بکۆشێ‌و لە پێناویدا بخرۆشێ، کەچی وا گومان با لە پێناوی بەندایەتیدا دەجۆشێ، یا لای وابێ لە لایـەن خـواوە فـەرمانی پیـا درابـێ، یـا خـوا پێـی ڕازی بـێ‌و خەڵکی لە پێناودا هەڵنابێ، ئەگەر ئەوە ڕاسـت‌و ڕەوا بـێ، ئـەوا دەبوایـە پێغەمبـەری

---

١٦٧) چوار پێ/ وەڵاخی سواری.

١٦٨) هەر خۆیان سڵ نەکرد.

خوا ﷺ بەهۆی کلۆڵیو مەینەتی ژیانی تارو مار بێ، جا چۆن دەشێ ئـەوە شـیاوی پێغەمبەرێك بێ سینەی بە ڕۆناهی خوا ئاوەڵـە بێ [١٦٩]؟!

وەلێ [١٧٠] ئەو فەرمودەیەی هیندی کچی هالـە کـە دەربـارەی ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـواوە دەدوێ: ((انه کان متواصـل الاحـزاب... پێغەمبـەری خـوا بـەردەوام دڵ پەسـت بوە))، ئەوە فەرمودەیـەکی نـاجێگیرەو، لـە پاڵدانـە لای پێغەمبـەری خـوادا یـەکێ لـە گێڕەوەکانی کەسێکی نەناسـراوە، لەگـەڵ ئەمەشـدا پێچەوانەی ڕەوشـتی پێغەمبـەری خوایە ﷺ.

جا چۆن ئەو پێغەمبەرە بەردەوام ماتو خەمبارە، لە کاتێکا خوداوەنـدی دۆسـتو یـارەو، لـە داخـداری بـونی بـەو دنیایـەو هۆکاریـشی پاراسـتوە، هـەتا لـەداخی بێبـاوەڕانیش خـودا ڕێـی خـەمباری پـێ نـەداوەو، هەرچـی تـاوانی ڕابـردوو داهـاتوە لێبوردنی لێکراوە؟! لە کوێوە ڕێی تێدەچێ خەمناكو خاکە سار بێ؟! لە کام لاوە کام ڕێگاوە ڕێ بە مەینەتی دراوە بچێتە دڵی پێغەمبـەری خـواوە؟! کەچـی ئـەو دڵـە بـە یادی خوا ئاوەدانەو، بە خۆراگریو داسەپاوی تێراوە، بە ڕێنوێنی خوا پڕ کـراوە، بـە بەڵێنی ئەو ئاسودەیەو حەساوەیە، لـە هەرچـی فـەرمانو یاسـای خوایـە ڕەزامەنـدی نیشان داوە؟! بەڵکە ڕو بە موژدەو دەم بە خەنـدە بـوە، هـەروەکو دەربـارەی ڕەوشـتی پیرۆزی هاتوە، درودو سڵاوی خوای لەسەر - کە هیچ گاە [١٧١] ڕوگرژیو مۆنی لێ بـەدی نەکراوە.

هەر کەسێکیش لـە ژیـانو گـوزەران ئـەو پێغەمبـەرەدا قـوڵ بێتـەوەو ورد بێتـەوە تێدەگا پێغەمبەری خوا بۆ ئەوە هاتوە ناڕەوایی بڕەوێنـێو نیگـەرانیو داخو کەسـەر بتارێنێ، دەرو دەرونی خەڵکان لە ژێر چەپۆکی گومانو دڵاو دڵیو هاوبەشـی دانـانو خەمباریو تەمباری دا دەربێنێ، بۆ ئەوە هاتوە بە فریای ئـەو گیـانو ڕۆحانـە بگـات کە لەسەر لێواری تیاچونو هەڵدێرانن، ئای ئەو پێغەمبەرە چەندە شایستەی ئەوەیە مرۆڤایەتی چاوشۆڕو منەت باری بێ!

---

١٦٩) گوشاد بێ.

١٧٠) بەڵام.

١٧١) هیچ کات.

ئەو گوتەیەش ((ان الله يحب كل قلب حزين... خوا هەمو دلێکی پەستی لا خۆشەویستە))، گوایە لە پێغەمبەری خواوە بیستراوە، بەلام ڕاستو دروستی بە هیچ جۆرێ نەزانراوە.

چۆن دەکرێ ئەو گوتەیە بێ هەلە بێ، کەچی بەرنامەو پەیرەوی خوا بە پێچەوانەی ئەو وتەیە دابەزیوەو، بۆ ئەوە ڕەخسیوە خەمان لە بنچینەوە هەلوەشێنێ؟!

گریمان [١٧٢] ئەگەر فەرمودەیەکی ڕاستو دروستیش بێ: وا ڕاڤە دەکرێ [١٧٣] پەژارە کۆستێکە لەو کۆستانەی خوا بەندەی خۆی پێ هەلدەسەنگێنێ، جا ئەگەر بەندە ئارامگرو خۆڕاگر بێ، ئەوا خوا ئارامگری بەندەی خۆی پێ خۆشە لەسەر تاقیکردنەوەی.

بە هەلەدا چون ئەوانەی ستایشی خەمباری دەکەنو بە شانو بالی هەلدەلێنو وا دەزانن بە پێی بەرنامەی خوا فەرمانی پێ کراوەو پەسند کراوە، وە لێ لەم ئایینەدا تەنیا یاساخ کراوەو فەرمانی لە دژ دراوە، کە خەلکان بە میهرو سۆزی خوای بێ هاوتا دلیان شاد بێ، بە هەمان شێوە بەو پەیامە پڕ پیتو فەڕەی لە ئاسمانەوە بەسەر دلی پاکی دۆستانی خوادا داباریوە گەشاوە بنو خەمیان لە دل دا بەرباد بێ.

هەوالێکی تریش بە زمانی پێغەمبەرەوە دراوە (( اذا احب الله عبدا نصب في قلبه نائحة، واذا ابغض عبدا جعل في قلبه مزمارا... ئەگەر خودا بەندەیەکی خۆشویست ئەوا زایەلە [١٧٤] ئەخاتە دلیەوە، ئەگەر ڕقی لە بەندەیێ هەلسا شاییو هەنگەمە ئەخاتە دلیەوە))، ئەوە هەوالێکی ئیسرائیلیەو، گوتراوە لە تەوراتدا ئەم گوتەیە گوتراوە. دەشکرێ بە واتایێکی دروست شرۆڤە [١٧٥] بکرێ، بلێین: بڕوادار لە ئاهی تاوانباریدا خەمگینە، بەلام مەردمی بەدکار خەلەفاو بێ ئاگایە گالتە جاڕو سەر مەستەبێ خەفەتو هەلپەرستە.

---

١٧٢) هیچ کات.

١٧٣) وا لێك دەدرێتەوە.

١٧٤) شیوەن.

١٧٥) ڕاڤە بکرێ.

ئەگەر دۆستانی خوا توشی دڵ شکستی بێن تەنیا لە تاوی لە کیسچونی بەهرەییێکە، یا لە تاوی سستی نواندنێکە، یا توشبونی تاوانێکە، بە پێچەوانەی مەینەتباری تاوانباران، ئەوان لە پێناوی لە دەست چونی بەرژەوەندیێك، یا هەواو هەوەسێك، یا ئامانجێکی دنیایی دلگیرو پەستن، هەر لەو پێناوە دایە هەوڵو ڕەنجیان، لەو ڕێیەدایە ماتەمینیو دەردی دڵیان.

ئەو وتە پیرۆزەی خوای گەورەش کە دەربارەی پێغەمبەر "یەعقوب"[176] دەفەرمووێ: ﴿وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ... لە سوێی یوسف تانەپەڕیە[177] سەرچاوانیو هەروا پیشی[178] دەخواردەوە، ﴿٨٤﴾ یوسف﴾.

ئەو فەرمودەیە دەربارەی باسو خواسی خەفەتباری یەعقوبەو، لە تاوی بزر کردنی ڕۆڵە خۆشەویستەکەی هەواڵی داوە کاتێ خوای گەورە بەو خەمباریەو جیابونەوەی لەگەڵ یوسفی کوڕیدا تاقی دەکاتەوە.

تەنیا هەواڵدانیش دەربارەی شتێك نابێتە بەلگەی بە باش دانانیو، فەرمان پێدانیو، لەسەر هاندانی، بەڵکە فەرمانمان پێ دراوە خۆ پەنادەین بە خوا لە خەفەتباری، چونکە خەفەت بارێکی گرانەو وەکو شەوێکی ڕەشی درێژخایانە، بەربەستێکە لە ڕێگای گەیشتن بە خوو خەسڵەتە بالاکان.

ئەوانەی ڕێگای دنیا بە کەم گرتنیان گرتۆتە بەر لەسەر ئەوە کۆكو یەك دەنگن کە دڵ پەستی لە پێناو دنیادا ناپەسندە، تەنیا "ئەبو عوسمان جەبری" نەبێ ئەو دڵێ خەفەتباری بە هەموجۆرەکانیەوە پەسندەو، بە مەرجێ بە سایەی تاوان نەبێ.

هەروەها دەڵێ: ئەگەر خەفەتباری سودو قازانجێکیش فەراهەم نەیێنێ، بەندە یەك لا دەکاتەوەو پاکژی لە چەپەڵی دەدرێنێ.

گوتراویشە: گومان لەوەدا نیە دڵ پەستی تاقیکردنەوەی خوایەو هەروەکو دەردەداریو بەڵاباری وایە.

---

١٧٦) پێی دەگوترێ "اسرائیل".

١٧٧ هەوری کەوتە سەر چاوانی.

١٧٨) ڕقی دەخواردەوە.

جا پێویستە هەوڵ دەی خۆشبەختیو کامەرانی دەستەبەرکەی، ژیانو گوزەرانێکی بێ گرێو گاڵو، هەستو نەستێکی بێ خەیاڵ لە پەروەرندەت داواکەی، بێ گومان بە هەرەوەریو بەهرەمەندی پاداشتێکی خوان هەر لە ئێستاوە دێنە دی، هەتا بە ئاستێکی وا خۆشبەختی ستایش کراوە، دەڵێن بەهەشتێکە لە ڕوی دنیاوە، هەر کەسێ خۆی تێ نەخا ئەوا لە بەهەشتی دوا ڕۆژیش خۆی بێ بەش دەکا.

هەر خوا خۆی دەتوانێ بە پەرتەوی[١٧٩] دڵنیایی دەستەبەری بەرزەوەدەیی[١٨٠] و بەختەوەریمان بۆ بکاو، ڕوی دڵەکانمان بەرەو ڕاستە شەقامی خۆی ڕاستە ڕێ کا، لە تەنگو چەڵەمەی ژیان دەرمانبێنێو ڕزگارمان کا.

## هەڵوەستەیەك

دەی بابەیەکەوە، بەو نزاو پاڕانەوە بە گوڕو نەستەقەوە دەنگمان هەڵبڕین کە چارەسازی ناسازیو نالەباریو خەمینی[١٨١] ئێمەن (( لا اله الا الله العظيم الحليم، لا الـه الا الله رب العرش العظيم، لا اله الا الله رب السموات ورب الارض ورب العـرش الكـريم، يا حي يا قيوم لا اله الا انت برحمتك استغيث... هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لە خوای خاوەن شکۆو میهرەبانی، هەر ئەو خوایە شایستەی بەندایەتی بۆ کردنە کە خاوەنی گەورەترین تەختی دەسەڵاتە، هەر ئەو خوایە شایانی پەرستشە کە پەروەرندەی ئاسمانەکانو زەمینەو خاوەندی تەختێکی پیرۆزی پانو بەرینە، ئەی ئەو کەسەی هەمیشە زیندو مشور گێڕی خوایەتی تەنیا شیاوی تۆیە، زایەڵەو زریکەم بۆ سۆزی تۆیە)).

(( اللّهم رحمتك ارجو، فلا تكلني الى نفسي طرفة عيـن، واصلح لي شأني كلـه، لا الـه الا انت... ئەی پەروەردگارا تەنیا سۆزو میهری تۆم لێ دیارە، تەنیا چاوتروکانێکیش وێڵم نەکەی، خوایە هەر تۆم هەی، هەرچی کاروباری هەمە ڕاستە ڕێی کەی)).

---

١٧٩) بە ڕوناکی.
١٨٠) فراوانی، بەرفراوانی
١٨١) خەمگینی.

(( استغفر الله الذي لا الـه الا هـو الحـي القيـوم واتـوب اليـه... لەو خوایـە داوای چاوپۆشـی دەکـەمو، پەشـیمانی دەردەبـڕم کـە هـەر ئـەو لـە خوایـەتی دەوەشـێتەوەو هەرگیز نامرێو لە هەمو بونەوەر دەپێچێتەوە)). ﴿...لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ... خوایـە تـەنیا تـۆی بـێ هەڵـەو بـێ قـسوری، خوازیـارم لـە بەندەیەکی تاوانکاری وەکو من ببوری، ﴿٨٧﴾ الأنبياء﴾.

(( اللّهم اني عبدك، ابن عبدك، ابن امتك، ناصيتي بيدك مـاضٍ فيَّ حكمـك، عـدل فيَّ قضاؤك، اسألك بكل اسم هو لك سمَّيت به نفسك، او انزلته في كتابك او علمتـه احـدا مـن خلقك، او استأثرت به في علم الغيب عندك، ان تجعل القران ربيع قلبـي، ونـور صـدري، و ذهاب همي، وجلاء حزني... خوایە من بەندەی تۆم، ڕۆڵەی باوكو دایکێکم کە بەندەی تۆن، جڵەوی من لە دەستی تۆیە، ملم کەچی بڕیاری تۆیە، لێت دەپاڕێمـەوە بـە هـەر نـاوێ خـۆت پـێ نـاو نابـێ، یـا لـە پەرتوکـە پیرۆزەکـەت دابـێ، یـا یـەکێ لـە دروست کراوانت پێ دەرس دابێ، یا لە پەنهانیەوە بۆ خۆت دانابـێ، قورئـان بکەیتـە بـەهاری دڵم، ڕۆشنایی سینەو، ڕەوێنەری دڵ گیریو خەمم)).

(( اللّهم اني اعوذ بك من الهم والحزن، والعجز والكسل، والبخل والجبن، وضلع الـدين و غلبة الرجال... خوایە پەنات پێ دەگرم لە خاکە ساریو لـە مەینـەتباری، لـە سـستیو دەستە پاچەیی، لە قرچۆکیو ترسەنۆکی، لە قەرزاریو ژێر چەپۆکی)).

(( حسبنا الله ونعم الوكيل... خوایە تۆ بەسـمانیو چاترین هاریکارمانی)).

## ڕو بــــە خەنـــدە بە

لێـو بــە خەنــدەیی داوو دەرمــانی پەرێــشانییەو هــەتوانی[١٨٢] پەرۆشـیـیە وزەو توانایێکی بێ وێنەیە بۆ شادیو گوشادی گیانو دڵ، هەتا "ئەبو دەردا" دەڵێ ﷺ من دەگرژێمەوەو پێ دەکەنم تاوەکو ببێتە مایەی پشودانو ئارامی دڵم.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕێزدارترین مرۆڤ بو کەچی جاری وا بو پێکەنینو بزەی لێوەی بە ئەندازەیەك بو ددانی پیرۆزی پێشینەی بە دیار دەکەوتن[١٨٣] ئا ئـەو شـێوە پێکەنینـە نـەریتی ژیـار[١٨٤] و تێگەیـشتوانە، ئەوانـەی بـە دەردو دەرمـانی دەرونــان کاراشنانە[١٨٥].

ڕوگەشی چڵەپۆپەی شادمانیو لوتکەی هەرە بەرزی خۆشیە.

بەڵام پێکەنینێك بێ زیادە ڕۆیـی (( لا تكثـر الـضحك، فـان كثـرة الـضحك تميـت القلــب... پێغەمبــەری خــوا دەفــەرموێ: زۆر پێمەکەنــە، چـونکە پێکـەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ)).

بەڵکە پێکەنینێك مام ناوەندی بێ ((وتبسُّمك في وجـه اخيــك صَـدَقة... پێغەمبـەری خوا دەفەرموێ: گرژینەوەت بە ڕوی برایەکەتدا چاکەیە)).

﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ... سولەیمان بە قسەی مێرولە بـزەی هاتـە سـەرلێوان. (١٩) النمل ﴾.ئەو شێوە پێکەنینە نەبێ بۆ گاڵتە جاڕیو کەم نرخاندنە:

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ... کاتێ نیشانەکانی منی لەبەر ڕانان[١٨٦] لە پڕ هەمو لە تریقەی پێکەنینیان دا (٤٧) الزخرف ﴾.

---

١٨٢) مەڵحەمی.

١٨٣) تێبینی: پێکەنینی پێغەمبەر ﷺ بە بێ دەنگ هەڵبڕین بوە.

١٨٤) هۆشمەند.

١٨٥) شارەزانە.

١٨٦) خستنە بەرچاو.

ڕوگەشی‌و لێوبەخەندەییش خەڵاتی بەهەشتییانە: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ... وا ئەمرۆش خودا ناسەکان بە بێدینەکان ئەخەنن[187]. ﴿٣٤﴾ المطففين ﴾ .

داب‌و نەریتی عەرەبەکان وابو زۆر ستایشی لێو بە خەندەییان دەکردو، بە ئاماری[188] سینە فراوانی‌و دەست کراوەیی، بەخشندەیی‌و، ڕەوشت بەرزیان دادەنا:

**مرۆڤی ڕو بـە خەنـدە بەرچـاوی فـراوانـە**
**ئەگـەر لێشـی بخـوازێ دەرونی ئاوەدانـــە**

زوهێری شاعیر بە یەکێدا هەڵدەڵی:

**گەر ببـی بە مێوانـی دڵخۆش‌و شـادمـانـە**
**هەروەکو بڵێی خانەخۆیی ئەوت لەلا مێوانـە**

ئایینی ئیسلامیش لە بواری بیروباوەڕو بەندایەتی‌و خورەوشتدا لەسەر مام ناوەندێتی بنیات نراوە، نەڕو گرژی‌و چاوسور کردنەوەو ڕەش هەڵگەڕان لەم ئایینەدا بەدی دەکرێ، نە گاڵتە جاڕی‌و بەردەوام قاقای پێکەنییشی تێدا قەبوڵ دەکرێ، بەڵکو بایەخداری‌و شکۆداری هێسك سوکی‌و نە بێزاری لێ ڕەچاو دەکرێ.

"ابو تمام" دەڵێ:

بەڵا گەردانی باوکی علی بم، چراو ئەستێرەی هیوادارانە ڕوخۆش‌و بە جۆش لە هەندێ جاردا، بێ بزەو خەندە ژیانیش کەی ژیانە.

مچ‌و مۆڕی[189] دەربڕینی بێزاری‌و دەرون هەڵچونە، هێمای [190] کلۆڵی‌و ژیان لێخن[191] بونە: (ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ... ئەوساکە ڕوی گرژ کردو ترش هەڵگەڕا.

---

١٨٧) پێ دەکەنن.
١٨٨) نیشانە/هێما.
١٨٩) ڕوگرژی.
١٩٠) نیشانەی.
١٩١) شێلو.

به سای ڕۆح زلی ڕوتاریو گرژن   هەروەکو بلێی بـه گڕ دەسـۆژن
وەکو گەلـێ نین به ڕودا گەشـبن   وەکو ئەستێران ئامرازی ڕێ بن

پێغەمبەریشمان دەفەرموێ: (( ولو ان تلقـى اخـاك بوجـه طلـق... ئەگەر چـی بـه ڕوێکی خۆشەوە به براکەت بگەی)).

"ئەحمەد ئـەمین" لـه کتـێبی "فـیض الخـاطر"دا دەڵـێ: ئەوانـەی لـه ژیانـدا ڕوگەشاوەن نەوەك هەر بـۆ خۆیـان بەختـەوەرترین کـەس بـن، بەڵکە لـه کرداریـشدا دەست بـاڵاترن، پـتر بەرگـەی بەرپرسـیارێتی دەگـرن، سـەبارەت بـه ناخۆشـیان پـشو درێژترو چارەسازترن، زۆرتر شیاوی فەراهەم هێنانی کـردەی بـەردارن، بـۆ خۆیـانو بۆ خەڵکی تریش سودمەندترن.

ئەگەر بێو لـه نێـوان هەڵبـژاردنی سامانێکی زۆر یـا پلـەو پایـەیێکی بـەرزداو لـه نێوانی دەرونێکی ئاسودەو ئارامـدا سەرپـشك بکـرێم، ئەمـەی دوەمیـان هەڵدەبـژێرم، جامالّو دارایی چ پیتو فەڕێکی هەیە ئەگەر خاوەنی ڕوگرژو زویر بێ؟! پلـەو پایـە چ سەنگو ڕێزێکی تیایە گەر خاوەنەکەی ماتو دڵبەست بێ؟!

مەگەر هەرچی لە ژینـدا هەیە بێ بایەخو مایە پوچ نیە ئەگەر بێو خـاوە نەکـەی پەستو دڵەن [١٩٢] بێو هەروەکو بڵێی لە ناشـتنی تـەرمی ئـازیزێکی بگەڕێتـەوە؟! ژنـی جـوان چ کـەڵکێکی لێ ڕەچـاو دەکـرێ ئەگـەر ناومـاڵی بکـا بـه دۆزەخ؟! خێزانێـك بـه هەزار فات خاسو ڕەند ترە [١٩٣] ئەگەر چی لە ڕواڵەت دا زۆر بەرچاو نـەبێ بـەڵام بـه سایەی ئەو ناومالّ وەکو باخی بەهەشت بێ.

ڕوگەشیو لێوبەخەندەییش ئەگەر تەنیا ڕواڵەتی بێو بەهۆی خونەریتی ناوازەوە لـه نـاخو سروشـتی مرۆڤـەوە هەڵنـەقوڵێ هـیچ بـەهاو نرخێکـی نیـە، سـەرنج دە روخـسارو دیمـەنی گـوڵان، بـاخو باخـاتو بێـستان، ئـاوی دەریـاو ڕوبـاران، ئاسمـانو هەسارەکان، باڵندە سەر لەبەریان، هەر هەموی ڕو بە خەندەن.

---

١٩٢) پەرۆش.

١٩٣) خۆش ڕەفتار ترە.

مـرۆڤیش بـەو سروشـتەی خۆڕسـكی دەم بـە خەنـدەو پێكەنینـە، ئەگـەر بـێ‌و بەرچاوتەنگی‌و خراپەكاری‌و خۆپەرستی ڕوی گرژو مۆن هەڵنـەگێڕن، ئەگـەر ڕوشی گرژبو لەو شێوە گونجاوەی لەسەری ڕەخساوە هەڵئـەتۆقێ و[194] دەتـۆرێ، بۆیـە ئـەوەی سینە تەنگ‌و ڕوگرژە چاوی بە جوانی‌و ڕەونـەقی ژیـان ناكرێتـەوە، ڕاسـتی‌و ڕەوایـی دەرك پێ ناكا ئەوەی دەرونـی پـیس‌و پـۆخڵ كـا، جـا هـەمومرۆڤێك بـەپێی ڕەفتـارو بیرو ئەندێشەو پاڵنەرەكانی ژیان دەنرخێنێ، ئەگەر ڕەفتارو بیرو هزرو پاڵنەرەكانی پاك‌و بێ گەردو لەكە بن، ئەوا ئـەو چاویلكەیەی پـێی دەڕوانێتـە ژیـان لێڵ‌و لـێخن نابێ، جوانی‌و نەشمیلی دنیا چۆنە ئاوا دەیبینێ.

ئـەگینا جـامی چـاویلكەكەی پەڵـەی تێدەكـەوێ‌و ڕەش هەڵدەگـەڕێ، هەرچـی لـە ژیانـدا هەیە لە دیدی ئەودا ناحەزو دزێو دەبێ.

دڵ‌و دەرونی وا هەن لە بارەیاندا هەیە بەد بەختی‌و چارە ڕەشـی لـە هەموشـتێدا وەدی بێـنن، هەنـدێ دڵ‌و دەرونـی واش هـەن دەتـوانن لـە هەموشـتێدا بەختـەوەری فەراهەم بێنن، هەیە ژنی ناوماڵە چاوی تەنیا هەڵە دەبینێ، وا دەزانێ ئاسمان بەسەر عەرزێ دا ڕوخاوە لەبەرئـەوەی پـەرداخێ شـكاوە، لـە ئـاهی ئـەوەی چێشتەكە زیـادە خوێی تێكراوە، یا لە داخی ئـەوەی لـە نـاو ژورەكـەدا پـەڕە كاغـەزێك هـەڵوەراوە، بـە سای ئەوە هەڵدەچێ‌و دەمی لە جنێو دەكاتەوەو لە ئەنـدامانی مـاڵ كـەس نـابوێرێ‌و بە گڕو كڵپەی ئاژاوە یەك پارچە ماڵ دادەگیرسێنێ، پیاوی واش هەیـە ژیـانی خـۆی‌و دەوروبەری دەكاتە ژان، چونكە وتەیەكی ناحەزی لە كوێچكەدا چەقیوە، یا بـە هەڵـە تێی گەییوە، یا هەڵوێستێكی كەم نرخی لە ئاقاردا نوانراوە، یا لە خودی خۆیدا ڕوی داوە، لە خەمی تێشكانێكی سامانی دایە، یا چـاوەڕێی قازانجێكـە نەهاتۆتـە ئـاراوە، یـا لە تاوی هەر جۆرێ لەم بابەتانە دنیای لەبەر چاوان تاری‌و وێرانـەو، بۆ هاونـشینانی مایەی دەردە سەری‌و شڵەژانە.

ئـا ئـەو جـۆرە كەسـانە دەتـوانن ژیـان‌و گـوزەران بـشێوێنن، نیـسكیان لێ ببـێ بـە گیسك‌و، مێشیان لێ ببێ بە گامێش، لە دەنكە تۆێـك درەختێـك بـڕوێنن، لـە ئـەنجام دانی كارو كردەوەی بەرهـەم دارەوە بەڵـەد نـین، هەرچـەندە مـاڵ‌و داراییـان زۆر بـێ

---

١٩٤) ڕەویلەوە/ترسان.

چاویان پڕ نابێ، چەندی خاوەنی بەهرەی بەهادار بن پێی بەهرەمەند نین‌و چێژی لێ وەرناگرن.

ژیان بەسەر بردن هونەرێکە، کارامەیی‌و شارەزایی گەرەکە، بێ سۆ [195] مرۆڤ ژیانی خۆی وەکو گوڵشەن بە نواندنی کردەوەی جوان‌و خۆشەویستی برازێنێتەوە، چاکترە لەوەی هەوڵ‌و رەنجی لە پێناو کۆکردنەوەی سەروەت‌و سامان بێ‌و ژبەر [196] پڕکردنی گیرفان بێ.

ژیان چ سەنگ‌و رێزێکی هەیە ئەگەر هەموکردو کۆش لەو ژیانەدا لە پێناوی گلدانەوەی پارەو پوڵ بێ‌و، هیچ بایەخێك بە بەرەو پێشەوە چونی بواری سۆزو خۆشەویستی‌و رازاندنەوە نەدرێ؟! زۆربەی خەڵکی چاوەکانیان لە ئاستی نەخش‌و نیگاری ژیاندا دەنوقێنن، کەچی بۆ دیتنی پارەو پوڵ‌و دراوەکان پێلوی چاوانیان هەڵدێنن، بە لای گوڵشەن‌و گوڵ‌و گولاڵەی رەنگاو رەنگ داو ئاوو ئاوەرۆی بەخوڕدا گوزەر دەکەن‌و گوێ بیستی ئاوازو چریکەی باڵندەکان دەبن روی بەلایدا لا ناکەنەوە، بەڵام ئەو دراوەی دێتە دەستیان، یاخود لێیان دەڕوا بە هەندێ دەزانن‌و بایەخی پێ دەدەن.

سەنگ‌و رێزی پارە لەوەدایە هۆکاری بەختەوەری ژیان بێ، ئەوان ئاسودەییان کردۆتە قوربانی پارەو دەبێ لە پێناویدا حاڵیان پەرێشان بێ، خوای بەخشندە بینایی بۆ بینینی جوانی پێ بەخشیوین کەچی ئێمە وا راهاتویین چاومان هەر بۆ پوڵ‌و پارە هەڵدەبڕین.

گەر دەتەوێ روگەشاوەو بە خەندە بی لە دژی بێ ئومێدی بوەستە، چونکە بێ هیوایی دیاردەترین هۆکاری گرژی‌و پەستی دەرونە.

ئەو هەل‌و مەرجەی بۆ خەڵکی تر رەخساوە بۆ تۆش هاتۆتە ئاراوە، دەروی خێر چۆن بۆ خەڵکانی تر کراوەیە ئاواش بۆ تۆ ئاوەڵەیە، ئینجا بیرو هزرت لەسەر ئومێدەواری‌و گەشبینی لە داهاتودا رابێنە.

---

١٩٥) بێگومان.

١٩٦) لەجیاتی.

ئەگەر باوەڕت وابێ لە پێناوی شتی کەم بەهادا خولقێنراوی، لە ژیاندا تەنیا شتی بێ بەها بەدەست دەهێنی، وە لێ پێت وا بێ لە پێناوی شتی بێ وێنەو پڕ بەهادا دروستکراوی هەست بە ورە بەرزێکی وا دەکەی ئاسنو پۆلا خۆی بۆ نەگرێو هەرچی بەربەستو لەمپەری سەر ڕێگایە پەرتو پێواری کەی، بەرەو جیهانێکی فراوان هەنگاو هەڵهێنیو بەو پەڕی ئاواتو خواستەکان بگەی، دەتوانین بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیە نمونەیێکی بەرچاو بێنینەوە، ئەگەر یەکێ لە ڕوبەرێکی سەد مەتریدا پێشبڕکێ ئەنجام بدات تا بە ئەو پەڕی دەگا هەست بە ماندو بونو شەکەتی دەکا، بەڵام یەکێ بەشداری پێش برکێ لە ڕوبەرێکی چوارسەد مەتری دا بکات لە کاتی بڕینی سەد یادو سەد مەتردا ماندوێتی دەرك پێ ناکا.

جا ناخو دەرونت بە ئەندازەی دیاری کردنی ویستو مەبەستت توانات پێ دەبەخشن.

دەی تۆش بەهرەی بەر فرەبخوازە، هەرچەندە بە دەست هێنانی سەختو دژوار بێ، چونکێ ڕۆژ بە ڕۆژ هەنگاوێکی نوێ هەڵدێنی، کۆڵ نەدەیو دانەمێنن.

تەنیا ئەوەی دەبێتە بەربەستی ڕێگاو دڵو دەرون دێنێتەوە یەكو دەیخاتە تاریکایی بەندیخانە. بێ ئومێدیو هیوا برانە، ئەو ژیانە تاڵو سوێرەیە کە بە سای ڕەشبینیو گەڕان بە دوای هەڵەو پەڵەی گشت کەسێكو بە خراپە لێ دوانیان دێتە ئاراوەو هیچی تر نیە.

ئەوەندەی پەروەردگاری بەسۆز کەڵك بە مرۆڤ دەگەیێنێو گەشە بە بەهرە سروشتیەکانی دەداو هاوسەنگی لە نێوانیاندا دەنوێنێو ئاسۆی ئاواتەکانی بەر فراوان دەکاو، لەسەر سینە پاکیو لێبوردەیی پەروەردەی دەکا، وای حاڵی دەکا کە سودمەندترین ئامانجی ئەوەیە بە پێی توانای ببێتە سەرچاوەی خێرو فەڕ بۆ خەڵکانو، وەکو خۆر بێ بدرەوشێو خۆشەویستیو چاکە کاری فەراهەم بێنێ، دڵی پڕ لە سۆزو جوامێری بێ، خۆشیو هەداری بۆ گشت کەسێ گەرەك بێ، هیچی تر ئەوەندە دادی نادا.

ئەو دڵو دەرونەی کراوەیەو گەشاوەیە بە خۆشحاڵیەوە ڕوبەڕوی ئەشکەنجان دەبێتەوەو بەسەریاندا زاڵ دەبێ، بە خەندەوە لێیانەوە دەڕوانێو چارەسەریان دەکاو

چێژ لەو سەرکەوتنە وەردەگرێ، بەڵام ئەو دڵو دەرونەی پەستو گرژە ناخۆشیەکان بـە سـوك نانرخێنـێ، بەڵکە چوکیش بـن بـە گـەورەیان سـەیر دەکـاو بـە ورەیێکـی بەزیوەوە لە ئاستیاندا دەوەستێو بە ئەگەرو مەگەران بیانو دەگرێ.

ئـەو ڕۆژگـارەی نـەفرەتی لێ دەکـا تـەنیا هەسـتو خوسـتی خۆیـەتی، ئـەو دەیـەوێ حازر خۆری بەر سێبەری بێو باجیـشی نـەدات، لای وایـە هەموڕێگایـەکانی ژیـانی لێ گیراون، لە بیری ئەوەدایە ئاسمان زێڕی ببارێنێو زەوی گەنجینەی بۆ وەدرێ نێ.

هەر کارێ لە ژیاندا سەختو دژوارە لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر جیاکارە، جا هـەر شتێ زۆر گرانو قورسە بـە پێـی بـیری کەسـێکە دڵـستو ڕەوەك بـێ[197]، بـەڵام ئـەوەی خاوەنی هەستێکی بەر وەدەو فراوانە کاری گرانیشی لە لا ئاسانە.

لە لایێکی تریشەوە دەرونێك کە خۆ گر بێ بەهۆی زاڵ بونی گوستاخ[198] تـر دەبـێ، کەچی دەرونی کزو لەرزۆك هەرچەندی لـە ترسـان ڕابکـا خـۆی زیـاتر گرفتـار دەکـا، کـاری سـەختو گـران هـەروەکو سـەگی گـازگر [199] وایـە هـەر کـە چـاوت پێـی کـەوتو هـەڵاتی پێـت دەوەڕێو ڕاوت دەنـێ، ئەگـەریش بـە هەنـدت هەڵنـەگرتو گوێـت بـۆ حەپەی[200] هەڵنەخست سەر دەنێتەوە قاوخی خۆیو ڕێگات بۆ بەردەدا.

دوای ئەمە ئەوە بزانە هیچ شـتێ ئەوەنـدەی دەرون بـەزیویو خـۆ کـەم نرخانـدن دوژمنی سەرسەختی دەرون نیە، کەسێ بەم چەشـنەبێ ئەنجامـدانی کـردەی نـاوازەی لـێ ڕەچاو ناکرێو، چاوەڕوانی بەهرەی بەروەدەی[201] لـێ ناکرێ.

ئا ئەم هەستە وای لێ دەکا مـرۆ بـاوەڕو متمانـەی بـە خـۆی نـەمێنێ، هـەر گاهـ[202] بیەوێ بەرەو کردارێ هەنکاو هەڵێنێ نیگەرانیو بێ متمانەیی یەخـەی دەگـرێو بـێ هیوایی ساردو سری دەکاتەوە. جا متمانە بەخۆبون بەهرەیێکی گوشادە[203] و کۆڵەکەی

---

١٩٧) بێ جەرگ و ترسـەنۆك بێ.
١٩٨) ئازاتر دەبێ.
١٩٩) سەگی دڕ.
٢٠٠) وەڕەوەڕی.
٢٠١) فراوانی.
٢٠٢) هەر گات.
٢٠٣) فراوانە.

سەرکەوتنە لە ژیاندا، ئەم باوەڕ بەخۆبونەش لەگەڵ لەخۆبایی بوندا - کە بە خو نەریتێکی دزێو لە قەڵەم دەدرێ - زۆر جیاکارن، جیاوازیان لەوەدایە لەخۆبایی بون پشت بە خۆ بەستنێکی خەیاڵیەو، خۆ بە زلزانینێکی ساختەکاریە، بەڵام متمانە بە خۆبون پشت بەستنە بە وزەو توانای دەرونو هەست کردنە بە لە ئەستۆ گرتنی بەرپرسیارێتی، پتەوکردنی بەهرەو توانا‌کانەو جوان بەگەڕ خستنیانە.

"ایلیا ابو ماضي" دەڵێ:

وتـــی: ئاســمـــان تـەمبـــارەو ڕەش هەڵگــەڕاوە
وتــم: ڕوگــەشو بـەخـەنـدە بــە بــاوی گــرژی نـەمــاوە
وتــی: ئـاخـــر تـافـــی لاوێتیــم پــشتی هــەڵکر دوەو تــۆراوە
وتــم: بگــرژەوە بــە داخو کەســەران لاوێـتی نایێتـەوە ئـاراوە
وتـــی: ئـــەوەی لـــە ئەوینـــداریدا ئاسمانـــی مـــن بـــو
لـــە پـــای وەفـــاداریدا وێنـــەی دۆزەخـــی بـــێ بـــن بـــو
دوای ئـــەوەی دڵـــی لـــێ سەنـــدم پەیمانـــی لەگـــەڵ شـکاندم
چـۆن بتوانــم دڵــم شــاد بـێو پــڕ بــە دڵـم پــێ بکــەنم
وتم: بـا ڕوت بەخەنـدە بـێو سـینەت گوشـادو بـێ خـەش بـێ
ئـەگینا تەمـەن دەکەیتـە قوربـانیو دەبـێ ڕۆشـنایی ژیانـت ڕەش بـێ
وتــی: ئاخـــر کــێ بەرکـــێ لــــەم کاڵایـــە بـــە نـرخـــەدا
وەکــو ڕێبوارێکـــی گـــەرو وشکـــەو خەریکـــە گیانـــی ئـــەدا
یـا وەکـو بـــێ چـارەو مـەفـەرێ بــە دوای خوێنـــدا دەگــەڕێ
کاتێ هەناسە هەڵدەبڕێ خـوێن لـە گـەروی وشـکی دەردەپـەڕێ
وتم: بگرژێـوە، دەردو دەرمـانی ئـەو نەخراوەتـە دەسـتی تـۆوە
بەڵام ئەشێ چارەسەری لانـەوازێ، بەنـد بـێ بـە خەنـدەی تـۆوە
ئایــە جگــە لـە تــۆ سـتەمکارەو تــۆش دڵـستو خاکــە سـاری؟
نانـا هـەروەکو بڵێی خـۆت بـۆ خـۆتو بـێ دەسـتی خـۆت سـتەمکاری
وتـــی: نـەیـــاری دەوروبـــــەرم دەنـــــگ زلو بەهـــــاوارن
ڕەوایـــە دەســــت خـــەڕو بم، ئـەوانـیـــش مـەیـــدان دارن؟

وتم: خەمبار مەبە ئەگەری تۆیان گەرەك نەبێ
گەر خۆت لەوان نەژمێری دەستت بالاتر دەبێ
وتی: وا بەهارەو ئاماری دەرگەوتنی دیارە
منیش بێ بەرگو پۆشاکم ڕەنگ هەڵبزرکاوو بێ چارە
نەك بۆ خۆم بم خۆشەویستانیشم لێ دیارە
کەچی بێ دەست مایەمو نە کالام هەیە نە پارە
وتم: ئاسۆت ڕون بێ شەوی خەمانت سەرەو نخون بێ
چاکە لە ژیندا ماوی چی دەکەی گەر چاوت لە چاوی دۆستانت ون بێ
وتی: شەوگارەکان جامێ شەڕابی گوژالکیان پێ نۆشیم
وتم: خەندە لێو بە نەکەی بلێی کوشتەی چێژی تالایم
ئومێد وایە بۆ غەیری خۆت ببی بە پێشەنگی شادی
ئەوانیش خەم لە دڵ دەرکەن گەر بت بینن دڵ گوشادی
چ تێشکانو زەرەرێکە بە ڕوخۆشی خۆت بدوێنی
یا لات وایە پارەو پوڵە خەڵك لە دەستت دەردێنی؟
ئەی ئەو کەسەی دەناڵێنیو چریکەو هاوارت لێ هەڵدەستێ
دەروگەش بە خۆلێوت ناقلیشێو دەمو چاوت داناتەپێ
ڕوت وەکو ئەستێران بێ کە لە تاریکیدا دەدرەوشێن
هەر بە سای ئەو خەندەیە هەسارەکانمان خۆش دەوێن
وتی: کەی ڕوگەشی یەکێ بەختەوەر دەکا
چاوی بە ژیان هەڵبێنێو بە ناچاریش کۆچ بکا
وتم: پێ بکەنە ئەگەر چی لە نێوانی تۆو مەرگا بستێ بمێنێ
لەوانەیە ئەم هەلە لە دەست چێو مەودای پێ کەنین نەمێنێ

چەندە ئاتاجین بە خەندە لێوی، بە ڕوگەشیو سینە شادی، بە ئاکار بەرزیو ئێسك سوکیو نەرمو نیانی(( إن الله أوحى الىَّ أن تواضعوا حتى لا يبغي أحد على أحد ولا يفخر أحد على أحد)) پێغەمبەری خوا دەفەرموێ "خوای گەورە نیگای بۆ کردوم کە مل کەچی بنوێنن، بە ئەندازەیێ کەس خۆی بەسەر کەسدا هەڵنەکێشێو لافو گەزافی بەسەردا لێنەدا.

## هەڵوێستەیەك

خەمگین مەبە: چونکێ خەمینی بە فریات نەهات، کوڕەکەت لە ساڵی خوێندنی دواکەوت تۆش ئاخو داخت بۆ هەڵچەشت، ئایە ئەم ساڵەی قەرەبو بوەوە؟! باوکی کۆچ کردوت بە دادو فیغانی تۆ بزوت؟! لە بازرگانیەکەت تێشکای پڕ بە چاوانت گریای بەرەو دەرامەت وەرچەرخای؟!

خەمبار مەبە: چونکێ خەمباریت بوە مایەی زێدە خاکە ساریت، لە ئاهی گزوریدا[٢٠٤] هەراسان بوی کەچی پتر نەدارو بێ دەستمایە بوی، بە وتەی نەیارانت ڕەنجای بەڵام نەتزانی لە هاوپشتی ئەواندای، لە ترسی ڕودانی پەتەرێ[٢٠٥] دڵت سوتا کەچی ئەم ڕوداوەش هەر ڕوی نەدا.

دڵکێش مەبە: چونکە خەفەتباری خانوبەرەی گوشادیش تەنگ دەکا، هاوسەری شۆخ دزێو دەکا، سامانی زۆر وزە بەند بێ سود دەکا، پلەو پایەی بەرزیش نزم دەکا منالی دەستەوەرە[٢٠٦] بێ قازانجو هەڕمێن دەکا.

دڵ پەست مەبە: دڵ پەستی ئاوی سازگارت لێ تاڵ دەکا، گوڵی جوانت لێ بە گوژاڵك[٢٠٧] دەکا، بەرو باخت لێ دەکا بە بیابانێکی وشكو برێن، ژیانت لێ دەکاتە بەندیخانەیێ کەست لە هانا نەیێ. پەرێشان مەبە: کە دەبینی خاوەنی دوچاوی جوانی، خێوی دو گوێچکەو دو لێو دو دەستو دو پێو یەك زمانی، خاوەندی دڵ ویژدانی، لە هێمنو لە ئارامی، لەش ساخو بێ وەی[٢٠٨] ژیان دەگوزێنی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ... دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەرندەو حاشا دەکەن. ﴿٥٥﴾ الرحمن ﴾.

دڵ توند مەبە: تۆ خاوەنی بیروباوەڕێکی کاری پێ دەکەی، خاوەنی خانوبەرێکی خۆتی تێدا مەڵاس دەدەی، نانێ هەیە لە دەمی خەی، ئاوێ هەیە کە بینۆشی، بایی

---

٢٠٤) پێویستیدا.

٢٠٥) خەفەت.

٢٠٦) گوێ دێر.

٢٠٧) گوژاڵك گیایەکی تاڵە بە عەرەبی پێی دەڵێن حنظلة.

٢٠٨) بێ دەرد.

ئــەوەی پۆشــاك هەیــە لــەش‌و لارت دابپۆشــی، خێزانێکــت هەیــە دڵــی خــۆی لــە لا خۆشکەی، ئەی بۆ دەبێ بەم چەشنە خۆت پەرۆش کەی؟!

## بەرهــەمی ڕەنــج

ئازارو ڕەنج هەمیشە بێ بەرو باو[209] نابێ‌و، شیاوی ڕق لێبونەوە نابێ، جاری وایـە لـە بەرژەوەنـدی بەنـدەی بـێ چارەیە ئـەم ئـازارە، دەنگـی نـزاو سـکاڵای بـە جـۆش‌و خـرۆش لـە کـاتی مەینەتیـدا هەڵدەبڕێ، کاتـێ قوتـابی بـە دوای زانـستدا دەگـەڕێ‌و، ئەرکی وەبەرهێنانی زانست لە ئەستۆ دەگرێ ڕەنج‌و جەوری بـۆ دەکێـشێ، دەرەنجـام زانـایێکی چـاپوك‌و زیـتی لێ ڕەنیـو دێ، چـونکێ لـە سـەرەتاوە سـوتاوە لـە کۆتـایی دادرەوشاوە رەنج‌و ئەشکەنجەی شاعیرێ، کە لە ڕێی دەربڕینی ڕاستیێك دا دێتە ڕێی، وێژەیەکی کاریگەرو دڵ ڕفێن فەراهەم دێنـێ، لەبەرئـەوەی هۆنراوەکـەی لـە قـوڵایی هەست‌و ناخیدا هەڵدەقوڵێ، بۆیـە هەسـتی خـەڵکان دەهـەژێنێ‌و دڵان ڕادەچڵەکێنێ. کردو کۆشی نوسەرێك بەرهەمێکی زیندوی سەرنج ڕاکێش‌و پڕ لە پەندو ئامۆژگاری لە وێنەو یادەوەری وەبەردێنێ.

ئەو قوتابیەش کە فێـری پاڵکەوتنـەو نـە کۆشـیارە[210] جارێ لـە جاران نەچـزاوە[211]، سەری لە تەمبەڵی‌و کەمتەرخەمی‌و خاوەلیچکەیی[212] دەردەچێ.

ئــەو هۆنــەرەی[213] لــە ژیانیــدا کەســەرێکی نــەبینیوەو تــاڵی‌و ســوێری نەچەشــتوەو نەنۆشیوە، هۆنراوەکانی لە وتەی بێ بەهاوە بەسەریەکدا کەڵەکە دەبن‌و، وەکـو کـەفی سەر ئاو دەسەنگێنرێن، چونکێ بەرهەمەکـەی زادەی بـیرو هۆشـی نیـەو لـە ناخـەوە سەرچاوە ناگرێ، بۆیە هەر قسەی سەر زارانەو خەڵکیش وەخۆی هەڵناگرێ.

---

٢٠٩) بێ بەروبو.

٢١٠) تێکۆشەر نیە.

٢١١) ئازاری پێ نەگەیشتوە.

٢١٢) سستی.

٢١٣) ئەو شاعیرەی.

ژیانو گوزەرانی بڕوادارانی پێشو دیاردەترینو لەبەرچاوترین بەڵگەیە، ئەوانەی لە چاخی لە دایکبونێکی نوێو بەیانی دانی ئازادیو سەرەتای هاتنی پێغەمبەردا ﷺ دەژیان، ئەوان خاوەنی پتەوترین باوەڕو فراوانترین دڵو دەرونو داسەپاوترینو شارەزاترین کەس بون، هەر بە سای ئەو ژیانە پڕ لە مەینەتیە بو کە دەیانگوزەراند: هەر لە ئێشو ژانی نەداریو هەژاریو هەڵوەدەیی، چەوسانەوەو وەدەرنانو دورە وڵاتیو جیابونەوەی خۆشەویستانو دەستبەرداری لە هۆ گرانەوە، تا دەگاتە ئێشو ژانی بریندارىو سزادانو کوشتاری، هەر بۆیە ئەم چینە پاکو پاڵاوتەیە، ئەو کۆمەڵە ناوازەیە، سەرمەشقی پاکایەتیو شیاوی هەڵگرتنی مەشخەڵی ئازادیو دروشمی قوربانی دان بون، ﴿...ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَٰلِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ... چونکە هەرچی لە تینوێتیو ماندوێتیو برسێتی - کە لە ڕێی خودا توشیان دێ - و هەر هەنگاوێکی دەی هاوێن، خوانەناسان توڕە دەکاو هەر زەربەیێ لە دوژمنی دەوەشێنن، گشتی خودا بە چاکەیان بۆ دەنوسێ. خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکا. ﴿١٢٠﴾ التوبة﴾.

لە جیهان نامەی ئەم ژیانەدا کەسانێ بون، سەبارەت بەو کۆڵەواریەی هاتە ڕێیان بە پیتو پێزترین بەرهەمیان پەخش کرد، شاعیرێك بە ناوی (موتەنەبی) لەو ساتەی توشی تاولەرزێك هات ئەم هۆنراوە بە پێزەی هۆنیەوە:

**دەڵێی بەڵاو مەینەتیم بە چاوو ڕووشەرمنن**
**بۆیە هەر لە شەواندا شەیدای دیدەنی منن**

یەکێکی تر بە ناوی (نابیغة) ئەو هەلەی "نعمان"ی کوڕی "مونزیر" هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکرد، ئەم هۆنراوەی پێشکەش کرد:

**تۆ وەك خۆری و میران[٢١٤] وەكو ئەستێران**
**گەر تیشكی خۆر لە ڕو بێ پەنهانە ڕوخساری وان**

**زۆرن ئەوانەی مایەی درەخشانی ژیانن**
**چونكێ بریندای دەستی ژین و ژارن**

كەوایە بە سای ئەشكەنجان دامەچڵەكێ، لە تاوی چروسانەوە[٢١٥]، مەشڵەژێ، لەوانەیە ئەم ئەشكەلە[٢١٦] مایەی شەنگو توانای تۆ بێ، تا مەودایێك كالای تۆ بێ، ئەگەر وەكو كەسێكی دڵسوتاوو دەرودەرون هەڵقرچاو وروژێندراو بژیێی، لەبارترە لەوەی هەڵسوكەوتت وەكو كەسێكی ساردو سڕو ورمتەپیو خامۆش بێ، ﴿...وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ... بەلام خودا هاتنی وانی پێ خۆش نەبو، ورەی لە دڵیان بردە دەر. پێیان گوتن: ئێوەش وێڕای بەجێ ماوان بەجێ مێنن. ﴿٤٦﴾ التوبة﴾.

بەم بۆنەوە شاعیرێكم[٢١٧] بیركەوتەوە كە لە ناو تەنگو چەڵەمەدا ژیانی بەسەربرد، ژانی لێك جوێ بونەوەی بینی، لە كاتێكا هەناسەی هەرە دوایی هەڵدەكێشا، ئەم پارچە هەڵبەستە سەرسوڕمێنە ناو كردوەی[٢١٨] هەڵبەست، بێ ئەوەی خۆی تەكان بداو فاق بریقی پێ بدا: ئەویشیان "مالیكی" كوڕی "ڕەیب" بو كاتێ بە خۆیدا هەڵدەڵێ:

**مەگەر نام بینی، چۆن سەرشێواویم بە ڕێنمایی فرۆشتوە**
**لە سوپای كوڕی "عەفانا" بە تێكۆشەر ناوم تۆمار كردوە**
**ئەی دۆستانی ئەم كاروانەم، كۆچ نزیكەو با لێرەدا بسێمەوە**
**لەم تەنگژەدا بە تەنیایی چەند شەوانێ بەسەبەو سەرنێمەوە**

---

٢١٤) پاشایان.
٢١٥) پاشایان.
٢١٦) ئەشكەنجە.
٢١٧) هەستیارێكم.
٢١٨) بەناوبانگ.

هـــەر بـۆ خـوايـــە لـــەو ڕۆژەدا پــڕ بــە دڵو ئــارەزوی خـۆم
زارۆڵانـم جـێ بهێڵـمو خـــۆم بـە تـەنـيــاو بـێ مــاڵ بــڕۆم
ئـەمڕۆ يـا هـەندێ لـە شەودا بمێنـنــەوەو جـێم مـەيـێڵـــن
پـەلـەو تــاڵۆكە نەكـەن، تــا دڵنـيــا دەبـــنو دەم ســـپـێرن
هـەر بـەسـەری پـەنـجەی پێتــان نەخشـەی گۆڕم بۆ بكێشــن
ئـــەوەی لـــە پوشــــتەم زيـــادی كـرد ڕومـی پێدا دابـپۆشـــن
ئـــەم زەمـيـنــە بـەر فـرەيــە، بـە تەنـگـەبەری مـــەزانــن
خـــوا پلـــەو بــرەوتــان پێ بـدا گشـت شـوێن بۆ مـن فراوانن

تا كۆتايی ئەم نوزانەوەو كرِوزانەوە بە جۆشو خرۆشەو، ئەم هاوارو ڕۆرِۆيـە بـە كوڵەی بۆ سۆ لە دڵی ئەم شاعيرەدا هەڵدەكا، كە لە ژيانيدا پێكێنراوو بە ژينو ژارە.

بێ سۆ[219] ئەم ئامۆژيارەی بە كڵپە[220]ی كڵۆڵی دڵی سوتاوە، وتـەكانی لـە نـاو دڵانـدا جێ نشين دەبنو بـە نـاو كرِۆكـی نـاخەكانـدا دەچـنە خـوارێ، هـەر سـەبارەت بـەوەی هاودەمی ئەشكەنجە بـوەو لـە نـاو ژانـدا ژيـاوە، ﴿...فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ... خـوازانی چيان لـە دڵ دايـە. سـا ئـۆقرەو دڵنيـايی نـاردە سـەريانو بە سەركەوتنێكی نزيك پاداشی دان. ﴿١٨﴾ الفتح﴾.

كەسـێ سەر زەنش مەكــە، لە خواستی ئامەزرۆيــە
ئـاوەكـو بــی دركێنــی، هەرچێی كـەڕازی خـۆيـــە

چەندين بەرهەمی شاعيرانم بينيوە بەڵام بێ ناوەرِۆكو ساردو سرِ بـون، چـونكە ڕۆژێ لـە ڕۆژان لـە گوڵێيـان گـرانتر پـێ نـەگوتراوەو، لـە ژيـانێكی بـێ گرێوگاڵـدا شيعريان هۆنيوەتەوە، هەروەكو بڵێی شيعرەكان پارچەی سەهۆڵو گرمۆڵەی[221] قورِن.

---

٢١٩) بێگومان.
٢٢٠) بە گڕی.
٢٢١) تۆپەڵە.

چەند بەرهەمێکیشم دەربارەی ئامۆژیاری[222] بە بەرچاوان کەوتوە کە بارتەقای گەردیلەیێ کاریگەری بەسەر بیسەرانەوە نەبوەو، تەنیا تاڵە موێکیشی نەجولاندوە، چونکە وتار بێژەکە بە ئاستەم[223] ئاستەنگێکی[224] نەهاتۆتە رِێو هیچ گاهـ[225] دڵ شکستی نەبینیوە، ﴿يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ ... ئەو شتانەی بە دەم دەیڵێن، ئەوە نیە کە رِازەو لە دڵیان دایە، خوا لەوەی دەیشارنەوە ئاگادارترە(١٦٧)﴾.

گەر بتەوێ بەهۆی وتەکانت، هۆنراوەو هەڵبەستەکانت، خەڵکان سەرنج رِاکێش کەی، دەبێ لە پێشدا بۆ خۆت بە گرِی ئەم گوتراوە بسوتێی، خۆت بخەیتە ژێر کاریکەریەوە، چێژ لەو بەرهەمەت وەرگری، ئەوسا خەڵك گوێت بۆ شل دەکاو وتەکانت وەردەگرێ، ﴿... فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۢ بَهِيجٖ ... هەر کاتێ بارانمان لێ باراند، رِادەژێو دەبوژێتەوە، (٥) الحج﴾ .

**( بەهرەی زانین )**

﴿...وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ... زۆر شتی وای فێری تۆ کرد کە تۆ پێشو نەت دەزانین. چاکەی زۆر هێژاو گرینگت لە خواوە لەگەڵ کراوە، (١١٣) النساء﴾.

نەزانی مایەی رِیشەکێش کردنی تەمەنەو، مەرگی دڵانەو، سەربرِینی ژیانە، ﴿...إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ... من ئامۆژگاریت لێ دەکەم کە نەچیە رِیزی نەزانان. (٤٦) هود﴾.

---

٢٢٢) ئامۆژگاری.

٢٢٣) تۆزقاڵێك.

٢٢٤) کۆسپێك.

٢٢٥) هیچ کات.

زانستیش توێشوی هەستو نەستەو، وزەی گیانو ڕۆحەو، ڕۆشنایییە بۆ دیدەنی، ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ... ئاخۆ کەسێ کە مردو بو، ئێمە زیندومان کردەوەو ڕوناکیەکمان خستە پێشی، بەسەر بەستی لە ناو خەڵکا بوخلێتەوە، وەك کەسێکە کە لە ناو تاریکی دایەو هیچ دەرەتانێکی نیە؟ (١٢٢) الأنعام﴾.

هەر زانستە ئاسودەییو بەختیاری وەبەردێنێ، چونکە زانست بەسەر پەنهانی داهەڵبونەوە نهێنی پەیدابونەوە، دیار بونی نادیار بونە، بێ گومان ویستی مرۆڤیش وایە خولیای زانستی نوێیەو، خوازیاری وەرگرتنی شتی نایابو لەجێیە.

بەڵام نەزانین هەوێنی بێزار بونو خەمبار بونە، چونکێ ژیانێکی بێ نوێ خوازیو بەرهەم بونە، نە جوان بونەو، نە هەنگاوێك پێش وەچونە، دوێنێ وەکو ئەمڕۆ بونەو، ئەمڕۆی وەکو دوێنێ بونە. جا ئەگەر خودان بەختیت گەرەك بێ، با هەوڵو گەڕت لە پێناوی فەراهەم هێنانی زانستو زانیاری بێو، بۆ بەردەست کردنی شتی نەستەقو سودمەند بێ، بۆ ئەوەی خەمو خەمینیو ماتو کزیت لەبەرچاواندا ون بێ، ﴿... وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا (١١٤) طه﴾.

پێژە: ئەی پەروەندەی من! گەشە بە زانستم بدە. ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ... بخوێنە بە ناوی پەروەرندەت! کە زیندەوەر کاری ئەوە، (١) العلق﴾.

((من يُرِد الله به خيرا يفقهه في الدين... پێغەمبەری خوا دەفەرموێ ﷺ هەر کەسێ خوا خۆشگوزەرانی بۆ گەرەکە، لەم ئایینە کاراشنای دەکا)).

با یەکێ دو دڵ نەبێ کە ژیانی بەهەدەر داوەو، تەمەنی لەکەدار ماوە، با بە ماڵو سامانداری پلەو پایەو خانەدانی تێنەکەوێ لە کاتێکا نەزانەو سەبارەت بە زانست بێ دەستمایەو پەرێشانە: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰ ... ئاخۆ کەسێ بڕوای وابێ ئەوەی لە پەروەرێنتەوە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە هەموڕاستە، وەك ئەوەیە کە لەمبارە کتو کوێرە؟ (١٩) الرعد﴾.

"زمخشری" توێژەرەوەی قورئان دەڵێ:

گەر شەوانە شەونخونی بۆ زانستێ بنوێنم
خۆشترە خۆم لە هەمبێزی[٢٢٦] شۆخو شەنگێ وەسێنم[٢٢٧]
گەر ژێریو سەرە دەری، لە گرێ گوێرەیێ دەرکەم
ئارەزومەندترم لەوە هەمیشە بادەنۆش کەم
سیڕەی[٢٢٨] نوکی خامەکەم، کە بەسەر لاپەڕە دادێ
لە ڕابواردنو ئەویندارانم، لە لا خۆشتر دێ
ئەی ئەو کەسەی بۆ پلەو پایەو ڕێزم خوازیاری
لات وایە هاوتای یەکن تەمبەڵیو شکۆداری
ڕەوایە من شەوگارەکان، بە بێ خەو بەسەر بەرم
تۆش هەر پڕخەو هۆڕت بێو، ئەوسا بێیە هەمبەرم[٢٢٩]

زانستو زانیاری چەندە جێگای سەروەریو هەداریو فێنکایی دڵو دەرونەو، لەگەڵ ناخی مرۆڤدا چەندە لەگەڵ یەك لێکن، ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ... ئاخۆ کەسێ لە پەروەردیاری خۆیەوە بەڵگەی ڕونی بۆ هاتبێ، وەك کەسێکە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ خەملاوە[٢٣٠] و شوێن ئارەزوی خۆیان کەوتون؟ (١٤) محمد ﴾.

٢٢٦) لە ئامێزی.
٢٢٧) وەحەسێنم.
٢٢٨) دەنگی.
٢٢٩) هاوتای من.
٢٣٠) ڕازاوەتەوە

## هونــەری شــادی

ئەوەی شادی لە دڵ دایەو، هەدادایی‌و هەداری لە لایە، لە ناو گەورەترین بـەهرەی خوادایە، شادی دڵە بیرو هزران مەند[٢٣١] دەکاو، ژیان ڕەونـەق دار دەکـاو، کـردو کۆش بەردار دەکا، بۆیە گوتراوە: شادی هونەرێکە ئاشنا بونی گەرەکە، کەسـێ بزانـێ بـە چ چەشنێ ڕامی دەکاو ڕەنێوی دێنێ، ئەوا خۆی لێ بەهرەمەند دەکاو، هەسـت بـە تـامو چێژی ژیان دەکاو، دەزانێ لە گشت لاوە بە بەهرەی خواوە دەوری دراوە.

بنچینەی هەرە ڕەسەن لە خواستنی بەختەوەریدا بڕوا بە خۆ بونە، بـڕوا بونێـك بە تەوژمی هـیچ زریانـێ نەهـەژێ‌و بـە هـیچ کارەسـتاتێ نەشـێوێ، بـە سـوکە دەردێ هەراسان نەبێ.

هەر بە پێی ئەو وزەی لە ناو دڵ دایە، دەرون ئاڵو والایە.

بە دڵنیاییەوە سروش خاوی‌و بێ بەرگەیی و[٢٣٢] هەراسانی، دەبنە کاروان سەرای[٢٣٣] دڵ کێشی و[٢٣٤] برەشی و[٢٣٥] پەرۆشی[٢٣٦]، ئینجا هـەر کەسـێ خـۆی لەسـەر ئـارام گـری‌و بـەرگری ڕابێنـێ، بـە کـەم بـەهاوە لـە ناخۆشـیان ڕادەمێنـێ، بـاری گـران بـە سـوك هەڵدەسەنگێنێ.

**گــە نجـــێ گـورگـی بـــاران دیـتــە بـــێ**
**دەبـێ بـێ پـــەروا[٢٣٧] لە قــوڕو لیتـە بـێ**

٢٣١) هێـور.
٢٣٢) خۆ نەگری.
٢٣٣) قۆناخی کاروان.
٢٣٤) دلگیـری.
٢٣٥) خەمگینی.
٢٣٦) دڵ ڕەنجی.
٢٣٧) بێ ترس.

بە هەمان شێوە بەرچاو تەنگیو کورت ڕوانی، تەنیا خۆ پێزانیو هیچ کەس بە هیچ نەزانی، هاوڕەنگی ئەم پێناسەیە دەبێ کە خوای گەورە نەیارانی خۆی پێ ناوزەد دەکا: ﴿... أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ ... هەر خۆیان لە بیرە، (١٥٤) آل عمران﴾.

هەروەکو بڵێی ئەو بێ بیرانە وایان لە مێشکی چەقیوە ئەم جیهانە لە پێناوی چاوی کاڵی ئەوانەوە ڕەخسیوە، هەر ئەم ژیانەیان پێ ژیانە لە بەرژەوەندی ئەوانە، ئەوەندە خۆویستو خۆپەرستن هەر خۆیان خۆش بێ با خەڵکی تر فەرامۆش بێ.

پێویستە منو تۆ ئەم هەڵەیە ڕاست کەینەوەو، جار جار بە لای خەڵکدا لاکەینەوە، هەر لە پێناوی ویستو خواستی خۆمان تێ نەکۆشین، جیا لەوە کەمێ خۆمان لە یاد کەینو خەمان لە دڵ بە با کەینو، هەم خۆمانو خەڵکی تریش بەختەوەرو گوشاد کەین.

یەکێ لە بنەمای هونەری بەختەوەری ئەوەیە: جڵەوی بیرو هزرت لەبەردەست دابێو نەیێڵی بەرهەڵدا بێ، ئەگینا هەر جارە بەلایێ دا سەرپێچی دەکاو یاخی دەبێ، هەرچی دیرۆکی[٢٣٨] ڕەشی رابردوی بەسەر چوتە هەر لەو چاخەی چاوت بە ژیان هەڵێناوە تا ئێستای لە ئاراوە، هەموی بەسەرتدا دەخوێنێتەوە. بێ گومان، ڕەوشی بیرو هزر هەروایە ئەگەر پرشو بڵاو بێ ڕابردوی خرۆشاوت وەیاد دەخاتەوەو، داهاتوی سامناکیشت پەرتو پێوار[٢٣٩] دەکا، ئەوسا هەموگیانت لە پەلو پۆ دەکەوێو دەهەژێ، ناخو دەرونت هەڵدەقرچێ، دەسا بە سای کردو کۆشێکی بەردارو[٢٤٠] نەپساوە هۆشو بیرت جڵەوکێش کە، ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ... جا خۆت بدە دەس ئەو خوایە، کە هەر زیندوەو نامرێ، (٥٨) الفرقان﴾.

بنچینەیەکی تریش لە تۆژینەوەی[٢٤١] بەختیاریدا ئەوەیە: ژیانی ئەم دنیایە بە پێی قەبارەو سەنگی خۆی هەڵی سەنگێنیو بی نرخێنی، تەنیا شیاوی ئەوەیە پشتی

---

٢٣٨) مێژوی.

٢٣٩) تەفرو تونا.

٢٤٠) بەرهەمدار.

٢٤١) بە شوێن گەڕان.

لێ هەڵکەیو بە گاڵتەو گەپی سەیرکەی، هەوەسی دنیا ڕەوشی وابێ، هەموبەدکارێی لەودا پەیدا بێ، سەرکێشی دڵ کێشی بکاو خاکە ساری تێدا بێ، چۆن دەبێ شیاوی ئاخ بۆ هەڵکێشانو ئەم هەمو هەوڵو ڕەنجە بێ.

خۆشیەکەشی هەر لێڵە، فاقو بریقی هەڵخەتێنە، پەیمانو بەڵێنی وەکو تراویلکەن، ئاواتو خواستەکانی ئێستاکەش هەر بەڕێوەن، ڕێز دارو بەهرەداری ڕەشك پێ براوە[٢٤٢]، بەهرەو خەڵاتی لە ژێر مەترسیدایەو، شەیداو ئەوینی بە تیخی بێ بەڵێنی سەربڕاوە.

بـاوو باپیـرانی ئێمـە، خـانوبەرە پێـك دەیـێنن
کەچی ئێمە لێی خاوەنین، تاقەڵو کونـد لێـی دەخـوێنن
لـە تاوی دنـیا دەگرینو، هـیچ کۆمـەڵێکیش نابـێ
کە دنـیا کۆیان کاتەوەو، تا سەر لەگەڵ یـەك دابـێ
چـیـان بـەسـەرهـات زۆردارانـی بـەرەی پـێـشـو
هەم خۆیانو گە نجینەشیان، لەبەرچاو نەماو ون بـو
هەر کەسێبێ، دەرامەتـی دەشـتو بـیـابـان پڕ بکـا
ڕۆژێ دێ گۆڕی تەنگە بەر لە پڕێ باوەشـی پێ بـکا
یەك بە دەنگت بانگیان بکەی، کپو کەڕن وەڵام نابێ
هەروەکو بڵێی نەیان بیستبێ، مافی دەربڕینیان درابێ

لە فەرمودەی پێغەمبەری خوادا هاتوە ﷺ: کە هەر هونەرێ هەوڵو ڕەنجێکی دەوێ وەکو دەفەرموێ: ((انما العلم بالتعلم، والحلم بالتَّحَلُّم... بەڵام زانست بە فێر بونەو، نەرمو نیانیش بە هەوڵ بۆ دانە)).

هەم لە هونەری خوڕەوشتە، فەراهەم هێنانی خۆش بەختیو ڕوگەشیو، بەکارهێنانی هۆکارەکانیو، هەوڵ دان بۆ دەست پێشخەری لێ کردنی، هەتاوەکو دەبێتە خوڕەوشتێکی خۆڕسکی. بێ گومان ژیانی دنیا ئەوەندەی لێ ناوەشێتەوە ئێمە ڕوگرژو جاڕسو بێزار کا.

---

٢٤٢) ئێرەی پێ دەبردرێ.

**یاسای مەرگە لەم جیهانە، بێ هەڵبوێری پیادە دەکرێ**
**بۆیە دنیا بۆ هیچ کەسێ حەساو گە نیەو بە ماڵ ناکرێ**
**تۆ هەست دەکەی لەم ژینەدا مرۆڤ هەواڵی پێ ئەدرێ**
**کەچی هەر خۆی لە ناکاوێ هەواڵی مەرگی لێ ئەدرێ**
**شەیداو ئەوینی ئەم ژیانەی، کە لێڵو لێخن ڕەخساوە**
**گەرکتە پاکو ڕۆشن بێ، ژینی دنیای ئەم زەلکاوە**
**ئەوەی پێچەوانەیی لەم ڕۆژگارە مەبەس بێ**
**وەکو بڵێی تروسکەی، ئاگری لە ئاو گەرەك بێ**
**ئەوسا دەشێ مەحالت بۆ بێتەدیو، نەشیاوێکت بۆ بشێ**
**کە لەسەر لێواری مەرگا، داری خواستت وەبەربێ**
**ژیان خەوتنەو مردن زەنگی ئاگایی**
**بەندە لە نێوان هەردوکیا، سوارێکی تاوداریی**
**پەلەو دەس پێشخەری کەن، لە ئامانجو مەبەستان**
**لە پەرتوکێ تۆمارە، مەودای ژیانو تەمەنتان**
**چارەوێی لاوێتیان تاو داو، زۆر بە پەلەو تاڵوکە بون**
**تا بۆ لای خوایێ وەگەڕێن، کە خواستراوی دەستی ئەو بون**
**هەرچەندە هەوڵو گەڕت بێ، ڕۆژگاربێ خەشو لەکە بێ**
**ژیانیش هەروا ڕەخساوە، ڕۆژگار نەیاری حەزت بێ**

ڕاستێیك كە سەرپێچی لێ ناكرێ ئەوەیە: تۆ ناتوانی هەرچی هۆكارو شوێنەواری خەفەتباریە لە ناو دڵت دا ڕیشەكێشی كەی، چونكە ژیان بەو شێوە ڕەخساوە ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِى كَبَدٍ... ئێمە ڕەگەزی مرۆمان دەگەڵ خەمان وەدی هێنا، (٤) البلد﴾ .

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ ... ئێمە مرۆن لە تنۆكێكی[٢٤٣] ئاوێتە[٢٤٤] وەدی هێنا تا تاقی بكەینەوە، (٢) الإنسان﴾.

---

٢٤٣) دلۆپێك.

﴿...لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا .. تا ئێوە تاقیکاتەوە کامتان ئاکاری جوانترە، (٢) الملك﴾.

بەڵکە ئەوە لە تۆدا داواکراوە، کۆڵی خەمو کەسەران بەسەر شانتەوە سوك کەی، وە لێ[245] بتەوێ ڕیشاڵی پەرێشانی لە بنەڕەت دا بن بڕ کەی، دەبێ ئەوە لە بەهەشتی دوا ڕۆژا چاوەڕێ کەی، هەر بەو بۆنەوە خۆشبەختانی ناو بەهەشت دەڵێن ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ ... شوکرانە بۆ ئەو خودایەی کە سەری لەسەر نەهێشتین، (٣٤) فاطر﴾.

ئەو فەرمودەیە وا دەگەیێنێ، تەنیا لە بەهەشت دا یەکجارەکی خەم نامێنێ، هەروەکو باری ڕقە بەری هەر لەوێدا لە کۆڵ دەبێتەوە ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ... کینەمان لە سینەیانا، داماڵیوە. (٤٣) الأعراف﴾.

جا هەر کەسێ لە ڕەوشی چەپەڵکاری ئەم ژیانەی دنیا بەئاگابێ، لە کۆسپو لەمپەرانی چاو دەپۆشێو، لە بێ بەڵێنیو پەیمان شکێنی دنیا خۆی دەبوێرێ، دەزانێ سروشتی ئەم ژیانە هەر ئەوەندەی لەباردایە.

**پەیمانو سوێندی دا دا پەیمانی خۆی نەشکێنێ**
**هەروەکو بلێی سوێندی خوارد، پەیمانێ جێ نەیێنێ**

ئەگەر گوزەرانی ئەم ژیانە ئاوا بێ، کە بۆ کەس بەردەس نابێ، جێی خۆیەتی کەسی زیتو ژیر هێندە کزو مات خۆی نە نوێنێو سەری بۆ کلۆڵی دانەنوێنێ، بەڵکە تا پێی دەکرێو وزەی لەبەردا بێ، پێویستە لە ڕوی ئەشکەنجەو ئازاردا خۆگر بێ، ﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ... تا بۆو دەکرێ چەكو جبەخانەی شەڕو ئەسپی سواری پەیدا بکەن، دوژمنی پێ بترسێنن، کە دوژمنانی خوداشن، (٦٠) الأنفال﴾.

---

٢٤٤) تێکەڵاو.

٢٤٥) بەڵام.

﴿... فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ...﴾ ... هەرچەند بەلای لە ڕێی خوادا توشی هاتن. نە هیچیانی بێ توانا کرد نە زەبونی ڕوی تێکردن، (١٤٦) آل عمران ﴾.

## هەڵوێستەیەك...

دڵ پڕ مەبە: ئەگەر تۆ بێ دەستمایەو هەژاری، جگە لە تۆ پەنگیان خواردوە لە ناو قەرزاری، ئەگەر تۆ خاوەنی ئامێری گواستنەوە نی، بێ لە تۆ ئەوەندەی لەسەر پێیەکانیان بڕۆن پێیان قڵیشاون[٢٤٦] ئەگەر تۆ لە ئاهی چەند دەردێکی دەناڵی، جیا لە تۆ سالآنێکە لەسەر چار پایەی[٢٤٧] ڕەقو تەق کەوتون، ئەگەر تۆیەك جگەر گۆشەت لەدەست داوە، جگە لە تۆ چەند ڕۆڵەیێکی لە یەك کارەساتدا لە دەست داوە.

دڵ پەست مەبە: چونکو تۆ موسڵمانی، سەبارەت بە خواو پەیامبەرانیو فریشتەکانی، سەبارەت بە ڕۆژی دوایيو قەزاو قەدەری خوا باوەڕداری، چەند کەسانی جیا لە تۆ بەرامبەر خوای پەرەوەردیار بێ باوەڕن، نوێنەرانی خوا بە راست نازانن، دەربارەی کتێبانی خوا جیا کارن، لە ڕۆژی پەسڵان[٢٤٨] سەرپێچی دەکەن، لە قەزاو قەدەر لاملی دەکەن.

دڵ پەست مەبە: ئەگەر توشی خراپەو تاوانێك هاتوی، فرمێسکی ژێوانی هەڵ ڕژێنەو پەشیمانی بنوێنە، ئەگەر هەڵەیێکیشت کردوە ڕاستی کەوە، بزانە میهرو سۆزی خوا فراوانەو هەمیشە دەرگای کراوەیە، لێبوردەیی گشت گیرە، گەڕانەوەی بەندەی قەبوڵە.

دڵ توند مەبە: بە سای دڵ توندی خۆت توشی دڵاو دڵی دەکەی، بونیەت بەرەو ڕوخان دەبەی، دڵ ماندو شەکەت دەکەی، خەوی شیرینت تاڵ دەکەی، بە هەناسەی سەردەوە شەوانت بەسەر دەبەی.

---

٢٤٦) قەڵشاون.

٢٤٧) قەرەوێڵە.

٢٤٨) قیامەت.

شاعیـر دەڵێ:

**چەندین بەڵا و مەینەت هەن گەنج و لاوێی هەراسانە**
**بـەڵام نـازانـی ئـەم دەردە ڕێی ئازادیە و دەرمانـە**
**کاتـێ ئازار زۆری هێنا و جار لە دوای جار توند دەبـو**
**دوای نائومێدی خۆرهەڵات، ئازارەکانیشـی لـێ ون بو**

## بەرگـەی شـە پۆلی هەست و سـۆز

بـە سـایی دو هۆیـان سـۆزی مـرۆڤ هـەڵ دەقوڵـێ و کڵپـە دەسـێنێ: کـاتی زۆری بـۆ هێنـانی شـادی، دوەم لـە کـاتی ڕودانـی کارەسـاتێکی بەرچـاو ڕەش دا، لـە فـەرمودەی پێغەمبەریشدا هـاتوە: ((واني نهيت عن صوتين احمقين فاجرين: صوت عند نعمة، وصوت عند مـصيبة... مـن دو دەنگـی نـاخۆش و خـراپم لێ قەدەغـە کـراوە: دەنگـێ لـە کـاتی خۆشیدا هەڵ دەبڕێ، دەنگێ لە کاتی بەڵا و کارەساتدا هەڵدەبڕێ)).

﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ... هەتا ئێوە بـۆ شـتێ لە دەستو دەچێ، خەم نەخۆن و بە دەسکەوتو دڵ خۆش نەبن،(٢٣) الحديد ﴾.

هەر بە سای ئەوەیە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (( انـما الـصبـر عنـد الـصدمة الاولـی... ئەو ئارامگرتنە گرنگە لە سەرەتای ڕودانی بەڵادا دەگیرێ)).

جا هەر کەسێ لـە کـاتی ڕودانـی مەرگەسـاتێ، یـا دڵ خۆشـێیکی بـەرفرەدا بەسـەر هەڵچونی هەست و سۆزیدا زاڵ بێ، شیاوی ئەوەیە: مـەدالیای خـۆگری و داسـەپاوی لـە مل بکرێ، بە هەمان شێوە بە بەهرەی بەختەوەری شاد دەبـێ و چێژ لـە سـەرکەوتن بەسەر هەواو هەوەسدا وەردەگرێ.

خـوای باڵادەســت مرۆڤـی وا هەڵـسەنگاندوە، کە لـە خۆشــیدا سنور دەبـەزێنیو لافو گـەزاف لــێ دەداو خـۆی هەڵدەکێـشێ، ﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٢٢﴾ المعارج﴾.

ئەگەر دەکەوێتە خۆشیش، ڕژدی دەنوێنێ، مەگین[249] ئەوانەی نوێـژ خـوێنن. هـەر توشی گزو بو هاوار دەکا.

ئەوان لە شینو شاییدا مـام نـاوەنجین، لـە خۆشـیدا سوپاسگوزارن، لـە ناخۆشـیدا خۆگرو ئارامن.

هەستو سۆزێکی لەسنوربەدەر، خاوەنەکەی شەکەت دەکا بەڵام چ شەکەتیێ، وەها ئـازاری پـێ دەگەیـەیێنێ، دای ئـەڕمێنێو خـەوی لـە چـاوان نامێنــێ، هـەر گـاه ڕقو تورەیی بی گرێ زۆر بە توندی هەڵدەچێو، ڕادەچڵەکێ، هەڕەشـەو گوڕەشـان دەست پێ دەکا، هەرچی ڕازی[250] دڵیەتی ئەی پـرژێنێ، وای بەسەر دێ هەروەکو بڵێی پـاوانی پوشێی گڕی گرتبێ، بەم چەشنە سنوری دەبـەزێنێ، ئەگـەریش ڕۆژێ شـادی ببینــێ، هۆشی لای خۆی نامێنێ، هەڵدەپەڕێو سەما دەکا، لـە قـوڵایی خۆشـیدا خـۆی لـە بیر دەکا، سەنگو ڕێزی لە دەست دەدا، خۆ دروست نیە ڕقـی لـە یـەکێ دابگـرێ، زۆر بـە خراپـە لێـی دەدوێ، لـە چـاکەکان خـۆی دەبـوێرێو، هـەر بـە خراپـەکانی دەوێـرێ، بەهرەکانیشی لـە ژێـر پێـی دادەپۆشـێ، ئەگـەر یەکێکیـشی خـۆش بـوێ، لای وایـە لـە ڕێزی فریشتانەو، لەو پەڕی چڵە پۆپەی تەواویانـە. ئـەوەش بـە فـەرمودە لـە قەڵـەم دراوە: لە ئاستی خۆشەویستەکەتدا سنورێ دابنێ چونکو دەشێ ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێتە نـەیارت، بـە هـەمان شێوە بـا ڕق لێ بونـەوەی نەیارەکەشت سنور دار بـێ، لەوانەیـە ڕۆژێ دابـێ ببێتـە هاوڕێیـەکی خۆشەویـستت[251]. لـە فەرمودەیـەکی پێغەمبـەردا ﷺ هاتوە: (( وأسألك العدل فـي الغضب والرضـا... خوایـە داوای یەکسانیت لێ دەکـەم لـە ڕەزامەندیو ڕق لـێ بونەوەدا.

---

٢٤٩) مەگـەر.

٢٥٠) نهێنــی.

٢٥١) ئاماژەیە بۆ ئەو وتەیە: (( احبب حبيبك هونا ما فعسى ان يكون يوما ما...)).

جا هەر کەسێ ئامادە بێ هەستو سۆزی دەستەمۆ کاو بیرو هۆشی بکا بە دادوەرو هەموشتێکی پێ هەڵسەنگێنێو هەر شتەی پلەو پایەی خۆی پێ بدا، ئەوا چاوی ڕاستەقینە دەبینێو دەرکی پێ دەکاو ڕاستە شەقام دەدۆزێتەوە، ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ... ئێمە پێغەمبەرمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراوەو وێڕای ئەوان، کتێبو هۆی هەڵسەنگاندمان نارده خوار، هەتا خەڵك بێ جیاوازی لە ناو یەکا ڕەفتار بکەن، (٢٥) الحديد﴾.

بێگومان ئایینی ئیسلام بە ڕەوشت بەرزیو دابو نەریتی پەسندەوە هاتوە هەروەکو بۆ خۆی بەرنامەیێکی گونجاوو یاسایێکی مام ناوەنجیو ئایینێکی پیرۆزە، ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ... بەو شێوە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی هەڵبژاردە، (١٤٣) البقرة﴾.

ئینجا هاوسەنگیو یەکسانی خوازراوێکی سودمەندە لە خوڕەوشتی نمونەییدا، هەروەکو لە بنەمایەکانی یاسادا خوازراوە، بە هەمان شێوە ئایینی ئیسلام لەسەر ڕاستیو دادوەری بنیات نراوە، ڕاستی لە هەواڵ دانو دادوەری لە یاسادا لە گوفتارو لە کردارو ڕەوشتدا ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ... قسەکانی پەروەندەت -لە بێ لایەنگریو ڕاستیدا- تەواو بێ کەمو کوڕین. (١١٥) الأنعام﴾.

## بە سای پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵان بەختەوەر بون

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگەوازی خوایی بۆیانی هێنا بە دیاری، ئەم بانگەوازە بۆ داراییو کۆکردنەوەی سامان نەبو، نە گەنجینەی لە دەست بو، نە خێوی باخو باخاتو کۆشكو تەلاری بەرز بو، لەگەڵ ئەوەشدا یارانی ڕویان تێ دەکرد، ئەگەر چی گوزەران سەختو ماندوشەکەت بون، بەڵام پەیمانی مانو نەمانیان لەگەڵ بەست، ژمارەیان گەلێ کەم بو، ڕوتو ڕەجاڵو بێ کەس بون، ترسیان لەوەدا هەبوخەڵکان بیان خەنە ژێر پێیان، کەچی بەوپەڕی ناخو دڵیان پێغەمبەریان خۆش دەویست.

لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە شیوێ گەمارۆ دران، ئەوەی بەزاران بخورێ لێی بێ بەش کران، سەنگو ڕێزیان لەکەدار کرا، خزم خوێشیان بونە دوژمن، بە دەستی بێگانە ئازاریان چەشت، لەگەڵ ئەو هەمومەینەتیەدا دەیان گوزەراند، کەچی لە کانگای دڵیانەوە پێغەمبەری خوایان خۆش دەویست.

هەیان بو بەسەر لمی سوربووەوەی بەر هەتاودا ڕادەکێشران، هەندێکی تر لە چۆڵگەدا کۆت بەند دەکران، هەندێکیشیان بە چەندین جۆرە سزا لە لایەن بێ باوەڕانەوە ئازار دران، بەم دەردەیان دەبردنو گاڵتە جارِیان پێ دەهات، لەگەڵ ئەوەدا بە پلەی هەرە بەرزی خۆشەویستی خۆشیان دەویست.

خاكو زێدو ماڵو حاڵیان زەوت کرا، لە یاریگەی گەنجو لاوو ڕۆڵەکانیان، لە باوەشی خاوو خێزانیان وەدەر نران، کەچی لە کرۆکی دڵیانەوە خۆشیان دەویست.

بە سای ئەو بانگەوازەی پێغەمبەری خوا ترسو لەرزێکی وایان پێ گەیشت، خەریك بو دڵیان دەرچێو گومانیان دەبرد خوا لە هانایان نایێ، کەچی بەوپەڕی خۆشەویستی خۆشیان دەویست.

گەنجیو لاوێتی خۆیان خستە سەر تیخی شمشێرەکانو، نوکی شمشێرەکان بەسەر سەریانەوە هەروەکو چقڵی داران بون.

**هەروەکو بڵێی سێبەری شمشێرانی سەر سەرمان**
**سێبەری درەختی سەوزن، دەڕازێ دەوروبەرمان**

پیاوەکانیان گیانیان خستە سەر دەستو پێشوازیان لە مەرگ دەکرد هەروەکو بڵێی لە گەشتو سەیراندا بن یا لە شەوانی جەژندا بن، سەبارەت بەوەی پڕ بە دڵیان پێغەمبەریان خۆش دەویست.

گەر یەکێ دەکرایە پەیامنێر دەیزانی ئەم هەڵەی کۆتا هەلی ژیانێتی، کەچی پەیامەکەی دەگەیاند، یەکێ بە کارێکی پێویست دەنێردرا وای دەزانی ئەم جارەیان بە ساخی ناگەڕێتەوە، بەڵام بە سینەیێکی گوشادەوە بەڕێ دەکەوت، چونکو پێغەمبەری خوایان لە چاوی خۆیان خۆشتر دەویست.

وەلێ با بزانین، بۆ ئەوەندەیان خۆش دەویست، دڵیان ئەوەندە بەو پەیامە ئاوەدان بو، بەو یاسایەو بەو ڕێسایە هێندە خۆشحاڵو ئارام بو، ئەوەندە بە هاتنی ڕوگەش بون، هەر کە شوێن پێی ئەویان هەلگرت، هەرچی دەردەسەری‌و چەرمەسەری، ئازارو ئەشکەنجەو ڕەنجبەری هەیە لە یادیان چو؟!

لەمەڕ ئەوە بو هەرچی ڕەوشتی بەرزە، دڵشادیەو ڕوی بە خەندە لە ڕوی پیرۆزی ئەویاندا بەدی دەکرد، هەرچی ئاماری[٢٥٢] جوامێری‌و ڕاستیە لەو پێغەمبەرەدا ﷺ دەدرەخشان[٢٥٣]، دەربارەی هەر کارێ سەختو گرانە وەلام گۆی ڕاپرسیان بو، بە سۆزی خۆشەویستی گڕی دڵی دەکوژاندنەوە، بە وتەی ناسك‌و شیرینی کڵپەی سینەی دەمراندنەوە، بەو پەیامەی بەردەستی، زاخاوی ڕۆحەکانی دەدانەوە.

نمەی دڵ گوشادی بەسەر دڵ دا دەرژاندن، لە پێناوی گەیاندنی پەیامەکەی دەرکیان بە ئەشکەنجەو مەینەتی نەدەکرد، ئەوەندە تنۆکی[٢٥٤] دڵنیا بونی بەسەردا دەباراندن هەرچی زوخم‌و ژین‌و ژاری ڕابردویانە لە بیری دەبردنەوە.

بە ڕێنمایی‌و ڕێنوێنی دڵی ڕۆشن دەکردن، بە پایە بەرزی‌و شکۆداری بەرچاوی ڕۆناك دەکردن، باری گرانی سەردەمی نەفامی لە سەر شاندا لادەبردن‌و ئاماری[٢٥٥] بت پەرستی لەسەردا ڕادەماڵین، پەتی هاوبەشی دانان‌و گومڕایی لە مل دا دادەڕنین، کڵپەی گڕی کینەو ڕقەبەری‌و دوژمن کاری لە ناخیانەوەدا دەمرکاند، بارانی دڵنەوازی[٢٥٦] بەسەر هەستەکاندا هەڵدەڕژاند، ئەوسا گیان‌و ڕۆحیان هێورە دەبون، هەموئەندامی لەشیان بێ وەی[٢٥٧] دەبون، هەست‌و نوستیان دەسرەوتن‌و فێنك دەبون.

لە هاودەمی پێغەمبەردا ﷺ چێژی ژیانیان هەڵدەچەشت، حەسانەوەیان بەدی دەکرد، لە خزمەتی ئەودا شادی‌و گوشادیان هەست دەکرد، لە گوێڕایەڵی ئەودا سەرفرازیان دەرك دەکرد، لە شوێن پێ هەڵگرتن دا دەوڵەمەندیان پەی پێ دەبرد.

---

٢٥٢) نیشانەی.
٢٥٣) دەتروسکا.
٢٥٤) دڵۆپێ.
٢٥٥) نیشانەی.
٢٥٦) دڵنیایی.
٢٥٧) بێ بەلا.

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ... ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە بەزەیی‌و چاکەیەك بی بۆ هەمو خەڵکی دنیا، (١٠٧) الأنبياء ﴾.

﴿ ...وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ... بێ گومان تۆ لە ڕاستەڕێ، ڕێبەری، (٥٢) الشورى ﴾.

﴿ ... وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ... لە تاریکی دەریان دەخاو بەرەو ڕوناکیان دەبا، (١٦) المائدة ﴾.

﴿ هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ... هەر ئەویشە لەناو خوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردن، کە نیشانەکانی ئەویان بۆ وەخوێنێ‌و لە کتێب‌و کارزانی ڕایانبێنێ، هەرچەند ئەوان لەپێشودا لەوپەڕی گومڕاییدا بون، (٢) الجمعة ﴾.

﴿ ... وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ ... گرانایی زنجیریان لەسەر لادەبا، کە بەوانیان شەتەك[٢٥٨] دا بون، (١٥٧) الأعراف ﴾.

﴿ ... ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ ... هەرکاتێ خوداو پێغەمبەر لێو داوا دەکەن کارێ بکەن ئێوەی پێ ببوژێنەوە، جێبەجێی بکەن، (٢٤) الأنفال ﴾.

﴿ ...وَكُنتُمۡ عَلَىٰ شَفَا حُفۡرَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنۡهَاۗ ... ئێوە لەسەر لێواری ئاگر بون، هەر خوا بو ڕزگاری کردن، (١٠٣) آل عمران ﴾.

بە ڕاستی هاوەڵان لەگەڵ پێشەنگ‌و سەرمەشقی[٢٥٩] خۆیاندا بەختەوەرو بەهرەوەر[٢٦٠] بون، شایستەیەو جێی خۆیەتی بە هاوەڵایەتی ئەو پێغەمبەرە بەختیارو شادمان بن.

---

٢٥٨) ئەوانی پێ بەسترابونەوە.

٢٥٩) پێشەوا.

٢٦٠) بەهرەمەند.

پـەروەردگارا: میهـرو سـۆزو هێمنـیو هـەداری بەسـەر ئارادکـاری بیرو هزرانـدا[٢٦١] دابڕژێنە، کە لە کۆتو زنجیری لارێییدا ئازادی کردن، گیانو ڕۆحی لە ئاستەنگی[٢٦٢] پەشێویدا[٢٦٣] ڕزگار کردن، پەروەردگارا: لە هاوەڵو یارانی شکۆداری ڕەزامەندی بنوێنە، لە پای ئەو هەوڵو کۆششەی پێش کەشیان کرد.

## بێــزاری لە ژیــان مەنوێنـــە

هەرکەسێ هەنگاوی نوێ نەنێتو بە یەك شێوە بگوزەرێنێ، شیاوی توش بونی دەردی بێزاریە، چونکێ هەر خۆی هۆکاری ئەم دەردەیە، مرۆڤ بەو سروشتەی خوا تێیدا ڕەخساندوە لەسەر یەك شێوە گوزەراندن جاڕس و[٢٦٤] هەراسانە، هەر بە سای ئەوەیە خوای پاكو بێ گەرد هەمە ڕەنگیو هەمە جۆری لە کاتو شوێنەکانداو، لە خواردنو خواردنەوەو، دروستکراوەکاندا فەراهەم هێناوە[٢٦٥]، بڕوانە جیاوازی نێوانی شەو ڕۆژ، گرانو ئاسان، ڕەشو سپی، گەرمو سارد، سێبەرو هەتاو، ترشیو شیرنی، خوای کردگار لە پەڕتوکی خۆیدا باسی لەم هەمە ڕەنگیو جۆراو جۆریە کردوە:

﴿... يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ ...﴾ لە دەرونی[٢٦٦] تراوێکی[٢٦٧] هەمەڕەنگ دێتە دەرێ، ﴿النحل ٦٩﴾.

﴿... مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ...﴾ بە ڕواڵەت وەك یەكو لە تامو ڕەنگا جیاوازن. ﴿الأنعام ١٤١﴾.

---

٢٦١) واتە: بەسەر پێغەمبەری خوادا بڕژێنە.
٢٦٢) تەنگانەی.
٢٦٣) پەرێشانی.
٢٦٤) بێزار.
٢٦٥) دروست کردوە.
٢٦٦) لە سگی.
٢٦٧) هەنگوینێکی.

﴿... وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا ... لە كێوەكانیش ڕێگەو بانی سپیو سوری جۆراو جۆری بە ڕەنگ جیای وەدی هێنان؟ ﴿٢٧﴾ ﴾ فاطر.

﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ... ئێمە ئاوا لە ناو خەڵكا زەمانە دەستاو دەس دەكەین، ﴿١٤٠﴾ آل عمران ﴾ .

"بەنی ئیسرائیل" یەكان لە بەچێژترین خۆراك بێزاریان دەربڕی هەر لەمەڕ ئەوە بو لەسەر خواردنی بەردەوام بون ﴿... لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ ... (گوتیان) موسا ئێمە بەیەك جۆرە خۆراك هەدا نادەین[٢٦٨]، ﴿٦١﴾ البقرة ﴾.

"خەلیفە مەئمون" ئەم جیاكاریەی بەجێ دەهێنا، جارە لە دانیشتنەوە جارە لە پێوە، جارە لە ڕێوە، قورئانی دەخوێندو پاشان دەی وت لە یەك شێوەدا دڵ بێزارە، ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ... ئەوانەی -چ لە پێوەو چ لە جێوە، بە دانیشتن، چ لەسەر تەنیشت دەخەون- هەر یادی خودا دەكەن، ﴿١٩١﴾ آل عمران ﴾.

هەر كەسێكیش سەرنجی بوارەكانی پەرستش[٢٦٩] بدات هەمە چەشنیو نوێكاری لێ بەدی كات، هەندێ لە جۆرەكانی بەندایەتی كردەی دڵن، یا گوفتارن، یا كردارن، یا بەخشینی پوڵو پارەن.

زەكاتدانو ڕۆژو گرتن، حەج كردنو گیان بۆ خودا بەخت كردن، هەر لە نوێژدا هەمە جۆری وەدی دەكرێ، ڕاوەستانو چەمانەوە، ڕودا خستنو دانیشتن، جا هەر كەسێ ئاسودەییو چاپوكی[٢٧٠]و، كۆڵنەدانی گەرەك بێ، لە كردەی ڕۆژانەیدا لەوە دەست هێنانی زانست دا ئاتاجی هەمە ڕەنگی دەبێ، بۆ نمونە لە بواری خوێندندا جۆرەها هونەر هەڵبژێرێ، وەكو شارەزایی لە قورئانو توێژینەوەی ژیان نامەی پێغەمبەرو فەرمودەی، كاراشنایی لە دەقە ئایینیەكان، مێژو ناسیو وێژە[٢٧١] ناسیو

---

٢٦٨) ئارام ناگرین.

٢٦٩) پەرستن.

٢٧٠) چوستی.

٢٧١) پەروەردە.

وشیاری گشتی، ئا بەم شێوەیە کاتی ڕۆژانەی دابەش بکا لە نێوانی نواندنی بەندایەتیو بەحەڵاڵی بەسەربردن، سەرەدان و[٢٧٢] لە مێوان پێشوازی کردن، گەشتو سەیرانو وەرزش کردن، ئەوسا خێوی[٢٧٣] دڵێکی زیندوو ڕۆشنایی بەخشە، سەبارەت بەوەی هەمە چەشنی خۆش دەویو هەنگاوی نوێی گەرەکە.

## نیگەران مەبە

با ئەو فەرمودەی پەروەرێنت هەوێنی دڵ نەواییت بێ: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ... ئەدی ئێمە تۆمان سینە گوشاد نەکرد؟ (١) الشرح﴾.

ئەم دڵ دانەوەیە هەمو ئەوانە دەگرێتەوە هەلگری پەیامی ڕاستینو چاویان ڕۆشنایی دەبینیو ڕێگای خوایان گرتۆتە بەر.

﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ... ئاخۆ کەسێ خودا دڵی بۆ ئیسلام گوشاد کردوەو دیارە بەر تیشکی بەزەیی پەروەرندەی خۆی کەوتوە، کەی دەبێ وەك ئەوانە بێ کە دڵڕەقن؟ هاوارە بۆ ئەو کەسانە دڵڕەقن لە یادی خودا، (٢٢) الزمر﴾.

کەوایە ڕاستەقینەیێ هەیە دڵان بەراوەڵە[٢٧٤] دەکا، نا دروستێکیش هەیە دڵان ڕەقو توند دەکا.

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ... هەر کەسێ خودا حەز بکا، بۆ خۆی ڕێگەی نیشان دەداو بۆ بڕوا بە ئیسلامەتی دڵی گوشادی دەداتێ، (١٢٥) الأنعام﴾.

دیارە ئەم ئایینە ئامانجێکە تەنیا شیاوی کەسانێکە بە دوای ڕاستیدا وێڵن. هەر کەسێ لە چاوەدێریو کۆمەکیو هاریکاری خوا دڵ نیایە لە تەنگانەدا ئەم وتەیەی لە

---

٢٧٢) سەردان.

٢٧٣) خاوەن.

٢٧٤) فراوان.

دەم دایە: ﴿ ...لَا تَحْــزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ... خەمت نەبێ ئێمە خودامان دەگەڵە، (٤٠) التوبة ﴾.

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... ئەو کەسانەی پێیان وتن: گەلە کۆمەکیو لێ کراوەو بە پەناوە دێنە سەرتان، ئەشێ ترسو لێیان هەبێ، باوەڕیان بەهێزتر بووەو گوتیان: ئێمە هەر خودامان بێ بەسمانەو چاترین پشتو پەنامان هەرئەوە، (١٧٣) آل عمران ﴾.

کە خوا یاوەرت بێو وە خۆگرو پارێزەرت بێ هەر ئەوەندەت بەسە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ئەی پێغەمبەر! بۆ تۆو بۆ باوەڕدارانێ شوێنت کەوتون، خودا بەسە، (٦٤) الأنفال ﴾.

هەر کەسێکیش بەرەو ئەو ڕێگایە ڕاستە ڕێ بێ، دەگا بە مەنزلێ خۆیو مەحاڵە کە لاڕێ بێ.

﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ... سا تۆ خۆت بدە دەس کەسێ، کە هەر زیندوەو نامرێ، (٥٨) الفرقان ﴾.

غەیری خودا بێ زەبرەو[٢٧٥]، دەستەوسانە[٢٧٦]، دەبێ بمرێو بەرەو نەمان ڕێگا بگرێ.

﴿ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ (١٢٧) إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ... خۆڕاگر بە! دیارە خۆڕاگرتنیش هەر بە خوایەو خەمیان مەخۆو لەو فێڵو تەڵەکانەش دەی کەن، دڵتەنگ مەبە. بێ سۆ خودا وێڕای خۆپارێزانو چاکەکارانە. (١٢٨) النحل ﴾.

---

٢٧٥) بێ دەسەڵات.

٢٧٦) پێویستە.

خوای گەورە کۆمەکیو بەرگری خۆی تایبەت کردوە بە دۆستانی کە بە پێی لە خوا ترسانو کردو کۆشیان کۆمەکیان دەکاو دەیان پارێزیو بەرگریان لێ دەکا.

﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... با سستی ڕوتان تێ نەکاو خەمیش مەخۆن. هەر ئێوەن کە سەر دەکەون، ئەگەر بڕواو بە خوا هەیە، (١٣٩) آل عمران﴾.

هەر شکۆداریو پایە بەرزیێك لە نواندنی بەندایەتی دا وەدی دێ.

﴿لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى ۖ وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ... ئەوانیش - مەگەر هەر بە دەم - دەنا هەرگیز ناتوانن بۆتان بە زەڕ بن. ئەگەر دەگژیشو ڕاچن، زۆر زو پشتو تێدەکەنو ڕا دەکەنو کەسیش دە هانایان نایێ، (١١١) آل عمران﴾.

﴿... لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ... خودا خۆی بڕیاری داوە: بێگومانە منو پێغەمبەرەکانم سەردەکەوین. خوا توانای بە دەسەڵاتە، (٢١) المجادلة﴾.

ئەوە پەیمانێکە سەرپێچی لێ ناکرێو بەڵێنێکە دوا ناخرێ.

﴿... وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (٤٤) فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا ... کاری خۆم بە خوا دەسپێرم، خودا چاوی لە عەبدەکانی خۆی هەیە. خوا ئەوەی لە ئاکامی خراپی ئەو فێڵەی دەیانکرد، ڕزگار کرد، (٤٥) غافر﴾.

﴿...وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ... باوەڕداران کاروباریان دەبێ هەر بە خوا بسپێرن، (١٢٢) آل عمران﴾.

خەمگین مەبە وا بزانە تەمەنت تەنیا یەك ڕۆژی تێدا ماوە، دەی کەوایە بۆ خەمان لە خۆ بار دەکەیو ڕوی خۆت گرژو مۆن دەکەی هاوارو ڕۆڕۆ دەکەی؟!

لە فەرمودەدا هاتوە: (( اذا اصبحت فلا تنتظر المساء، واذا امسيت فلا تنتظر الصباح... ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕێی ئێوارە لێ داهاتن مەبە، ئەگەر ئێوارەت کردەوە چاوەڕێی بەیانی لێدا هاتن مەبە)).

مەبەست لەو فەرمودەیە ئەوەیە: کردوکۆشت تەنیا بۆ ڕۆژی تێدا ژیانت بێ، خۆت بە ڕابردو سەرقاڵ مەکەو، لەمەڕ داهاتو حاڵت بێ حاڵ مەکە، هۆنەر[٢٧٧]یش دەڵێ:

**بە دوای چواندا وێڵ مەبەو هیواو ئومێدیش پەنهانە**
**هەر ئەو ساتەی لەبەر دەستتە جێی ئومێدو هیوای ژیانە**

جۆرێ لە جۆرەکانی گێلیو نەفامی ئەوەیە: بە ئاهو کەسەری ڕابردو خۆت بسوتێنیو هەرچی پەژارەو مەینەتی بەسەرچوە لە خۆیدا وەرئاڵێنی.

پەندێکی کوردیش دا دراوە دەڵێ: پێش گەیشتن بە ڕوباری قاچت هەڵمەکە.

ئەوەی لەو وتەیە وەردەگیرێ ئەوەیە: پەلە لە ڕودانی ڕوداوان نەکەی، دەردو خەمانی لە خۆ بار نەکەی هەتاوەکو پێی دەگەیو تامو بۆی لێ چێژ دەکەی.

یەکێ لە پێشینان دەڵێ: ئەی بەرەی مرۆڤ تۆ تەنیا سێ ڕۆژت هەیە، دوێنێی ڕابردو: سبەی نەهاتو، ئەم ڕۆژەی لە ڕو، دەی وریا بە ئیمڕۆ خوای خۆت نەڕەنجێنی. ئەو کەسەی خەمی ڕابردو ئێستاو داهاتو لە خۆی بارکا چۆن بۆی دەلوێ ژیان بەسەربا؟!

چۆن ئاسودەیی پەی بەدڵی یەکێ دەبا هەر داخوکەسەرێ ڕویدا یادەبێ لەناو دڵیدا تاو توێیکا؟! ئەوسا لەناو بیروهزریدا بیهێنیو بیباو بە بێهودە گیانی پێ ئازار بدا!

دەرسێك کە لەو فەرمودەیەوە وەردەگیرێ (( اذا اصبحت فلا تنتظر المساء واذا امسيت فلا تنتظر الصباح... ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕێی ئێوارە لێدا هاتن مەبە، ئەگەریش ئێوارەت کردەوە چاوەڕێی بەیانی لێدا هاتن مەبە)).

ئەو دەرسەی لەو فەرمودەیە وەردەگیرێ ئەوەیە: ئومێدت بێ مەودا نەبێ، ڕۆژی کۆچی یەکجارەکیت لەبەرچاو بێ، کردەی بەردار بنوێنە، با خەمو خەفەت وات لێ نەکەن جگە لەم ڕۆ بە ڕۆژی هەڵاتنی خواستەکانت بقرسێنی، هەر لەم ڕۆژە هەوڵو ڕەنجت بخەرەگەڕ، کاروپیشەت ڕێكو ڕێزکە، هەر بەو ڕۆژە بایەخ بدە، ڕەوشتی نایاب بنوێنە، بە باری تەندروستیت گرنگی بدە، هەڵسوکەوتت لەئاستی خەڵکدا ڕاستکەوە.

---

٢٧٧) شاعیر.

## هەڵوەسـتەیەك

دڵ گیـر مەبە: چونکێ بڕیاری خوا دراوە، قەدەری پیادە کراوە، مەرەکەبی خامـە وشـکەوە بـوەو، لاپـەڕە هەڵپێـچراوەو، هـەموکرداروو فـەرمانێ بـەجێ بـوە، کەواتـە دلگیری تۆ هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ، تازە کار لـە کار تـرازاوەو دەهۆڵ دڕاو تەقـەی بڕاوە.

خـەمبار مەبـە: خـەمباری تـۆ بەرگـەی شـالاّوی ڕۆژگـار نـاگرێو، بـەری ڕۆژێ بـە بێژینگێ ناگیرێ، بۆت نارەخسێ چـرکە ژمێـری خولـەك چـەپە خولەکـەی[٢٧٨]، بـەرەو دواوە گوزەرکەی، ئاوی ڕوبار بەرەو ژورو سەرەو هەڵکەی[٢٧٩].

زویـر مەبـە: زویـری وەکـو ڕەشـەبای سـەرکەشو هەڵەشـەیی وایـە کـەشو هـەوا بشلەژێنێ، ئاوی بێ گەرد بشێلوێنێ، ڕەنگی ئاسمان بگـرژێنـێ، لـقو پۆپـەی گـولان لـە گوڵشەندا تێك بشکێنێ.

خەمگین مەبـە: خـەمینی وەکـو ڕوبـارێکی بـە هـاشو هـوش وایـە کـە لـە دەریـاوە هەڵدەڕژێو بۆ ناو دەریا دادەڕژێ، وەکو کەسێکە ڕیسی لـە خـوری بهۆنـێ و[٢٨٠] پاشـان هەڵی وەشێنێ، یا وەکو ئەوە وایە ئاسنگەر کوندەی کون بـو دەف دا، یـا وەکـو کەسـێ وایە بە پەنجەی دەستی لەسەر ڕوی ئاو بنوسێ.

تەمبار مەبە[٢٨١]: چونکێ هەر ئـەو سـاتەی دڵ شـادو بەختـەوەری لـە تەمـەنی تـۆ دەژمێردرێ، نەکەی ڕۆژگارەکانت بکەیتە قوربانی خەمۆکیو، شەوگارەکانت بە ئاخو داخان بەسەربەی، کاتە پڕ بەهاکانت بەسەر خەماندا دابەش کەی، لە بە فـیڕۆ دانـی تەمەنت زیادەڕۆیی نەنوێنی، چونکو کەسی زیادەڕۆ نەیارێتی خوا وەدەس دێنێ.

---

٢٧٨) بەرەو چەپ پێچەوانەی کەی.

٢٧٩) بەرەو ژورو هەڵگێڕیەوە.

٢٨٠) بچنێ.

٢٨١) خەمبار مەبە.

## پەروەردگـارت لێبوردەیە و لێبوردەیی بەروەدەیـە

ئایە ئەوەی گرنگی خۆری هیوات لـێ هەڵدێنێو ئاسۆی ئومێدت دەدرەوشێنێ، بەختیاری دێنێو خەم دەتارێنێ: ئەو وتەیەی پـەروەرگار نیـە، کـە مـزگێنی دێنـێ؟: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ... بێژە: ئەی عەبدەكانی مـن! ئـەی ئەوانـەی كـە بـە لادان لە ئەندازە، ناحەقیو لە خۆ كردوە! نابێ ئێوە لە بەزەیی خـوا ناهومێـد بـن، چـونكە لە هەموگوناهێك چاو دەپۆشێ، ئەو لێبوردەو دلۆڤانە، ﴿٥٣﴾ الزمر ﴾.

خـوای گـەورە بـە وشـەی "ئـەی بەنـدەكانم" دڵنـەواییان دەكـاو هیـوای دواڕۆژیـان گەش دەكا، بەو مزگێنییە كەسانێكی تایبـەت كـردوە دەرحـەق بـەخۆیان سـتەمكارن، سەبارەت بەوەی هەڵەی زۆریان ئەنجام داوەو فرەتاوانیان لێ ڕوداوە، چ جای ئەوانـەی لە هەڵەو تاوان بەدورن! بەهەمان شێوە بەندەكانی لە بێئومێدیو بەدبینی[٢٨٢] یاسـاخ دەكاو پێیان دەڵێ:

گەر تاوان كار ژێوانی دەربڕێ ئەوا خوای گەورە لە هەموتاوانێ ورد بێ یا درشـت، دیار بێ یا نادیار دەبورێ.

پاشان خوای باڵادەست بە ڕاناوی دڵنیاكار[٢٨٣] "إِنَّهُۥ هُوَ ... و ئامرازی ناساندن (الـ)[٢٨٤] خـۆی دەناسـێنێ "إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ... كـە ئەوپـەڕی بـێ هەڵـەییو تـەواوی خـوا دەگەیێنێ.

ئایە بەختەوەرو شادمان نیت بەو مزگێنیو بەڵێنانـەی پـەروەرێنت: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ

---

٢٨٢) ڕەشبینی.

٢٨٣) (الضمیر المؤكد....

٢٨٤) (اداة التعریف....

ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ... ئەو كەسانەی هەرگا كاری خراپ دەكەن، یان ناحەقی لە خۆ دەكەن، خودا لە بیر نابەنەوەو لەبەری دەپاڕێنەوە: لە خەتاكانیان ببورێ، بێژگە خوداش كێ لە گوناهان دەبورێ؟ جا ئەوانە لەسەر كارێ كە زانیویانە هەڵەیە، پێ داگر نین. ﴿١٣٥﴾ آل عمران ﴾.

﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ... هەر كەسێكیش كارێكی نالەبار بكا، یان غەدرێكی لەخۆی بكا، پاشان لە خودا بخوازێ كە بیبەخشێ، دەبینێ كە خوا لێی دەبورێو دلۆڤانە، ﴿١١٠﴾ النساء ﴾.

﴿ إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ... ئەگەر ئێوە ئەو تاوانە زەلامانەی پێمان ڕاگەیاندون نەیكەن‌و خۆتان دورە پەرێز بگرن، هەڵەو پەڵەی دیكەتان لەسەر لادەبەین‌و دەتانبەینە شوێنێكی بە قەدرو عیزەت، ﴿٣١﴾ النساء ﴾.

﴿ ...وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ... جا ئەمانەش لە پاش ئەوەی كە ئەو غەدرەیان لە خۆ كرد، گەر بهاتانەوە لای تۆو داوای خودا لێ خۆشبونیان بكردایە، تۆ یەكیش، كە پێغەمبەری، داوای لە گوناه بوردنت بۆ ئەوانە بكردبا، بێ گومان ئەوسا دەیاندی، كە خوا ژیوانیەكەیان قەبوڵ دەكاو دلۆڤانە، ﴿٦٤﴾ النساء ﴾.

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ... هەر كەسێكیش تۆبەكاری باوەڕدارو، ئاكار چاك‌و، شارەزای ڕاستە ڕێگە بێ، من دەیبەخشم، ﴿٨٢﴾ طه ﴾.

كاتێ موسا پێغەمبەر U بێ باوەڕێ دەكوژێ دەڵێ: (( فاغْفِرْ لِي فغَفَرَ لَهُ... خوایە لێم خۆش بە ئەویش لێی خۆش دەبێ.

خوای پەروەردگار دەربارەی داود پێغەمبەر دەفەرموێ لە کاتێکدا دەگەڕێتەوەو پەشیمان دەبێتەوە: ﴿فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ ... ئێمە لەو هەڵەیەی بەخشیمان، لە نزیکانی خۆمانەو گەڕانەوەی چاکی هەیە، ﴿٢٥﴾ ص﴾.

پاکیو بێ گەردی بۆ ئەو خوایە میهروسۆزی چەند فراوانەو چەندە دەروی خێری ئاوەدانە!! بە ئەندازەی میهرو لێبوردەیی گشت گیرە هاوبەش پەیدا کەرانیش دەگرێتەوە ئەگەر پەشیمانی دەرببڕنو بۆ لای خوا وەگەڕێنەوە، پێمان دەڵێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ... ئەوانەی کە گوتیان: خودا سێهەمینە لە سێ کەسان، بێ سۆ لە دین لایان داوە. جگە لە خودای تاقانە، هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ. ئەگەر بێتو دەس هەڵنەگرن لەو قسانە - ئەوانیانە کەوا لە دین لایان داوە - گرفتاری ئازارێکی بەژان دەبن. بۆ چ ئەوانە پەشیمانی نابەنە بەرقاپی خوداو داوای بەخشینی لێ ناکەن؟ کە خوا لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە، ﴿٧٤﴾ المائدة﴾.

پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لە فەرمودەیەکی ڕاستو ڕەواندا دەفەرموێ:

((یقول الله تبارك، تعالی: یا ابن ادم، انك ما دعوتني، رجوتني الا غفرت لك علی ما كان منك ولا ابالي، یا ابن ادم، لو بلغت ذنوبك عنان السماء، ثم استغفرتني غفرت لك، لا ابالي، یا ابن ادم، لو اتیتني بقراب الارض خطایا ثم لقیتني لا تشرك بي شیئا، لاتیتك بقرابها مغفرة... خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ئەی گرۆی ئادەم، تاوەکو لێم بپاڕێیەوەو چاوی ئومێدت لە من بێ، بێ سۆ لە هەموتاوانێکی دەبورم کە تۆ پێیەوە تاوانباریو گوێ پێ نادەم، ئەی بەرەی ئادەم ئەگەر تاوانت بەری ئاسمان بگرێو داوای چاوپۆشی لە من بکەی تاوانی تۆ دەپۆشمو گوێ پێ نادەم، ئەی دەستەی ئادەم، ئەگەر بە پڕاوپڕی زەوی بە تاوەنەوە بەرەو من بێی بەلام کاتێ پێم دەگەی هاوبەشیت بڕیار نەدابێ ئەوا بە پڕاو پڕی زەوی بە لێخۆشبونەوە بەرەو تۆ دێم)).

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ: (( ان الله يبسط بالليل ليتوب مسيئ النهار، ويبسط يده بالنهار ليتوب مسيئ الليل، حتى تطلع الشمس من مغربها... خوای گەورە لە شەودا دەرگای لێبوردەیی خۆی کردۆتەوە تاوەکو تاوانبارانی ڕۆژ بگەڕێنەوە، لە ڕۆژدا دەرگای میهروسۆزی والاّ کردوە تاوەکو تاوانبارانی شەو ژێوانی خۆیان دەربڕن هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ)).

لە فەرمودەیەکی قودسیدا هاتوە: (( يا عبادي انكم تذنبون بالليل والنهار وانا اغفر الذنوب جميعا، فاستغفروني اغفر لكم... خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی بەندەکانی من ئێوە لە شەو ڕۆژدا گوناه دەکەن منیش خوایەکی لێ بوردەمو لە هەموتاوانێ دەبورم، سا داوای لێ خۆشبونم لێ بکەن هەتا لێتان خۆشبم)).

هەروەها پێغەمبەری خوا لە وتەیەکی تریدا دەفەرموێ: (( والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم ولجاء بقوم اخرين يذنبون فيستغفرون الله فيغفروا لهم... سوێند بەوەی گیانی منی لەدەستە ئەگەر بێ‌و ئێوە تاوان نەکەن خوای گەورە ئێوە لائەباو گەلێکی تر دەێنێ‌و تاوانیان لە دەست ڕوبداو داوای لێخۆشبون بکەن‌و خوداش لێیان ببورێ.

لە فەرمودەیەکی تردا: (( والذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لَخِفْتُ عليكم ما هو اشد من الذنب، وهو العجب... سوێند بەوەی گیانی منی لە دەستە، ئەگەر بێ‌و ئێوە توشی تاوان نەبێن، شتێکی مەترسیدارترتان لێ چاوەڕێ دەکەم، ئەویشیان ڕا لەخۆیی یە.

لە فەرمودەیەکی تردا: (( كلكم خطاء وخير الخطائين التوابون... هەموتان شیاوی هەڵە کردنن چاترینی هەڵەکارانیش تۆبە کارانن)).

لەو فەرمودەیەشدا دەفەرموێ کە هەڵەوە خۆ هەڵناگرێ: (( لله افرح بتوبة عبده من احدكم كان على راحلته، عليها طعامه وشرابه، فضلت منه في الصحراء، فبحث عنها حتى ايس، فنام ثم استيقظ فاذا هي عند رأسه، فقال: اللهم انت عبدي، وانا ربك اخطأ من شدة الفرح... بە دڵنیاییەوە خوای گەورە لە ژێوانی[٢٨٥] بەندەی خۆی خۆشتر دێ لە

---

٢٨٥) پەشیمانی.

یەکێ لە ئێوە لە بیابانێ وڵاخەکەی گوم کاو خواردنو خۆراکی لەسەر پشتی ئەو وڵاخە بێ، هەتا ئومێدی دەبڕێ بە دوای دابگەڕێ، بە ناچاری خەو بەسەر چاویدا بێو پاشان بە خەبەر بێو لە ناکاوێ ببینێ وڵاخەکەی لەسەر سەریەوە وەستاوە، لە خۆشیان هەڵە بکاو بڵێ: خوایە گیان تۆ بەندەی منیو منیش پەروەردگاری تۆم)).

ئەو فەرمودەیەش گومانی تێدانیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستراوە: (( ان عبدا اذنب ذنبا فقال: اللهم اغفر لي ذنبي فانه لا يغفر الذنوب الا انت، ثم اذنب ذنبا، فقال: اللهم اغفر لي ذنبي فانه لا يغفر الذنوب الا انت، ثم اذنب ذنبا فقال اللهم اغفر لي ذنبي فانه لا يغفر الذنوب الا انت، فقال الله عزوجل علم عبدي ان له ربا ياخذ بالذنب، ويعفو عن الذنب، فليفعل عبدي ما شاء.... یەکێ لە بەندەکانی خوا، تاوانێکی کردو گوتی: ئەی پەروەردگارا لە تاوانم ببورەو هەر تۆ لە تاوان دەبوری، جارێکی تر توشی تاوان هاتەوەو، گوتی: پەروەردگارا لەو هەڵەیەم ببورە بە ڕاستی هەر تۆ خوایەکی بە لێ بوردەی، بۆ جاری سێیەم توشی گوناهێکی تر هاتو پەشیمانی دەربڕیو گوتی: پەروەردگارا ئەو جارەشیان بم بەخشە بە ڕاستی بەخشندەیی هەر شیاوی تۆیە، خوای بەخشندە فەرموی: بەندەی من هەست دەکا پەروەردگارێکی هەیە بەهۆی تاوان خەڵکی دەگرێو لە تاوانیش دەبورێ، کەوایە هەرچی بیکاو پەشیمانی بنوێنێ منیش لێی دەبورم. مەبەس لەو فەرمودەیە ئەوەیە بەندە هەرچەندی تاوانبار بێ بەڵام ژێوانی دەرببڕێو بۆ لای خوا بگەڕێتەوە خوای گەورە دەفەرموێ منیش هەر لێی قەبوڵ دەکەم)).

## خەمبار مەبە، هەمو شتێ قەزاوقەدری خوایە

هەر کەسێ موسڵمان بێو شوێن پێ هەڵگیر پێغەمبەری خوا بێ ﷺ بیروباوەڕی وایە هەر چییێ ببێ بە قەزاوقەدری خوایە، هیچ شتێ نایێتە ئاراوە مەگەر بە ئاگاداریو فەرمانی ئەوەو، ئەو لێی ئەندازە گیرە.

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ... هەر بەڵایێك ڕودەدا لەم سەر زەمینەو هەر بەڵایەك کە

بەسەر خودی خۆتان دێ - بەر لەوەی وەدی بهێنـن - لە دەفتەرێکـدا نوسراوەو ئەمە لای خودا ئاسانە، ﴿٢٢﴾ الحديد ﴾.

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ... ئێمە هەموبونەوەرمان بەئەندازە ئافراندوە،﴿٤٩﴾ القمر ﴾.

﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ... دیارە ئێمە جاروبارە بە هێندێك ترس‌و برسی بون‌و لـە ناوچون‌و کـەم بونەوەی ماڵی دنیاو بەروبوتان، بە ئەزمونتان دەگەیێنین. مژدە بـدە بـەو کەسـانەی خۆڕاگرن،﴿١٥٥﴾ البقرة ﴾ .

فەرمودەی پێغەمبەریش لەوبارەوە هاتون: (( عجبا لأمر المؤمن!! ان امـره كلـه لـه خيـر، ان اصابته سراء شكر فكان خيـرا له، وان اصابته ضـراء صبـر فكـان خيـرا لـه، وليس ذلك الاّ للمؤمن... کردارو فەرمانی موسڵمان سەرسوڕمێنە!! هەموبارێکی ژیـانی فەرو چاکەیە، ئەگـەر خـۆش گـوزەرانی بەسـەردا هـات سـوپاس گـوزارە، لەمـەڕ ئـەوە بەهرەدارە، ئەگەریش ناخۆشیێ ببینێ ئارامی لەسەر دەگـرێ، بەسـای ئەمـە خـەڵاتی خواوە دەست دێنێ، ئەمەشیان تەنیا بۆ باوەڕدار ڕەخساوە)).

دەفـەرموێ: (( اذا سـئلت فاسال الله، واذا اسـتعنت فاسـتعن بالله، واعلـم ان الامــة لو اجتمعوا على ان ينفعوك بشيء لم ينفعوك الا بشيء قد كتبه الله، وان اجتمعــوا علـى ان يضـروك بشــيء لم يضروك الا بشيء قـد كتبـه الله عليــك، رفعـت الاقــلام، وجفـت الـصـحف... ئەگـەر داوات کـرد داوا لـە خـوا بکـە، ئەگـەریش کۆمـەکی‌و یارمـەتیت گەرەکـە هانـا بـەرەو خـوا ببـە، دڵنیـا بـە ئەگـەر هەموخـەڵك لـە بەرژەوەنـدی تـۆ کۆبێتەوە، ناتوانن سودت پێ‌بگەیێنن بە هیچ جۆرێ، مەگەر بایی ئەوەنـدەی بڕیـاری خوای لەسەر بێ، ئەگەریش هەمویان هەوڵدەن بە شێوەیێ زیانت پێ بگەینین بۆیان نـالوێ [٢٨٦] مەگـەر بارتـەقای ئەوەنـدەی بڕیـاری خـوای لەسـەر بـێ، پێنوسـی خـوا لـە نوسین بۆتەوەو لاپەڕە وشکبۆتەوە)).

---

٢٨٦) ناگونجێ.

بە هەمان شێوە دەفەرموێ: (( واعلم ان ما اصابك لم يكـن ليخطئـك ومـا اخطـأك لم يكن ليصيبك... دڵنیا بە ئەوەی تـۆ بپێکـێ بەسـەر تـۆوە هـەڵنابڕێ، ئـەوەی بەسـەرتا هەڵببـڕێ تۆ ناپێکێ)).

هەروەها دەفەرموێ: (( جف القلم يا أبا هريرة بـما أنت لاق... ئەی "ئەبا هـوڕەیرە" ئەوەی تۆ پێی گرفتار ببی تازە قەڵەمی قەدەر نوسیوێتی)).

بەو شێوەیە لەو فەرمودەدا دەفـەرموێ: (( احرص على ما ينفعك، واستعن بـالله ولا تعجز، ولا تقل: لو اني فعلت كذا لكان كذا، ولكن قل: قـدَّر الله وماشـاء فعـل... لەسـەر ئەوەیان پێ دابگرە کە سودت پێ دەگەیەنێو، پـشتت بـە خـوا ببەسـتەو بـێ توانـایی مەنوێنە، وا مەڵێ ئەگەر ئاوام بکردایە واو وا دەبو، بەڵکە بڵێ: چارەنوسی خـوا وابـو ئەوەش، کە خوا بیەوێ دەبێ هەر بێتە دی)).

لەو فەرمودەیەشدا دەفەرموێ: (( لا يقض الله قضاء للعبد الا كان خيرا لـه... خـوای میهرەبـان هەرچـی بـۆ بەنـدەی خـۆی بـە ڕەوا ببینـێو بڕیـاری لەسـەر بـدا، ئـەوا بەرژەوەندی ئەوی تێدایە)).

دەربارەی گوناهو سەرپێچی کردن پرسیاریان لە "ئیبن تەیمیەی"ی شێخی ئیسلام کرد: ئایە گوناهیش بەرژەوەندی بەندەی تێدایە؟

لە وەڵام دا گوتی بەڵێ، بە مەرجێ پاشگەز ببێتـەوەو ژێـوانی دەربـڕێو داوای لـێ بوردن لە خوا بکاو مل کەچی بۆ بنوێنێ.

خوای تاكو تـەنیا دەفـەرموێ: ﴿... وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ... ڕەنگـە لـە شـتێك حـەز نەکـەن بـەڵام بۆتـان وەخێرگـەڕێ، ڕەنگـیش هەیـە ئـاوات بـۆ شـتێك بخـوازن کـە ئاکامەکەی باش نەبێ، خودا دەزانێو ئێوە سەری لێ دەرناکەن، (٢١٦) البقرة﴾.

## خەمگین مەبە، گەشبین بە

"تیرموزی" ئەو فەرمودەیە دەگێڕێتەوە: (( أفضل العبادة: انتظار الفرج... چاترینی بەندایەتی ئەوەیە ئومێدی ڕزگاریت ببێ.

﴿ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ... ئاخۆ بەیان نزیك نیە، (٨١) هود ﴾.

چاوت لە دەروازەی ڕزگاری خوای بەهرەوەر بێ، چاوەڕێ بە، هەر بینا خۆری ئومێدی بێ ئومێدان لە سپێدەی بەیاندا هەڵبێ.

کوردیش گوتەنی: زوڵم لە ئەستوری دەپچڕێ.

ئەگەر تەنگانە تەنگی پێ هەڵچنی چاوەڕێی لێبونەوەی دەروی خێر بە.

خوای هێزدارو توانادار دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ... هەر کێش لە خودا بترسێ، دەروێکی لێ دەکاتەوە، (٢) الطلاق ﴾ .

خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ... هەر کێش لە خودا بترسێ، خەتاکانی دادەپۆشێو پاداشتی گەورەی دەداتێ، (٥) الطلاق ﴾.

﴿ ... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ... هەر کێش لە خودا بترسێ خوا کاری ئاسان دەکا، (٤) الطلاق ﴾ .

لەو فەرمودە حاشا وەخۆ هەڵنەگرەدا پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: خوای گەورە دەفەرموێ: (( أنا عند ظن عبدي بي، فليظن بي ما شاء... بەندەی من چ گومانی بە من دەبا بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم، جا چ گومانێکم پێ دەبا با بیبا)).

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ ... ئا ئەوسا کە پێغەمبەران ناهومێد بون، مەردمیش وایاندەزانی کە درۆیان دەگەڵ کردون، یارمەتی ئێمەیان بۆهات، ئەوانەش وا حەزمان کرد ڕزگارکران، (١١٠) یوسف ﴾.

خوای گەورە ئەم وتەیەشی فەرمووە: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا (٥) إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا (٦) الشرح ﴾.

هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان ئەو قسەیە دەکەن - هەندێکیشیان بە فەرمودەی دادەنێن- کە دەڵێ: (( لن يغلب عُسْـــرٌ يُسْرين... ناخۆشێك بەسەر دو ناخۆشیاندا زاڵ نابێ)).

خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿... لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ الطلاق﴾ لە پاش تەنگانـــە فەرەحنایی هەیە، ئارێ، لە پاش تەنگانە فەرحانی هەیە گەورەیی بۆ ئەو دەفەرموێ: ﴿... أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ... تۆ بزانە کە یاریدەی خوا نزیکە، ﴿٢١٤﴾ البقرة﴾.

﴿... إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ... ئەو کەسانەی چاکە کارن، لە بەزەیی نزیکن، ﴿٥٦﴾ الأعراف﴾ .

لە فەرمودەیەکی تری پێغەمبەریشدا هاتوە: (( واعلم ان النصر مع الصبر، وان الفرج مع الكرب... دڵنیا بە سەرکەوتن هاوشانی ئارام گرتنە، ڕزگاری دوا بە دوای خەفەت باری چەشتنە)).

## هەڵوێستـەیـەك

خەمبار مەبە: چونکو ماڵو سامانی داگراوت[٢٨٧]، کۆشکو تەلاری بەرچاوت، باخو بێستانی سەوزی ڕازاوەت، هاوکات لەگەڵ خەمباریو کەسەرو، هەڵکێشانی هەناسەی بە کوڵدا: جیا لەوەی دڵت خۆش کەن، پتر گڕی پەژارەو کڵۆڵیت جۆش دەدەن.

خەمبار مەبە: ئەگەر بێو دڵت بکەیتە حەساوگەی خەمانو چاوەکانی بۆ داخەی، باڵی خۆی بۆ بنوێنیو وەکو توێکڵێك خۆت بەسەر خەماندا دابێنی، ئەوا دڵنیا بە داودەرمانی پزیشکانو ڕێگا چارەی چارەسازان دەردی تۆ تیمار ناکەن.

ئەگەر تۆ لە بارەتدا هەبێ بە دڵێکی پاکەوە نزا بکەی، لەبەردەم قاپیەی خوایێکی هەرەزاڵو پەروەرندە[٢٨٨] مل کەچانە خۆت بە گۆڕێ دادەی، هەلێکی زێڕینت بۆ

---

[٢٨٧] هەڵگیراو.

ڕەخساوە لە سێ یەکی کۆتایی شەودا ناوچاوانت لە کڕنۆشدا لە ناو خۆڵدا تۆزاوی کەی، بۆ دەبێ ئەوەندە کەسەران لە خۆ بارکەی.خەمبار مەبە: ئەم گەردونە بە چەندین هەسارەی درەخشاوە[289]، ئەم زەمینەو ئەوەی تێی دا ڕەخساوە، هەر لە باخ‌و باخاتی درەوشاوە بگرە -کە جۆرەها جوتە گژوگیای تێدا ڕواوە- تا دەگاتە چەندین دارو درەختی میوەدارو، چڕە و[290] جۆگەو جۆبار، خوای دەهەندە[291] لە پێناوی تۆیدا فەراهەم هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا دڵ گرانی!!

خەمبار مەبە: خۆ ئاوی سازو شیرین دەنۆشی، لەم کەش‌و هەوا پاکە هەناسە هەڵدەمژی، لەسەر دو پێی بێ خەش دەگوزەرێی، شەوانە بە ئاسودەیی سەر دەنێیەوە.

## ( دۆش دامەمێنـەو ژێوانی بۆ خوای بەخشـندە بنوێنـە )

﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَٰرًا ... هەر پێم گوتن داوای لێبوردن لە پەروەردیارتان بکەن، ئەو بێ گومان زۆر لێبورە. لە حەواوە بارانێکی پەڵە دەرتان بۆ بنێرێ. بە دارایی‌و بە کوڕانیش یاریو بداو باغاتو بۆ پەیدا بکاو جۆبارتان بۆ وەدی بێنێ، ﴿١٢﴾ نوح ﴾.

بۆ ئەوەی لە تەنگژەو خاکە ساری رزگارت بێ‌و هێمنی‌و هەداریت[292] لە ناو دڵدا بێ، ڕۆزی حەلاڵت وەدەست بێ‌و زارۆڵەی[293] دەستەوەرەت[294] لێ بەپاشکەوێ‌و بارانی

---

٢٨٨) پەروەردگار.
٢٨٩) تروسکاوە.
٢٩٠) بیشە/دارستان.
٢٩١) بەخشندە.
٢٩٢) هێواشی.
٢٩٣) منداڵ.
٢٩٤) گوێ دێر.

پڕ پیتو سودمەندت بەسەردا هەڵبڕژێ، زۆر فرمێسکی ژێوانی[٢٩٥] هەڵڕژێنەو ناوی خوا بەسەر دەمت دابێنە.

﴿ وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَيُؤۡتِ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥۖ ... لە پەروەردگاری خۆتانیش داوا بکەن، لێو ببورێو بشگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، تا ماوەیەکی ناونراو ژیانی خۆشتان بۆ دابینکاو دەگەڵ خاوەن هەر چاکەیەك چاکەی بکا، (٣) هود ﴾.

فەرمودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە هاتوە: (( من اكثر الاستغفار جعل الله له من كل هم فرجا، ومن كل ضيق مخرجا... هەرکەسێ فرە[٢٩٦] ژێوانی بۆ خوا بنوێنێ، خوای گەورە لە هەموچورتمێ[٢٩٧] ڕزگاری بۆ دێنیو، لە تەنگانەدا دەریدەهێنێ)).

ئەم نزایە هەمیشە بکە بە ئامرازی پاڕانەوە، کە گەورەترین پەیڤی[٢٩٨] ژێوانی دەربڕینە، پێشەوا بوخاریش ئەو فەرمودەیە دەگێڕێتەوە: (( اللّهم انت ربي لا الـه الا انت، خلقتني وانا عبدك، وانا على عهدك وعدك ما استطعت، اعوذ بك من شر ما صنعت، ابوء لك بنعمتك علي، وابوء بذنبي فاغفر لي، فانه لا يغفر الذنوب الا انت... ئەی خوایە تۆ پەروەردیاری منی، هەر تۆ شیاوی پەرستنی، منت فەراهەم هێناوەو بەندەی تۆم، من لەسەر ئەو پەیمانەو بەڵێنەم کە بە تۆم داوە بە پێی توانام، پەنات پێ دەگرم لە سەرەنجامی ئەو تاوانەی کردومە، دان دەنێم بەو بەهرەو خەڵاتەی بەسەر منتدا هەڵڕشتوەو دان دەنێم بە هەڵەو تاوانی خۆم، خوایە لێم ببورە، بێگومان تەنیا تۆ خوایەکی لێبوردەی)).

---

٢٩٥) پەشیمانی.

٢٩٦) زۆر.

٢٩٧) کارەساتێ.

٢٩٨) رستەی.

## ( خەمگیـن مەبـە، هەمیشـە خوات لە یاد بێ )

پاکی بۆ خوا کە دەفەرموێ: ﴿...أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ... باش بـزانن کە یادی خوا ئۆقرەو ئارامی دڵانە، ﴿٢٨﴾ الرعد﴾.

دەفەرموێ: ﴿ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ ... سا ئێوە یـادی مـن بکـەن، تـا مـنـیش لـە بیرتـان نەکەم. ﴿١٥٢﴾ البقرة﴾.

﴿ ...وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ... ژنو پیـاوێ کـە زۆر یـادی خـوا دەکەن. ﴿٣٥﴾ الأحزاب﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ... ئـەی گـەلی خاوەن باوەڕان! فرە یادی خوا بکـەن (و لـە یـادی ئـەو ڕامەوەسـتن.... هەموبـەیانیو ئێواران لە پاکیو بێ عەیبی خودا گوزارشت بکەن. ﴿٤٢﴾ الأحزاب﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ... ئەی گەلـی خاوەن باوەڕان! سامانو زاڕۆڵەتـان یادی خواتان نابێ لەبیربەرێتەوە، ﴿٩﴾ المنافقون﴾.

﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ... ئەگـــەر لەبیریـــشت نـــەما یـــادی پەروەردندەت بکە. ﴿٢٤﴾ الكهف﴾.

﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ... هـەر کاتـێ لـە جـێ ڕادەبـی پەسـنی پەروەرنـدەت بـدە. لەشەویـشدا شوکری بکەو پەسنی بدە، لەو دەمەشدا کە هەسارە ئاوا دەبن، ﴿٤٩﴾ الطور﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ... ئەی گرۆی خاوەن باوەڕان! ئەگەر دەگەڵ دوژمنان ڕوبەڕو دەبـن، خـوای گەورە بەگەورە بگرنو گەلێك یادی خوا بکەن، شایەتا ئێوە سەرکەون، ﴿٤٥﴾ الأنفال﴾.

چەند فەرمودەیەکی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هاتون: لەوانە: ((مثل الذي يذكر ربَّهُ والذي لا يذكر ربَّه مثل الحي والميت... وێنەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکاو ئەوەیشی کە یادی خوا نەکا، وێنەی زیندو مردوە)).

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (( سَبَقَ المفرِّدون... هەڵکەوتو بێوێنەکان لە پێشبڕکێدا پێش کەوتن)).

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو هەڵکەوتوانە کێن؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی ﴿ ...وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ ... ئەو ژنو پیاوانەن زۆر یادی خوا دەکەن. ﴿٣٥﴾ الأحزاب﴾.

هەروەها دەفەرموێ: (( الا اخبركم بافضل اعمالكم، وازكاها عند مليككم، وخير لكم من انفاق الذهب والورق، وخير لكم من ان تلقوا عدوكم فتضربوا اعناقهم ويضربوا اعناقكم؟ قالوا: بلى يا رسول الله. قال: "ذكر الله"... ئایە پێتان بڵێم باشترینو پاکترین کردەوە لەلایەن خواوە کە ئەنجامی دەدەن، لە بەخشینی زێڕو زیویش بەهەرمێن تر بێو چاتر بێ لەوە کە بگەن بە دوژمنتانو لە گەردەنیان بدەنو ئەوان لە گەردنی ئێوە بدەن؟

گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەوەیان یادی خوایە)).

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە: کە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەرکو فەرمانەکانی ئیسلام بەسەرمەوە زۆر بونە، منیش بەساڵدا چومو بێ توانام، شتێکی وام پێ بڵێ دەستی پێوە بگرم.

ئەویش فەرموی: (( لا يزال لسانك رطبا بذكر الله... با بەردەوام زمانت بە یادی خواوە تەڕو پاراو بێ.

## دڵگیر مەبەو لە میهری خوا نائومێد مەبە

﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ... هەر ئەوانەی خوا نەناسن لە بەزەیی خوا ناهومێدن، ﴿٨٧﴾ یوسف﴾.

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا ... تا ئەوسا کە پێغەمبەران ناهومێد بون، مەردمیش وایاندەزانی کە درۆیان دەگەڵ کردون، یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، ﴿١١٠﴾ یوسف﴾.

﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ... یونسمان لە خەمەکەی ڕزگار کرد. ئێمە ئاوا باوەڕداران ڕزگار دەکەین، ﴿٨٨﴾ الأنبیاء﴾.

خوای گەورە دەربارەی حاڵی موسڵمانانیش دەفەرموێ: ﴿...وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُواْ زِلْزَالًا شَدِيدًا ... زۆر خەیاڵی جۆراو جۆرتان لە خودا بە دڵدا دەهات. لەو شوێنەدا ئەزمونی خاوەن باوەڕان هاتە گۆڕێو بە لەرزێکی زۆر بە هێز، دڵی هەموان کەوتە لەرزە، ﴿١١﴾ الأحزاب﴾.

## لەمەڕ ئەو ئازارەی پێت گەییوە پەرۆش مەبەو لە هەڵەی دەرحەق کراوت چاوپۆش بە

نرخی تۆڵەیێ کە قورسە، کەسی تۆڵە سێنو قین لە دڵ، ئەگەر بیەوێ کوڵی دڵی دامرکێنێو رقو کینەی خۆی لە خەڵك بڕێژێ، ئەوا دەبێ لە گۆشتو خوێنو دڵی، لە هەستو نەستی، لە ئاسودەیی‌و کامەرانی‌و خۆش بەختی خۆی، باجی ئەم تۆڵەیە بدا. بێ گومان هەر ئەویش تێیدا زەرەرمەندە.

خوای بێ هاوتاو کار لە جێ ئێمەی لە داودەرمانی ئەم دەردەو چارەسەری کاراشنا کردوە، دەفەرموێ: ﴿وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ ... ئەوانەش کە ڕکی خۆیان دەخۆنەوەو لە مەردەم چاوپۆشی دەکەن، ﴿١٣٤﴾ آل عمران﴾.

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ... چاو بپۆشەو فەرمان بە کاری چاك بدەو لەو نەزانانە واز بێنە (١٩٩) الأعراف ﴾.

﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ... تۆ هەمیشە وەرامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێ کە لەگەڵ تۆدا دوژمنە دەبێتە دۆستی نزیکت، (٣٤) فصلت ﴾.

## لە ڕابردو دڵ پەست مەبە، لە نازو گۆزی زەوەند دای

بەهرەو خەڵاتی خوای بەخشندە وەیادخەوە، بیر لەو هەمو نازوگۆزە بەراوەڵانەی[299] خوا بکەوە بەسەرتەوە، بزانە تۆ بە بەهرەی خوا داپۆشراویو بەستایشەوە وەڵامیان دەوە. خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿...وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ... ئەگەر بێنە سەر ژمارەی چاکەی خودا لە ژماردن دادەمێنن، (٣٤) إبراهيم ﴾.

﴿ ... وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ ... بە ئاشکرا بە نهێنی بەهرە گەلی بەسەرتانا ڕژاندوە؟، (٢٠) لقمان ﴾ .

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ...هەر بەهرەیەك ڕووتێدەکا لە خواوەیە (٥٣) النحل ﴾.

لەم ئایەتانەدا خوای گەورە بەهرەکانی خۆی بە چاوی بەندە دادەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ (٨) وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ (٩) وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ... ئەدی ئێمە دو دیدەمان پێ نەداوە؟ زمانێکیشو جوتێ لێو؟ ڕێگەی هاتو نەهاتیشمان نیشان نەدا؟، (١٠) البلد ﴾.

---

٢٩٩) فراوان.

چەند بەهرەیێ پەیا پەی[٣٠٠] بەسەرت دا باریوە، بەهرەی ژیانو تەندروستی، بەهرەی بیستنو بینایی، بەهرەی دو پێو دەستو بازو، بەهرەی هەواو ئاوی سازگار، بەهرەی خۆراکی بە چێژو مەزەدار[٣٠١] لە سەروی هەموویانەوە بەهرەی ڕێگا نوێنی[٣٠٢] پەروەردگار: ئەویشیان ئایینی ئیسلامە کە بە خەڵات هاتۆتە خوار.

یەکێ دەڵێ: ئاخۆ ئامادەی ئەو مامەڵەیە ئەنجام دەی دو چاوەکانت بە یەك بلیۆن دۆلار بدەی؟ یادو گوێچکەت لە پای ئەم ڕێژە پارەیە بدەی؟

یا لەمەڕ ژمارە پوڵی ناوبراودا خۆت لە پەلو پۆخەی؟ یا لەپێناوی ئەوەندە دراوە هەردو دەستەکانت پەل دەی؟ یا خورپەی[٣٠٣] دڵت لە کارخەی؟ ئای بەندەی سپڵەکار لەناو ئەو هەمو بەهرەی بەروەدەوە[٣٠٤] بەسەردەبەی کەچی ستایشی لەسەر ناکەی!!

## هەر شتێ شیاوی خەم نەبێ بۆ دەبێ دڵت بۆی پەست بێ

یەکێ لەوانەی بەختەوەریت لە ناو دڵدا دەڕوێنێ، نەشونمای پێ دەکاو دەی گەشێنێ[٣٠٥] ئەوەیە: بە لای شتی کەم بایەخدا لانەکەیتەوە، چونکێ مەردمێ خواستە بالآکانی گەرەك بێ، هەوڵو گەڕی هەر لە پێناوی ڕۆژی سەلا[٣٠٦] دەبێ.

یەکێ لە پێشینەکان ئامۆژیاری[٣٠٧] برایەکی دەکاو دەڵێ: با خەمت یەك خەم بێ، لەپێناو گەیشتنە خواو وەستان لەبەردەم دادگایی ئەوو، ڕۆژی پەسلان بێ[٣٠٨] ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ... ئەو ڕۆژە ئێوە ڕادەنێنو هەرچی بۆ شاردنەوەیە لە ئێوە حەشار نادرێ، ﴿١٨﴾ الحاقة﴾.

٣٠٠) خێرا خێرا.
٣٠١) بەتام.
٣٠٢) ڕێنمایی.
٣٠٣) لێدانی دڵ.
٣٠٤) فراوانەوە.
٣٠٥) گەشەی پێ دەدا.
٣٠٦) ڕۆژی قیامەت.
٣٠٧) ئامۆژگاری.
٣٠٨) ڕۆژی قیامەت.

چونكێ هەرچی پەژارەیە لە ئاستی ئەم خەمەدا بێ بایەخە. ئینجا خەفەتێ لە پێناوی ئەم ژیانە دوا بڕاوەدا بێ چ خەمێكە؟ پلەو پایەی ئەم ژیانەو سەنگی گەنجینەو گەوهەری، نرخی ماڵو منالی، شكۆداریو ناوداری، باڵەخانەو كۆشكو تەلاری دەبێ چ بایەخێكیان هەبێ!!

خوای بێ هاوتا لەمەڕ بایەخدانی دو ڕوان بە ژیانی دنیاوە بەو شێوەیە دواوە:

﴿أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ... هەر خۆیان لە بیر بو، گومانی ناشایستەیان بە خوا برد، ﴿١٥٤﴾ آل عمران﴾.

تەنیا خۆیان خۆش بێو هورگیان تێر بێو ئارەزوی ئاژەڵانەیان پێك بێ چیان لە خونەریتە باڵاكاندا وە!

لەو ساتەی لەژێر دارەكەدا چەند كەسێ لە هاوەڵان لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺ پەیمانیان بەست، یەكێ لە دو ڕوان پشتی هەڵكردو بە دوای وشترە سورەكەیدا دەگەڕا پێی گوتن: من دیتنەوەی وشترەكەم لا خۆشترە لەو پەیمان بەستنەی ئێوە، بۆیە ئەو فەرمودەیان دەربارە وترا (( كلكم مغفور لە الا صاحب الجمل الاحمر... هەموتان لە لایەن خواوە بوراون تەنیا خاوەنی وشترە سورەكە نەبێ)).

یەكێكی تر لە دو ڕوان كە تەنیا خۆویستو خۆپەرست بو بە دۆستانی خۆی دەڵێ: (( لاَ تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ... لەم گەرمایەدا دەرمەكەون)).

خوای گەورە لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿...قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ ... بێژە: ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایە، خۆ ئاگری جەهەندەم زۆر گەرم ترە، ﴿٨١﴾ التوبة﴾.

خۆپەسندێكی تریان دەڵێ: ﴿ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓ ... ئیزنمان بدە با نەیەین، نەوەك توشی گوناهان بین، ﴿٤٩﴾ التوبة﴾.

خوای گەورە لە وەڵامدا دەفەرموێ: ﴿أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ... با بزانن هەر ئێستا كەوتونە ناو گوناهەوە، ﴿٤٩﴾ التوبة﴾.

هەندێكی تریان ماڵو منداڵیان بەربەستی سەر ڕێگای چاكەیە: ﴿شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ... ئێژن: داراییو ماڵو منداڵیان نەیانهێشت بگەینە ئێوە، داوای بەخشینمان بۆ بكە، ﴿١١﴾ الفتح﴾.

بێگومان ئەوەی دو ڕوان بە خەم‌و باری سەرشانیان دەزانی هەر ئەو شـــــتە بێ نرخانە بون کە مەردمی بێ بارو[٣٠٩] گەنە کار[٣١٠] بە لەمپەری سەر ڕێگایان دەزانێ، کەچی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوان هەر کردو کۆشیان بۆ دەستەبەرکردنی بەهرەمەندی‌و ڕەزامەندی لای پەروەردگار بو.

## دڵگیـر مەبـە، خــەم لە بیـر بـە

وچاندانی باوەڕدار بێ ئاگایی‌یە، کات بەتاڵیش بگــوزی مرۆڤەو، پاڵکەوتن کاری بێ کارانە، ئەوانەی لە هەمو کەسێکیش پتر گیرۆدەی دەستی گێچەڵ‌و کڵۆڵین، ئەوانەن بە کاتی بەتاڵ‌و بێ کاری ژیان بەسەردەبەن.

کەسانێکیش دەستبادی[٣١١] کرداری بەرهەم دارن، سەرمایەیان تەنیا پڕوپاگەندەو پێشبینی چاوەڕوان نەکراوە[٣١٢].

دەی کپ‌و کڵا[٣١٣] دامەمێنە، هەوڵدە خۆت وەجوڵێنە، کارامەبەو لێوردبەوە، یادی خوا بکەو پەیامەکەی وەخوێنە، یا بە نوسێنێ سەرقاڵ بە، یا خەریکی بەسەر کردنەوەو دیدەنی بە، ئەم هەلەی لەژیانتدا بۆت ڕەخساوە، تەنیا چرکەیەکی نەخەیتە لاوە، بێگومان ئەو ڕۆژەی لە ژیانتدا بێ کاری، هەراسان‌و وێزاری[٣١٤]، ترس‌و لەرزدات دەپۆشێ‌و دڵاو دڵۆ[٣١٥] نیگەرانی، دەبیتە گۆڕەپانی یاری‌و گاڵتەو گەپی شەیتانی.

---

٣٠٩) نالەبار.

٣١٠) بێ سود.

٣١١) دەستبڵاو.

٣١٢) مەترسیدار.

٣١٣) بێ دەنگ و جودا.

٣١٤) بێزاری.

٣١٥) دو دڵ.

## (کە تۆ چاوت لە پاداشتی خوا بێ، بە نەیارانی جوامێریت دڵت پەست نابێ)

کردەت بۆ خوا یەك لا کەوە، لە چاوەڕوانی سوپاسان لاکەوە [٣١٦]، بە دوری مەزانە کە بەرامبەر یەکێ چاکەیێ بنوێنی ئەو بە چاو نزێریەوە [٣١٧] لێت ڕامێنێ [٣١٨] نە ئەو دەستەی چاکەخوازە بیناسێ، نە چاکەت بە چاکە بزانێ، دەی کەوایە ئەو پاداشتەت لە خوا بوێ.

خوای بێ هاوتا سەبارەت بە دۆستانی خۆی دەفەرموێ: ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا ... چاونۆڕی بەهرەو ڕەزامەندی خوان، (٨) الحشر﴾.

دەربارەی پێغەمبەرانیشی بەو شێوەیە فەرمویە ﴿وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ ... پاداشتم - بۆ ئەم کارە - لێتان ناوێ، (١٠٩) الشعراء﴾.

﴿قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ ... بێژە: من هیچ پاداشێکم لێتان ناوێ، ئەوی دەبو بیدەن بە منیش بۆ خۆتان، (٤٧) سبأ﴾.

﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ... بۆیەشی بە کەس نەبەخشی کە پاداشی بدرێتەوە، (١٩) الليل﴾.

﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ... ئێمە — هەر لە ڕاهی خودا- ئەم خۆراکەتان دەدەینێ، نە پاداشێکمان لە ئێوە دەوێ نە شوکرانەش، (٩) الإنسان﴾.

هۆنەر دەڵێ:

**هیچ کەس لە کردەی چاکە بارەش بینی نەنوێنێ**
**خودا لەسەر بەڵێنی خۆی هەر ماوەو دەمێنێ**

---

(٣١٦) روت وەرگێرە.
(٣١٧) ڕژدی.
(٣١٨) تەماشات کا.

سەوداو مامەڵەت تەنیا لەگەڵ خوای تاكو تەنیا بێ، چونكی پاداشتو بەخـشش‌و خەڵات تەنیا لەو ڕەچاو دەكرێ، شكۆداری بۆ خـوا، كـە جەزرەبـەدان و[319] سەرزەنـشت كردن ڕق هەڵسان‌و ڕەزامەندی نواندن ڕەوشتی بەرزی ئەون.

لە سەردەمی پێشەوا (عومەر...دا لە شاری قەنـدەهار چەند موسڵمانێ بـە پلـەی بەرزی شەهیدی گەیشتن، پێشەوا عمر پرسی ئەم كوژراوانە كێن؟ هەندێ ناویـان بـۆ هەڵدان‌و گوتیان: هەندێكی تریشن بەڵام تۆ نایانناسی.

یەك سەر پێشەوا (عومـەر) چاوی لـە ئەسـرین هـەڵڕژاو گـوتی خـۆ خـوای گـەورە دەیانناسێ. یەكێ لە پیاوچاكان خۆراكێكی گـران بـەهاو بـە چـێژ بـۆ پیـاوێكی كـوێر ئامادە دەكا، خاوو خێزانیشی دەڵێ: خۆ ئەمە كوێرەو نازانێ چ خواردنێكە دەیخوا!

ئـەویش دەڵـێ: بـەڵام خـوای گـەورە دەزانـێ! كـە تـۆ دڵنیـای خـوا بەسـەرتەوە چاوەدێرەو بە هەمو خێرو فەڕت ئاشنایە، كارت بەوە نەبێ خەڵك بیزانێ.

## ( بە گـــازاندەی گازنـــدەكاران دڵ گـــران مەبـــە )

﴿ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ... ئـەوانیش - مـەگین هـەر بـەدەم - دەنـا هـەرگیز ناتوانن بۆتان بەزەر بن، ﴿١١١﴾ آل عمران ﴾.

﴿ ...وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ... لـەو فـێڵ‌و تەڵەكـەش كـە دەیكـەن، دڵتەنگ مەبە، ﴿١٢٧﴾ النحل ﴾.

﴿ ...وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ... گوێ بە ئازاریشیان مەدە. هەر خۆت بە خودا بسپێرەو خودا پشتیوان بێ بەسە، ﴿٤٨﴾ الأحزاب ﴾.

﴿ ...فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُوا۟ ... ئەوسا خـودا لـەو بوختـــانەی بۆیـــان دەكـرد، پاكانـەی كرد، ﴿٦٩﴾ الأحزاب ﴾.

---

٣١٩) ئازاردان و تۆڵە لـێ سەندن.

**کە دەریـــا لە ئاودا وەســـتاوە لێـــوان لێـــوی**
**چ باکی لـەوە دێ بـــەردێ بخـرێتـــە نێـــوی**

لەو فەرمودە پیـرۆزەی پێغەمبەردا هاتوە: ﷺ کە دەفەرموێ: (( لا تبلغوني عــن اصحابي سوءا فـاني احـب ان اخـرج الـيكم وانـا سـليم الـصدر... بـە خراپـە دەربـارەی هاوەڵانم هەواڵم پێ مەدەن، پێم خۆشە کە دێمە لاتان دڵم هیـچ نەڵێ لە ڕوتان)).

**لـە ئـــاهـــی هـەژاری مـەنـــاڵـــــــــە**
**جـاری وایـــە نـەداری ئاســـودەیی حاڵـــە**

هەر کاتێ جەستە نازو گۆزی بـە خـۆوە بـینی گیـانو ڕۆح وێـك دێنـەوە، چـەندی کەمیشت هەبێ سەرت سوك ترە، دنیا بە کەم گریش، ئاسودە بـونێکی ڕاسـتەوخۆیە، خوای گەورە بۆ هەموکەسێکی بە ڕەوا نابینێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا ... ئـەم زەمینەو هەرچی وا بەسەریەوەیە لە دواجاردا هەر بۆ ئێمە ئەمێنێت، ﴿٤٠﴾ مریم ﴾.

یەکـێ ئەم هـۆنراوەی هەڵداوە:

**نـان و ئاوو سـێبەرن بەهـــرەی خـوای بەهـرەوەرن**
**گـەر بڵێـم من مەغدورم لە میهـری خـوا بـە دورم**

بۆ مەگەر بژێوی ژیان هەر لەم سێ شتە سەرەکیە پێك نایێ، سێبەری چـڕو پـڕو ئاوی ساردو نانی گەرمو گوڕ!!

ئـا ئـەو چـاوتێری یـە هەڵوێـستی کەسـانێکە سـەر بـەرزو شـکۆمەندن، خـاوەنی ڕێبیـرێکی [٣٢٠] داسەپاون، لە گوفتاردا نەگۆڕاون، لە پەیامیاندا دڵکـارن [٣٢١].

---

٣٢٠) بیروباوەڕ.
٣٢١) تێکۆشـەرن/چالاکن.

## لە داخـی چـــاوەڕوان کــراوێ هەراسان مەبــە

دەڵێن لـە تەوراتـدا نوسـراوە: زۆربـەی مەترسـی چـاوەڕوان کـراو نایێتـە ئـاراوە! مەبەست لەو وتەیەدا ئەوەیە: زۆرێك لەوانەی خەڵك مەترسـیان لـێ دەکا ڕونـادەن، بێگومان ئەو لێکدانەوانەی لەناو دڵ دایە، زۆرترن لەو ڕوداوانەی لە ڕودایە.

شـاعیـرێك دەڵــێ:

**بە دڵی خـــۆم وت گــەر بەڵایێ یەخــەت بگرێ**

**دڵارام بــە پێشـبـینـی زۆر نــاگــاتــە جـــێ**

گەر گێچەڵێ بەرەو ڕوت هات، یا گوێ بیستی مەرگەساتێ بوی، هێمنی و هـەداری بنوێنەو بە خەمەوە خۆت مەدوێنە، چونکێ زۆرێ لە هەواڵی جـەرگ بـڕو پێـشبینی یەخە دادڕ هەر لە ڕێ بون و بێ جێ بون، ئەگەر وزەیێ هەبێ نـەیێڵێ قـەدەری خـوا بگاتە جێ، ئەوا خـەڵك بـە دوای دەستەبەرکردنی ئـەم وزەیـەدا دەگـەڕێ، ئەگـەریش ئەم وزەیە نەبێ، لە کوێ دەستەبەر دەکرێ؟!

﴿... وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ ... کاری خۆم بە خوا دەسپێرم، خودا چاوی لـە عەبـدەکانی خـۆی هەیـە. خوا ئەوەی لە ئاکامی خراپی ئەو فێڵەی دەیانکرد، ڕزگار کرد، ﴿٤٥﴾ غافر﴾.

## بە ڕەخنەی چە پەڵکاران و چاوچنۆکان چۆك دانەدەی

ئەگەر تۆ لە ئاستی ڕەخنە گریو چاو تێبڕی[٣٢٢] ئەواندا دان بە خۆدابگری، ئەوا پاداشتی خوای لەسەر وەردەگری، گومانت نەبێ کە ڕەخنەو ڕەخنەکاری ئەوان بارتەقای سەنگو ڕێزی تۆیە، دڵنیا بە هیچ کەسێکیش لە مردو قەڵس نابێو پێیدا ناکێشرێو، خەڵکانێکی بێ بەهرە ڕەشکیان پێ نابرێ[٣٢٣].

پێغەمبەر موسی درودی خوای لەسەر، داوای لە خوا کرد زمانی کەسانێ لە گۆ ببەستێ کە بە خراپە لێی دەدوێن، خوای باڵا دەست فەرموی: "یا موسی، ما اتخذت ذلك لنفسي، اني اخلقهم وارزقهم، وانهم يسبونني، يشتمونني!!... ئەی موسا من ئەوەم بۆ خۆم نەکردوە، من بە دیم هێناون ڕۆزیان پێ دەدەم، کەچی ئەوان وتەی نابەجێ بەرامبەرم دەدرکێنن‌و جوێنم پێ دەدەن!! هەروەها لە فەرمودەیەکی بەهێزدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (( يقول الله عزّوجل: يسبني أبن آدم، ويشتمني أبن آدم، وما ينبغي له ذلك، أمّا سبّه أياى، فإنه سيب الدهر، وأنا الدهر أقلب الليل والنهار كيف أشاء، وأما شتمه أيـاي فيقول: إن لي صاحبة ولدا، وليس لي صاحبة ولا ولد... خوای بەرزو توانا فەرمویەتی: مرۆڤ جوێنم پێ ئەداو تۆمەتی ناڕەوام ئەداتە پاڵ، کەچی لێی ناوەشێتەوە، جوێنەکەی ئەوەیە کە جوێن بە ڕۆژگار دەدا کەچی ڕۆژگار بریتیە لە من، من چۆن بم هەوێ هەڵگێڕو وەرگێڕ بەشەو ڕۆژان دەکەم، تۆمەتی ناڕەواش ئەوەیە گوایە: هاوسەرو منداڵم هەیە، کەچی نە هاوسەرم هەیەو نە منداڵ)). تۆ ناتوانی لەمەڕ ئابڕوی خۆت قوڕ لە دەمی خەڵك بپەستیو زمانیان لەگۆ ببەستی، بەڵکە دەتوانی کردەوەی چاکە ئەنجام دەیو، خۆت لە ڕەخنەو پەلاریان هەڵبوێری.

بێگومان ئەوانەی بێ نرخو بێ بایەخن بەسای کردو کۆششی تێکۆشەرو تیشك دەرو گەورەپیاوان بێزارو قەڵسن. زۆربەی زۆری دەوڵەمەندانیش حاڵیان وایە لە بێزاریدا دەگوزەرێنن کاتێ نرخی دەستمایەکانیان بەرزە، پاڵەپەستۆی خوێنیان

---

٣٢٢) ئێرەیی.

٣٢٣) ئێرەییان پێ نابرێ.

نزمـه. ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ الَّذِي جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ ﴿٣﴾ كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ ... هاواره لـه کەسێکی تانەوتەشـەر لێدەداو قسان دێنیو دەبا، ئەوەی ماڵی کۆکردۆتەوەو دەیبژێری، خـەیاڵ دەکا دراوەکـەی لـە مـردن دەیپارێزێ، نانا، باوا خەیاڵ نەکا، بێشك فڕێ دەدرێتە ناو (حوتەمە)، ﴿٤﴾ الهمزة﴾.

یەکێ لە وێژەرە ڕۆژئاواییەکان دەڵێ: کام کردەی ڕاستە ئەنجامی دە، دوای ئەوە لە پشكو پەلاری هەرزە گۆیان چاوەڕێ بە!

یەکێ لەو سودو کەڵکەی بە سای ئـەزمون بـە دەسـت هـاتوە ئەوەیـە: وەڵامـی ئـەو وتەو گوتـەو پرتـە نەدەیتـەوە کـە هەسـتو ناخـت دەخرۆشـێنن [324] دەشـێ ئـەم نـاو زڕانە [325] بێ خەوشی [326] تۆ بگەیێنێ، سەر بەرزیە بۆ تۆ کـە نـەرمو نیـانی بنـوێنیو، دوژمـن بـە شـەکراوێ بخنکـێنی، گـەر چاوپۆشـیان لـێ بکـەی سـەر بەڵنـدیو پـاداش وەدەست دێنی، نیوەی ئەوانەی سوکایەتی تۆیان بـەر گـوێ کـەوتوە ئێسـتا لـە بیریـان چـۆتەوە، نیوەشـیان هـەر نـەیان خوێندۆتـەوە، خـەڵکانێکی زۆریـش ئەگـەر بـە بەرگوێشیان کەوتبێ هەر لەو باسو خواسە تێ نەگەیشتون!

کەوایە تۆش زۆر بیری لێ مەکەوەو تێی داقوڵ مەبەوەو هەر وەڵامیان مەدەوە.

یـەکێ لـە پـسپۆڕو شـارەزایان دەڵێ: کـە خـەڵك نـانی کـەم بـێ بـە لای مـنو تـۆدا لاناکاتەوە، خۆ تێنوێتی یەکێ لەوان مەرگی منو تۆیان لە بیر دەباتەوە.

خۆ ئەگەر ماڵێك خۆراکیان نانی جۆ بێ، بەڵام ئەندامانی دڵارامو لەسەر خـۆ بـێ، خۆشترە لەو ماڵەی لە جۆرەها خۆراکی بەچێژ پڕ بێ، کەچی بارودۆخی دانیـشتوانی تفتو تاڵو قـوززەڵقـورت بێ.

---

٣٢٤) دەکولێننەوە.

٣٢٥) ناشیرین کردنە.

٣٢٦) بێ عەیبی.

## هەڵوەستەیەك

ئەو دڵ پەستیەو کزو ماتیەی ناوێ: نەخۆش چارەسەر دەکرێو، بەڵاو مەینەتی ڕادەبرێ، تاوانیش چاوپۆشی لێ دەکرێ، قەرزو قوڵ دەدرێتەوە، بەند کراو کۆتبەندی لێ دەکرێتەوە، ون بو بەرەو ماڵ دێتەوە، هەژارو نەدار دەروی خێری لێدەبێتەوە. بێزاری لە ژیان مەنوێنە: مەگەر نابینی کاتی هەوری ڕەش بەری ئاسمانێ دەگرێ، پاشان چۆن دەڕەوێتەوەو ئاسمان بە ڕۆنی دەدرەوشێتەوە، تاریکی شەو چۆن دەتارێ، چۆن گەردەلولو ڕەشەبا ڕقو کینەی دەخواتەوەو، ئارام ئارام خۆی هێورە دەکاتەوە؟! کەواتە مەرگەساتو گێچەڵی تۆش بەرەو هێمن وەردەچەرخێن [٣٢٧]، خۆش گوزەرانیت بەڕێوەو ئاسۆی ڕونت لێ هەڵدێن.

ڕەنگ هەڵبزرکاو [٣٢٨] مەبە: هەر ئەوەندە لەسەرەتۆ پێویستە کەمێ ئارام بگرێو چاو لە ڕێ بی، بزانە ساتێ سرەوتنی ژێر سەهەندێ [٣٢٩] کڵپەی گڕی بەر هەتاو دادەمرکێنێ، تێنوێتی لە قرچە ڕۆژی هاویندا [٣٣٠] تەنیا قومە ئاوێکی سازگار دەی شکێنێ، نانێکی گەرمو نەرم برسێتی چەند ڕۆژەت لە بیر دەباتەوە، خەوێکی خۆش شەونخونی چەند شەوانت قەرە بو دەکاتەوە، لەش ساخیو تەندروستیت وەڵامی دەردەداری پێشوت دەداتەوە.

جێی خۆی نیە پەرۆشو بێ چارە دامێنی: ئەوەی خوا بیەوێ ڕێی لێ ناگیرێ، قەزاو قەدەری خوا هیچی لەگەڵ ناکرێ، پزیشکان لە ئاستیدا پەشۆکاون [٣٣١]، کاراشنایان لە ئاقاریدا دەستەوسانن، پسپۆڕانو شاعیران لێی ماتو سەرسام ماون.

---

٣٢٧) وەردەگەڕێن.

٣٢٨) ڕەنگ تێك چو.

٣٢٩) نراگە و سێبەر.

٣٣٠) ڕۆژی گەرمی هاویندا.

٣٣١) سەرسام بون.

## ( دڵ لە دڵ مەدە ئەوەیان هەڵبژێرە خوا بۆی داناوی )

هەستانو دانیشتنت بە پێی فەرمان خوا بێ، کاتی هەژاری پێ ڕەوا بینی ئارامی لەسەر بگرە، ئەگەریش زەنگینی کردی سوپاسگوزاری بنوێنە.

ئەمەشیان یەکێکە لە کەرەستەو پێکهاتەی ئەو فەرمودەیە: "رضیت باللە، ربا وبالاسلام دینا، وبمحمد ﷺ نبیا" قایلم بەوە، خوا پەروەردیارم بێ، ئیسلام بەرنامەی ژیانم بێ، محمد ﷺ ڕابەرم بێ.

## ( بێزاری لە هەڵسوکەوتی کەس مەنوێنە )

خوای کار لەجێ سود گەیاندنو زیان گەیاندنی نەخستۆ دەستی هیچ کەس، نە مردونو، ژیانی کەسیان لە دەستەو، نە دەشتوانن خەڵکی لە قەبران فیت کەنەوەو، خەڵاتیان کەن، یا تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

وتەیەکی ئیبراهیمی کوری "ادهم"یش دەڵێ: ئێمە واین لە ژیانێ، ئەگەر زۆردارو دەسەڵاتدار پێی بزانێ، بە زەبری شمشێر لێمان دەسێنێ.

"ئیبن تەیمیە" دەڵێ: جاری وایە حاڵەتی وا بەسەر دڵما دێ دەڵێم: ئەگەر بێو بەهەشتی یان لە وێنەی ئەم خۆشیەدا بەسەربەن، دیارە ئەوان خۆشگوزەرانن.

لە وتەیەکی تریش دا دەڵێ: چەند حاڵەتو چۆنیەتی وا بەسەر دڵدا دێن لە خۆشیان ئەم دڵە شاییو هەنگەمەی تێدا دەگەڕێ، کە بە سایەی یادو یادەوەری خوای بەهرەوەرو، دڵارام بون بەو یادەوە ئەو حاڵەتە دێتە ئاراوە.

بە هەمان شێوە لەو کاتەی بەند دەکرێو دەرگای بەندیخانەی لەسەردا دەخرێ، ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ... ئیتر ئەوسا شورەیەکیان لە نێوان دەبێتە لەمپەر، دەرگای هەیە، لە ژورەوەی بەزەییەو لە دەرەوەی جەزرەبەیە، (١٣) الحدید﴾ .

هەر لە ناو بەندیخانەکەدا دەڵێ: باشە نەیارانم چیـان لێم دەوێ؟!

من بەهەشتو بـاخو باخـاتم وا لـە نـاو سینەمدا، بـۆ هـەر لایـێ بـڕۆم لەگـەڵم دا، کـوژرانم شـەهید بونـە، شـار وەدەریـم گەشـتو سـەیرانو شـاد بونـە، بەندیخانەشـم لەگەڵ یادی خوادا سەرقاڵ بونە.

پیاوچاکانیش ئەم وتەیان فەرموە دەڵێن: ئەو کەسەی خوا نـەیاری بـێ دەبـێ چـی بێ لە یاری بێ؟! ئەوەیشی خوا لە یاری بێ دەبێ چی بێ نەیاری بێ؟!

بـە هـیچ جـۆرێ ئـەم دوانـە ناخرێنـە یـەك كێـشانەو پێوانـە [٣٣٢]، هـەر کەسـێ پەرستراوی ڕاستەقینەی بدۆزێتەوە خاوەنی هەموشتێکە، هەر کەسێکیش پەرستراوی ڕاستەقینەی نەدۆزێتەوە هەموشتێ لە دەست دەدا.

## ( ئــەوەی لە تـاوی داخـداری، بزانە سـەنگی چەندە )

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرموێ: (( لأن أقول: سـبحان الله، والحمد لله، ولا الـه الا الله، والله اكبـر، احب الي مـما طلعت عليه الشمس... بە دڵنیاییەوە کە بڵێم: پـاکی بـۆ خواو سوپاس بۆ خوا، هیچ پەرستراوێ بەڕاست نـازانم جگـە لـە خـوای تـاكو تـەنیا، ئـەو خوایـەش لـە هەموشـتێ گـەورەترە، ئـەو یـادەم لـە لا خۆشەویـسترە لـە هەرچـی ڕۆژی بەسەردا هەڵدێ.

یەکێ لە پێشینان، سامانداران‌و پارەو پوڵیان، خانو بەرەو کۆشـكو تـەلاریان، بـەو شێوەیە هەڵدەسەنگێنێو دەڵێ: ئێمە لەگـەڵ وان لـە خـواردنو خواردنـەوەو بینینـدا هاوشـانین، بـەڵام ئێمـە بـار سـوکین لـە دوا ڕۆژداو ئـەوان دەربـارەی ئـەو سامانداریە لێیان دەپێچرێتەوە.

لە بیـرت دەبـاتـــەوە شـــەوێ لــە گــۆڕی تــاریـت
هەرچی کۆشـكو تەلارو گەنجیـنەی پێی دەنـازیـت

---

[٣٣٢] وەکو یەك نین.

﴿ وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ ... هـەروەك تـاك تاكـەو بـە تـەنیا لـە پێشودا، ئێوەمان وەدی هێناوە، هەر واش هاتونەوە لامان، ﴿٩٤﴾ الأنعام ﴾.

(لەمـەڕ ناخۆشـیێ هاتـە ڕێیـان گوتیـان): ﴿وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ ... هـەر بـەڵێنی خوداو پێغەمبەری بیدەن، ڕاست دەردەچێ، ﴿٢٢﴾ الأحزاب ﴾.

بـەڵام دو ڕوان ئـەوە هەڵوێـستیان بـو: ﴿ ... مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ... ئـەو بەڵێنەی خوداو پێغەمبەر دەیاندا هەر بۆ فریوی ئێمە بو، ﴿١٢﴾ الأحزاب ﴾.

ژیانێ کە ئێستا هەتـە، بـەری بیـروهزری خۆتـە، ئـەو بۆچونەی لـە بیـروهزری تۆوە هەڵدەقوڵێو لە بیـری خۆتدا تاو توێ یان دەکەی، هـەر ئەوەیـە بەسـەر ژیانتـدا کاریگەری دەبێ، جا چ بە لای بەختەوەریدا بـێ، یـا بـەلای بەدبـەختیو چارەڕەشـیدا بێ. یەکێ دەڵێ ئەگەر تۆ بێ کەوشو [٣٣٣] پێخواسی، لـە کەسـانێ بنـوارە قاچـەکانیان قرتاوە [٣٣٤]، کەوایە تۆ لەسەر بەهرەی ئەم دو قاچەت سوپاسگوزاری بۆ خوا بنوێنە.

شاعیـر دەڵـێ:

**بێ جەرگو ڕەوەك نـابـم کە ڕوداوێ لە ڕێیـــە**

**دەڵێ چی خوا بیهـێنێ خێـرو فەڕ هەر لەوێیە**

---

٣٣٣) بێ پێڵاو.

٣٣٤) بڕاوە.

## (با دڵــت گــەردێ نەگرێ، هــەتا ڕوت لە چاکە بێ)

بــێ ســۆ چــاکە نوانــدن لــە ڕوی خەڵکــدا، ڕێگــایێکی بــەر فرەیــە، لــە ڕێگاکــانی بەختەوەریدا. پێغەمبەری خوا ﷺ بەمبۆنەیەوە دەفەرموێ: (( إن الله يقول لعبده وهو يحاسبه يوم القيامة: يا ابن ادم، جعتُ ولـم تطعمني، قال: كيف اطعمك وانـت رب العالـين؟! قال: اما علمت ان عبدي فلان ابن فلان جاع فما اطعمته، اما انك لـو اطعمته وجدت ذلك عندي. يا ابن ادم، ظمئت فلم تسقني. قال: كيـف اسـقيك وانـت رب العـالمين! قال: اما علمت انَّ عبدي فلان ابن فلان ظمئ فما اسقيته، اما انك لو اسقيته وجدت ذلـك عندي. يا ابن ادم، مرضت فلم تعدني. قال: كيف اعـودك وانـت رب العـالمين؟! قـال: امـا علمت ان عبدي فلان ابن فلان مرض فما عدته، اما انك لو عدته وجدتني عنـده؟!... لە ڕۆژی سەڵادا خوای گەورە لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەی خۆی دادەکاو دەفەرموێ: ئەی مرۆڤ، من برسی بومو تۆ خۆراکت پێ نەدام. ئەویش دەڵێ: ئـەی پـەروەردگارا چۆن خۆراك بە تۆ بدەم کەچی تۆ پەروەردیاری هەمو جیهانی؟! خوای گەورە دەفەرموێ: مەگەر نەتزانی بەندەی من فلاّنی کوڕی فلاّن برسـی بـو تـۆش خواردنـت پـێ نـەدا، نەتدەزانی ئەگەر خواردنی بدەیتێ لەلای منەوە پاداش وەردەگری. ئـەی مرۆڤ، مـن تێنو بوم ئاوت نـەدا پـێم. ئـەویش دەڵـێ: پـەروەردگارا چۆن ئـاوت پـێ بـدەم کـە تـۆ پەروەرێنی هەمو جیهانی! خوای گەورە دەفەرموێ: بۆ مەگـەر نـەتزانی بەنـدەی مـن فلاّنی کوڕی فلاّن تێنو بو بەڵام ئاوت پـێ نـەدا، نەتـدەزانی ئەگـەر ئـاوی بـدەیتێ لـە لای منەوە پاداش وەردەگری. ئەی مرۆڤ، من نەخۆش بوم کەچی سەردانت نـەکردم. ئەویش دەڵێ: ئـەی خوایـە چۆن سـەردانت بکـەم کـە پەروەرنـدەی هـەمو جیهـانی؟! خوای گەورە دەفەرموێ: مەگەر نەتزانی بو بەندەی من فلاّنـی کـوڕی فـلاّن نـەخۆش کەوت کەچی سەرت لێنەدا، نەتدەزانی ئەگەر سـەرادنت بکردایـە منـت لـەوێ دەست ئەکەوت؟!)).

با سەرنجێ لەو فەرمودەیە بدەین، لە کۆتـاجاردا دەڵێ: منت لە لای ئـەو نەخۆشـە دەست دەکـەوت وەکـو جـارانی پێـشو ناڵـێ: لـەلای منـەوە پاداشـت دەسـت دەکـەوت، چونکێ خوای دلۆڤان لە لایەن کەسانێکە دڵ شکستەن، نەخۆشیش یەکێکە لەوان.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفـەرموێ: (( فــي کـل کبـدٍ رطبـة اجــرٌ... چاکە لەگەڵ هەر گیانلەبەرێدا بنوێنە، پاداشتی خوا وەدەست دێنی)).

بزانە خوای دەهەندە، سۆزی بۆ ژنێکی خراپەکاری "بـەنی ئیـسرائیل" دەنوێنـێو، دەیخاتە بەهەشت، بە سـای ئـەوە سـەگێکی تێنـو تێـراو دەکـا. چ جـای یـەکێ هـەزارو نەدارێ تێر نانو تێراو بکا، لە تەنگانەو کلۆڵیدا ڕزگاری کا؟!

بـە هـەمان شـێوە بـە ڕاسـتو دروسـتی لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ بیـستراوە کـە دەفەرموێ: (( من کان له فضل زاد فلیعد به علی من لا زاد له، ومن کان له فضل ظهـر فلیعد به علی من لا ظهر له... هەر کەسێ زیادە لە خۆی ڕۆزی هەبێ، با بیدا بە یەکێ نیەتی، هەر کەسێکیش زیادە لە خۆی باربەری [٣٣٥] هەبێ، با بیدا بە یەکێ نیەتی)).

حاتـەم چـەند دێـرە شـیعرێکی هۆنیوەتـەوە تیایـدا ئامۆژگـاری فەرەواشـەکەی [٣٣٦] دەکا، کە چاوەڕوانی مێوانی بێ.

دەگێڕنەوە "عبدالله"ی کوڕی "مبارك" هاوسێیەکی جولەکەی دەبێ، بەم شـێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، بـەر لـە منـاڵی خـۆی خـواردنی بـە جولەکـە دەداو بـەرگـو پۆشاکی بۆ دەکڕی، بـە جولەکـەیان وت وەرە خانوەکـەمان پـێ بفرۆشـە، گـوتی باشـە بەڵام من خانوەکەم بە دو هەزار دینار دەفرۆشم، هەزاریان نرخی خانوەکەیە، ئەوی تریشیان لـە پـای هاوسـێیاتی "عبـدالله"یـە! عبـدالله گـوێی لـەم قـسەیە بـو، لـە خـوا پاڕایەوە گوتی: ئەی خوایە ئەم جولەکەیە بۆ لای ئایینی ئیـسلام ڕێنمـایی کـەی. بـە یارمەتی خوا موسڵمان بو!

جارێکی تریشیان "عبـدالله" لەگـەڵ کاروانـێ بـۆ حـەج کـردن دەڕۆیـشت، لـە ڕێگـا چاوی بە ژنێ کەوت، لەسەر زبڵدان قەلێکی مردارەوە بوی هەڵگرتـەوە، خوڵامەکەی بە دوادا ناردو سەبارەت بـەو کـارەی لێـی پرسـی، لـە وەڵامـدا گـوتی: ئـەوە سـێ ڕۆژە هیـچمان نیـە بیخـۆین تـەنیا ئـەوە نـەبێ، کـە فـڕێ دەدرێتـەوە سـەر ئـەم گوفەکـە، "عبـدالله" چـاوی لـە ئەسـرین [٣٣٧] هـەڵڕژاو فەرمانیـدا هەرچـی پـێیانـە لـەوێدا

---

٣٣٥) بارهەلگر/وەڵاخی سواری و ئۆتۆمۆبیل و هەر شتێ دەگرێتەوە باری هەڵبگرێ.
٣٣٦) خزمەتکارەکەی.
٣٣٧) فرمێسك.

بیبەخشن، لەم گەشتەیدا گەڕایەوەو ئەو ساڵە نەچو بۆ حەج، شەوێ لە خەودا بینی یەکێ پێی دەڵێ: حەج کردنت قەبوڵ بێو، کردو کۆشت [٣٣٨] بە هەدەر نەچێو، تاوانت لەسەر لاچێ.

خوای گەورەش لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ... خەڵکی وەپێشەخۆیان دەخەن، هەرچەند دەست تەنکیشیان هەیە، (٩) الحشر﴾.

شکۆداری بۆ خوای گەورە، خونەریتی بەرز چەندە گران دەنرخێنێ! بەهرە باڵاکان چەند بە بەرزی دەنوێنێ! ڕەفتاری جوان چەندە جوان دەڕەنگێنێ! هیچ کەسێ پەشیمانی لە ئەنجامدانی کردەی چاکە دەرنابڕێ، ئەگەر چی تێیدا زیادەڕۆ بێ، وە لێ لە کردنی تاوانێ پەنجەی ژێوانی دەگەزێ، ئەگەر چی تاوانێکی چوکیش بێ.

## بە بیستنی وشەیەکی نەشیاو دڵ گران مەبە، ڕژدی ڤایرۆسێکی دێرینە

یەکێ لە زانایانی ئەم چاخە [٣٣٩] دەڵێ: پێویستە لەسەر ئەوانەی لەمەڕ توانجو پەلاران زو هەراسانن لەبەردەم هاشەهاشی [٣٤٠] ڕەخنەی ستەمکارانەدا، لێوانێ [٣٤١] ئاوی سارد بە سەرپەیەکانی [٣٤٢] هەستدا هەڵڕێژن.

هەروا ئەم وتەیان هەڵداوە کە دەڵێ: (( هەر لە پێناوی خوایە ڕەوشتی ئێرەیی، [٣٤٣] کە دادوەری دەنوێنێ، چونکو خاوەنەکەشی هەڵنابوێرێ، سەرەتا لەویەوە دەست پێدەکاو بە خاکی دەسپێرێ [٣٤٤] )).

---

٣٣٨) هەوڵ و کۆشش.

٣٣٩) ئەم سەردەمە.

٣٤٠) هاژە هاژ.

٣٤١) پەرداخێ.

٣٤٢) وردە دەماری هەست.

٣٤٣) حەسودی.

پێشەوا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، بەم شێوەیە بێ ترسی لە مەرگ دەنوێنیو دەڵێ: مەرگ بەهەشتێکی پەرژین قایمە.

یەکێ لە کاراشنایان دەڵێ: مرۆڤی بێ جەرگ چەندین جار دەمرێ، بەڵام مرۆڤی گوستاخ [٣٤٥] تەنیا یەك جار لە ژیانیدا دەمرێ.

ئەگەر خوای گەورەش بیەوێ چاکە لەگەڵ بەندەکانی خۆی بکات، ئەوا لەو پەڕی تەنگانەدا وەنەوزەیان [٣٤٦] بەسەردا دێنێ کە ئاماری [٣٤٧] هێور کردنەوەیە لە لایەن خواوە، هەروەکو لە جەنگی "ئوحود"دا "تەلحە" خوای لێی ڕازی بێت، وەنەوزەی گرتو، ئەوەندە دڵارامو حەساوە بو، چەند جاران شمشێری لە دەست هەڵدەوەرا.

کەسانێکی دیـن کـزو لاڕێ هەبون ئـەم حاڵەتەیان بەسەرهات، یەکێ بە نـاوی "شەبیبی" کوڕی "یەزید" چاپوکترین کەس بو خێزانەکەشی ئەو ژنە بو توانی "حجّاج" وەدەرێ نێ، لە تەنگانەدا لەسەر پشتی وڵاخەکەی وەنەوزەی بەسەرداهات.

خـوای گـەورەش دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ... بێژە: ئـاخۆ چاوەنۆڕن جگە لە یەکێ لەو دوانە - کە هەردوکیان باشەکانن - شتێکی ترمان توش ببێ؟ ئەوا ئێمەش چاوەنۆڕین خودا هەر خۆی، یان بەهۆی ئێمە جەزرەبەو بۆ بنێرێ. دەسا ئێوە چاوەنۆڕ بن، ئەوا ئێمەش چاوەنۆڕین، (٥٢) التوبة ﴾.

بەهەمان شێوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ... هیچ کەسێکیش بە بێ ئیزنی خودا نامرێ. کە مردنی هەر کەسێکیش وەختەکەی بۆ داندراوەو لە لای خوداوە نوسراوە کێش هەر خۆشی لە دنیادا ئارەزو

٣٤٤) هەتا دەیکوژێ.

٣٤٥) ئازا.

٣٤٦) باوێشکیان بەسەردا دێ.

٣٤٧) نیشانەی.

بێ، خوا دەیداتێ، هەر کەسێکیش خۆشی خۆشی دوا ڕۆژی گەرەك بێ، خودا ئارەزوی پێك دێنێ. ئەوانەش وا شوکر دەکەن، زو جەزایان دەدەینەوە، ﴿١٤٥﴾ آل عمران.

بەڵێ، سوێند بە خوا، کاتێ مۆڵەتی ژیانیان بڕا تەنیا چرکە بێ مەرگیان دوا ناخرێو نە پێش دەخرێ، پێشەوا علی خوا لێی ڕازی بێ فەرموی:

هەروا پێشەوا "ئەبو بەکر" دەفەرموێ خوا لێی ڕازی بێ: بە دوای مەرگا بگەڕێن ژیانیان وەدەست ئەکەوێ.

## هەڵوەستەیەك

ئەی باوەڕدار ئەو خەمۆکیو دڵپەستیەی پێ ناوێ: دڵنیا بە خوا پشتیوانیت لێ دەکا، فریشتە بۆت دەپاڕێتەوە، بڕواداران لەهەمو نوێژێدا لە نزاو سکاڵا بێ بەشت ناکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی سزا تکات بۆ دەکا، قورئانیش جوانترین بەڵێنی پێ داوی، لە سەروی هەمویانەوە خوای گەورە سۆزت بۆ دەنوێنێو میهری ئەویش بێ سنورە.

خەمگین مەبە: دڵنیا بە لەسەر چاکە یەك بە دە هەتا حەوسەد بگرە زیاتریش پاداشت دەدرێتەوە، وەلێ [٢٤٨] تاوان هەر بەو وێنەی خۆی وەلامی دەدرێتەوە یا چاوپۆشی لێ دەکرێو تۆڵەشی ناگرێتەوە، دەبزانە بەخشندەیی خوا چەند فراوانە هیچ دروستکراوێ ئەوەی لێ چاوەڕێ ناکرێ! میهری ئەو چەند بەروەدەیە [٢٤٩] کەس هاوشانی پێ ناکرێ [٢٥٠]!

خەمبار مەبە: تۆ لە دەستەی یەکتاپەرستانی، هەلگری پەیامی قورئانی، یەك ڕوگە پێدەزانی، تۆ بنچینەی خۆشەویستی خواو پێغەمبەرت ﷺ لەناو دڵدا سەپاوە، خوا ئەم هەستەی پێداوی: لە خراپە پەشیمانی، لە چاکەو چاکەکاری دڵخۆشو شادمانی، چەندین بەهرەی شاراوەت هەن کەچی پێیان نازانی.

---

٢٤٨) بەلام.

٢٤٩) بەر فراوانە.

٢٥٠) بەرامبەری پێ ناکرێ.

تـەمبار مەبـە: تـۆ لـە شـین‌و لـە شـاییدا، لـە زنگینـی‌و هەژاریـدا، لـە تەنگانـەو هەداریدا [٣٥١]، کردەت بـە هـەدەر ناچێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: (( عجبـاً لأمر المؤمن، إن أمره كل له خيـرا!! وليس ذلك الاّ للمؤمن، إن أصابته سـرّاء فـشكَرْ كـان خيـــرا لــه، وإن أصـابته ضـرّاء فـصبـر كـان خيـــرا لـــه... کـارو وەرامـی [٣٥٢] بـڕوادار سەرسوڕمێنە، ئەگەر خۆشییێکی بەسەردا هات سوپاسگوزاری خوایە بـە چاکە بۆی دەنوسرێ، ئەگەرییش دوچاری تەنگانەیێ هات، ئارامی لەسەر دەگرێ‌و بە چاکە بۆی دادەنرێ.

## ئارامگـرتن‌و خۆڕاگـری ڕێگان بۆ بەختـەوەری

﴿ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ ... خۆراگربـــە، دیـــارە خۆڕاگرتنیـــشت هــەر بـــە خوایە، (١٢٧) النحل ﴾.

﴿ ...فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ . خـۆڕاگری بـێ ناشـکوری (چـاری منه)، لەمەڕ ئەوانەش کە ئێژن، خودا دەهانامەوە دێ، (١٨) یوسف ﴾

﴿ فَٱصۡبِرۡ صَبۡرٗا جَمِيلًا ... تۆ خوای گەورە بگرە بە خۆگرتنێکی پەسند، (٥) المعارج ﴾.

﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ ... هەر لـە سـاى هێمنیـدا بـن، چونکە ئێوە خـۆڕاگر بـە، (٢٤) الرعد ﴾.

﴿ ...وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ ... خۆڕاگر بـن لـە خۆڕاگریـشـــا هـەر لـە پێشەوە بـن، (١٧) لقمان ﴾.

﴿ ... ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ ... بۆ پاراستنی سنور گەل هەمیشە سازو تەیار بن، (٢٠٠) آل عمران ﴾.

---

٣٥١) هێمن دا.

٣٥٢) کردەوە.

پێشەوا (عومەر) دەڵێ: بە ساى ئارامگرى بو بە بەختەوەریمان بەدەست هێنا.

ئەوانەى شوێن پێ هەڵگرى پێغەمبەرى خوانە، کاتێ داماوو بەرە بەلانە، سێ هۆکارى دەربازبونیان لەبەردەست دانە: ئارامگرىو پاڕانەوە، چاوەڕێى دەرگاى خێر لێکرانەوە.

شاعیر دەڵێ:

**لێوانێکیان پێ نۆشین ئێمەش پێمان نۆشکردن**
**بەس ئێمە ئارامگر بوین لەسەر تالأیى مردن**

لە فەرمودەیەکى ڕاستى پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: کە دەفەرموێ: (( لا أحد أصبر على أذى سمعه من الله: أنهم يزعمون انه له ولدا و صاحبة، وانه يعافيهم و يرزقهم... هیچ کەسێ لە خوا ئارامگرتر نابێ لەسەر ئەو ئازارەى گوێبیستى دەبێ: بێباوەڕان وا گومان دەبەن خوا منداڵو هاوسەرى هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خواى گەورە دەیانپارێزێو، ڕۆزیان پێ دەدا)).

لە فەرمودەیەکى تریشدا دەفەرموێ: (( رحم الله موسى، ابتُلي باكثر من هذا فصبر... خوا میهرو سۆزى بەسەر "موسى"دا بڕێژێ، پتر لەوەى بەسەرە من دێ بەسەرى هات بەلأم ئارامى گرت)).

لە فەرمودەیەکى تریشدا درودى خواى لەسەر بێ دەفەرموێ: "مَن يَتَصَبَّر يُصَبِّره الله... هەر کەسێ هەوڵدا دان بە خۆدا بگرێ خواى گەورە دلارامى بەسەردا دێنێ.

بێ گومان خواستە بالأکان بە خەونو خەیالان بەردەست نابن، بەڵکە بە ساى ورە بەرزىو خۆڕاگرى فەراهەم دێن.

## لەمـەڕ هەڵوێستی خەڵکان دڵپەست مەبە، بزانە لەگەڵ پەروەرێندا چۆنن

پێشەوا "ئەحمەد"ی کوڕی "حەنبەل" لە باسی دنیا بە کەم گریدا فەرمودەیـەکی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کە خوای گەورە دەفـەرموێ: (( عجبـا لـك يـا ابـن ادم! خلقتك، تعبد غيـري، ورزقتك وتـشكر سـواي، اتَحَبَّـبُ اليـك بـالنعم وانـا غـني عنـك، وتتبَغَّض الي بالـمعاصي وانـت فقيـر الي، خيـري اليك نازل، وشرك الي صـاعد!!... تـۆ جێگای سەرسامی ئەی مرۆڤ ! وەدیم هێناویو جگە لـە مـن دەپەرستی، ڕۆزیت پـێ دەدەمو جگە لە من سـوپاس دەکەی، بـە سـای بـەهرەکانم خـۆم لای تـۆ خۆشەویـست دەکـەم کەچـی لێت بـێ منـەتم، بـەڵام تـۆ بـە سـای تـاوان رقـم هەڵدەسێنیو کەچـی ئاتاجی منی، چاکەم بۆ تۆ دادەبارێو خراپەی تۆ بۆ من هەوراز دێ)).

لەسەر بوردەو سەرگوزەشتەی پێغەمبەر "عیـسادا" هـاتوە، درودی خـوای لەسـەر بێ، سی کەسی نـەخۆشو ژمارەیـەکی زۆر لـە چـاو کوێران لەسـەر دەسـتی ئـەو خـوا چاکی کردنـەوە، بـەڵام هـەمویان سـەریان لـە سپڵەکاریو بـێ ئەمـەکی دەرچـو بونـە دوژمنی.

## بە نەبـونی مـەناڵـە

دڵنیا بە ئەوەی بژێوی ژیانی لە دەست دایە، خوایـەکی تـاکو تەنیایـە، ڕۆزی تـۆو هەموبەندەیەکی لە لایە، بۆ دابینکردنی ژیانیش بەڵێنی دایـە، ﴿ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ... ڕۆزیتانو هەرچی بەڵێن تان پێ دەدرێ، لە عاسمانە، ﴿٢٢﴾ الذاريات ﴾.

کە دەیسەلمێنین خوا ڕۆزی دەرمانە، بۆ دەبێ مـرۆ ئەوەنـدە مـەرایی بنوێنـێو، لـە پێناوی دەستەبەرکردنی ڕۆزیدا ئەوەنـدە خۆی زەبونو ڕیسوا بکا؟!

خوای دور لە هـەڵە پێمـان دەفـەرموێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا... لەم زەمینـە هەر شتێ دەجوڵێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خوایە، ﴿٦﴾ هود ﴾.

شـكۆدارى بۆ ئەو كە دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ... هەر ساتێ خودا دەروی خێـرى لە ڕوى مەردەم بكاتەوە، كـەس ناتوانـێ گاڵەى بداتـەوە، ئەگـەر ئـەويش گاڵەى بـدا، - بـەدەر لـەخۆى - كـەس ناتوانێ بيكاتەوە، ﴿٢﴾ فاطر ﴾.

## دەشـێ لە برى دڵ پـڕى، ئەم هۆكارانە لەبەرچـاو بگرى

١- ئومێدت بە بەخشش‌و پاداشتى خواى دەستە باڵا بێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ... بێ گومانە ئەو كەسانەى خۆڕاگرن، بە تەواوى‌و بە بێ حيسابى پاداشى خۆيان وەردەگرن، ﴿١٠﴾ الزمر ﴾.

٢- بە بينينـى بـەڵا (باران بارى سـەرشانت سوك بێ):

گـەر نـەبوايـە لـە دەورم نالـەى دڵ برينـداران
دەبوايـە خـۆم لەنـاويەم لەتـاو ئێش‌و ئـازاران

دەى بە لاى چەپ‌و ڕاستدا بنوارە، ئايە بێ لە مەينەتباران‌و دەردەرانت لـێ ديارە؟ هەربۆيە ئەم وتەيەش هەڵدراوە: لە هەمو شيوێ "بەنو سەعدێك" [٢٥٣] هەيە.

٣- ئەم دەردەى پـێيەوە گرفتارى لە ناخۆشيەكانى ترت لا سـاناتر بێ.

٤- خۆشحاڵ بە كە ئـەم بەڵايـە ڕوى لـە ئايينـت نـەكردوە، هـەر بەرژەوەنـدى دنيـاى گرتۆتەوە.

٥- دڵنيابە جارى وايە ئەو بەندايەتيەى لە تەنگانەو ناخۆشيدا دەينوێنى، پلەى زۆر بەرزترە لەو بەندايەتيە كە لە خۆشيدا بەجێى دێنى.

٦- وا دانێ دەبوايە ئەوە هـەر ببێ.

---

٢٥٣) "بنو سعد" بەو دۆڵاييە دەگوترێ پێغەمبەرو ﷺ يارانى تێدا گەمارۆ درابون.

**وازبێنە لەوەی چارەسەرێ لەباربەی**
**چارە چارە لەوەیە لە رێگا چارە پازەی**

**٧- ئەو خوایەی پەروەرێنی تۆیە، ئەوەی بە سەرت بێنی لە بەرژەوەندی تۆیە:**

﴿...وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ... رەنگە لە شتێك حەز نەكەی بەلاّم بۆتان وەخێر گەرێ، ﴿٢١٦﴾ البقرة﴾.

## مەچوە قاوغی كەسێكی تر

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ...هەر لایە شوێنێكیان هەیە روی تێدەكەن، دەسا ئێوە بۆ چاكە كێ بەركێ بكەن، ﴿١٤٨﴾ البقرة﴾.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ... هەر خۆشی ئێوەی كردە جێ نیشینانی زەمینو هێندێكیان بەرانبەر هێندێكی تر، چەن پلە بردە سەرەوە. ﴿١٦٥﴾ الأنعام﴾ الانعام/١٦٥.

﴿...قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ... هەر تیرەیەك جێ وە خواردنی خۆی زانی. ﴿٦٠﴾ البقرة﴾.

خەڵكان لە بەهرەو وزەو تواناد‌ا، لە پیشەو كارو كرداردا، جیاكارن، بۆیە لە ئاماری شكۆداری پێغەمبەری خوا بو ﷺ، كە بە پێی وزەو ئامادەیی هاوەڵانی كارو پیشەی پێ دەسپاردن، "عەلی" بۆ دادوەری دانا، "موعاز" ی بۆ زانست تەرخان كرد، "ئوبەی" بۆ لێكدانەوەی قورئانو، "زەید" بۆ میرات دابەشكردن، "خالید" بۆ جەنگان لە روی دوژمنو، "حەسان" بۆ هۆنینەوەی شیعرو، "قەیس"ی كوری "سابت" بۆ وتاربێژی.

**لە بری شمشێر لە توندی نەرمی بەكارهێنانی**
**زیانبارە وەكو ئەوەی توندی لە جێی مانی**

خۆ تاواندنەوە لە قاوخی[٣٥٤] کەسانیداو، خۆ پۆشتە کردن بە دابو نەریتی خەڵکێکی تر، خۆ کوشتنو لە ناو بردنە.

خەڵکان کە لە ڕەوشتو خویاندا، لە بەهرەو زمانو ڕەنگو ڕویاندا جیاکارن[٣٥٥]، بەڵگەو نیشانەی خوای بەرزو تواناادارن.

بۆ نمونە پێشەوا "ئەبوبەکر" بە سای سۆزو نەرمو نیانی، سودو کەڵکی بۆ گەلو نەتەوە هانی[٣٥٦] پێشەوا "عومەر" بەهۆی تینو تەوژمی ئیسلامو هەڵگرانی بەو پایە گەیاند، کەوایە ئەوەی لە توانات دایە بەهرەو خەڵاتی خوایە، تۆش بە کەمی مەنرخێنە گەشەی پێ بدەو ڕەنێوی بێنە، بۆ غەیری خۆت پێش کەشی کەو، خۆشت سودی لێ ببینە، ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... خوا ئەرکی لە توانا بەدەر بەسەر کەسدا ناسەپێنێ، ﴿٢٨٦﴾ البقرة ﴾ .

بێگومان دەمە لاسکە کردنو[٣٥٧] زێدە ڕۆیی لە خۆ تێخزاندنی ناو تویکڵی[٣٥٨] خەڵکانی تر مۆرانەی هونەرو بەهرەکانە، قەلاچۆ کردنی[٣٥٩] خواستەکانەو، هەڵوەشاندنەوەی ئەم جیاکاریانەیە کە پێویستە لە مرۆڤدا هەبن.

## گۆشەنشینیو داهاتە سود بەخشەکانی

ئەو گۆشە گیریەم گەرەکە لە خراپە کاریو زێدەڕۆیی کردن لە حەڵاڵ خۆ بە دور بگری، کە دەبێتە هۆی دڵ فراوانیو خەم ڕەوێنی.

"ئیبت تەیمیە" دەڵێ: پێویستە بەندە بۆ بەندایەتی نواندنیو یادی خواو قورئان خوێندنی، بۆ بە خۆدا چونەوەو نزاو ئەسرین هەڵرژتنی، لە خراپەو وێنەی ئەمانەش خۆ بە دور گرتنی، گۆشە گیر بێ.

---

٣٥٤) قالك/توێلك/توێکڵ.

٣٥٥) جیاوازن.

٣٥٦) هێنا.

٣٥٧) لاسایی کردنەوە.

٣٥٨) توێلك.

٣٥٩) بن بڕ کردن.

"ابن الجوزی" لە پەرتوکی "صید الخاطر"دا، سێ باسی دەربارەی گۆشەنشینی [٣٦٠] تەرخان کردوە کە ئەمە پوختەکەیەتی: نەمبیستوەو نەمبینیوە هیچ شتێ ئەوەندەی گۆشەگیری مایەی ئاسودەییو ڕێزو سەربڵندی بێ، ئەوەندە لە خراپەوتاوان مرۆ بەدور بگرێ، ئەوەندە پلەوپایە بەرزڕاگربێ، پارێزەری تەمەن بێ، لەچاوتێوەبوان و [٣٦١] بەدکاران و گەزاران [٣٦٢] بەدورگرتر بێ، ئەوەنده بەدەستهێنانی خواپەرستی و، بەکارهێنانی بیرو هزری تێدا بێ، بۆ فەراهە هێنانی شتی سودمەندو، دەرهێنانی گەنجینە پڕ بەهاکان و، هەڵێنجان لە دەقە سەرەکیەکان ئەوەندە بەر قازانج بێ.

چەند وتەیەکی تریشی سەبارەت بە گۆشەنشینی گوتوە، کە ئەوە مەبەستێتی بە دەستکارمیەوە. لە بەشێکی ڕابردوی پەرتوکەکەمدا گوتومە: بەهرەمەندی و شکۆمەندییەکی وەها لە گۆشەنشینیدا هەیە هەر خوا بۆ خۆی پێی ئاشنایە، ژیری تیایدا وەبەردێ، کاتی هەڵچنینی [٣٦٣] بەری بیرو زەین دێ، دڵی تێدا دەسرەوێ، ئابروی پێ دەپارێزرێ، فرە بەخششی تێدا بەدەست دێ، سەرپێچی لە خراپە دەکرێ، کات و ساتە پڕ بەهاکان لە گوێڕایەڵی خوادا خەرج دەکرێ، یادەوەری خوای دڵۆڤانی تێدا دەکرێ، لە گاڵتەو گەپو ئاشوب گێڕان [٣٦٤] پشت هەڵدەکرێ، بە سای ئەم گۆشەگیریە مرۆڤ لە تێکهەڵچونی [٣٦٥] گەڵ نەیاران و، قسەی نابەجێی ناحەزاندا لادەکاتەوە [٣٦٦]، لە تیلەچاوی [٣٦٧] چاوچنۆکان بێ وەی دەبێ، لە کێشەو بێشەی گرانزانان بەدور دەبێ، لە برِو بیانوی سەر زەنشت کاران و، سەندنەوەی مافە پێشێل کراوەکان و، مەرایی [٣٦٨] خۆ بە زل زانان و، ژیان بەسەر بردن لەگەڵ گەمۆرو مایە پوتاندا [٣٦٩] سەرسوك دەبێ.

---

٣٦٠) گۆشە گیری/خۆ دانە پەنا.
٣٦١) چاو چنۆکان/حەسودان.
٣٦٢) بێ شەرمان.
٣٦٣) ڕنینی.
٣٦٤) ئاژاوە نانەوە.
٣٦٥) بەگژ یەکتر داچون.
٣٦٦) پشت تێ دەکا.
٣٦٧) گۆشەی چاو.
٣٦٨) فێڵ و تەڵەکە.
٣٦٩) هیچ و پوچان.

گۆشەنشینی ئەم کەمو کورپیانەت پوش بەسەر دەکا[٣٧٠]: هەڵەو پەڵەی سەر زمانت، خلیسکی جوڵەوکردەکانت، هەتڵەبونی[٣٧١] هۆش‌وبیرت، هەڵەشە[٣٧٢] بونی دەرودەرونت.

گۆشەنشینی پەچەی[٣٧٣] سەر ڕوی نەریتە باڵاکانە، قاوخی[٣٧٤] مرواری ڕەوشتی جوانە، تویکڵی شکۆفەی[٣٧٥] جوامێریانە، چەند خۆشە گۆشە نشینی‌و هاو دەمت کتێبی خوا بێ، بۆ بەراوەڵە بونی[٣٧٦] تەمەنت هەمیشە لە گەڵتا بێ، هەوێنی کونجی تەنیایی بەندایەتی خوا بێ، تۆشەی[٣٧٧] گەشت‌و سەیرانی ڕێی گوێ ڕایەڵی‌و یادی پەروەردیار بێ، مەخابن تاکۆتا تەمەنت مو بە مو لێت جودا بێ.

هەر لەو گۆشەنشینییەدا بیرو هزرت بەکاردێنی، ورد دەبیەو، ڕادەمێنی، هەست کردنت بە چاوە دێری خوای باڵادەس وەدەس دێنی.

لە گۆشەنشینیدا لەسەر تێگەیشتنی ڕازو نیازان پێ دادەگری، زۆرو وردیاتی شاراوە لە ناو بیرو هۆشتدا هەڵدەگری، لە مەبەست‌و خواستان تێ دەفکری، قەڵای بیروڕایان هەڵدەچنی[٣٧٨]، پەیکەری ژیری هەڵدەبەستی[٣٧٩].

لەو ساتەی لە شوێنێکی چەپەك[٣٨٠] دەگوزەرێنی، گیان‌و دڵ زۆر ئاسودەن، هەست‌و نەست بەدوای ڕاوکردنی شتی سودمەندەوەن.

بۆت نارەخسێ لە گۆشەنشینیدا مەرایی[٣٨١] بنوێنی، چونکو هەر خوایە کە بت بینێ، ناتوانی بە گوتەکانت سەرنجی هیچ کەسێ بۆ خۆت ڕابکێشی، بەڵکە هەر ئەو خوایە وتەکانت دەبیستێ کە بەسەر هەموبونەوەردا بیسەرەو بینەرە.

---

٣٧٠) دەشارێتەوە.
٣٧١) پرش و بڵاو بونی هۆش و بیرت.
٣٧٢) خۆپەسندی.
٣٧٣) پێچە.
٣٧٤) قالك/کیفك.
٣٧٥) شتێ تازە سەر هەڵدەدا/وەکو خونچە.
٣٧٦) فراوان بون.
٣٧٧) توێشوی.
٣٧٨) دروست دەکەی.
٣٧٩) دروست دەکەی.
٣٨٠) ڕێی بەسەرەوە نەبێ.

هـەمو ئەوانـەی بـە ڕەوشـتی جـوانو نـاوازەوە تیـشك دەدەنو دەدرەوشـێن، هـەمو ئەوانەی بلیمەتو وردەكار بون، كۆڵەكەی سەردەمو چاخ بون، كانزای دێرینی ڕۆژگار بون، گوڵ ئەستێرەی[٣٨٢] كۆڕو كۆبونـەوان بـون، هـەمویان شـەتڵی نـەمامی خۆیـان لـە كانیاوی گۆشەنشینیدا تێراو كرد، هەتا خۆی گرت، درەختێكی بـەرزە بـاڵای لێ وەدی هات، بە پشتیوانی پەروەردیاری بۆ هەموەرزێ بەرهەمی گرت.

گوتویانە: هەر كەسێ گۆشەنشینی لا خۆشبێ سەربڵندی وەدەست دێ.

گەر دەتەوێ لەو باسە زێـتر ئاشـنا بـی، سـەرێ بـدە لـە كتێبـی "العزلـة" دانـراوی "خطـــابي".

## لە تەنگـانـە خۆ گر بە

تەنگانـەو خەفـەت بـاری وزە بـە دڵ دەبەخـشێ، تـاوانی پـێ نامێنـێ، لـوت بـەرزی دادەنوێنـێ، خۆ بە زلزانـی هەڵدەوەشـێنێ، مرۆڤـ لـە نائاگـایی بـە ئاگـا دێنـێ، كڵپـەی گڕی یادوەری خوا هەڵدەگیرسێنێ، سـۆزو بـەزەیی خـەڵكانت بـۆ دێنـێ، وا دەكـا پیـاو چاك بە نزاو پاڕانەوە لێت ڕامێنێ، خۆ پێ زاڵی تێك دەشكێنێ، بۆ خوای هەرە زاڵو تاكو تەنیا مل كەچیت پێ دەنوێنـێ، ڕاسـتەوخۆ ئامۆژیـارە، ترسـێنەرە لـە ئێـستاڕا، فێری ئارامیت دەكا، بە خۆ گریـت ئاشـنا دەكـا، بـۆ گەیـشتنەوەی پـەروەرێنت ئامـادە دەكا، لە پـشت هـەڵكردن لـە پابەنـدی بـە دنیـاوەو ئـۆقرە پـێ گـرتنی ناچـارت دەكـا، ئەگـەر چـی سـۆزو میهـری خـوا لەوانـە گـەورەترە، لێبـوردنی خـوا بەسـودترەو، چاوپۆشی لە تاوان بەهەرمێن ترە[٣٨٣].

---

٣٨١) ڕیابازی.

٣٨٢) جۆرە گیانداریكی چوكەڵەیە لە شەواندا دەتریسكێ و شۆق دەدا.

٣٨٣) بە قازانج ترە.

## هـەڵوەسـتەیەك

خەمناك مەبە: چونکێ خەمناکی لە خواپەرستی سستت دەکا، لە تێکۆشان پەکت دەخا، سەردەکێشێ بۆ ڕوخانت، پیس دەکا ئەندێشەو گومانت، بەدبین و ڕەش بین دەکا هەستو ناخو ویژدانت.

زویر مەبە: چونکو زویری بنچینەی دڵە خورپێو نەخۆشیە دەرونیەکانە چاوگی ئەشکەنجەی هەستو نەستانە، کەرەستەی دڵە ڕاوکێو نیگەرانیو هەرەس هێنانە.

پەرێشان مەبە: تۆ قورئانت لە دەست دایە، دەتوانی بپاڕێیەوەو نزا بکەی، ماڵ ببەخشیو نوێژ ئەنجام دەی، تۆوی چاکە بچێنی، کردەی بەردار بڕوێنی.

دڵ گـران مەبـە: بـە سـای تەمبـەڵیو کـات بـەتاڵی دەسـخەڕۆی[٣٨٤] داخو کەسـەران مەبـە، وریـا بـە نوێـژ بـەجێ بێنـە... پاکانـەی خـوا بنوێنـە... بەرنامـەی خـوا وە خوێنە... بنوسەوە... کردەی باش بەرهەم بێنـە... بەرەو پێش هەنگاو هەڵێنـە... خۆشەویستێ بەسەرکەوە...تێ بفکرەو ورد بەوە.

﴿...ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ...لەبەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم، ﴿٦٠﴾ غافر﴾.

﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ... بە نهێنیو بەسەرکزی[٣٨٥] هەر پەروەرندەو لەبیـربێو لەبەری بپاڕێنەوە خودا ئەوانەی خۆش ناوێ کە لە ڕێگەی ئەو لادەدەن، ﴿٥٥﴾ الأعراف﴾.

﴿فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ... دەسا ئێوە بە دڵپاکی هەر هانا بۆ خودا بەرنو دینی پاکژتان بۆ ئەو بێ، ﴿١٤﴾ غافر﴾.

﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ...بێژە: هاوار لەخوا بکەن یان هانا بە ڕەحمان بەرن، هەر یەکێکە، ئەو ناوی زۆر پیرۆزی هەن، ﴿١١٠﴾ الإسراء﴾.

---

٣٨٤) ژێر دەستی.

٣٨٥) مل کەچی.

## بەو بنچینانەی بەختەوەری دڵنەوایی خۆت بکە

١- دڵنیا بە ئەگەر لە سنوری ئەو ڕۆژەی تێی دای ژیان بەسەر نەبەی، بیرو هزرت دەبێتە ئاردی ناو دڕوێ[٢٨٦]، خەمو پەژارەت زۆر دەبێ، هەموکرداری مەرامت[٢٨٧] لێ ئاڵۆز دەبێ، هەر ئەو واتایەش لەو فەرمودەیە دەفامرێتەوە: "اذا اصبحت فلا تنتظر المساء، واذا امسيت فلا تنتظر الصباح... کاتێ بەیانیت کردەوە چاوەڕێی ئێوارە لێدا هاتن مەبە، ئەگەریش ئێوارەت کردەوە چاوەڕێی بەیانی لێدا هاتن مەبە.

٢- ئۆقرە گیری بە ڕابردوی تێکچڕژاو[٢٨٨]، بەدوای چواندا چون، گەوجیو گێلیو نەفامیە.

٣- بە داهاتو سەرقاڵ مەبە هێشتا لە جیهانی نەبودایە کەی هاتە ئاراوە ئەوسا بیری لێ بکەوە.

٤- بە ڕەخنە مەچڵەکێ، سەقامگیر بەو دڵنیا بە ئەو ڕەخنەی ڕوبەڕوی تۆ دەبێتەوە هێمای[٢٨٩] سەنگو ڕێزی تۆیە.

٥- هەر باوەڕ بە خواو کردەوەی چاکە ژیانێکی خواڕسکی بەختەوەرانەیە.

٦- هەر کەسێ هێمنو هەدادایی[٢٩٠] گەرەك بێ، با یادی خوای گەورەی هەمیشە لە ناو دڵ بێ.

٧- پێویستە بەندە لای وابێ هەرچی خوا نەیکا نابێ.

٨- چاوت لە سوپاسی کەس نەبێ.

٩- بە ئەگەری ڕودانی خراپ تر لەوە دڵت بدەوە.

---

٢٨٦) پڕشوبڵاو دەبێ.

٢٨٧) مەبەستت.

٢٨٨) ئاڵۆز.

٢٨٩) نیشانەی.

٢٩٠) ئاسودەیی.

١٠- دەگونجێ لەوەی ڕویداوە تۆی تێدا بەر قازانج بێ.

١١- هەر کارەساتێ ڕوبدا لە بەرژەوەندی بڕوادارە.

١٢- لە بەهرە پێ بەخشراوەکانی خوا ڕامێنەو سوپاس بژێر بە[٣٩١].

١٣- زۆر کەس لە تۆ بەرەو خوارن‌و تۆ لە سەروی ئەوا نی.

١٤- جار لە دوای جار خۆشی لە ڕێیە.

١٥- بە سای کلۆلی نزاو پاڕانەوەت لە دلْدا هەلْدەقولێ.

١٦- بەلاو مەینەتی هەتوانی[٣٩٢] چاوو وزەی دلْن.

١٧- ناخۆشی خۆشی لە دوایە.

١٨- با شتی کەم بایەخ بن بڕت[٣٩٣] نەکات.

١٩- لێبوردەیی پەروەردیارت بەروەدەیە[٣٩٤].

٢٠- ڕوگرژو ڕوترش‌و توڕە مەبە.

٢١- نان‌و ئاوو سێبەرن بژێوی ژیانیان لێ پێك دێ، بە هیچی تر بایەخ مەدە.

٢٢- ڕۆزیتان‌و ئەوەی بەلێنتان پێ دراوە لە ئاسمانەوەیە.

٢٣- زۆربەی مەترسی پێشبینی کراو نایێتە دی.

٢٤- لە بەلا باران پەند وەرگرە.

٢٥- ئەگەر خوا گەلێکی خۆش ویست تاقیان دەکاتەوە.

٢٦- ئەو نزاو پاڕانەوانەی لابەری ئێش‌و ئازارن دوبارەو سێ بارەیان بکەوە.

٢٧- خۆت بە کردەی بەرداری بەرهەمدارەوە سەرقالْ کە پشت لە کاتی بەتالْ کە.

٢٨- پڕوپاگەندە وەلانێ‌و بە هەوالْی نادروست باوەڕ مەکە.

٢٩- ئەو ڕق‌و کینەی لە دژی نەیارانت لە دلْت ناوە، تۆ زیاتر لێی زەرەرمەندی.

٣٠- هەر بەلایێ بێتە ڕێت تاوانی پێ هەلْدەوەرێت.

---

٣٩١) سوپاسی خوا بکە.

٣٩٢) مەلْحەم.

٣٩٣) لەبەینت نەبا، ڕیشەکێشت نەکا.

٣٩٤) فراوانە.

## کە ئەو شــەش دەرمانە چارەسازەت لەبەردەســتە بۆ دڵــت پەســتە؟

خاوەنی کتێبی "الفرج بعـد الـشدة" دەگێڕێتـەوە دەڵێ: یـەکێ لـە زانـاو پـسپۆران دەردو کەسەرێکی توشهات دۆستو خۆشەویستانی بۆ دڵنەوایی هاتنە سەردانی، یەکێ پێی گوت: من شەش دەرمانی گیراوە پێ دەزانم، گوتیان چ دەرمانێکن؟ ئەویش گوتی:

یەکەم: متمانە بە خوا بون.

دووەم: دڵنیابون بەوەی قەزاوقەدەری خوا ڕەت نابێتەوە.

سێیەم: ئارامگرتن باشترین چارەسەری بەلا بارانە.

چوارەم: ئەگەر ئارام نەگرم چیم لەدەست دێ.؟! هاوارو ڕۆڕۆ بە چارەسەر نازانم.

پێنجەم: دەشێ لەوە خراپترم بەسەر بێ.

شەشەم: جار لە دوای جار ڕزگاری دێ.

## بە سای توانجو پەلارێ، یا ئەشکەنجەو ئازارێ، یا گوتەی ڕیسواکارێ، یــا ســتەمی ســتەم کارێ، خەم بەســــەرتا نەبارێ.

شێخی ئیســـلام دەڵێ:

بڕوادار چاو لە تۆڵە ناگێڕێ، سەرزەنشتی سەرزەنشت کارێ ناکاتەوە، وەلامی لێدانیش ناداتەوە.

## ماتو کز دامەمێنــە، هەڵوێستی جوان بنوێنــە، قەدرو ڕێز بەدەســت بێنــە

یەکێ لە شاعیران توشی لێقەومانێ هات هانای بۆ کەسێکی بەخشندەو بەرچاو فراوان هانی[٣٩٥]، ئەویش لە هانای هات، لە وەلامی ئەم چاکەیەدا ئەم هۆنراوەی پیاهەڵدا:

---

٣٩٥) هێنــا.

**لاوێکی نەو نەمام بو خوا ئاوڕی پێ دایەوە**
**ئامـاری هەر چاکـەیێ لە ڕوی دەدرەوشـایـەوە**
**کە بینی بەخشندەیی بەرگی لەبەرنەماوە**
**بـەرگـی دڵ فـراوانـی خسـتـە قـەدو بـاڵاوە**
**هەروەکو بڵێی هەسارە لە ناو چاوانی دیـارە**
**هەڵبەستی من ملوانکەو هەیڤیش لەسەر ڕوخسارە**

## گەر کۆستێ دای پلۆسی، خەمو خەفەت دای پۆشی، یا ئەستەنگێ بێتە ڕێت، با دڵت ئاسودە بێت نەك پەستو پڕ لە خەم بێت.

بێگومان ئەگەر ئارامت هەبێو دان بە خۆ دابگری، چاترە لەوەی چریکەو زایەڵەت [٣٩٦] هەڵبڕی، ئەگەریش لە ئاستی مەینەتیدا داسەپاوو خۆڕاگر بی، زۆر پایەدارتری لەوەی داڕماوو بێ ورە بی، هەرکەسێکیش بەهەوەسی خۆی ئارام نەگرێ، ڕۆژێ دێ بەناچاری خۆی ڕابگرێ.

## دڵ گران مەبە، دۆستو خۆشەویستانێکت هەن خەمیان لەلا بەباکەی

ئەگەر حەز دەکەی با چەند دێرە شیعرێکت بۆ بکەمە دیاری، بۆ ئەوەی خۆشیو شادیت بەسەردابێو، کەمێ دڵت بسرەوێ، هەندێ لە هۆنەران دەربارەی دڵنەوایيو لێك نزیك خستنەوەی دڵەکان، ئەم پارچە هۆنراوەیان هەڵبەستوە:

**هاتیـن بـە لای قەیسی یـە "یـەمـنـی"دا**
**کـە وەجـاخ زادەییکی بـاش بـو لە ڕەچەڵیدا**

---

٣٩٦) هاوارو ڕۆڕۆ.

**ئێمـــەی بینــی و پــەچــەی ســەر ڕوی بەردایــەوە**
**گــوتـــی کێنـــەو خەڵکی کوێنـەو لە کام لاوە؟**
**گوتم بەڵام لـــە تیـرەی تەمیمـیـانـــە هــاوەڵم**
**منیـــش خەڵکـــی یەمـنـمو لـەوێیە حـاڵو ماڵم**
**بە خاكو وڵات لێك دورین خـودا بە برای داناویـن**
**گەر نەژادیشـمان جیا بێ دڵمان لە یەك جودا نیـن**

بێگومان دۆستو یاران لە تەنگانەدا مایەی دڵارامین بۆ یەکتر، یەکێ دەڵێ: ئەگـەر لەبەر دڵەڕاوکێو نیگەرانی نەبوایە، تێکەڵاوی خەڵکان نەدەبوم.

﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ... ئـەوێ ڕۆژێ یـاران هــەمو دەبنە نەیاری یەکتـری، جا مەگین خوا پارێزەکان، (٦٧) الزخرف ﴾.

## ڕێزداریو پایەداری باشـتـرە لە ماڵداری

کەلاوەیێ [٣٩٧] هەبێ ژیانی تێدا بەسەربەی، یا ڕەشـماڵێ [٣٩٨] هەڵدەی، تیکە [٣٩٩] نـانێکی جۆ هەبێ لە دەمی خەی، لەگەڵ ئەوەی شەرمو شکۆت پارێزراو بێو، ئاوی ڕوانـت [٤٠٠] دانەچکاو بێ [٤٠١] و زمانت پاكو پاراو بێ [٤٠٢]. زۆر سەربەرزو ڕێزدارتری لەوەی لە کۆشكو باڵەخانـەی ڕازاوەو باخو باخاتی درەوشاوە ژیان بەسەربەی، لەگەڵ ئەوەدا ژیانێکی تفتو تاڵت هەبێو، دڵێکی بە ناڵەو هاوارت ببێ.

ناخۆشی وەکو نەخۆشی وایە، چۆن نەخۆشی ماوەیەکی پێ دەچێ، هەتا لادەچێ، ئەگـەر پەلەو تاڵوکەشی لێ بکرێ لەوانەیە دو چەندانە ببێتەوەو، دەبێتە دەردێکی کوشندە، هەر

---

٣٩٧) کەچە خانو.
٣٩٨) چادر/لە موی ئاژەڵان دروست دەکرێ.
٣٩٩) پارو.
٤٠٠) ئابرو.
٤٠١) دانەڕژابێ.
٤٠٢) لە قسەی پڕوپوچ دور بێ.

بە هەمان شێوە بـەڵاو ناخۆشی پێویـستی بـە ماوەیـێ دەبـێ، هـەتا شـوێنەواری بـزر دەبـێ، پێویستیشە مرۆڤی بەڵا بار ئارامی هەبێو چاوی لە لێبونەوەی دەروی خێر بێو زمانی بـە یادی خواوە فێر بێ[٤٠٣].

## هەڵوەستەیەك

﴿... وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ... ناهومێدیش مـەبن لـە بـەزەیی خـودا، هـەر ئـەوانـەی خـوا نـەناسـن، لـە بـەزەیی خـوا ناهومێدن. (٨٧) یوسف﴾.

﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ... کـێ لـە بـەزەیی خـوادا بـێ هومێدە، مەگین لە رێ لادەرەکان؟ (٥٦) الحجر﴾.

﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ... ئەو کەسانەی چاکە کارن، لە بەزەیی خودا نزیکن. (٥٦) الأعراف﴾.

﴿لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ... تۆ چـوزانی، لەوانەیـە لـە پـاش ئـەمـە خوا شتێ تر وەدی بێنێ. (١) الطلاق﴾.

﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ... رەنگە لە شتێك حەز نەکەن بەڵام بۆتان وەخێر بگەڕێ، رەنگیش هەیە ئاوات بۆ شتێ بخوازن کە ئاکامەکەی باش نـەبێ خـودا دەزانـێو ئێـوە سەری لێ دەرناکەن، (٢١٦) البقرة﴾.

﴿ٱللَّهُ لَطِيفٌۢ بِعِبَادِهِۦ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ...خودا دەربارەی عەبدانی بە ڤیانە، (١٩) الشورى﴾.

---

٤٠٣) لە یادی خوا بەردەوام بێ.

﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ... بەزەییشم هەمو شتی داگرتوە، (١٥٦) الأعراف﴾.

﴿...لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ...خەمت نەبێ! ئێمە خودامان دەگەڵە، (٤٠) التوبة﴾

﴿...إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ ... لەو کاتەشدا کە هاناتان بۆ پەروەردیارتان دەبرد، جا لە فریاتان هات، (٩) الأنفال﴾.

﴿... وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِنْ بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنْشُرُ رَحْمَتَهُ ... هەر ئەویشە پاش ناهومێدبون لە باران، بارانە دادەبارێنێ دلۆڤانیو خۆشی بڵاودەکاتەوە، (٢٨) الشورى﴾

﴿... وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ... بە هومێدو بە ترسەوە لەبەرمان دەپاڕانەوەو لە بەرانبەر ئێمە لارە مل بون. (٩٠) الأنبياء﴾.

## چاترین هاودەم کتێبە

بێگومان یەکێ لە هۆکاری بەختەوەری ئەوەیە: لەگەڵ خوێندنەوەی کتێب دا کات بەسەر بەری، بایەخێکی زۆر بە خوێندنەوە بدەی، گەشە بە بیرو ژیریت بدەی.

"جاحز" بەوە ئامۆژیاریت دەکا کە بە خوێندنەوەو لێ وردبونەوەی کتێبان خۆت سەرقاڵکەی، بۆ ئەوەی خەمان لە دڵ بەباکەی، پێت دەڵێ: کتێب ئەو هاودەمەیە وەڕەس‌و بێ توانات ناکا، خۆشەویستێکە بە پاکی دەتدوێنێ، هاوڕێیەکی وایە ماندوو شەکەتت ناکا، ئەو چاوپۆشی کارەیە [٤٠٤] شل‌وخاوت ناکاتەوە، هاوسێیەکی بارسوکەو بارت گران ناکا، ئەو هاوەڵەیە نایەوێ بە نواندنی مەرایی [٤٠٥] دەست بەتاڵتکاو ناپاکانە هەڵسوکەوتت لەگەڵ کا، بە دوڕویی نات خەڵەفێنێ و [٤٠٦]، بە درۆو دەلەسە خلیسکت پێ نابا.

---

٤٠٤) لێبوردەیە.

٤٠٥ )فرتوفێڵ.

٤٠٦) هەڵت ناخەڵەتێنی.

کتێب ئەو هاودەمەیە هەتا لێی ورد ببیەوە پتر تامەزرۆت دەکا، هەستو نەستت دەسازێنیو دەمو زمانت پاراو دەکا، دەستو پەنجەت ڕەنگین دەکا، وتـەو پـەیڤت [٤٠٧] شیرن دەکا، دڵو دەرونت فراوان دەکا، سینەت شادو گوشاد دەکا، ئـاپۆرە [٤٠٨] بـەرێزەوە سـەیرت دەکـا، بـە خـەڵکانی پایـە بـەرز ئاشـنات دەکـا، تـەنیا خوێندنـەوەی مانگـێ بارتـەقای چـەند سـاڵانێ زانـستی وات پـێ دەبەخـشێ لـە دەمـی هـیچ زانایـێ نـەت بیستبێ، وێڕای ئەوەی پارەو پوڵیش خەرج ناکەی، خۆشت لـە دوای شـەکەت ناکـەی، لە دەرگای هیچ کەسێ لە خۆ زاناتر نادەی، خۆشـت بـەوە ئاتـاج ناکـەی لـە بـەردەمی یـەکێ چۆکان دادەی، کـە تـۆ لـەو ئاکـار جوانتریو خـۆت بـە سـەتی وەك وی نـادەی، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە کـۆڕو کۆبونـەوەی ڤـین لـە دلان خـۆت پـەنا دەدەی، لەگـەڵ ساماندارانیش خۆت بەراورد ناکەی، کتێب ئەو هاودەمەیە گوێ ڕایـەڵی شـەو ڕۆژتـە، لە دەرێو لە ژورێ هاورێتە، بە خـەوتنت تـەنگاو نابـێ، لـە شـەونخونیدا مانـدوێتیو شەکەتی نایگرێ، ئەو فێر کارە [٤٠٩] دڵسۆزەیە لێی دەپرسـیو شـەرم ناکـەی، تـۆ پـارەی پێ نابەخشیو ئەو زانیاریت پێ دەبەخشێ، گەر تۆ بە توندی بدوێی ئـەو گوێچکەت لە بۆ دەگرێ، ئەگەر بایێ هەڵبکاو لاپەڕەی وەریگێڕێ بۆ تۆ دەگەڕێتەوەو جارێ تـر وەرناگەڕێ، گەر تۆ بەهـەر هۆکـارێ پەیوەنـدیت لەگـەڵ هـەبێ پێویـستیت بـە کـەس نابێو تاسەر لەگەڵت دەبێ، لە تەنیاییو بێ زاری گەر کتێب هاودەمـت بـێ، هـەرگیز ئاتاجیت بە هاودەمی بەد سروشتان نابێ، ئەوەندە چاکەو خەلاتـەی کتێـب بەسـەرە تۆدا دەیکا بەسە، کە لە دانیشتنی بەر دەرگا دەتپارێزێو، لەوانـەی بەوێـدا ڕادەبـورن چاویان تێ نابڕی - لەگەڵ ئەوەی ئەرکی دانیشتنی سەر ڕێگات پێ جێبەجێ ناکرێ - چاوت لە ئابڕوو ناموسی خەڵکان دەپارێزێ، لـەو بـاسو خواسانە ڤـوڵ نابیتـەوە کـە هیچ پەیوەندیەکیان بە تۆوە نیە، تێکـەڵاوی کەسـانێکی هـەرزە پـوچو مایـە پـوت [٤١٠] نـابیو، لـە وتـەی بـێ واتایـان گـوێ نـاگریو، بەشـداری مـەرامی [٤١١] گـلاوو کـاری

---

٤٠٧) جەماوەر.

٤٠٨) جەماوەر.

٤٠٩) مامۆستا.

٤١٠) بێ کەڵك.

٤١١) مەبەست.

چەپەڵکارانەیان نابی، بێگومان ئەمەیان هەم ئاسودە بونەو ڕزگار بونە، هەم دەسکەوتێکی بێ وێنەیە، هەروەها خۆپاراستنە لە مەترسییێکی سەرەکیو بەدەست هێنانی قازانجێکە، جا ئەگەر بێو کتێب خوێندنەوە تەنیا ئەوەندە بەرهەمەی هەبێو لە خواستی چروك[٤١٢]بە دورت بگرێ، لە پاڵکەوتنی بێ سودو گاڵتەو گەپی بێ هودەو تەمەن بەهەدەردان بە دورت بخاتەوە، دیارە گەورەترین بەرهەمت بەدەست هێناوەو، بەسودترین بەخششت بەسەردا ڕژاوە.

شتێکی بەڵگە نەویستە کە پێویستە بێکارانی ڕۆژو گاڵتە چیانی شەو جیا لەوەی کاتە پڕ بەهاکانیان بەهەدەر چێ: ئەم هەلەی تەمەنیان بە خوێندنەوەی پەرتوکی سودمەند بەسەربەن، ئەوەندەی بە سای کتێب خوێندنەوە بەرو داهاتی سود بەخشیان چنگ دەکەوێ، ژیانیان بە ئەزمون دەگا، بیرو ژیریان گەشە دەکاو، پیاوەتیو جوامێریان پتر دەکا، ئابڕوو شکۆیان دەپارێزێ، دینداریان چاتر دەبێ، ماڵو سامانیان پڕ پیت دەبێ، کارو پیشەی نوێ فێر دەبنو دەروی خێریان لە ڕودا ئاواڵە دەکرێ، هیچ شتێ ئەوەندە سودو کەڵکیان پێ نابەخشێ.

## * چەند وتەیێ دەربارەی سودی کتێب * :

"ئەبوعوبەیدە" دەڵێ: "موهەللەب" ئامۆژیاری کوڕەکانی دەکاو پێیان دەڵێ: ڕۆڵەکانم کاتێ دەچن بۆ بازاڕ تەنیا لە بەردەم دوکانی زرێ چی [٤١٣]، یا پەڕتوك خانەیێ بوەستن. هاوەڵێکم بۆی گێڕامەوەو گوتی: کتێبی مامۆستایەکی خەڵکی شامم خوێندۆتەوە، یەکێ لە باسەکانی دەربارەی جوامێری تیرەی "غەتەفان" دەدوێ، دەڵێ: جوامێریو پیاوەتی بەسەر چو تەنیا لە پەرتوك داماوە. گوێم لە "حەسەنی لوئلوئی" بو کە دەی گوت: چل ساڵ بەو شێوەیە ژیانم بەسەربرد ئەگەر سەر خەوێکم بشکاندایە، یا پاڵم دابایەوە، یا شەوانە سەرم بنابایەوە، دەبوایە پەرتوکێکم هەر لەسەر سینگ بوایە.

---

٤١٢) مەبەستی بێ سود.

٤١٣) ئەوەی زرێی شەری دروست دەکا.

"ئیبنول جەهم"یش دەڵێ: ئەگەر خەوەکوتکێ [٤١٤] بم باتەوەو کاتی خەوتنیشم نەبێ - کە خەوی نابەجێم زۆر پێ ناپەسندە - دەست بە خوێندنەوەی پەرتوکێکی سودمەند دەکەمو بە سای وتەی نەستەقو سودمەند دڵم دەبوژێتەوە [٤١٥]، کاتێ گرێ کوێرەییێکم بۆ دەبێتەوەو [٤١٦] پەی بە یەکێ لە مەبەستەکانم دەبەم هەست دەکەم هەداری بەسەرمدا دەبارێو، خۆشی دڵم دادەپۆشێ، ئەو شکۆمەندیەی بە سای ڕون کردنەوەی بابەتێك بە دەست دێ، توندتر مرۆ ڕادەچڵەکێنێ لە شریخاندن و [٤١٧] خورەی [٤١٨] دارمانێ.

دوبارە "ئیبنول جەهەم" دەڵێ: ئەگەر پەرتوکێکم بە دڵ بو بە دەستم هێنا، سودو قازانجیشم لێ ڕەچاو کردو لێم بەدی کرد، دەم بینی چۆن لە ترسی ئەوەی لێم ببڕێ جار لە دوای جار تەماشا دەکەم ئاخۆ چەند پەڕێکم ماوە، یا لە ترسی ئەوەی ئەو بابەتە کۆتایی بێ، ئەگەریش ئەم پەرتوکە لە قەبارەدا گەورە بێو پەڕی زۆر بێو زۆر بەرگ بێ، ئەوا هەست بە خۆشحاڵیەکی زۆر دەکەمو تەواو دڵم دەسرەوێ.

"عەتەبی" باسی یەکێ لە پەرتوکی زانا دێرینەکان دەکاو دەڵێ: گەر بهاتباو کتێبێکی دورو درێژو زۆر پەڕ نەبوایە گۆڕانکاریم بەسەر دێناو تێکم دەدا [٤١٩].

"ئیبنول جەهم"یش دەڵێ: بەڵام ئەوەی لەم کتێبەدا سەرنجی منی ڕاکێشاوە هەر ئەوەیە کە تۆی لە دەستی بێزاری [٤٢٠]، هەر کتێبێکی گەورەم خوێندونەتەوە قازانجێکم لێ وەدی کردوە، لە ڕادەبەدەر کتێبی بچوکیشم خوێندەوە بەڵام کاتێ کۆتاییم پێ هێناوە هەستم کردوە هیچم بە دەست نەهێناوە!.

بۆ ئاگاداریشت، شکۆدارترینو پیرۆزترینو پایەدارترین کتێب قورئانە:﴿ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُن فِى صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ... کتێبێکە بۆ تۆ

---

٤١٤) دەخەو ڕاچون.

٤١٥) دەگەشێتەوە.

٤١٦) مەسەلەیەکی توندم بۆ ڕون دەبێتەوە.

٤١٧) بە قیژە و دەنگێکی گەورە دەگوترێ/من لە جیاتی دەنگی گوێ درێژم بەکارهێناوە.

٤١٨) دەنگی ڕوخانێ.

٤١٩) دیارە کتێبی دور و درێژی خۆشویستوە.

٤٢٠) مەبەستی پێ گەورەیی کتێبێکە.

هاتۆتە خوارەوە، تا بەهۆی ئەو ترس وەبەر مەردم بێنیو خۆت توشی دڵتەنگی مەکە لەوبارەوە، ئەم کتێبە نسحەتیشە بۆ ئەوانەی بڕوای پێ دێنن، ﴿٢﴾ الأعراف ﴾.

## بەری درەختی خوێندنەوە:

١- نەمانی دڵاو دڵی و[421] خەمو پەژارە.
٢- لادان لە شتی پڕوپوچو بێ هەڕمین.
٣- دور کەوتنەوە لە کەسانێ بێ هودە ژیانو تەمەنیان بەهەدەر دەدەن.
٤- ڕاهاتن لەسەر زمان بونەوەو دەربڕینی ڕستەی نایابو دور بونەوە لە هەڵەو ساتمەی زمانو ڕازاندنەوەی بە پاراویو ڕەوان بێژی.
٥- گەشاندنەوەی ژیریو زاخاودانی بیرو هزرو مشتومالّ کردنی هەستو نەست.
٦- هەڵقوڵانی زانیاریو فرە بونی بیر بڕی[422] و هۆشداری.
٧- بەهرەمەند بون لە ئەزمونی خەڵکان ودانایی دانایانو دەرخستنی زانایان.
٨- دەستەبەر کردنی بەهرەی وەبەرهێنانی زانیاریو ئاشنا بون بەو ڕۆشن بیریەی بەسەر ژیانەوە کاری گەری هەیە.
٩- پتەو کردنی بیروباوەڕ بە تایبەتیش بە خوێندنەوەی پەرتوکی ئیسلامی، چونکە پەرتوك دڵسۆزترین ئامۆژیارەو، بەهێزترین سەرزەنشت کارە، گەورەترین بەربەستی ڕێی خراپەیەو، توندو تۆڵ ترین فەرمان ڕەوایە.
١٠- ئاسودە بونی بیرو هۆش لە پرشو بڵاو بون، حەسانەوەی دڵ لە دابڕدا بڕبون، ڕزگار بونی کات لە بە فیرۆ چون.
١١- ڕۆچون لە کرۆکی وشەکانو، داڕشتنی بابەتو واتای پەیڤو ڕستەو، کاراشنایی لە نهێنی ژیریو دانایی.

**ناخی واتاو مەبەستان حەساوگەیە بۆ گیانی**
**نەك لە خواردنو خواردنەوەو لە نۆشینێ بزانی**

---

٤٢١) دو دڵی.
٤٢٢) بیرێژی

## دڵت هەراسان نەبێ، خەڵکێ بە ئاکاری بەرزت ئاشنایەو چـاکەی تـۆی لـە چاودایە

بە سای ئەو ڕەوشتەو ئاکارە بەرزەی نواندوتە، چەند دەستێ بە نزاو پاڕانەوە بـۆ تۆ بەرز کراونەوەو، چەند کەسێ لە ئاستی تۆدا زمـانی بـە چاکە دەگەڕێ. بێگومـان سوپاس‌و پێزانینی خەڵکانیش وا دەکا سەر لـە نـوێ نـەمامی تەمـەنت بـڕوێ‌و بـبڕای ببڕ بەری بگرێ‌و، بە کەلەپورێکی زیندودا بنرێ‌و بەرهـەمێکی پـاکی لێ بەرهـەم بـێ خەڵك سودی لێ وەربگرێ.

## هەڵوەسـتەیـەك

جارێکیان پێشەوا "ئەبوبەکر" نەخۆش کەوت خوای لێ ڕازی بێت، هاوەڵانی چـون بۆ دیدەنی، پێیان گوت: پزیشکت بۆ بانگ نەکەین؟ لـە وەڵامـدا گـوتی پزیـشك مـنی بینیوە[٤٢٣].

گوتیان چی پێ گـوتی: ئـەویش گـوتی: پێـی گـوتم: مـن هەرشـتێ بمـەوێ ئـەنجامی دەدەم. پێشەوا "عومەر"ی کوڕی "خـەتاب" یـش دەڵـێ خـوای لێ ڕازی بێـت: هەسـت دەکەین خۆشترین ژیانمان لە ئارامگرتن دایە.

هەروەها دەڵێ: خۆشترین ژیانێ پێی گەیشتبین بە سای ئارامگرتنەوە بـوە، ئەگـەر بێ‌و ئارامگری پیاو بوایە ئەوا بە جوامێرێکی بەخشندە دادەنرا.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب -خوای لـێ ڕازی بێت- دەڵێ: ئارامگرتن لـە بـاوەڕدا بە وێنەی سەرە لە لاشەدا، ئەگـەر سـەریش بـبردرێ ئـەوا لاشـە خـۆی نـاگرێ، پاشـان دەنگی بەرز کردەوەو گوتی: گومان تان نەبێ باوەڕی نیە ئەوەی ئارامی نەبێ. هەروا گوتی: ئارام گرتن پێڕۆیێکە[٤٢٤] بەسەر ڕودا مەیکەوێنن.

---

[٤٢٣] وەڵاخی سواری.

[٤٢٤] وەڵاخی سواری.

شێخ "حسن البصری" دەڵێ: ئارامگرتن گەنجینـەیێکی، چاکەیە، خـوای گـەورە تەنیا بە بەندەیەکی وا دەی بەخشێ لە لایەن خواوە بە دڵاوا [٤٢٥] دانرا بێ.

عومەری کوڕی عوبدول عـەزیز دەڵێ: خـوای گـەورە هـەر بەهرەیـەکی خـۆی لـە بەندەی بسێنێتەوە، ئەویش لە بەرابەری ئـەوەدا ئـارامگر بـێ، بـێ سـۆ [٤٢٦] خـوا لـەوە باشتری پێ ئەداتەوە.

"میمون"ی کوڕی "عبدالعزیز" دەڵێ: هیچ کەس بەو پـەڕی چاکە ناگا تـەنیا بـە سای ئارامگری نەبێ.

"سلیمان" کوڕی قاسم دەڵێ: هـەموکردەوەیێ سـنوری پاداشـتی بـۆ دیـاری کـراوەو دەزانـرێ، تـەنیا ئـارام گـری نـەبێ، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿...إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ...بێ گومانە ئەو کەسانەی خۆڕاگرن، بـە تـەواوی‌و بـە بـێ حیـساب پاداشی خۆیان وەردەگرن، (١٠) الزمر﴾ .

سـولەیمان دەڵێ: ئارامگری هەروەکو سەرچاوەیەکە بێ پسانەوە [٤٢٧] هەڵدەڕژێ.

## خەمبــار مەبــە چونکو جگــە لەم ژیــانە ژیانێـکی تر چاوەڕێمانە

دڵـت بـەو دادوەریـەی خـوا دەسـرەوێ، کـە لـە ڕۆژی پەسـلاَن [٤٢٨] گـرۆی [٤٢٩] مـرۆ [٤٣٠] گشتی کۆ دەکاتەوە، جا هـەر کەسـێ لـەم جیهانـە دوا بـڕاوەدا مـاڵی لـێ زەوت کـراوە لـەوێ دەسـتی دەکەوێتـەوە، هـەر کەسـێ لێـرە سـتەمی دەرحـەق کـراوە لـەوێ مافـی دەسەندرێتەوە، هەر کەسێ لێرە ستەمکارە لەوێ بێ چارەو هەژارە!!

---

٤٢٥) بەخشندە.
٤٢٦) بێ گومان.
٤٢٧) بێ بڕانەوە.
٤٢٨) دوایی.
٤٢٩) دەستە.
٤٣٠) مرۆڤ.

"کانت" کە زاناو پسپۆرێکی ئەڵمانیە لێی دەگێڕنەوە، کە دەڵێ: شانۆی ئەم ژیانەی دنیا هێشتا کۆتایی پێ نەهاتوە، دەبێ شانۆیەکی‌تر هەبێ، چونکو لەم ژیانەدا ستەمکارو ستەم لێکراومان بەرچاو دەکەوێ کەچی نابینین دادوەریان لە نێواندا بکرێ، کەسانێ دەبینین زاڵن هەندێکیش چەوساوەو ژێر دەستەن کەچی تۆڵە سەندنەوە نابینین، کەوایە دەبێ جیهانێکی تر هەبێ ئەو مافانەی لێ بسەندرێ".

شێخ "عەلی تەنتاوی" دەربارەی ئەم قسەیە دەڵێ: ئەو دەستەواژەیە[٤٣١] کە مرۆڤێکی دور لە ئیسلام دەری دەبڕێ، دان پێ دانان‌و باوەڕ کردن بە ڕۆژی سەلا[٤٣٢] لە خۆوە دەگرێ.

﴿... لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ... ئەم ڕۆژە هیچ غەدرێك نیە. خودا بە خێرایی بە کاروباران ڕادەگا. ﴿١٧﴾ غافر ﴾.

## چەند گوتەیەکی جیهانی‌و دەستکەوتی ئەزمون

"ڕۆبرت لویس ستیفنسون" نوسیوێتی‌و دەڵێ: هەمو مرۆڤێ دەتوانێ لە یەك ڕۆژدا بە کردەی خۆی هەڵبستێ با هەرچەندە کارەکەی سەخت‌و گران بێ، هەمو کەسێ دەتوانێ ڕۆژانە تا خۆرئاوا بەختەوەرانە ژیان بەسەربا. کە هەر ئەمەیان واتای ژیان دەگەیەنێ".

یەکێ تریشیان دەڵێ: "تۆ لە ژیانتا تەنیا یەك ڕۆژت هەیە، دوێنێ ڕابراوەو سبەینێش هێشتا نەهاتۆتە ئاراوە".

"ستیفن لیکوك" دەربارەی خۆ خەڵەتاندن نوسیوێتی‌و دەڵێ: منداڵ دەڵێ: دەی ئەو کاتەی بوم بە هەرزەکار، هەرزەکاریش دەڵێ: دەی ئەوساتەی بوم بە گەنج‌و لاو. ئەو کاتەش بوم بە گەنج ژیانی هاوسەرێتی پێك دێنم. بەڵام دوای ژن هێنان چی ڕونەدا؟ دوای بڕینی ئەو هەموقۆناغانە چ دێتە ئاراوە؟ ئەم بۆچونە دەگۆڕێ بۆ: تا ئەو کاتەی ئەتوانم دابنیشم.

---

٤٣١) ڕستە/پەیڤ.
٤٣٢) دوایی.

ئاوڕێ بەرەو دواوەی دەداتەوە، بایەكی ساردو سڕ خۆی بە ڕودا دەكێشێ، هەست دەكا ئەو ژیانەی جێی هێلاوە گشتی بە هەدەر داوەو تەنیا یەك خولەك بەخۆشی نەژیاوە، دوای ئەوەی كار لە كار ترازا بە هۆش خۆمان دێینەوەو دەزانین هەر خولەكو كاتژمێرێ لە ئێستای ژیانمان دەژمێرێ.

بە هەمان شێوە ئەوانەی بە ئومێدی تۆبە كردنن بەو شێوەیە خۆیان دەخەڵەفێنن.

یەكێ لە پێشینەكان دەڵێ: "وریابن لە بەكارهێنانی وشەی "دێو دەبێ" چونكو ئەوەو شەیێكە چەندین بەرژەوەندی دوا خستوەو لە دەست داوە".

﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا وَيُلْهِهِمُ الْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ... لێیان گەڕێ بخۆنو خۆش ڕاببوێرنو ئارەزو سەرگەرمیان بكا زۆر ناخایەنێ دەزانن، (٣) الحجر ﴾.

"مۆنتین"ی پرۆفیسۆری فەرەنسی دەڵێ: ژیانم پڕی ئەو خواستە خراپانە بو كە هەرگیز بەزەیی نانوێنن.

منیش دەڵێم: ئەوانە بە كەڵكو قازانجی وەدیهاتنیان ئاشنا نین، لەگەڵ ئەو زیرەكیو شارەزاییەدا پەیڕەوی ئەو ڕێنماییەی خوا نەبون كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕەوانە كراوە ﴿ ... وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ... هەر كەسێكی خوا ڕوناكی نیشان نەدا، هیچ ڕوناكی شك نابا. (٤٠) ﴾ النور.

﴿ إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ... خۆمان ڕێگەمان نیشان دا، جا یان شوكرانە بژێرە یان پێ نەزان. (٣) الإنسان ﴾.

"دانسی" دەڵێ: بیر كەوە ئیمرۆ دوبارە گزنگی لێ هەڵنایێ".

منیش دەڵێم: ڕاست ترو جوانتر لەم وتەیە ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ (( صلّ صلاة مودع... نوێژ بكە وەكو نوێژی كەسێكی ماڵ ئاوایی لە دنیا دەكا)).

هەر کەسێ وا دابنێ ئیمڕۆی کۆتا ڕۆژی ژیانە، تۆ بەو پەشیمانی نوێ دەکاتەوە، کردەوەی دەڕازێنێتەوە، لە گوێ ڕایەڵێ خواو شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەرەکەیدا کۆشش دەکا.

"کالیداسا" کە ئەکتەرێکی شانۆگەری ناوداری هیندیە نوسیوێتیو دەڵێ:

سڵاو لە سپێدەی بەیان هەر بە ئیمڕۆ بایەخ بدە لەبەر ئەوەی هەر ئیمڕۆ ژیانە، بون ژیانە لەو هەلە کورتەی ئیمڕۆدا جۆرەها نهێنی بونی تۆی تێدا دەرئەکەوێ بەهرەی گەشە کردن ڕازاوە بەهرەی سەرکەوتن لەبەر ئەمەشیان دوێنێی تێپەڕیو تەنیا خەونێ بۆ سبەی نەهاتوش تەنیا خەیاڵە بەلأم ئەو ڕۆژەی تۆ تیایدا دەگوزەرێنی دەشێ لە سایەیدا دوێنێ وەکو خەونێکی خۆش ببینیو، هەموو بەیانییێکیش پێشبینی خواستەکانت بێ دەسا جوان سەرنجی ئیمڕۆ بدە هەر ئیمڕۆ سڵاوی بەیانی دانە.

## دامەمێنە، دەربارەی دوێنێو ئیمڕۆو سبەی بە پرسیار خۆت بدوێنە

دەرگای ئاسنین بە ڕوی رابردوو داهاتودا گاڵەدە، ڕۆژی ئێستات لەگەڵ ساتەکانیدا ببەسەر:

١- ئایە گەرەکمە ئەو ژیانەی ئێستام دواخەم لەپێناوی ئەوەی لەمەڕ داهاتودا دودڵم، لەبەرئەوەی بۆ گوڵشەنێکی فریودەر دەناڵم کە لەو دیوی ئاسۆوەیە بە خەیاڵم؟

٢- ئایە ئێستای ژیانم تفتو تاڵکەم بە سای ئەو ڕۆژە ڕەشانەی بەسەرمدا تێپەڕ بون، ئەو ڕوداوانەی ڕویان داوەو لەگەڵ تێپەڕبونی ڕۆژگار تێدەپەڕن؟

٣- تۆ بڵێی بەیانی بە ئاگا بێمەوە، لە کاتێکا بڕیارم داوە ئیمڕۆم بە فیڕۆ نەچێو لەو بیستو چوار کاژێرەی داهاتودا ئەوپەڕی کردەی بەردار فەراهەم بێنم؟

٤- تۆ بڵێی لەمەولا بتوانم خێروبێری ئیمڕۆم دەستەبەر کەم ئەگەر بە کاتو ساتەکانی بایەخ بدەم؟

٥- کەی بەو کارە هەستم؟ ئەو هەفتەی داهاتو؟ بەیانی؟ یا هەر ئیمڕۆ؟

ئەگەر كارەساتێ بەرەو ڕوت بێ بەرچاوت تاريك نەبێ بەخۆت لەگەڵ خۆت بدوێ:

١- له خۆت بپرسه: لەوه خراپ تر پێش بينی چت دەكرد؟

٢- خۆت ئاماده كه بەرگەی ئەم پێشبينيه هەره خراپه بگری.

٣- پاشان هەوڵ ده به هێواشی ئەم پێشبينيه چارەسەركەی.

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... ئەو كەسانەی پێيان وتن: گەله كۆمەگيو لێكراوەو بە پانەوه دێنه سەرتان، ئەشێ ترسو لێيان هەبێ، باوەڕيان بەهێزتربوەو گوتيان: ئێمە هەر خودامان بێ بەسمانەو چاكترين پشتو پەنامان تەنيا ئەوه. (١٧٣) آل عمران﴾.

## هەڵوەســتەيەك

﴿...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ... هــەر كــێش لــە خــوا بترسێ، دەروێكی لێ دەكاتەوه. (٣) الطلاق﴾.

له شوێنێكــەوه بژێوی بۆ دەنێرێ كه به خەيالــيدا نايه. هەر كێ خۆی به خوا بسپێرێ ئەوی بەسه.

﴿... سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ... خـوا زو لـە پـاش تەنگانـە فـەرەحنايی دێنـێ. (٧) الطلاق﴾.

پێغەمبەری خواش دەفەرموێ: (( واعلم ان النصر مع الصبر، وان الفرج مع الكـرب، وان مع العسر يـسرا... بزانـە سـەركەوتن لەگـەڵ ئارامگرتنـدا، ڕزگـاری لەگـەڵ خـەمو خەفەت دا، هەموناخۆشيەكيش خۆشی لەگەڵدا)).

﴿انا عند ظن عبدي بي فليظن بي ما شاء... پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: خوای گەورە دەفەرموێ: بەندەی من چ گومانێکم پێ ببا بە پێی ئەو گومانە هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکەم، جا چ گومانێکم پێ دەبا با بیبا﴾.

﴿... فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ... خودا لە ئازاری ئەوان ئەتپارێزێ و زۆر بیسەرو فرە زانا هەر خۆیەتی، (١٣٧) البقرة﴾.

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ... سا تۆ خۆت بدە دەس کەسێ کە هەر زیندووەو نامرێ، (٥٨) الفرقان﴾.

﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ ... هیچ دور نیە خودا ڕۆژێ سەرتان بخا، یا خۆ کارێکی تر بکا، (٥٢) المائدة﴾.

﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ... غەیری خودا کەس پەردەی لەسەر لانادا، (٥٨) النجم﴾

## خەمناك مەبە چونکێ خەمینی تین و توانا تێکدەشکێنی و جەستەدا دادەوەشێنێ

"ئەلکسیس کاسێل" ئەو پزیشکەیە، کە لە پزیشکیدا خەڵاتی "نۆبل" ی بەدەست هێنا دەڵێ: پیاوانی پیشەگەر [٤٣٣] ئەوانەی نازانن ڕواو ڕوی [٤٣٤] دڵاو دڵی [٤٣٥] ببنەوە، هەر سەر لە بەیانی دەمرن".

منیش دەڵێم: هەر ئەوەیان ڕاستە کە بڵێین: مردن بە بڕیارو چارەنوسی خوایە، بەڵام دەکرێ وا لێك بدرێتەوە: دو دڵی و نیگەرانی یەکێکە لەو هۆکارانەی مرۆڤ لە پەلو پۆ دەخات [٤٣٦] و بونیەو قەوارەی لە ناو دەبات.

---

٤٣٣) خاوەن پیشە.

٤٣٤) ڕوبەڕوی.

٤٣٥) دو دڵی.

## بەهەمان شێوە خەمناکی برینی گەدە پەیدا دەکا!

دکتــۆر "جۆزیــف ف.مونتــاگیو" دانــەری کتــێبی "کێــشەی دەمــارگیری"[٤٣٧] لــە کتێبەکەیدا دەڵێ: تۆ بە سای ئەو خۆراکەی دەیخۆی توشی برینی گەدە نایێی، بەڵکە بەهۆی ئەو خەمانەومیە، کە دەمیان ناوەتەلاشەی تۆوە"!!.

بە پێی گۆڤاری "لایف" برینی گەدە بە پلەی دەیەم دێ لە نەخۆشیە کوشندەکان.

## با هەندێك لە شـوێنەواری خــەمناکیت بۆ باس کــەم:

کتــێبی دکتــۆر "ئــەدوار بۆدۆلیــسکی"، بەناونیــشانی (واز لــە دڵــە ڕاوکــێ بێنــەو هــەنگاوی باشــتر هەڵێنــە..."[٤٣٨] بەشــێکی لــە زمــانی پێنوســراوی وەرگــێڕراوە، هــا ئــەوە هەندێ لە پێڕستی ئەم کتێبە:

* نیگەرانی چ بەسەر دڵ دێنێ.
* نیگەرانی یارمەتی بەرزبونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن دەدا.
* نیگەرانی ئەگەری توش بون بە نەخۆشی "روماتیزم" پەیدا دەکا.
* بۆ ڕێز گرتن لە گەدەی خۆت نیگەرانیت کەمکەوە.
* نیگەرانی چۆن دەبێتە هۆی پەیدابونی سەرما بون.
* نیگەرانیو چەقالو[٤٣٩].
* نیگەرانیو توش بون بە نەخۆشی شەکرە.

دکتــۆر "کاریــل مــانینگر" کــە یەکێکــە لــە پزیــشکانی تایبــەت بــە نەخۆشــیە دەرونیــەکان، کتێبێکــی هەیــە وەرگێڕراوەتــە ســەر زمــانی عــەرەبی بــە ناونیــشانی:

---

٤٣٦) بێ توانای دەکات.
٤٣٧) مشــكلة العصبية.
٤٣٨) دع القلق وانطلق نحو الافضل.
٤٣٩) نەخۆشی "غودەی دەرەقی".

"الانسان ضد نفسه"، "مرۆڤ دژی خۆیەتی" لەم کتێبەدا دەڵێ: "دکتۆر مانینگر" چەند بنەمایەکــت پێ نادا دەربارەی چۆنیەتی خۆپاراسـتن لە نیگەرانی، بەڵکە ڕاپۆرتێکی سەرسوڕمێنت پێ دەدا بەو ناوە:

ئێمـە چۆن جەسـتەو لاشـەو بـیرو هۆشمـان بـەهۆی نیگـەرانیو خـۆ خواردنـەوە دادەڕمێنین، بە ڕقە بەریو پنگ خواردنەوەو[٤٤٠] پەشێویو دڵستی[٤٤١] خۆ دەشێوێنین".

خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿... وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ ... ئەوانـەش کـە لـە مـەردم چاوپۆشی دەکەن، (١٣٤) آل عمـران﴾.

گەورەترین بەهرە کە لەو ئایەتەدا وەربگیـرێ، دڵسرەوتنو هێورەبونـە، هـەداریو بەختەوەر بونە.

پرۆفیسۆری فەرەنسـی"مونتین" فەرمان ڕەوای شـاری "بوردو"ی فەرەنسا دەڵێ": حەزدەکەم کێشەکانتان بەدەستی خۆم چارەسەرکەم نەوەك لە هەناوی خۆیان نێمەوە".

## ئاخـۆ پـەژارەو ڕق هـەڵگرتن کاریـان چـیـە؟

دکتۆر "راسل سیسل" لـە زانکۆی "کورنیـل" پـەیمانگای پزیـشکی، چوار هۆکـاری ڕونو بەرچاوی ڕەچاو کردوە بۆ توش بون بە ئاوسانی جومگەکان:

١- هەرەسهێنانی پێکهێنانی ژیانی هاوسەری.
٢- کارەساتی شـتکـاریو[٤٤٢] خەمباری.
٣- تەنیـاییو دلا دڵـی[٤٤٣].
٤- ڕیسـواییو ڤین لە دڵی.

---

٤٤٠) دڵ پەست بون.
٤٤١) ترسەنۆکی.
٤٤٢) مادی.
٤٤٣) دو دڵی.

دکتۆر "ولیەم ماڵك گۆینگل" لە وتارێکیدا، کە بۆ یەکیەتی پزیشکانی ددانی ئەمریکی پێشکەشی دەکاو دەڵێ: ئەو هەستو نەستانەی دڵخۆشکەر نین وەکو دڵەڕاوکێو ترسەنۆکی..

لەوانەیە کار لە دابەشکردنی "کالسیۆم" بکەن لەناو لەشدا، دوای ئەوە سەر دەکێشێ بۆ کلۆر بونی ددانەکانو لە ناوچونیان".

جڵەوی کارەکانت بە هێواشی بەدەستەوە بگرە: "دایل کارنیجی" دەڵێ: "ئەو ڕەش پێستانەی لە باشوری وڵات ژیان بەسەردەبەنو دانیشتوانی وڵاتی چینیش کەم وایە دوچاری ئەو نەخۆشیانەی دڵ بێن، کە بەهۆی نیگەرانی پەیدا دەبن، چونکێ ئەوان بە هێمنی جڵەوی کارەکانیان بە دەستەوە دەگرن". هەروەها دەڵێ: ئەو ئەمریکیانەی پەنا دەبەنە بەر خۆکوشتن یەکجار زۆرترن لەوانەی بەهۆی پێنج نەخۆشیە کوشندەکان گیان لە دەست دەدەن". ئەوەشیان ڕاستەقینەیێکی سەرسوڕمێنە نزیکە باوڕ نەکرێ! با گومانت بەرامبەر پەروەردیارت باش بێ: "ویلیەم جایمس دەڵێ: بێ گومان خوای گەورە لە تاوانمان دەبورێ، بەڵام ئامێری هەستیاریمان بەربەستێکە بەهیچ جۆرێ ڕێمان پێ نادا" [٤٤٤]!.

"ئیبن ول وەزیر" لە کتێبی خۆیدا بە ناوی "العواصمو القواصم" دەڵێ: ئومێد هەبون بە میهرو سۆزی خوا - شکۆداریو پایەداری بۆ ئەو- بەندە هێڤیدارو گەشبین دەکا، وزەو توانای بەندایەتیشی پێ دەبەخشێو دەبێتە کەسێکی کارامە لە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خواو زیتەڵ لە پێشبرکێی چاکە کاریدا".

منیش دەڵێم: ئەمەیان سەلمێنراوە، چونکو هەندێ دڵو دەرونی وا هەن تەنیا سەبارەت بە یادکردنەوەی میهرو سۆزو، لێبوردەییو، چاوپۆشیو بەخشندەیی خوا، دێنەوە سەرخۆو لێی نزیك دەبنەوەو دەکەونە گەڕو کۆڵیش نادەن.

ئەگەر خەیاڵ هەتلەی کردی: "تۆماس ئەدیسۆن" دەڵێ: "هیچ هۆکارێ نیە مرۆڤ پەنای بۆ بباو لە دەست خەیاڵان هەڵبێ".

---

٤٤٤) لەبەر پەیدابونی گومانی خراپ.

هەر بە پێی ئەزمون ئەم وتەیەوە ڕاست گەڕاوە، مرۆڤ لەگەڵ نوسین‌و خوێندنەوەشیدا لە خەیاڵ بە دور نابێ، بەڵام دەکرێ بڵێین چاترین شت کە بیری مرۆڤ تیژ بکاو زەین‌و هۆشی لەسەر خۆ بێ ئەنجامدانی کردەی بەسودو بەرداره، هەر ئەوانەی کات بەتاڵن سەرگەرمی خەون‌و خەیاڵن، پەڕو باڵیان شکاوەو بە پڕوپاگەندەوە سەرقاڵن.

## لە ڕەخنەی بنیات نەرو دڵ سۆزانە نیگەران مەبە، بەڵکو بە دڵێکی فراوانەوە وەری بگرە

"ئەندرێ مۆرۆ" دەڵێ: هەرچی لەگەڵ بەرژەوەندی کەسایەتیماندا تێك بکاتەوە بە ڕاست‌وڕەوای دادەنێین، بەڵام هەرچیێ تێکنەکاتەوە ڕق‌و کینەمان هەڵدەستێنێ".

منیش دەڵێم: ئامۆژیاری‌و ڕەخنەگرتنیش هەروایە، زۆرجار ئێمە بەوە دڵ خۆش‌و شادمانین پێماندا هەڵبگوترێ، هەرچەندە لە جێی خۆی نەبێ، بەوەشیان هەراسانین لۆمەمان بکرێ‌و ڕوی ڕەخنەمان تێ بکرێ، ئەگەر چی لە جێی خۆی بێ، ئەم شێوە بیرکردنەوەشیان لەکەیێکی گەورەو هەڵەیەکی مەترسیدارە.

﴿ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ... هەر ساتێکیش بەرەو خوداو ڕاسپاردەی بانگیان دەکەن، کە خۆی بە کاریان ڕابگا، کەچی دەستەیەکیان هەر خۆی لێ دەبوێرن. ئەگەریش لە قازانجی وان بێ، دێنە لای‌و دەیسەلمێنن. ﴿٤٩﴾ النور ﴾.

"ویلیەم جایمس" دەڵێ: کاتێ سەبارەت بە کردارێك تەواو ڕێکەوتن دەکرێ بۆ ئەوەی هەر لەم ڕۆژەدا ئەنجام بدرێ، تۆ بە تەواوی لە چنگی ئەم خەم‌و پەژارەدا ڕزگارت دەبێ کە دەبێتە بەربەستی ڕێگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانت، ئەوەش وادەگەیەنێ، کە ئەگەر تۆ بڕیارێکی چارەسازانە بگریەبەر کاریگەری بەسەر گۆڕانکاری ڕۆژانەوە هەبێ، تازوە بە ئەنجامی بگەیێنەو دو دڵ‌و نیگەران مەبەو هەنگاوەکانت مەوەستێنە، گیانی خۆشت مەخە ناو گێژاوی ئەو گومان‌و خەیاڵانەی کە جار لەدوای جار گومانت بۆ زیاد دەکەن‌و، بەردەوامیش ڕوەو دواوە مەڕوانە".

یەکێکـی تریش دەڵێ:

بێگومان بوێری تۆ لە مەڕ بڕیاردان دەبێتـە هۆکاری ڕزگـار بونـت لـە ئاسـتەنگـو سەخڵەتی ژیان، ﴿... فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرًا لَّهُمۡ ... هەر کـاتێکیش خەزا بڕیار درا، ئەگەر ئەوسا بەرامبەر بە خـودا ڕاسـتبن هـەر بـە قـازانجی خۆیانـە، (٢١) محمد﴾.

## دەسـتەوسانو دو دڵ دامەمێنە، بەڵکە دەسـتبەکار بـەو کاتێبکۆشـەو لـە بەتـاڵی دامەگوزەرێنـە

دکتۆر "ڕیتشارد زکابۆت" مامۆستای پزیشکی لە زانکۆی "هـارفرد" لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی، مرۆڤ بە چی دەژیێ...[٤٤٥]، دەڵێ: "بەو ناوەی، کە پزیشکێکم، ئامۆژگاری ئەو نەخۆشانە دەکەم بە سای گومانو دو دڵیو بێ زاڵەییو[٤٤٦] ڕەوەکـی[٤٤٧] گیرۆدەی لەرزۆکی بـون، کـە بـە کـارو کردەوەیـێ چارەسـەری ئـەم دەردەیـان بکـەن... جا ئـەو بوێریەی[٤٤٨] وزەی کارکردنمان پێ دەبەخشێ وەکو ئەو باوەڕ بە خۆ کردنـە وایـە کـە (ئیمرسۆن... بە هەمیشە هەست جوڵێنو ڕەونەق پەخشی ناوزەد کردوە"[٤٤٩].

﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ ... هـەر کـاتێ لە نوێژێ بونەوە، بە هەر دێدا بڵاو ببنو بۆ چاکەی خودا بکۆشن، (١٠) الجمعة﴾.

"جۆرج برنادشۆ" دەڵێ: نهێنی دۆڕانـی تـۆ بـەوە دەردەکـەوێ کـە کـاتێکی وات بـۆ بڕەخسێ بتوانی بیرو هزری خۆی تێدا بەکاربێنیو، لەمەڕ ئەوە خـۆت هەڵسـەنگێنی ئاخۆ بەختەوەری یا چارەڕەشی، کەچی بایەخ بەو هەلە ڕەخساوە نـەدەی، بـەڵام مـن

---

٤٤٥) (بم يعيش الانسـان....

٤٤٦) بێ ورەیی.

٤٤٧) ترسەنۆکی.

٤٤٨) ئازایەتی.

٤٤٩) داناوە/ ناوی بردوە/ ناساندوێتی.

پێت دەڵێم سـەرگەرمی کارکردنـت بـە، لـەو کاتـەدا خوێنـت دەست بـە سـوڕی خـۆی دەکاو، هەستو ژیریت دەستبەکار دەبێ، بە دوریشی مەزانە ئەم ژیانـە نوێیـەت دڵاو دڵیو نیگەرانی لە ناو بیروهزردا بڕەوێنێ! دەستبەکار بەو لە کارکردن بێـزار مەبـە، دڵنیا بە لەسەر ڕوی ئەم زەمینەدا لەو دەرمانە هەرزان ترو چاترت دەست ناکەوێ".

﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ ... بێـژە: دەسـا وە کارکـەون، کـاری ئێوە بە زوێکی زو لە لای خوداو پێغەمبەریو خاوەن باوەڕان دیار ئەدا. (١٠٥) التوبة ﴾.

"دزرائیلی" دەڵێ: "ئەم ژیانەی دنیا زۆر کورتە، تاوەکو بە کەم سەیر بکرێ".

هەندێ لە زاناو کاراشنایانی عەرەب دەڵێن: "ژیانی دنیا لـەوە بـێ بایـەخترە ئێمـە بە ڕقو کینە بیبەینە سەر".

﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ (١١٢) قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ... پێیان ئێژێ: چەند ساڵ لە زەمین مانەوە؟ ئێژن: ئێمە هەر ڕۆژێـك یـان هێنـدێك لـە ڕۆژێ ماینـەوە، لـە حیـسابگەران بپرسـە. ئێـژێ: ئەگـەر بوزانیبـا، کـەمێك نـەبێ نەمانەوە. (١١٣) المؤمنون ﴾.

## زۆربــەی هــەواڵی بڵاو کراوە لە ڕاســـتی بەدورە

"جەنەڕاڵ جۆرج کرۆك" - ئەگەر چی لە مێـژوی ئەمریکیەکانـدا بـە گـەورەترین نەیاری هیندی دادەنرێ- لە لاپەڕەی ٧٧ی یاداشت نامەکانی دادەڵێ: بێگومان زۆربەی هەرە زۆری نیگەرانیو کەساسی هیندیـەکان لـە خـەیاڵو بیرکردنەوەیانـدا سەرچـاوە دەگرێ نەوەك لە ژیانی ڕۆژانەیاندا".

خوای تاكو پاکیش دەفەرموێ: ﴿ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ ... هەر هەرایەك لە دژی خۆیان دەزانن. (٤) المنافقون ﴾.

﴿ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ ... گـەر وێـڕای ئێـوەش هاتبان بۆ خەزایە، کاریان لە ئێوە تێکدەداو کێشەیان بۆ دەنانەوە (٤٧) التوبة ﴾.

مامۆستا "هۆکس" - لە زانکۆی "کۆلۆمبیا" - ئەم پەیڤو دەستەواژەیەی کردۆتە یەکێ لە دروشمەکانیو دەڵێ: "هەمو دەردو بەڵایێ لەسەر ڕوی ئەو زەویەدا لە دو چۆنیەتی بەدەر نیە یا چارەسەری دەست دەکەوێ، یا بە هیچ جۆرێ چارەی نادۆزرێنەوە.

جا ئەگەر دەزانی چارەسەری هەیە بەدوایدا بگەڕێ، ئەگەریش دەزانی چارەی نادۆزێتەوە هیچ بایەخی پێ مەدەو خۆی پێوە سەرقاڵ مەکە".

لە فەرمودەیەکی بێ هەڵەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: (( ما انزل الله من داء الا انزل له دواء، علمه من علمه، وجهله من جهله" خوای گەورە هیچ دەردێکی نەناردوە مەگەر دەرمانیشی لەگەڵ ناردوە، جا ئەوەی بیزانێ دەیزانێو ئەوەیشی کە نایزانێ نایزانێ)).

## نەرمو نیانی لە خلیسک بردن دەتپارێزێ

مامۆستایەکی یابانی بە قوتابیانی دەڵێ: "نەرمو نیانی وەکو داری خلاف [٤٥٠] وایە خۆ نەگریو بێ بەرگەییش وەکو بەڕو [٤٥١] وایە".

لەو فەرمودەی پێغەمبەریشا ﷺ هاتوە: "المؤمن كالخامة من الزرع، تَفَيَّئُها الريح يُمنةً و يُسرة" بڕوادار وەکو کشتوکاڵی تەڕو ناسك وایە، بای لێدەداو بە لای ڕاستو چەپدا دەیهێنێو دەیبا".

مرۆڤی کاراشناو تێگەیشتوش وەکو ئاو وایە، لەگەڵ تاشەبەردان دا تێك ناگیرێ، بەڵکە بە لای ڕاستو چەپو سەرێو ژێرەوەیدا تێدەپەڕێ.

لەو فەرمودەیەشدا هاتوە: "المؤمن كالجمل الآنف، لو أُنيخ على صخرة لا ناخ عليها" بڕوادار وەکو وشتری ئاڵقە لە لوت وایە ئەگەر لەسەر بەردێکیش ئیخ بدرێ ئیخ [٤٥٢] دەدا".

---

٤٥٠) ناوی درەختێکی شامیە.

٤٥١) بەڕو زو بەردەبێتەوەو خۆی بەدارێەوە ناگرێ.

## ئەوەی چــو ناگەڕێتــەوە

دکتۆر "بـۆڵ براندۆنی" ڕادەوەستێو، شوشـە شیرێك بـە زەویـدا دەكێشێ، هـاوار دەكاو دەڵێ: "لەسەر شیری ڕژاو مەگری".

ئاپۆڕەش دەڵێ: ئەوەی بۆت نەنوسرا بێ بەسەرتەوە گرانە.

حەزرەتی ئادەم بە حەزرەتی موسی دەڵێ درودی خوایان لەسـەر بێ: ئایـە لەسـەر شتێ لۆمەم دەكەی كە چل ساڵ بـەر لـەوەی لـە دایـك بم خـوای گـەورە لەسـەرە مـنی نوسیوە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: (("فحجَّ آدم موسی، فحـجَّ آدم موسـی، فحـجَّ آدم موسی" سێ جار فـەرموی: ئـادەم بەڵگـەی موسـای بـڕی. هـەر لـە نـاو نـاخ‌و دەرونـی خۆتدا بە دوای بەختەوەری دابگەڕێ، نـەوەك لـە دەوروبـەرت: شـاعیرێكی ئینگلیـزی بە ناوی "مێلتۆن" دەڵێ: "بێگومان ژیری هەر بە خۆیو لە شـوێنی خۆیـدا دەتوانـێ بەهەشتێ بكا بە دۆزەخ‌و، دۆزەخ بكا بە بەهەشت!)).

## ژیانی دنیــا شــیاوی خەم لەســەر خواردن نیــە!

"ناپلیۆن" لە "سانت هێلینـا"دا دەڵـێ: "بـە بـیرم نایـێ شـەش ڕۆژم لـە ژیانـدا بـە بەختەوەری بردبێتە سەر"!!

خەلیفـە "هیـشـام"ی كـوڕی "عەبـدول مـەلیك" دەڵـێ: "ڕۆژانـی بەختـەوەریم ژماردن هەستم كرد تەنیا – ١٣- ڕۆژن".

" عەبدول مەلیك"ی باوكی هیـشامیش هـەروا ئـاخ‌و ئـۆف هەڵدەكێـشان‌و دەیگـوت "خۆزگە ئەو جێنشینیەم قەبوڵ نەكردبا".

"سەعید"ی كوڕی "موسەیەب" دەڵێ: سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی وایكـردوە ئـەوان پەلاماری ئێمە بدەن ئێمە پەلاماری ئەوان نادەین.

---

٤٥٢) ئیخدانی وشتـر/ واتە كەواندنی/ وشتری ئاڵقە لە لوت ئەو وشترەیە لەبەر چەموشی ئاڵقەیان لە لوت دەكردو ڕام دەبو.

جارێکیـان "ئـیبن سـەماك" ی ئامۆژیـار دەچێتە لای "هارون ڕەشـید"، "هـارون" تێنـوی دەبـێ‌و داوای قومـە ئـاوێ دەکـا، "ئـیبن سـەماك" پێـی دەڵـێ: ئـەی گـەورەی بڕواداران ئەگەر بێ‌و لێت نەگەڕێن ئەم قومە ئاوە بنۆشی، نیوەی مڵك‌و دەسـەلاتی خۆی لە پای دەدەی؟ گوتی: بەڵێ. کاتێ ئاوەکەی خـواردەوە، پێـی گـوت: ئەگـەر بـێ‌و ئەو ئاوەی خواردتەوە بەری لـێ بگیـرێ، نیـوە مڵکەکـەی تریـشی لـە بـری دەدەی بـۆ ئەوەی ڕێی بۆ دەرەوە چونی ببێتەوە؟ گوتی: بەڵێ. "ئیبن سەماك" گوتی: جا مڵك‌و دەسەلاتێ نرخەکەی بارتەقای قومە ئاوێ نەبێ هیچ سودو کەڵکێکی نیە. بێگومـان ژیانێك ئەگەر باوەڕداری تێدا نـەبێ هـیچ نـرخ‌و بـەهاو سـەنگێکی نیـە. "ئیقبـال" دەڵێ: "ئیمرسۆن" لە کۆتایی وتارەکەیدا بە ناوی "پشت بەخۆ بەستن" دەڵێ: "پێت وانەبێ، سەرکەوتنی سیاسی، یا زیاد بونی کرێی ڕۆژانەت، یا چابونەوەت لە نەخۆشی یا، کە ڕۆژە خۆشەکانت بۆ وەگەڕێنـەوە، دەروی خێـرت لـە ڕودا والاّ دەکـرێ، چونکو بەو شێوەیە نیـە، کـە تێـی گەیشتوی. هـیچ کەسێکیش دلاّرامیـت بـۆ ناپێنـێ تـەنیا دەرونی خۆت نەبێ".

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ... تـۆش ئـەی گیـانی لـە خەم ڕەخسیو! بە دڵخۆشی بچۆوە لای پەروەرنـدەت، چۆن ئـەوت لـە خـۆ ڕازی کـرد. ﴿٢٨﴾ الفجر ﴾.

پرۆفیسۆری ژیریارو وردبین "ئیبتکتۆیتۆس" هۆشیاری داوە دەڵێ: پێویستە بە لابردنی بیرو بۆچونی هەڵەو نابەجێ لە بیر کردنەوەماندا بایەخ دەین، پتر لەوەی بایەخ بە نەهێشتنی ئاوسان‌و نەخۆشی لاشەمان دەین".

سەیر لەوەدایە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو نەخۆشیانەی پەیوەندیان بە بیروباوەڕەوە هەیە، پتـر بە جێگای مەترسی دانـراون لـەوەی پەیوەنـدییان بـە نەخۆشـی لاشـەوە هەیـە، خـوای تـاك‌و پـاك دەفـەرموێ: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ... دڵیان نەخۆشیەکی هەیەو خودا نەخۆشی پتر کردون، لەسەر ئەم درۆ کردنە، بەشیان ئازاری بەژانە، ﴿١٠﴾ البقرة ﴾.

﴿... فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ... وەختێ ئەوان خۆیان لادا، خوداش دڵی وانی لادا، ﴿٥﴾ الصف﴾.

پرۆفیسۆری فەرەنسی "مونتین" ئەم چەند وشەی کردۆتە دروشم لە ژیانی خۆیدا: "مرۆڤ ئەوەندەی بە بۆچونی خۆی دەربارەی ئەگەری ڕودانی ڕوداوەکە دەکەوێتە ژێر کاری گەریەوە خودی ڕوداوەکە ئەوەندە کاری تێناکا".

ئەم وتەیەش بە فەرمودە بیستراوە: (( اللّهم رضّني بقضائك حتى اعلم أنّ ما اصابني لم يكن ليخطئني، وما اخطأني لم يكن ليصيبني... خوایە وام لێ بکەی‌و لە بڕیاری تۆ ڕەزامەندی بنوێنم تا دڵنیا دەبم ئەوەی بە سەرم دێ بەسەرمدا هەڵنابرێ، ئەوەیشی بەسەرم دا هەڵدەبرێ بەسەرم نایێ)).

## هەڵــوەســـتەیــەك

خەمبار مەبە: چونکو خەمباری لەمەڕ ڕابردو جەرگاوس‌و [٤٥٣] بێزارت دەکا، داهاتوشت لەبەرچاودا سامناك دەکا، ڕۆژی ئیمڕۆشت لە کیس دەدا.

خەمگین مەبە: چونکێ خەمینی دڵ‌و دەرون دێنێتەوە یەك، ڕوان گرژومۆن دەکا، گیان‌و ڕۆح دا دەڕمێنێ‌و، خۆزگەو خواستان دەپوکێنێ [٤٥٤].

دڵ پەست مەبە: چونکە دڵ پەستی نەیارانت دڵخۆش دەکا، ئازیزانت دەڕەنجێنێ، چاوچنۆك‌و چاوتێبڕان لێیان وەخۆشی دێ‌و، ڕاستیەکانیشت لەبەرچاودا دەشێوێن.

دڵ توند مەبە: لەبەرئەوەی دڵ توندی دژایەتی بڕیارو فەرمانی خوایە، بێزاری نواندنە لە شتێ کە دەبوایە هەر ببێ، خۆ هەڵاوێردنە [٤٥٥] لە باوو نەریتی گشتی‌و، لە بەهرە بێزار بونە.

٤٥٣) داخدار.

٤٥٤) ناهێڵێ.

٤٥٥) خۆ جیاکردنەوەیە.

دڵ گران مەبە: بە سای دلگرانی ون بو ناگەڕێتـەوەو ڕۆیـشتو نایێتـەوە، مـردو لـە گـۆڕ ڤیـت نابێتـەوە، قـەدەری خـوای گـەورەش بـە دڵ گرانـی ڕەت نابێتـەوەو، هـیچ قازانجێکیشی پێ فەراهەم نایێ.

دڵ گیـر مەبە: بێ گومان دلگیری لە شەیتانەوەیە، بێ ئومێد بونێکی وایە بەسـەر چـاوانتدا دەکـەوێنێ، لـە جـێوە توشـی هـەژاریت دەکـا، هیـوا بـڕانێکی بـێ مەودایـە، سەتاسەت دارمانە، دەست بەجێ هەرەسهێنانە.

﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾ وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ الَّذِي أَنقَضَ ظَهْرَكَ ﴿٣﴾ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴿٤﴾ فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ﴿٧﴾ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَارْغَب ... ئەدی ئێمە تۆمان سینە فەڕاح نەکرد؟ قورساییشمان لەسەر شانت لانەبرد؟ ئەوەی پشتی چەماند بوی؟ ناوبانگیشتمان بەرزەوە کرد. لە پاش تەنگانە فەرەحنایی دێ، بەڵێ، لە پاش تەنگانە فەرەحنایی هەیە. هەر کاتێ لە کارت قوتار بوی، ڕاستەوە بە (بۆ کارێکی تر.... ئەوسا لەبەر پەروەرێنت بلالێوە [٤٥٦]، ﴿٨﴾ الشرح﴾.

## لە سـۆنگەی ئەوە کـە باوەڕداری وا مـەزانە بـەلا باری

بێگومان هەر باوەڕ بونە نهێنی قایل بونەو هێورە بونو ئارام بونە، بەد بـەختیو چارەشیش هاودەمی دو دڵیو گومڕا بونە. کەسانێکی زیاریشم [٤٥٧] بەرچاوکـــــەوتوە - بەڵکە پسپۆڕو کاراشنا بون [٤٥٨] - بەلام دڵیان بە ڕۆشنایی پەیامی خـوا ڕۆشـن نـەبو، بە سای ئەوە زمانیان نەپرشایە [٤٥٩] سەر ڕاستیو دروستی یاساو ڕێسای خوا.

"ئەبو عەلای موعـەری" لـە بـارەی یاسـاو بنەماکانـدا دەڵـێ: چـەند دژە کاریـێ لـە ناویا هەیە هەرئەوەمان لەدەست دێ لێی بێ دەنگ بین!!

ڕازی دەڵـێ: کۆتا هەنگاوی وەستانە.

---

٤٥٦) بپاڕێوە.

٤٥٧) هۆشیار.

٤٥٨) شارەزا بون.

٤٥٩) نەکەوتە سەر.

"جوەینی" لەمەڕ لەکوێ بونی خوا، واقو ڕماوەو [٤٦٠] دەڵێ: هەمەدانی سەراسیمەی کردم، هەمەدانی سەری شێواندم.

هەروا (ئیبن سینا) دەڵێ: ئەو هەستو ژیریەی زۆر کارایە [٤٦١] هەر ئەوە لە بونەوەردا کاری گەرە.

زۆر گوتەو وتەی تریش هەن کە دورو نزیك مافیان بەسەر ڕاستیەوە نیە.

جا دڵنیا بوم کە بەندە بە پێی بەرزیو نزمی باوەڕی بەختەوەر دەبێ، بە گوێرەی سەرگەردانیو گومانو دودڵیشی بەدبەختو چارەڕەش دەبێ، هەر ئەو وتەو جێ باسانەی لەدوایی سەریان هەڵداوە لە دایك بوی ئەو گوتارە [٤٦٢] یاخیانەی چاخەکانی کۆنن، فیرعەونی لاڕێو تاوانکاریش دەڵێ: ﴿...مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي... وا نازانم جگە لە من خوایەکتان هەبێ، (٣٨) القصص﴾.

هەروا دەڵێ: ﴿... أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ... ئەمن پەروەرێنی هەرە پایە بەرزتانم، (٢٤) النازعات﴾ .

ئای لەو وتە ناڕەوایانەی کە هەمو جیهانیان پەرتو پێوار کرد [٤٦٣].

(جایمس ئیلیەن) دانەری کتێبی (بەو شێوەی مرۆڤ بیر دەکاتەوە)[٤٦٤] دەڵێ: لەمەولا مرۆڤ دەرکی پێ دەکا کە هەر کاتێ لە بەرانبەر خەڵکانی ترو شتی تردا بیروبۆچونی بگۆڕێ، ئەوا ئەم خەڵکەو ئەم شتانە بە هەوڵو گەڕی خۆیان دەگۆڕێن.. واز لەو کەسە بێنە نایەوێ بیروبۆچونی بگۆڕێ، دەبینی ئێمەش چۆن سەرسام دەبین لەو خێراییەی بواری ژیانی شتکاری [٤٦٥] ئەو مرۆڤە دەگۆڕێ، ئەوەی مەرامو خواستەکانی ئێمە پێك دێنێ هەر ئەو لە لای ئێمە پیرۆزە ئەویشیان دەرونمانە..".

---

٤٦٠) سەرسام.

٤٦١) بکەر.

٤٦٢) ئەو وتارە.

٤٦٣) تەفرو تونا کرد.

٤٦٤) مثلما یفکر الانسان.

٤٦٥) مادی.

خـواى تـاكو تـەنياش دەربـارەى بـيرو بۆچـونى هەڵـەو مـەوداى كاريگـەرى، دەفەرموێ: ﴿ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ... نەخێر ئێوە پێتان وا بو پێغەمبەرو باوەڕداران هـەرگيز تـازە نايەنـەوە نـاو مـاڵو خێزانـى خۆيـان. هـەر بـە دڵـيش ئـەم خەياڵەو بە شتێكى باش دەزانى. گومـانێكى بێجێو دەبـرد، ديـارە ئێـوە كۆمـەڵێكى زۆر بێخێر بون، ﴿١٢﴾ الفتح ﴾.

﴿ ... يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ... ئێـوەش هـەروەكو خوانەناسـەكانى پێـشين بـيرو لـە خـوا دەكـردەوە، دەيانگـوت: ئاخـــۆ لەم كـــارە چن بۆ دەكرێ؟ بێـژە: گـش كـار بـە دەســت خـودان. ﴿١٥٤﴾ آل عمران ﴾.

بـە هـەمان شـێوە (جـايمس ئيليـەن) دەڵـێ: "هەرچـى مرۆڤـ دەسـتەبەرى كـا ڕاستەوخۆ دەرەنجامى بۆچونە تايبەتيەكانێتى...

مرۆڤ دەتوانێ لە ميانـەى بيركردنەوەيـدا ڕاپـەڕێو سـەركەوتن بـە دەست بێنـێو مـەرامو خواسـتى بێنێتـە دى، ئەگـەر بـەو هەسـتو نەسـتە نـەژێ بـێ توانـاو دۆڕاو دەمێنێتەوە".

خواى تاكو پاك لەمەڕ وزەو ورەى ڕاستيانەو بيروبۆچونى بێ هەڵەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ ... ئەگـــــــەر بيانويسـتايە دەرچن، خۆيان بۆ ئامادە دەكـرد، بەڵام خودا هاتنيانى پێ خۆش نـەبو. ﴿٤٦﴾ التوبـة ﴾ .

هـەروا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ... ئەگـەر خـودا بيزانيبـا خێرێكيان دەباراندايە، كارێكى دەكرد ببيسن، ﴿٢٣﴾ الأنفال ﴾.

دەفـەرموێ: ﴿ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ ... خـوا دەيزانـى چـيان لـە دڵدايە، سا ئۆقرەو دڵنيايى ناردە سەريان. ﴿١٨﴾ الفتح ﴾.

## بۆ شتی کەم بایەخ هەراسان مەبە، هەر دنیا ئەوەندە نایێنێ

یەکێ لە گەورە پیاوچاکان فڕێ درایە بەرچەپۆکی شێرێکی دڕندە، کەچی خوا پاراستی، پێیان گوت: لەو کاتەدا بیرت لە چی دەکردەوە؟ لە وەڵام دا گوتی: بیرم لە لیکی شێرەکە دەکردەوە، دەبێ پیس بێ یا پاکژ!!. ئاخۆ زانایانیش ڕاو بۆچونیان دەربارەی ئەم لیکە چی بێ.

خوای بەرزو بێ هاوتا هاوەڵانی پێغەمبەری بە پێی ویستو خواستیان لێك جیاکردۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿...مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ... ئی وا هەبوحەزی لە ماڵی دنیا بو، ئی واش هەبون خۆشی ئەو دنیایان دەویست، (١٥٢) آل عمران﴾.

(ئیبن قەیم) باس دەکا کە سەنگو ڕێزی مرۆڤ لە هێزی دڵو هومێدی دایەو، ئەوەیشی هەڵی دەبژێرێ ئاخۆ نرخی چەندە؟!.

یەکێ لە زاناو دانایان دەڵێ: تۆ پێم بڵێ ئەو کەسە بایەخ بە چی دەدا منیش پێت دەڵێم نرخی چەندە.

یەکێ تر دەڵێ: جارێکیان بەلەمێك لە ناو دەریادا سەرەو نخون دەبێ، یەکێ لە خوا پەرستان دەکەوێتە ناو دەریا، ڕاستەوخۆ دەست دەکا بە دەستنوێژ گرتن ئەندام لە دوای ئەندام پێ دادێ، ئاویش لە دەمو لوتی وەردەکا، دەریا وەدەرێی دەنێو ڕزگاری دەبێ، لێیان پرسی بۆ ئاوات دەکرد؟

لە وەڵامدا گوتی: ویستم دەستنوێژێ بگرم تاوەکو ئەگەر مردم بە پاکی بڕۆم.

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی "حەنبەل" لەسەرە مەرگیدا دەستنوێژیان بۆ دەگرت ئاماژەی کرد دەستی بۆ لەناو ڕیش وەردەن کە "سونەتێکە"!! ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ... ئەوسا خودا پاداشتی ئەم دنیایەو چاکەو پاداشی دوا ڕۆژی پێدان، (١٤٨) آل عمران﴾.

## پەڕێشــان مەبــە ئەگەر چی شــە پۆلی ســتەم هێرشــت بۆ ســەر بێنێ

ئەگـەر تـۆ چاوپۆشـیو لێبـوردەیی بنـوێنی سـەر بڵنـدی دنیـاو شـکۆداری دواڕۆژ بەدەست دێنی: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ... کێ لە تۆڵە چاوبپۆشێو کۆشش بۆ ئاشتی بکا، پاداشی لەسەر خودایە. ﴿٤٠﴾ الشوری﴾.

(شکسـپیـر) دەڵـێ: تەندورەکـە بـۆ دوژمـن زۆر گـڕ مـەدە، نـەوەکو خـۆتی پـێ بسوتێنی".

یەکێ بە (سالم)ی کوڕی (عبـدالله)ی کوڕی (عومـەر) دەڵـێ: کـە یەکێکـە لـە زانـا (تـابیعی)یـەکان: تـۆ پیـاوێکی خراپـی! لـە وەڵامـدا دەڵـێ: تـەنیا تـۆ منـت ناسـیوە.

وێژەرێکی ئەمریکی دەڵێ: "دەشێ لێدانی گۆپـاڵو بـەرد هێـسکەکانم بـشکێنێ، بـەڵام وشەی نەشیاو ڕێی تێ ناچێ ئازارم پێ بگەێنێ".

یـەکێ بـە (ئەبوبـەکر) دەڵـێ: سـوێند بـە خـوا دەبـێ جوێنێکـت پـێ بـدەم لەگەڵـە خۆتی ببەیە ناو گۆڕ!

ئەویش پێی دەڵێ: بەڵکە ئەو جوێنە لەگەڵ خودی خۆت دێتە ناو گۆڕ.

پیاوێ بە عەمری کوڕی عامر دەڵـێ: گومانت نەبێ لەمەولا بـۆ دژایـەتی تـۆ خـۆم یەك لا دەکەمەوە.

عەمــر دەڵێ: هەر لە ئێستاوە کەوتیە ناو گێژاوی سەرقاڵی.

"جەنـەڕاڵ ئیزنهـاور" دەڵـێ: "وازمـان لـێ بێـنن ئێمـە تـەنیا خولـەکێ لـە بیـر لێکردنەوەی ئەو کەسانە بە فیـڕۆ نادەین کە خۆشمان ناوێن".

مێشوولە بە دارخورما دەڵێ: خۆت بگرە، مـن دەمـەوێ هـەڵفڕمو وازت لـێ بێـنم. دارخورما دەڵێ: بە خوا لەو کاتەی بەسەرمەوە نیشتی هەستم پێ نەکرد، جا ئەگـەر هەڵبفڕی چۆن هەست پێ دەکەم؟!

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿... وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ... هەرکاتێ بە لای کاری نالەباردا ڕادەبورن، مەردانە خۆی لێ لادەدەن، (٧٢) الفرقان﴾ .

هـەروا دەفـەرموێ: ﴿...وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ... هـەر کـاتێکیش نەزانەکان بیاندوێنن، بەرسڤی [٤٦٦] نەرمو نیانیان دەدەنەوە، (٦٣) الفرقان﴾.

"کۆنفۆشـیۆس" دەڵـێ: "بێگومـان ئـەو پیـاوەی قـین لـە دڵـە هەمیـشە بـە ژەهـر پەنگی خواردۆتەوە" لە فەرمودەشـدا هـاتوە: (( لا تغـضب، لا تغـضب، لا تغـضب... تورە مەبە، تورە مەبە، تورە مەبە)) هەروا دەفەرموێ (( الغضب جـمرة مـن النّـار... تورەیی پۆلوێکە لە ئاگر".

شەیتانیش لە سێ شـوێناندا بەندەی لە عەرزێ دەدا: تورە بون، ئـارەزو هەڵـسـان، بێ ئاگـایی.

## جیهــان بەو شـێوە ڕەخســاوە

(مارکۆس اۆیلیـو) - کە لە هەموئەوانەی فەرمانڕەوایی ئیمپراتـۆری ڕۆمیـان کـرد کاراشناو شارەزا تر بو - ڕۆژێکیان دەڵێ: ئیمـڕۆ لەگـەڵ کەسـانێ بەیـەك دەگـەم، کـە زۆر بلێن، کەسانێکی خۆپەرستو سەرپێچی کارن، خۆپەرستن، بەڵام من لەو کارەیان سەرشێواوو هەراسان نابم، چونکێ من وا هەسـت ناکـەم هـەمو جیهـان لـە هاووێنـەی وان کەمتـر بێ"!

---

٤٦٦) وەڵامی.

## چە پەڵكاران چەندە زۆر بن سەرسـامیان لـێ مەنوێنـە بـەڵام چـاكە كـاران ئەگەر چی كـەم بن بە زۆریان بنرخێنـــە

(ئەرستۆ) دەڵێ: "كەسی هەڵكەوتەو نمونەیی بەو ڕەفتارەی لە پێناوی كەسانیدا دەینوێنـێ خۆشـحاڵو شـادمانە، ئەگـەر چاكەییێكیـشی لەگەڵـدا بنـوێنرێ خـۆی پـێ شەرمەزارە، چونكێ ئەوەی سۆزی دەنوێنێ وا دیـارە باڵادەسـتە، بـەڵام ئـەوەی سـۆزی بۆ دەنوێرێ وا دیارە دەستە پاچەو بێ چارەیە".

لە فەرمودەشا هاتوە: (( الید العلیا خیر مـن الیـد الـسفلی... ئـەو دەسـتەی باڵایـە چاترە لەو دەستەی لە ژێر دایە)).

دەسـتی بـاڵا ئـەو دەسـتەیە دەبەخـشێ، دەسـتی نـزمو لـە خـوارێ ئـەو دەسـتەیە وەردەگرێ.

## ئەگـەر تەنیا تیكە نانێكو لوێچێك ئـاوت هـەبێو بـەرگێ هـەبێ شـەرمو شـكۆت داپۆشـێ ئیتـر خـەمو خـەمینی پێ ناوێ.

یەكێ لە دەریاوانان بیستو یـەك ڕۆژ لـە نـاو زەریـای هێمنـدا مایـەوەو ڕێگـای ون كرد، كاتێ خوا ڕزگاری كرد خەڵك دەربارەی گەورەترین پەندو وانەی فێـری بـو بـێ لێیان پرسی گوتی: گەورەترین پەند كە لەم ئەزمونەدا وەرمگرتبێ ئەوە بـو: ئەگـەر ئاوێكی سازگارت لەبەردەست بێو خۆراكێ هەبێ پشتی خـۆی پێـوە بگـری، پێویـستە لەسەرت هەرگیزاو هەرگیز بێ زاری نەنوێنی!

یەكێكیان گوتی: جا ژیان هەموی بریتییە لە پـاروە نانێـكو قومـە ئاوێـك، لەوانـە بەدەر زێدە ژیانە.

"جۆناسان سـۆیفت" دەڵێ: ((بەرنامەی خۆ لاوازكردنو، لەسەرخۆییو، ئاسودەیی باشـترین دكتـۆرن لـە جیهانـدا، كـەم خـواردنیش هاوكـات لەگـەڵ هـێمنو شـادمانیدا چارەسەرێكی بە ئەنجام گەیشتوە خەڵكیش بە دوایدا ناگەڕێ)).

منیش دەڵێم: لەبەرئەوەیە قەڵەوی نەخۆشیەکی درێژ خایانە، هورگنی [٤٦٧] وشیاری‌و ژیری نایەڵێ، هێمنی‌و هەداریش خۆشی دڵ‌و جەژن‌و شادی ڕۆحەکانە، هەروا خەندە لێوی [٤٦٨] هەر لە جێوە دڵارامیت بۆ دێنێ‌و وزەوتینێکی سودمەندت وەبەردێنی.

## بە کارەساتێ داخدار مەبە کە سەرەنجامەکەی خۆشیە بە سای بەلایێ چۆك دانەدەی کە بەرەو خەڵات وەردەچەرخێ

دکتۆر (صموئیل جۆنسۆن) دەڵێ: ((نەریتی ڕەچاوکردنی لای گەشبینی لە هەر ڕوداوو کارەساتێك دا، گران بەهاو بەنرخترە لەوەی ساڵانە هەزار (جەنیە)[٤٦٩] بەدەست بێنی)).

﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ... ئاخۆ ئەمانە نابینن کە ساڵانە کەرەتێك یان دوکەرەتان دەکەونە بەر تاقیکاری؟ لە ئاکامدا نە توشی پەژیوانی دێن نە پێی تەمێ گرتو دەبن. ﴿١٢٦﴾ التوبة﴾.

(معاویە)ش دەڵێ: تەنیا ئەو کەسە نەرم‌و نیانە کە خاوەنی ئەزمونە.

یەکێ لە پێشینان بە پیاوێکی خوا پێداو [٤٧٠] دەڵێ: من هەست دەکەم تۆ چەند بەهرەییێکت بەسەردا ڕژاوە، جا بە سای سوپاسگوزاری بەری ئەم بەهرانە بگرە [٤٧١].

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ إبراهيم﴾... ئەگەر شوکرانە بژێر بن، بۆو زیاد دەکەم، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن، جەزرەبەم زۆر توندو تیژە، ﴿٧﴾ إبراهيم﴾.

---

٤٦٧) هورگ زلی.

٤٦٨) ڕوخۆشی.

٤٦٩) جۆرە دراوێکە.

٤٧٠) خاوەن بەهرە.

٤٧١) بە فیرۆیان مەدە.

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَاقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ
... خـوا شـارێکی نەزیلـە هێناوەتـەوە"[٤٧٢]، کـە زۆر هـێمن‌و بـێوەی بـون لـە هـەمو ئاقارێکـەوە فـرە بـژێویان بـۆ دەهات، کەچی لـەم هەموچاکەی، کـە خـودا دەربـارەی کـردن، حاشـایان کـرد. لـە بارتـەقای ئـەو کـردارەی کـە دەیـانکرد، خـودا دەبـەرگی برسێتی‌و ترسی پێچان، (١١٢) النحل ﴾.

سەبارەت بەوە خەمبار مەبە کە جیا لەم‌و لەو لە شێوەو خوونەرێتێکی تایبەتدا رەخساوی.

دکتۆر (جایمس گۆردۆن گلیلکی) دەڵێ: "ئاستەنگی ئارەزومەنـدی لـەوە دایـە لات وابێ هەست‌و دەرونت کۆنەو، وەکو مێژو دێرینە، وەکو ژیانی مرۆڤایەتیش گشتیە.

چۆن گیروگرفتی نـەبونی ئارەزومەنـدی لـەوە دایـە دەرونـت سەرچاوەی زۆرێ لـە گرێ‌و گاڵ‌و کێشەو بێشەی دەرونی بێت".

یەکێ تر دەڵێ: "تۆ لە دروست کراوەکـانی تـر جیـاوازی هـیچ کەسـت پـێ ناچـێ‌و، تـۆش بـە کـەس ناچـی، چـونکو دروسـتکاری بونـەوەر - بـەرزی‌و شـکۆداری بـۆ ئـەو - دروستکراوەکانی جیا لە یەك فەراهەم هێناوە".

خـوای گــەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ... خەبــــــاتێ ئێـوە جـۆراو جـۆرە، (٤) الليل ﴾.

(ئەنجیلۆ بـاتری) دەربـارەی "ڕاهێنـان‌و مەشـق پێکردنـی منـداڵ" سـێزدە کتێـب‌و هــەزاران گوتاریــشی نوســیوە"، دەڵێــت: "هــیچ کەســێ ئەوەنــدەی یــەکێ دوڕاو نیــە هەوڵدا هەست‌و نەست‌و لە شولارو بیـرکردنەوەی بگۆڕێ".

---

٤٧٢) بە نمونە هێناوەتەوە.

خوای گەورە دەفەرمـــوێ: ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا ... لەو حەوایە ئاوێکی دارژاندوە، پڕاو پڕی بارستایی نەوالان [٤٧٣] دێ، ﴿١٧﴾ الرعد ﴾.

هەر یەکێ خاوەنی چەند بەهرەو تواناو خوونەریتێکی تایبەتە، با کەس خۆی لە کەسێکی تردا نەتاوێنێتەوە.

تۆ بە چەند بەهرەیەکی دیار کراوەوە خوڵقێنراوی تاوەکو چەند کردەوەیەکی دیاری کراو ئەنجام دەی، هەروەکو گوتراویشە: خۆت وەخوێنەوەو، بزانە چ پێشکەش دەکەی.

(ئیمرسۆن) لەو گوتارەیدا کە دەربارەی "پشت بە خۆبەستن" نوسیویێتی دەڵێ: ئەو کاتو سەردەمە دێ زانیاری مرۆڤ تیایدا بگاتە ئەو ئاستەی باوەڕ بەوە بێنێ کە ئێرەیی‌و چاو تێبڕی دواکەوتن‌و نەفامیە، چاولێکەری‌و دەمە لاسکەیی [٤٧٤] خۆ کوشتنە، هەر بارودۆخێ لە ئارادا بێ خۆی چۆنە بەم شێوەیە خۆی بنرخێنێ، چونکو ئەو بەشەی پێ براوە، ئەگەر چی هەموبونەوەریش پڕ لە شتی سودمەندو بەهەرمێن بێ، ئەو تەنیا دەنکێکی لێ بە دەست نایێنێ مەگەر زەویەکە دابچێنێ‌و بەسەریشیەوە چاوەدێر بێ، ئەو وزەو توانایەی لە ناخی ئەودا شاراوەیە لە خوونەریتدا شتێکی نوێیە، هیچ کەسێکیش نازانێ مەوداو چەندیەتی دەسەڵاتی چەندەو دەرکی پێ ناکا هەتاوەکو ئەو وزەیەی تاقی نەکاتەوە.

﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ ... بێژە: دەسا وە کارکەون، کاری ئێوە بە زوێکی زو لە لای خوداو پێغەمبەری‌و خاوەن باوەڕان دیار ئەدا، ﴿١٠٥﴾ التوبة ﴾.

---

٤٧٣) دەرە، دۆڵ.

٤٧٤) لاسایی کردنەوە.

## هەڵوەستەیەك

فەرمو ئەوە چەند ئایەتێکن ئومێدەواریت پتەو دەکەن، دەستو بازوت بەهێز دەکەن، گومانت لە ئاستی پەروەردیارتدا جوان دەکەن.

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ... بێژە: ئەی عەبدەکانی من! ئەی ئەوانەی کە بەلادان لە ئەندازە، نا حەقیو لە خۆ کردوە! نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا ناهومێد بن، چونکە لە هەمو گوناهێك چاودەپۆشێ، ئەو لێبوردەو دلۆڤانە، (٥٣) الزمر ﴾.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ... ئەو کەسانەی هەر کاتێ کاری خراپ دەکەن، یان نا حەقی لەخۆ دەکەن، خودا لەبیر نابەنەوەو لەبەری دەپارێنەوە: لە خەتاکانیان ببورێ، بێژگە خوداش کێ لە گوناهان دەبورێ؟ جا ئەوانە لەسەر کارێ کە زانیویانە هەڵەیە، پێ داگر نین، (١٣٥) آل عمران ﴾.

﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ... هەر کەسێکیش کارێکی نالەبار بکا، یان غەدرێکی لە خۆی بکا، پاشان لە خودا بخوازێ کە بیبەخشێ، دەبینێ کە خوا لێبورو دلۆڤانە، (١١٠) النساء ﴾.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ... هەر کاتێکی عەبدەکانم لەمەڕ من لە تۆ دەپرسن، من نزیکم، هەر کەس هانام وەبەربێنێ، بێ وەرامی ناهێڵمەوە. با ئەوانیش لە فەرمانی من دەرنەچن، بڕوای تەواویان بە من بێ، بە شکو ڕێی ڕاست بەدی بکەن، (١٨٦) البقرة ﴾.

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ... یا ئەو کەسەی چاترە کە هەروەختێ هومێد براوێك لەبەری بپاڕێتەوە، دە هانای دێو لە چۆرتم ڕزگاری دەکاو دەتانکاتە جێنشین لەم سەرزەمینە؟ ئاخۆ هیچ پەرستراوێك لەگەڵ خوا هەیە؟ ئەمانە کەم پەند وەردەگرن، ﴿٦٢﴾ النمل ﴾.

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ... ئەو کەسانەی پێیان وتن: گەلە کۆمە گیولێکراوەو بە پەناوە دێنە سەرتان، ئەشێ ترسو لێیان هەبێ، باوەڕیان بەهێز بووەو گوتیان: ئێمە هەر خودامان بێ بەسمانەو چاکترین پشتو پەنامان تەنیا ئەوە. هاوڕێ دەگەڵ نیعمەتو چاکەی خودادا - بێئەوەی توشی زیان بن - گەڕانەوەو هەلۆەدای ڕەزای خودا بون، هەر خوداشە چاکەی گرنگی بەدەستە، ﴿١٧٤﴾ آل عمران ﴾.

﴿ ...وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُوا۟ ... کاری خۆم بە خوا دەسپێرم، خودا چاوی لە عەبدەکانی خۆی هەیە. خوا ئەوی لە ئاکامی خراپیو ئەو فێڵەی دەیانکرد، ڕزگار کرد، ﴿٤٥﴾ غافر ﴾.

## زۆر جاران زیانباری سودمەندە

(ویلیەم جایمس) دەڵێ: "بەڵاباریمان بەرێژەییێکی چاوەڕوان نەکراو یارمەتیمان دەدا، ئەگەر بهاتباو (دۆستیۆفسکی)و (تۆلستۆی) ژیانێکی پڕ لە مەینەتیان بەسەر نەبردایە نەیاندەتوانی چیرۆكو داستانی نەمردویان تۆمار کەن، جا بێ باوکایەتیو نابینایی، دەربەدەریو، نەداری، هەندێ جار دەبنە هۆکاری بلیمەتیو کار ڕاپەڕاندنو پێشکەوتنو پێشکەش کردن".

جاری وایە هەبونی کوڕو ماڵو دارایی زۆر مایەی بەدبەختیو چارەڕەشیە: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ... سەیرت نەیە لە دارایـیو زارو زیچـێ کە هەیانە، خوا دەیەوێ لە دنیادا بەمانـە ئازاریانـدا، (٥٥) التوبة﴾.

(ئیبن ئەسیـر) ئەو کتێبە ناوازانەی دانا، وەکو: "جامع الاصول"و "النهایـە" بـە سای ئەوەی گردەنشین کرابو[٤٧٥].

هەروەها "سەرخەسی" بە سای ئەوەی خرایـە نـاو چاڵ کتێبێکی نـاوداری نوسی بەناونیشانی "المبسوط" کە لە پازدە بەرگ پێك هاتوە!

(ئیبنول قەیم) کتێبی (زاد المعاد)ی لە گەشتو گەڕاندا نوسی!

(قورتبی) هەر لەسەر پشتی کەشتی لێك دانەوەو شەرحی کتێبی (صحیح مسلم)ی نوسی! (ئیبن تەیمیە) زۆرەهای فەتاوای لە بەندیخانەدا نوسی!

گێڕەوەکانی فەرمودە بە سەدهەزاران فەرمایشتی پێغەمبەریان کۆکردەوە چونکێ هەژارو بێجێوڕێ بون.

یەکێ لە پیاوچاکان بۆی گێڕامەوە کە بەند کرابو هەر لـەناو بەندیخانـەدا هـەمو قورئانی دەرخ کردبو، چل کتێبیشی خوێند بوەوە! (ئەبوعەلای موعـەری) بـە چاوی کوێرەوە چەند دیوانو کتێبێکی دانانو بۆی نوسرانەوە!

(تـەها حوسـێن) چاوەکانی لەدەسـتدا بـە سـای ئەمـە چەند یاداشتنامەی خۆیو چەند کتێبی نوسی!

چەندین کەسی هەڵکەوتەو ڕۆشـنا پـەخش[٤٧٦] لـە پلـەو پایەیانـدا لادران، چـەندین هەنـدەی ئـەو پلەیـە بـۆ گـەلو نەتـەوەیان زانـستو بۆچـونی سـودمەندیان فەراهـەم هێنا.

---

٤٧٥) دانشێن رابو/ کەفتە کار بو.

٤٧٦) سـودگەیێن.

(فرانسیس بایکۆن) دەڵێ: "تەنیا کەمێك زانیاری بون دەربارەی "فەلسەفە" سەرکێشێ بۆ بێ باوەڕی، بەڵام قوڵبونەوە لە "فەلسەفە"دا بیرو ژیری مرۆڤ لە ئایین نزیك دەخاتەوە".

﴿... وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ... زانایان نەبێ، تێی ناگەن، (٤٣) العنكبوت﴾.

﴿... إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ... لە ناو عەبدانی خوادا هەر ئەوانەی فرە زانان لێی دەترسن، (٢٨) فاطر﴾.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ... ئەو کەسانە بە زانستو باوەڕدارن، پێیان ئێژن: هەروەکو خودا نوسیوە، تا ڕۆژی سەلا ماونەوە، (٥٦) الروم﴾.

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ... بێژە: من هەر ئامۆژگاریەکتان دەکەم: لەبەر خودا یەکە یەکەو دوان دوان ڕاوەستنو پێکەوە بیربکەنەوە، هاوەڵەکەتان [٤٧٧] هیچ شێتی تێدا نیە. (٤٦) سبأ﴾.

دکتۆر "ئـ.ئـ. بریل" دەڵێ: "هیچ باوەڕدارێکی ڕاستەقینە بە نەخۆشی دەرونی گیرۆدە نابێ".

﴿... سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ... ئەوانەی باوەڕیان هەیەو ئاکار چاکن، خوا دەیانکاتە خۆشەویست، (٩٦) مريم﴾.

﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ... هەر کەسێ کرداری باشەو بە باوەڕە - چ نێر چ مێ - هەتا دەژی وا دەکەین بە خۆشی بژی، (٩٧) النحل﴾ .

﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ... هەر کێ باوەڕیان پێی هەیە، بێ سۆ خودا شارەزای ڕاستەڕێی کردون، (٥٤) الحج﴾.

---

٤٧٧) پێغەمبەرەکەتان.

## بـاوەڕ گـەورەترین دەرمـانە

دکتۆر (کارڵ جانگ) بەرچاوترینو نـاودارترین پزیشکی دەرونـی لـە کتێبەکەیدا بـەناوی (مرۆڤـی هاوچـەرخ لەمـەڕ لێکۆڵینـەوەی دەربـارەی ڕۆح... [٤٧٨] لـە لاپـەڕەی (٢٦٤)دا دەڵێ: بۆ ڕاوێژ پێ کردنم لە هەمووولاتانی جیهانەوە خەڵکانێ هاتون، سەدان نەخۆشم چارەسەر کردوە، زۆر بەشیان لە قۆناغی ژیاندا مام ناوەنجی بـون، واتـە لـە سەروی تەمەنی سیو پێنج ساڵی دابون.

یەکێکیان تیا نەبو کێشەی بۆ نـەبونی سەرچاوەیەکی ئـایینی نەگەڕێتـەوە کە لـە ڕوانگـەی ئـەم سەرچاوەیە بنوارێتـە ژیـان، دەشـتوانم بڵێم: هـەر هـەمویان دەردیـان لەوەدا بو ئەو بەخششو خەڵاتەی ئایین بە بڕواداری دەبەخشێ ئەوان لێی بێ بـەش بـون، هـەر کەسێکـیش ئامـادە نـەبێ بیـروباوەڕی ڕاسـتەقینەی بەدەست بێنێتـەوە چاك نابێتەوە".

﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا ... هەرکەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانەدایەو ڕۆژی سەڵاش بەکوێری لە گۆڕی دەردەخەین، (١٢٤) طه ﴾.

﴿ سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ ... ئەوانـەش کـە خـوا نەناسن، چونکە هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن، ترسێ داوێژینە دڵیان، (١٥١) آل عمران ﴾

﴿ ...ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ... تاریکایی بارە لەسـەر تاریکـاییو هـەرگا [٤٧٩] دەسـتی خـۆی دەربخـا، لەوانەیە هـەر نەیبینێ. هەر کەسـێکی خـوا ڕونـاکی نیشـان نـەدا، هیـچ ڕونـاکی شـك نابا، (٤٠) النور ﴾ .

---

٤٧٨) الانسان الحديث في بحثه عن الروح.

٤٧٩) هەر کاتێ.

## خەمبار مەبە.. خوا وەڵامی بێباوەڕێکی ناچار دەداتەوە، چ جای باوەڕدارێکی یەکتا پەرست؟!

(ئەلمهاتما غاندی) - سەرکردەی هیندی لەدوای (بوذا)- گەر بهاتایە وزەو توانای لەو هێزەی نوێژ دەیبەخشێ وەرنەگرتایە نزیك بو دابڕوخایە، چۆن دەتوانم ئەوە بزانم؟ بەوە دەزانم کە (غاندی) بۆ خۆی دەڵێ: ئەگەر بێ‌و نوێژم نەکردبایە زۆر لەمێژ بو شێت دەبوم.

وێڕای ئەوەش (غاندی) موسڵمان نەبو، بەڵکە کەسێکی گومڕا بو، بەڵام ئەو ڕێڕەوەی [٤٨٠] گرتبوەبەر، کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ... هەرگا [٤٨١] سواری کەشتی دەبن، بە دڵی پاك لەبەر خوا دەپاڕێنەوە، ﴿٦٥﴾ العنكبوت ﴾.

﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ... یا ئەو کەسەی چاترە کە هەروەختێ هومێد بڕاوێك لەبەری بپاڕێتەوە، دە هانای دێ، ﴿٦٢﴾ النمل ﴾.

﴿ ...وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ... کاتێکیش کە زانیان هەر چار دەوریان گیراوە، بەو پەڕی بڕوای پاکەوە لە خودا دەپاڕێنەوە، ﴿٢٢﴾ یونس ﴾.

وتەو گوتەی زۆرێ لە زاناو مێژووناس‌و وێژەرانی ئیسلامم هەڵسەنگاندوە، ڕستەو دەستەواژەیەکم بەرچاو نەکەوتوە واتای نیگەرانی‌و دڵەڕاوکێ‌و نەخۆشی دەرونی ئەوان بگەیەنێ، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەوان لەگەڵ ئایینی خۆیاندا بە هێمنی‌و ئارامی ژیان، بۆیە ژیانیان دور لە ئاستەنگ‌و [٤٨٢] گرێ‌و گاڵ بو:

---

٤٨٠) بۆچونەی/ هەڵوێستەی.

٤٨١) هەر کاتێ.

٤٨٢) گێچەڵ.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ... ئەوانیش کە خوداناس‌و ئاکار چاك بون‌و بەم قورئانەش - کە ڕاستەو لە پەروەرندەیانەوە بۆ محەممەد بە خەڵات هاتۆتە خوارێ - باوەڕیان کرد، خودا هەمو گوناهەکانیانی پۆشی‌و کاروباری ژیانیانی بۆ ڕەخساندن، ﴿٢﴾ محمد ﴾.

گوێ بۆ ئەو وتەیەی (ئەبو حازم) هەڵخە [٤٨٣]، کە دەڵێ: ((تەنیا یەك ڕۆژ لە نێوانی من‌و دەسەڵات داران دا هەیە، بەڵام ئەو ڕۆژەی ڕابرا ئەوان چێژی لێ وەرناگرن، لەمەڕ سبەینێش من‌و ئەوان لە چاوەڕوانی داین، تەنیا ئەو ڕۆمان لەبەردەستە، ئاخۆ ئیمرۆ چۆن‌و چی بێتە ئاراوە؟!)).

لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: (( اللّهم اني اسألك خير هذا اليوم بركته و نصره و نوره و هدايته" پەروەردگارا داوای خێرو چاکەی ئەو ڕۆت لێ دەکەم: لە پیت‌و فەڕو، سەرکەوتن‌و ڕۆشنایی‌و ڕێنماییەکەی)).

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ... ئەی گەلی باوەڕداران! هەمیشە هۆشی خۆو هەبێ، ﴿٧١﴾ النساء ﴾.

﴿ ... وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ... بەزیرەکی [٤٨٤] ببزوێنەوەو [٤٨٥] هیچ کەسیش پێتان نەزانێ، ﴿١٩﴾ الكهف ﴾.

﴿ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ ... هەر ئەوەندەیان ئەدرکاند، دەیانگوت: ئەی پەروەرێنمان! تۆ لە گوناهان‌و لە ئەندازە لادانمان ببورەو جێ هەنگاومان پتەوتر کەو بەسەر خودا نەناساندا زاڵمان بکەن. ئەوسا خودا پاداشی ئەم دنیاو چاکە پاداشی ئەو دنیای پێدان. ﴿١٤٨﴾ آل عمران ﴾.

---

٤٨٣) بگرە.

٤٨٤) بە وریایی.

٤٨٥) بجوڵێتەوە.

## خەمگین مەبە ژیان زۆر لەوە کورت ترە، کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە

"وایلێ کارنیچی" داستانی پیاوێ دەگێڕێتەوە کە بە برینی ڕیخۆڵە گیرۆدە بو، نەخۆشیەکەی ئەوەندە ترسناك بو پزیشکان کاتوساتی مەرگیان بۆ دەست نیشان کردبو، هەتا پێیان ڕاگەیاند کە کفنی بۆ خۆی ئامادە بکا. (وایلێ... دەڵێ: لە ناکاوێ نەخۆشەکە - کە ناوی "هانی" بو - بڕیارێکی سەرسوڕمێنیدا، بەو شێوە بیری لە خۆی کردەوە: باشە ئەگەر لەو ژیانەدا ماوەیەکی کورتم مابێ، بۆ بە هەوەسی خۆم لەو ماوەیە چێژ وەرنەگرم، چەند لەمێژە خولیای ئەوەم بە چوار دەوری زەویدا گەشتێ بکەم، ئەو هەلەی ئێستام ئەو هەلەیە ئاواتی خۆمی تێدا بێنمە دی. پاسەپۆرتی ئەم گەشتەی کڕی، پزیشکەکانی واقیان وڕما، پێیان گوت: ئێمە لەوە ئاگا دارت دەکەینەوە، کە بتەوێ ئەو گەشتە ئەنجام دەی ئەوا گۆڕەکەت دەکەوێتە ناو قولایی دەریا!! بەلام بەو جۆرە وەڵامی دانەوە: نەخێر، ئەوەی ئێوە دەیڵێن هیچی ڕونادا، من بەڵێنم بە خزمەکانم داوە تەنیا لە گۆڕستانی خانەوادەم بنێژن. "هانی" سواری گەشتی بو، چاوی لەو شیعرەی (خەیام... کرد کە دەڵێ:

**وەرە بۆ مرۆڤایەتی داستانێ تۆمار کەین**
**بە شیرنایی شەو کۆڕان تەمە نمان تێپەڕدەین**
**بەخەوی قولێ تەمەنی کورت درێژ نابێ**
**بە شەو نخونی شەوانیش تەمەنی درێژ کورت نابێ**

ئا ئەوە چەند دێرە شیعرێکن کەسێکی خوانەناس دەیانهونێتەوە.

(هانی) دەستی بەو گەشتە پڕ لە ئارامیو بەختەوەریە کرد، نامەیەکی بۆ خێزانەکەی دەنێرێو تیایدا دەڵێ: لەسەر پشتی کەشتیدا ئاو دەخۆمەوەو ئەوەی بە چێژو خۆشە دەی خۆم، چەند هەڵبەستو هۆنراوەم هۆنیوەتەوە، جۆرەهای خۆراك دەخۆم هەتا ئەو چەوریەی لێم قەدەغە کرابو، لەو ماوەیەدا ئەوەندەم بە خۆشی بەسەر بردوە کە لە ژیانی خۆمدا خۆشی وەهام نەبینیوە.

پاشان چی؟! دوای ئەوە (دایل کارنیجی) لای وایە کابرا لە نەخۆشی چاك دەبێتەوە، ئەو شێوازو ڕەفتارەی پیادەشی کردوە شێوازێکی سەرکەوتو بوە بۆ بن بڕکردنی نەخۆشیو زاڵ بون بەسەر ئەشکەنجەدا!!

من لەگەڵ ئەو چەند دێرە هۆنراوەی (خیام)دا کۆك نیم، چونکو لە پەیڕەوی پەروەردگاری لایان داوە، بەڵام مەبەست لەو داستانە ئەوەیە، کە: شادیو گوشادیو ئاسودەییو بەختەوەری چەندین پلە لە داودەرمانی پزیشکی سودمەندترن.

## ئەگەر بایی ئەوەندەت هەبێ چاوت لە دەستی کەس نەبێ جێی خۆی نیە دڵت پەست بێ

﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ... سامانیشو منداڵی زۆر لەوانە نین لە ئێمەو نزیککاتەوە، مەگین کەسێ بڕوای بە ئێمە هێنا بێو ئاکاری چاك ڕەچاو بکا، کە لە بەرابەر کردەیان دو سەرە پاداش ئەگرنو بێ دەغدەغە [٤٨٦] لە ئۆدەکانی [٤٨٧] بەهەشتا دەسێنەوە، ﴿٣٧﴾ سبأ ﴾.

(دایل کارنیچی) دەڵێ: "بە پێی سەرژمێری کردن دەرکەوتوە کە نیگەرانیو دڵاو دڵی [٤٨٨] بە بکوژی پلە یەك دێن لە ئەمریکا لە ماوەی ساڵانی جەنگی جیهانی دوەمدا، لە ڕۆڵەکانمان نزیکەی سێیەکی ملیۆنێك سەرباز گوژران، هەر لەو ماوەیەشدا دو ملیۆن کەس بە نەخۆشی دڵ گیانیان لەدەستدا.

ملیۆنێکیش لەو دوانە نەخۆشیەکەیان لە نیگەرانیو گرژبونی دەماری هەست سەری هەڵدا بو".

---

٤٨٦) بێ کێشەو بێشە.

٤٨٧) لە هۆدەکانی ژورەکانی.

٤٨٨) دو دڵی.

بەڵێ بێگومان نەخۆشی دڵ لەو هۆکارە سەرەکیانەیە وا لە دکتۆر (ئەلکسیس کاریل) دەکا، کە بڵێ: "بێ سۆ [٤٨٩] پیاوانی پیشەگەر ئەوانەی نازانن چۆن دڵە ڕاوکێو نیگەرانی تارو مارکەن [٤٩٠]، هەر سەر لە بەیانی دەمرن".

هۆکارەکە سەلمێنراوە، کاتو ساتی مردنیش بە ویستو دەسەڵاتی خوایە:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ... هیچ کەسێکیش بە بێ ئیزنی خودا نامرێ، کە مردنی هەر کەسێکیش وەختەکەی بۆ دانراوەو لە لای خوداوە نوسراوە، (١٤٥) آل عمران ﴾.

کەموایە ڕەش پێستەکانو چینی یەکان بە نەخۆشیەکانی دڵ گیرۆ دەبن، چونکێ ئەوان نەتەوەیەکن بە نەرمو نیانی ژیانیان دەگوزەرێنن، تۆ دەبینی ژمارەی ئەو پزیشکانەی بە لەکارکەوتنی دڵ گیانیان لە دەست دەدەن ژمارەیان بیست هەندی ئەو کشتیارو [٤٩١] وەرزێرانەیە کە بە خودی ئەو نەخۆشیە دەمرن، بێگومان ئەو پزیشکانە ژیانێکی زۆر توندو ئاڵۆز بەسەر دەبەن، بۆیە ئەو باجەی دەیدەن گرانە. "پزیشکەو چارەسازی خەڵکانە کەچی خۆی لە دەردەدارانە!!".

## لەوەی بەردەستت ڕەزامەندی بنوێنی خەمو پەژارەت نامێنێ

لەو فەرمودەیەشدا هاتوە: "ولا نقول الأ ما يرضي ربنا" تەنیا ئەوە دەڵێین کە خوا پێی قایلە".

بێگومان تۆ ئەرکێکی پیرۆزت لەسەر شانە، ئەویشیان ئەوەیە ئەگەر کارەساتێ دەورەت بگرێ کە هەر دەبوایە ببێ خۆت بەدەستەوە بدەیو ملت بۆی کەچ بێ، تاوەکو سەرەنجام لە بەرژەوەندی تۆ بێو، دوا ڕۆژ لەبەرژەوەندی تۆ بێ، چونکە بە سای ئەو ملکەچیە لە گێچەڵی دارمانێکی ڕاستەوخۆو تێشکانێکی لەمەولا ڕزگارت دەبێ.

---

٤٨٩) بێگومان.

٤٩٠) لە ناو بەن.

٤٩١) جوتیار.

هیچ چارەو دەرتانێ شك نابەی مەگەر متمانە بە قەدەری خوا بكەی، ئەگەر بێ‌و بەرگ‌و پۆشاكی بەرت هەڵدڕیی‌و، پێستی لاشەت دادڕی، دڵنیا بـە هـەر دەبـێ بڕیـارو چارەنوسی خوا سەربگرێ!!

لە كتێبی (ئیمرسـۆن... بـە ناونیـشانی (توانـای كـار ڕاپەڕانـدن...[492] گوازراوتـەوە، كاتێ دەپرسێ: "لە كوێوە ئەو بۆچونەمان بۆ دروست بوە كـە دەڵـێ: ژیـانێكی خـۆش گوزەرانەو جێگیر بو دور لـە كۆسپ‌و تەگـەرە بەختـەوەران‌و گـەورە پیـاوان دروسـت دەكا؟ بێ گومان بارودۆخەكە پێچەوانەیە، ئەوانەی لەسەر شیوەن‌و دڵگیری ڕاهـاتون هەرچەندە لە سەر ئاوریشم بخەون‌و كامە پۆشـاكی گـران بەهایـە لەبـەری كـەن ئـەم شیوەن‌و ڕۆڕۆیە لە خۆیان بە دور ناخەن.

مێژو گەواهی بەوە دەدا كە ئەو خوایەی جڵەوی شكۆداری‌و بـەختیاری لـە دەسـتە دەیخاتە بەردەستی كەسانێ لە جۆرەهـا ژینگـەدا ژیـان بەسـەردەبەن، ئـەو ژینگەیـەی پـاك‌و پـیس لێـی دەگوزەرێنـێ، ئـەو ژینگەیـەی جیاكـاری نەخـستۆتە نێـوانی چـاكە كاران‌و چەپەڵكاران، لەم جۆرە ژینگانە پیاوانێكی وا ڕەخساون باری بەرپرسـیارێتیان خستۆتە سەرشان، ئەم ئەركە بەهی خۆیان دەزانن‌و پشت گوێی ناخەن".

بێگومـان ئەوانـەی لـە ڕۆژانـی یەكـەمی بانگـەوازی پێغەمبەرایەتیـدا مەشـخەڵی ڕێنوێنی خوایان بەرز هەڵكرد[493]، كۆیلەو هەژارو بێ چارەكان بون، زۆربەی ئەوانەش كـە بـەرەو دواوە پـشتیان لـەو بـاوەڕە پـیرۆزە كـرد ئـەو سـەرپێچی كـارو لاسـارو پیاوماقوڵ‌و خۆش گوزەرانا نەبون: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ... هەر كاتێكی نیشانانی دیاریدەری ئێمەیان بۆوە خوێندرێ، خوا نەناسـان بـە خـاوەن بـاوەڕان ئێـژن: كامـە لەهـەردو لایـان مـاڵی خۆشترەو دیوەخانی لەبارترە؟ (٧٣) مريم ﴾.

﴿ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ... گوتوشـیانە: ئێمـە لەمـەڕ ماڵی دنیاو منداڵەوە لە ئێوە پتـرمان هەیەو هەرگیز توشی ئازار نابین، (٣٥) سبأ ﴾.

---

٤٩٢) القدرة على الانجاز.

٤٩٣) بەرزكردەوە.

﴿... أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ... چلۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی وەبەر چاکەی خۆی خستوە؟ ئاخۆ خودا لەوان باشتر شوکر بژێران ناناسێ، ﴿٥٣﴾ الأنعام﴾.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ ... ئەوانەی خودا نەناسن، بۆ خاوەن باوەڕان ئێژن: ئەگەر هیچ شتێکی باشی تێدا هەبا، بەر لە ئێمەی بۆ نەدەچون، ﴿١١﴾ الأحقاف﴾.

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ ... خۆ بە زل زانەکان گوتیان: ئێمە لەوەی کە بڕواتان پێ هێناوە، حاشا دەکەین، ﴿٧٦﴾ الأعراف﴾.

﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ ... گوتیشیان: بۆ ئەم قورئانە، بۆ پیاوێکی بەوەجی ئەم دو بازێڕە[٤٩٤] نەهاتە خوار؟ ئاخۆ ئەوان بەزەیی پەروەرندەی تۆ دابەش دەکەن؟ ﴿٣٢﴾ الزخرف﴾.

منیش ئەو دێرە شیعرەی (عەنتەرە) وەیاد دەخەمەوە، پێمان ڕادەگەیەنێ کە نرخ و بەهای ئەو لە جوان مەردیو ڕەفتار بەرزیدا وەدی دەکرێ نە لە ڕەگەزو ڕەچەڵێدا، دەڵێ:

**ئەگەر بەندەو کۆیلەش بم، دەستکراوەو بەڕێزم**
**کە ڕوخساریشم ڕەش بێ پاک و خاوێنە پەڕێزم**

---

٤٩٤) ئەم دو شارە.

ئەگەر یەکێ لە ئەندامەکانت لەدەستداوە هێشتا چەند ئەندامێکت ماوە، ئیبن عەباس دەڵێ:

**گەر خوا بینایی دو چاوم لێ بستێنێ**
**رۆشنایی لەسەر زمان و ناو گوێچکەمدا دەمێنێ**

ئومێد وایە لەو بەڵاو مەینەتیەی بەسەرت دێ بەرژەوەندی تۆی لێ وەدی بێ، ﴿... وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ ... ڕەنگە لە شتێك حەز نەکەن بەڵام بۆتان وەخێر گەڕێ، ﴿٢١٦﴾ البقرة﴾.

سەرنج دە ئەو جیاوازیەی نێوانی وتەو هەڵوێستی ئیبن عەباس لەگەڵ کەسانێکی تردا بزانە ئەوان چ دەڵێن

هیچ چارە نیە فەرمانی خوا پیادە دەکرێ، لەسەر ئەوانەی پێی قایلن و ئەوانەش پێی نارازین، بەڵام ئەوەی کە پێی ڕازی یە پاداشتی پێ دەدرێ و بەختەوەر دەبێ، ئەوەی نارەزاییشی لێ دەنوێنێ تاوانبارو چارەڕەش دەمێنێ.

(عومەر)ی کوڕی (عەبدولعەزیز) لە وەڵامی نامەیەکیدا کە (میمون)ی کوڕی (میهران) بۆی ناردبو دەڵێ: پرسەی سەرەخۆشیت بۆ نوسیوم لەسەر مردنی (عبدالملك)، ئەوە فەرمانێك بو هەمیشە چاوەڕێی بوم، کاتێکیش کە ڕویدا سەرپێچی لێ ناکەم.

## ڕۆژگار دەستاودەستی پێ دەکرێ

دەگێڕنەوە (ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) - خوا سۆزی بۆ بنوێنێ - لەو کاتەی (بەقی) کوڕی (موخەلەد) نەخۆش دەکەوێ سەردانی دەکاو، پێی دەڵێ: "ئەی باوکی (عبدالرحمن)، بەوە دەستهێنانی پاداشتی خوا موژدەت لێبێ، ڕۆژانی ساخلەمی[٤٩٥] بێ دەردن، ڕۆژانی دەردیش بێ ساخلەمین..".

---

٤٩٥) تەندروستی.

ڕۆژانــی مــرۆ تیایــدا لــەش ســاخ بــێ نەخۆشــی بەخــەیاڵدا نایــێ، ورەی بــەرزە، خواستو ئومێدی زۆرن، زۆر لە بڵندی دەڕوانێ. ئەو ڕۆژانــەش کــە زۆر بــە نالــەباری دەگوزەرێنــێ، ساخی لــە یــاد نامێنــێ، خۆزگــەو خواستی دەپوکێنــەوە [٤٩٦]، ورەو وزەی وێك دێنەوە [٤٩٧]، بێ ئومێدو هیوا بڕ دەبێ.

وتەی پێشەوا (ئەحمەد) لەو فەرمودەیەی خوا وەرگیــراوە: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَـٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ... گــەر تــامی خۆشــیمان بــە مــرۆ چــێژاندو پاشان لێمــان ســتاندەوە، بــێ گومــان لــە ناهومێــدی مــل لــە ناسوپاســی دەنــێ. ئەگــەر پاشــی لێقــەومانیش شــادمانیمان پــێ تامانــد، هەڵبــەت ئێــژێ: قۆرتــەکانم لــێ ڕەویــون. بــە کەیفەو بە خۆی هەڵدەڵێ. مــەگین ئــەوی خۆڕاگرو ئاکار چاك بــون، بەشــی ئــەوان بوردنو پاداشی هەرە مەزن دەبێ، ﴿١١﴾ هود﴾.

زانای دانا (ئیبن کەسیــر) - خوا سۆزی بۆ بنێــرێ - دەڵــێ: خــوای گــەورە بــاس لــە مرۆڤو ڕەوشتی دزێوی دەکا، کە ئەگەر لــە دوای خۆشی ناخۆشی بەســەردا بــێ، ئــەوا لەمــەڕ فــەڕو چاکەی داهاتودا بــێ ئومێــدو ڕەشــبین دەبــێ، هــەروا لــە ئاســتی حــاڵو گوزەرانی ڕابردوشدا بێ باوەڕیو گومڕایی ڕوی تــێ دەکــا، هــەروەکو بڵێــی چــێژی بــە چاوی خۆی نەدیتبێو، ئومێدی لێ هەڵوەری بێ، مەگەر یــەکێ لــەو بەندانــەی وەبــەر میهری خوا کەوتبێ.

هەر بەمشێوەیە حاڵی ئەگەر لەدوای ناخۆشیی بەهرەیێ ڕوی تــێبکا: ﴿... لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ... ئێژێ: قۆرتەکانم لــێ ڕەویون. ﴿١٠﴾ هود﴾ .

واتــە دەڵــێ: لەمــەولا جــارێ تــر بــەڵابارو خاکەســار نــابم، ﴿...إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ... بەکەیفەو بە خۆیدا هەڵدەڵێ. ﴿١٠﴾ هود﴾.

---

٤٩٦) کۆ دەبن.

٤٩٧) بێهێز دەبن.

بەوەی لە دەستی دایە دڵ خۆشیو شادمانە، لە ئاستی خەڵكانی تردا لوت بەرزو خۆ بەزلزانە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ ... مەگین ئەوانەی خۆڕاگرو ئاكار چاك بون، بەشی ئەوان بوردنو پاداشی هەرە مەزن دەبێ، (١١) هود ﴾ .

## دەكرێ لەم زەمینە بەرفراوانەی خوادا وەدەركەوی

یەكێ دەڵێ: گەشت كردن خەم دەڕەوێنێ.

(ڕامە هورموزی) هۆشدارو بێ دار لە كتێبەكەیدا بە ناوی "المحدث الفاضل"، دەربارەی سودو كەڵكی بەدوادا گەڕانی زانستو ئەو تامو چێژەی لێی وەبەردێ، لە وەڵامی ئەوانەی ڕقیان لە گەشتەو بە خراپی دائەنێن بەم شێوەیە دەدوێ: "ئەوەی تانەو تەشەر لە گەشتیاران دەدات ئەگەر دەیزانی گەشتیاران لە گەشتو سەیرانیاندا چەندە چێژ وەردەگرن، لەو ساتەی لە نیشتمانی خۆیان بەدەردەكەون چەندە چوستو چاپوكن، گەشتیار لەو كاتەی ساتەكانی ژیانی لە حەساوگەو دەراوان[٤٩٨] بەسەر دەبا، لە شوێنی لا چەپو بەرچاودا دەگوزەرێنێ، چاوی بە پانتاییو شوێنە ڕازاوەكانی هەرێمو ناوچەكان، باخو بێستانو، مێرگو مێرغوزاران هەڵدێنێ، چەندین ڕوخساری گەشو درەوشاوە دەبینێ، لەو شارەو شارۆچكە سەرسوڕمێنانە دەڕوانێ كە بۆ یەكەم جارە بە بەرچاوی بكەوێ، گوێبیستی جۆرەها زمان دەبێو چەندین ڕەنگی لێك جیا دەبینێ، لە ژێر سێبەری دەرو دیوارو سەهەندو نزارگەدا پاڵ دەكەوێ، لە مزگەوتەكاندا نان دەخوات، لە دۆڵاییاندا ئاو دەنۆشێ، لە هەر شوێنێ شەوی بەسەردا بێ دەخەوێ، لە فیزو بەخۆ نازیو خۆ دەرخستن وازدەهێنێ هاوەڵایەتی ئەو كەسە دەكا كە لە ڕێی خوادا خۆشی ئەوێ، هەر گاه دڵی دەسرەوێ لە دەرەنجامی ئەوەیە بە ئاواتەكانی دەگات، بە خواستەكانی شاد دەبێو خۆی لەو كۆڕو

---

٤٩٨) ئەو شوێنەیە قەراخ ئاوێو مرۆ بتوانێ بگاتە سەر ئاوەكە.

کۆبونەوانە دەخنرێنێ کە بەدوایاندا وێڵەو دەگەڕێ، ماوەیەکە ڕێگای لەپێناو دادەبڕێ - ئەوسا دەزانێ کە هەمو تام‌و چێژی دنیا بریتییە لە نەخش‌و نیگاری ئەم دیمەنە دڵڕفێنەدا، لە شیرینی ئەم ڕوخسارەنەدا، لە شکاری [٤٩٩] ئەم بابەتە سودمەندانەدا، ئەوانەی لە لایەن خاوەنانی لە گوڵ‌و گوڵاڵەی بەهار بەهادارترن [٥٠٠]، لە کۆکردنەوەی گەوهەری شەوچرا [٥٠١] سەنگین ترن، بە ڕێژەیەکی وا کە تانە لێدەرو هاو وێنانیان لێی بێ بەشن".

## هەڵوەستەیەك

"ئەگەر خوای گەورە گەلێکی خۆش ویست تاقیان دەکاتەوە، جا هەر کەسێ قایل بو ئەوا ڕەزامەندی خوا وەدەست دێنێ، هەر کەسێکیش نا قایل بێ خەشم‌و قینی خوا وەدەست دێنێ".

"بەلاّ بارترین کەس پێغەمبەرانن، دوای ئەوان پێ بە پێ بە گوێرەی پلەی بەرزی خواپەرستی، مرۆڤ بە ئەندازەی دینداریەکەی تاقی دەکرێتەوە، جا ئەگەر دینداریەکەی توندو بەند بێ، تاقی کردنەوەی گەورە دەبێ، ئەگەریش دینداریەکەی کرچ‌و کاڵ بێ ئەو بە گوێرەی ئەو کرچ‌و کاڵیەی تاقی دەکرێتەوە، جا بەندەی بڕوادار هەمیشە تاقی دەکرێتەوە، تا وای لێدێ کە بەسەر ئەم زەویەدا دەگوزەرێ هەرچی تاوانە لێ هەڵوەراوە".

"کارو فەرمانی بڕوادار سەر سوڕمێنە هەمو هەڵس‌و کەوتێکی چاکەیە!! ئەوەش تەنیا بو باوەڕدار شیاوە، ئەگەر خۆشیێ بەرەو ڕوی هات سوپاسگوزاری خوایە بە چاکە بۆی دائەنرێ، ئەگەریش ناخۆشیێ ڕوی تێ بکا ئارامی لەسەر دەگرێ بە چاکە بۆی دائەنرێ".

---

٤٩٩) لە ڕاوکردن و بەدوا گەڕانی.

٥٠٠) بەسودترن.

٥٠١) ئەو گەوهەرەی لە شەودا دەتریسکێ.

((دڵنیابە ئەگەر هەمو جیهان کۆبێتەوە تاوەکو سودێکت پێ بگەیەنێ ناتوانن مەگەر بە شتێك خوا بڕیاری لەسەردا بێ، ئەگەریش بۆ ئەوە کۆببنەوە زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن مەگەر بە شتێك خوا لەسەرتی نوسیبێ)).

(( پیاو چاکان پێ بە پێ بە پێی پلەی چاکەکاریان تاقی دەکرێنەوە)).

(( بڕوادار وەکو کشتوکاڵی تەڕو ناسك وایە با بە لای ڕاستو چەپدا دەیهێنێو دەیبا [٥٠٢] )).

## لە دوایین ساتەکانی تەمەنت دا ناهومێد مەبە

سەرنج دە ئەبو رەیحانی بەیرونی کە لە ساڵی ٤٤٠ ك کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ تەمەنێکی پڕ بەهادا ٧٨ ساڵ ژیانی بەسەر برد کردو کۆشو هەوڵو گەڕی لە پێناوی بەدەست هێنانی زانست بو، بە دانانی چەند کتێبێکەوە سەرقاڵ بو، دەرگای لە ڕوی زانستدا دەکردەوەو بە وردو درشتو ئاشکراو نهێنی زانستەکان ئاشنا بو، هەمیشە پێنوسی لە دەست بو، چاوی هەر لە ڕوانینی کتێب بو، بیرو هزری هەر لە گەڕ بو، مەگەر بە ئەندازەی دابین کردنی پێداویستیەکانی ژیانی وەکو پەیدا کردنی بەرگو پۆشاكو نانی، جگە لەمە خوونەریتی وا بو لە هەموکاتو ساتەکانی ژیانیدا: زانستێکی وەهای بەرهەم دێنا پەچەی سەڕوی ڕادەماڵی، دەری ئەخست شانو شەوکەتو باڵی.

(عەلی) کوڕی (عیسا) ناسراو بە (ئەبولحەسەن) زاناو شەرعزان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: چومە لای (ئەبو ڕەیحان) لە کاتێکا گیانی ئەداو لەسەرە مەرگدا بو کۆتا هەناسەی هەڵدەکێشا، سینەی بە گیانی تەنگ بو، ئا لەم حاڵە نالەبارەدا پێی گوتم:

منیش پێم گوت: لەمەڕ ئەودا پیرانەی لە بەشە میراتدا بێ بەشن ڕۆژێکیان چیت پێ گوتم: ئا لەم کاتەدا؟! لە وەڵامدا گوتی: ئەی فلان: کاتێ ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکەم باشتر نیە لەو مەسەلەیە شارەزا بم، نەوەك بە نەزانی جێی بهێڵم؟!

---

٥٠٢) تێبینی: ئەوانە واتای چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەرن ﷺ .

منیش بۆم دوبارە کردەوە، لەبەری کردو ئەوەی بـەڵێنی پـێ دابـوم پێـی وتم هـەر لەلای ڕۆیشتمو گوێبیستی هاوارو شیوەن بوم[٥٠٢]!!

ئا ئەوە ئەو ورە بەرزیەیە کە گومەزی ترسناکیەکان ڕیشەکێش دەکاو لەبن دێنێ.

(عومەر)ی دادوەر کاتێ لە سەرەمەرگ دابو، خوێن لە برینی هەڵئەچۆڕا، پرسـیار لە هاوەڵان دەکا: ئاخۆ نوێژەکەی تەواو کرد یان نا؟!

(سەعد)ی کـوڕی (ڕەبیـع) لـە جـەنگی (ئوحـود)دا خـەڵتانی خـوێن بـو، لـە کاتێکا دوایین هەناسـەی ژیـانی هەڵدەکێـشا دەپرسـێ پێغەمبـەری خـوا چـی بەسـەرهات، ئـا ئەوەیە خۆڕاگریو دڵ بێداری!

## با خەمناکی نەتگـرێ گەر کـتاو پڕ مـەرگ یەخەت بگـرێ گوێـبیستی ئـەم داسـتانەش بەشـە

(ئیبراهیم)ی کوڕی (جەراح) دەڵێ: (ئـەبو یوسـف) نـەخۆش کـەوت منـیش چـومە حاڵپرسی[٥٠٤]، بینیم بێ هۆش کەوتوە، کاتـێ بـە هـۆش هاتـەوە پێـی گـوتم: دەربـارەی یەکێ لە بابەتەکان چ دەڵێی؟ گوتم: ئا لـەم حاڵـەدا؟! گـوتی: ئاسـاییە بەڵکـە بـە سـای ئەم لێکۆڵینەوەیە دەرباز بین.

دوای ئـەوە گـوتی: ئـەی (ئیـبراهیم) لـەم دوڕایـە کامـەیان پەسـندە لەمـەڕ ڕەمـی کردنی شەیتانەکان: بە ڕۆیشتنەوە پیاو بەردەکان بهاوێژێ یا بە سواری؟

گوتم: بە سواری. گوتی: هەڵەت کـرد. گـوتم: بـە ڕۆیـشتنەوە. گـوتی هەڵـەت کـرد. گوتم: دەی کامەیان باشترە؟ گوتی: ئەوەیان کە وەستانی لە لا دەکـرێ باشـتر وایـە بـە ڕۆیشتنەوە پێی دابکێشێ، ئەوەشیان کە وەستانی لە لا ناکرێ، باشتر وایـە بـە سـواری پێیدا بکێشێ، دوایی ئەمە لە لای ڕۆیشتم هێشتا نەگەیشتبومە بەر دەرگای ماڵی کـە گوێ بیستی هاوارو ڕۆڕۆی لەسەر گریانی بوم، لە ناکاوێ گیانی سپارد، سۆزو میهـری خوای بەسەردا بڕژێ.

---

٥٠٣) کۆچی دوایی کرد.

٥٠٤) سەردانی.

یەکێ لە نوسەرانی سەردەم دەڵێ: ئەوان بەو شێوەیە بون!! یەکێ لەوان مەرگ بە خۆیو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەوە یەخەی دەگرت، مردن تەنگی پێ هەڵئەچنی، بێ هۆشو زەین دەبو، ئەگەر ماوەی چەند چرکەیێ هۆشی وەبەردەهاتەوەو کەمێ دەهاتەوە سەرخۆی، دەربارەی هەندێ مەسەلەو بابەتی زانستی یا سوننەتی دەکەوتە گفتوگۆ، بۆ ئەوەی فێری بێ یا خەڵکی لێ فێر بێ، کەچی لەو بارە نالەبارەی دابو کە مەرگ بەرۆکی پێ دەگرتو بەری هەناسەی لێ دەگرت.

ئەی خوایە زانستو زانیاری چەندە لە ناو دڵیانا سەنگین بو!! چەندە بیرو ژیریان پێیەوە سەرقاڵ بو!! بە ئەندازەیەکی وا لە کاتی گیانەڵاو[٥٠٥] مەرگدا، بیری هاوسەرو منداڵیانو دۆستو ئازیزانیان نەدەکرد، بەڵکە تەنیا زانست یان لە یاد بو!! سۆزو میهری خوای بەرزو توانا بڕژێ بەسەریانا، هەر بە سای ئەمە بو بون بە سەر مەشقو پێشەنگی زانستو خواپەرستی.

## لە ئاهی کارەساتان مەشڵەژێ تۆ لە نهێنیو سەرەنجامی کاران تێناگەی

(ئەحمەد)ی کوڕی (یوسف) وێژەرو نوسەرو مێژونوسی میسری لە کتێبە سەرسوڕمێنو ناوازەکەی دا بە ناونیشانی "الـمكافأة، حُسْنُ العقبى" هێناویەتیو دەڵێ: بێ گومان مرۆڤ دەرکی بەوە کردوە، کە گومانی تێدا نیە دەبێ لەژێر چەپۆکی خەمو کلۆڵی ئازاد بێ هەروەکو دەزانێ شەو لە ڕۆژ جیادەبێتەوە، بەڵام لە کاتیدا بارانی بەڵاو مەینەتیدا بێ زاڵەییو[٥٠٦] وره بەزیوی لە هەموشتێ پتر لە ناخی مرۆڤدا وەدی دەکرێ، جا ئەگەر بە داوودەرمان چارەی نەکرێ، دەردەکە توند تر دەبێ، پەژارەش زێتر دەبێ، چونکێ ئەگەر لە کاتی بەڵاو مەینەتیدا دەرون بەو شتە زاخاو[٥٠٧] نەدرێ، کە ورەو وزەی وەبەر دێنێتەوە، بێ ئومێدی باڵی بەسەردا دەکێشێو ڕیشەی لە بن ڕاهەڵدەکێشێ.

---

٥٠٥) گیان کێشان.

٥٠٦) ترسەنۆکی.

٥٠٧) بەهێز.

وردبونەوەو سەرنجدان لەو باسو خواسە - باسو خواسی ئەوانەی بەربەلابونو ئارامگر بون، بەرهەمی ئارامگرتنیان پاشە ڕۆژێکی گەشەدار بو- ئەو تینو وزە بەخشەیە دڵو دەرون لەسەر بوێری[٥٠٨] ڕادێنێ، بەهۆی گەش بینی لەمەڕ دەرەنجامی تاقی کردنەوەی، لەسەر هەمیشە ئارامگریو هەڵسو کەوتی جوانی لەگەڵ خوای بەرزو توانادا مەشقی پێ دەکا.

بە هەمان شێوە لە کۆتایی کتێبەکەیدا دەڵێ: "کۆتایی: (بزر جمهر) دەڵێ: سەخڵەتی بەر لە بەهرەو بەخششان، بە وێنەی برسێستیە بەر لە خواردنی نان، بە سای ناخۆشی پلەو پایە زیاد دەبێ، لەگەڵ خواردنیش چێژ وەردەگیرێ".

(ئەفلاتون) دەڵێ: "ناخۆشیو تەنگژەکان چەندە ژیانو ئاسودەیی تێك دەدەن بە ئەندازەی ئەوە قازانجو سود بە ناخو دەرون دەگەیەنن، واتە خۆش گوزەرانیو حاڵ خۆشی وێرانکاری دڵو دەرونن بە ئەندازەی ئەوەی ژیان خۆش دەکەن".

هەروەها دەڵێ: هەر هاوەڵو دۆستێك لە تەنگو چەڵەمەدا بوە بە هاوڕێت دۆستایەتی لەگەڵ مەپچڕێنە، هەر هاوەڵێکیش لە خۆشیدا بوە بە هاوڕێت پشتی لێ هەڵکە".

هەروەها دەڵێ: "خۆشگوزەرانی وەکو شەو وایە ئەوەی لە شەودا لە دەستت دەڕوا یا دێتە دەستت بیری لێ ناکەیتەوە، تەنگانەو ناخۆشیش وەکو ڕۆژ وایە، گردو کۆشی خۆتو خەڵکانیشی تێدا دەبینی".

(ئەزدەشیر) دەڵێ: "سەخڵەتی کلی چاوانە ئەوەی بە سای ئەوەوە بە بەرچاوانت دەکەوێ بە سای خۆش گوزەرانی نایبینێ".

هەروەها دەڵێ: هەوێنی بەرزەوەندی کارو مەبەستان لە ئاستەنگو شێواویدا دو شتە: گچکەترینیان ئەو هێزەیە خاوەنەکەی لەو شتەی دوچاری دێ لای بدات، گەورەتریشیان ئەوەیە بەڕاستو دروستی خۆی بداتە پاڵ پەروەردگارو ڕۆزی دەری".

ئەگەر مرۆڤ بە بیرو هزری پەنای بۆ پەروەرێنی هێنا، دڵنیا دەبێ کە خوای گەورە تەنیا بەوە تاقی دەکاتەوە پاداشتی لەسەر بداتەوە، یا لە تاوانێکی گەورەی

---

[٥٠٨] ئازایەتی.

پاك بكاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لە لایەن خواوە سودو قازانجی پێ دەگا، پەیتا پەیتا[٥٠٩] بەهرەی خوای بەسەردا هەڵدەڕژێ.

وەلێ ئەگەر لە ئاستی بونەوەردا بە توندی بیر کاتەوە، چەپەڵکاری زۆر دەبێ، لە ڕوبینی زیاد دەکا، لە بەهاو ڕێزی بێزاری دەنوێنێ لەمەڕ ئەو کەمو کورپەی لە بیر کردنەوەیدا هاتۆتە ئاراوە، بە ڕێژەیەکی وا درێژە بە ناسۆری ژیانی ئەدا، کە خەریکە لەو ڕۆژەی خۆی لەناو با، بە شێوەیەکی وا لە دەردو بەلایان دەترسێ، کە پێی وایە بەم چەشنە لەسەری لادەچێ.

هەر لەبەر ئەمە پاڕانەوەی بەندە لە نێوان خۆیو خوایدا بەڕەوا زانراوە، چونکێ خوا بە ڕازو نهێنیان ئاشنایەو ئەوەی لە پاش پەردەیە لە لای ئەو ڕونو ئاشکرایە، کەچی ئەو نهێنیە لە نێوان خەڵکدا بەربەستی زۆری لەبەردەم دایە، لە دەرەوی بازنەی بەرژەوەندی دایە.

لەو کاتەی بەندە بێ ئومێد دەبێ خوای گەورە پشوو هەنسکێك لە لایەن خۆیەوە ئەنێرێ، بەسەر هەر کەسێدا خۆی بیەوێ لە دروستکراوەکانی، ئاسانکاریو ئومێدی ڕزگاریو، ئەوپەڕی خواستو مەبەستیش لە دەرگای ئەودا چاوەڕوان دەکرێ، هەر ئەویش بەسمانەو باشترین پشتیوانمانە.

لە کتێبی "الفرج بعد الشدة" دانراوی (تەنوخی) ورد بومەوەو چەند جار خوێندومەتەوە ئەو سێ سودو قازانجەم لێ وەدەست هێناوە:

یەکەم: لێبونەوەی دەروی خێر لە دوای تەنگانە دابو نەریتێکی دێرینەو داوایەکی سەلمێنراوە، هەروەکو سەرپێچی لەوە ناکرێو گومانی تێدا نیە، کە دوا بە دوای شەو بەیانی دادێ.

دووەم: مەینەت باریو کلۆڵی زۆرجاران لە خۆشیو شادی بەهەرمێنترو سودبەخشترە بۆ بەندە لە دنیاو دوارۆژیدا.

سێیەم: بە دڵنیاییەوە ئەوەی زەرو زیانی لەدەستە تەنیا ئەو خوایەیە کە بەرزو شکۆدارە، گومانیشت نەبێ ئەوەی خوا بیەوێ بەسەرت بێ دەبێ هەر ببێ ئەوەیشی خوا نەی هەوێ ببێ ناکرێ بەسەرت بێ.

---

٥٠٩

## خەمبار مـەبە دنیا هـەندەی نایەنێ تۆی لە پێناودا بمێنـێ

زانـای بـەناوبانگ (ئـیبن موبـارەك... دەڵـێ: هـۆنراوەی (عـدی) کـوڕی (زیـد)م لا خۆشەویستترە لەوەی کۆشكو تەلاری (امیـر تاهیـر)ی کوڕی (حسین)م هەبێ.

ئەویش ئەو هۆنراوە سەرنج ڕاکێشو ناوازەیە، کە ئەمە بەشێکی تی:

ئەی ئەو کەسەی لە ڕۆژگار تانەوتەشـەر دەگری
مـەگـەر لات وایـە تـۆ لە هەڵـەو تاوان بەری؟
یـاخـــود لـەگـەڵ ڕۆژگـــاردا بـــەڵێنـــت داوە
واتێنـەگـەی، بەڵکـە نـەزانـیو لێـــت گـۆڕاوە

واتە ئەی ئەو کەسەی بـە بـەڵاباری خـەڵکان شـادمانی، تـۆ پـەیمانت پـێدراوە کـە بەڵایەکی وەکو ئەوانت بەسەر نێ؟! یا ڕۆژگار بەڵێنی لەگەڵ بەستوی لەسـەر ئـەوەی لە هەمو کۆستو کۆسپێکی ژیـان ڕزگـارت بـێو هـیچ کارەسـاتو ئاسـتەنگێ یەخـەت نەگرێ؟! دەی کەوایە ئەو بەدیو چاو تێ بڕیەت لە چی دایە؟

لە فەرمودەیەکی ڕاستو ڕەوادا هاتوە: (( لو ان الدنیا تساوي جناح بعوضة، ما سقی الکافر منها شــربة ماء... ئەگەر دنیا بارتەقای بـاڵی مێشولەیێ لـە لای خـوا سـەنگی هەبوایە، تەنیا قومە ئاوێکی لەم دنیایەدا نەدەدا بە هیچ بێ باوەڕێ)).

بێگومان دنیا لە لای خوا لە بـاڵی مێـشولەیێ بـێ بایـەخ تـرە، ئـا ئـەوە ڕاسـتێتیو سـەنگـو نرخـی دنیایـە، کەواتـە بۆچـی ئـەو خاکەسـاریو قـوڕ پێوانـەی لەسـەرو لـە پێناودا بکرێ؟! بەختەوەری لەوەدایە: لەمەڕ خۆتو خاوخێزانتو بژێوی ژیـانو دوا ڕۆژت دا هەست بە مەترسی نەکەی، ئەو بەختەوەریـەش کـە بریتیـیـە لـە بـاوەڕ بـە خوا بونو بە بڕیارو چارەنوسی خوا قایل بونو، بە بەشی خۆ ڕازی بون: هەموی لە ئارام گرتنەوە فەراهەم دێ.

## تۆ باوەڕت بە خوا هەیە خەمناك مەبە

﴿ ... بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ ... بەڵام خودا منەت لەسەر ئێوە دەکا، کە ڕێگای بڕوا هێنانی نیشان داون، ﴿١٧﴾ الحجرات ﴾.

یەکێ لەو بەهرەو بەخششانەی تەنیا ژیریارو هۆشداران دەرکی پێ دەکەن ئەوەیە: بڕوادار سەرنجی بێ باوەڕ دەدا، ئەو چاکەو خەڵاتەی خوات دێتەوە یاد، کە لە ڕێنمایی‌و هیدایەت دایە بۆ ئاینی ئیسلام، هەست دەکەی خوای بەرزو بێ هاوتا تۆی وەکو ئەو بێ باوەڕە دانەناوە، کە بەرامبەر پەروەردیاری سەرپێچی کارو یاخیە، نکۆڵی لە ئایەتەکانی دەکا، لە ڕەوشتە جوانەکانی لاملی دەکا، لە ئاستی ڕۆژی دەرو بەدیهێنەریدا ڕەقەکارو دژە کارە، پێغەمبەرانی خواو پەیامەکانی بەدرۆ دەزانێ، لە فەرمانی لوت بڵندی دەکا، دوای ئەوە بیر دەکەیتەوە کە تۆ موسڵمانێکی یەکتاپەرستی، بە خواو پەیامبەرانی‌و دواڕۆژ بڕواداری، ئەرکی سەر شانت ئەگەر چی بە کەم تا کورتیش بێ بەجێ دەهێنی، بێگومان ئەوە خۆی لەخۆیدا بەهرەیەکە بە هیچ قیمەتێ ناخەملێن ڕێو بە هیچ سامانێ نافرۆشرێ، بە مەزەندەی کەس مەزەندە ناکرێ، لەوەی بە بەرچاوانت دەکەوێ هاو وێنەی نابێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ... چۆن کەسێ بڕوای هێناوە، وەك ئەوەیە کە لە ڕێی خودا لای داوە؟ وەك یەکتر نین، ﴿١٨﴾ السجدة ﴾.

هەتاوەکو هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان باس دەکەن کە یەکێ لە بەخشش‌و خەڵاتی بەهەشتیان ئەوەیە تەماشای دۆزەخیان دەکەن، سوپاسی پەروەرێنیان دەکەن لەسەر ئەو بەهرەیە، "بە سای بێ باوەڕیش هەموشتێ دابڕ دابڕ دەبێ".

## هەڵوەســـتەیــەك

لا اله الا الله: واتە جگە لە خوای تاقانەو توانا هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیـە، چونکێ هەر ئەو خاوەنی ڕەوشتی خوایەتیە، ئەو ڕەوشتانەی نیـشانەی بـێ لەکـەیی‌و ئەوپەڕی تەواوین.

ڕازو نهێنی ئەو وشەیە لەوەدایە: هەر ئەو خوایە گەورەیـەو سوپاسـندەیە، بـەرزو پیرۆزە ناوو ڕەوشتە جوانەکانی، هەرە زاڵەو دەسەڵاتی بێ سنورە، هەر ئەو شیاوە بە پەرستن‌و، خۆشویستن‌و ڕێزلێنان‌و بە گەورە دانان، بە لێ ترسان‌و ئومێد پـێ هـەبون، ئەوانەش، کە دوا بـە دوای ئەوانـە دێـن وەکـو پـشت پـێ بەسـتن‌و بـۆ لا گەڕانـەوە، لێ چاوەڕوان کردنی قازانج‌و زیان، تەنیا هەر ئەوی خۆشـبوێ، هـەر چـینێکیش خۆشـی دەوێ لە خۆشەویـستی ئـەو بـێ‌و، هۆکـاری پـتر خۆشویـستنی بـێ، تـرس‌و بیمـی هـەر لـەوی بـێ، چـاوی تـەنیا لـە دەروی خێـری ئـەوو هـەر بـە هیـوای کۆمـەکی ئـەو بـێ، ئارەزوو خواستی بۆ لای خودا بێ تەنیا بە سام‌و هەیبەتی ئەو خوایە ڕابچڵەکێ، هەر بە ناوی خوا سوێند بخوا، تەنیا بۆ ئەو لـە خـۆ بگـرێ‌و، هـەر بـۆ ئـەویش پەشـیمانی دەربـڕێ، گوێڕایـەڵی فـەرمانی بـێ، لـە هـەم‌و کـارو فـەرمانێدا خـودای بەسـبێ‌و، لـە تەنگانەدا نزاو سکاڵاو هانا وەبەرهێنانی هەر بۆ لای ئـەو بـێ، سـەری کڕنـۆش تـەنیا بۆ خوا دابنوێنێ، هەر لە پێنـاوی ئـەو بـە نـاوی ئـەو قوربـانی سـەربڕێ، دەشـتوانین ئەوانە هـەموی لـە یـەك پیـت دا کـۆ کەینـەوە، ئـەویش ئەوەیـە: بـە هەموشـێوەکانی پەرستن تەنیا خوا بپەرسترێ.

ئەگەر تەگەرەیەکت هاتە ڕێ خەمبار مەبە چونکو لەبەرەو پێش چون دوات ناخا

لە پاشکۆی ڕۆژنامەی (عوکاز) لە ژمارە ١٠٢٦٢ دا لـە بـەرواری ٧ /٤ /١٤١٥ ی کۆچـی لەگەڵ نابینایەکدا بە نـاوی: (موحەممـەد بـن موحەممـەد مـەدەنی) چاوپێکەوتنێك ئەنجام درا، ئەو نابینایە چەندین کتێبی وێـژەی بـە چاوی چاوساغان خوێندۆتـەوە، گوێبیستی چەندین کتێبی مێژویی‌و گۆڤارو ڕۆژنامەو خول بوە، جـاری وابـو تـاوەکو کاتژمێر سێ‌ی شەو لەگەڵ یەکێ لە هاوەڵانیدا دەیخوێنـدەوەو گوێی بـۆ هەڵدەخـست هەتا بو بە سەرچاوەو چاوگی وێژەو هەواڵ‌و وتەی نەستەق.

(مستەفا ئەمین) لە ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) لە گۆشەی "فكـرة" دا وتەیەك دەنوسێ، تیایدا هاتوە: لەسەر فێڵو تەڵەكەی ناحەزانو، ستەمی ستەمكارانو، پەلاماری زۆرداران تەنیا پێنج خولەك ئارام بگرە، بێگومان سەرەنجام قامچیەكە هەڵدەوەرێ، كۆتو زنجیر دەپچرێ، ڕۆژێ دێ بەندكراوەكە دەرگای لە ڕودا والا بكرێ، لەمەولا تاریكایی دەتارێ، بەڵام تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ئارامبگریو چاوەڕێ بی.

لەگەڵ موفتی ئەلبانیا لە شاری ڕیاز چاوپێكەوتنێكم ئەنجامدا، لە كاتێكا لە لایەن شوعیەكانی ئەلبانیاوە بیست ساڵ بەند كرابو، چەند كارێكی قورسیشی پێ سپێررابو، هاوكات لەگەڵ كوت بەندی، لەگەڵ ئەوپەڕی ئەشكەنجەو ستەمو بێ دادی، لە تاریكایی‌و برسێتی، لە ترسان لە سوچێكی ئاودەست خانە هەر پێنج نوێژەكەی ئەنجام دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئارامی لەسەر گرتو پشتی بە خوا بەست هەتا دەروی خێری لە ڕودا والا كرا، ﴿فَٱنقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ ... هاوڕێ دەگەڵ نیعمەتو چاكەی خوادا گەڕانەوە. ﴿١٧٤﴾ آل عمران﴾.

فەرمو ئەوە "نلسۆن ماندێلا" سەركردەی باشوری (ئەفریقیا)، بیستو حەوت ساڵ زیندانی كرا، كەچی بۆ ئازادی گەلو نەتەوەی هاوارو چریكەی هەڵدەبڕی، داوای ئەكرد گەلەكەی لەژێر نیری ستەمو خۆخۆریو زۆرداریو چەوسانەوە ڕزگاری بێ، خۆڕاگرو پێداگرو سوربو، ڕێی خەباتی بەرنەدا، هەتا سەركەوتنی دنیایی وەدەست هێنا.

﴿ ...نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ ... ئێمە مزەی كردەوەیان -بە تەواوی- هەر لەم دنیایە دەدەینێ، ﴿١٥﴾ هود﴾.

﴿ ...إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ ... ئەگەر ئێوە لەوان توشی ئازار دەبن، ئەوانیش -هەروەكو ئێوە- لە ئێوە ئازار دەبینن، ﴿١٠٤﴾ النساء﴾.

﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ ... ئەگەر ئێوە بریندار بون، دوژمنیشتان وەك ئێوە بریندار بوە، ﴿١٤٠﴾ آل عمران﴾.

## دڵ پەستی ناوێ ئەگەر بە ئیسلام ئاشنای

ئەو دڵانەی لە ئیسلام نائاگانە چەند چارە ڕەشن، کە هیچ سەرەدەری لێدەرناکەن، بێگومان ئەو ئیسلامە هەوڵو گەڕی دۆستانو هەڵگرانی گەرەکە، ڕاگەیاندنێکی بەرفراوانی جیهانی پێویستە، چونکو دەنگو باسی ئەو ئیسلامە زۆر گەورەیە، بانگەوازی بۆکردنیشی پێویستە بە ڕۆشنیو پێشکەوتوانەو سەرنج ڕاکێش بێ، چونکە بەختەوەربونی مرۆڤایەتی تەنیا لەو ئایینە ڕاستەو یەکجارەکیە دایە، ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ ... هەرکەسێ بەدەر لە ئیسلام، هەر دینێکی دیکەی هەبێ، قبوڵ نیەو لە دواڕۆژا لە ڕیزی زیانبارانە، (٨٥) آل عمران ﴾ .

موسڵمانێکی بانگەوازکاری ناودار لە شاری میۆنخی ئەڵمانی نیشتەجێ دەبێ، لە دەروازەی شاردا تابلۆیەکی گەورەی ڕاگەیاندن هەیە، بە زمانی ئەڵمانی لەسەری نوسراوە: "ئەتۆ بە دێهاتەکانی (یۆکوهاما) ئاشنا نیت".

ئەو بانگەوازکارەش شان بە شانی ئەو تابلۆیە تابلۆیەکی گەورە دەچەقێنێو لەسەریشی دەنوسێ: "تۆ بە ئیسلام ئاشنا نیت، گەر دەتەوێ ئیسلام بناسی، بە ژمارە تەلەفۆنی ئەوەندەو ئەوەندە پەیوەندی بکە".

لە هەمو کونو قوژبنێکی ئەڵمانەوە بەلێزمە پەیوەندی پێوە کرا، هەتاوەکو نزیکەی سەد هەزار کەس لە ژنو لە پیاو لە یەك ساڵدا لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بون، مزگەوتێكو بنکەیەکی ئیسلامیو خانوێکی بۆ پەروەدە کردن بنیات نا.

بێگومان مرۆڤایەتی سەرگەردانو سەرلێشێواوە، زۆر ئاتاجی ئەم ئایینە شکۆدارەیە، تاوەکو دڵارامیو هێمنیوهەداری بۆ بگێڕێتەوە، ﴿ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ... بەو قورئانە، خوا ئەوەندەی شوێنی ڕەزای ئەو دەکەون، دەخاتە سەر ڕێی هێمنیو بە ئیزنی خۆی لە تاریکی دەریاندەخاو بەرەو ڕوناکیان دەباو ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدا، (١٦) المائدة ﴾ .

یەکێ لە گەورە خوا پەرستان دەفەرموێ: گومان نا بەم هیچ کەسێ لە جیهاندا جگە لە خوا بپەرستێ.

بەلاّم ﴿... وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ... لە عەبدەکانم کەمتریان شوکرێ دەکەن. ﴿١٣﴾ سبأ﴾.

﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ... ئەگەر کەوتیە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانەی وا لەم سەرزەمینەدان، لە ڕێگەی خودا لات دەدەن، چونکە هەمو بە شوێن خەیاڵدا دەڕۆن و هەر لە پڕوپوچ خەریکن، ﴿١١٦﴾ الأنعام﴾ .

﴿ وَمَا أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ... هەرچەندە زۆریش بە تاسەوە داوا بکەی، ئەم مەردمە زۆربەیان بڕوا ناهێنن، ﴿١٠٣﴾ یوسف﴾ .

یەکێ لە زانایان بۆی گێڕامەوە کە لە کاتی داگیرکردنی سودان لەلایەن ئینگلیزەوە موسڵمانێکی سودانی بیابان نشین دێتە شاری (خەرتوم) پایتەختی سودان، لە ناوەڕاستی شار چاوی بە پۆلیسێکی هاتوچۆی بەریتانی دەکەوێ، موسڵمان دەپرسێ: ئەوە کێیە؟ پێیان گوت: ئەوە بێ باوەڕە. ئەویش گوتی: باوەڕی بە چ نیە؟ گوتیان: باوەڕی بە خوا نیە. گوتی: جا کەس هەیە باوەڕی بە خوا نەبێ؟! بە سای ئەوەی بینی و گوێبیستی بو ڤێزی بوەوەو دەستی بە سگیوە ناو ڕشایەوە، دوای ئەوە بەرەو بیابان گەڕایەوە. ﴿ فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ...! چیانە ئەمانە باوەڕی هەر ناهێنن، ﴿٢٠﴾ الانشقاق﴾.

(ئەسمەعی) دەڵێ: عەرەبێکی کۆچەری گوێی لە قورئان خوێنێك دەبێ کە ئەو ئایەتە دەخوێنێ: ﴿ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَاءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ ... سا سوێند بە

پەروێنی ئاسمانو زەمین، ئەمە ڕاستە، هەروەك بۆ خۆتاندا خێون "[٥١٠]، ﴿٢٣﴾ الذاريات ﴾.

عەرەبەکە دەڵێ: گەورەیی بۆ خوا، چی وای کردوە خوای باڵا دەست سوێند بخوا؟! بە ڕاستی ئەوە گومان چاکیە بەرامبەر بە خواو بە بەخشندەیی پەروەندەو بە پاداشتو سۆزو میهری ئاشنا بونە. بە بێ گومانیش لە فەرمودەی پێغەمبەردا  هاتوە کە دەفەرموێ: (( يضحك ربّنا )): پەروەردیارمان پێدەکەنێ" یەکێ لە عەرەبە دەشتەکیەکان گوتی: بێ ئومێد نابین لە پەروەردگارێك بە چاکەوە پێدەکەنێ.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ ... هەر ئەویشە لە پاش ناهومێد بون لە باران، بارانە دادەبارێنێ، ﴿٢٨﴾ الشورى ﴾.

﴿ ... إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ... ئەو کەسانەی چاکە کارن لە بەزەیی خوا نزیکن، ﴿٥٦﴾ الأعراف ﴾.

﴿ ... أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ... تۆ بزانە کە یاریدەی خوا نزیکە. ﴿٢١٤﴾ البقرة ﴾ .

هەر کەسێ دەربارەی بەسەرهاتو ژیان نامەی خەڵکانو جوامێران کتێب وەخوێنێ چەند بنچینەو بابەتێکی سودمەند وەدەست دێنیو لێی بەهرەمەند دەبێ ئەوانە (نمونەی خەرمانێکن):

١- بێگومان سەنگی مرۆڤ لەوەدایە چاکە کار بێ، ئەوە وتەیەکی پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبو تالیبە)، ئەوە دەگەیەنێ، کە زانستو زانیاریو ڕێزو بەندایەتی بەخشندەییو خوڕەوشتی مرۆڤ نرخو سەنگی خۆیەتی، نرخی ئەو لە ڕوخسارو لە ڕوکارو پلەو پایەیدا وەدی ناکرێ: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ... گرژ بو ڕوشی وەرگێڕا! کە بێ چاوەکە هاتە لای، ﴿٢﴾ عبس ﴾.

---

٥١٠) قسە بکەن.

﴿... وَلَعَبۡدٌ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٌ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ ... بەندەيـــەكى بـــڕوادار لـــە پياوێكى ئازادى خودانەناس هێژا ترە با زۆريش حەزى لێ بكەن، ﴿٢٢١﴾ البقرة﴾.

٢- مـرۆڤ بـە ئەنـدازەى ورە بـەرزىو هـەوڵو گـەڕو قوربانيـدانى شكۆدارو پايـەدار دەبێ، هەر لە گۆترەو لەو گۆڕەش پلەو پايە بەدەست نايێنێ.

گومان نەبەى شـكۆدارى دەنكە قەسپێكەو دەيخەيتە زارى...

﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ ... ئەگـەر بيانويـستايە دەرچـن خۆيـان بۆ ئامادە دەكرد. ﴿٤٦﴾ التوبة﴾.

﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ ... بە دڵو داو[٥١١] -وەك پێويستە- لـە ڕاى خـودا بچنە خەزا، ﴿٧٨﴾ الحج﴾.

٣- بێگومان مرۆڤ هەر خۆى بە دەستى خۆى دێرۆكـى[٥١٢] خـۆى بـە يارمـەتى خـوداى خۆى تۆمار دەكات، هەر ئەوە ژيان نامەى خۆى بە كـردەوەى جوانو ناشـيرنەوە دەنوســێ: ﴿... وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ ... هــەر كــارێكى بـــە زينـــدويى كردويانەو شوێنەواريان، گش دەنوسين. ﴿١٢﴾ يس﴾.

٤- تەمەنى بەندە كورتەو زو تێدەپـەڕىو، دەست بـە جێ دەبڕێتـەوە، جا مرۆڤـى (ژير) بە گوناهو تاوانو خەمو پەژارەو مەينەتى ئەو تەمەنە تێك ناپەڕێنێ:

﴿...لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا... بــە دەر لــە ئێـوارەى ڕۆژێـك يـان چێـشتانێ نەماونەوە. ﴿٤٦﴾ النازعات﴾.

﴿قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ... ئێـژن: ئێمـە هـەر ڕۆژێـك يـان هێندێك لە ڕۆژێ ماينەوە، لە حيساب گەران بپرسە. ﴿١١٣﴾ المؤمنون﴾ .

---

٥١١) بە دڵو بە گيان.

٥١٢) مێژوى خۆى.

## هــەندێك لە هــۆكاری بەختــەوەری:

١- ئەنجامــدانی كــردەی چاكــە: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ... هەر كەسێ كرداری باشـەو بـە بـاوەڕ - چ نێـر، چ مـێ- هەتا دەژی وا دەكەین بە خۆشی بژی، (٩٧) النحل ﴾.

٢- هاوســەری گونجاوو لــەبار: ﴿ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ... ئەی پەروەرێنمان! ژنو منالانی وامـان پـێ ببەخـشە، ببنـە مایـەی چاوڕونیمان (٧٤) الفرقان ﴾.

٣- خانویەكی بەجێو ڕێ: لە فەرمودەی پێغەمبەریشدا ﷺ هـاتوە: (( اللّهم وسِعْ لي فــي داري... پەروەردگارا خانو بەرەم بۆ فراوانكەی)).

٤- كارو پیشەیەكی حـەڵاڵ: لـەو فەرمودەشــدا هـاتوە: (( إن الله طيــب لا يقبــل إلا طيبا... خوا پاكەو تەنیا پاكیشی قەبوڵە)).

٥- ڕەوشــت جــوانیو خــۆش ڕەفتــاری لەگــەڵ خــەڵكان: ﴿ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ ... لە هەر كوێش بم، پێو قەدەمم پیــرۆز دەكا. (٣١) مريم ﴾.

٦- ڕزگاربون لە دەست قەرزو قوڵو زیادە ڕۆیی لە خەرج كردندا: ﴿ ... لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ ... نەیەك جاری دەسـبلاون، نــە بـە تـەواوەتیش دەس قوچـاون، (٦٧) الفرقان ﴾.

﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ ... دەســــــتەكانت دەگەردنت وەرمەهێنەو تەواویش پانیان مەكەوە. (٢٩) الإسراء ﴾.

* بنەمای بەختەوەری: دڵێكـی سـوپاس كـارە، زمـانێكی سـتایش یـارو، لاشـەیەكی ئارامگرە.

ئەگەر بێو دەربارەی بەختەوەری، زانستی زانایانو، لێزانی شارەزایانو، هۆنراوەی هۆنەرانت بۆ کۆکەمەوە، بەختەوەری وەدەست نایەنێ هەتاوەکو بۆ چێژ وەرگرتنیو دەستەبەرکردنی ڕاستگۆیانە خۆتی بۆ یەك لا نەکەیتەوەو، بە دوای دانەگەڕێ بۆئەوەی دژی بەختەوەریە فرێی نەدەی: لە فەرمودەی قودسی داهاتوە هەر کەسێ بە ڕۆیشتنەوە بەرەو ڕوم بێ بە غاردان بەرەو ڕوی ئەچم".

یەکێکی تریش لە هۆکاری بەختەوەری بەندە پاراستنی نهێنیو وەستان لەسەر قاچی خۆیەتی.

دەگێڕنەوە کابرایێکی عەرەب دە دیناری دەدەنێ لەبەرامبەر نهێنیێك بپارێزێ، بە نەدرکاندنی ئەو نهێنیە دڵو ناخی وێکدێنەوە، دەچێتە لای خاوەن پارەکەو، دەڵێ فەرمو خۆتو پارەکەت بۆ ئەوەی چیتر نهێنیەکە وەخۆهەڵنەگرێ، چونکە پاراستنی نهێنی خۆڕاگریو ورەبەرزی گەرەکە: ﴿...لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ ... ئەم خەوەت لای براکانت مەگێرەوە. (٥) یوسف﴾.

لەبەرئەوەی دەرخستنو بەرچاوخستنی لاپەڕە نهێنیەکانی مرۆڤ بە ڕوی خەڵکداو، بە گۆڕێ وەرکردنی ڕازو نیاز بۆیان، خاڵی لاوازی ئەو مرۆڤەن، ئەوەشیان نەخۆشیێکی لە مێژینەیەو دەردێکی بن داکوتاوە لە مرۆڤایەتیدا، دەرونیش بەوە خوازیارە نهێنیان بە دەرڕاوەرکاو، دەنگو باسان بگوازێتەوە.

پەیوەندی ئەو بابەتەش بە مەسەلەی بەختەوەری ئەوەیە هەر کەسێ نهێنی لە لای خۆ ناگرێ بە زۆری ژیوانی دەردەبڕێو خەمو پەژارە دەیگرێ.

(جاحیز...یش لە نامەکانیدا دەربارەی خوڕەوشت، لەمەڕ پاراستنی نهێنی وتەیەکی سەرنج ڕاکێشی هەیە، هەر کەسێ دەیەوێ با چاوێکیان پێ دابخشێنێ.

لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتوە: ﴿...وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ... با بەزیتی [٥١٣] ببزوێتەوە [٥١٤] و هیچ کەسیش پێتان نەزانێ. (١٩) الکهف﴾ .

---

٥١٣) بە وریایی.

٥١٤) بجولێتەوە.

ئا ئەوە بنەمايەكە بۆ پاراستنی نهێنی، عەرەبی كۆچەریش دەڵێ شاردنەوەی نهێنی جاری وایە لێدانی ملی تێدایە.

## خەمبار مەبە بەر لە بڕانی ماوەی ژیانت نامری

﴿... فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ... بۆ مەرگی هەر ئۆمەتێ، وەختێ هەیە، ئەگەر وەختی مردنیان هات، نە تاوێك دەكرێ پێش كەون، نە تاوێكیش دوا دەكەون، (٣٤) الأعراف﴾.

ئەو ئایەتە پرسەو سەرەخۆشی ئەو ترسەنۆكو بێ جەرگانەیە بەرلەوەی سەرەی مردنیان بێ چەند جار دەمرن، دەبا دڵنیا بن مەرگ ماوەی دیاری كراوە، نە پێش دەكەوێو نە دوا دەكەوێ، هیچ كەسێ ناتوانێ تاڵوكەی لێ بكاو، هیچ مرۆڤێ ناتوانێ دوای بخا، با هەرچەندە خەڵكی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواش هەوڵی بۆ بدەن، ئەوەشیان خۆی لە خۆیدا دڵارامیو هێمنیو هەداریو خۆڕاگری وەبەر بەندە دەهێنێ: ﴿وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ... بورانەوەی ئاویلكەدان[٥١٥]، وا دیاریدا، (١٩) ق﴾.

دڵنیا بە پابەندبون بە غەیری خودا بەدبەختیو چارەڕەشیە: ﴿... فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ... هیچ دەستەیەكیش نەبو كە قارون لە خودای بپارێزێو خۆشی یاریدەی خۆی نەدا. (٨١) القصص﴾ .

كتێبی (سیر اعلام النبلاء) دانراوی (زەهەبی) لە بیستو سێ بەرگ پێك هاتوە، چەندین زاناو خەلیفەو دەسەڵاتدارو فەرمان بەدەستو وەزیرو ساماندارو شاعیری تیادا باسكراوە، بە لێكۆڵینەوەو سەرنجدانی ئەو كتێبە دو ڕاستی گرنگ وەدەست دێنی:

یەكەم: هەر كەسێ پەیوەندی بە جگە لە خوا ببەستێ وەكو ماڵو منداڵو پلەو پایەو كارو پیشە، ئەوا خوای گەورە بەو شتەی دەسپێرێ كە پەیوەندی پێوە

---

٥١٥) گیانەڵا، سەرە مەرگ، گیان كێشان. وا سەرەمەرگ هات.

دەبەستێ، دەشبێتە هۆی ئازار چەشتنو چارەڕەشیو تێشکانو لەناوچونی: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ... ئیتر هەر ئەو هاودەمانە لە ڕێگەی هەڵەیان دەکەن، لاشیان وایە ڕاستە ڕێیان دیوەتەوە. ﴿٣٧﴾ الزخرف ﴾.

(فیرعەون) بە پلەو پایەو، (قارون) بە ماڵو سامانیو، (ئومەییە)ی کوڕی (خەلەف) بە بازرگانیو، (وەلید) بە کوڕەکانی، سپێردران.

﴿ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ... تۆ لێم گەڕێ بۆ ئەو کەسەی من تەنیا وەدیم هێناوە، ﴿١١﴾ المدثر ﴾.

دووەم: هەر کەسێ بە خوا سەربڵندی وەدەستبێنێو لە پێناوی خوا بێ کارو کرداری خۆی لێ نزیك خاتەوە، خوای گەورە پایەدارو شکۆدارو ڕێزداری دەکا بە بێ ئەوەی وەجاخ زادە بێو پلەو پایەو ماڵو منداڵو هۆزو تیرەی هەبێ: (بیلال) بە سای بانگ بێژی، (سەلمان) بە سای هەڵبژاردنی دواڕۆژی، (سوهەیب) بەهۆی قوربانیدانی، (عەتاء) بە سای زانستی، ﴿ ...وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ... قسەی خودانەناسەکان وەبن کەوتو هەر قسەی خودا لەسەرە. ﴿٤٠﴾ التوبة ﴾.

## پابەندی ئەو نزایە بن (یا ذا الجلال والاکرام...)

((ألظوا بیا ذا الجلال والاکرام... )) هەمیشەو زۆر ئەو یادە بکەن، لەسەریشی بەردەوام بن، ئەو نزایەش وەکو وی وایە بەڵکە گەورەتریشە کە دەفەرموێ: (یا حي یا قیوم... گوتراویشە: ئەوەیان ناوی هەرە گەورەی[٥١٦] پەروەردگاری جیهانە ئەو ناوەی ئەگەر نزای پێ بکرێ خوا وەڵامی ئەداتەوە، ئەگەر داوای شتێکی پێ بکرێ دەبەخشرێ، بەندە هەر ئەوەندەی لەسەرە دەنگو هاوارو چریکەی پێ هەڵبڕێو

---

٥١٦) ئیمسی ئەعزەمە.

لەسـەری بـەردەوام بـێ، تـاوەکو ڕزگـار بـون‌و سـەرکەوتن‌و لێبونـەوەی دەروی خێـر بەچاوی خۆی ببینێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ ... لـەو کاتەشـدا کـە هاناتـان بۆ پەروەردیارتان دەبرد، جا وەڵامی دانەوە. ﴿٩﴾ الأنفال﴾.

## سـێ ڕۆژ لە ژیانی موسـڵماندا وەکو جـەژنەوانـە

ڕۆژێك بە کۆمەڵ نوێژە فەرزەکانی تێدا ئەنجامدا، لە گوناهو تاوانیش بە دور بێ: ﴿... اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ ... هـەر کاتـێ خـوداو پێغەمبـەر لێـو داوا دەکەن، گورجێی بکەن[517]، ﴿٢٤﴾ الأنفال﴾.

ڕۆژێکیشیان تیایدا تۆبە بکاو پەشیمانی لە تاوانی دەربڕێ، بـەرگی سەرپێـچیکاری لـە خۆیـدا دابڕنـێ، بـۆ لای پـەروەردیاری وەگـەڕێ: ﴿...ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا ... پاشان ئەوانیشی بەخشی کە بەرەو خودا وەگەڕێن. ﴿١١٨﴾ التوبة﴾ .

هەروا ئەو ڕۆژەی بە ڕوی سـپی‌و کردارو ڕەفتاری چاکە بە خزمەت خـوای خـۆی دەگاتەوە: (من أحب لقاء الله أحـب الله لقـاءه... هـەر کەسـێ پێـی خـۆش بـێ بـە خـوا بگاتەوە، خوا پێی خۆشە پێی بگاتەوە.

سەرگوزەشتەی هاوەڵانی پێغەمبەرم خوێندۆتەوە -ڕەزای خوایان لەسەر بێ- پێنـج مەسەلەم لە ژیانی ئەواندا سەرنجداوە کە لە خەڵکانی تر جیای کردونەتەوە:

یەکـەم: لـە ژیانیانـدا سـوك‌و سـانایيان گـەرەك بـو بـاری خۆیـان گـران نـەدەکرد، کارەکانیان بە سادەیی ئەنجام دەدا، فاق‌و بریـق‌و قوڵبونـەوەو ڕەقـەکاریان پـشت گویّ دەخست: ﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ... لەبەریشت ئاسان دەکەین، ﴿٨﴾ الأعلى﴾.

دووەم: زانست‌و زانیاری وان بە لێزمەو بە لێشاو بو هاوشانی کارو ڕەفتار بـو، زانـستی وان نەسەرو گوێی لـێ ئـەبۆوەو نـە پـەڕاوێزی بـۆ ئـەکرا، نـە زۆر بڵێـی‌و، هـات‌و

---

517) بە پەلە ئەنجامی بدەن.

هـاوارو گـڕێو گـاڵی تێـدا بـو: ﴿ ...إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ... لـە نـاو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەی فرە زانان لێی دەترسن، ﴿٢٨﴾ فاطر ﴾.

سێیەم: ئـەوان کـردەوەی دڵیـان لـەلا گـەورەتر بـو لـە کـردەوەی لاشـەیی، نیازپـاکیو گەڕانـەوەو پـشت بەسـتنو خۆشویـستنو ئارەزومەنـدیو ترسـانو ڕاچڵەکان لـە خواو وێنەی ئەوانەش کارو کـردەوەی ئـەوان بـون، لـە کاتێکـا لـە نوێـژو ڕۆژوی سوننەتدا ئاسانکاریان ڕەچاو دەکرد، هەتاوەکو هەندێ لـە وەچـەی دوای هاوەڵان دەربـارەی سـوننەتە ڕوکاریـەکان پتـر تێکۆشـانو هـەوڵیان داوە: ﴿ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ ... خوا دەی زانی چیان لە دڵدایە. ﴿١٨﴾ الفتح ﴾.

چوارەم: کەم بایەخ دانیان بە دنیـاو سوك سـەیرکردنی خۆشـیو لەزەتـەکانی، پـشت هـەڵکردنیان لـە فـاقو بریقـی دنیـا یـەکێ بـو لەوانـەی حەسـانەوەو دڵارامـیو هـێمنیو هــەداری بەسـەردا دەڕژانــدن: ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْأَخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ ... کێش خۆشی ئەو دنیـای دەوێو - بـە پێـی توانـا - بـۆی دەکۆشـێو باوەڕدارە. ﴿١٩﴾ الإسراء ﴾.

پێنجـەم: هەڵبـژاردنی جیهـادو تێکۆشـانیان بـە سـەرهەمو کـردەوە چاکەکانی تـردا، هەتاوەکو جیهاد ببوە دیاردەو نیشانەو دروشمو مەشخەڵی ڕێیان.

هەر بە سای ئەو جیهـادەش بەسـەر خـەمو پـەژارەو بـەڵاو مەینەتیانـدا زاڵ بـون، چونکە یادی خواو هەوڵو گەڕو تێکۆشانی تێدایە.

جا تێکۆشەری ڕێی خودا لە هەموکەس خۆشحاڵ ترەو، سـینە شـادو گوشـاد تـرەو دڵو دەرون ئــــاواترە: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ... ئەوانەی لـە ڕای ئێمـەدا چـونە خـەزا، ئێمـەش ئـەوان بـە ڕێگـەی خۆمانـدا دەبـەین. دیارە خودا لایەنگری کار چاکانە. ﴿٦٩﴾ العنكبوت ﴾.

لە قورئانی پیرۆزدا چەند ڕاستیو ڕێو ڕێباز هەنە لاناچنو گۆڕانیان بەسەردا نایێ، هەندێ لەو بنەمایانە باس دەکەم، کە پەیوەندیان بە بەختەوەریو، حاڵ خۆشی بەندەوە هەیە:

هەر کەسێ داوای سەرکەوتن لە خوا بکا سەری دەخا: ﴿... إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ... ئەگەر یاری خواتان کرد خوداش یاریدەتان دەداو، لەبەر نەیاران نابەزن، (٧) محمد﴾.

هەر کەسێ لە خوا بخوازێ وەڵامی ئەداتەوە: ﴿... ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ... لەبەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم. (٦٠) غافر﴾.

هەر کەسێ داوای لێخۆشبونی لێ بکا لێی خۆش دەبێ: ﴿... فَٱغۡفِرۡ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ ... خوایە بم بەخشە، ئیتر خودا خەتای بەخشی، (١٦) القصص﴾.

هەر کەسێ بۆ لای ئەو وەگەڕێ قەبوڵی دەکاتەوە: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ ... هەر ئەویشە پەشیمانی لە عەبدانی قبوڵ دەکا. (٢٥) الشورى﴾.

هەر کەسێکیش پشتی پێوە ببەستێ ئەو بەسێتی: ﴿... وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ ... هەر کێ خۆی بە خوا بسپێرێ، ئەوی بەسە. (٣) الطلاق﴾.

سێ تاوانیش هەیە خوای گەورە هەر لەسەر دنیادا تۆڵەیان دەکاتەوەو خاوەنەکەی تەمبێ ئەکا:

<u>یەکەم</u>: جەورو ستەم: ﴿... إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ ... ئەم ناهەقیانە هەر زیانی بۆ خۆتانە. (٢٣) یونس﴾.

<u>دوەم</u>: پەیمان شکێنی: ﴿... فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ ... سا هەر کەسێ پەیمانی بەجێ نەهێنێ، هەر خۆی لە پەیمان شکێنی زەرەر دەکا (١٠) الفتح﴾.

<u>سێیەم</u>: فێڵو تەڵەکە بازی: ﴿ ... وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ... فروفێڵیش هەر یەخەی خاوەنی دەگرێ. ﴿٤٣﴾ فاطر ﴾.

بێگومان ستەمکاریش لە ژێر هێزو دەسەڵاتی خوا ڕزگاری نابێ: ﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ... ئێستا (جێ) ماڵەکانی وان - لەسەر ناهەقی کردنیان - چۆڵو هۆڵە. ﴿٥٢﴾ النمل ﴾.

بەروبومی کردەی چاکەش هەم لە دنیاو هەم لە دوا ڕۆژیش دەدورێتەوە، چونکە خوای گەورە لێبوردەیەو سوپاس بژێرە: ﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ... ئەوسا خودا پاداشی ئەم دنیاو چاکە پاداشی ئەو دنیای پێدان. ﴿١٤٨﴾ آل عمران ﴾ .

هەر کەسێکیش گوێڕایەڵی خوا بێ خۆشی دەوێ: ﴿ ...فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ... شوێن من کەون هەتا خوداش خۆشی بوێن. ﴿٣١﴾ آل عمران ﴾.

جا ئەگەر بەندە هەستی بەوە کرد دڵخۆشو شادمانە، چونکە مامەڵەی لەگەڵ پەروەردیارێکە ڕۆزیدەرو ڕزگارکارە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ... هەر خودا ڕۆزی دەنێرێ. ﴿٥٨﴾ الذاريات ﴾ .

﴿ ... وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ... یاریدەش هەر لە خواوەیە، ﴿١٠﴾ الأنفال ﴾.

خوایەکی بە لێبوردەشە: ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ ... هەر کەسێکیش تۆبە کارە من دەیبەخشم. ﴿٨٢﴾ طـه ﴾.

تۆبەی بەندەشی قەبوڵە: ﴿ ... إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ... هەر خۆیەتی لە پەشیمانان دەبورێو دلۆڤانە. ﴿٣٧﴾ البقرة ﴾.

تۆڵەی دۆستانی لە دوژمنانی دەستێنێ: ﴿... إِنَّا مُنتَقِمُونَ ... ئێمە تۆڵە دەکەینەوە، ﴿١٦﴾ الدخان﴾.

پاكو بێ گەردی بۆ خوا چەند کار لە جێو شکۆدارە: ﴿... هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا ... ئاخۆ ئاگات لێیە هاو ناوێکی هەبێ؟! ﴿٦٥﴾ مريم﴾.

شێخ (عبدالرحمن بن سعدی) -خوا سۆزی بۆ بنوێنێ- نامیلکەیەکی بایەخداری هەیە بە ناونیشانی "الوسائل المفيدة في الحياة السعيدة"، تیایدا دەڵێ: "یەکێ لە هۆکاری بەختەوەری ئەوەیە بەندە تەماشای بەهرەی خوا دەکا بەسەریەوە، دڵنیا دەبێ لە خەڵکانێکی لە ڕادە بەدەر بەهرەمەندترە، ئەوسا بەندە هەست بە خەڵاتو بەخششی خوا دەکا بەسەریەوە".

من دەڵێم: هەتاوەکو لە بواری ئاینیشدا، هەست دەکا لە زۆربەی کەس باڵاترە لەمەڕ پارێزگاری کردنی لەسەر نوێژی بە کۆمەڵو، خوێندنی قورئانو یادکردنی پەروەردیارو وێنەی ئەوانەش لەگەڵ ئەوەی بەندە کەم تەرخەمیش بێ، ئەوەشیان بەهرەیەکی ئەوەندە گەورەیە بە هیچ سامانێ ناخەملێنرێ: ﴿... وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ... بە ئاشکراو بە نهێنی بەهرە گەلی بەسەرتانا ڕژاندوە. ﴿٢٠﴾ لقمان﴾ .

(زەهەبی) لە فەرمودەناسی بەناوبانگ (ئیبن عەبدولباقی) دەگێڕێتەوە، کە: دوای هاتنە دەری خەڵك لە مزگەوتی "دار السلام" لە بەغدا داوا لە خەڵکەکە دەکا، هیچ کەسێکی دەست ناکەوێ خۆزگە بۆ شوێنی ئەوو جێ نوێژی ئەو بخوازێ.

ئەو وتەیە ڕوێکی لەبارو[٥١٨] ڕوێکی نالەباری[٥١٩] هەیە: ﴿...وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ... لە چاو زۆر لە کردەی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتون. ﴿٧٠﴾ الإسراء﴾.

---

٥١٨) ایجابی.

٥١٩) سلبی.

## سەرنجێك

له ئەسمای کچی (عمیس) دەگێڕنەوە -خوا لێی ڕازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: (( الا اعلمك كلمات تقولينهن عند الكرب او في الكرب؟: الله الله ربي لا اشرك به شيئا": ئایە چەند وشەیەکت فێرکەم: (الله ربي لا اشرك به شيئا... کە لەکاتی نەگانەدا یاخود لەتەنگانەدا بیڵێ؟)).

له دەربڕینێکی تریشدا: (( من اصابه هم او غم او سقم او شدة، فقال: الله ربي، لا شريك له كشف ذلك عنه... هەر کەسێ بە خەمێك یا پەژارەیەك یا دەردێ یا تەنگانەیێ توشهات، گوتی: الله ربی، لا شریك له.ئەو بەڵایەی لەسەر لادەچێ)).

چەند بەڵاو مەینەتی ناخۆش هەن چەند پەڵە هەوری ڕەش‌و بەسەریەکدا دێننە سەر دڵان، جا ئەگەر دڵ بۆ لای خوا ڕابچڵەکێ‌و، کارو وەرامی خۆی بە خوا بسپێرێ، لەبەردەمی قاپیەی خوادا خۆی بە گۆڕێ دادا بێئەوەی هاوبەشی لە دروستکراوەکانی بۆ بڕیاردا، خوا ئەو مەینەتیەی لەسەر لائەدا، بەڵام هەرکەسێ بە دڵێکی بێخەبەرو نا ئاگا ئەو نزایە بڵێ: یەکجار دورە ".

## هەرکەسێ لە بەدکارێ بترسێ

(با ئەو چەند هۆکارە بەکاربێنێ)

١- با ئەو چەند سورەتە بخوێنێ کە پێیان دەگوترێ (معوذات... لەگەڵ دوعاو نزا بە گشتی ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ... لە گێچەڵێ ئێرەیی بەر، وەختێ کە ئێرەی دەبا. ﴿٥﴾ الفلق ﴾.

٢- کارو مەرامی خۆی لە بەدکار بشارێتەوە: ﴿ ... لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ... لەیەك دەرگا مەچنە ناو، لە دەروازەی جیا جیاوە بچنە ژور. ﴿٦٧﴾ یوسف ﴾.

٣- خـۆ دورخـستنەوە لـە بەدكـار ﴿ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُواْ لِى ... ئەگـەر باوەڕيـشم پـێ ناكـەن خۆم لـێ دورخەنەوە. ﴿٢١﴾ الدخان ﴾.

٤- چاكەی لەگەڵدا بكەی هەتا دەست لە ئازاردانت هەلگری: ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... تۆ وەرامی خراپە بە چاكە بدەوە. ﴿٩٦﴾ المؤمنون ﴾.

## هـەڵس و كەوتـت لەگـەڵ خەڵكـدا جـوان بێ

جـوان ڕەوشـتی بـەختیاریو كامەرانییـە، بەدڕەوشـتی ڕەشـبینیو چارەڕەشـیە. (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((... ان الـمرء ليبلغ بـحـسن خلقـه درجـة الـصائم القائم... بەندە بەسای جوان ڕەوشتی دەگاتە پلەی ئەو كەسەی بە ڕۆژ بەڕۆژو دەبێو شەوان بە شەو نوێژ بەسەردەبا)).

(( ألا انبئكم بـاحبكم واقـربكم مـني مـجلـسا يـوم القيامـة؟! أحاسـنكم اخلاقـا": (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ) پێتان بڵێم كامەتان لە ڕۆژی سەڵادا لـە هـەموتان نزيكترە لە من لە كۆڕو دانيشتندا؟! لە ئێوە هەرە ڕەوشت جوانەكانن)).

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ... بێگومان تۆ (ئـەی محمـد) ئاكـارت فـرە بـەرزە. ﴿٤﴾ القلم ﴾ .

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ... لـە بەزەيی خودا ڕايە كـە تـۆ هێنـدە نـەرمو نيـانی دەگـەڵيان، ئەگـەر كەسێكی دڵڕەقو توندو سەركێش بـای، بڵاوەيان لـێ دەكردی. ﴿١٥٩﴾ آل عمران ﴾.

﴿ ...وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسْنًا ... بۆ مەردم قسەی باش بكەن. ﴿٨٣﴾ البقرة ﴾ .

كچی (ئەبوبەكر)ی (سەديق) (عايشـە)ی دايكی بڕواداران - خوا لێی ڕازی بـێ - لـە باسی پێغەمبەری دور لە تاواندا - درودو سڵاوی خوا بـڕژێ بەسـەريا- دەڵێ: (( كـان خلقه القران)) خوڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بو.

بێگومان دڵ فراوانیو هەست ئاوەدانی: بەهرەیەکی ڕاستەوخۆیەو دڵ شادیەکی دەستبەجێیە بۆ کەسێ خوا خێرو خۆشی بۆ بوێ، زو هەڵچونو ڕو گرژبونو ڕق هەڵسان: هەمیشە ژیان تاڵیو سزایەکی نەبڕایەوە.

## خەمبار مەبە، پێت دەڵێم بۆ

چونکە دەردی بێخەوی خەو لە چاوان دەتۆرێنێو، وادەکا لەسەر جێگا ئۆقرەت نەمێنێ، فەرمو ئەوەش چەند ڕێگا چارەیێك:

١- نزاو پاڕانەوە شەرعیەکان: ﴿...أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ... باش بزانن کە یادی خوا ئۆقرەو ئارامی دڵانە. ﴿٢٨﴾ الرعد﴾.

٢- بە ڕۆژ نەخەوتن مەگەر زۆر پێویست بێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا... ڕۆژیشمان کردە هۆی ژیان. ﴿١١﴾ النبأ﴾ .

٣- خوێندنەوەو نوسینەوە تا کاتی نوستن: ﴿... وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ... بێژە: ئەی پەروەرندەی من گەشە بە زانستم بدە. ﴿١١٤﴾ طە﴾.

٤- ڕۆژانە خۆماندوکردن بە کردارێکی سودمەند: ﴿...وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا ... ڕۆژیشی بۆ هەڵسانەوەتان داناوە. ﴿٤٧﴾ الفرقان﴾.

٥- کەمکردنەوەی خواردنەوەی ئاگادار کەرەوە وەکو چایەو قاوە.

شاعیرێك دەڵێ: بە خۆشەویستانمان گوت ئێمە شەومان لێ نابڕێ، ئەوانیش گوتیان شەوی ئێمە زو تێپەڕدەچێ.

جا دیارە ئەوان بە دڵنیایی خەو لە چاوایان دەکەوێ ئێمەش خەو لە چاومان دەتۆرێ.

تاڵایی گوناه لەگەڵ شیرنایی خواپەرستیو، ڕوگەشی باوەڕو، بۆنو بەرامەی بەختەوەری یەك ناگرنەوە.

(ئیبن تەیمیە) دەڵێ: تاوانەکان ڕێگا بە دڵ نادەن لە بۆشایی ئاسمانی یەکتاپەرستیدا بخولێتەوە: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ... بڵێ: بەری خۆ بدەنێ لە ئاسمانانو زەمیندا چی هەیە. (١٠١) یونس﴾.

## ئاکامی زیانباری تاوان:

١- بەربەستە لە نێوان بەندەو پەروەردیاری: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ... هیچ وانیە! دیارە ئەوان لەو ڕۆژەدا لە پەروەرێنیان، فرە دورن. (١٥) المطففين﴾.

٢- دروستکراو لە دروستکار نامۆ دەبێو دەتۆرێ: ئەگەر کردەی بەندە تێکچو ڕازو نیازی خراپ بو.

٣- هەمیشە خەمۆکی: ﴿ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ ... ئەو خانوەی سازیان داوە، هەر مایەی دڵەڕاوکێیانە. (١١٠) التوبة﴾ .

٤- دڵ لەرزۆکیو ترسنۆکی: ﴿ سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ ... ئەوانەش کە خوا نەناسن، چونکە هاوکار بۆ خودا دەناسن[٥٢٠]، ترسێدا وێژینە دڵیان. (١٥١) آل عمران﴾ .

٥- ژیان تاڵی: ﴿ ...فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا ... ژینی لە تەنگانەدایە. (١٢٤) طه﴾.

٦- دڵ ڕەقیو دڵ ڕەشی: ﴿ ... وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ ... دڵمان ڕەش کردن. (١٣) المائدة﴾ .

٧- ڕو گرژیو ڕو ڕەشی: ﴿ ... فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم ... ئەو کەسانەی ڕو ڕەشی ڕۆژی قیامەتن، پێیان ئێژن: ئێوە دوای باوەڕی هێنان چۆن بونە خوانەناس؟ (١٠٦) آل عمران﴾ .

---

٥٢٠) شەرێکی بۆ بڕیار دەدەن.

٨- ڕق دروستکردن له دڵی خەڵکدا: (( انتم شـهداء الله فـي ارضـه: (پێغەمبـەری خوا دەفەرموێ) ئێوە گەواهی دەری خوان لەسەر زەوی ئەودا)).

٩- دەستکورتیو نـەداری: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ... ئەگـەر ئـەوان تـەوڕاتو ئینجیـلو ئەوەی لە پەروەرێنیانەوە بۆیان هاتوە، تەواو دەکاریـان هێنابا، بـێ سـۆ لـە لای سەریانەوەو لە زەمینی ژێر پایان ڕا خواردنیان بۆ دابین دەکرا. (٦٦) المائدة﴾.

١٠- ڕق هەڵسـانی خوای بەخشـندە، کزبونی بـاوەڕ، ڕودانـی بەڵاو مەینـەتی: ﴿...فَبَاءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ... بـەم کارەیـان دوجـار وەبـەر غـەزەب کـەوتن. (٩٠) البقرة﴾ .

﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ... بـەڵکو ئـەوان ژەنگـی کارەکـانی خۆیـان بۆتە توێژێکی سەر دڵیان. (١٤) المطففين﴾.

﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ ... گوتیان دڵمان سەرپۆشی پێدا دراوە. (٨٨) البقرة﴾ .

## بە دوای ڕۆزی دابگـەڕێو چاو برسـی مـەبە

ئەو کرمـەی لـە نـاو قوڕێـدا پەروەرنـدەی جیهـان بـژێوی ئـەدا: ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا ... لـەم زەمینـە هـەر شـتێ دەجوڵێتـەوە گـشتی ڕۆزی لەسـەر خوایە. (٦) هـود﴾ .

باڵندە لە ناو هێلانە خۆراکی بەدەسـت خوای بەخـشندەو پێزانـە: (( کمـا یـرزق الطیـر، تغـدو خـماصا و تـروح بطانـا: (پێغەمبـەری خـوا دەربـارەی بەنـدەی پـشت ئەستور بە خوا دەفەرموێ) ڕۆزی بە بەندە ئەدا هەروەکو ڕۆزی ئەداتە ئەو باڵندەی بەیانیان بە زگی برسی ئەڕواو ئێواران بە زگی تێر دەگەڕێتەوە)).

تۆ لە لای خوا ڕێزدارتری لە کرمو باڵندەو ماسی، کەوایە لە پێناوی ڕۆزیدا هەراسان مەبە.

چەند کەسانێ ئەناسم تەنیا بە سای دورکەوتنەوەیان لە خوای بەرزو توانا، توشی نەداریو بەڵاباریو دڵ بێزاری هاتن، یەکێکت بەرچاو دەکەوێ ساماندارو خوا پێداوە، فرە ڕۆزی بەسەردا ڕژاوە، لە گەنجینەو خەڵاتی خواوە تەندروستیو بەهرەی زۆری پێ دراوە، کەچی لە گوێڕایەڵی خوا پشتی هەڵکردوە، لە نوێژەکان خۆی بواردوە، دەستی لە تاوانی گەورە هەڵکردوە، جا خوای پەروەردیار لەش ساخیو ڕۆزی فراوانی لێ دائەڕنێو، بە نەداریو بەڵاباریو خەمباری گرفتاری دەکا، وای لێ دێ دەردێك یەخەی بەرنادا، کە یەکێکی تر یەخەی دەگرێ، لە بەڵایێ ڕزگاری نابێ کە یەکێکی تر ڕێی پێ دەگرێ:

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... هەر کەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانەدایەو. (١٢٤) طه ﴾ .

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ... چـــونکە خودا دەروی چاکەی لە هەر کەسێ وەکردبێ، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆڕی بێ، قەت خودا لێی نەگۆڕیون. (٥٣) الأنفال ﴾.

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ... هـەر گـا توشی بەڵایەك بون، بەهۆی کردەوەی خۆتانەو، لە زۆر گوناهەکانیشتان چاودەپۆشێ. (٣٠) الشورى ﴾.

﴿وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ... گـەر ئـەوانیش هـەر لەسـەر ئـەم ڕێگەیە بن، بێ گومانە لە ئاوێکی زەبەندە تێراویان دەکەین. (١٦) الجن ﴾.

## ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ... نهێنـی ڕێنـمایـیـە

بەنـدە ڕێگـای بەختـەوەری نادۆزێتـەوە دەسـتی ناکـەوێو چـێژی لـێ وەرنـاگرێ، مەگەر ئەو ڕاستە شەقامە بگرێتە بەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی لەسـەر لایـێ جێ هێڵاوەو لایەکەی تریشی لە بەهەشـتی خوایـە: ﴿ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ... واشمان دەکرد کە لە ڕێگەی ڕاستی ئێمەش شارەزا بن. (٦٨) النساء ﴾ .

ئەو کەسەی هۆگری ڕاستە ڕێیـە بەختـەوەری لەوەدایـە سـوڕ دەزانـێ سـەرەنجامی خێـرەو، ئاسـۆی ئومێـدی ڕۆنـە، لـەو بەڵێنـەی خـوا پێـی داوە دڵنیایـە، بـە بڕیـاری پەروەردیاری ڕازیە، دڵارامە لـەو ڕێگایـەی دەیگـرێتـە بـەر، دەزانـێ ڕێ نیـشاندەرێکی هەیە، ئەو ڕێگایەی نیشانداوە، ئەویش لە تاوان بەدورەو قسە لە گیرفانی دەرنایەنێ، دوای کەسی هەڵخەڵەتێنەر ناکەوێ، وتەی ئـەو لەسـەر دروسـتکراوانی خـوا بەڵگەیـە، لە دەست تێخستنی شـەیتانو لـە خلیسك پـێ بردنـی خـەڵکانو، لـە قسەی تێکـەڵو پێکـەڵی ئینـسان پـارێزراوە: ﴿ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ... لـە پێـشیەوەو لـە دوایـەوە فریـە[٥٢١] پـەیجۆرێ[٥٢٢] وای هەیـە کـە بـە پێـی فەرمانی خودا دەیپارێزن. (١١) الرعد ﴾ .

ئەو بەندەیە بە سای گرتنەبەری ئەو ڕێگەیە بەختەوەری هەست پێدەکا، چونکو دەزانـێ خوایـەکی ڕاسـتەقینەی هەیـە، پێـشەنگێکی بێوێنـەی لـە پێـشە، کتێـبو پەیامێکی لە دەستە، ڕۆشنایی لەناو دڵدا، ئامۆژگارێکی لەناو ناخو دەروندا، دەرەنجام بۆ خۆشبەختی دەگەڕێتەوە، لە خوا پەرستیدا کار دەکا، بـۆ کـاری خێـر هـەوڵ ئـەدا: ﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ... ئەم شـارەزایی کردنـە لـە لای خوایـە. لـە هـەر کەسێ لە عەبدانی مـەیلی لێبێ، بەرەو خۆی ڕێی نیشان دەدا. (٨٨) الأنعام ﴾ .

---

٥٢١) فریشتە.

٥٢٢) پشکێنەر، بەدواگەڕ.

ئەم دو ڕێگایەت لە پێشن: واتایی و[٥٢٣] بەرجەستەیی[٥٢٤]، واتایی: ڕاستە شەقامی باوەڕو خوا پەرستییە، ڕێگای لەبەرچاوو بەرجەستەیش: ئەو ڕێگاو پردەیە لەسەر پشتی دۆزەخ دانراوە، ڕێگای خواپەرستی لەسەر پشتی ئەم دنیایە دوابڕاوەیە کە چەند قولاپی هەواو ئارەزوی هەن، ڕێگای دوا ڕۆژیش کە بەسەر دۆزەخدا دەڕوا چەند قولاپێکی هەیە وەکو دڕکی (سملّی)[٥٢٥] وایە، جا هەر کەسێ بە باوەڕەوە لەسەر ئەم ڕاستە شەقامە بڕوا بە پێی باوەڕەکەی بەسەر پردی دۆزەخیشدا تێ دەپەڕێ، هەروەها ئەگەر بەندە ئەو ڕاستە شەقامەی بگرێتە بەر خەمو پەژارەو بێزاریو دڵ پەستی نامێنێ.

## هەر کەسێ خۆشگوزەرانی گەرەك بێ با ئەو دە خونچە گوڵانە بچنێ:

١- دانیشتنێك لە بەرەبەیاندا بۆ داوای لێخۆشبون لە خوا: ﴿... وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ... ئەوانەش کە سەر لە بەیان لە خودا دەپاڕێنەوە. ﴿١٧﴾ آل عمران﴾.

٢- کەمێ تەنیایی بۆ بیرکردنەوە: ﴿... وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ... ئەوانەش کە لە سازدانی ئەم عاسمانانو زەمینە ڕادەمێنن. ﴿١٩١﴾ آل عمران﴾.

٣- هاونشینی پیاوچاکان: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم ... تۆ هەر دەگەڵ ئەوانە بە کە سبەینانو ئێواران بۆ دیداری پەروەردیاریان بە نزان. ﴿٢٨﴾ الكهف﴾ .

٤- یادی خوا: ﴿... ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ... فرە یادی خوا بکەنو (لە یادی ئەو ڕامەوەستن) ﴿٤١﴾ الأحزاب﴾.

---

٥٢٣) مەعنەوی.

٥٢٤) حیسی.

٥٢٥) گیایەکی دڕکاویە.

٥- دو ڕکات نوێژی ملکەچانە: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴾... ئەو کەسانەی لە نوێژیاندا خۆیان بە گەورە نازانن. (٢) المؤمنون.

٦- خوێندنی قورئـان بە تێفکرینەوە: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ ... ئاخۆ ئەمانـە لـە قورئان ورد نابنەوەو (سەرنجی ڕانەکێشاون)؟ (٨٢) النساء ﴾ .

٧- بەرۆژوبون لە ڕۆژێکی زۆر گەرمـدا: (( يــدع طعامــه و شــرابه و شـهوته مــن اجـلي ... (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ) "خـواردنو خـۆراكو ئـارەزوی لـە پێناوی من واز لـێ هێناوە.

٨- ماڵ بەخشین بە پەنهانی: (( حتى لا تعلم شـماله ما تنفق يـمينه: (پێغەمبـەری خوا دەفەرموێ) "هەتاوەکو دەستی چەپی نازانێ دەستی ڕاستی چی بەخشیوە.

٩- لادانی ئاستەنگێ لە ڕێی موسـڵمانێ: (( من فرج عن مسلم كربة من كرب الـدنيا فـرَّج الله عنه كربـة من كرب يوم القيامة... (پێغەمبەری خوا دەفەرموێ) "هـەر کەسێ پەژارەیـەك لـە پـەژارەکانی دنیـا لەسـەر موسـڵمانێ لاببـا خـوای گـەورە یەکێ لە ناخۆشیەکانی دوا ڕۆژی لەسەر لائەبا".

١٠- دنیا بە کەم سـەیر کـردن: ﴿ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ... دوا ڕۆژ باشـترو بـە پێزتـرە. (١٧) الأعلى ﴾ .

ئەمەیان دە (خونچە گوڵـی) تەواون.

ئەوەی بوە مایــەی بەدبەختــی کوڕی پێغەمبــەر (نوح) U ئەو قـسـەیە بـو: ﴿ ...سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ ... ئـەمن پـەنا بـە چـیایەك دەبـەم کـە لـە ئاودەمپارێزێ. (٤٣) هود ﴾.

بێگومـان ئەگـەر پـەنای بـۆ پـەروەردیاری ئاسمـانو زەوی هێنـا بوایـە پایـەدارو شـکۆدارو پارێــزراو ئەبو.

مایەی بەدبەختی (نمرود)یش ئەوەبو دەیگوت: من دەژێینەمو دەمرێنم بەرگێکی پۆشی کەشیاوی نەبو، دەیویست مافێك بە خۆی بدا کە ئیوی نەبو، ئەوسا دەمکوتو سەرشۆڕو ڕیسوا بو.

﴿ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ... ئەوسا خودا گیرۆدەی ئازاری پەسلانو دنیای کرد. ﴿٢٥﴾ النازعات ﴾ .

کلیلی بەختەوەری وشەیێکە، کەلەپوری گەل دەربڕینێکە، مەشخەڵی سەرفرازی دەستەواژەیەکە، سا ئەو وشەو دەربڕینەو دەستەواژەیە بریتی یە لە: لا الـه الا الله محمد رسول الله .

ئەوەی لە ڕوی ئەم زەمینە بەو ڕستەیە دەئاخەوێو دەوێژی [٥٢٦] بەختەوەری لەوەدایە: لە ئاسمانەوە بە ڕاستگۆ لە قەڵەم ئەدرێ: ﴿ وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ... ئەو کەسەی ڕاستەکەی هێناو ڕاستی سەلماند. ﴿٣٣﴾ الزمر ﴾ .

ئەوەی کار بەو ڕستەیە دەکا بەختەوەری لەوەدایە: لە دارمانو دارزان [٥٢٧] و ئابروتکانو بەگڕ سوتان ڕزگاری دەبێ: ﴿ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ بِمَفَازَتِهِمۡ ... ئەو کەسانەی خۆیان پاراست -لەبەرئەوە بە ڕێگەی ڕزگاری داچون- خودا خۆی ڕزگاریان دەکا. ﴿٦١﴾ الزمر ﴾.

ئەوەی خەڵکی بۆ بانگ دەکا بەختەوەری لەوەدایە: کۆمەکی ئەکرێو پاڵپشتی لێ دەکرێو سوپاسی دەکرێ: ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ... دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەردەکەوێ. ﴿١٧٣﴾ الصافات ﴾.

ئەوەی ئەو ڕستەیەی خۆش ئەوێ بەختەوەری لەوەدایە: پلەو پایەی بەرز دەبێو ڕێزی دەگیرێو شکۆمەندی وەدەست دێنێ: ﴿ ...وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ... دەسەڵاتیش هەر بۆ خواو پێغەمبەریو ئاپۆرەی [٥٢٨] بڕوادارانە. ﴿٨﴾ المنافقون ﴾ .

---

٥٢٦) قسە دەکا.

٥٢٧) دە شەرم وەچونەوە.

٥٢٨) جاماوەری، کۆمەڵی.

بیلالی کۆیلە بەو پەیڤەیە چریکەو زایەڵەی هەڵبری بە سای ئەوە ئازادی وەدەست هێنا: ﴿...يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ... لە ناو تاریکستانەوە دەیانبا بەرەو ڕوناکی. (٢٥٧) البقرة﴾ .

(ئەبولەهەبی هاشمی) لە دەربڕینی ئەو ڕستەیە دەمی بەستا، بە سای ئەمە وەکو کۆیلەیەکی زەبونو ڕیسوا سەری نایەوە:﴿ ... وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ... خودا هەر کێ توشی سوکایەتی بکا، تازە کەس ڕێزی لێ نانێ. (١٨) الحج﴾.

ئەو دەستەواژەیە ئەو مادەو کەرستەیە کۆمەڵەی مرۆڤی دوا بڕاوو لە بن هاتو بەرەو لوتکەی باوەڕ بە خوا بونێکی پاكو پاراو دەبا: ﴿... وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ... بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە مەشخەڵێك کە عەبدانمان - ئەوانەی خۆمان بخوازین- بەوە دەخەینە سەر ڕێگا. (٥٢) الشورى﴾ .

ئەگەر پشت لە دواڕۆژ هەڵکەی بە دنیا دڵخۆش مەبە، بێگومان سزایەکی درێژ خایەنت لە ڕێدا، کۆتو زنجیرو تەمێ کردن چاوەڕێتە: ﴿ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ (٢٨) هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ... سامانم بەهرەی بۆم نەبو. دەسەڵاتم وا لەبەین چو. (٢٩) الحاقة﴾.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ ... بێ سۆ کە پەروەندەی تۆ، هەمو ئەوانە دەبینێ. (١٤) الفجر﴾ .

ئەگەر پشت لە خوایەکی تاكو بێ نیاز هەڵکەی جێی خۆی نیە دڵ بە ڕۆڵەو منداڵ خۆشکەی، بێ سۆ پشت هەڵکردن لە خوا مایەی ئەوپەڕی سەر شۆڕ بونە، ئەوپەڕی تێشکانو، ڕیسوا بونە: ﴿ ...وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ ... چارە ڕەشیو زەبونیان بۆ بڕیار درا. (٦١) البقرة﴾ .

ئەگەر تۆ کەسێکی چەپەڵکاری دڵت بە ماڵو سامان خۆش نەبێ، بە ڕاستی چەپەڵکاری قەڵاچۆ کردنی کۆتا ژیانە، لە دەست دانی سەرەنجامە، مایەی نەفرەتی

ڕۆژی پەسلانە[529]: ﴿... وَلَعَذَابُ ٱلْأَخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ... بێگومان سوکایەتی ئازاری ئەولاش زۆرترە. ﴿١٦﴾ فصلت﴾.

﴿وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ... سامانیش‌و عەولادی زۆر لەوانە نین لە ئێمەو زیك کاتەوە، مەگین کەسێ بڕوای بە ئێمە هێنابێ‌و ئاکاری چاك ڕەچاو بکا. ﴿٣٧﴾ سبأ﴾.

## تێڕوانینێك

واتاییێکی بەرفرە لە بەرز نرخاندنی ئەم نزایە دەستەبەردەکرێ: (یا حي یا قیوم برحتمك أستغیث... ئەی ئەو کەسەی هەمیشە زیندووەو مشورگێڕی هەمو کارو فەرمانێکی، پەناوە بەر میهری تۆ دێنم: بێ گومان سیفەتی (الحیاة) هەمیشە زیندویی هەرچی ڕەوشتی ئەو پەڕی تەواویە دەیگرێتەوەو لە خۆوە دەگرێ، هەروەها سیفەتی (القیومیة... هەمیشە مشورگێڕی هەرچی ڕەوشتی کردارە دەی گرێتەوە، بۆیە ئەو نزایە بە ناوی هەرە گەورە (الاسم الاعظم... دادەنرێ ئەو ناوەی نزای پێ بکرێ خوا وەڵامی ئەداتەوە، ئەگەریش داوای پێ بکرێ دەبەخشرێ: ئەویش ئەو سیفەتەیە: (الحي القیوم) هەمیشە زیندو مشورگێر.ژیانی هەمیشەیی لەگەڵ هەرچی دەردو ئازارە جیاکارە، هەر لەبەرئەوەیە بەهەشتیەکان کاتێ تەواو ژیانیان دابین بو، نە خەم‌و پەژارەو نیگەرانی دەیان گرێ نە هیچ بەڵایەکیان توش دێ.

ژیانێکیش هەمیشەیی نەبێ زیان بە کردارەکان دەگەیەنێ، لەگەڵ هەمیشە مشور گێڕیش تێك ناکاتەوە، جا هەمیشە مشورگێڕی بە سای ژیانی هەمیشەییە، ئەوسا زیندوی ڕەها (الحي المطلق)، کە ژیانێکی هەمیشەیی یە هەرگیز سیفەتی تەواوی (الکمال) لێی جیا نابێتەوە، مشورگێڕی هەمیشەییش (القیوم) هەرچی کردارێ بگونجێ لەسەری گران نابێ، ئینجا پاڕانەوە بە سیفەتی (الحیاة والقیومیة) کاری گەری دەبێ بۆ لابردنی ئەو شتەی دژی ژیانەو زیان بە کردار دەگەیەنێ.

---

٥٢٩) ڕۆژی دوایی.

## خــەمبار مــەبەو لەگــەڵ خــەیاڵ ڕەفــتار مــەکە

ئەگەر بە ئاسانی سەیری کارێکی گرانت کرد ئاسان دەبێ، ئەگەر لە شتێکیش نائومێد بوی هەواو ئارەزوت ئەوەی لەبیر دەچێتەوە: ﴿... سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ... (ئەگەر بیانگوتایە): ئێمە هەر خودامان بەسەو بەم زوانە خوداو پێغەمبەری خوا لەچاکەی خۆ بەشمان دەدەن، چ دەقەوما؟ ﴿٥٩﴾ التوبة﴾.

لە کتێبێکدا خوێندنەومەتەوە، کە پیاوێ لە دەلاقەیەکەوە خۆی فڕێ دەدا ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەی چەپەدا دەبێ، ئەنگوستیلەکە لە بزمارێکی دەلاقەکە دەئاڵقێ، لە کاتێ کابرا دەکەوێتە سەر زەوی ئەو بزمارە پەنجەی لە بنەوە هەڵدەقەنێ، چوار پەنجەی دەمێنێتەوە، خۆی بە خۆی دەڵێ: وا هەست ناکەم تەنیا چوار پەنجەم بەو دەستەوە ماوە، یاخود وا نازانم یەکێ لە پەنجەکانم لە دەست داوە تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە ڕوداوەکەم بیر دەکەوێتەوە، ئەگینا کاروبارم لەسەرخۆیەو، ڕازیم بەوەی ڕوی داوە: "قدر الله وما شـاء فعل... خوا هێنا بوی دەبوایە ببێ".

پیاوێکیش دەناسم باسكو قۆڵی چەپەی بەهۆی نەخۆشیەك لە شانیدا بڕدراوە، ژیانێکی درێژی بردە سەرو خێزانی پێك هێناو خوا چەند کوڕێکی پێ بەخشی، بە ڕوێکی گەشەوە ماشێنەکەی لێ دەخوڕی، بە خۆشحاڵیەوە کاری خۆی بەجێ دەهێنا، هەروەکو بڵێی خودا تەنیا دەستێکی پێ دابێ: "ارض بما قسم الله لك، تكن اغنى الناس" ئەو بەشەی خوا پێی داوی ڕەزامەندی لێ بنوێنە، لە گشت کەسێ زەنگین تری.

چەندە زو وامان بەسەرهات لەگەڵ ڕاست بینیدا نەگونجێین، چەندە جێگای سەرسامیە لەگەڵ بارودۆخو ژیانو گوزەرانمان ناڕەخسێین، پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا ڕایەخی ناو ماڵمان ئەو حەسیرە بو کە لە گەڵای دارخورما چنرا بو، کەلوپەلی ناومال بریتی بو لە: کوندەیەکی ئاوو مەنجەڵێکی گڵینەو [٥٣٠] قاپێكو مەسینەو

٥٣٠) لە گڵ دروست کراو.

تەشتێك، کەچی لە ژیانـدا پـەکمان نەکـەوتو حـاڵو گوزەرانمـان لـە گەڕنەکـەوت، چونکە ئێمە ڕەزامەندیمان نوانـدو ملکـەچ بـوین کـارو وەرام مـان خـستە ژێردەسـتی (واقع)و ڕاستیمان.

لە مزگەوتی گەورەی کوفە لە نێوانی دو تیرەدا ئاشوبو ئاژاوە ڕویدا، شمشێرو ڕمیان لە یەك هەڵکێشا، شەڕ کڵپەی سەند، نزیك بو کەللە سەر لە لاشە جیا ببنەوە، یـەکێ لـە مزگـەوت خـۆی دزیـەوە تـاوەکو بـە دوای (ئەحنـەف)ی کـوڕی (قـەیس) دابگەڕێ کە پیاوێکی زۆر چاك سازو نـەرمو نیـان بـو، بـینی وا لـە ماڵەکەیـدا مـەڕو ماڵاتی دەدۆشێ، پۆشاکێکی لە بەردا بو دە عانەی نەدەهێنا، کەسێکی کـزو لاوازو بـێ هێزو بە لە باریکە [٥٣١]، باسو خواسیان بۆ گێڕایە وە بە هیچ جۆرێ نەشڵەژاو خـۆی تێك نەدا، چونکە لەو کارەساتانە ڕاهاتبو، ژیانی لەگەڵ ڕوداوان بەسـەر بردبـو، پێـی گوتن خێرە انشا الله، پاشان خواردنیان هێنایە پێش هەروەکو بڵێی هیچ ڕوی نەدابێ، لە کاتێکا بەربانگەکەی بریتی بو لە کەرتە نانێکی وشكو زەیتو خوێ، لەگەڵ جامە ئاوێك، نـاوی خـوای هێنـاو دەسـتی بـە خـواردن کـرد، پاشـان سوپاسـی خـوای لەسـەر خواردنەکە کرد، گوتیشی، نانێك لە دانەوێڵەی عێراقو، زەیتێك لـە شـامەوە، لەگـەڵ ئـاوی ڕوبـاری (دیجلـە) بـە ڕاسـتی چـەند بەهرەیـەکی بـەهادارن. پاشـان پۆشـاکەکەی لەبەرکردو، داردەستەکەی [٥٣٢] لە دەست ڕا هـەڵگرت، هـەنگاو بـە هـەنگاو بـەرەو ئـەو خەڵکە ڕۆیی، لـە کاتـێ چاویان پـێ کـەوت سـەریان بـوبینینی هەڵکێـشا، چاویان تـێ بڕیو گوێییان بۆ وتەکانی هەڵخست، هـەر سـەر پێـی ئاشـتەوایی لـە نێوانـدا کـردن، پاشان گوتی بلاوە بکەن، هەریەکەیان بـە لایەکـدا ڕۆیـشتنو ئاوڕیـان نەدایـەوە گـڕی ڕقو کینەیان دامرکاو، ئاژاوە کوژایەوە.

لـەو چـیرۆکە چـەند دەرسـێ وەردەگـیرێ، لەوانـە ڕێـزو گـەورەیی بـە کەشـخەییو دیمەن نیە، کەم دەرامەتیش ئاماری بەد بەختی نیە، بەهـەمان شـێوە بەختـەوەریش بە هەبوییو سامانداری نیـە: ﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ١٥ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ... بەلام ئەمڕۆ هەر کاتێکی

---

٥٣١) ڕەق لاواز.

٥٣٢) داروەکاز/ئەو دارەی لە دەست ڕاهەڵدەگرێ.

پەروەرنـدەی دەیخاتە بەر ئەزمونەوەو ڕێزی لێدەگرێو بەهرەی پێدەگەیەنێ، ئێژێ: (ئەوا) پەروەندەم قەدری گرتم ئەگەریش - هەر بۆ ئەزمونێ- پەروەندەی بژێوی لێ کەمکردەوە، ئەوسا ئێژێ: پەروەندەم سوکایەتی بەسەرهێنام. ﴿١٦﴾ الفجر ﴾.

بێگومان بەهرەو ڕەوشتە بالاکان نـرخو ڕێـزی مـرۆڤن، نـە وەك بـەرگـو پۆشـاكو کـەوشو پـێلاوی کۆشـكو تـەلارو خـانوی پێشـچاوی، بەڵکـە سـەنگی ئـەو لـە کـردەو بەخــشندەییو نــەرمو نیــانیو ژیــری دایــە: ﴿ ...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ... بەڕێزترینتــان لای خودا، پارێزگار ترەکانتانن. ﴿١٣﴾ الحجرات ﴾ .

پەیوەندی ئەو وتەیە بە جێ باسی ئێمەوە ئەوەیە بەختەوەری بـە هـەبونێکی لـە ڕادە بـەدەرو، کۆشـكو باڵەخانـەی ڕازاوەو، لـە ئـاڵتونو زێـڕو زیـو دانیـە، بەڵکـە بەختەوەری لەناو دڵدا بە سای ئەوەیە بـاوەڕی تێدا بڕەخسێ، ڕەزامەنـدی لـە نـاودا بڕوێ، شـادو هۆگر بێ، تیشك بداو بدرەوشێ: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ... سەیرت نەیە لە داراییو زارو زیچێ[٥٣٣] کە هەیانە. ﴿٥٥﴾ التوبة ﴾.

﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ... بێــژە: لــەو چاکەو بەزەییە - کە خوا دەربارەی ئێوەی کرد- کەیف خۆش بن، کە ئەمـە لـە هـەر شتێکی کۆی دەکەنەوە هێژاترە. ﴿٥٨﴾ یونس ﴾ .

دەرونی خۆت لەسەر ملکەچ بون بە قەزاو قەدەری خوا ڕابێنە، چی دەکەی ئەگەر باوەڕ بە بڕیارو قەزاو قەدەری خوا نەکەی، ئایە دەتوانی بە ناخی زەویدا ژێر کۆڵێ لێ بدەی یا پەیژەیێ بەرەو ئاسمان هەڵبەی، ئەوەشیان دادت نـادا، لـە قـەزاو قـەدەری خوا لات نادا. کەوایە چارە چیە؟

چـارە ئەوەیـە: ڕەزامەنـدیمان نوانـدو ملـمان کـەچ کـرد: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ... لـە هـەر کـوێ بـن تەنانــەت ئەگـەر لـە قـەڵای زۆر قایمیش (خۆوە شێرن)، مـردن دەتانگاتێ. ﴿٧٨﴾ النساء ﴾ .

---

٥٣٣) ڕۆڵـەو منــاڵ.

دژوارترین‌و سەخت تریني ڕۆژانی ژیانم، بەرچاو ڕەشترین کات‌و ساتی تەمەنم: ئەو کاتە بو پزیشکی تایبەت هەواڵی پێدام بە بڕینەوەی دەستی (محمد)ی برام لە قۆڵیرا- خوا سۆزی بۆ بنوێنێ - ئەو هەواڵە وەکو بۆمبێك بو بە بن گوێچکەمدا تەقیەوە، بەڵام بەسەر نەفسی خۆمدا زاڵ بوم، ئەو وتەیەی خوای پەروەردگار دڵنەوایی کردم: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ... کەس هیچ بەڵای بەسەر نایە، مەگین خودا فەرمان بدا. هەر کێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خۆی دەکا. (١١) التغابن ﴾ .

ئەو وتەیەش: ﴿ ... وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ (١٥٥) ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ... مژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن. ئەو کەسانەی کە توشی چورتمێك دەبن دەڵێن: ئێمەش هەر ئی خواین‌و هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە. (١٥٦) البقرة ﴾.

ئەو ئایەتانە فێنکایی‌و ئارامی‌و وزەو تین‌و بۆن‌و بەرامی خۆش بون.

هیچ پلانێکیشمان لەبەردەستدا نیە بی گێڕین، تەنیاو بەس چارەمان باوەڕهێنان‌و ملکەچ بونە، ﴿ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ... ئەگەر ئەوان لەسەر کاری خۆیان سور بون، ئەوا ئێمەش لەسەر کاری خۆمان سورین. (٧٩) الزخرف ﴾ .

﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمْرِهِۦ ... خوا لەسەر کاری خۆی زاڵە. (٢١) یوسف ﴾ .

﴿ ... وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ... هەر کە ویستی کارێ پێك بێ، فەرمان دەدا: ببە! دەبێ. (١١٧) البقرة ﴾ .

(خنساء النخعیة) تەنیا لە یەك چرکەدا بە شەهید بونی چوار کوڕەکەی لە شەڕی (قادیسیە) لە ڕێگای خوادا هەواڵی پێ درا، هیچ یان لە دەمی نەبیست تەنیا سوپاس کردنی پەروەردیاری نەبێ، ستایشی پەروەرێنی خۆی کرد لەسەر ئەو خەڵاتەی پێی بەخشی، لەسەر ئەوەی سۆزی چاکەی لەگەڵ نواندو، بڕیاری خواش جێ بەجێ بو، چونکە باوەڕێکی یارمەتی دەرو وزە بەخشی هەبو، خاوەنی چەم‌و ڕوبارێکی یەقین‌و دڵنیایی بو کە نەبڕێتەوە، جا نمونەی ئەو ژنانە شیاوی ئەوەن سوپاسیان بکرێ‌و

پاداشـتیان بدرێتـەوەو بەختـەوەری دنیـاو دوا ڕۆژ بـن، ئەگـەر ئـەو هەڵوێـستەی نەنوندایە لـە بـری ئـەوە چی پـێ دەكـرا؟! نـاڕەزایی‌و هـاوارو ڕۆڕۆو پـەرج دانـەوەو نەخواستن، دوای ئەوە لـە دەسـت دانـی دنیـاو دوارۆژ! (فمـن رضـي فلـه الرضـا، ومـن سخط فله السخط... هەر كەسێ ڕەزامەنـدی نوانـد ڕەزامەنـدی وەدەسـت دێنـێ، هـەر كەسێكیش ناڕەزایی نواند، ڕق‌و توڕەیی وەدەست دێنێ.

بێگومان هەتوانی[٥٢٤] دەردو ئازارو چارەسـەری بـەڵاو مەینـەتی، ئەوەیە بڵێیـــــن: ﴿... إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ...  ئێمـە ئـی خــواین‌و بـۆ لای ئـەویش دەگەڕێینـەوە. (١٥٦) البقرة﴾ .

مەبەسـت ئەوەیـە: هـەمومان ئـی خـواین، ئێمـە دروسـت كـراوی ئـەوین‌و لـە ژێـر دەسەڵاتی ئەوداین، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، دروست بون لەویەوە سەرچاوە دەگـرێ‌و، گەڕانـەوەش بـۆ لای ئـەو دەبـێ، كـارو فـەرمانیش بـە دەسـتی ئـەوە، ئێمـە خاوەنی هیچ نین.

﴿ ...كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ... بـە غـەیری ئـەو هـەمو شـتێ لـە بـەین دەچـێ. (٨٨) القصص﴾ .

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ... هەر كێ ژینی لەسەر زەمینە نامێنێ. (٢٦) الرحمن﴾.

﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ... تۆش دەمری‌و ئەوانیش دەمرن. (٣٠) الزمر﴾.

ئەگەر لە ناكاوێ بە هەواڵێكی ڕاچڵەكێنەر هەوڵیان پێدای بـەوەی ماڵەكـەت گـڕی گرت، یا ڕۆڵە خۆشەویستەكەت مرد، یا سەروەت‌و سامانت بەهـەدەر چـو، دەبـێ ئـەو كاتە چی بكەی؟ هەر لە ئێستاوە خۆت لەسەر ئارامی ڕابێنـە، خـۆ دزینـەوە داد نـادا، ڕاكردن‌و هەڵاتن لە بڕیارو چارەنوسی خوا سودت پـێ ناگەیـەنێ، بـە فـەرمانی خـوا ملكەچ بە، بە قەدەری خوا ڕازی بە، دانبنێ بە ڕاستی‌و هەڵكەوتـدا [٥٢٥]، پاداشـتی خـوا وەدەست بێنە، چونكە هەر ئەو ڕێگا چارەیەت لە دەستە. بەڵێ ڕێگایەكی تریشت لە

٥٢٤) مەڵحەم/مەرهەم.

٥٢٥) واقیع.

دەست دایە، بەڵام ئەویان چەوتە ڕێ یەو لە مەترسی ئەم ڕێییە ئاگادارت دەکەمەوە، ئەویـشیان: لـە تـاوی ئـەوەی ڕوی داوەو هاتۆتـە ئـاراوە قـوڕ پێـوانو جارِسـیو بێـزار بونە، ڕق هەڵسانو شینو ڕۆڕۆو خاکە سار بونە، وەلێ لەو هەمو پەرێشانیە دەست کەوتت چ دەبێ؟! بێگومـان خەشـمو قـینی پەروەنـدەی بـەرزو توانـا وەدەسـت دێـنی، خەڵکان لە خۆت دەڕەنجێنی، پاداشتی خوا لەدەست دەدەی، کۆڵێ گوناهیش لـە خـۆت هەڵـدەدەی، دوای ئـەوە خۆشەویـستەکەت بـۆ ناگەڕێتـەوە، بـەڵاو مەینـەتیش لـە دڵ دەرناچێو، ئەوەش کە هەر دەبێ بێتـە دی بەسـەرتدا هـەڵنابرێ: ﴿ ...فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ... با بەپەتێك خـۆی هەڵواسـێ تا دەخنکێ، دەبا بزانێ بەم فێڵە ئۆخەی دڵی دێ؟ ﴿١٥﴾ الحج ﴾ .

## خەمبــار مــەبە بە ئــەوەی تۆ لە پێنــاویــدا خــەمباری کۆتـایــی دێ

بێ گومان مەرگ ڕەپێش هەمو کەس دەکەوێ: ستەمکار بـێ یـا چەوسـاوە، بـەهێز بـێ یـا ژێردەسـتە، دەوڵەمەنـد بـێ یـا هـەژار، تـۆ یەکـەم کـەس نیـت کـە دەمـرێ، خەڵکانێکی زۆر لە پێش تۆدا مردون لە دوای تۆشدا زۆریان دەمرن.

(ئـیبن بەتوتـە) دەگێڕێتـەوە کـە گۆڕسـتانێك لـە بـاکور هەیـە هـەزار پاشـای تێـدا لەگۆڕ نراوە تابلۆیەکی لەسەر هەڵواسراوە تیایدا نوسراوە:

**لە خاك بپرســە لەمــەڕ کەســانێ پێش مردن گەورەی گەلــن**
**پێــت دەڵێ ئەوانەی ســەرپەڵ بون ئێستاکە هێســكو پەلــن***

ئەو کارەی لەو بارەوە سەرسام کارە: بێ ئاگایی مرۆڤە لـەو مردنـەی کـتو پـڕ بـە شەوو بە ڕۆژ مرۆڤەکان دەدورێتـەوە، گومانیـشی وایـە هـەرگیزاو هـەرگیز دەمێنـێو ڕادەبوێرێو مەرگ یەخەی ناگرێ، لەو سەرەنجامە بـێ گومانـە بـێ ئاگـایی دەنوێنـێ، لەو کۆتاهاتنەی هەمو گیانداری دەگرێتەوە خۆی دەبـوێرێو کەمتەرخـەمی لێ دەکـا:

* گەورەی گەلن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ ... ئـەی خەڵكـینە! لە پەروەندەو بترسن، بومە لەرزەی ڕۆژی سەڵا ڕوداوێكی زۆر گرنگە. ﴿١﴾ الحج ﴾.

﴿ٱقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ﴾ ... خەڵك ئاگایان لێ نیە، ڕۆژی ژمارەیان نزیكەو هەر باوەڕیش ناكەن هەبێ. ﴿١﴾ الأنبياء ﴾.

لەو كاتەی خوای گەورە گەلو نەتەوەكان لەناو دەباو، بن بڕیـان دەكـا، ئـەو شـارو لادێیانەی سـتەمكار بون بە خەڵكەوە دەیانڕمێنـێ، خـوای بـەرزو توانـا دەفـەرموێ: ﴿...هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾ ... ئاخۆ هەسـت بە هیچیان دەكەی، یان نوزەشیان لێ دەبیستی؟ هەرچی لەمەڕ ئەوان بـو بڕایـەوە تـەنیا بـاسو خواسـیان مایەوە؟! ﴿٩٨﴾ مریم ﴾.

## هەڵوەسـتەیـەك

دوعاو نزای كڵۆڵی: تاقانـەیی خـوا لـە ڕوی پەرسـتنو پەروەردگارێتیـدا لـە خـۆوە دەگرێ، هەروەها بە شكۆداریو نەرمو نیانی باس لە پەروەرێنی تاكو پاك دەكا، ئـەو دو ناوو سیفەتەش ئەوپەڕی دەسەڵاتو میهرو سۆزی خواو چاكەو لێبـوردەیی لـە خـۆوە دەگـرن، بـە هـەمان شـێوە ناسـاندنی خـوا لـە خـۆوە دەگـرێ، بـەوەی تـەواو بەڕێوەبـەردنی جیهـانی ژورو جیهـانی خـوارو، ئـەو عەرشـەی كـە لـە سـەروی هـەمو دروست كراوەكانەو گەورەترین دروستكراویشە لە ژێر دەستی ئەودایە.

پەروەردگارێتی تەواویش یەكتاپەرستی خوا لە خـۆوە دەگـرێ، ئـەوەش دەگەیـەنێ كـە هـەر ئـەو شیاوی بەندایـەتی بـۆ كـردنو خـۆش ویـستنو لێ ترسـانو ئومێـد پـێ هەبونو بەگەورە دانانو گوێڕایەڵی بۆ كردنە. گەورەرییو شكۆداری خوای گەورەش، كە بێسنورە وا پێویست دەكا هەرچی تەواویو بێگەردیە بۆی بڕیار بدرێو هەرچی ناتەواویو وێچواندنیشە لێی بەدور بگیرێ، نەرم جوڵانەوەی خوای گەورەش ئەوپەڕی میهرو سۆزو چاكەكردنی لەگەڵ دروستكراوانیدا لەخۆوە دەگرێ.

جا ناسین و پێ زانینی دڵ بەو ڕاستیە، ئەو دڵە بە خۆشویستن و بە گەورە دانان و یەکتاپەرستی خوا ناچار دەکا، ئەوەندە شادی و سرەوتن و ئاسودەیی وەدەست دێنێ ئازار و ئەشکەنجەو خەم و خەمینی نەمێنێ، تۆ دەبینی نەخۆش ئەگەر بەشتێ دڵ خۆش و شادمان بێ، وزەو ورەی وەبەر بێنێ، چۆن ئەو دڵ و دەرونە توانای ئەوەی دەبێ نەخۆشیە جەستەییەکەی نەیێڵێ، جا ئەو چارەسەر و چابونەوەیە بۆ دڵ شایستەتر و لەبارترە.

## ماتەمینی داتنەگرێ ئەگینا بەرەو بەدبەختی دەکەویە ڕێ

ڕۆژنامەی (المسلمون) ژمارە (٢٤٠) لە مانگی (صفر)ی ساڵی ١٤١٠ی کۆچی نوسیوێتی، ئێستا کە ٢٠٠ ملیۆن کەس لەسەر ڕوی ئەم زەمینەدا هەیە، کە گیرۆدەی خەمۆکی بێ!

ماتەمی جیهان لە ڕیشاڵەوە دەردێنێ!! جیاوازی ناخاتە نێوانی وڵاتێکی ڕۆژئاوایی یاخود ڕۆژهەڵاتی! یا دەوڵەمەندێ یاخود هەژارێ ئەوە نەخۆشییێکە هەمو چینێك دەگرێتەوە... زۆربەی جاران دەرەنجامەکەی...خۆ کوشتنە!! خۆ لەناوبردن هیچ ناوێك و پلەو پایەو دەوڵەتێك ناناسێ، بەڵام لە بڕواداران دەسڵەمێتەوە[٥٢٦]، هەندێ نوسین دەریان خستوە کە ژمارەی قوربانیانی ئەم نەخۆشیە گەیشتۆتە ٢٠٠ هەزار ملیۆن نەخۆش لە هەمو جیهاندا...بەڵام کۆتا سەرژمێر و بە دوادا گەڕان وادەگەیەنێ کە لە نێوانی هەر دە کەس دا بە لای کەمی یەکێکیان بەو دەردە کوشندەو ترسناکە گیرۆدەیە لەسەر ڕوی ئەم زەویەدا!!

ترسناکی ئەم نەخۆشیە بەو ئەندازەیە تەنیا گەورەکان ناگرێتەوە، بەڵکە دەگاتە ئەو ئاستەی کۆرپەی سکی دایکیش پێی گیرۆ دەبێ!!

مات و خەمینی دەروازەی خۆ کوشتنە: ﴿... وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ ... بە هەق نەبێ نابێ یەکتریش بکوژن. ﴿٢٩﴾ النساء﴾.

---

[٥٢٦] دەرەوێتەوە/دەترسێ.

﴿... وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ... خۆشتان بە فەتـەڕات[٥٣٧] مـەدەن بەدەسـتی خـۆ. (١٩٥) البقرة﴾.

ئـەو هەواڵانـەی لەسەرچـاوەكانی ڕاگەیانـدن دەمـاودەم كـەوتن[٥٣٨]، ڕایانگەیانـد كـە دەردی خــەمۆكی (ڕۆنالــد ریجــان...ی ســەرۆكی پێــشوی وڵاتــە یــەك گرتوەكــانی ئـەمریكای گرتـەوە. توشـبونی سـەرۆكی ئـەمریكی بـەو دەردە هۆكارەكـەی بـۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە كە حەفتا ساڵ لـە تەمـەنی تێپـەڕ دابـو، لەوكاتـەدا بـەردەوام ڕوبـەڕوی پاڵەپەستۆی دەماری ترسناك دەبـوەوە... هاوكات لەگـەڵ ئـەوەی یـەك لـە دوای یـەك نەشتەرگەری بۆ ئەنجام دەدرا، ﴿...وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ تەنانـەت ئەگـەر لـە قـەڵای زۆر قایمیش خۆوەشێرن. (٧٨) النساء﴾. (مردن دەتانگاتێ.

زۆرێ لـە نـاوداران بەتایبـەت ئەوانـەی هونـەر كـاربون، بـەو دەردە گـیرۆدە بـون، بێگومان دەردی خەمۆكی هۆكارێكی سەرەكی بو - ئەگەر تاكە هۆكاریش نەبو بێ- لە مردنـی (سـەلاح جـاهین...ی شـاعیر، هـەروا دەشـلێن: (نـاپلیۆن بۆنـابرت... لـە شـوێن ئـاوارەیی خـۆی بـە خـەمۆكی مـرد ، ﴿...وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ... (خـواش دەیەوێ (بە بێدینی گیانیان دەرچێ.(٨٥) التوبة﴾. بە هەمان شێوە ئێستاش بـەردەوام یادی ئەو هەواڵە دەكەینەوە كـە دەزگایـەكانی ڕاگەیانـدن بـڵاوی دەكەنـەوە، زۆربـەی ڕۆژنامەكانی جیهـانیش سـەرەتای لاپـەرەی یەكـەمیان پـێ داگیر كـردوە، لەمـەڕ ئـەو تاوانكاریە ڕاچڵەكینەی دایكێكـی ئـەڵمانی بـە كوشـتنی سـێ لـە جگـەر گۆشـەی خـۆی ئەنجام دابو، دەركـەوتوە كـە هۆكارەكـەی توشـبونی ئـەو ژنەیـە بـە دەردی خـەمۆكی، لەبەرئەوەش منداڵەكانی زۆر خۆشدەویست ترسا لەوەی ئەو ئازارو دڵ توندیەی ئەو پێیەوە گرفتار بوە ببێتـە میراتـی منـاڵـەكانی، بڕیـاری دا بیـان حەسـێنێتەوە"!! لـەو ئازارە بەو شـێوەی هەرسـێكیان بكوژێ.. دوای ئـەوە خۆشـی كوشت!! ژمـارەو دیـاری كردنی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی" بۆ ترسناكی ئەم كارە ئاماژە دەكەن..لە ساڵی ١٩٧٣ز ئەوانەی بەخەمۆكی گیرۆدە بون ڕێـژەیان ٣٪ بـو، لـە سـاڵی ١٩٧٨ز ئـەو ڕێژەیـە

---

٥٣٧) بەڵا.

٥٣٨) كەوتنە سەر زاران.

زیادی کرد گەیشتە ٥٪، هەروەکو هەندێ توێژینەوە دەریانخست کە لە هەر چوار کەسی ئەمریکی یەکێکیان بەو دەردە دەینالآند!! لەوکاتەی سەرۆکی کۆنگرەی پەشێوی دەرونی کە لە ساڵی ١٩٨١ز لە (شیکاغۆ... گرێ درا رایگەیاند کە ١٠٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا بە دەستی خەمۆکیەوە دەناڵن، زۆربەشیان لە وڵاتە پێشکەوتوەکانن، چەند ژمارەیەکی تر دەریانخست کە رێژەیان ٢٠٠ ملیۆن گیرۆدەیە!! ﴿ أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ... ئاخۆ ئەمانە نابینن کە ساڵانە کەرەتێك یان دو کەرەتان دەکەونە بەر تاقیکاری؟ (١٢٦) التوبة ﴾ .

یەکێ لە کاراشنایان[٥٣٩] دەڵێ: لە لیمۆ خۆشاوی شیرین بسازێنە، یەکێکی تریشیان دەڵێ: هۆشمەندو بێدار ئەو کەسە نیە بتوانێ سودو قازانجی زیاد کا، بەڵکە مرۆڤی بیر تیژ ئەو کەسەیە زەرەرمەندی بەرەو قازانج وەچەرخێنێ، ﴿ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ... خێرو بێرو بەزەیی پەروەندەیان بۆ دەبارێو شارەزا لە رێ ئەوانن. (١٥٧) البقرة ﴾.

ئەو پەندەشیان داداوە: لەگەڵ دیوار قۆچ قۆچانێ[٥٤٠] مەکە!!

بەرهەڵستیو سەرکێشی لەگەڵ یەکێدا مەکە لەبەرهەڵستی ئەودا سودو قازانجێکت پێ نەبرێ.

گوتراویشە: ئارد مەهارەوە[٥٤١] ﴿ ... فَأَثَابَكُمْ غَمًّا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ ... جا خوا جەزای خەمی هەر بە خەم دانەوە. نەکا لە بەرئەوەی وا لە دەستان چوەو ئەوەی کەوا توشتان بوە خەم هەڵگرن. (١٥٣) آل عمران ﴾.

ئەو کارەی کۆتایی هاتوەو براوەتەوە پێویست ناکا دوبارە سەرهەڵداتەوە، چونکە ئەو دوبارەیە دڵە راوکێو نیگەرانیو کات بەفیرۆدانی تێدایە.

---

٥٣٩) شارەزایان.

٥٤٠) شەرە کەللە/ شەرە قۆچ.

٥٤١) کۆتایی پێ هاتوە.

هەروا لە پەندێکی ئینگلیزیشدا گوتراوە: پوشکەی داری بڕاوە مەبڕەوە.

ئەو پوشکەی لە بڕینەوەی دار هەڵوەراوە، ناشێ جارێکی تـر ببڕدرێتـەوە، چونکە ئەو بڕینەوە بڕاوەتەوە[542]. ئەو پەندە بۆ کەسانێ بەکاردەبرێ بە شتی کەم بایەخەوە سـەرقاڵن، سەرگەرمی خەونو خـــەیاڵن، بـە دوای گێڕانـــەوەی ڕابـردودا عــەوداڵن، ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ... ئەوانەی کە خۆیان نەچوبونە خەزا، لەمەڕ هاوەڵانیـان دەگـوت: ئەگەر بە قسەیان کردباین نەدەکوژران. بێژە: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆ لـە مـردن بپارێزن. (١٦٨) آل عمران ﴾ .

ئەوانەی سەرقاڵی کات بەتاڵین ئەو هەلەیان بۆ ڕەخساوە بـە چەند کـردارێ کـات بە تاڵیان پڕ کەنەوە، وەکو ئەوەی بە کردەی بەردار خۆ وەڕازێنن، سـودو قـازانج بـە خەڵکان بگەیەنن، بۆ دڵنەوایی بەلاباران بچنە دیـدەنی، سـەر لـە گۆڕسـتان بـدەن[543]، بایــەخ بــە مزگــەوتان بــدەن، لــە دەســتەو کۆمەڵــەی خێرخــوازی بەشــداری بکــەن، هاونـشینی پیاوچاکان بـن، نـاو مـاڵو پەرتوکخانـەیان ڕێکخـەن، وەرزشـی سـودمەند بکەن، سود بە هەژارانو پەك کەوتانو بێ نەوایان بگەیەنن، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ... ڕەنجی زۆر دەدەی بگـەی بـە پـەروەرێنی خـۆت، ئەوسا پێی دەگەی. (٦) الانشقاق ﴾ .

مێژو وەخوێنە مەینەت بارو ڕوتو ڕەجاڵو[544] بەلا بارانت وەبەر چاوان دەکەوێ.

لــەدوای چــەند باســێ لەمــەڕ ئــەو لێکۆڵینەوەیــە تابلۆیــەکی خــەمو خــەمینی خەمبارانت دەخەمە بەرچاو بەناونیشانی: بە مەینەتباران دڵت بدەوە.

﴿ ... وَكُلّٗا نَّقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَۚ ... ئەم حەمکە[545] دەنگـو باسانەی پێغەمبەرانت بۆ دەکەین، کە دڵداریت بدەینەوە. (١٢٠) هود ﴾ .

---

٥٤٢) کۆتایی پێ هاتوە.

٥٤٣) بۆ پەند لێ وەرگرتن.

٥٤٤) بێ ماڵ و هەژار.

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ ... لەسەرگوزەشـتەی ئەمانـە، پەنـد هەیـە بـۆ بـە ئاوەزان[٥٤٦]. ﴿١١١﴾ یوسف ﴾ .

﴿ ... فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ... تـۆ لـەو تـەرزە باسـانەیان بـۆ وەگێـڕە شایەتا بیـر بکەنەوە. ﴿١٧٦﴾ الأعراف ﴾.

(پێـشەوا) عومـەر دەڵـێ: بـەیانیم کـردەوە هـیچ داخوازێکیـشم نیـە تـەنیا چێژ وەرگرتن نەبێ لە دیمەنەکانی بڕیارو فەرمانی خوا.

مەبەست لەو وتەیەدا ئەوەیە: پێشەوا دڵ خۆشـە بـە قـەزاو قـەدەری خـوا، ئەوسا ئەو بڕیارو قەزاوقەدەرە لە بەرژەوەندی ئەو بێ یا لە دژی بێ.

هەندێکی تریش دەڵێن: بەلامەوە گرنگ نیە لە دو تاقیکردنـەوان بـەکامیان تـاقی بکرێمەوە، ئەگەر هەژاری بێئارامی لەسەر دەگرم، ئەگەر دەوڵەمەندیش بێ سوپاسی لەسەر دەکەم. ئـەبو زوهـەیبی هـوزەلی لـە یـەك سـاڵدا بـە سـای پـەتای کۆمـەڵکوژی هەشت کوڕی لەدەستدا، چی بڵێ باشە؟ باوەڕی پتەو بو ملکەچ بـو سـەری بـۆ قـەزاو قەدەری خوا داخستو، لە هۆنراوەێك دا ملکەچی خۆی نیشاندا.

﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ... کـەس هـیچ بـەڵای بەسـەر نایـە، مـەگین خودا فەرمان بدا. ﴿١١﴾ التغابن ﴾ .

(ئیبن عەباس) چاوی لەدەستدا، بەوە دڵی خـۆی دایـەوەو لـە هۆنراوەێکدا گـوتی: ئەگەر خوا ڕوناکی چاوەکانمی ڕەواندەوە ئەوا ڕۆشناییم لە دڵو دەروندا هەیە.

ئەوەیە دڵ نەوایی بەو بەهرە زۆرانـەی خـوا پێبەخـشیوە لـە کاتێکا هەنـدێ لـەو بەهرانە لەدەست بدا.

عوڕوەی کوڕی زوبـەیر لـە یـەك ڕۆژدا قاچی بڕایـەوەو کوڕەکەشـی مـرد، کەچـی گوتی: سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگارا، ئەگەر تۆ بی بەیتەوە هەر تـۆش بەخـشیوتە،

---

٥٤٥) ئەو هەمودەنگ و باسانەی....

٥٤٦) تێگەیشتوان.

ئەگەر تۆ دەردو بەڵا بنێری هەر خۆشت چاکی دەکەیتەوە، چوار ئەندامت خەڵات کردوم، یەکێکت بۆ خۆت بردەوە، چوار کوڕیشت پێ دابوم یەکێکت لێ سەندمەوە.

﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةً وَحَرِيرًا ... چونکە ئەوان خۆڕاگر بون، لە پاداشا بەهەشتو حەریری پێدان. ﴿١٢﴾ الإنسان ﴾ .

﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ ... هەر لە سای هێمنی دابن، چونکە ئێوە خۆڕاگر بون. ﴿٢٤﴾ الرعد ﴾ .

(عبدالله...ی کوڕی سەمتی برای دوڕەید کوژرا، دوڕەید دوای ئەوەی باسی کرد کە بەرگری لە برایەکەی کردوە بەپێی توانای، بەڵام چارە نەبو دەبوایە بڕیارو فەرمانی خوا بێتە دیو، (عبدالله...ی برای کۆچی دوایی کرد، دوڕەید لە هۆنراوەێکدا باس لەوەدەکا، کە بەرگری لە برایەکەی کردوە بەڵام کەس لە ژیاندا نامێنێ دەبێ بمرێ.

هەروا ئەم هۆنراوەیە ئامۆژیارو دڵنەوا کارە بۆ بەڵاباران، لە پێشەوا شافعی گێڕراوەتەوە:

وازبێنە لە رۆژگار چی دێ بەخێر بێ
قەزای خوا ڕودەدا دڵیشت ئاسودە بێ
گەر قەزا بەسەر گەلێك دابباری
زەوی و ئاسمان دەستەوسانن بەجاری

**چەند جاران لە مردن ترساوینو هێشتاش هەر ماوین؟!**

چەند جاران لامان وابوە ئەو جارەمان تیاچونو کۆتا ژیانە، کەچی بویتە مایەی سەرەتایەکی نوێو هێزو وزەو بەردەوامی (لە ژیانماندا)؟! چەند جاران ڕێگاکانمان لێ تەسك بونەوە، ئومێدو خۆزگەمان پچڕا، ئاسۆیەکانمان لەبەرچاودا تاریك بون، لە ناکاوێ موژدەی ئازادیو سەرکەوتنمان پێ دراو دەروی خێرمان لە ڕودا والا کرا؟!

﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٍ ... بێژە: خوا ڕزگارو دەکا لەو تەنگانەو لە هەمو بەڵایەکی دیش. ﴿٦٤﴾ الأنعام ﴾ .

چەند جاران دنیا لە ڕوماندا ڕەش هەڵگەڕا، زەویمان لێ تەنگ بوەوە لەگەڵ ئەو فراوانیەیدا سینەو ناخمان وێك هاتنەوە، لە ناكاوێ خێرو خۆشی بەر فراوانو سەركەوتنو كۆمەكی گەیشتە جێ؟!

﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ... ئەگەر خودا بەلایەكت بەسەر بێنێ، بە غەیری خۆی كەس لەسەرتی وەلانابا. (١٧) الأنعام ﴾ .

هەر كەسێ بزانێ خوا بەسەركاری خۆیدا زاڵە، چۆن لە كارو كردەی خەڵكان دەترسێ؟!

هەر كەسێ دڵنیا بێ كە هەمو شتێ لە خواروی دەسەڵاتی خوایە، چۆن بەشتێ دەترسێ كە لە خوا بەرەو خوارە؟! هەر كەسێ لە خوا بترسێ چۆن لە غەیری خودا دەترسێ، لە كاتێكا دەفەرموێ: ﴿ ... فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ ... ئێوە لەوان ترسو نەبێو، دەبێ هەر لە من بترسن. (١٧٥) آل عمران ﴾ .

شكۆمەندیو سەربڵندی لە لایەن خوای تاكو پاكە، شكۆمەندی بۆ خواو پێغەمبەری خواو بڕوادارانە.

زاڵ بون هەر ئی خوایە، ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ... دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەردەكەوێ. (١٧٣) الصافات ﴾.

﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ... بێ گومانە ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەو كەسانەی كەوا بڕوایان هێناوە، لە ژیانی ئەم دینایەداو لەو ڕۆژەشدا كە شایەتان ڕاست دەبنەوە، یاری دەكەین.[٥٤٧] (٥١) غافر ﴾ .

ئیبن كەسیر لە تەفسیرەكەیدا وتەیەك بەناوی فەرمودەی قودسی دەگێڕێتەوە: **(( و عزتي و جلالي ما اعتصم بي عبد، فكادت له السماوات والارض، الا جعلت له من بينها فرجاء مخرجاء عزتيء جلالي ما اعتصم بغيـري الا اسخت الارض من تحت قدميه...** سوێند بە گەورەییو دەسەلاتی خۆم هەر بەندەیێ پشت بە من ببەستێ،

٥٤٧) یاریدەیان دەدەین، سەریان دەخەین.

ئاسمانەکان‌و زەوی پیلانی لە دژ بگێڕن، هەردەبێ لەو پیلان گێڕیە ڕزگاری کەم. سوێند بە گەورەیی‌و دەسەڵاتی خۆم هەر بەندەیێ پشت بە جگە لە من ببەستێ هەردەبێ زەوی لە ژێر پێیاندا ڕانەگرم. پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: بە سای "لا حول ولا قوة الا بالله" باری گران هەڵدەگیرێ، بەرگەی مەینەتی دەگیرێ، بوارو چۆنیەتی ڕەخساو دەستەبەر دەکرێ. ئەی بەندە هەرگیز ئەو زیکرە لە یاد مەکە! چونکە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت یەکێکە لە بنەمای بەختەوەری‌و، ڕێڕەوی خۆشگوزەرانی‌و، سینە فراوانی.

## داوای لێخۆشبون گرێ کوێرە دەکاتەوە...

(ئیبن تەیمیە... دەڵێ: جاری وایە گرێ کوێرەیەکم دێتە پێش سەد جار یا زیاتر یا کەم تر "استغفر الله" دەکەم، خوای گەورە بۆم دەکاتەوە.

﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ... هەر پێم گوت: داوای بوردن لە پەروەرندەتان بکەن، ئەو بێ گومان زۆر لێبورە. ﴿١٠﴾ نوح ﴾.

یەکێ لەوانەی دڵارامیت بەسەردا دێنێ ئەوەیە بەندە ژێوانی بۆ خوا بنوێنێ. زۆر زیانباری هەن سودمەندن، هەرچی قەزاو قەدەری خوایە هەموی خێری تێدایە هەتاوەکو تاوانیش بە مەرجی خۆی.

لە موسنەدی (ئیمام ئەحمەدیشدا... هاتوە: (( لا يقضي الله للعبد قضاءً الا كان خيراً له... هەرچی خوا بۆ بەندەی خۆی بڕیار بدا تەنیا بۆی دەبێتە مایەی خێرو چاکە)).

لە (ئیبن تەیمیە)یان پرسی: هەتاوەکو تاوانیش؟ گوتی بەڵێ: ئەگەر تۆبەو پەشیمانی لەگەڵ دابێ، داوای لێبوردن‌و شەرمەزاری تێدا بێ.

﴿ ... وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ... جا ئەمانەش لە پاش ئەوەی کە ئەو غەدرمیان

لە خۆ کرد گەر بهاتبانەوە لای تۆو داوای خودا لێخۆشبونیان بکردایە، تۆ یەکیش کە پێغەمبەری، داوای لە گوناھ بوردنت بۆ ئەوانە بکردبا، بێگومان ئەو سادەیاندی کە خوا پەشمانیەکەیان قبولّ دەکاو دلۆڤانە. ﴿٦٤﴾ النساء ﴾ .

﴿ ... وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ... ئێمە ئاوا لە ناو خەلّکا زەمانە دەستاو دەس دەکەین. ﴿١٤٠﴾ ﴾ آل عمران.

﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ... ئـەوێ ڕۆژێ کـە دەیبینـن، وا تێدەگەن بە دەر لە ئێوارەی ڕۆژێك یان چێشتانێ نەماونەوە. ﴿٤٦﴾ النازعات ﴾ .

بە گەورە پیاوانێ سەرسامم کە مێژو شایەتیان بۆ دەدا، بەو شێوە پێشوازیان لە مەینەتیەکان دەکرد هەروەکو بلّێی بەلایانەوە تنۆکی ئاوی باران بون، یا گزە بای نەرمی شەمالّ بون، لە سەروی هەموشیانەوە گەورەو پێشەوای مرۆڤایەتی بو — محمد ﷺ کە لەناو ئەشکەوتا، بە هاوەلّەکەی دەلّێ: ﴿ ... لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ... خەمت نەبێ! ئێمە خودامان دەگەلّە. ﴿٤٠﴾ التوبة ﴾.

کاتێ شار وەدەرو ڕەهەندە[٥٤٨]، کرا لە ڕێگای کۆچ کردنیدا مزگێنی لە دەست کردنی بازنەکانی کیسرای بە سوراقەدا!

لە جەنگی بەدردا پێغەمبەری خوا لە ژێر کەپرەکەیەوە هێرش دەباو دەفەرموێ: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ... هەر بینا ئەو ئاپۆرەیە لە شەڕ شکاو پشت بکەنەوەو ڕابکەن. ﴿٤٥﴾ القمر ﴾ .

لە جەنگی (ئوحود)دا - دوای کوژرانو بریندار بون- بە هاوەلانی دەلّێ: ((صفُّوا خلفي لأثني على ربّي... بە دوامەوە ڕیز بن تاوەکو سوپاسی پەروەردیارم بکەم. ئەوە ورە بەرزی پێغەمبەرایەتیە کە سەری لە هەسارەی چل چرا دەدا، ورەیێکە چیایەکان دەهەژێنێ.

---

٥٤٨) دەربەدەر.

(قەیس)ی کوڕی (عاصم)ی (مونفری) کە یەکێ بو لە نـەرمو نیانـەکانی عـەرەب، باوەشی لە ئەژنۆیەکانی گرتبو سەربوردەیەکی بۆ خەڵك دەگێڕایەوە پیاوێ هاتە لای پێی وت: هەر ئێستا کوڕەکەت کوژرا، کوڕی فلانە کەس کوڕی تـۆی کوشـت، دەسـتی لە ئـەژنۆی نـەکردەوەو، سـەربوردەشـی نەپـچڕی، هـەتا کۆتـایی بـە وتەکـەی هێنـا، پاشان گوتی: کوڕەکەم بشۆنو کفنی بکەن، دوای بـانگم بکـەن نوێـژی لەسـەر بکـەم! ﴿... وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ ... لـە نـەداریو گرفتـاریو تەنگانـەدا خۆڕاگرن. ﴿١٧٧﴾ البقرة﴾ .

عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل لە سەرە مەرگدا ئاویان پێدا، گوتی بی دەنە فلانـە کەس. ئەو گوتی بۆ یەکی تری ببەن یەك لە دوای یەك دەستاو دەسـتیان پـێ دەکـرد هەتا هەمویان مردن[٥٤٩].

## خـەڵك نەیـاری تۆیە نـەك لە بەرژەوەنـدی تۆیـە

کەسی ژیرو کارامە[٥٥٠]وا دادەنێ هەر کەسەی لەبەرژەوەندی خۆی کار دەکا نەك بۆ ئەو، لە نواندنی هەڵوێستو بڕیار دان پشت بە خەڵکی نابەستێ، چونکە خـەڵك لە هەڵسو کەوتو هاوکاریان بەرامبەر غەیری خۆیـان سـنورێکیان دانـاوە، لـە قوربـانی دانو هەوڵو گەڕیان مەودایەکیان دیاری داوە لێی تێ ناپەڕن.

دەرس لە حوسێنی کوڕی عەلـی وەرگـرە - خـوا لـە خـۆیو بـاوکی ڕازی بـێ -، کـە کـچە زای[٥٥١] پێغەمبـەری خـوا بـو ﷺ کاتـێ شـەهید کـرا هـیچ کـەس تـەنیا بـە وشەیەکیش ورتەی لێوە نەهات، بەڵکە ئەوانـەی کوشـتیان دەنگیـان بـە هوتـافو (الله اکبـر... هەڵـدەبڕی بـە سـای ئـەو سـەرکەوتنە گـەورەی بەدەسـتیان هێنـا بـو بـە کوشتنەوەی!!، خوای لـێی ڕازی بێت.

---

٥٤٩) کۆمەڵە هاوەڵێك بریندار بون هیچیان ئاویان لەبەر یەکتر نەخواردەوە تا هەمویان مردن.
٥٥٠ لێهاتو.
٥٥١) کوڕی کچی پێغەمبەر بو.

(ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) بەرەو بەندیخانە ڕاکێشرا، زۆر بە توندی ئازار درا، هاتە سەر گیانەلا، کەسێ جوڵەی تێ نەکەوت.

(ئیبن تەیمیە) قۆڵ بەست کرا، بە سواری هێسترەکەی بەرەو وڵاتی مصر کەوتە ڕێ، ئەو هەمو کۆمەڵو ئاپۆڕەی ئامادەی ناشتنی تەرمی بون تەکانێکیان بە خۆ نەدا، چونکە خەڵك سنورێکیان دانەوە لەوێ نارۆن بەو لاوە، ﴿... وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ... تەنانەت قازانجو زەرەری خۆشیان بە دەس نیە، نە مردنیشیان بە دەستەو نە ژیانو نە ژینەوەی لە پاش مردن. (٣) الفرقان﴾ .

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ئەی پێغەمبەر! بۆ تۆو بۆ باوەڕدارانێ شوێنت کەوتون، خودا بەسە. (٦٤) الأنفال﴾ .

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ ... سا تۆ خۆت بدە دەس کەسێ کە هەر زیندوەو نامرێ. (٥٨) الفرقان﴾ .

﴿إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ... ئەوان ناتوانن لە خوات بێ نیازکەن. (١٩) الجاثية﴾ .

## ماڵ بە فیرۆ مەدە "ئەوەی دەست بگرێتەوە هەژار نابێ"

ئەو بیرو بۆچونەی دەبێتە پاڵنەری بە فێرۆدانی سامانو دەستبلاویو خەرجکردنی بە شێوەیەکی نەشیاو، یا هاندەرێکە بۆ ئەوەی بە هیچ شێوەیێ ماڵ کۆنەکرێتەوە بۆچونێکی هەڵەیە، تەنیا لە عیبادەت کارە هیندیەکانو کۆمەڵێکی نەزان گوازراوەتەوە.

بێگومان ئیسلام داوای کار کردن دەکا بە ڕێگایەکی پیرۆزو، بۆ پەیدا کردنی سامانێکی پیرۆزو، خەرج کردن لە ڕێگایەکی پیرۆز، بۆ ئەوەی بەندە بە سای ماڵو

سامانی سەر بڵند بێ، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: (( **نعم المال الصالح في يد الرجل الصالح**... چاك ترین ماڵ ئەو ماڵەیە لە دەستی پیاوی چاك دابێ. فەرمودەیەکی (حسن)ە بێگومان یەکێ لەوانەی مایەی دڵپەستیو خەمانە زۆر بونی قەرزانە، یا هەژارییێکە مایەی نابوتیو دارمانە:

((فهل تنتظرون الا غنیً مطغیا او فقرا منسیا... ئایە جگە لە دەوڵەمەندییێکی سنور بەزێن، یا هەژارییێکی لەبیرخەرەوە چاوەڕوانی چ دەکەن؟

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنا دەگرێ بە خواو دەفەرموێ: (( **اللّهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر**... پەروەردگارا پەنات پێ دەگرم لە بێ باوەڕیو هەژاری.

دەشفەرموێ: (( **كاد الفقر ان يكون كفرا**... نزیکە هەژاری ببێتە بێ باوەڕی. ئەو فەرمودەیە لەگەڵ ئەو فەرمودەیەی (ئیبن ماجە... دەیگێڕێتەوە تێکناگیرێن، ئەگەر چی فەرمودەییێکی بێهێزە (کە دەفەرموێ): (( **ازهد في الدنيا يحبك الله، وازهد فيما عند الناس يحبك الناس**... دنیا بەکەم بنرخێنە خوا خۆشی دەوێی، ئەوەی لەلای خەڵکە بەکەمی بنرخێنە خەڵك خۆشی دەوێی. بەڵام مەبەست ئەوەیە: بایی ئەوەندەت هەبێ بەرچاوت تێر بێ، ئەوەندەی چاوت لە دەستی خەڵك نەبێو ماڵو سامانیان لێ نەخوازی، بەڵکە بەرێزو دەست پاك بی، ئەوەندەت هەبێ لە ئاستیاندا ڕوسوربی، (( **ومن يستغن يغنه الله**... هەر کەسێ خوا پێ داوی گەرەك بێ خوای گەورەش پێی دەبەخشێ)).

لە فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (( **انك ان تذر ورثتك اغنياء، خيرٌ من ان تذرهم عالة يتكففون الناس**... ئەگەر تۆ میرات گرانت بە دەوڵەمەندی جێبهێڵی، باشترە لەوەی بە هەژاری جێیان بهێڵیو دەست لەبەر خەڵکان پان کەنەوە.

لە فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەریشدا هاتوە: (( **اليد العليا خير من اليد السفلى**... دەستی باڵا چاترە لە دەستی واڵا. ئەو دەستەی کە باڵایە ئەوەیە دەبەخشێ، دەستی واڵا ئەو دەستەیە داوا دەکاو وەردەگرێ، ﴿... يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ ... ئەوی ئاگایان لێ نیە، وا دەزانن هیچ ئاتاج نین. ﴿٢٧٣﴾ البقرة ﴾ .

مەبەستی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە: بۆ مرۆڤەکان مەرایی[٥٥٢] نەنوێنی جا داوای ڕۆزیان لێبکەی‌و دەستکەوتێ بەدەست بێنی، بێگومان خوای شکۆدارو پایەدار ڕۆزی‌و مـردن‌و دروسـتکردنی بەتـەمای کـەس نـەکردوە، چـونکە ئەوانـەی بەسـای باوەڕداری ڕێزدارن، هەمیشە سەربڵندن‌و، پایە دارن، سەریان شۆڕ نیەو بەدەمارن[٥٥٣].

﴿ ... أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ... ئاخۆ بەتەمان کە لای وان قەدرو حورمەتیان دەسـکەوێ؟ ﴿١٣٩﴾ النساء ﴾.

## هـەر بە خــوا پەیوەنــدی ببەسـتە

ئەگەر ژێنەرو مرێنـەرو ڕۆزیـدەر تـەنیا خـودا بێ، بـۆ دەبـێ تـرس‌و دودڵیت لـە خەڵکان بێ؟! وا هەست دەکەم زۆربەی سـەرهەڵدانی خـەم‌و خـەمینی لـە دەرەنجامی هـەبونی پەیوەندیـە بـە خـەڵکی، هەوڵدانـە بـۆ ڕازی کردنیـان‌و، خـۆ لـێ نزیـك خستنەوەیان‌و، چاوگێڕانە لە سوپاسیان‌و، هەراسان بونە بـە سـای بـەد گۆیی ئـەوان، ئەوەشیان هۆکارەکەی بۆ لاوازی یەکتاپەرستی دەگەڕێتەوە.

## چـەند هۆکارێکــی دڵشــادی

(ئیبن قەیم) چەند مەسەلەیەك باس دەکا، کەسینە شادو گوشاد دەکەن:

گرنگتـرینیان: یەکتا پەرستیە: بە پێی ئەندازەی پاك‌و بێ خەشی یـەك خواپەرسـتی دڵ ئاسودەو ئارام دەبێ، هەتا وای لێدێ لە دنیاو ئەوەیشی تێی دایە فراوانتـر دەبێ.

مـەردمی بـێ بـاوەڕو هاوبـەش پەیداکـەریش هـیچ ژیـانی نیـە، خـوای تـاك‌و پـاك دەفـەرموێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ

---

٥٥٢) ماستاوچیاتی.

٥٥٣) سـەربڵندن.

أَعۡمَىٰ ... هەر کەسێکیش لە ئامۆژگاری مـن نـەکاژێن‌و لـە تەنگانـە دایـەو، ڕۆژی سـەڵاش کۆره لە گۆڕی دەردە خەین. ﴿١٢٤﴾ طـه ﴾ .

هــەروا خــوای بــێ هـــــاوتا دەفــەرموێ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ ... هـەر کەسـێ خـوا حـەز بکـا، بـۆ خـۆی ڕێگـەی نیـشان دەداو بـۆ بـڕوا بـە ئیسلامەتی دڵی گوشادی دەداتێ. ﴿١٢٥﴾ الأنعام ﴾ .

شـکۆداری بـۆ ئـەو کـە دەفـەرموێ: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ ... ئـاخۆ کەسـێ خـودا دڵـی بـۆ ئیـسلام گوشـاد کـردوەو دیـاره بـەر تیـشکی بـەزەیی پەروەرندەی خۆی کەوتوە. ﴿٢٢﴾ الزمر ﴾.

خوای گەورە بە سینە تەنگی‌و ترس‌و بیم‌و دڵاو دڵی‌و نیگەرانی هەڕەشە لە نەیارانی دەکـــا، ﴿سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ ... ئەوانەش کە خوانەناسن، چـونکە بـێ ئـەوە بەڵگـەیان لـە حـەواوە بـۆ هاتبێ هاوکار بۆ خودا دەناسن، ترسێ داوێژینە دڵیان. ﴿١٥١﴾ آل عمران ﴾.

﴿... فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ... هـاوار بـۆ ئـەو کەسـانە دڵـڕەقن لـە یـادی خودا. ﴿٢٢﴾ الزمر ﴾.

﴿وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ ... کێش خـوا حـەز بکـا گـومڕای بکـا، هێنـدە نەفـەس تـەنگی دەکـا، وەك بـەرەو سـەرو سەرکەوێ. ﴿١٢٥﴾ الأنعام ﴾.

یەکێ تر لەوانەی سینەو ناخی پێ دەسرەون زانستی بە کەڵکە جا زانایـان لـە هـەمو کـەس پـتر دڵـشادو دڵ گوشـادن، سـینە فـراوان‌و ئاسـودەن، چـونکە میراتـی پێغەمبـەری خوایان پێ بڕاوە: ﴿... وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ ... زۆر شتی وای فێری تۆ کرد کە تـۆ پێشو نەتدەزانین. ﴿١١٣﴾ النســاء ﴾.

﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ... سا بزانه غەيرە خودا هيچ شت بۆ پەرستن نابێ. (١٩) محمد ﴾.

كردەوەى چاكە: هۆكارێكى ترە: بە ڕاستى چاكەكارى مايەى ڕۆشنايى دڵەو، ڕەونەقى روخسارە، مايەى فراوانبونى ڕۆزيەو، جێى خۆ كردنەوەيە لە دڵى خەڵكدا، ﴿ ... لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ... بێ گومانە لە ئاوێكى زەبەندە تێراويان دەكەين. (١٦) الجن ﴾.

هۆكارێكى تر: چاو نەترسيە: مەردمى چاونەترس دڵو دەرون ئاوەدانە، خۆ گرەو، سەقامگيرە، چونكێ پشتى بە خوا دەبەستێ، بە كارەساتان نالەخشێ[٥٥٤]، بە پڕوپاگەندە ناهەژێ، بە هەواڵى دڵ تەزێن هەڵناتۆقێ[٥٥٥]

هۆكارێكى تر: خۆپاراستن لە تاوان: بێ گومان تاوان ڕاستەوخۆ ژيان لێخن[٥٥٦] دەكا، دڵو دەرون پەست دەكا، خۆشى تارو مار دەكا.

هۆكارێكى تر: زيادە ڕۆيى نەكردن لە حەلاڵ: وەكو قسە كردنو خواردنو نوستنو تێكەلاوى، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ... ئەوانەش كە لە قسەى پوچ دورى دەكەن. (٣) المؤمنون ﴾.

﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ... هەر وتەى لە دەم دەربچێ، چاوەدێرێكى لا هەيە. (١٨) ق ﴾.

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ... خواردنێ بخۆنو وەخۆنو لە ئەندازە دەرمەچن. (٣١) الأعراف ﴾.

---

٥٥٤) كارى تێناكا.

٥٥٥) ناترسێ/ ناتۆقێ.

٥٥٦) شێلو/شلوێ.

## خـوا بڕیاری خـۆی داوە

یـەکێ لـەو نەخۆشـانەی بـە دەردی خـەمو دڵ پەسـتی گـیرۆدە بـو، پرسـیار لـە پزیشکێکی موسڵمانی پسپۆڕ لە نەخۆشی دڵە ڕاوکێو نیگەرانی دەکا، پزیشـك پێـی دەڵێ: دڵنیا بە خوا لە دروسـتکردنو بـەڕێوەبردنی جیهان بویتـەوە، هـەر جوڵـەیێو هەر چرپەیێ لەم جیهانە ڕودەدا هەموی بە فەرمانی خوایە، کەوایە ئـەو مـاتو لێـو بە باریەت لە چی دایە؟! (( ان الله کتب مقادیر الخلائق قبـل ان یــخلق الله بـخمـسیـن الف سـنة... پـەنجا هـەزار سـاڵ بـەر لـە دروسـت بـونی بونـەوەر خـوای گـەورە هـەمو دروستکراوەکانی ئەندازە گیـر کردوە.

## تـــامو چێــژی ئـــازادی

"ڕاشد" لە کتێبـی "المسـار" دا دەڵێ: هـەر کەسـێ سـێ سـەدو شەست کولێرەو کوپـە ڕۆنێـكو هـەزارو شـەش سـەد دەنکـە قەسـپی لـە لابـێ، هـیچ کەسـێ نایکـا بـە کۆیلەی خۆی.

یەکێ لە پێشینانیش دەڵێ: هـەر کەسـێ بـە نانـە وشـکەو ئـاو ڕازی بـێ، لـە هـەمو کۆیلایـەتیێ ڕزگـاری دەبـێو تـەنیا بەنـدەی خـوا دەبـێ، ﴿وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ... بۆیەش بە کەسی نەبەخشی کە پاداشی بدرێتەوە. ﴿١٩﴾ اللیل﴾ .

ئەوانـەی هـەوڵ دەدەن بـە سـای کۆکردنـەوەی سـامانو دەسـتەبەرکردنی موچـەو پلەو پایە بەختیاری وەدەست بێنن، بۆیان ڕۆشن دەبێتەوە کە بە ڕاستی بەدبـەختو دۆڕاو هـەر ئـەونو، تـەنیا خـەمو پـەژارەیان پـێ بـڕاوە، ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ... هەروەك تاك تاکەو بە تـەنیا لـە پێشودا، ئێوەمان وەدیهێناوە، هەرواش هاتونە لامان هەر چیش ئێمە پێمان دابون، لە دواتانەوە بەجێما. ﴿٩٤﴾ الأنعام﴾.

﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ... بەڵام ئێوە ژینی دنیا هەڵدەبژێرن. کەچی لەولا باشترو بە پێزتر هەیە. ﴿١٧﴾ الأعلى﴾ .

## سوفیانی سەوری سەرینی گڵ بو

(سوفیان)ی (سەوری) لە کاتی حەجکردن لە (موزدەلیفە) گومەزێك خۆڵ دەکاتە سەرینی، خەڵکان پێی دەڵێن: ئا لەم شوێنەدا سەروەخۆڵ دەکەی کەچی تۆ فەرمودەناسی جیهانی؟ پڕ لەدڵەوە گوتی: ئا ئەو سەرینەم لە سەرینی خەلیفە (ئەبی جەعفەر)ی (مەنسور) بە نرخ ترە.

﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ... بێژە: بێژگە ئەوەی خودا بۆی نوسیبین توشمان نایە. ﴿٥١﴾ التوبة﴾ .

## بە بەڵێنی بەدگۆیان باوەڕ مەکە

بەڵێنی بە درۆ، پڕوپاگەندەی بەربڵاوی نابەجێ، ئەوەی زۆربەی خەڵك لێی دەترسێ، تەنیا خەیاڵەو نایێتە جێ، ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ... شەیتان ئێوە لە نەداری دەترسێنێو بۆ خراپە هانودەدا. خواش بەڵێنی لێ خۆشبونو خۆشی ژیانو پێدەدا. فەرحانی والای خودایەو خۆی زانایە. ﴿٢٦٨﴾ البقرة﴾ .

برینی گەدەو خەو زڕانو نیگەرانی: بەرهەمی هیوابڕانو هەستکردنە بە نوچ دانو داڕمان.

## وتەی نابەجێو جوێن پێ دان زیانت پێ ناگەیەیێنن

"ئیبراهام لینکۆڵن" سەرۆکی پێشوی ئەمریکا دەی وت: ئەو جوێننامەی بۆم ڕەوانە دەکرێ من نایخوێنمەوە، زەرفەنامەکەش ناکەمەوە، چ جای وەڵامی لەسەر بدەمەوە، چونکو ئەگەر بێو خۆمی پێوە سەرقاڵ کەم بۆ گەلو نەتەوەم هیچ شتێ پێشکەش ناکەم.

﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ ... سا تۆ واز لەوانە بێنە. (٣٠) السجدة ﴾ .

﴿ ... فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ ... سا تۆ چاوپۆشی بکە بە پیشەو چاوپۆشیت بێ گازاندە بێ. (٨٥) الحجر ﴾ .

﴿ فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ ... سا تۆ لەوانە وازبێنەو بێژە: ئێستا بێ ترس بن. (٨٩) الزخرف ﴾ .

حەسان لە شیعرێکدا دەڵێ، کە ئەوە مەبەستەکەیەتی:

وتەو گوتەی لۆمەکارو گەزاران‌و [٥٥٧] هەرزە گۆیان [٥٥٨] ئەوانەی لە ئاستی ئابڕوی خەڵکدا چەنە بازو دەم داڕون [٥٥٩]، نە زیان گەیێنن نە شیاوی بایەخ پێ دانن، نە جێی خۆیەتی موسڵمان ڕوی بەلایدا لاکاتەوە، یا مرۆڤی گوستاخ [٥٦٠] لێی بسڵەمێتەوە [٥٦١].

سەرکردەی دەریاوانی ئەمریکی لە جەنگی جیهانی دوەم دا پیاوێکی بە کارو بەرچاو بو، حەزی لە ناوو دەنگ بو، هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەوانەی ژێر دەستی دەکرد کە بە لێزمە جوێنیان پێ دەداو قسەی ناشیرینیان پێ دەگوتو سەرزەنشت یان

٥٥٧) بێ شەرمان.

٥٥٨) زمان شڕان.

٥٥٩) زۆر بلێن.

٥٦٠) ئازا.

٥٦١) بڕەوێتەوە.

دەكرد، هەتا دەڵێ: ئێستا كە بەرگرییێكم بۆ دروست بوە لە ڕەخنە، زۆرم دنیا دیتو، بە ساڵدا چوم، دڵنیا بوم كە قسە شكۆداری نارمێنیو قەڵای پۆڵایین هەڵناوەشێنێ.

لـە پێغەمبـەر عیـسا دەگێڕنــەوە - درودی لەسـەر- كـە دەفـەرموێ: دوژمنـەكانتان خـۆش بـوێ. دەربـارەی نـەیارانتان لێبـوردنێكی گـشتی دەرکـەن، هـەتاوەكو لـە مـاف سەندنەوەو تۆڵە كردنەوەو ئەو ڕقو كینەی بەرەو نـەمانتان دەبـات بەدوركەونــەوە، ﴿ ... وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ... ئەوانــەش كــە لــە مــەردم چاوپۆشـی دەكەن، خوا چاكەكاری خۆش دەوێن. (١٣٤) آل عمران ﴾ .

((أذهبـوا فانتـم الطلـقاء... بـڕۆن ئێـوە ئـازادن، ﴿ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ ... ئیمڕۆ گازاندەو لەسەر نەماوە. (٩٢) یوسف ﴾ .

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ ... خودا لە كاری ڕابردو چاو دەپۆشێ. (٩٥) المائدة ﴾.

## نەخــش و نیگــاری ئەم گــەردونە وەخوێنــەوە

تێڕوانینو وردبونەوە لەم گەردونە، لەم پەرتوكە بەرهەڵە، خوێندنـەوەی جوانی لە نیگاری وەدی هاتوی خوای خاوەن شـكۆو توانـادارو چێژ لـێ وەرگـرتنی، یەكێكە لەوانەی ناخو دەرون دەسرەوێنێ، خوای گەورە دەربـارەی دروسـتكراوانی دەفـەرموێ: ﴿ فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٖ ... گەلێك باخچەی بە دیمەنمان بە ئاوەكەی شین كردوە. (٦٠) النمل ﴾ .

﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ ... ئەمــە كارەكــانی خــودا، دەسا ئێوە نیشانم دەن غەیرە خودا چیان كردوە. (١١) لقمان ﴾ .

﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ... بێـژە بـەری خـۆ بـدەنێ لـە ئاسمانـانو زەمیندا چی هەیە. (١٠١) یونس ﴾ .

دوای چەند لاپەڕێ لەمەودوا، لەمەڕ بونـەوەر هەنـدێ هەواڵت پـێ دەدەم تـا بـە گـەورەیی‌و کاراشـنایی خـوا ئاشـنا بـی ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... ئـەو خوایەیــە بـە هـەمو دەسـتکردی خـۆی هـەمو پێداوێـستی داوە، پاشـانیش ڕێـی نیشان داوە. (٥٠) طـه ﴾ .

خوێندنەوەو وردبونەوە لەو خۆرە پڕشنگ دارە، لەو هـەمو ئەسـتێرە درەخـشان‌و تروسکەدارە، لە ئاوی ئەم ڕوبارە...لەو هەم‌و چەم‌و چۆبارە..لـەو گـردو تەپۆڵکەیـە.. لەو دارو درەختەیـە..لە (هەمە ڕەنگی) ئەو میوەیــــە.. لـە ئاووهـەوا..لـە ڕۆشـنایی، ﴿ ... فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ... دەس ڕەنگینی هـەر بـۆ خوایـە، کـە هـیچ وەسـتایە پێـی ناگـا. (١٤) المؤمنـون ﴾ .

﴿ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ... ئەمانە چۆن ڕانەماون، کە وشـــتـــر چۆن وەدیهێنراوە؟ (١٧) الغاشية ﴾ .

(ئەنیشتاین) دەڵێ: هەر کەسێ لەو بونەوەرە ورد بێتەوە تێ دەگا کە بەدی هێنەر کاراشنایەو زانایە، گاڵـتە کارنیە.

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ... ئەو کەسێکە هـەمو شـتی - بەوپـەڕی ڕێکـی‌و لـە باری- دروست کرد. (٧) السجدة ﴾ .

﴿ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ... هەر بۆ ڕاستی هەمومان وەدەیهێناون. (٣٩) الدخان ﴾ .

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا ... ئـاخۆ ئێـوە پێتـان وابـو بـە گەمـە دروسـتن کردون. (١١٥) المؤمنون ﴾ .

مەبەست ئەوەیە: هەمو دروست کراوێ بە ئەندازەیەو لـە جێـی خۆیـە، بـە یاسـاو ڕێخستنە، هەر کەسێ لەو گەردونە بڕوانێ دەزانێ خوایەکی توانادار هەیە لـە گـۆترە کارەکان هەڵناسوڕێنێ، گەورەیی‌و شـکۆ بۆ ئەو.

دوای ئەوە خوای بەرزو توانا دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ... خۆرو هەیڤیش -بە ئەندازە- دێنو دەچن. ﴿٥﴾ الرحمن ﴾ .

﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ... نە خۆر توانای هێنـدەی هەیە بگا بە مانگ، نە شەو وەپێش ڕۆژ دەکەوێ. سەر لەبەریش لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. ﴿٤٠﴾ يس ﴾ .

## چاو برسێتی بێ سودە

پێغەمبەری خوا -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: (( **لـن تـموت نفـس حتـى تستكمل رزقها وأجلها**... هیچ گیانداری نامرێ تاوەکو ڕۆزیو ماوەی ژیانی کۆتایی نێ.

کەوایە پەشۆکانو شپرزەیی لە پێناو چی؟! قوڕ پێوانو خاکە ساری لەبەرچی؟! ئەگەر ماوەی تەمەنو ڕۆزی بڕیاری لەسەردرا بێو کار لە کاترازابێ ئەو هەمو ماندوبونەی دەوێ؟!

﴿ ... وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ... هەمو شتێك لە لای ئەو ئەندازەی هەیە. ﴿٨﴾ الرعد ﴾ .

﴿ ... وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ... خوا بە هەر چی فەرمان بدا -بێ زیادو کەم- دەبێ بکرێ. ﴿٣٨﴾ الأحزاب ﴾.

## تەنگژە تاوانت ڕەش دەکاتەوە

لە ئیبن موعتەزی شاعیر دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: ئای ئەو کەسەی پشت بە خوا دەبەستێ خوای گەورە چۆن وەلاّخەکەی بۆ ڕام دەکا، ئەوەی متمانەی بە خوا بێ گەڕانەوەی لەسەر فەر چەند بۆ سانا دەکا!! بە دروستی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

گێڕدراوەتەوە کە دەفەرموێ: ((ما يصيب المؤمن من همّ، ولا غمّ، ولا وصب، ولا نصب، ولا مرض، حتى الشوكة يشاكها، الا كفر الله بها من خطاياه... هەر خەمو پەژارەیێ، هەر ئازارو ئەشکەنجەیێ، هەر دەردو بەلاَیێ، بڕوادار پێی گیرۆدەبێ، هەتا دڕکێکی پیا بچەقێ، بە بێ گومانی خوا تاوانی پێ ڕەش دەکاتەوە. ئەو پاداشتە بۆ کەسێکە ئارامگر بێو چاوی لە پاداشتی خوا بێو بۆ لای ئەو پەشیمانی دەربڕێ، بشزانێ لەگەڵ خوایەکی زۆر بەخشندەو بێ هاوتا مامەڵە دەکا)).

﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ... هەتا ئێوە بۆ شتێ لە دەستو دەچێ، خەم نەخۆنو بە دەسکەوتو دڵخۆش نەبن. ﴿٢٣﴾ الحديد ﴾.

## خـوا بەسـمانەو باشـترین پاڵپشـتمانە

ئەو وتەیە: ((حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ... (ئیبراهیم) پێغەمبەر گوتی لەو ساتەی خرایە ئاگر، ئاگر بو بە ساردێکی بێ زیان.

لە جەنگی (ئوحود) موحەممەد پێغەمبەری خوا -درودی خوای لەسەر بێ- ئەو رستەیەی دەربڕی جا خوا بەسەر دوژمن دا زاڵی کرد.

لەوکاتەی (ئیبراهیم) خرا نێو مەنجەنیق [٥٦٢] (جبریل) پێی وت: ئایە هیچ پێویستیت بە منە؟ (ئیبراهیم) پێی گوت: پێویستی بە تۆ نەخێر، بەڵام پێویستی بە خوا بەڵێ!

دەریا مرۆڤ نغرۆ [٥٦٣] دەکا، ئاگریش دەیسوتێنێ، بەڵام ئەویان وشک بو، ئەمیان دامرکا، بە سای (( حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ )).

پێغەمبەر (موسا) بینی دەریای لە پێشەو دوژمنیشی بە دواوەیە.

---

٥٦٢) ئامێرێك بوە چتیان پێ فڕێ داوە.

٥٦٣) نقوم.

فـەرموی: ﴿ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ... نابـێ هـیچ بترسـن چـونکە پەروەرنـدەم دەگەڵەو بەم زوانە دەروێکم لـێ دەکاتەوە. بە ویستو فەرمانی خوا ڕزگاری بو. ﴿٦٢﴾ الشعراء ﴾ .

لە ژیانو بەسەرهاتی پێغەمبەری خوادا -درودو سڵاوی خـوای لەسـەر- باسکراوە: لەوکاتـەی چـوە ئەشـکەوت، خـوای گـەورە کـۆتری بـەوە ناچـار کـرد لـەناو دەرگـای ئەشـکەوت هێلانـە دروسـت کـا، جاڵجاڵۆکـەی بـەوە ناچـار کـرد دەمـی ئەشـکەوت بـە تەونەکەی بتـەنێ [٥٦٤]، بێ باوەڕان گوتیان: (موحەممەد) دێرەوە نەچوە.

بەڕاستی ئەوە لە هانـا هـاتنو یارمـەتی خوایـە، ئەگـەر بەنـدە ڕوی بـۆ لاکاتـەوەو، بیـرکاتەوە کە پەروەردیارێکی فریادڕەسو تواناداری، میهرەبانو سەرپەرشـتیار هەیـە، ئەوسا بەندە ملی کەچ دەکاو بۆی دەچەمێتەوە.

﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ... تۆ بە بەرچاوی ئێمەوەی. ﴿٤٨﴾ الطـور ﴾ .

﴿ ... فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ... چاکتـر پارێزەر خودایەو هەر خـۆی لە هـەمو دڵسـۆزان دڵسـۆزترە. ﴿٦٤﴾ یوسف ﴾ .

## کـەرسـتەی بەختـەوەری

تیـرموزی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (( من بـات آمنـا فـــي سربــــه، معافىً فـي بدنه، عنده قوت يومه، فكأنـما حيزت له الـدنيا بـحذافيـــرها... مەبەست لەو فەرمودەیە ئەوەیە: ئەگەر بەندە خۆراکێکی هەبێو، لە حەسـاوگەیێ جـێ نـیش بێ، لـە مەترسیـشدا نـەژیێ، ئـەوا خۆشـترین بەختـەوەریو خێـرو خۆشـی بەسـەردا ڕژاوە، زۆر کەسیش ئەو بەهرەی وەدەست هێناوە، بەڵام بیـری لـێ ناکەنـەوە، دەرکـی پێ ناکەنو بەلایدا لاناکەنەوە.

---

٥٦٤) بچنێ.

خوای بەرزو بێ هاوتا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿... وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي ... تەواو بەهرەی خۆم بەسەردا کردن. ﴿٣﴾ المائدة﴾ .

چ بەهرەیەکە بە تەواوی بەسەر پێغەمبەری خوادا - درودی خوای لەسەر- ڕژاوە؟ ئایە خواردنو خۆراکە؟ یا کۆشكو باڵەخانەو زێڕو زیوە، کەچی هیچ شتێ لەوانەی شك نەدەبرد؟ ئەو پەیامبەرە شکۆدارە -درودی خوای بەسەردا برژێ- لە زۆرێکی بە قوڕ هەڵنراو دەخەوت، سەری بە لقو گەڵای دارخورما گیرا بو، دو بەردی لەسەر سگی پێچا بو، پاڵی وەسەرینێك دەدا کە لە گەڵای دارخورما هەلپێچرا بو شوێنەواری لە کەلەکەی دەردەچو، زرێیەکەی لە بری سی ڕبە جۆ لەلای جولەکەیێ بە بارمتە دانابو، سێ ڕۆژ بەسەریدا تێدەپەڕی کامە قەسپی خراپە دەستی نەدەکەوت ژەمێکی بە تێری لێ بخوا.

﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٤﴾ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ... دیارە دواڕۆژ بۆ تۆ لە دنیا چاترە. بەم زوانەش پەروەندەت چاکەی وەهات دەگەڵ دەکا، ڕازی دەبی. ﴿٥﴾ الضحى﴾ .

﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ... ئێمە زۆی شتماندا بە تۆ. ﴿١﴾ الكوثر﴾ .

## باجی بەرپرسیارێتی

کاربەدەستی یەکێکە لەوانەی شەکەت کاری ژیانن.

مەبەست ئەوەیە: باجی بەرپرسیارێتی گرانە، ئاوی ڕوان دەتکێنێ، حەسانەوەو سرەوتن ناهێڵێ، کەمن ئەوانەی ئارەقەو خوێنیان، ناودەنگو سانەوەیان، شکۆمەندیو سەربلندیو قەدرو ڕێزیان، نەکەنە قوربانی ئەو باجەی ڕۆژانە دەی دەن، (( لا تسأل الامارة )) بەرپرسیارێتی مەخوازە.

**((نعمــت المرضــعة و بئســت الفاطمة))** دنيا باشترين شيــر پــێ دەرەو خراپتــرين لە شيــر کەرەوەیە[٥٦٥].

وا دانێ دنیات بە هەمو نازو گۆزەوە هاتە بەردەستان، باشە دەرەنجام بـەرەو کـوێ دەچێت؟ بـەرەو نـەمان، ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ... هـەر پـەروەردگاری خاوەن شکۆی بەرزو بەرێزت دەمێنێ. ﴿٢٧﴾ الرحمن﴾.

یەکێ لە پیاوچاکان بە کورەکەی دەڵێ: ڕۆڵە سەری هیچ شتێ مەبە، چونکە سـەر ئێــشو ژانی زۆرە. حەزت لە سنگ ڕەپێش کردنو سەرپەلی نەبێ، چونکە زۆربـەی ڕەخنەو گلــەییو گازاندە، باج دانو ناچار کردن ئەوانەی لە پێشەوە دەگرێتەوە.

## دەی بۆ نوێــژ ئامـــادە بە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ... ئــەی گــەلی خــاوەن بــاوەڕان پەنابەرنەبەر نوێژانو خۆڕاگر بن. ﴿١٥٣﴾ البقرة﴾.

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ توشـی گرفتـێ بهاتایـە، یەکسـەر پـەنای بـۆ نوێـژکردن دەبرد.

دەشی فەرمو: **((أرحنا بها يا بلال))** ئەی بلال بە سای نوێژ بمان حەسێنەوە.

هەروا دەیفەرمو: **((جعلت قرة عيني من الــصلاة...** بیلبیلـەی چاوم لـە نوێـژکردن دایە)).

ئەگەر هەستت بە سینە تەنگی کرد، لەمپـەرێکت هاتـە ڕێ، داوو تەڵەی زۆرت بـۆ دانراوە، یەك سەر بەرەو جێ نوێژ بڕۆو نوێژ بخوێنە.

ئەگـەر ڕۆژگـار لەبەرچـاوت ڕەش هەڵگـەڕا، شـەوان گۆڕانکاریـان بەسـەردا هـات، دۆستو هاوەڵانت پشتیان لـێ هەڵکردی، دەردت بە نوێژ تیمار کە.

---

٥٦٥) لەو فەرمودەیە دنیا بە ژنی شیردەر چوێنراوە، واتە ئەگەر یەکێ پێیەوە هۆگر بێ بە ئاسانی دەستبەرداری نابێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەنگانەو کێشەی زۆر گەورەدا بە سای نوێژ دڵی خۆی ئاو دەدایەوە، وەکو لە جەنگی (بەدر)و (ئەحزاب)و لە زۆر شوێنی تریش.

دەربارەی (ئیبن حەجەر)ی هۆشیارو ژیر خاوەنی کتێبی "الفتح" دەگێڕنەوە کە دەچێتە (قەلعە) لە (میسر) ڕێگرو چەتە دەورەی دەگرن، هەڵدەستێ دەست دەکا بە نوێژکردن، خوای گەورە لە دەستی ئەوانی ڕزگار دەکا.

(ئیبن عەساکر)و (ئیبن قەیم) دەگێڕنەوە: یەکێ لە پیاوچاکان لە ڕێگای شام چەتەیەك ڕێگای لێ دەگرێ، دێتە سەر ئەوەی بی کوژێ، داوای لێ دەکا مۆڵەتی دوورکات نوێژی پێ بدا، ڕادەوەستێو دەست دەکا بە نوێژ، ئەو وتەی خوای گەورەی بەبیر دێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ... یا ئەو کەسەی چاترە کە هەر وەختێ هومێد براوێك لەبەری بپارێتەوە، دە هانای دێ. (٦٢) النمل ﴾.

سێ جار دوبارەی کردەوە، فریشتەیەك لە ئاسمانەوە بەخۆیو چەقۆیەك دابەزیو چەتەکەی کوشتو، گوتی: من نوێنەری ئەو کەسەم وەڵامی لێ قەوماوێ ئەداتەوە کە هاواری بۆ بکا.

﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ... بە کەسو کاری خۆت بێژە: نوێژان بکەن، خۆشت وازی لێمەهێنە. (١٣٢) طه ﴾ .

﴿ ... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ... نوێژ خوێندن مرۆ لە کاری ناشیرنو ناڕەوا دەپارێزێ. (٤٥) العنكبوت ﴾ .

﴿ ... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ... نوێژ لەسەر خاوەن باوەڕان نوسراوێکە، وەختی بۆ دیاریکراوە. (١٠٣) النساء ﴾ .

یەکێ لەوانەی دڵو دەرون دەحەسێنن، خەم پەژارە ڕەوێنن، سڵاوەت لێدانە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ: ﴿ ... يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! سا ئێوەش پەسنی[٥٦٦] (پێغەمبەر) بدەنو بە دڵو گیان سڵاوی خودای لێ بکەن. (٥٦) الأحزاب ﴾ .

---

٥٦٦) داوای ڕژانی میهر و سۆزی بۆ بکەن.

لە کن ((تیرموزی)) ئەو فەرمودەیە بە (سەحیح) هاتوە: کە (ئوبەی) کوڕی (کەعب) ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لە نزایەکانم چەندی بۆ تۆ بێ؟

فەرموی: ((ما شئت)) ئەوەندەی حەز دەکەی.

گوتی: چارێکی؟

فەرموی: ((ما شئت، وان زدت فَخَیْر)) ئەوەندەی حەز دەکەی، ئەگەر زیادیکەی چاکترە....

گوتی: لە سێ بەشان دوی؟

فەرموی: ((ما شئت، وان زدت فَخَیْر... ئەوەندەی حەز دەکەی، ئەگەر زیادیکەی چاترە، گوتی: هەمو نزایەکانم بۆ تۆ بێ [٥٦٧] ؟

فەرموی: ((اذن یغفر ذنبك، وتکفی همك... ئەو کاتە خوا تاوانت دەبورێو، بۆ لابردنی پەژارەش بەستە)).

لێرەدا بەڵگە هەیە، کە خەمو پەژارە بە ناردنی درودو سلاو بۆ پێشەواو گەورەترین دروستکراوی خوا دەڕەوێتەوە: (( من صلی علي صلاة واحدة صلی الله علیه بها عشرا... هەر کەسێ سلاوەتێکم لەسەر لێ بدا، خوای گەورە دە سلاوەتی لەسەر لێدەدا)).

((أکثروا من الصلاة عليَّ لیلة الجمعة ویوم الجمعة، فان صلاتکم معروضة عليَّ... لە شەوو ڕۆژی هەینیدا زۆر درودو سلاوم بۆ بنێرن، بێ گومان سلاوەتی ئێوە دەخرێتە بەرچاوم.

گوتیان: چۆن سلاوەتی ئێمە دەخرێتە بەرچاوی تۆ لەکاتێکا تۆ هێسکەکانت ڕزیوە؟!

فەرموی: ((ان الله حرَّم علی الأرض ان تأکل أجساد الأنبیاء... خوای گەورە لەسەر زەوی قەدەغە کردوە لاشەی پێغەمبەران بڕزێنێ)).

---

٥٦٧) هەمو نزایەکانم سلاوەت لێدان بێ لەسەر تۆ.

لە ڕاستیدا ئەوانەی شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری خوان ﷺ بەدوای ئەو پەیامە دەکەون کە بەسەرەویدا دابەزیوە بەشێکیان لە دڵ گوشادیو پایە بـەرزیو ڕێـزداری وەبەردەکەوێ.

(ئیبن تەیمیە) دەڵێ: تەواوترین سڵاوەت لێدان لەسـەر پێغەمبـەر ﷺ سـەڵاوەت لێدانی ئیبراهیمە (بەو شێوەیە): (( **اللّهم صلّ على محمد وعلى آل محمد كما صليت على أبراهيم وعلى آل أبراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد، كما باركت على أبراهيم وعلى آل أبراهيم في العالمين، انك حميد مجيد**)).

## بەخشـندەیی شـادی دڵـــە

چاکەکاری، ئەوانە هەموی دەگرێتەوە کە شادی هێنو خەمو پەژارە ڕەوێنن وەکو: بەخـشندەییو چـاکەو پیـاوەتی نوانـدن بـۆ خـەڵك، بـێ گومـان چاکەکاری چـاترینی ئەوانەیـە سـینەو ناخیـان پـێ ئـاوەدان دەبـێ، ﴿... ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم ... لـەو بژێوەی کە پێم داون بەخت بکەن. ﴿٢٥٤﴾ البقرة ﴾.

﴿وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ ... پیاوو ژنی سەدەقەدەریش. ﴿٣٥﴾ الأحزاب ﴾ .

پێغەمبەری خوا ﷺ مەردمی ڕژدو مەردمی بەخشندەی بەو دو کەسە چوان دوە هەریەکە جوبەیـەکی لەبـەربێ، کەسـی بەخـشندە هەمیـشە دەبەخـشێو چـاکە دەکـا، جوبەو زرێ ئاسنەکەی فراوان دەبێ، هەتاوەکو شوێنەواری بزر دەکا، کەسـی ڕژدیـش هەردەستی دەقوچێنێو نابەخشێ، جوبەکـەی وێـك دێتـەوەو تـەنگی پـێ هەڵئەچنـێ هەتا وای لێدێ گیانی تەنگ دەکاتەوە!

﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثۡبِيتٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ كَمَثَلِ جَنَّةِۭ بِرَبۡوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٞ فَـَٔاتَتۡ أُكُلَهَا ضِعۡفَيۡنِ فَإِن لَّمۡ يُصِبۡهَا وَابِلٞ فَطَلّٞۗ ... ئەو کەسانەش کە لە چاکە دەگەڵ هـەژاران کردنـدا، بـە هومێـدن خـودا لـەخۆ ڕازیکـەنو دڵیان بەبڕوا پتەوبێ خێرەکەیان وەك باغێکە لەسەر گردێكو بارانی پەڵەی لێبداو بەروبوی دو ئەوەندە بێ، ئەگەر پەڵەشی لێنەدا، نمە باران تێراوی کا. ﴿٢٦٥﴾ البقرة ﴾ .

هەروا خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ... دەستەكانت دەگەردنت وەرمەهێنە. ﴿٢٩﴾ الإسراء ﴾.

بێ گومان دڵ پەستی بەشێكە لە دەست بەستی[٥٦٨]، ئەوانەش كە دەست دەقوچێنن‌و ڕژدن لە هەمو كەس سینە تەنگترو كەم ڕەوشترن، چونكە ڕژدی بە بەهرەی خوا دەنوێنن[٥٦٩]، ئەگەر دەركیان بەوە بكردایە هەرچی بە خەڵكانی دەبەخشن بۆ ئەوەیە لە ژێر سایەیدا بحەسێنەوە، بۆ ئەنجام دانی كردەی چاكە دەست پێشخەریان دەكرد، ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ... ئەگەر ئێوە قەرزێ ڕەوا بە خودا ڕەوا ببینن، چەند قات پێتان ئەداتەوەو لە گوناهو خۆش دەبێ. ﴿١٧﴾ التغابن ﴾ .

ئەوجارەش خوای بەرزو بێ‌هاوتا دەفەرموێ: ﴿... وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ... كەسانێكیش خۆ لە ڕژدی دەپارێزن، ئەوانە ڕزگارەكانن. ﴿٩﴾ الحشر ﴾.

﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ... لەو بژێوەش كە پێمان داون دەبەخشن. ﴿٣﴾ البقرة ﴾.

حاتەمی دەستكراوە[٥٧٠] لە شیعرێكیدا فەرمان بە هاوسەرەكەی دەكا مێوانداری مێوانانی بكا، چاوەڕێی گەشتەوان‌و دێدەوانانی بێ تاوەكو نانیان لەگەڵ بخواو، بە هاونشینی ئەوان دڵی ئاسودە بێ، پاشان مەرام‌و ویستی خۆی تەواو ڕۆشن دەكاتەوە، ئەو مەرام‌و مەبەستەشی هاوڕێژەیەكی هەژمارەیی پێك هەڵێێكە، بە هاوسەرەكەی دەڵێ:

**بێنە بەرچاوم كەسی دڵفراوان بەر لە مەرگی مردبێ**
**ئەوەی كە قرچۆكیشە دنیای هەتا سەر ببێ**

---

٥٦٨) دەست گرتنەوە.

٥٦٩) ناى بەخشن.

٥٧٠) بەخشندە.

ئایە داکردنی[571] ماڵو سامان تەمەنی خاوەنەکەی درێژ دەکا؟ ئایە بەخـشینی مـاڵو سامان تەمەنی خاوەنەکەی کورت دەکا؟ نەخێر.

## ڕق دامــەگــرە

(وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنْ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ... هـەر وەختـێ لـە شەیتانەوە دوچاری خەیاڵاتێك بوی، بە گورجی پـەنا بـە خـوا بـەرە، کـە خـۆی بیـسەرو زانایە. فصلت ⁄ ٣٦.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژیاری یەکێ لە هاوەڵانی دەکا دەفەرموێ: (( **لا تغـضب، لا تغضب، لا تغضب...** ڕق دامەگرە، ڕق دامەگرە، ڕق دامەگرە)).

هەروا پیاوێ لە لای پێغەمبەر ﷺ ڕقی هەڵسا، فەرمانی پێ کرد پەنا بگرێ بە خـوا لە شەیتانی نەفرینکراو.

خـوای گـەورەش دەفـەرموێ: ﴿ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ... هـەر هانـاش دەبەمـە بەر تۆ، کە ئەوان دێن بە لامەوە. (٩٨) المؤمنون ﴾ .

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَـٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ .... ئەو کەسانەی پارێزگارن، هەرگا خەیاڵی خراپیان لە شەیتانەوە توش دەبێ، بـە گـورجی یادی خوا دەکەنو بەرچاویان ڕون دەبێتەوە. (٢٠١) الأعراف ﴾.

ئەوەی مایەی لێڵکردنی ژیانو پەیداکردنی دەردو خەمانو تورە بونو ڕق هەڵسانە، ڕێگا چارەی لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ دانراوە.

یەکێ لە ڕێگـــــا چارەکـان: ئەوەیـە هـەوڵ دەیگـرێ ڕقو کیـــنە بکوژێنیـــەوە، ﴿ وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ... ئەوانەش کە ڕقی خۆیان دەخۆنەوە. (١٣٤) آل عمران ﴾.

﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمْ يَغْفِرُونَ ... لەکاتی تورەبونیشیان عەفو دەکەن. (٣٧) الشورى ﴾.

---

[571] کۆ کردنەوە/ خڕکردنەوە.

یـەکێ تـر: دەسـتنوێژە، بـێ گومـان ڕق هەڵـسان پۆلـوی ئـاگرە، ئـاگریش بـە ئـاو دەکوژێتەوە، ((الطهور شطر الايـمان... دەستنوێژ هەڵگرتن بەشێکە لە باوەڕ)).(( الوضوء سلاح المؤمن... دەستنوێژ چەکی بڕوادارە)).

یەکێ تر: ئەگەر ڕق هەڵساو بە پێوە بو دابنیشێ، ئەگەریش دانیشتبو پاڵکەوێ.

یەکێکی تر: ئەگەر ڕقی هەستا قسـە نەکاو بێ دەنگی بنوێنێ.

ڕێگاچـارەیەکی تـریش ئەوەیـە: پاداشـتی ئەوانـە وەیـاد خاتـەوە، کـە ڕقـی خۆیـان دەخۆنەوەو چاودەپۆشـنو دەبورن.

## چـەند دوعـاو نـزای بەیانیـان

ئێـستا چـەند نزایـەکت پـێ دەڵـێم هەموبـەیانیێ بیخوێنـە، تـاوەکو ئاسـودەییو کامەرانیت بۆ فەراهەم بێنیێو، لە خراپـەی شـەیتانو، مرۆڤـ و پـەری بتپـارێزێ، بـە درێژایی ئەو ڕۆژە تا ئێوارە پەنات بدا.

ئا ئەو چەند دوعایە لەو دوعایانەن کە بـە بـێ گومـانی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بیسـتـراون:

١- ((أمسينا وامسى الملك لله، والحمد لله ولا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شئ قدير، رب اسألك خيـر ما في هذه الليلة، وخير ما بعـدها، واعوذ بك من شر هذه الليلة وشر ما بعدها، ربّ اعوذ بك من الكسل وسوء الكبر، رب اعوذ بك من عذاب في النار وعذاب في القبـر... ئێوارەمان کردەوەو موڵکیش ئێوارەی کردەوە بۆ خوا، سوپاس بۆ خواو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە جگە لەو، بـێ هـاودەمو هاوبەشـە، دەسـەڵاتو سـوپاس هـەر بـۆ ئـەوەو، بەسـەر هەمو شتێدا زاڵە، پەروەردگارا خێرو چاکەی ئەم شەوەت لێ دەخوازمو، چاکەو فەڕی دوای ئەو شەوە شت لێ داوا دەکەم، پـەنات پـێ دەگـرم لـە خراپـەو زیـانی ئەو شەوەو، دوای ئەم شـەوەش، پـەنات پـێ دەگـرم پـەروەردگارا لـە تەمبـەڵیو خراپەی پـیریو بـە ساڵدا چـون، پـەروەردگارا پـەنات پـێ دەگـرم لـەو سزایەی دۆزەخو ئەو سزایەی لە ناو گۆڕدا)).

٢- (( اللّهم عالم الغيب والشهادة، فاطر السماوات والارض، رب كل شيء ومليكه، اشهد ان لا اله الا انت، اعوذ بك من شر نفسي، وشر الشيطان وشركه، وان اقترف على نفسي سوءا او اجره الى مسلم... پەروەردگارا ئەوەی نهێنیو ئاشكرات لێ دیارە، وەدی هێنەری ئاسمانەكانو زەوی، پەروەرندەو خاوەندی هەمو دروستكراوێ، گەواهی دەدەم كە هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە تۆ لە بەدفەڕی دەرونم، لەبەد فەڕی شەیتانیو بە هاوبەش دانانی، لەوەی خۆم توشی خراپەیێ بكەم یا بەسەر موسڵمان ێكی بێنم)).

٣- (( بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيء في الارض ولا في السماء وهو السميع العليم... بە ناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەو هیچ شتێ نە لە زەویو نە لە ئاسماندا زیان نادا، ئەویش بیسەرو زانایە)). سێ جار.

٤- (( اللّهم اني اصبحت اشهدك واشهد حملة عرشك وملائكتك وجميع خلقك انك انت الله لا اله الا انت، وحدك لا شريك لك، وان محمد عبدك رسولك... پەروەردگارا من بەیانیم كردەوە تۆ دەكەمە شایەتو هەڵگرانی عەرشەكەتو فریشتەكانتو هەمو دروستكاراوەكانت دەكەمە شایەت كە تۆ خوایو هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە جگە لە تۆ، تۆ بێ هاوتایو هاوبەشت نیە (موحەممەد)یش ﷺ بەندەی تۆو نێرراوی تۆیە)). چوار جار.

٥- (( اللّهم اني اعوذ بك ان أشرك بك شيئا وأنا اعلم، وأستغفرك لما لا أعلم... پەروەردگارا پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی دروستكراوێ بكەم بە هاوبەشت كەچی بشزانم، داوای لێبوردنیشت لێ دەكەم لەوەی نایزانم)). سێ جار.

٦- (( أصبحنا على فطرة الاسلام، وعلى كلمة الاخلاص،، على دين نبيّنا محمد ﷺ، وعلى ملة ابينا أبراهيم حنيفا مسلما وما كان من المشركين... بەیانیمان كردەوە لەسەر سروشتو خوی موسڵمانەتیو، وشەی یەكتاپەرستیو، لەسەر ئایینی (موحەممەد)ی پێغەمبەرمان ﷺ لەسەر ئایینی ئیبراهیمی باوكیشمان بەبێ هاوبەشیو بە موسڵمانەتی، ئیبراهیمیش لە هاوبەش پەیداكەران نەبو)). سێ جار.

٧- (( سبحان الله وبحمده: عدد خلقه، ورضاء نفسه، و زنة عرشه، و مداد كلماته... پاكی بۆ خواو سوپاس بۆ خوا: بە ئەندازەی دروستكراوانیو پێ ڕەزایی خۆی، بە قەد گرانایی عەرشی ئەوو، مەرەكەبی وشەكانی)). سێ جار.

٨- (( رضيت بالله رباً، وبالاسلام ديناً، و محمد ﷺ نبياً... ڕازیم بەوەی: الله پەروەردیارم بێو، ئیسلام ئایینم بێو، موحەممەد ﷺ پێغەمبەرم بێ)). سێ جار.

٩- (( اعوذ بكلمات الله التامات من شرّ ما خلق ... پەنا دەگرم بە وشەكانی خوا كە تەواو بێ كەمو كوڕین، لە خراپەی هەرچی دروستكراوی خوایە)). سێ جار.

١٠- (( أللهم بِك اصبحنا وبك أمسينا، وبك نحيا، وبك نموت، واليك النشور... پەروەردگارا بە سای تۆ بەیانیمان كردەوەو بە سای تۆ ئێوارەمان كردەوە، ژیانو مردنمان بە سای تۆیەو گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە)) سەد جار.

١١- (( لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير... بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە، تاكو تەنیایەو بێ هاوتایە، هێزو دەسەڵاتو سوپاس هەر بۆئەوە، ئەو بەسەر هەمو شتێدا زاڵە)). سەد جار.

## هەڵوەستەیەك

(ئیبن قەیم) دەڵێ: "خواناسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە سەرشۆڕیو دۆڕان لەوەدایە: خوای گەورە بە تەمای دەرونی خۆت بكا، نێوانی تۆو نەفست چۆڵ كا. سەركەوتنیش لەوەدایە: خوای گەورە بە تەمای خودی خۆت لێت نەگەڕێ جا بەندەكان لە نێوانی یارمەتی دانی خوای پەروەردگارو دەست لێ بەردانیان هەڵگێڕو وەرگێڕان دەكەن، بەڵكو بەندە لە یەك ساتدا لە هەردوكیان پشكی خۆی پێ دەبڕێ، بە یارمەتی خوا گوێڕایەڵی دەكاو خوا لە خۆی ڕازی دەكا، یادی خواش دەكاو

ستایشی دەکا، دوا بە دوای ئەوە بە سای ئەوەی خوا کۆمەکی لەسەر دەگرێتەوە، سەرپێچی خوا دەکاو لێی یاخی دەبێ، خوا لە خۆی دەرمنجێنێو لە یادی ئەچێتەوە، جا بەندە لە نێوانی یارمەتی خواو کۆمەکی لێ گرتنەوەی دا دەخولێتەوە.

ئەوسا هەر کاتێ بەندە لەم ڕاستیە تێ گەییو حەقو مافی خۆی پێ دا، دەزانێ هەمو کاتو ساتێ چەندە ئاتاجی کۆمەکیو یارمەتی خوایەو تەنیا چاو قوچانێ لێی بێ پێویست نیە، دەش زانێ باوەڕی ئەوو یەکتاپەرستی بە دەست خوای دەستە بالایەو ئەگەر چرکەیێ پشتی تێ بکرێ تەختو تاراجی یەکتا پەرستیەکەی دادەڕمێ، ئاسمانی باوەڕو خواپەرستی بەسەر زەویدا دەکەوێ، دەش زانی ئەوەی ئاسمانی خوا پەرستیەکەی ڕاگرتوە: هەر ئەویشە تەنیا بە ویستی خۆی نایەڵێ ئاسمان بەسەر زەویدا بڕوخێ".

## قورئــان.... کتێــبی پیــرۆزە

خوێندنەوەی کتێبی خوا بە تێفکرینو لێوردبونەوەو تێدا قوڵبونەوە یەکێکە لە بەختەوەریو سینە شادی، خوای گەورە بەوە کتێبی خۆی دەناسێنێ کە ڕێنماییو ڕۆشناییو چارەسەری نەخۆشی ناو سینەکانە، بەوەش دەی ناسێنێ کە میهرو سۆزە، ﴿... قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ ... لەلایەن پەروەندەو ڕا ئامۆژگاریە کو پێ گەیشت، چارەی دەردی دڵانیشە. (٥٧) یونس﴾ .

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ... ئاخۆ ئەوان لەو قورئانە ڕانامێنن، یان دڵیان گاڵە دراوە؟ (٢٤) محمد﴾ .

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ... ئاخۆ ئەمانە لە قورئان ورد نابنەوەو ﴿سەرنجی ڕانەکێشاون﴾؟ ئەگەر قورئانیش کاری کەسێکی تر بوایە غەیری خودا، دیارە مەبەستی نارێکو دژ بە یەکتریان فرە تێدا پەیدا دەکرد. (٨٢) النساء﴾.

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ ... ئەم قورئانە پڕ لە پیتو پیرۆزەمان بە خەڵات بۆ تۆ ناردە خوار، تا لەسەر نیشانەکانی ڕابمێنن. (٢٩) ص ﴾ .

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەم قورئانە لە خوێندنەوەو، کار پێ کردنیو، دانانی بە دادوەرو، یاسا لێ هەڵێنجانی پیرۆزە.

یەکێ لە پیاوچاکانیش دەڵێ: هەستم بە خەمو پەژارەیێ کرد لە ناو ناخم دا کە هەر خوا پێی ئاگادار بو، دەستم دایە قورئانو بەردەوام بوم لەسەر خوێندنی، سوێند بە خوا کتو پڕ ئەو خەمو پەژارەیەم ڕەویەوە، خوای گەورە لە بری ئەو خەمە ئاسودەییو ئارامی بەسەردا هێنام.

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ ... بێگومان ئەم قورئانە ڕێگایەکی پیشان دەدا لە گشت ڕێیان سەر ڕاستترە. (٩) الإسراء ﴾ .

﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ... بەو قورئانە، خوا ئەوانەی شوێنی ڕەزای ئەو دەکەون، دەخاتە سەر ڕێی هێمنی. (١٦) المائدة ﴾.

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ ... هەر بەم جۆرەش ئێمە لە فەرمانی خۆمان گیانێکمان ناردە لای دڵت. (٥٢) الشورى ﴾ .

## لەسەر بە دەستهێنانی ناوو دەنگ سور مەبە

چونکە خاکە ساریو مەینەت باریو بەڵا باری باجەکەیتی، یەکێ لەوانەی دڵ توشی ڕاڕایی دەکاو ڕۆشنایی لێخن دەکاو هێمنیو هەداری بن بڕ دەکا: پێ داگرتنە لەسەر خۆدەرخستنو ناودەنگ پەیداکردنو، خواستنی ڕەزامەندی خەڵکە، ﴿ ... لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ ... لەم عەرزا نایانەوێ خۆ بە زلتر بزانن و بەد فەڕی بکەن. (٨٣) القصص ﴾.

((من رأى رأى الله به، ومن سَمَّعَ سَمَّعَ الله بــه... هەركەسێ مـەرایی بنوێنـێ، خـوای گەورە لەبەرچاوی خەڵك نهێنی بەدەر ڕاوەردەكا، هەركەسێكیش نـاوودەنگی پەیـدا بكا خوای گەورە لە ناو خەڵكا ڕیسوای دەكــا.

﴿... يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ ... ڕوبینی لە خەڵك دەكەن. ﴿١٤٢﴾ النساء﴾.

﴿... وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ ... پێیان خۆشــە بـۆ كـارێ كـە نـەیانكردوە تاریف [٥٧٢] بكرێن. ﴿١٨٨﴾ آل عمران﴾ .

﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ... ئێـوە وەك ئەوانـە مـەبن، بۆ خۆبینیو بۆ ڕوبینی لە ناو مەردم لە زێدەكەیان دەركەوتن. ﴿٤٧﴾ الأنفال﴾ .

## خۆشگـوزەرانی

یەكێ لەو مەسەلانەی نكوڵی لـێ ناكرێ ئەوەیە: گەورەترین هۆكاری بەختـەوەری كە من لێرەدا دەیاننوسـم بـاوەڕ هەبونـە بـەو خوایـەی پەروەرنـدەی هـەمو جیهانـە، بێگومان ئـەو سودو زانیـاریو هۆكارانـەی تـر كـە كۆمكردونەتـەوە ئەگـەر هـەمویان پێشكەشی یەكێ بكرێن بەڵام باوەڕی بـە خـوا نـەبێو، بەسـەر ئـەو گەنجینـە پـڕ بـە هایە هەڵنەبێ، بـە هـیچ جـۆرێ كـەڵكو سودیان لـێ نابینـێ، بـا بەدوایـدا نەگـەڕێو خۆی شەكەت نەكا.

لە ڕاستیدا بنچینەی هەرە ڕەسەنو داسەپاو باوەڕ هێنانـە بـەوەی خـوا پـەروەردیارت بێو، (موحەممەد) پێغەمبەرت بێو، ئیسلام ئاینو بەرنامەت بێ.

ڕاسـترینو بایەخدارترین وتە فەرمودەی پـەروەرێنی بـێ هاوتامانـە: ﴿مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ... هەركەسێ كرداری باشەو بە بـاوەڕە -چ نێـر، چ مـێ- هـەتا دەژی وا

٥٧٢) پێیان دا هەڵبگوترێ.

دەکەین بە خۆشی بژی، دیاریشە باشتر لەوەی وا کردویانە، ئێمە پاداشتیان دەدەینێ. ﴿٩٧﴾ النحل ﴾.

لەو ئایەتەدا دو مەرج (بۆ بە خۆشی ژیان... دانراوە: باوەڕ بە خواو، پاشانیش ئەنجامدانی کردەی چاکە، ﴿... سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ... ئەوانەی باوەڕیان هەیەو ئاکار چاکن، خوا دەیان کاتە خۆشەویست. ﴿٩٦﴾ مریم ﴾ .

دو سودو قازانجیش (لە ئایەتی ڕابردودا... وەردەگیرێن بە خۆشی ژیان لە دنیاو لە دوا ڕۆژدا، بە دەست هێنانی بەخششو خەڵات لە لایەن خودای بەرزو بێهاوتا، ﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ... مژدە بۆ وان کە لە دنیاو لە قیامەتێ گفتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایە. ﴿٦٤﴾ یونس ﴾ .

## بەڵاو مەینەتی لە بەرژەوەندی تۆیە

بە کۆست کەوتن دامەچڵەکێ، بە کارەساتان مەشلەژێ، لە فەرمودەدا هاتوە: (( **إن الله اذا أحب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا، ومن سخط فله السخط...** ئەگەر خوا گەلو نەتەوەیەکی خۆشویست تاقیان دەکاتەوە، جا هەرکەسێ قایل بو ڕەزامەندی وەدەست دێنێو، هەر کەسێکیش ناقایل بێ خەشمو قین وەدەست دێنێ.

## بەندایەتی گوێ دێرانەو ملکەچانە

یەکێ لە کەرەستەو تفاقی باوەڕداری ئەوەیە بە قەزاوقەدەری خێرو شەڕ ڕازی بێ، ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ... دیارە ئێمە بەهێندێك ترسو برسیبونو لەناوچونو کەمبونەوەی ماڵی دنیاو بەروبومان، تاقیتان دەکەینەوە. مژدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن. ﴿١٥٥﴾ البقرة ﴾.

بێ گومان هەمیشە قەدەر بە پێی ویستو ئارەزوی ئێمە نیە بەڵکو ئێمە بە ساى کەم دەسەڵاتیمان لە هەڵبـژاردنی بڕیارو قەزاوقەدەر شارەزا نین، ئێمە لە ئاستی پێشنیار کردن دا نین، بەڵکە لە ئاستی بەندایەتیو مل کەچی نواندن داین. بەندە بە ئەندازەی باوەڕی تاقی دەکرێتەوە ((أوعك كما يوعك رجلان منكم... پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ لەرز دەگرم بە ئەندازەی دو کەس لە ئێوە کە تاو لەرز دەگرن))، (( أشد الناس بلاء الانبياء، ثم الصالحون... پێغەمبەران لە هەمو خەڵك پتر بەلا بارن، دوای ئەوانیش پیاوچاکان، ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ... تۆش هەروەکو پێغەمبەرە لێبڕاوو نەبەزەکان، سوربە لەسەر کارەکەتو خۆڕاگر بە، وەك ئەوانیش خۆڕاگر بون. ﴿٣٥﴾ الأحقاف ﴾.

((من يرد به خيرا يُصَبْ منه... هەر کەسێ خوا چاکەی بۆ بوێ توشی بەلاو ناخۆشی دەکا)).

﴿ وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبۡلُوَاْ أَخۡبَارَكُمۡ ... بە تاقیتان دەکەینەوە تا بزانین، کێ لە ئێوە تێکۆشاوەو کێتان خۆڕاگرتر بوە. بەراوردی دەنگو باسی ئێوەش دەکەین. ﴿٣١﴾ محمد ﴾.

﴿ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ... ئێمە ئەوانەی بەر لەمانیشمان بە تاقی کردەوە. ﴿٣﴾ العنكبوت ﴾ .

## لە شازادەیی وە بەرەو دارتاشی

عەلی کوڕی (مەئمون)ی عەباسی -فەرمانڕەوای کوڕی خەلیفە- لە کۆشکێکی جوانو ڕازاوەدا جێنیش بو، نازو گۆزی دنیای لە ژێر دەست بو، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە تەلاری[٥٧٣] کۆشکەکەیەوە سەرنجیدا، کرێکارێکی بەرچاو کەوت کە بە درێژایی ڕۆژ

---

٥٧٣) بەرهەیوان.

ڕەنجی دەکێشا، لە چێشتەنگا و[٥٧٤]دا لە کەناری ڕوباری دیجلە دەست نوێژێکی دەگرت‌و دو ڕکات نوێـژی دەکـرد، لـە بەرەبـەری[٥٧٥] ڕۆژئـاوا بـەرەو مـاڵ دەگەڕایـەوە، ڕۆژێ لـە ڕۆژان داوای کرێکارەکەی کـردو (لەمـەڕ بـاری گوزەرانی) پرسـیاری لێ کـرد، ئـەویش وەڵامـی پێـدا کـە هاوسـەرێك‌و دو خوشـك‌و دایکێکـی هەیـەو ڕەنجیـان لـە پێنـاودا دەکێشێ‌و، هـیچ سەرچاوەیێکی بـژێوی نیـە مەگـەر ئـەو کرێکاریـە نـەبێ، لـە بـازاڕ دەیکاو، هەمو ڕۆژێکیش بەڕۆژوەو لەگەڵ ڕۆژئاوابون بـە بەرهـەمی ڕەنجی ڕۆژانـەی ڕۆژو دەشکێنێ، گوتی: ئایە بە هیچ شتێ ئاتاج نی؟

گوتی: نەخێر سوپاس بۆ خوای ڕاهێنەری جیهان.

(شازادە) کۆشـکەکەی جێدەهێڵێ‌و، واز لـە فەرمانڕەوایـەتی دێنـێ‌و، سـەری خـۆی هەڵـدەگرێ‌و ون دەبـێ، دوای سـاڵانێکی زۆر بـە مردویـی دەدۆزرێتـەوەو دەزانـن لـەو ماوەیەدا لەلای وڵاتی خۆراسان کاری دارتاشی کـردوە، چونکە بـەختیاری خـۆی لـەم کارەدا وەدی کـردوە نـەوەك لـە کۆشـك‌و تـەلاری، ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ... ئەو کەسانەش، کـە هاتونـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، پـتر شـارەزەیان دەکـاو ترسـی خوایان پتـر دەخاتە دڵەوە. ﴿١٧﴾ محمد﴾ .

بە سای ئەو بەسەرهاتە داستانی یاوەرانی ئەشکەوتم بیر کەوتەوە، ئەوانەی لەگەڵ پاشا لەناو کۆشك‌و تەلاردا دەیانگوزەراند، کەچی هەستیان بە دڵ تەنگی‌و پەشێوی‌و، نیگەرانی دەکرد، چونکە ئەم کۆشکە بت پەرستی‌و بێ باوەڕی تێدا بـو، ئـەم کۆشـك‌و تەلارەیان بەجێهێشت‌و، یەکێ لەوان گوتی: ﴿... فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقًا ... سا بەم غارە[٥٧٦] پەنا بەرن، پـەروەرێن‌و وەبـەر بەزەیی خۆیتان دەخاو هۆیەکی واشدەرەخسێنێ بە ئاواتو بگەیێنێ. ﴿١٦﴾ الکهف﴾ .

---

٥٧٤) بەیانیان کاتێ ڕۆژ بەرز دەبێتەوە.

٥٧٥) نزیکی خۆرئاوا بون.

٥٧٦) بەم ئەشکەوتە پەنابەرن.

کونی دەرزی لەگەڵ دۆستاندا گۆڕەپانە... جێگای تەنگەبەر لەگەڵ باوەڕو خۆشەویستی و دۆستایەتیدا بەراوەڵەو فراوانەو زۆرکەس وەخۆ هەڵدەگری، (( جفاننا لضیوف الدار جفانُ... پێڵوی چاوەکانمان بۆ میوانان لەگەنن[٥٧٧].

## یەکێ لە هۆکاری دەردەسەری و خاکەساری دانیشتنە لەگەڵ ڕەزاگرانان

(پێشەوا) (ئەحمەد) دەفەرموێ: ڕەزا گرانان ئەوانەن شتی زیاد وەگەڵ دین دەدەن هەندێ دەڵین: بەدکارو خراپەکارانن، هەندێکیش دەڵێن: بەد سروشتانن، ئەوانەی لەگەڵ بیروڕاتێك ناکەنەوە، لە هەڵس‌وکەوتیاندا ساردو سڕن، ﴿... كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ... ئێژی دارن بە دیوار هەڵپەسێراون. ﴿٤﴾ المنافقون﴾ .

﴿... لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ النساء﴾... وەکو لە هیچ قسەیەك تێ نەگەن وایە!.

(پێشەوا) شافعی دەربارەیان دەڵێ کاتێ ڕەزاگران لەلام دادەنیشێ وا گومان دەبەم ئەو لایەی ئەو لێی دانیشتوە زەوی بەولادا لاسەنگ بوە.

(ئەعمەش) کاتێ ڕەزاگرانێکی ببینیبا، دەیگوت: ﴿رَبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ... ئەی پەروەردیارمان! ئەو پەتایەن لەسەر لابە، ئێمە باوەڕیمان هێنا. ﴿١٢﴾ الدخان﴾ .

(ئیبن تەیمیە) ئەگەر لەگەڵ ڕەزاگرانێ دانیشتبایە، دەیگوت: دانیشتن لەگەڵ ڕەزا قورسان وەکو تای سێبەرۆ[٥٧٨] وایە، ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ ... هەر گا ئەوانە دەبینی دەربارەی نیشانەکانمان خراپ دەدوێن تۆ ڕویان لێ وەربگێڕە. ﴿٦٨﴾ الأنعام﴾ .

---

٥٧٧) مانای چاوتێری و جوامێری دەگەیەنێ.

٥٧٨) تای سێ بەڕۆ ئەو جۆرە تایەیە بە سێ ڕۆژ جارێ توشی دێ.

﴿ ... فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ ... لەگەڵیانا دامەنیشن. (١٤٠) النساء ﴾ .

((مثل الجليس السيء كنافخ الكير... هاونشینی خراپ وەكو كورەچی وایە[٥٧٩])).

بێگومان ڕەزاگرانترین كەس بەسەر دڵانەوە ئەو كەسەیە لە خوڕەوشتی بەرز دەست بەتاڵە، لە كردەی بێ وێنە كەم دەرامەتە، كەسێكی ئارەزو بازە، بۆ هەواو هەوەسی ملكەچە.

﴿ ... فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ... ئێوە نابێ -هەتا ئەو باسە نەگۆڕن- لە گەڵیاندا دابنیشن، دەنا ئێوەش ئەوسا وەكو ئەوان دەبن. (١٤٠) النساء ﴾ .

(ئیبن قەیم) دەڵێ: ئەگەر كەسێكی ڕەزا گرانت توشهات بەلاشەت ڕوی تێ مەكە، بەڵام بە گیانو ڕۆح پشتی تێبكەو لەوێ مەمینێ، هەروەكو بڵێی گوێچكەت وتەكانی نابیستێو چاوت ڕوخساری نابینێ، هەتا ئەو كاتەی خوا ئەو بەڵایەت لە یەخە دەكاتەوە.

﴿ ... وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ... گوێ لە مستی كەسێ مەبە كە نەمانهێشت دڵی یادی ئێمە بكاو هەر لە شوێن ئارەزوی خۆیەو كاری لەڕادە دەرچوە. (٢٨) الكهف ﴾ .

## بۆ ئەوانەی بەڵا بارن

لە فەرمودەی ڕاستی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (خوای گەورە دەفەرموێ) (( من قبضت صفيّه من اهل الدنيا ثم احتسبه عوضته منه الجنّة... هەركەسێ یەكێ لە دۆستو خۆشەویستانی دنیام لێ سەندەوە دوای ئەوە چاوی لە پاداشتو خەڵاتی خوا بو ئەوا بەهەشتی لە بری ئەوە پێ دەدەم)). بوخاری گێڕاویەتەوە.

---

٥٧٩) كورەی ئاسنگەری.

بە هەمان شێوە لە فەرمودەیەكی ڕاستی تریشدا هاتوە: (خوای گەورە دەفـەرموێ) (( من ابتلـيته بـحبيـبتيه عوَّضته منهمـا الجـنّة... هەركەسێ بـە لێسەندنەوەی دو خۆشەویستەكانی - واتـە دو چاوەكانی- تـاقی بكەمـەوە لـەبری چاوەكان بەهەشتی پێدەدەم.

﴿ ... فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ... لـە ڕاستیدا چاو كۆر نابن، ئەو دڵانە كوێر دەبن كە جێیان لە ناو سینەكانە. ﴿٤٦﴾ الحج ﴾ .

لە فەرمودەیەكی ڕاستی تریشـدا هاتوە:

(( ان الله -عزوجل- اذا قبض ابن العبد المؤمن قـال للملائكـة: قبـضتم ابـن عبـدي المؤمن؟ قالوا: نعم. قال: قبضتم ثـمرة فؤاده؟ قالوا: نعم. قال: مـاذا قـال عبـدي؟ قـالوا حـمدك واسـتـرجع. قال: ابنوا لعبدي بيتا فـي الجنّـة، وسـموه بيـت الحمـد... خوای بەرزو توانا ئەگەر گیانی ڕۆڵەی بەندەیەكی بـڕواداری كێشا بـە فریشتەكانی دەڵێ: گیـانی ڕۆڵـەی بەنـدەی مـنی بڕوادارتـان كێـشا؟ دەڵـێن: بـەڵێ. دەفـەرموێ: جـەرگی بەندەی منتان بڕی؟ دەڵێن: بەڵێ. دەفەرموێ: بەندەی من چی وت؟ دەڵێن: سوپاسـی تۆی كردو بۆ لای تۆ گەڕایەوە. دەفەرموێ: خانوێك بنیات بنێن بـۆ بەنـدەی مـن لـە بەهەشتدا، ناویشی بنێن خانوی سوپاس‌و ستایش)). تیرموزی گێڕاویەتەوە.

هەروەها دەگێڕنەوە: لە ڕۆژی سەلا كەسانێك خۆزگە دەخوازن بە مەقەست تیكـە تیكە كرابان[٥٨٠]، چونكێ چاویان بەسەرەنجامی خێرو پاداشتێ بەلاباران دەكەوێ.

﴿ ... إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ... بێ گومانە ئەو كەسانەی خـۆڕارگرن، بـە تەواوی‌و بە بێ حیسـاب پاداشـی خۆیان وەردەگرن. ﴿١٠﴾ الزمر ﴾ .

﴿ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ... هەر لە سای هێمنـی دابن، چونكە ئێوە خـۆڕاگر بـون. ﴿٢٤﴾ الرعد ﴾ .

﴿ ... رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا ... ئـەی پـەروەرێنمان! وا بكـە خـۆڕاگر بـین. ﴿٢٥٠﴾ البقرة ﴾ .

---

٥٨٠) پارچە پارچە كرابان لە دنیادا.

﴿... وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ... خۆڕاگر بە! دیارە خۆڕاگرتنیشت هەر بە خوایە. ﴿١٢٧﴾ النحل﴾.

﴿فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ... سا خۆڕاگربە، چونکە بەڵێنی خوا ڕاستە. ﴿٧٧﴾ غافر﴾

لە فەرمودەشدا هاتوە: (( **ان عِظَمَ الجزاء من عظم البـلاء، وان الله اذا احب قوما ابتلاهم، فمن رضي فله الرضا ومن سخط فله السخط**... پاداشتی گەورە لە تاقیکردنەوەی گەورەدایە، ئەگەر خوای گەورە گەلو نەتەوەیەکی خۆشویست تاقیان دەکاتەوە، جا هەرکەسێ پێ قایل بێ ڕەزامەندی خواوە دەست دێنێو هەر کەسێکیش نا قایل بێ خەشمو قینی خوا وەدەست دێنێ)). تیرموزی گێڕاویەتەوە.

بێگومان لە کارەساتو مەینەتباری چەند مەسەلەیەك رەچاودەکرێ: ئارامگرتنو قەدەرو پاداشتی خوا، با بەندەش دڵنیا بێ ئەو کەسەی دەگرێتەوە هەر ئەویشە دەبەخشێ، ئەوەی لێشت دەسێنێ هەر ئەویشە بۆ تۆی بەڕەوا دەبینێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا ... خودا فەرمانو پێدەدا، هەرچی ماڵی ئەمانەتە بیاندەنەوە بە خاوەنیان. ﴿٥٨﴾ النساء﴾.

## دیمەنی یەکتاپەرستی

یەکێ لە دیمەنەکانی یەکتاپەرستی لە کاتی ئازارو ئەشکەنجەدا (دوچاری ئازار پێ گەیشتنە بە دەستی خەڵکەوە) لە چەند بەش پێك هاتوە:

١- دیمەنی چاوپۆشی: ئەویشیان دیاردەی سینە پاکیو بێ خەشیو بێ لەکەییە لە بەرابەر کەسانێ ئازارت دەدەن وێڕای ئەوەش خێرو چاکەت بۆی دەوێو حەز دەکەی قازانجو سودی پێ بگا، ئەوەشیان پلەیەکی گەورەترو بەرزترە، ئەو پلەیە قۆناغی یەکەمی بە ڕق خواردنەوە دەست پێ دەکا، ڕق خواردنەوە ئەوەیە: تۆڵە لەو کەسە ناکەیتەوە کە ئازاری پێ گەیاندوی، قۆناغی دوەمیش چاوپۆشینە، ئەویشیان ئەوەیە، لێی دەبوریو ئەو هەڵەیەی دەبەخشی. قۆناغی سێیەم چاکە

**کاریە، ئەویشیان ئەوەیە: لە پیای ئەو خراپەیەی دەرحەقی کردوی چاکەی لە گەڵــدا دەکـــەی، ﴿... وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾... ئەوانەش کە ڕکی خۆیان دەخۆنەوەو لە مەردم چاوپۆشی دەکەن، خوا چاکەکاری خۆش دەوێن. (١٣٤) آل عمران.**

**﴿... فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ... کێش لەتۆڵە چاوبپۆشی‌و کۆشش بۆ ئاشـتی بکا پاداشـتی لەسەر خوایە. (٤٠) الشورى ﴾ .**

**﴿... وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ... بـلا [٥٨١] چاویان لێبپۆشـنو لە هەڵەکانیان ببورن. (٢٢) النور ﴾ .**

**لە ئەسەردا هاتوە: (( ان الله أمَرَني ان اصل من قطعني، واعفوا عمن ظلمني، وان اعطي من حرمني... خوا فەرمانی پێ داوم سەرەدانی ئەو کەسە بکەم هاموشۆی لێ بچڕیوم، چاوپۆشی لەو کەسە بکەم ستەمی لێکردوم، بەو کەسە ببەخشم دەستی لە من گرتۆتەوە.**

**٢- دیمەنی قەزاو قەدەر: ئەویش ئەوەیە دڵنیا بی ئەوەی تۆی ئازار داوە تەنیا بە قەزاو قەدەری خوایە، ئەو بەندەیە یەکێکە لە هۆکارەکانو، ئەندازەگیرو بڕیاردەر تەنیا خوایە، ئەوسا ملت کەچ دەبێو دڵت بۆ پەروەردیارت دادەمرکێ.**

**٣- دیمەنی پاکبونەوە لە تاوان: ئەویشیان ئەوەیە ئەو ئازارەی پێتگەییوە مایەی لاچونی گوناهو هەڵوەرینی تاوانە، هەڵەو پەڵەت ڕەش دەکاتەوەو پلەو پایەت بەرز دەکاتەوە، ﴿... فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ... ئەو کەسانەی لە زێدی خۆ دەرکراونو لە ڕای من ئازاریان دیوەو چونە خەزاو دژی منیان کوشتبێ یان بە کوشت چو بن، بێ گومانە گوناهیان دەکوژێنمەوە. (١٩٥) آل عمران ﴾ .**

٥٨١) با چاویان لێ بپۆشن.

یەکێ لەو کارزانیو تێگەیشتنەی بە زۆرێك لە بڕواداران بەخشراوە، هەڵکێشانی ڕەگی دوژمن کاریە، ﴿... ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ... تۆ هەمیشە وەرامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێ کە لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت. ﴿٣٤﴾ فصلت﴾.

(( المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يـده... موسڵمان ئەو کەسەیە موسڵمانان لە دەستو زمانی بێ وەی بن[٥٨٢] )).

مەبەست ئەوەیە: بە ڕۆێکی خۆشو گەشو قسەی نەرمو نیان ڕووبەڕوی ئەو کەسە ببیتەوە، کە ئازاری پێ گەیاندوی، بۆ ئەوەی ڕیشەی دوژمنایەتی لە ڕیشەوە هەڵکێشیو کڵپەی گڕی ڕەقە بەری بکوژێنێتەوە، ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ ... تۆبە عەبدانی من بێژە چی باشترە ئەوە بێژن، چونکە شەیتان سۆدرەیی[٥٨٣] و لە نێودا دەکا. ﴿٥٣﴾ الإسراء﴾.

یەکێ لە دیمەنەکانی یەکتاپەرستی لە مەڕ ئەو کەسەی ئازارت پێ دەگەیەنێ: دیمەنی هەست کردنە بە کەمو کوڕی هەواو ئارەزوت: کەوا بزانی ئەگەر بە سای تاوانی تۆ نەبوایە ئەو کەسە بەسەرە تۆدا زاڵ نەدەبو ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ ... ئاخۆ زانیو لە دوژمن دوچاری زیان هاتن - کە جارێکیش دو ئەوەندەو زیان لێدان - هیچ پرسیتان: زیانەکەمان لە چی بو؟ بێژە: لە خۆتانەوە بو، خوا بۆ هەموشت توانایە. ﴿١٦٥﴾ آل عمران﴾.

﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ... هەرگا توشی بەڵایەك بون، بەهۆی کردەوەی خۆتانە. ﴿٣٠﴾ الشورى﴾.

---

٥٨٢) بێ زیان بن.

٥٨٣) شەڕو لە نێودا دروست دەکا.

دیمەنێكی تری گەورە هەیە، ئەویش بریتییە لەوەی: خوا تۆی بە ستەم لێكراو داناوە نەوەك بە ستەم كار، ئەوسا سوپاس‌و ستایشی لەسەر دەكەی.

هەندێ لە پێشینان گوتویانە: خوایە بمكەی بە ستەملێكراو نەوەك ستەمكار. ئەو نمونەیەش وەكو دو كوڕەكانی ئادەم وایە، كاتێ چاترەكەیان دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ... ئەگەر تۆش دەستم بۆ درێژ بكەی كە بمكوژی من دەستەوەكەری ناكەم تۆ بكوژم. من لە خودا - كە ڕاهێنەری دنیایە - ترسم هەیە. (٢٨) المائدة ﴾ .

دیمەنێكی تری زۆر جوان هەیە، كە دیمەنی سۆز و میهرەبانیە: ئەویشیان ئەوەیە تۆ بەزەییت بەو كەسەدا دێتەوە كە ئازاری پێ گەیاندوی، بێ گومان شیاوی بەزەیی پێدا هاتنەوەیە، چونكە سور بونی لەسەر ئەوەی ئازاری موسڵمانێ بداو بە سای ئەوە گەزارەیی‌و [٥٨٤] بێ شەرمی بەرامبەر خوا بنوێنێ: جێگای خۆیەتی دڵت پێ بسوتێ‌و سۆزت بۆی بجوڵێ‌و، هەوڵ دەی لەو تەنگژەیە دەربازیكەی، (( **أنصر اخاك ظالماً أو مظلوماً**... بەرگری لە برایەكەت بكە چ ستەمكار بێ یا ستەملێكراو [٥٨٥] .

كاتێ "میستەح" (ئەبوبەكر)ی ئازاردا لەمەڕ ناموسو ئابروی عائشەی كچی، (ئەبوبەكر) سوێندی خوارد چی تر یارمەتی نەدا، چونكە (میستەح) كەسێكی هەژار بو (ئەبوبەكر) بژێوی ژیانی ئەدا، خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ ... ئەوانەی لە ناو تاندا دەوڵەمەندن سوێندی نەخۆن كە خزمان‌و هەژاران‌و ئاوارەكانی ڕای خودا بێبەش دەكەن. بلا چاویان لێبپۆشن‌و لە هەڵەكانیان ببورن، مەگەر ئێوە حەز ناكەن خوا لە گوناهو ببورێ؟ (٢٢) النور ﴾ .

---

٥٨٤) بێ شەرمی.

٥٨٥) مەبەست لە بەرگری كردن لە ستەم كار ئەوەیە ڕێی پێ نەدرێ ستەم بكا هەروەكو لە كۆتایی حەدیسەكەدایە.

(ئەبوبەکر) گوتی: بەڵێ پێم خۆشە خوا لێم ببورێ دەستی کردەوە بە یارمەتی دانیو چاوپۆشی لێ کرد.

(عویەینە)ی کوڕی (حیصن) بە عومەری (کوڕی خەتابی) گوت: ئەوە چیە ئەی عومەر؟ سوێند بە خوا تۆ مافی تەواومان پێنادەی، دادوەرانەش فەرمانڕەوایەتیمان ناکەی، عومەر ویستی سزای بدا، (حوڕ)ی کوڕی (قەیس) گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ... چاو بپۆشەو فەرمان بە کاری چاك بدەو لەو نەزانا نەواز بێنە. (١٩٩) الأعراف ﴾.

گوتی: سوێند بە خوا عومەر لەوە زیاتر سنوری نەبەزاند، چونکە خوڕەوشتی وابو، کە کتێبی خوایان بۆ خوێندبایەوە ڕاستەوخۆ هەڵوەستەی دەکرد.

پێغەمبەر یوسفیش بە برایەکانی دەڵێ: ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ... ئیمرۆ زندەو لەسەر نەماوە، خودا خەتاتان دەپۆشیو هەر خۆی لە گش بە بەزەیەك دڵسۆزترە. (٩٢) یوسف ﴾.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەناو کۆمەڵێك لە گاورەکانی قوڕەیش، ئەوانەی دژایەتیان کردو شار وەدەریانکرد، دەفەرموێ: (( **لیس الشدید بالصُّرعة، انما الشدید الذي یملك نفسه عند الغضب**... ئازا ئەو کەسە نیە هەمیشە لە زۆرانبازێدا زاڵە، بەڵکە ئازا ئەو کەسەیە لەکاتی توڕەبوندا دان بەخۆی دادەگرێ.

هەندێ دەڵێن: لە ئینجیلدا هاتوە: ئەو کەسەی جارێ هەڵەی دەرحەق کردوی حەوت جار لێی ببورە.

﴿ ...فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ... کێش لە تۆڵە چاوبپۆشێو کۆشش بۆ ئاشتی بکا، پاداشی لەسەر خودایە. (٤٠) الشوری ﴾.

مەبەست (لە وتەی پێشو) ئەوەیە: هەرکەسێ جارێك ئازارت پێ بگەیەنێ، تۆ حەوت جار لێبوردەی خۆتی بۆ دوبارە بکەوە، تاوەکو ئایینو ئابروت پارێزراو بێو، دڵیشت ئاسودە بێ، بێ گومان تۆڵە لە ڕەگو خوێنو، خەوتنو حەسانەوەو ئابروی خۆت دەکەیتەوە نەك لە نەیارانت.

هیندیەکان پەندێکیان هەیە دەڵێن: "ئەوەی بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێ: ئازاترە لەوەی شارێك ئازاد دەكا".

﴿ ... إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ... نەوس هەمو خراپەیەك بە پیاو دەکا، مەگین ئەوی پەروەندەم بەزەیی پێدابێتەوە. ﴿٥٣﴾ یوسف ﴾ .

## هەڵوەستەیەك

"بەلام نزاو پاڕانەوەی یونس پێغەمبەر، بێ گومان ئاماری ئەوپەڕی یەکتاپەرستیو بە پاك دانانی پەروەردیاری بەرزو توانایە، دان پێ دانانی بەندە بە ستەمو تاوانەکانی، باشترین داوودەرمانی خەمو پەژارەو مەینەت باریە، بۆ جێەجێبونی خواستەکانیش باشترین هۆکاری گەیشتنە بە خوای بێ هاوتا، بە ڕاستی یەکتاپەرستیو بە پاك دانانی خوای پەروەردگار، هەرچی نیشانەی تەواویو بێ لەکەیيو لێ بە دور گرتنی هەرچی نەنگیو ناتەواویو وێچواندنە لە خۆوە دەگرن.

دان پێ دانانی بەندە بە ستەمو تاوانی، باوەڕهەبون بە یاساو ڕێسای خواو پاداشتو سزای خوا دەگەیەنێ، (ئەو دان پێ دانانە) وا پێویست دەکا بەندە مل کەچی بنوێنێو بۆ لای خودا وەگەڕێو، دەست لە تاوانو هەڵەی هەڵگرێ، دان بە بەندایەتی خواو ئاتاج بونی بە پەروەرندەی دابنێ، لێرەدا چوار شت هەیە دەتوانی پێیان لە خوا نزیك ببیەوەو داوایان پێ بکەی: یەکتاپەرستیو، خوا بە پاك دانان، بەندایەتیو، دان پێدانان".

﴿ ... وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ... مژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن. ئەو کەسانەی کە توشی چۆرتمێك دەبن ئێژن: ئێمەش هەر ئی خواینو هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە. خێرو بێرو بەزەیی پەروەردیاریان بۆ دەبارێو شارەزا لە ڕێ ئەوانن. ﴿١٥٧﴾ البقرة ﴾ .

## بە دەرو دەرون بایەخ بدە

دڵی پاكو بێ گەرد بە سای بەرگو پۆشاكی پاكە، لەوبارەوە وتەیەكی پڕ واتاو قەشەنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە هەندێ لە كاراشنایان دەڵێن: هەركەسێ بەرگو پۆشاكی چڵكن بێ، ناخو دەرونی لێخن دەبێ. ئەوەشیان شتێكی ڕۆنو بەرچاوە.

خەڵكانێكی زۆر بە سای شڕو شەپڕێوی‌و پیسی‌و چڵكنی، یا نالێكی پەڕتوك خانەكەی، یا پەڕپوتی‌و نابوتی ماڵەكەی، یا شلۆقی وا دەو بەڵێن‌و بەرنامەی ڕۆژانەی ژیان تاڵو پەشۆكاون، ئەو بونەوەرەش لەسەر یاسا ڕەخساوە، جا هەركەسێ لە ناوەڕۆكی ئەم ئایینە حاڵی بێ تێ دەگا كە ئەم ئایینە بۆ ئەوە هاتوە ژیانی بەندە، كەم تا زۆری، چوك تا گەورەی ڕێك خات، هەمو شتێكیش لەم ئایینەدا لە جێی خۆیەتی، ﴿... مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ... لە ناو ئەم كتێبە هیچ شتمان هەڵنەبواردوە. ﴿۳۸﴾ الأنعام﴾ .

لە فەرمودەیەكیشدا كە تیرموزی دەی گێڕێتەوە هاتوە: (( **إن الله نظيف يحب النظافة...** بە ڕاستی خوا پاكەو پاكیشی لا خۆشەویستە)).

ئەو فەرمودەیەش لە (صحیح)ی (مسلم)دا هاتوە: (( **إن الله جميل يحب الجمال...** خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆش دەوێ)).

هەروا لە فەرمودەیەكی (حسن)دا هاتوە: (( تجمّلوا حتى تكونوا كأنكم شامة في عيون الناس... خۆتان بڕازێننەوە هەتاوەكو لەبەرچاوی خەڵكدا وەكو نمونەیەكی بەرچاوتان لێدێ)).

بایەخدان بە خۆشۆرین: قۆناغی یەكەمی جوانیە. بوخاریش ئەو فەرمودەیە دەگێڕێتەوە: ((حق على المسلم ان يغتسل في كل سبعة ايام يوما، يغسل فيه رأسه و جسمه... پێویستە لەسەر موسڵمان لە هەمو حەوتەیەكدا ڕۆژێكیان خۆی بشوا، سەرو لاشەی پاك كاتەوە)).

بە لای كەمیەوە حەوتەی جارێك. بەڵام هەندێ لە پیاوچاكان هەمو ڕۆژێ جارێك خۆیان دەشۆری، وەكو دەگێڕنەوە (عوسمان)ی كوڕی (عەفان) یەكێ بوە لەوان،

﴿ ... هَٰذَا مُغْتَسَلٌ بَارِدٌ وَشَرَابٌ ... ئەمــە ســـەرچاوەیەکە بــۆ مەلــەکردن دەس دەداو ســاردیشــە، دەشـکرێ لێی بخۆیەوە.(٤٢) ص ﴾ .

خووڕەوشـتی نـەژادیو سروشـتی بەشـێکن لـە جـوانی: وەکـو هێـشتنەوەی ڕیـش، سمێڵ هەڵپاچین، نینۆك قرتانـدن، لابردنـی مـوی زێـدەی لاشـە، سیواك کـردن، بـۆن خۆشی، پـاککردنەوەی دەمو ددان، شـۆرینی بـەرگو پۆشـاك، بایەخـدان بـە دیمـەنو ڕوخسار، بێ گومان ئەو خووڕەوشتانە لەوانەن هەستو ناخ شادو گوشاد دەکەن.

پۆشاکی ڕەنگ سپیش مایەی جوانیـە، (( ألبسوا البيـاض، وكفّنـوا فيـه موتـاكم... بەرگی سپی بپۆشنو، مردوەکانیشـی تێدا بنێـژن.

بوخاری جێباسێکی نوسیوە بە نـاوی: پۆشـینی بـەرگی سـپی: (( إن الملائكـة تنـزل بثياب بيض عليهم عمائم بيض... فریشـتە دادەبەزن بـەرگی سـپیان لەبـەرەو مێـزەری سپیان لەسەرە. بەشێکی تری جوانی بریتییە لە، ڕێكو ڕێزکردنی وادەو بەڵێن لەناو دەفتەرێکی بچکۆڵەداو، ڕێکخستنی بەرنامەی ڕۆژانە، کاتێـك بـۆ خوێندنـەوە، کاتێك بۆ موتاڵاو وردبونەوە، کاتێك بۆ بەندایەتیو، کاتێك بـۆ حەسانەوە، ﴿ ... لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ... بۆ هەمو کارێك وەختێکی تایبەتی هەیە کە نوسراوە. (٣٨) الرعد ﴾.

﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ... گەنجینــەی هــەمو شـتێکـیش لای ئێمەیـەو ئەوەشــمان هـەر بـە ئەنـدازەی دیاریکـراو ناردۆتـە خـوار. (٢١) الحجر ﴾ .

لە پەڕتوکخانەی کۆنگریس لەسەر تابلۆیەك نوسراوە: بونەوەر لەسەر یاسا بنیـات نراوە. ئەو وتەیـە ڕاسـتە، هەمویاسـاکانی ئاسمـانی داوای ڕێـك خسـتنو یـەك ڕێـزیو لێكو پێکی دەکەن، خوای بەرزو بێ هاوتا هـەواڵی داوە کـە بونـەوەر لـە گـۆترەو بـە گاڵتـەو گـەپ نەهاتۆتـە ئـاراوە، بەڵکـە بـە قـەزاو قـەدەری خـواو بـە یاسـاو ڕێـسا ئەندازەگیـر کـراوە: ﴿ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ... خـۆرو هـەیڤیش - بـە ئەنـدازە - دێنو دەچن. (٥) الرحمن ﴾ .

﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ... نە خۆر تواناى هێندەى هەيە بگا بە مانگ، نە شەو وەپێش ڕۆژو دەكەوێ. سەر لە بەريش لە ئاسمانێك مەلە دەكەن. ﴿٤٠﴾ يس ﴾.

﴿ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ... هەيفيش ئێمە بۆمان دانا بە چەند قۆناغاتێ پەڕێ! تا واى لێدێ، وەك پەلى كەونى وشكەڵێ[586] دارى خورما، دێتە بەرچاو. ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ يس ﴾ .

﴿ وَجَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيۡنِۖ فَمَحَوۡنَآ ءَايَةَ ٱلَّيۡلِ وَجَعَلۡنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبۡصِرَةٗ لِّتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا ... شەوو ڕۆژمان بە دو نيشانە نيشان دان: نيشانى شەومان داكوژاند، نيشانى ڕۆژيشمان كردە هۆى ديتنێ، تا بگەڕێن بەشوێن ڕۆزى، كە پەروەرندەتان دەيداو لە ژمارەى ساڵەكانو ژماردنێ سەرو دەرچێ، هەموشتمان بە وردى شى كردۆتەوە.. ﴿١٢﴾ الإسراء ﴾ .

﴿ ... رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا ... ئەى پەروەرندەمان! تۆ ئەم دەزگايەت بە فيڕۆ ساز نەداوە. ﴿١٩١﴾ آل عمران ﴾.

﴿ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ... ئێمە ئاسمانو زەمينو هەرچى لە ناو ئەواندايە بۆ لە يستۆك[587] دروس نەكرد ئەگەر ئێمە گەرەكمان با لە يستۆكێك هەڵبژيرين، هەر لاى خۆمان هەڵمان دەبژارد. ئەگەر بمانويستايە ئەو كارە بكەين (هەردەمان كرد) ﴿١٧﴾ الأنبياء ﴾ .

﴿ ... وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ ... بێژە: دەسا وەكاركەون. ﴿١٠٥﴾ التوبة ﴾.

---

٥٨٦) كەلا وشكى.

٥٨٧) ئامرازى گەمە.

فەیلەسوفەکانی یۆنان ئەگەر ویستبایان چارەسەری کەسێ بکەن کە بە خەم و پەژارەو نیگەرانیو نەخۆشیە دەرونیەکان گیرۆدەیە: زۆریان لێ ئەکرد بچێ لە کشتوکاڵو باخ و بێستان کار بکات، تەنیا ماوەیەکی کەمی پێ دەچو دەگەڕایەوە سەر هێمنیو ئارامیو باری پێشو.

﴿... فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا ... شانەو شان تێیدا بگەڕێن. ﴿١٥﴾ الملك﴾ .

﴿... وَقُلِ اعْمَلُوا ... بێژە: دەسا وەکارکەون. ﴿١٠٥﴾ التوبة﴾.

بێ گومان ئەوانەی بە دەستو قامی خۆیان کار دەکەن لە هەمو کەس بەختەوەرو ئاسودەو دڵارام ترن، بڕوانە ئەو پیشە کارانە چۆن بە سای جموجۆڵیان چوستو چالاکیو کارامەییان، هێزی لاشەو شادی دڵیان بەدەست هێناوە، (( **واعوذ بك من العجز والكسل**... پەنا دەگرم بە تۆ (خوایە) لە دەستەو سانیو تەوەزەلی[588] )).

## پەنـا بۆ خـوا بـبـە

الله: ناوێکی گەورەو شکۆدارە، لە هەمو ناوێ ناسراوترە، ماناو واتایەکی وردی لێ وەردەگیرێ، گوتراوە: لە وشەی (ألـهَ)، وەرگیراوە، ئەو ناوەیە دڵەکان پەنای بۆ دەبەن، خۆشیان دەوێ، پێشوازی لێ دەکەن و، پێی قایلن، پێی دەسرەوێن، ئەو دڵە ناتوانێ بە جگە لە خوای بێ هاوتا بسرەوێو ئارام بێو ئۆقرە بگرێ، هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فاتیمەی کچی فێری دوعاو نزای تەنگانەو ناخۆشی دەکا: (( **الله، الله ربي لا اشرك بە شيئا**... خوا، خوا پەروەردیارمە هیچ شتێ بە هاوبەشی وی دانانێم. ئەوە فەرمودەیەکی ڕاستە، ﴿... قُلِ اللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ... بێژە: هەر خودا ناردویە. تۆ ئیتر وازیان لێبێنە با بە گاڵتەکردنەوە خۆ خەریك کەن. ﴿٩١﴾ الأنعام﴾ .

---

588) تەمبەڵی.

﴿ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ... هەر خۆی دەسـتەڵاتدارە بەسەر بەندەکانیدا. (٦١) الأنعام ﴾ .

﴿... ٱللَّهُ لَطِيفٌۢ بِعِبَادِهِۦ ... خودا دەربارەی عەبدانی بە ڤیانە. (١٩) الشورى ﴾ .

﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ... خودایان - وەکو پێویستە- نەناسیوە. ڕۆژی سەلا زەمین هەمووا لەناو مشتی ئەودایەو ئاسمانانیش بەدەستی ئەو پێچراونەوە. خودا پاكو بەرزترە لەو شتانەی ئەوان دەیکەنە شەریکی. (٦٧) الزمر ﴾.

﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ... ڕۆژێ کە ئێمە ئاسمانێ لە چەشنی تۆماری قاقەز بۆ نوسینێ، هەڵدەپێچین. (١٠٤) الأنبياء ﴾ .

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ... خودایەکە ئەم ئاسمانانو زەمینەی ڕاگرتوە کە ناکەون. (٤١) فاطر ﴾ .

## هەربە خوا پشت دەبەستم

گەورەترینی ئەوانەی هێمنیو هەداری بەسەر بەندە دادێنن، پەیوەندی بە خوا بەستنو پشت پێوەبەستنە، ئەوەیە تەنیا چاوت لە دۆستایەتیو چاوەدێریو بەرگری ئەو بێ، ﴿... هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ... ئاخۆ ئاگات لێیە هاوناوێکی هەبێ. (٦٥) مريم ﴾ .

﴿إِنَّ وَلِـِّۧىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ... گەورەی من هەر خودایە کە ئەم کتێبەی ناردۆتە خوار، هەر بۆ خۆشی سەرپەرشتی چاکان دەکا. (١٩٦) الأعراف ﴾ .

﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ... با تێ بگەن کە ئەوانەی دۆستی خودان، هیچ ترسێکیان لەسەر نیەو خەمیش ناخۆن. (٦٢) يونس ﴾ .

## لەسـەر سـێ شـتان یـەك دەنگـن

ئەو کتێبانەم سەرنج داوە کە بایەخ بە بواری نیگـەرانیو دڵاو دڵـی دەدەن، ئەوسا چ کتێبی فەرمودەناسو وێژەرانو پەروەردەکارانو مێژونوسانی پێشینان بـێ، یا ئـی دوای ئەوان بێ، لەگەڵ بڵاوکراوەو، کتێبی وەرگێڕدراوی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژاواییـەکانو، چەندین خولو گۆڤاریش، گەیشتومە ئەو ئەنجامەی، هەمویان لەسـەر سـێ بنـچینەو بنەما کۆكو یەك دەنگن بۆ ئەوانەی چارەسـەرو چـابونەوەو دڵ گوشـادیان گـەرەکـە، ئەو سێ بنچینەیەش بریتین لە:

یەکەم: پەیوەنـدی بەسـتن بـە خـواو، گوێڕایـەڵیو بەندایـەتی بـۆ کردنـیو، پـەنا بـۆ بردنـی ئەوەشیان پلـەی هـەرە بـەرزی بـاوەڕە، ﴿... فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ ... سا تۆش هەر ئەو بپەرستەو دەبێ بۆ پەرستنی خۆڕاگربی. (٦٥) مریم﴾ .

دوەم: داخـستنی فـایلی ڕابـردوی، پـڕ لـە ئـاخو داخو ئەشـکەنجەو ئـازار، پـڕ لـە مەرگەسـاتو ژیـنو ژار، هەڵدانـەوەی لاپەڕەیـەکی نـوێو دەسـت پێکردنـەوەی ڕۆژێکی نوێ.

سێیەم: وازهێنان لە داهاتوو پشتگوێ خستنی، پێ سەرقاڵ نەبونو، خۆ پێ خـەریك نەکردنی، لاکردنەوە لە پێشبینیو چاوەڕوانیو تـرسو تۆقـانی، بەڵکە تـەنیا لـە سنوری ئەو ڕۆژەدا بژیێی کە تێیدا دەژییێ.

(پێشـەوا) عەلی دەفەرموێ: ئومێدی بێ مەوداتان نەبێ، گەڕانەوە لای خواتـان لـە بیــر دەباتــەوە، ﴿... وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ... لایـان وابـو ناگەڕێنـەوە لای ئێمە. (٣٩) القصص﴾ .

وریا بە پڕوپاگەندە باوەڕ نەکەی، چونکە خـوا لـە ئاسـتی نەیارانیـدا دەفـەرموێ: ﴿... يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ ... هەر هەرایەك لەدژی خۆیان دەزانن. (٤) المنافقون﴾ .

سالآنێکی زۆرە کەسانێك دەناسم، ئێستاش لەگەڵ دابێ چاوەڕێی ڕوداوو کارەساتو مەرگەساتێکن کە بەڕێوەیە کەچی هەر نەگەیشتە جێ، بەردەوامیش خۆیانو خەڵکانیشی پێ دەترسێنن، پاكو بێ گەردی بۆ خوا چەندە تاڵە ژیانو حاڵیان!! وێنەی ئەوان بە وێنەی بەندکراوێکی ژێر ئەشکەنجەی چینیەکانە، نەریتی وان بەو شێوەیە بەند کراو دادەنێن لە ژێر بۆڕیە ئاوێ لە هەر خولەکێ تنۆکێ ئاوی بەسەردا هەڵدەڕژێ، لە دەرەنجامی چاوەڕوانی ئەو دڵۆپە ئاوانە ژیری لە دەست دەداو شێتو سەرگەردانە. خوای گەورە بەو جۆرە باس لە دۆزەخیەکان دەکاو دەفەرموێ: ﴿... لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ...﴾ نەڕێی مردنیان پێدەدەن، نە جەزرەبەی دۆزەخیان لەسەر سوك دەکرێ. ﴿٣٦﴾ فاطر.

﴿... لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ...﴾ لەوێدا نەدەمرێ نە زیندیشە. ﴿١٣﴾ الأعلى.

﴿... كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا ...﴾ هەر کە پێستیان داپلۆخا، پێستی تریان بۆ دەگۆڕین. ﴿٥٦﴾ النساء.

## ئەوەی دەت چەوسێنێتەوە بیدە دەس خوا

بەندە ئەوەندە ویژدانو دادوەریەی بەسە چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بێ کە خوا هەمو دروست کراوانی تێدا کۆ دەکاتەوە، لەو ڕۆژەدا ستەم ناکرێ، خوای بەرزو توانا خۆی دادوەرە، شایەدو گەواهی دەرانیش فریشتەکانن، ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ ...﴾ ڕۆژی قیامەت چەندین تەرازوی بەرانبەر وەکار دەخەین. ئەوسا بەقەد تۆمی وردیلەی دانە خەردەلیش دەخەینە ڕو ناهەقی لە کەس ناکرێ. ئەوسا بەسە کە هەر خۆمان پێ ڕادەگەین. ﴿٤٧﴾ الأنبیاء.

# کیسراو پیرە ژنێك

(بوزور جمهور) داناو تێگەیشتوی فارس دەگێڕێتەوە: پیرە ژنێکی فارس لە قەراخ [٥٨٩] کۆشکی کیسرای دەسەڵاتدار لە کۆڵیتێکدا [٥٩٠] بە خۆیو مریشکێك جێنشین دەبێ، پیرە ژن سەرەدانی لادێیەکی تر دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارا ئەو مریشکەیەم بە تۆ سپارد. کاتێ پیرەژن لەبەر چاوان ون بو، کیسرا لە پێناوی بەرفرەکردنی کۆشكو باخەکەی کۆڵیتەکەیان دارماندو سەربازەکانیشی مریشکەکەیان سەر بڕی، پیرەژن گەڕایەوە ڕوی لە ئاسمان کردو گوتی: پەروەردگارا، من لێرە نەبوم بەڵام تۆ لە کوێ بوی! خوای گەورە مافی بۆ سەندەوەو تۆڵەی بۆ کردەوە کوڕی کیسرا هەڵمەتی بۆ باوکی بردو بە چەقۆیەك لەسەر پێخەفی خۆی کوشتی.

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ ... تۆ بەوانەی غەیری خودان، دەترسێنن، مەگەر هەر خودا بەس نیە کە ئاگای لە عەبدی خۆی بێ؟ (٣٦) الزمر ﴾ .

خۆزگە هەمومان وەکو چاترینی دو کوڕەکەی ئادەم دەبوین کە دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ ... ئەگەر تۆش دەستم بۆ درێژ بکەی کە بمکوژی، من دەستەوەکەری ناکەم تۆ بکوژم. (٢٨) المائدة ﴾ .

(( **كن عبدالله المقتول، ولا تكن عبدالله القاتل...** بەندەی کوژراوی خوا بە، بەندەی خوێن ڕێژی خوا مەبە)).

بێگومان موسڵمان ڕێبیرو بنەماو پەیامێکی هەیە لە ڕقەبەریو تۆڵە سەندنەوەو کینەو کۆڵ لێ هەڵڕشتن بەرزترە.

---

٥٨٩) لە تەنیشت.

٥٩٠) بە چاوە خانوێکی پەرپوتو تەنگە بەر دەگوترێ.

## خۆ بە کـەمبیـنی جاری وایە مایـەی تۆکمـەیی و تەواویـە

﴿ ... لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ... پێتـان وانـەبێ بـۆ ئێـوە خـراپ دەبـێ، بەڵکو قازانجە بۆ ئێوە. ﴿١١﴾ النور ﴾ .

هەندێ لە بلیمەت و هەڵکەوتوان بە سای خۆگری و ورە بەرزیان ڕێگایان گرتەبەر، سەبارەت بەوەی هەستیان بـە کـەم و کورپیێکی زۆر کـرد، زۆر لـە زانایـان لـە پێشاندا کۆیلـەی ئـازاد کـراو بـون، وەکـو (عـەتا)و، (سـەعید)ی کـوڕی جبیـرو، (قـەتادە)و، (بوخاری)و، (تورمزی)و، (ئەبو حەنیفە).

زۆریش لە زاناو دانایان کە دەریـای شـەریعەت بـون توشـی نابینـایی هـاتن، وەکـو (ئیبن عەباس)و (قـەتادە)و (ئـیبن ئـومی مـەکتوم)و (ئەعمـەش)و (یەزیـد)ی کـوڕی (هارون).

لە زانایانی دوایش: وەکو شێخ (موحەممەد)ی کوڕی (ئیـبراهیم ئـال شـێخ)و شـێخ (عبداللە)ی کوڕی (حەمید)و (شێخ عەبدولعزیز بن باز).

داسـتانێ زۆرێـك لـە داهێنـەرو کاراشـناو ژیـرو ڕەوانبێـژانم خوێندۆتـەوە، کـە بـە دەردو بەڵا گیرۆدە بون، ئـەوەیان کوێر بـو، ئـەمیان کـەڕ بـو، یـەکێ تـر لـەنگ بـو[٥٩١]، ئەمەی تریان پەك کەوتە بو، لەگەڵ ئەوەشدا لـە مێـژودا جـێ پەنجـەیان دیـارەو بـە سای زانیاری و داهێنان و دەرخستنیان ژیانی مرۆڤایەتیان گەشاندەوە.

﴿ ... وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ ... تیـریژێکتان[٥٩٢] وەپـێش دەخـا، بـەهۆی ئـەو بەرێدا بڕۆن. ﴿٢٨﴾ الحديد ﴾ .

بڕوانامەی زانستی باڵا هەمو شتێ نیە، خـەمناك و دڵ تـەنگ مەبـە نـاخ و سـینەت وێك نێتەوە لە مەڕ ئەوەی بڕوانامەی زانکۆ، یا ماجستێر، یاخود دکتـۆرات وەدەسـت نەهێناوە بێگومان بڕوانامە هەمو شتێ نیە، دەشێ ئەگەر چی خاوەنی بڕوانامەیێکی

---

٥٩١) شەل بو/ شەلە بو.

٥٩٢) تیشکێکتان وەپێش دەخا.

زانستیش نـەبی بدرەوشـێیو تـێ بکۆشـی خێـرو بێرێکـی زۆریـش بـۆ گـەل فەراهـەم بێنی. چەنـد جوان مەردی ناودارو پایەدارو سود بـەخش بـەهۆی خـۆ پـێ گەیانـدنو کارامەییو ورە بەرزیو خۆگری ڕێگای سەرفرازیان گرتە بـەر کەچـی هـەڵگری هـیچ بەڵگە نامەو بڕوانامە نەبون.

لـەو سـەردەمەی ئێـستاشماندا خـەڵکانێکی زۆرم بـینی لـە زانـستی شـەرعیدا لـە بانگەوازو بێدارکردنەوەی خەڵکدا لە بیـروڕاو وێژەدا ڕۆشنا پەخشو کاریگـەر بـون، کەچی هەڵگری هیچ بڕوانامەیەکی جیهانی نەبون، وەکو شـێخ بـن بـازو، (مالیـك)ی کوڕی (نـەبی)و، (عەقاد)و، (تەنتاوی)و، (ئەبو زوهـرە)و، (مـەودودی)و، (نـەدەوی)و، کۆمەڵێکی زۆری تـریش.

زانایـانی پێـشینیش سـەرنج دەو، ئـەو بلیمـەتو لـێ هاتوانـەش کـە بـە چـاخە زێڕینەکاندا گوزەریان کرد.

لەو سەرو ئـەو سـەری دنیـاش بگـرە بـە هـەزاران هـەڵگری بڕوانامـەی "دکتـوراە" دەبینی کە پێچەوانەی ئەوانـە بـون، ﴿ ... هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ... ئاخۆ هەست بە هیچیان دەکەی یان نوزەشیان لـێ دەبیستی؟ (۹۸) مریم ﴾ .

قایـل بـونو بـە بەشـی خـۆڕازی بـون گەنجینەیـەکی بـێ بنـە، لـە فـەرمودەی (سەحیح)دا هاتوە: (( أرض بـما قسم الله لك تكن اغنـى النـاس... لەو بەشـەی خـوا پێـداوی ڕەزامەنـدی بنوێنـە لـە هـەمو کـەس زەنگـین تـری)). لـە دەسـتکەوتو دەرامـەتت، لـە خـاوخێزانو منداڵـت لـە پیـشەو کـارو فـەرمانت ڕەزامەنـدی بنوێنـە ئاسودەییو دڵارامی وەدەست دێنی.

لە فەرمودەی (سەحیح)دا هاتوە: (( الغنـى غنـى الـنفس ...دەوڵەمەنـدی ئەوەیـە دڵت دەوڵەمەند بێ)). دەوڵەمەندی بە کەلوپەلی زۆروماڵو داراییو پلەوپایە نیـە، بەڵکە دڵ ئاوەدانیو، ڕەزامەندی نواندن لەو بەشەی خوا بۆی داناوی دەوڵەمەندیە.

لە فەرمودەی (سەحیح)یشدا هاتوە: (( ان الله یـحب العبـد الغـنی النقـیّ الخفـّي... خوا بەندەی دەوڵەمەندی تەقوا کاری[۵۹۳] خۆ حەشاری خۆشدەوێ.

---

۵۹۳) پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمودەیەکەدا دەفەرموێ (دەوڵەمەندی دڵ دەوڵەمەندیە....

ئەو فەرمودەیەش: (( اللّهم اجعل غناه في قلبه... خوایە دەوڵەمەندیەکەی بخەیە دڵیەوە.

(یەکێك دەگێڕێتەوە) دەڵێ: لە فڕۆکەخانە لەگەڵ خاوەن ئۆتۆمبیلێك سوار بوم، بەرەو یەکێ لە شارەکان دەڕۆیشتین، بینیم ئەو شوفێرە زۆر دڵ خۆش‌و شادمانە، سوپاس‌و ستایشی خوای گەورەی لەسەر زمانە، دڵی بە یادی خوا ئاوەدانە، لەمەڕ ماڵ‌و خێزانی پرسیارم لێ کرد هەواڵی پێ دام کە دو خێزانی هەیەو، زیاتر لە دە کوڕیشی هەیە، دەستکەوتی مانگانەشی تەنیا هەشت سەد "ریاله"، خۆی‌و خێزانیشی لە ژورێکی کۆندا ژیانیان بەسەر دەبەن، لەگەڵ ئەوەی دڵی خۆشە، چونکە بەو بەشەی خوا پێی ڕەوا بینیوە ڕازییە.

دەڵێ: کاتێ ژیانی ئەو شوفێرەم بەراورد کرد لەگەڵ کەسانێك دا کە خاوەنی چەندین ملیار پوڵ‌و پارەو چەندین کۆشك‌و باڵەخانەن، کەچی ژیانێکی تەنگ‌و تەسك دەگوزەرێنن، پێی سەرسام بوم‌و زانیم بەختەوەری لە سامان‌و داراییدا نیە.

باس‌و خواسی بازرگانێکی گەورەم بیستوە، خوا پێداوێکی ناودار بو خێوی هەزاران ملیۆن‌و دەیان کۆشك‌و تەلار بو، بەڵام کەسێکی دڵ تەنگ، بەد خو بەد سروشت، شپرزەو سەرلێشێواو، دور لە کەس‌و کارو وڵات گیانی سپارد، چونکە ئەوەی خوا پێی دابو ڕەزامەندی لێ نەنواند، ﴿ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا ... هێشتا هەر چاوی لەوەیە بۆی پتر کەم. هەرگیز، چونکە بۆ نیشانانمان لاسار بوە. ﴿١٦﴾ المدثر ﴾.

یەکێ لە دروشمی حاڵ خۆشی عەرەبە کۆنەکان ئەوە بو، کابرا بە تەنیا لە بیاباندا دەی بردە سەر، هیچ کەسیشی هاودەم نەبو.

(ئەبو زەڕ) بەهەمان شێوە دور کەوتەوە. سوفیانی سەوریش دەڵێ: پێم خۆشبو لە یەکێ لە دۆڵاییەکان ژیانم بەسەر بردبایەو هیچ کەسیش نەیناسی بام!

لە فەرمودەشدا هاتوە: (( یوشك ان یکون خیر مال المسلم: غنم یتبع بها مواقع القطر وشعب الجبال، یفر بدینه من الفتن... نزیکەوای لێبێ باشترین ماڵی

موسـڵمان: مـەڕو ماڵاتێـك بـێ لـە بـەرزایی چـیایەكانو لـەوەرگابیان لـەوەڕێنێو، بەخۆیو بە دینەكەی لەبەر بەڵاو فیتنە هەڵبێ.

ئەگەر ئاشوبو ئاژاوە هەڵاییسـا چاكتـر وایـە بـۆ بەنـدە: لەبـەری ڕاكـا، هـەروەكو (ابن عومەر)و (ئوسامە)ی كوڕی (زەید)و (موحەممەد)ی كوڕی (مەسلەمە) ڕایـانكرد كاتێ (عوسمان) ی كوڕی (عەفان) كوژرا.

كەسانێك دەناسم تەنیا بە سای دور كەوتنەوەیان لـە خـوای بـەرزو بـێ هاوتـا، بـە نـەداریو بـەڵاباریو بێـزاری گرفتـارن، تـۆ یـەكێ دەبـینی دەوڵەمەنـدو دارایـە، نـازو گۆزێكی زۆری بەسەردا ڕژاوە، پەروەردگاری لەشو لارێكی ساخی پـێ داوە، بەهرەو بەخششی خەڵات كراوە، كەچی پشت لە گوێ ڕایەڵی خوا دەكا، نوێـژ بـە كـەم سـەیر دەكا، قۆڵو بازوی لـە تـاوانی گـەورە هەڵـدەكا، جـا پـەروەردگاری تەندروسـتیو لـەش سـاخی ناهێڵـێو، ڕۆزی لـێ تـەنگ دەكـا، بـە هـەژاریو نـەداریو خـەمو دەردەداری گرفتـار دەكـا، وای لێـدێ خەفـەت دەسـتاو دەسـتی پـێ دەكـەن، ئەشـكەنجەو ئـازار بـۆ یـــەكتری هەڵـــدەدەن، ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... هـــەر كەسێكیش بە ئامۆژگاری من نەكا، ژینی لە تەنگانەدایە. (١٢٤) طه ﴾ .

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ... چـــونكە خودا دەروی چاكەی لە هەر گەلێ وەكردبێ، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆڕیبێ، قەت خودا لێی نەگۆڕیون. (٥٣) الأنفال ﴾.

هـەروا دەفـەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ... هەرگـا توشی بەڵایەك بون، بەهۆی كردەوەی خۆتانە، لە زۆر گوناهیشتان چاو دەپۆشێ. (٣٠) الشورى ﴾ .

﴿ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ... گەر ئەوانیش لەسەر ئـەم ڕێگەیـە بن، بێ گومانە لە ئاوێكی زەبەندە تێراویان دەكەین. (١٦) الجن ﴾ .

پێم خۆش بو چارەسەرێکی جادویم هەبوایە بۆ سەر خەمو پەژارەو مەینەتی تۆم فرێ بدایە بۆ ئەوەی هەمویانی هەڵ لوشی بایە، بەڵام لە کوێم بو؟! وەلێ ئێستا بە چارەسەرێکی پزیشکیت ئاشنا دەکەم کە لە دەرمانخانەی زانایانی ئەم ئیسلامەو چاوساغانی ئەم شەریعەتە دەست دەکەوێ، ئەویشیان ئەوەیە: بەدی هێنەر بپەرستەو، بە بەشی خۆت ڕازی بە، بە بڕیاری خوا قایل بەو، دنیا بە کەم سەیر کەو، ئومێدی درێژ ڕامێڵە[٥٩٤].

سەرسامم بە زانایەکی دەرون ناسی ناوداری ئەمریکی بە ناوی "ویلیەم جیمس" کە لە لای وان بە باوکی زانستی دەرون ناسی ناسراوە، دەڵێت: ئێمەی مرۆڤ بیر لەوە ناکەینەوە کە لە دەستمان دایە، سوپاسی خواشی لەسەر ناکەین، تەماشای ڕوی تاریکی مەینەتیەکان دەکەین لە ژیانماندا، لای ڕۆژهەڵاتەکەی ڕەچاو ناکەین، لە داخی ئەوەی لە دەستماندا نیە هەناسەی سەرد هەڵدەکێشین، بەڵام بە سای ئەوەی لە دەستمانا دڵخۆش نین، ﴿... لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ... ئەگەر شوکرانە بژێر بن، بۆو زیاد دەکەم. ﴿٧﴾ إبراهيم﴾.

"واعوذ بالله من نفس لا تشبع... پەنا دەگرم بە خوا لە دەرونێ تێر نەخوا.

لەو فەرمودەشدا هاتوە: (( **من اصبح والاخرة همّه، جمع الله شمله، وجعل غناه في قلبه، واتته الدنيا وهي راغمة، ومن اصبح والدنيا همّه، فرّق الله عليه شمله، وجعل فقره بين عينيه، ولم يأته من الدنيا الا ما كتب له...** هەرکەسێ بەیانی کردەوەو خەمی لە پێناو دوارۆژدا بو، خوا کاروباری ڕێك دەخاتەوەو، دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە، بێ دەستی خۆی دنیای بەرەو ڕو دێ، هەر کەسێکیش بەیانی کردەوەو خەمی لە پێناو دنیا بو خوا کاروباری ئاڵۆز دەکاو، هەژاری دەخاتە نێوانی هەردوچاوانی، هەر ئەوەندەش دنیای پێ دەبڕێ کە بۆی بڕیار دراوە)).

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ... ئەگەر تۆ لەمانە پرسی: کێ عاسمانانو زەمینی وەدی هێناو خۆرو هەیڤی

---

٥٩٤) ئومێدی دورو درێژت نەبێ.

دەستەمۆ کرد؟ بێ گومان دەبێژن: خودا. دەسا چلۆن ﴿لە ڕێگەی هەق﴾ کلا دەکرێن[٥٩٥]؟ ﴿٦١﴾ العنكبوت ﴾.

## دەرەنجام سەلماندیان

زانایەکی ڕوسی بە ناوی "سەخروف" بەرەو کەنداوی (سیبیریا) شاروەدەر[٥٩٦] کرا، لەبەرئەوەی بۆچونەکانی لەگەڵ گومڕاییو باوەڕ بە خوا نەبون تێکی نەدەکردەوە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هێزێکی کارا هەیەو کاریگەری بەسەر جیهانەوە هەیە، بە پێچەوانەی گوتەی شوعیەکان کە دەیان گوت: خوا نیەو ژیان بریتیەیە لە مادە.

ئەوەشیان وا دەگەیەنێ کە دەرونەکان بە سروشتی خواڕسکیان یەکتا پەرستن.

﴿... فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ... دینێکی بنەڕەتیەو لە سروشتا خوا ئەو خەڵکەی هەر بۆ یەکتاپەرستی وەدەی هێنا. ﴿٣٠﴾ الروم ﴾.

(بە ڕاستی مەردمی گومڕا لێرەو لەوێ جێی نابێتەوە چونکە سروشتی نەژادیان لە دەست داوەو، دڵو دەرونیان دۆڕاوەو، هەستو ویستیان ڕوخاوەو، پێچەوانەی یاسای خوایە لەسەر زەوی.

دو ساڵ بەر لە ڕوخانی شوعیەت -یا یەکێتی سۆڤێتی- چاوم بە مامۆستایەکی موسڵمان کەوت لە پەیمانگای بیری ئیسلامی لە واشنتۆن، ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمـــــەوە: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ... هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد، (ئێمەش) دڵو دیدەی ئەوان لە کار دەخەین. هەروەك هەن وازیان لێ دێنین کە هەر بە نا فەرمانیەوە سەرگەردان بن. ﴿١١٠﴾ الأنعام ﴾.

---

٥٩٥) لا دەخرێن.

٥٩٦) دەربەدەر کرا.

هەروەها گوتی ئەو ئایەتەشیان بەسەردا جێبەجێ دەبێ: ﴿...فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ ... خودا دامو دەزگایانی لە هیمەوە[٥٩٧] هەڵتەکاندو میچیشیان[٥٩٨] بەسەردا ڕما. ﴿٢٦﴾ النحل﴾.

﴿... فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ ... نا فەرمانی خودایان کرد، ئەوسا ئێمەش لافاوی ئاوی بەندێمان[٥٩٩] بەردا سەریان. ﴿١٦﴾ سبأ﴾.

﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ... ئێمە هەریەك لەوانەمان بە تاوانەکەی خۆیان گرت. ﴿٤٠﴾ العنكبوت﴾.

﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ... لە ناکاویش دێتە لایان، کە هەر هەستیشی پێ ناکەن. ﴿٢٠٢﴾ الشعراء﴾.

## چەند ساتێ لەگەڵ گەلۆران[٦٠٠]

(زەیات) لە گۆڤاری (الرسالة)دا لەمەڕ ناساندنی شوعیەت، وتەیەکی سەرسوڕمێنو گوتارێکی جوانی نوسیوە، لەو کاتەی شوعیەکان کەشتییێکی ئاسمانیان بەرەو مانگ بەڕێ کردو گەڕایەوە، یەکێ لەسەر نیشینەکانی گوتارێکی لە ڕۆژنامەی (ئەلبراغدا)ی ڕوسی بڵاوکردەوە، تیایدا دەڵێ: بەرەو ئاسمان سەرکەوتین نە بەهەشتو نە دۆزەخو نە فریشتەو هیچ خوایەکمان لەوێ دانەبینی.

ئەوسا (زەیات) لەو گوتارەیدا کە نوسیوەتی دەڵێ: "ئێوە چەند سەیرن ئەی کەرە کێوی و گەلۆرینە[٦٠١]!!

---

٥٩٧) لە بناغەوە.

٥٩٨) میچی بانی.

٥٩٩) سەد، بەربەندی ئاو.

٦٠٠) نەفام.

پێتان وایە بە چاوی سەرتان خوا لەسەر عەرشی خۆیدا دەبینین، لە بەهەشت دا حۆریە چاو جوانەکان بە بەرگی ئاوریشمی دەبینن، شلپەی[602] تێکردنی ئاوی کەوسەر دەبیسن، بۆنی هەڵقرچانی دۆزەخیەکان هەڵدەمیسن، بەڵام ئەو سەر شێواوی‌و گومڕایی‌و لاڕێیی‌و لاساریەی ئێوە هەتانە تەنیا بە شوعیەت‌و بێ باوەڕی ناو کەللەی سەرتان شرۆفە[603] دەکەم. ئەو شیوعیەتەی ئێوە ڕۆژێکی دوا بڕاوە، کردەیەکی بێ دەرەنجامەو، هەوڵێکی بێ ئاکامە)" تا کۆتایی گوتارەکەی، ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ... یان پێت وایە کە زۆربەیان گوێ شل دەکەن‌و تێدەگەن؟ ئەوانە وێنەی وڵساتن[604]، بگرە لەویش گومڕاترن. ﴿٤٤﴾ الفرقان ﴾ .

﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَا يَسْمَعُونَ بِهَا ... دڵیان هەیەو پێی تێ ناگەن، چاویان هەیەو پێی نابینن، گوێیان هەیەو پێی نابیستن. ﴿١٧٩﴾ الأعراف ﴾.

﴿ ... وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ ... خودا هەر کێ توشی سوکایەتی بکا، تازە کەس ڕێزی لێنانێ. ﴿١٨﴾ الحج ﴾ .

﴿ ... أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ ... کردەوەیان وەك ئەو تراویلکە وایە کە لە بیاباندا هەیە. ﴿٣٩﴾ النور ﴾ .

﴿ ... أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ ﴿١٨﴾ إبراهيم ﴾... کردەوەیان وەکو ئەو خۆڵەمێشە وایە کە لە ڕۆژی ڕەشەبادا بای لێ هەڵکا. ﴿١٨﴾ إبراهيم ﴾.

---

٦٠١) گێل.

٦٠٢) دەنگی تێ کردن.

٦٠٣) لێك دەدەمەوە.

٦٠٤) ئاژەڵن، ماڵاتن.

(عەقاد) وتەیەکی هەیە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (مـذهب ذوي العاهات) -ڕێـچکەی پڕ لەکە - بە توندی ڕواو ڕوی بیری شوعیەت دەبێتەوە، بەرەنگاری بێ باوەڕیو ئەو بـیرە هیـچە دەبیتـەوە کـە بـە جیهانــدا بـڵاوەی کـرد، ئـەوەش لـە وتەکەیـدا دادەفامرێتەوە: بیری نەژادی تێك نەدراو ئەم ئایینە ڕاستەقینەی قەبوڵە، کە ئـاینی ئیسلامە، بەڵام ئەوانەی ژێریان تێـك چوەو، لـە دواوەیـە، خـاوەنی هەسـتو بیرێکـی بۆگەنو دواکەوتون، ڕێی تێ دەچێ سەریان لە گومڕاییو بێ باوەڕی دەرچێ.

﴿... وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ... مۆریان بەسەر دڵەومیەو هـیچ تـێ ناگەن. ﴿٨٧﴾ التوبة﴾ .

بە ڕاستی بێباوەڕی گورزێکی کوشندەیە لە بیروهزر دەدرێ، بە داهێنانی منـداڵان دەچێ لە جیهانی خۆیاندا، هەڵەو تاوانێکە ڕۆژگـار تـاوانی وای بـە خـۆوە نـەبینیوە. بۆیـە خـوای بـەرزو توانـا دەفـەرموێ: ﴿..أَفِي اللَّهِ شَكٌّ ...!! ئـاخۆ ئێـوە لـە خـوا بەشکن؟ ﴿١٠﴾ إبراهيم﴾ .

مەبەست ئەوەیە: گومانی تێدا نیە، شتێکی ڕۆنو بەرچاوە. بەڵکو (ئـیبن تەیمیـە) دەڵێ: دروستکار -مەبەستی خوای بـە توانـاو بـێ هاوتایـە- هـیچ کـەس سەرپێـچی لـە هەبونی نەکردوە تەنیا فیرعەون نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا لە نـاخو دەرونـەوە دانـی پـێ دادەنـا، بۆیـە (موسـا) دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَٰؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ بَصَائِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا فِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ... گوتی: تـۆ خـۆت سـور دەزانـی ئـەم شتانە کە وا زەق لەبەرچاوانن، هەر داهێنەری زەمینو عاسمانـەکان ناردونیـە خـوار. فیرعەون! منیش لام وایە. تۆ تێدادەچی. ﴿١٠٢﴾ الإسراء﴾ .

بەڵام دەرەنجامی فیرعەون نهێنی ناو دڵـی درکانـدو هـاواری کـرد: ﴿... آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ... من باوەڕیم هێنـا، هـیچ کـەس بۆ پـەرستن ناشـێ، مـەگین ئـەوەی کـە وەچـەی ئیـسرائیل باوەڕیـان پێیـە، منـیش لـە تەسلیم بوانم. ﴿٩٠﴾ يونس﴾ .

## باوەڕ ڕێگای ڕزگاریە

ڕاستیەك لە كتێبی (الله يتجلى في عصر العلم) لە چاخی زانستدا گومان لە بونی خوادا نیە، هەروا لە كتێبی ( الطب محراب الايمان ) پزیشكی مینبەری باوەڕە، دەردەكەوێ ئەویشیان ئەوەیە: هەستم كردوە باوەڕ بە خوای بەرزو تواناو، خۆ خستنە ژێر فەرمانی ئەو، گەورەترین فریاد ڕەسی بەندەن تاوەكو لە دەست خەمو پەژارە ڕزگاری كەن، ﴿ ... وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ... كاری خۆم بە خوا دەسپێرم. ﴿٤٤﴾ غافر ﴾ .

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥۚ ... كەس هیچ بەڵای بەسەر نایە، مەگین خودا فەرمان بدا. هەر كێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خۆی دەكا. ﴿١١﴾ التغابن ﴾ .

هەر كەسێ دڵنیا بێ ئەوەی ڕو ئەدا بە بڕیارو قەدەری خوایە، دڵی بە ڕەزامەندیو ملكەچیو، وێنەی ئەوانەش ئاشنا دەبێ، ﴿ ... وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْۚ ... گرانایی زنجیریان لەسەر لادەبا، كە بە وانیان شەتەك دابون. ﴿١٥٧﴾ الأعراف ﴾ .

نوسەرە بەناوبانگەكانی ڕۆژئاوا، وەكو "كەرسی مەریسۆن"و، "ئەلكسیس كاریل"و، "دایل كارنیچی" دان پیادەنێن كە ڕۆژئاوای لە ژیان دوڕاو تەنیا باوەڕ بە خوای بەرزو توانا لە هانایان هات، دانیش بەوە دادەنێن كە هۆكارو نهێنی هەرە سەرەكی لە ڕودانی ئەو خۆكوژیەی بویتە دیاردەیەكی بەرچاو لە ڕۆژئاوا، تەنیا گومڕاییو پشت هەڵكردنە لە خوای بەرزو تواناو ڕاهێنەری گشت جیهان، ﴿ ... لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ... چونكە قیامەتیان لە بیرچو، جەزرەبەی توندو تیژیان هەیە. ﴿٢٦﴾ ص ﴾ .

﴿... وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ... هەر کەسێکی شەریك بۆ خودا بناسێ، وەك ئەوەیە لە حەواوە هەڵدێراوەو مەل تێی ڕۆبێن، یان با یەك هەڵیداشتبێ[٦٠٥] بۆ شوێنێکی دوری چەپەك[٦٠٦]. ﴿٣١﴾ الحج﴾ .

ڕۆژنامەی "الشرق الاوسط" لە یەکێ لە ژمارەکانی لە بەرواری ١٤١٥/٤/٢١ی کۆچی لە یاداشت نامەکانی هاوسەری جۆرج بۆشی سەرۆکی پێشوی[٦٠٧] ئەمریکی دەگوازێتەوە: کە ئەو ژنە چەندین هەوڵی خۆکوشتنی داوە، لە ئاهی خۆی ماشێنەکەی بەرەو هەڵدێر لێ خوڕیوەو بە دوای مەرگدا گەڕاوە، هەوڵیشی داوە خۆی بخنکێنێ.

(قەزمان) ئامادەی جەنگی "ئوحد" بو شان بە شانی موسڵمانان شەڕێکی زۆر توندی کرد.

خەڵکانێ گوتیان: خۆشی لە خۆی چوە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمودەی: ((إنە من اهل النار!! ئەوە دۆزەخیە)).

بەسەختی بریندار بو ئارامی لەسەر برینەکەی نەگرت، خۆی بەسەر شمشێرەکەدا گرتو خۆی کوشت، ﴿ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ... ئەو کەسانەی تەقەلایان لە ژیانی سەر دنیادا بە فیڕۆ چوەو لاشیان وایە کارێکی چاکیان کردوە. ﴿١٠٤﴾ الكهف﴾ .

هەر ئەوەشیان لە فەرمودەی خوای تواناو تاقانە دەفامرێتەوە: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... هەر کەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانە دایە. ﴿١٢٤﴾ طه﴾ .

---

٦٠٥) فڕێی دابێ.

٦٠٦) لابەلا.

٦٠٧) بۆشی یەکەم/جۆرج دەبل یو بۆش.

موسڵمان چەندی ژیانی تفتو تاڵ بێ پەنا بۆ ئەو کارە دزێوانە نابا.

بێ گومان دوڕکات نوێـژی دڵسۆزانەو مـل کەچـانە بـەڵێنی دەرن بـەوەی هەرچـی دەردە سەری‌و کولە مەرگی‌و خاکە ساری‌و بەڵا باری هەیە ڕای بماڵن.

﴿... وَمِنْ ءَانَآيِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ... لە بەتڵەکـانی شەوێدا و[608] لە هەردو ئالی[609] ڕۆژێدا سەرگەرمی سوپاسی ئەو بە، بەشکو بـە ئاوتـت بگـەی. ﴿١٣٠﴾ طه﴾.

قورئـان لـە جیهـان‌و سـەر شـێواوی‌و گـومڕا بـونی خـەڵکی دنیـا پرسـیار دەکـاو دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ... ؟! چی وای کردوە پشت لـە بـاوەڕە هەڵکەن، ﴿٢٠﴾ الانشقاق﴾. کەچی ڕێگای حـەق‌و ڕاستی وەکو ڕۆژی ڕونـاك لەبەرچاوە، بـە بەڵگـەی ڕۆشن‌و درەوشاوە، بڕو بیانو نەماوە.

﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْأَفَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ... هاکا وامـان گرد ئەوانە لە ئاسوکانی زەمین‌و عاسمانداو لە خۆشیاندا نیشانەکانمان ببیـنن، هـەتا لێیان ڕون بێتەوە کە ئەو ڕاستە. ﴿٥٣﴾ فصلت﴾.

بۆیـان ڕۆشـن دەبێتـەوە کـە (موحەممـەد) ﷺ ڕاسـت گۆیـە، (الله) خـوای ڕاستەقینەیەو شیاوی پەرستـشە، ئیـسلامیش ئـاییـنی تێـرو تەسـەلەو بـەوە شـیاوە جیهـان باوەشـی پیـا بکـا، ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ... هەر کەسێك بە دڵێکی پاك ڕوی لە خوا بێ‌و ئاکار چـاك بـێ، دیـارە ئاڵقەی هەرە پتەو ئەو گرتویە. ﴿٢٢﴾ لقمان﴾.

٦٠٨) بەشەکانی شەوێدا.

٦٠٩) هەردو تەرەفی.

## گـاورەكـانیش پایـە پایـەن

له یاداشت نامەیەكیدا جۆرج بۆشی سەرۆكی ئـەمریكا بـە ناونیـشانی "هـەنگاوێك بەرەو پێـشەوە": بـاس لـەوە دەكـا كـە بەشـداری لـە ناشـتنی تـەرمی "بـەرجنێیف"ی سەرۆكی یەكێتی سۆڤێتی دەكا لە مۆسكۆ، دەڵێ: بینیم تەرمێكی ڕەش‌و قێزەونە، نـە باوەڕو نە گیانی تێدایە. چونكە بۆش (نەسرانی) بو ئەوانیش باوەڕیان بە خوا نەبو، ﴿... وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَـٰرَىٰ ... ئــەو كەسانەش كە گوتیان: (ئێمە مەسیحین) پتر بڕوادارەكانیان خۆشگەرەكە.﴿٨٢﴾ المائدة﴾.

ببینە ئەگەرچی بۆ خۆی كەسێكی گومڕایـە بـەڵام چۆن هەسـت بـە سـەرگەردانی ئـەوان دەكـا، چـونكێ بـێ بـاوەڕیش پلـە پلەیـە، ئەگـەر بـۆش ئـەم ئیـسلامەو دیـنی ڕاسـتەقینەی خـوای بناسـیایە، دەبوایـە چـی بوتایـە؟! ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ... هـەر كەسـێ بـە دەر لـە ئیـسلام، هـەر دینێكی دیكەی هەبێ، قەبوڵ نیەو لە دوا ڕۆژا لە ڕیزی زیانبارانە. ﴿٨٥﴾ آل عمران﴾ .

بـە سـای ئـەوە گوتـارێكی شـێخی ئیـسلام (ئـیبن تەیمیـە)م هاتـەوە یـاد، بـاس لـە كەسێكی (بەتائیحی) دەكا كـە (تیـرەیەكی سەرشـێواو لاڕێـن) ئـەو (بەتائیحیـە) بـە (ئیبن تەیمیـە) دەڵێ: ئـەی (ئـیبن تەیمیـە) ئـەوە چیـە كاتـێ دێینـە لای ئێـوە -واتـە ئـەهلی سـوننە- كەڕامـەتمان هەڵدەوەشـێنەوەو نـامێنن، ئەگـەر دەشـچینە لای گـاورو مەغۆڵ‌و تەتارەكان كەرامەتمان لـێ ڕودەدات؟

(ئیبن تەیمیە) گوتی: ئایە دەزانـی وێنـەی ئێمـەو ئێـوەو تـەتارەكان چۆنە؟ ئێمـە وەكو ئەسپی سپی واین، ئێوەش وەكو ئەسپی بۆزن، تەتارەكانیش وەكـو ئەسـپی ڕەش وان، جـا هەسـپی بەڵـەك ئەگـەر ڕەگـەڵ هەسـپی ڕەش بكـەوێ ئـەوا بـە سـپی دێتـە بەرچاوان، ئەگەریش ڕەگەڵ سـپیەكان بكـەوێ ئـەوا بـە ڕەش دەبینـرێ، ئەوسـا ئێـوە كەمێك ڕۆشناییتان لە لایە، ئەگەر چونە ناو بێ باوەڕەكان ئەو ڕوناكیە دەردەكـەوێ، ئەگـەر هاتنــە لای ئێمـەش چـونكە ئێمـە خـاوەنی سـوننەو ڕۆنـاهی هـەرە زۆریـن، تاریكی‌و ڕەشایی ئێوە دەردەكەوێ، ئا ئەوە وێنەی ئێمەو ئێوەو ئەوانە.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ... ئەوانەش کە ڕوسپین، بۆ هەمیشە بەزەیی خودایان هەیەو تا هەتایە هەر دەگەڵیانە. ﴿١٠٧﴾ آل عمران ﴾ .

## ویستێکی پۆڵاییـن

خوێندکارێك لە وڵاتانی ئیسلامیەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەچێ لەوێ بخوێنێ، هەر لە خودی لەندەنیش جێ گیر دەبێ، لەگەڵ خێزانێکی بەریتانی بێ باوەڕدا ژیان بەسەر دەبا، تاوەکو فێری زمانی ئینگلیزی ببێ، ئەو قوتابیە دین دارو خواپەرستە لە بەرە بەیاندا خەبەری دەبێتەوەو، بەرەو جێ دەستشۆری دەچێو دەست نوێژێ دەگرێ، ئەگەر چی ئاوەکەش ئاوێکی سارد دەبێ، ئەوجا دەچێتە جێگا نوێژەکەیو دەست دەکا بە نوێژ کردنو زیکرو یادی خوای گەورە، لەو خێزانەدا پیرەژنێك هەیە هەمیشە چاوەدێری دەکا، دوای چەند ڕۆژێك پیرەژن لێی دەپرسێ: ناگرێ هەندە زو لە خەو هەڵنەستیو کاتەکە دوا بخەی تاوەکو بحەسێیتەوە دوای ئەوە هەڵبستی. ئەویش دەڵێ: بەڵام خوایەکەم قایل نابێ نوێژ لە کاتی خۆیدا دوا بخەم. پیرەژن سەری جوڵاندو، گوتی: ئەوە ویستو ئیرادەیەکە ئاسن خۆی لەبەر ناگرێ!!

﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ ... پیاوانێ کە نە بازرگانی نە سەودا، یادی خوداو نوێژ کردنیان، لەبیر نابا. ﴿٣٧﴾ النور ﴾ .

ئەوەیە ورەو وزەی باوەڕو، تینو تەوژمی یەکتاپەرستیو دڵنیایی.

هەر ئەو وزەو ورەیە بو جادوگەرەکانی فیرعەونی هەڵنا لە کاتو ساتی ڕوبەڕو بونەوەی جیهانی نێوانی فیرعەونو موسادا باوەڕ بە خوای ڕاهێنەری جیهان بێننو، بە فرعەونیان گوت: ﴿ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ... گوتیان: لە دوای ئەو نیشانانەی دیومانە، سوێند بەو کەسەی کە ئێمەی دروس کردوە، هەرگیز بۆ تۆ دەسمان پێ لەو هەڵناگیرێ، سا هەر چیەکی لە دەستت دێ درێغ مەکە. ﴿٧٢﴾ طه ﴾.

ئـەو ورەيـە هـەر ئـەو ڕوبەڕوبونـەوەو لـە ڕو وەسـتانە بـو كـە تـا ئێـستا وێنـەی نەبیستراوە، كە وای لێ كردن وشەی ڕاستو دروست بە گوێچكەی لاسارو سەرپێچی كارێكی وەكو فیرعەون دا بچرپێننو پەیامی ڕاستی بگەیێنین.

حەبیبی كوڕی زەیـد چوە لای (موسـەیلەمە)و بـۆ یەكتاپەرسـتی بانگێشتی كـرد، (موسەیلەمە) حەبیبی بە شمشێر تیكەتیكە كرد، حـەبیب نـە هـەژاو ئۆفـەی نـەكرد هەتا بە پلەی شەهیدی بە پەروەردیاری خۆی گەیشت، ﴿... وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ ... ئەو كەسانەش كە لە ڕای خودا كوژراون، وان لـە لای پەروەرنـدەیان پاداشی خۆیان پێدەگاو ڕۆشنایی خۆیان هەیە. ﴿١٩﴾ الحدید﴾ .

(خوبیب) بە سێدارەی مەرگا هەڵواسرا، ئەم دێرە هۆنراوەی هۆنیەوە:

**باكـم نیـە ئەوسـاتەی بە مسـوڵمانی دەكـوژرێم**
**ئاخـۆ لەسـەر كام لاوە لە ڕێی خـوداوە دەگـلێم**

## سروشـتی خـواڕسـك

ئەگـەر تـاریكی ئەنگوسـتە چـاو دابـێ، هـەورە تریـشقە چـەخماخەیدا [٦١٠]، بـاو گەردەلولی توش هەڵبكـا، سروشتی نەژادی بە ئاگـا دێ.

﴿... جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ... تا بای زۆر بەتوند هەڵدەكاو لـە گشت لاڕاشـە پۆلیـان بـۆدێو باش دەزانن، كە هەمو دەوریان گیـراوە، بەوپەڕی بڕوای پاكەوە لە خودا دەپاڕێنەوە. ﴿٢٢﴾ یونس﴾.

٦١٠) بروسكیدا.

بەڵام موسڵمان لە خۆشیو ناخۆشـیدا لە شینو شاییدا هانـا وەبـەر خـوا دێنـــێ: ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ... سا ئەگەر ئەو پاکی خودای نەگوتبایە، تا ڕۆژی سەڵا ڕادەبو، لە ورگی ماسیدا دەمایەوە. ﴿١٤٤﴾ الصافات ﴾ .

زۆرن ئەوانـەی لـە تەنگانـەو دەربەسـتیدا [611] هانـا وەبـەر خـودا دێـننو چـریکەو زایەڵە هەڵدەبڕن، کاتێ خوا ئاوڕی لێدانەوەو خواستەکانیان هاتەدی پشت هەڵدەکەن، خوای گەورەش گاڵتـەو گـەپی لەگـەڵ نـاکرێو، نـاش خەڵەفێنرێ ﴿ ... يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ ... دەیانەوێ خوا فریو دەن، کەچی خوا دەیانخەڵەتێنێ. ﴿١٤٢﴾ النساء ﴾.

ئەوانـەی تـەنیا لـە کـاتی لێقـەومانێ پـەنا بـۆ خـوا دەبـەن تـەنیا شـاگردی ئـەو فیرعەونە لاسارو گومڕایەن، کە لە دوای هەل لە کیس چونو دەستبەربون پێی وترا: ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ... جا تازە؟ تۆیەك لە پێشدا بـاغی بویو لە ڕیزەی خراپکاری بوی؟ ﴿٩١﴾ یونس ﴾ .

ئـەو کاتـەی عێـراق کـوێتی داگـیر کـرد گـوێ بیـستی دەسـتەی پەخـشی هـەواڵی بەریتانی بوم لەوبارەوە هەواڵیدا: کە تاتـشەری سـەرەك وەزیرانـی پێـشوی بـەریتانی لەوکاتەدا لە هەرێمی (کلۆرادۆ)ی ئەمریکی بو هەر کە ئـەم هەواڵەی بیـست بـە گـوڕ بەرەو کەنیسە ڕۆییو کڕنۆشی برد!

ئەم دیاردەیە تەنیا بەوە لێك دەدەمەوە، کە وێنەی ئەوانە ئەگەر چی گومڕاو بـێ باوەڕن، بەڵام سروشتیان بۆ وەدی هێنەری سروشت بـەئاگا دێتـەوە، چونکێ دەرونو هەستەکان لە سەر باوەڕ بە خوای بەرزو توانا وەدی هاتون: (( **كل مولود يولـد علـى الفطرة، فأبواه يُهَوِّدانه او ينصرانه او يـمجسانه...** )) هەموله دایکبوێك لەسەر سروشتی باوەڕی لە دایك دەبێ، دایكو باوکی دەیکەن بە جولەکە، یا گـاور، یا ئاگر پەرست.

---

٦١١) پێویستی.

## لە بژێوی خــۆت پەلــەی مەکــە، ماوەی بۆ دیاری کــراوە

ئەوەی لە بەشە ڕۆزی خۆی پەلە دەکا، پێشبرکێی لەگەڵ ڕۆژگار دەکا، بە سای درەنگ هاتنە دی خواستەکانی نیگەرانە، وەکو ئەو کەسە وایە لە ناو نوێژدا پێش برکێ لەگەڵ پێش نوێژدا [٦١٢] بکاو، دەشزانێ ناگرێ بەر لە سەلامدانەوەی پێش نوێژ سەلام بداتەوە!

کارو فەرمانو ڕۆزی ئەندازەگیر کراوە، پەنجا هەزار ساڵ بەر لە دروستبونی بونەوەر بڕیاری لەسەر دراوە، ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ ... ئەوا فەرمانی خودا هات، پەلەی مەکەن. ﴿١﴾ النحل﴾ .

﴿... وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ ... ئەگەر چاکەشتی گەرەك بێ، کەس پێش بە چاکەی ناگرێ. ﴿١٠٧﴾ یونس﴾ .

پێشەوا (عومەر) دەڵێ: "خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە نەبەزیو بوێری خراپە کارو، متمانە بە خۆ نەکردن".

ئەوەو وتەیەکی ڕاستو زۆر بایەخ دارە. زۆر سەرنجی مێژوم داوە، هەستم کردوە گەلێك لە دوژمنانی خوای بەرزو توانا، هەوڵ دەرو کۆڵنەدەرو بەرزخواز بون: زۆر جێگای سەرسوڕمانو تێڕامانە.

موسڵمان گەلێکیشم بینیوە ئەوەندە ورە ڕوخاوو شلو خاوو دۆش داماو بون: هەر خوا خۆی دەزانێ، ئەوجا لە نهێنی نزای پێشەوا گەیشتم -خوا لێی ڕازی بێ-.

---

٦١٢ ئیمام.

## لە ناو كـردەی بـەردارەوە[٦١٣] قـولْ بـەوە

وەلیـدی كوڕی موغـەیرەو ئومەییـەی كـوڕی خەلـەفو عاسـی كـوڕی وائـل مـاڵو داراییان لە دژایەتیو ڕوبەڕوبونەوەی پەیامو بەرنامە ڕاستەقینەكەی خـوادا خـەرج كـــرد ﴿... فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ... ئـــەو مــــاڵ بەختكردنەیان دەبێتە كەسەرێك بۆیانو پاشان هەر ژێر دەكەون. ﴿٣٦﴾ الأنفال﴾ .

بەڵام موسڵمان گەلێ بە ماڵو داراییان ڕژدی دەنوێن، نایانەوێ قەڵای چاكە خوازی هەڵچنن، كۆشكی خواپەرستی بنیـات نێن ﴿... وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ... هەر كەسێكیش ڕژدی دەكا، ڕژدی دەربارەی خۆی دەكـا. ﴿٣٨﴾ محمد﴾ .

ئەوەیە نەوەستانی چەپەلكاران‌و دەستەوسانی موسڵمانان.

لە یاداشت نامەكانی (جۆلدا مائیر)ی جولەكە بە ناونیشانی "ڕق‌و كینە"[٦١٤] هاتوە: كە لە یەكێ لە قۆناغەكانی ژیانیدا لە پێناوی خزمەتكردن بە بیروباوەڕی گەنـدەڵو پوچـەڵی شـانزە كاتـژمێر لـە بیسـتو چـوار كاتـژمێردا تـەرخان دەكـا، هـەتاوەكو بـە یاوەری "بن گۆریۆن" دەوڵەتێك پێـك دێنـێ، هەركەسـێكیش حـەز دەكـا بـا سـەرنجی كتێبەكەیدا.

بـە هــەزاران ڕۆڵــەی موســڵمانیش دەبیــنم تــەنیا كاتــژمێرێكیان لــە پێنــاوی بیروباوەڕیان تەرخان ناكەن، وەلـێ هەمو ژیانیان لـە پێنـاوی خـواردنو خواردنـەوەو گاڵتەو گەپـدا بەسـەر دەبـەن ﴿... مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ ... چیتانە كە پێتان ئێژن: وەدەركەون بۆ خەزا لە ڕای خـودادا، تەمـەڵنو لە جێی خۆنا بزون؟ ﴿٣٨﴾ التوبة﴾ .

---

٦١٣) كردەوەی بەرهەمدار.

٦١٤) الحقد.

پێشەوا عومەر بە شەوو ڕۆژ بەبێ پچڕان لە گەڕدا بو، خەوی کەم بو. کەس‌وکاری پێی دەڵێن: بۆ ناخەوی؟

ئەویش دەڵێ: ئەگەر لە شەودا بخەوم خۆم لە دەست دەچێ، ئەگەر لە ڕۆژیشدا بخەوم، گەلەکەم بە هەدەر دەچێ.

لە یاداشت نامەکانی "موشی دیان"ی لەناوچودا، بە ناونیشانی (شمشێرو دەسەلات) [٦١٥] هاتوە: لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بە شەوو بە ڕۆژ بە ئاشکرایی‌و بە نهێنی کۆڵی نەدەدا، ئامادەی کۆبونەوەکان دەبو، چەندین کۆنگرەی دەبەست، چەندین گرێ بەندی‌و ڕێکەوتننامەی ڕێك دەخست‌و، چەندین یاداشتنامەی دەنوسی. گوتم: داخی گرانم، ئەوەیە هەوڵ‌و گەڕی برای مەیمون‌و بەرازان، ئەمەشیانە دەستەوسانی زۆرێ لە موسڵمانان، بەڵکە ئەوەیە نە وەستانی چەپەڵکاران‌و بێ ورەیی موسڵمانان.

پێشەوا عومەر دژایەتی تەوەزەل‌و بێ کارو کات بە فیرۆ دەرانی دەکرد، چەند گەنج‌و لاوێکی لە مزگەوتێ وەدەرێ نان‌و دارکاری کردن‌و پێی گوتن: بڕۆنە دەرێ‌و بە دوای کارێدا بگەڕێن، خۆ ئاسمان زێڕو زیوی نابارێنێ.

بێگومان لە دەرەنجامی کات بەتاڵی‌و بێکاری: دڵاو دڵی‌و دەردەسەری‌و نەخۆشی دەرونی دروست دەبێ خەم‌و خەمینی فەراهەم دێ‌و هەست‌و ژیریدا دەرمێ.

هاوکات لەگەڵ هەوڵ‌و گەڕو چاپوکیدا: بەختەوەری‌و شادمانی‌و دڵاڕامی پەیدا دەبێ.

ئەگەر بێ‌و هەر یەکێ لە ئێمە لە ژیاندا جێ پەنجەی دیار بێ، کارخانەکان کاریان تێدا بکرێ‌و، کارگەکان وەگەڕ بخرێن، دەزگای خێر خوازی‌و هاریکاری‌و بێداری‌و چەند ناوەندو بنکە بکرێنەوەو، چەند چاوپێکەوتنێکی وێژەیی ئەنجام بدرێن، چەند خولی زانستی‌و جگە لەوەش بکرێنەوە، هەرچی نیگەرانی‌و پەرێشانی‌و دڵگرانی هەمانە دەڕەوێتەوە.

﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ ... بێژە: دەسا وەکارکەون. (١٠٥) التوبة ﴾ .

---

٦١٥) السيف والحكم.

﴿... فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ ... بە هەردێدا بلاو ببن. (١٠) الجمعة﴾ .

﴿سَابِقُوا ... پێشبرکێ بکەن. (٢١) الحدید﴾ .

﴿وَسَارِعُوا ... پەلە بکەن. (١٣٣) آل عمران﴾.

(( وان نبي الله داود كان يأكل من عمل يده)) پێغەمبەر داود ت بەرهەمی کاری دەستی خۆی دەخوارد.

(راشد) کتێبێکی نوسیوە، بە ناونیشان (صناعة الحیاة) ژیانو وەگەڕخستن) بە تێرو تەسەلی لەوبارەوە دەدوێ، باسیش لە خەڵکانێکی زۆر دەکا کە لە ژیاندا بە کارو پیشەی خۆیان هەڵناستن.

مرۆڤ گەلێ بە ڕواڵەت زیندون، بەڵام وەکو مردوانن، ئامانجی ژیانیان نازانن، نە بۆدا هاتوی خۆیانو گەلو نەتەوەشیان کەڵكو سودێك پێ دەزانن ﴿رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ ... بەوە ڕازی بون لەگەڵ بەجێ ماوەکان بن. (٨٧) التوبة﴾ .

﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ ... ئەو بڕوادارانەی کە هەر لە ماڵی خۆیان دەمێنن -جیا لەوانەی نوقوستانن- دەگەڵ ئەوانەی دەچنە جەنگ لە ڕای خودا، وەکو یەك نین. (٩٥) النساء﴾ .

ئەو ژنە ڕەش پێستەی مزگەوتی پێغەمبەری خوای ﷺ دەماڵی بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵسا، بە سای ئەم کردو کۆشە بەهەشتی وەدەست هێنا ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ... کەنیزەی باوەڕدار بۆ هاوسەری لە ژنی ئازادی خوانەناس هێژاترە، با هەرچەندە حەزی لێ بکەن. (٢٢١) البقرة﴾ .

هەروەها ئەو کوڕە لاوەی بەرزەکی [٦١٦] بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کرد بە کاری خۆی هەستا لە ژیاندا، چونکێ کاری ئەو بەهرەی دارتاشی بو، بە سای ئەمە

٦١٦) مینبەر.

بەخـشش‌و خـەڵاتی خـۆی پـێ بەخـشرا. ﴿... وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ ... تانەش دەدەن لەوانە وا هەرئەوەندەیان دەس دەڕوا، کەدەیبەخشن. ﴿٧٩﴾ التوبة﴾.

لە ساڵی ١٩٨٠ی زایینی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ڕێگایانـدا بـە بانگەواز کارە موسڵمانەکان بچنە ناو بەندیخانەکان [٦١٧]، چونکە تاوانبـارو چەپەڵکارو خوێنڕێـژان، ئەگـەر ڕێبـازی ئیـسلام بگرنـە بـەر، دەبنـە چـەند ئەنـدامێکی چاکە خـواز لـە کۆمەڵگاکەیانـــدا ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ ... ئاخۆ کەسێ کە مردو بـو ئێمـە زیندومان کـردەوەو ڕوناکیـەکمان خستە پێـشی، بـە سەربەستی لە ناو خەڵکا بخولێتەوە؟ ﴿١٢٢﴾ الأنعام﴾ .

بۆ ئەو کەسەی بیەوێ کارو وەرامی ڕاست‌و دروست بێ‌و لە کاتی ڕوداوو کارەسات دان بە خۆیدا بگرێ، با ئەو دو نزایە گەورەو سودبەخشە لە دەم بگرێ:

یەکەم: ئەو فەرمودەی پێشەوا (عـەلی) دەی گێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێی دەفەرموێ: (( قل اللّهم اهدني و سدّدني... بڵێ: ئەی پەروەردگارا ڕێنماییم کەی‌و کاروبارم ڕاستەڕێ کەی. مسلم دەی گێڕێتەوە.

دوەم: ئـەو فـەرمودەی (حـصین)ی کـوڕی (عوبەیـد) لـە پێغەمبـەری خـواوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا پێی دەفـەرموێ: (( اللّهم الهمني رشدي، وقني شر نفسي... پـەروەردگارا بـەرەو ڕاستە ڕێ شارەزام کـەی، لـە خراپـەو بـەدی دەرونم بە دورم خەی. (ئەبو دەڕدا) دەیگێڕێتەوە.

شـەیدا بـون‌و پەیوەسـتی بـە ژیـانی دینـاوە، حـەز کـردن بـە مانـەوە تیایـداو دور بونـەوە لـە مـردن، بەنـدە توشـی: کلـۆڵی‌و دڵ پەسـتی‌و نیگـەرانی‌و بـێ خـەوی‌و بارگرانی‌و نابوتی [٦١٨] دەکا، سەبارەت بەوەی جولەکە پەیوەست بون بـە ژیـانی دنیـاوە، خـوای گـەورە گازانـدەیان لـێ دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ

---

٦١٧) بۆئەوەی بەندکراوەکان بەرەو ئیسلام بانگ کەن.

٦١٨) بێ سەروبەری.

أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ... بێ گومانە دەيانبينى لە هەمو كەس لە دنيادا بۆ ژيانێ تامەزرۆترن، تەنانەتى لەو كەسانەش كە شەريك بۆ خوا دەناسن. هەر كام لەوان پێی خۆشە هەزار ساڵ بژی. خۆ تەمەنی هەزار ساڵەش لە ئازار دوری ناخاتەوە، خودا هەموكردەيانی لەبەرچاوە. ﴿٩٦﴾ البقرة ﴾.

لێرەدا چەند وانەيەك وەردەگيرێ، يەكێ لەوان: دياری نەكردوە چ ژيانێكيان گەرەكە، هەر جۆرە ژيانێك بێ، ئەگەر چی ژيانێكی ئاژەڵانەو درِندانەش بێت، كەمايەتیو سوكو چرۆكيشيان قەبوڵەو هەوڵی دەستەبەر كردنی دەدەن.

دەرسێكی تر: رەچاوكردنی وشەی (ألف سنة) هەزار ساڵ ژيان، لەبەرئەوەی كاتێ جولەكە بەيەك دەگەيشتن يەك بە يەكی دەگوت بەيانيت بێ مەودا بێ هەزار ساڵ.

واتە هەزار ساڵ بژێی خوای گەورە دەيەوێ ئەو ويستەيان بە دەر راوەركا، كە دەيانەوێ تەمەنێكی هەندە دورو درێژ بەسەربەن، بەڵام گريمان هەندە ژيان سەرەنجام بەرەو كوێ؟!

سەرەنجاميان بەرەو دۆزەخێكی گڕگرتوە ﴿... وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ... بێگومانە سوكايەتی ئازاری ئەولاش زۆرترەو كەسيش دە هانايان نايە. ﴿١٦﴾ فصلت ﴾ .

جوانترين گوتەی ئاپۆرەش [٦١٩] ئەوەيە كە دەڵێ: جێگای خەم نيە، لە خوا دەخوازرێ.

خوايەك لەسە روی ئێمەيەو داوای لێ دەكرێو، فەرو چاكەی لێ دەخوازرێ، ئەگەر تۆ كارو وەرامت بە خوا بسپێریو، خوای گەورەش خەمو پەژارەت لابباو برەوێنێ، بۆ دەبێ تۆ لەسەر زەويدا كپو كلاّدا بمێنی ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ ... يا ئەو كەسەی چاترە كە هەر وەختێ هومێد براوێك لە بەری بپارێتەوە، دە هانای دێو لە چۆرتم رزگاری دەكا. ﴿٦٢﴾ النمل ﴾ .

---

٦١٩) جەماوەر/خەڵكی رەشۆكی.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ... هەر کاتەکی عەبدەکانم لەمەڕ من لە تۆ دەپرسن، من نزیکم، هەر کەس هانام وەبەر بێنێ، بێ وەرامی ناهێڵمەوە. (١٨٦) البقرة ﴾ .

## لە ژیانی خۆتدا چەند کات و ساتێکی بایەخدارت هەیە

لە یاداشتنامەکانی شێخ (عەلی تەنتاوی)دا دو هەڵوێستی کاریگەرو پەنددادەرم وەبەر چاوان کەوتوە:

هەڵوێستی یەکەم: باس لە خۆی دەکا لەو کاتەی لە کەناری (بەیروت) مەلەوانی دەکرد خەریك بو نقوم بێو بخنکێ، بێ هۆش کەوت و هەڵیان گرت، ئا لەو کات و ساتەدا مل کەچی بۆ خوا دەنوێنێ و، حەز دەکا ئەگەر بۆ چەند ساتێکی کەمیش بێ بەرەو ژیان بگەڕێتەوە، تاوەکو بیروباوەڕی نوێ بکاتەوەو پتر چاکە ئەنجام داو، بە سا ئەمە بگاتە ئەوپەڕی پلەی باوەڕداری.

هەڵوێستی دوەم: دەگێڕێتەوە کە جارێکیان لەگەڵ کاروانێکدا لە سوریاو بەرەو مەککەی پیرۆز دەگەڕێتەوە، لە کاتێکا لە بیابانی "تەبوك" ڕێگایان لێ ون دەبێ و سێ ڕۆژان دەمێننەوە، خواردن و خۆراکیان لێ دەبڕێ و چاوەڕوانی مەرگ دەکەن، (شێخ) لە ناو هاوڕێکانیدا هەڵدەستێتەوەو وتاری ماڵئاوایی لە ژیان پێشکەش دەکا، وتارێکی برایانەو گەرم و گوڕو سەرسوڕمێن، بە خۆی گریاو ئەوانی تریشی گریاند، هەست دەکا پلەی باوەڕیان بەرزبۆتەوەو، هیچ پەناگەو فریاد ڕەسێکیشیان نیە تەنیا خوای باڵادەست و توانادار نەبێ، ﴿ يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ... هەر کێ لە ناو ئاسمانەکان و زەمینن، هەموکارێکیان هەر بەوەو ئەو گش ڕۆژێ بە کارێکەوە خەریکە. (٢٩) الرحمن ﴾ .

هەروا خوای بەرزو بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ ...

بەشـی زۆر لـە پێغەمبـەران دەگـەڵ گـەلی خواپەرسـتانی هـەڤالیان چـونە خـەزا، هەرچەند بەلاّی لە رێی خودا توشی هاتن، نە هیچیانی سستەوە کرد نە زەبونی ڕوی تێکردن، لەوانەی کە خۆڕاگرن، خۆ خۆشی دێ.﴿١٤٦﴾ آل عمران ﴾ .

بێگومــان خــوا ئــەو بــڕواداره توانادارانــەی خۆشــی دەوێ بــە وره بــەرزیو ئارامگرییەوە بەرەو ڕوی نـەیارانیان دبنـەوە، ورە بـەر نـادەن، بێ ئومێدیو بـەزین رویان تێ ناکا، هێـزو وزەیـان نارِوخێ، بەسـەر شۆڕیو کـزو لاوازی نـشوستی هێنـان قایـل نـابن، بەڵکـە خـەباتیان ناپـسێتەوەو یـەك گروپـێ داگـرن، هـەر ئـەوەش بـاجی بڕواهێنانیان بە پەروەردگارو پێغەمبەرو ئاینیانە ((**المؤمن القوي خيـر و احب الى الله من المؤمن الضعيف، وفي كل خيــر**... بڕواداری توانادار چاکترو خۆشەویـسترە بـە لای خواوە لە بڕواداری بێ هێز، لە هەردوکیشیاندا چاکە هەیە)).

(ئەبوبـەکر) لـە پێنـاوی خـوادا پەنجـەی بـەخوێن هـات -خـوای لێـی ڕازی بـێ- (ئەبوبەکر) لەپێناو پاراستنی پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی خستە کونی ئەشکەوت مار پێیوەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای بۆ خوێند بە فەرمانی خوا چاك بۆوە.

پیاوێك بە (عەنتەرە)ی گوت: تـۆ بەسـەر پیاوانـدا زاڵ دەبـی، نهێنی ئازایـەتی تـۆ چیە؟ ئەویش گوتی: تۆ پەنجەت بخە نـاو دەمـی مـنو، منـیش پەنجەم دەخەمـە نـاو دەمی تۆ. پەنجەی خستە دەمی (عەنتەرە) ئـەویش پەنجەی خـستە دەمـی پیاوەکـە، هەریەکەیان پەنجەی ئەوی تریانی گەست، پیاوەکـە لـە تـاوان هـاواری کـردو، ئـارامی نەگرت، (عەنتـەرە) پەنجەی خۆی هێنایە دەرو، گوتی: بـەوە بەسـەر هێزدارانـدا زاڵ دەبم. بە سای بەرگە گرتنو ئارامگری.

یــەکێ لەوانــەی مایــەی دڵارامــیو سـرەوتنی بـڕواداره، ئەوەیـە: میهـرو سـۆزو بەخـشندەیی خـوای لێ دیـاره، جـا بـە پێـی پلـەی بـاوەڕی چاوەدێریو کۆمـەکی خـوا دەرك پـێ دەکـا. هەموبونـەوەرو گیـان لەبـەر، درنـدەو باڵنـدەو ڕۆینـدە[٦٢٠]، هـەمویان هەسـت دەکـەن پـەروەردیارێکی وەدیهێنـەرو ڕۆزی دەریـان هەیـە ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا

٦٢٠) ئەوەی بە پێ دەڕوا.

﴿يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ ... هەمو شتێك - بە پەسن دانەوە[٦٢١] - پاكانەی ئەو دەكا، بەڵام ئێوە پاكانەی ئەوان نابیسن. ﴿٤٤﴾ الإسراء.

ئێمە دەبینین جوتیارەكان لە كاتی زەوی كێڵاندا، بە دەستی خۆیان تۆ بە زەوی وەردەكەن، دەڵێن‌و هاوار دەكەن: ئەی وەدی هێنەری ئاسمان‌و زەمین، ئەو دانەوێڵە وشكە لەو زەویە وشكەدا بە تۆ دەسپێرین، ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ﴾ ... ئاخۆ ئەو تۆمەی[٦٢٢] دەیچێنن، دیتوتانە؟ پێتان وایە ئێوەن كە بەرهەمی دێنن، یان ئێمە بۆتان دەروێنین؟ ﴿٦٤﴾ الواقعة.الواقعة/٦٤.

ئەمەیە ڕو كردنە خوای تاك‌و تەنیاو بێ هاوتا، ئەمەیە ئارەزو خواستی بە یەك ناسینی خوای بەرزو توانا.

(عبدالحمید كشك) - كەسێكی نابینا- وتاربێژی زمان پاراوو دەنگ زوڵاڵ كاتێ هەستاو بەسەر بەرزەك كەوت، پارچە گەڵایەكی دارخورمای لە گیرفانی دەرهێنا، كە بە خۆڕسكی بە خەتێكی جوانی كوفی لەسەری نوسرا بو "اللّٰه"، پاشان لەسەر بەرزەك هاواری كرد:

لەو درەختە بڕوانە — گەڵاو لقی چەند جوانە
كێیە وەدی هێناوە — بە سەوزایی‌و ڕازاوە
ئەو وەدیهێنەرە خوایە — دەسەڵاتی بالایە

یەكسەر خەڵكەكە دایە پڕمەی گریان.

بێگومان ئەو خوایە بەدی هێنەری ئاسمانەكان‌و زەویە، نیشانەو بەڵگەكانی لە هەمو بونەوەردا دەردەخشێن، دان بە خوایەتی‌و پەروەرێنی‌و یەكتا پەرستی‌و بێ

---

٦٢١) پەسنداری: پێداهەڵگوتن.
٦٢٢) ئەو تۆوەی.

نیازی ئەو خوایە دادەنێن ﴿ ... رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا ... ئەی پەروەرندەمان! تۆ ئەم دەزگایەت بە فیڕۆ نەسازاندوە. ﴿١٩١﴾ آل عمران﴾.

یەکێ لە پایەکانی ئاسودەیی‌و بەختەوەری، ئەوەیە بزانی پەروەردگارێکی میهرەبان‌و بەخشندە هەیە لە تاوان دەبورێ‌و ئەو کەسەی تۆبە بکا لێی وەردەگرێ، دەسا موژدەی میهرو سۆزی پەروەردیارت لێبێ کە هەمو ئاسمانەکان‌و زەوی گرتۆتەوەو، شکۆداری بۆ ئەو کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ... بەزەییشم هەموشتی داگرتوە. ﴿١٥٦﴾ الأعراف﴾.

پایەداری‌و ڕێزداری بۆ خوا لێبوردەیی‌و میهرەبانی چەند فراوانە، لە فەرمودەیەکی (صحیح)یشدا هاتوە: یەکێ لە عەرەبە بیابان نشینەکان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی دەکرد لە کاتی تەحیات خوێندندا گوتی: خوایە بەزەییت بە من‌و (موحەممەد)دا بێتەوە، بەزەییت بەکەسی تردا نێتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((**لقد حجرت واسعا**... بە ڕاستی شتێکی فراوانت تەسك کردەوە، میهری خوا هەمو شتێ دەگرێتەوە، ﴿ ... وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ... خودا بۆ خاوەن باوەڕان دلۆڤانە. ﴿٤٣﴾ الأحزاب﴾.

(( **الله أرحم بعباده من هذه بولدها**... خوای گەورە بەرامبەر بەندەکەی بە سۆزترە، لەو دایکە بەرامبەر کۆرپەکەی. کابرایەك لە ترسی سزای خوا فەرمانیدا دوای مردن بیسوتێنن، خوای گەورە خۆڵەمێشەکەی کۆکردەوەو فەرموی: (( **یا عبدي، ما حملك علی ما صنعت؟ قال: یا رب، خفتك، وخشیتُ ذنوبي. فادخله الله الجنــّة** ... ئەی بەندەی من، چی وای لێکردی ئاوا بکەی؟ گوتی: ئەی خوایە، لە تۆ ترسام‌و، لە تاوانەکانیشم. خوای گەورە بردی بۆ بەهەشت. فەرمودەیەکی بەهێزە.

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ... بەلام کەسێ لە گەورەیی پەروەندەی خۆی ترساوە لە ئارەزوی دڵی خۆی وازی هێناوە، دیارە بەهەشت جێگای ئەوە. ﴿٤١﴾ النازعات﴾.

خوای گەورە لێپرسینەوە لەگەڵ پیاوێکی گوناهباردا دەکا بەڵام خوا بە یەك دەزانێ، هیچ چاکەیەکی لەدەستدا نیە، بەڵام لە دنیادا بازرگانی دەکردو، چاوپۆشی لە هەژارو کەم دەرامەتان دەکرد، خوا دەفەرموێ: ئێمە بە بەخشندەیی شیاو ترین لە تۆ، دەی ڕێگای بۆ بەردەن.

ئەوسا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشت.

﴿ وَٱلَّذِيٓ أَطۡمَعُ أَن يَغۡفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوۡمَ ٱلدِّينِ ... ئەو کەسەیە کە بە هیوام ڕۆژی سەڵا لە هەڵەکانم ببورێ. ﴿٨٢﴾ الشعراء ﴾.

﴿ ...لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ ...نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا ناهومێدبن. ﴿٥٣﴾ الزمر ﴾.

(موسلیم) دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژی بۆ موسڵمانان کرد، پیاوێ هەڵسایەوەو گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) حەقی دارکاریم هاتوە، بەسەرمدا جێبەجێ کە. فەرموی: (( **أصليت معنا**؟... ئایە نوێژت لەگەڵ ئێمە کرد؟ گوتی: بەڵێ. فەرموی: (( **اذهب فقد غفر لك**... بڕۆ چاوپۆشیت لێکرا.

﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ... هەر کەسێکیش کارێکی نالەبار بکا، یان غەدرێکی لە خۆی بکا، پاشان لە خودا بخوازێ کە بیبەخشێ، دەبینێ کە خوا لێبوردەو دلۆڤانە. ﴿١١٠﴾ النساء ﴾.

لێرەدا سۆزو میهرێکی نادیار هەیە کە بەندەی لە هەمو لایەکەوە، داپۆشیوە، خاوەنی ئەو سۆزە نادیارە خوای ڕاهێنەری جیهانو پەروەردیارە، ئەو خوایەی (موحەممەد)ی لە ئەشکەوتدا چەپاڵەدا -سلاوی خوای لەسەر- سۆزی بۆ یارانی ئەشکەوت نواند لە ئەشکەوتدا، ئەو سێ کەسەی تاشە بەردێك دەرگای ئەشکەوتی لێگرتن ڕزگاری کردن، ئیبراهیمی لەناو ئاگردا نەسوتاند، موسای لە دەریادا نغرۆ نەکرد، نوحی بە لافاو لەناو نەبرد، یوسفی لەناو بیردا لەیاد نەکرد، ئەیوبی بە دەردو نەخۆشی نەکوشت.

## ســەرنجـێــك

له (ئوم سەلەمە) دەگێڕنەوە دەڵێت: گوێبیستی پێغەمبــەری خــوا ﷺ بــوم دەیفــەرمو: ((ما من مسلم تصيبه مصيبة، فيقول ما امر الله: (انا لله وانا اليه راجعون) اللهم اجُرْني مــن مصيبتي واخلف لي خـيرا منهــا. الا اخلــف الله خـيرا منهــا... هــەر موسـڵمانێ توشــی بــەڵاو كۆستێك هات، ئەوسا ئەوە بڵێ كە خــوا فــەرمانی پــێ كــردوە: "ئێمــە هــی خــواینو بــۆ لای ویش دەگەڕێینەوە. خوایە لەسەر ئەو بەڵایە خەڵاتمكەی ئەوەی لەدەستم داوە چاتر لەوەم بۆ لەجێ دانێی. بێ سۆ خوا چاتری بۆ لەجێ دادەنێ.

## كــردەی جــوان ڕێگــای بەختــەوەریــە

له سەرەتای دیوانی حاتەمی (تائی) دا وتەیەكی جوانیم بینی تیایدا دەڵێ: ئەگــەر پشت هەڵكردن له خراپە بۆ تۆ بەس بێ، واز له خراپە بێنە.

مەبەســتی ئەوەیــە: ئەگــەر دەرفــەتی دەرنــەبڕینی قسەی خــراپو خۆپاراســتن لــە خراپەت هەبێ، با ئەوەندەت بەس بێ ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ... سا تــۆ واز لەوانــە بێنــە. (٣٠) السجدة ﴾ .

﴿ ... وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ ... گوێ بە ئازاریشیان مەدە. (٤٨) الأحزاب ﴾ .

چاكە ویستی بۆ خــەڵك بەهرەیــەكی خواییــە، خــەڵاتێكی پــیرۆزە لــە لایــەن خــوای بەخشندەو میهرەبانەوە (خەڵات كراوە).

(ئیبن عەباس) باس لە بەهرەی خوا دەكا بەسـەریەوەو دەڵــێ: مــن ســێ خەســڵەتم پێ بەخشراوە: لە هیـچ شوێنێكی زەوی بــاران نابــارێ، مەگــەر ستایــشی خــوای لەســەر دەكەمو پێی شادمانم، ئەگەر چی هــیچ وشــترو مــەڕو مــاڵاتێكی مــنی لــێ نالــەوەڕێ. گوێبیــستی دادوەری هــیچ دادوەرێــك نــابم، مەگــەر داوای بــۆ لــە خــوا دەكــەم، هــیچ كێشەیەكیشم ناكەوێتە لای ئەو.

هیچ ئایەتێکیش لە کتێبی خوا شارەزا نابم، مەگەر پێم خۆشە خەڵکانیش ئەوەی من دەیزانم ئەوانیش بیزانن. بە ڕاستی ئەوەیە چاکە خواستیو، بڵاوکردنەوەی خێرو خۆشی لە نێوانیانداو، سینە پاکیو، دەربڕینی دڵ سۆزیە بۆ هەمو کەسێ.

شاعیرێك دەڵێ:

**ئەگەر هەوروباران گشگیر نەبێ**
**منیش نابێ هەر خۆم لەبیر بێ**

مەبەستی ئەوەیە: من کەسێکی خۆپەرست نیم، ئەگەر بێو هەورو باران هەمو شوێنێ نەگرێتەوەو هەمو کەس لێ بەهرەمەند نەبێ، منیش بە تەنیا نامەوێ ﴿ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ ... ئەو کەسانەی چکوسی[٦٢٣] دەکەنە پیشەو خەڵکیش بۆ ڕژدی هان دەدەن، ئەو بەشەی خودا پێیداون دەیشارنەوە، ﴿٣٧﴾ النساء ﴾ .

## زانستی سود بەخشو زانستی زیان بەخش

با شادو دڵ گوشادت کا ئەو زانستەی بە خوای خۆت ئاشنا دەکا.﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَٱلۡإِيمَٰنَ لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِۖ ... ئەو کەسانەی بە زانستو باوەڕدارن، پێیان ئێژن: هەروەکو خودا نوسیویە، تا ڕۆژی سەڵا ماونەوە. ﴿٥٦﴾ الروم ﴾

لێرەدا دو زانست هەیە زانستێك ئاوێتەی باوەڕە، ئەوی تریان هاوشانی بێباوەڕیە، خوای گەورە سەبارەت بە نەیارانی دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ... لە ڕواڵەتی ژینی دنیا ئاگادارنو هیچ ئاگاشیان لە پاشەڕۆژەکە نیە. ﴿٧﴾ الروم ﴾ .

---

٦٢٣) ڕژدی، نان نەخۆری.

ئـەوجارەش لەمـەڕ ئەوانـە دەفـەرموێ: ﴿ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ... ئـاخۆ زانیاریـان بەدوارۆژهەیـە، بەڵکـە دو دڵـن دەبـێ یان نابێ؟ لە ئاستی دا چاویان کوێرە. ﴿٦٦﴾ النمل ﴾ .

هەروا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ ... هەر ئەوەندەی لـێ‌دەزانن﴿٣٠﴾ النجم ﴾

گـەورەیی‌و شـکۆ بـۆ ئـەو کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ... دەنگـو باسی ئەو کەسەشیان بۆ وەخوێنـە کـە نیشانەکانی خۆمـان پـێ بەخشیوە، خۆی لێبواردن، ئەوسا شەیتان وەدوی خۆی داو کەوتە ناوڕیزی گومڕایان. ئێمـە گـەر بمانویـستایە لەمانـەڕا پایەبـەرزیمان دەدایـە، بـەڵام ئـەو هـەر خـۆی بـوو. نەزیلەی ئەو وەکو نەزیلەی سەگێکە بـۆی بـچی زمـان دەردێنـێ‌و لێـشی گـەڕێی زوان دەکێشی. ئـەم چـیرۆکە بەسـەر هـاتی ئەوانەیـە، کـە نیـشانانی ئێمـەیان بـە درۆدانـا. تۆلەوتەرزە باسانەیان بۆ وەگێڕە، شایەتا بیربکەنەوە. ﴿١٧٦﴾ الأعراف ﴾.

هەروەهـا لەمەڕ جولەکەو زانستیان دەفـەرموێ پایـەداری‌و بـێ هاوتـایی بـۆ خـوا: ﴿ كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢاۚ ... وەکـو ئـەو گوێدرێژەیـە بـاری کتێبـی لـێ بـارە. ﴿٥﴾ الجمعة ﴾ .

ئەوان خاوەنی زانستن بەڵام ڕاستە ڕێی پێ نابینن، بەڵگـەو بیانویـان هەیـە بـەڵام دەردی دڵیان چارە ناکا، گومـان‌و دو دڵـی نارەوێنـێ‌و لا نابـا، بەڵگـەی نوسـراویان لـە دەستەو زمانیان لە گۆ نەوەستە، کەچـی نـە ڕاستـەو نـە دروسـتە، ڕابـەری ڕێیـان لـە پێـشە، وەلـێ بـەرەو هەڵـدێریان دەبـا، بـەرەو پێـشەوە دەڕۆن، بـەڵام سـەریان لـە گومڕایی‌و لاڕێی دەردەچێ، ئەوسا چۆن خاوەنی ئەم زانستە سەروەری‌و بەختـەوەری

وەدەست دێنێ، کەچی خۆی یەکەم کەسە لە ژێرییدا بینوێنێ: ﴿... فَٱسْتَحَبُّواْ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ... لەباتی شارەزابوونێ حەزیان کرد هەر نابینابن. ﴿١٧﴾ فصلت﴾.

﴿... وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ ... گوتیشیان ئێمە دڵمان داخراوە، هەر خودا خۆی دڵی بە مۆر داخستبوون. ﴿١٥٥﴾ النساء﴾ .

لە پەرتوکخانەی (کۆنگرێس) لە (واشنتۆن) سەدان هەزار کتێبی بە قەبارەو سەرنج ڕاکێشم بینی. دەربارەی هەموزانستێك، هەموبوارێك، هەموگەلو نەتەوەو ژیارو کەلتورو چاخێك، بەلاّم ئەو گەلو نەتەوەی ئەو پەرتوك خانە نەوازەی لەبەردەستە، گەلێکی خوانەپەرستە، تەنیا بەو جیهانە لەبەرچاوە باوەڕ دەکا، بەلاّم لەمەڕ ئەوەی کە پەنهانە، نە هەستو ژیرو بیری نەبیستنو بینایی کار دەکا، ﴿... وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَـٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَـٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ ... گوێو چاوو دڵیشمان بە وان دابو، ئەوان لە گوێو چاو دڵیان هیچ بەهرەیان دەسنەکەوت. ﴿٢٦﴾ الأحقاف﴾ .

مێرگو لەوەڕ [٦٢٤] سەوزو جوانە، بەلاّم مێگەل دەردەدارە، زەمیلە [٦٢٥] پڕ خورمایە وەلێ خاوەنی ڕژدەو چاوی لە دوایە، ئاوەکە سازو سازگارە کەچی لە دەمدا تفتو تاڵە، ﴿... كَمْ ءَاتَيْنَـٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ... چەند نیشانەی ئاشکرامان داوە بەوان؟ ﴿٢١١﴾ البقرة﴾ .

﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَـٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ... هەر نیشانەیەك لە لایەن خوای پەروەرێنیانەوە بێو بێتە لایان، بێ سۆ هەر حاشای لێ دەکەنو خۆیانی لێ دەبوێرن. ﴿٤﴾ الأنعام﴾ .

٦٢٤) پەرێز/مێرگ.
٦٢٥) زەمبیلە.

## زۆر بیر کەوەو زۆر ورد بەوە

یەکێ لەوانەی دڵو دەرون دەگەشێنێ: زۆرزانیو، لە بابەتی هەمە جۆری زانستی شارەزا بونە، بە راوەڵە [٦٢٦] بونی ڕۆشنبیریو، دور بینیو بیر قوڵییە، بەڵگەی بیانو ڕەوێن [٦٢٧]و، بیرو هزری ڕەسەنو، بەسەر نهێنیدا هەڵبونە، بەدەرخستنی بنجو بناوانی [٦٢٨] کارو وەرامو، ڕازو نیازان ئاشنا بونە، ﴿ ...إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ... لە ناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەی فرە زانان لێی دەترسن. (٢٨) فاطر ﴾.

﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ ... نەخێر ئەوان شتێك بە درۆ دەزانن، کە هیچی لێ تێنەگەییون. (٣٩) یونس ﴾ .

بێگومان مرۆڤی زانا هەمیشە دڵ فراوانە، هەستو نەستی ئاوەدانە، بیرو هزری حەساوەیەو دەرونی شادمانە.

یەکێ لە بیریارانی ڕۆژئاوا دەڵێ: فایلێکی بە قەبارەم لە نێو پەرتوك خانەکەدا هەیە، هەرچی هەڵەو پەڵەو کەوجیو گێلیو لاساریەی لە شەوو ڕۆژدا ئەنجامی دەدەم دەی نوسم، تاوەکو لە دەستیان ئازاد بم.

منیش دەڵێم: زانایانی پێشینی ئەم ئیسلامە بەر لە تۆ لەسەر زەنشت کردنی دەرونی خۆیانو بە توندی سەرکوت کردنی دەست پێشخەریان کردوە ﴿ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ... سوێندیش دەخۆم بە ویژدانەکەی ڕەخنەگر. (٢) القیامة ﴾.

حەسەنی بەسری دەڵێ: موسڵمان لە ئاستی سەرزەنشتکردنی دەرونی خۆیدا توندو تیژترە لە هاوبەشێك بەرامبەر برا بەشی خۆیدا.

---

٦٢٦) بەرفراوان.
٦٢٧) ئەو بەڵگەی گومان ناهێڵێ.
٦٢٨) قوڵایی.

(ڕەبیعی کوڕی خوسەیم) لە هەفتە بۆ هەفتە وتەکانی خۆی دەنوسی، جا ئەگەر دەی بینی قسەیەکی چاکی کردوە سوپاسی خوای لەسەر دەکرد، ئەگەریش بینیبای قسەیەکی خراپی کردوە داوای لێبوردنی لە خوا دەکرد.

یەکێ لە پێشینانیش دەڵێ: چل ساڵ دەبێ من تاوانێکم ئەنجام داوە، لە خوا داوا دەکەم لێم ببورێ، ئێستاش لەگەڵ دابێ لەسەر داوای لێخۆشبون پێ دادەگرم ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ ... ئەوانەش کە هەرچی لە ڕای خودا داویانە، هەر دەیدەن، کەچی دڵیان دەترسێ. (٦٠) المؤمنون﴾.

## دەرونت سەرزەنشت کە

یادەوەریەك بۆ خۆت ڕەچاو کەو، خۆتی پێ سەرزەنشت کە، هەڵەو ناتەواوییەکانی خۆتی تێداوە خوێنەوەو، چارەسەریان بدۆزەوە.

(پێشەوا) عومەر دەڵێ: خۆتان سەرزەنشتکەن بەرلەوەی سەرزەنشت بکرێن، خۆتان هەڵسەنگێنن بەرلەوەی هەڵسەنگێنرێن، خۆشتان بۆ ڕۆژی سزا وەڕازێنن.

## لە ژیانی ڕۆژانەماندا سێ هەڵە دوبارە دەبێتەوە

یەکەم: کات بەفیڕۆدان.

دوەم: بێهودە دوان[٦٢٩]: ((من حسن اسلام المرء ترکه ما لا یعنیه... بەدوا دانەچونی شتی بێهودە لە جوان موسڵمانی مرۆڤە.

سێیەم: بایەخدان بە شتی کەم بایەخ، وەکو گوێ هەڵخستن[٦٣٠] بۆ ترس و تۆقاندنی پاگەندەچیان و، پێشبینی گەنەکاران و[٦٣١]، خەون و خەیاڵی ڕاڕایان[٦٣٢]، ڕاستەوخۆ

---

٦٢٩) قسەکردنی بێ هودە.

٦٣٠) گوێ گرتن.

٦٣١) چەپەڵکار و خراپەکارن.

ژیانت پێ تاڵ دەکاو، دەستبەجێ خەمناکیت توش دەکا، هەروەها بەربەستو لەمپەرێکە لە ڕێگای بەختەوەری‌و کامەرانیدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ عەباسی مامی فێری نزایەك کرد بەختەوەری دنیاو دوارۆژ لەخۆوە دەگرێ، کە بەم جۆرەی فەرمو: ((**اللّهم اني اسألك العفو والعافية...** پەروەردگارا لێبوردەیی‌و تەندروستیت لێ دەخوازم. ئەوە نزایەکی لەخۆگرو گشتگیرە، چارەسازو چارەسەرە، خۆشبەختی دنیاو دوا ڕۆژی لەگەڵە. ﴿ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ... ئەوسا خودا پاداشتی ئەم دنیاو چاکە پاداشی ئەو دنیای پێدان. ﴿١٤٨﴾ آل عمران ﴾.

﴿ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ... ئیتر نە ڕێ هەڵە دەکا، نە توشی نەگبەتی دەبێ. ﴿١٢٣﴾ طـه ﴾.

## وریـای خۆتـان بـن

هۆشمەندی‌و بەکارهێنانی هۆکارەکان لەگەڵ پشت بەستن بە خوای بەرزو توانا یەکێکن لە بەختەوەری بەندە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر چی پێشەنگی پشت بە خوا بەستان بو، بەڵام لە هەندێ جەنگا مەیدان داری دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا زرێی دەپۆشی، یەکێکیش لێی دەپرسێ ئەی پێغەمبەری خوا وشترەکەم ببەستمەوە یاخود بەرەڵای کەم‌و پشت بە خوا ببەستم؟

لە وەڵامدا فەرموی: ((**اعقلها وتوكل**... ببەستەوەو پشتیش بە خوا ببەستە)).

گرتنەبەری هۆکارو پشت بە خوا بەستی پایەی یەکتاپەرستییە، پشت لە هۆکار کردنیش لەگەڵ پشت بەخوا بەستن بە پێی یاسای خوا نەڕەخساوو نەگونجاوە، هەروەها ڕوکردنە هۆکارو پشت بە خوا نەبەستی یەك ناگرنەوە لەگەڵ یەکتاپەرستی.

---

٦٣٢) دو دڵان/ بەگومان لە کارەکان.

(ئیبن جەوزی) لەو بارەوە دەگێڕێتەوە: پیاوێك لای مەترسی ڕەچاو نەكرد، هەستا نینۆكەكانی قرتاند كارەكەی لێ ئاڵۆز بو پێی مرد [٦٣٣].

كابرایەكیش لەسەر پشتی گوێدرێژەكەیەوە بە ژێر كۆڵێكدا ڕۆیی سگی خۆی چەماندەوەو بوە هۆی مردنی.

دەربارەی تەها حسێنی نوسەری میسری دەگێڕنەوە كە بە شوفێرەكەی دەڵێ: خێرا مەڕۆ تاوەكو زو بگەینە جێ.

ئەو وتەیە هاو واتای ئەو پەندەیە: زۆر جاران تاڵوكەیی سەری لە شێنەیی دەردەچێ.

ئەوسا خۆپاراستن لەگەڵ قەدەر تێك ناگیرێن، بەڵكو خۆپاریزی لە قەدەرو كرۆكی قەدەر دەژمێردرێ، ﴿وَلْيَتَلَطَّفْ ... با بەزیتی بجوڵێتەوە. (١٩) الكهف﴾.

﴿... تَقِيكُمُ ٱلْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ... جلو بەرگێكیشی بۆتان ساز داوە كە لە كاتی شەڕو گەرمادا دەوپارێزێ. (٨١) النحل﴾.

## دۆستایەتی بڕەخسێنە

مایەی بەختەوەری بەندەیە، كە بتوانێ سۆزو خۆشەویستی خەڵكان بەلای خۆیدا ڕابكێشێو دۆستایەتیان لەگەڵدا بنوێنێ، خوای گەورە لەسەر زمانی (ئیبراهیم) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَٱجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي ٱلْآخِرِينَ ... وەبكە لە ناو چینە دواییەكانیشا ناوم بە چاكە دەربچێ. (٨٤) الشعراء﴾.

توێژەرەوان دەڵێن: مەبەستی ئەوەیە خەڵك بەچاكە لێی بدوێن. بە هەمان شێوە خوای گەورە دەربارەی موسا پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي ... ڤیانی خۆم خستە سەر تۆ. (٣٩) طه﴾.

---

٦٣٣) لەوانەیە تەشەنەی كردبێ بوبێتە هۆی پەیدابونی نەخۆشی گەورە.

هەروەكو دەربارەى يەكێ گوتراوە: هەر كەسێ تۆى بينيبێ خۆشتی دەوێ.

لە فەرمودەی (سەحیح)دا هاتوە: (( **أنـتم شـهداء الله في الارض**... ئێوە شايەتانی خوان لەسەر زەوی)).

زمانی خەڵكانيش پێنوسی ڕاستی يە. ئەم فەرمودە بێهەڵەيەش هاتوە: (( **إن جبـريل ينادي في السماء: ان الله يـحب فلانا فاحبوه، فيحبه اهـل الـسماء، ويوضـع لـه القبول فـي الارض**... جوبريل لە ئاسمانێ بانگ ڕادێڵێ: خوای گەورە فلانەكەسی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، خەڵكی ئاسمان خۆشيان دەوێ، لەسەر زەويشدا خوای گەورە لە دڵی خەڵكدا جێی دەكاتەوە.

يەكێ لەوانەی دەبێتە هۆكاری خۆشەويستی: خووڕەوشتی جوانو، وتەی نەرمو نيانو، ڕوی گەشو جوانە. يەكێ لەو فاكتەرە بەهێزانەی هەستو سۆزی خەڵكانت بۆ دەستەبەر دەكا: نەرمو نيانیو ميهرەبانيە. بۆيە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (( **ما كان الرفق في شيء الا زانه، وما نزع من شيء الا شانه** ... نەرمو نيانی لە هەر شتێدا وەدی بكرێ دەی ڕازێنێتەوە لە هەر شتێدا برنێ ناشيرينی دەكا)).

هەروەها دەفەرموێ: (( **من يـحرم الرفق، يـحرم الخيـر كلـه**... هەركەسێ لە نەرمو نيانی بێ بەش بێ، لە هەمو خێروبێرێ دەستی بەتاڵە)).

يەكێ لە كاراشنايان دەڵێ: نەرمو نيانی مار لە كونی خۆی دەردێنێ.

ڕۆژئاواييەكانيش دەڵێن: هەنگوێن دەربێنەو شانە مەشكێنە.

لە فەرمودەی (سەحیح)يشدا هاتوە: (( **المؤمن كالنحـلة تأكل طيبـا، وتضع طيـبا، واذا وقعت على عود، لـم تكـسره**... بڕوادار وەكو هەنگ وايە پاك دەخواو پاكيش فەراهەم دێنێ ئەگەر لەسەر گوڵانيش بنيشێ لقەكانی ناشكێنێ)).

## بەو زەمینەدا بخولێوەو نیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خوا وەخوێنەوە

یەکێ لەوانەی دڵ دەسرەوێنێو هێمنیو هـەداری بەرهـەم دێنـێ: گەشـتو گەڕانـە بە ناو شارو وڵاتاندا، لەسەرەتای ئەم کتێبە وتەیەك بەو مەبەستە پێشکەش کرا.

خوای بێهاوتا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ... بێژە: سەرنج بدەن لە ئاسمانانو زەمیندا چی هەیە. ﴿١٠١﴾ یونس ﴾.

﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ... بێژە: گەشتێ بەم سەر زەمینەدا بکەن. ﴿٦٩﴾ النمل ﴾.

﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ ... ئاخۆ هەرگیز بە زەمیندا نەگەڕاون، سەرنج بدەن. ﴿٨٢﴾ غافر ﴾.

سـەربوردەی گەشـتی (ئـیبن بەتوتـە) ئەگـەر چـی زیـادە ڕۆیـی تێدایـە، وەلـێ هەرکەسێ وەیخوێنێ لە نەخشو نیگاری خوای باڵادەست سەرسام دەمێنێ، کارجوانی خوا لەم گەردونەدا دەبینێ، تێدەگا پەندو گەلێك ئامۆژی بۆ باوەڕدار لێوەرئەگیرێ، دەزانـێ گەشـتو سـەیران دڵ دەسـرەوێنێ، دڵ گوشـادە ئـەو کاتـەی جێگـاو شـوێنو کەشو هەوای بگۆڕێ، تاوەکو لاپەڕەی پەرتوکی ئەم گەردونە بەر هەڵەوە خوێنێ.

﴿ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ... بێژە: گەشتێ بەم سەر زەمینەدا بکەن. ﴿٦٩﴾ النمل ﴾.

﴿ فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ... لەم زەمینەدا بگەڕێن. ﴿٢﴾ التوبة ﴾.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغۡرِبَ ٱلشَّمۡسِ ... (زیـل قەرنــەین بــە شـوێن مەبەسـتی داچـو) تـا گەیشتە لای خۆرنشین. ﴿٨٦﴾ الكهف ﴾.

﴿ ... لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ... (جـارێ موسـا بـە لاوی بەردەستی خۆی گوت): من لێبـڕاوم سەفەر بکەم تـا بگەمـە جەمـسەری هـەردو دەریاکان، یان لەوێش وێوە دەربچم. ﴿٦٠﴾ الكهف ﴾.

## لەگــەڵ بێــدارانی شــەو بێــدار بــەوە

یەکێ لەوانەی ناخو دەرون دەگەشێنێو دەحەسێنێ: شەو نوێژە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمودەیەکی (سەحیح)دا باس لەوە دەکا: ئەگەر بەنـدە شەو لە خەو هەڵساو، یادی خوای کرد، دوای ئەوە دەست نوێژی گرتو نوێـژی کـرد، بەیانیەکەی چوستو چالاکو دڵ پاکە.

﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ... شەوانە کەمتر دەخەوتن. ﴿١٧﴾ الذاريات ﴾.

﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ ... لـە شەویـشدا بـوی هەسـتەوە، ئەمـە زیـادە نوێژی تۆ بێ. ﴿٧٩﴾ الإسراء ﴾.

هەروا شەو نوێژ دەردو نە ساخی لاشە دەڕەوێنێ، ئەو فەرمودەیـەش بـە دروسـتی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستـراوەو (ئەبو داود) دەیگێڕێتەوە: ((**یا عبدالله لا تکن مثل فلان، کان یقوم اللیل، فترك قیام اللیل**... ئەی (عبدالله) وەکو فلانە کـەس مەبـە، شەوان شەو نوێژی دەکرد، دوایێ پشتی تێکرد، ((**نعم الرجـل عبـدالله لـو کـان یقـوم اللیل**... (عبدالله) باشترین پیاوە، گەر بهاتایە شەو نوێژی بکردایە)).

ئەو شتەی دوا بڕاوەو لە ناو ئەچێ دڵت بۆ پەرێشان نەبێ، چونکێ هەموشتێ لەم ژیانەدا دوا بڕاوە، ئەوەی هەمیشە زیندوە تەنیا خـوای بـەرزو بـێ هاوتایـە، ﴿ ... كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ... بە غەیری خوا هەموشتێ لە بەین دەچێ. ﴿٨٨﴾ القصص ﴾.

﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَـٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ... هەر کێ ژیـنی لەسـەر زەمینە، نامێنێ. هەر خودانی خاوەن شکۆی بەرزو بەڕێزت دەمێنێ. ﴿٢٧﴾ الرحمن ﴾.

## هەڵوەستەیەك

هەریەك لەم دو وشەیە: (الهم) و (الحزن) هاوواتای یەکن، بۆ ئازاری گیان هاوڕێی یەکن، جیاکاریان تەنیا لەوەدایە، (هم) بۆ پێشبینی لە مەترسی داهاتو بەکار دەبرێ، (الحزن)یش بۆ ئێش و ژانی ڕابردوو خۆشەویستی لە دەست چو بە کار دێنرێ، هەر کامێك لەو دوانە مایەی ئێش و ژانەو، بەسەر گیان و دڵدا دێ، جا ئەگەر خەم پەیوەندی بە ڕابردووە هەبێ پێی دەگوترێ (حزن) ئەگەریش پەیوەندی بە داهاتوە هەبێ پێی دەوترێ (هم).

**((اللّهم اني اسألك العافية في الدنيا والاخرة، اللّهم اني اسألك العفو والعافية في ديني و دنياي واهلي ومالي، اللّهم استر عوراتي وآمن روعاتي اللّهم احفظني من بين يديّ ومن خلفي، وعن يميني وعن شمالي ومن فوقي، واعوذ بعظمتك ان اغتال من تحتي...** پەروەردگارا، بێوەیی[٦٣٤] دنیاو دواڕۆژت لێ دەخوازم، پەروەردگارا داوای سڕینەوەی تاوان و دورە بەڵاییت لێ دەکەم، لە ئایین و ژیانی دنیام، لە ماڵ و لە خێزانم، پەروەردگارا شەرم و شکۆم دابپۆشەو، ترس و لەرزم لێ بڕەوێنە، پەروەردگارا لە بەردەمم و لە دواوەم، لە لای ڕاستەو چەپەو سەرسەرمەوە بم پارێزە، پەناشت پێ دەگرم لەوەی لە ژێر پێمەوە لە ناوببرێم.

## بەهەشت سەرمایەی تۆیە

بێگومان دنیا بە زێڕو زیوەوە بە کۆشك و تەلارەوە تەنیا تنۆکە فرمێسکێك نایێنێ، تیرموزی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: **((الدنيا ملعونة معلون ما فيها، الا ذكر الله، وما والاه، وعالماء متعلما...** دنیاو ئەوەی تیایەتی وەبەر نەفرەتی خوا ئەکەوێ، بەدەر لە یادی خواو ئەوەی بە شوێنیا ئەڕوا، یا زاناو ئەوەی بە دوای زانستدا دەگەڕێ.

---

٦٣٤) خۆ ناشێوێنن.

هەمو نازوگۆزی دنیا تەنیا بۆ ماوەیەکی کاتی خراوەتە دەستی بەندە، دڵنیا بە ملیاران پارەو پۆڵو زەویو زارو ئۆتۆمبێل تەنیا چرکەیێ مەرگی بەندە دوا ناخەن، بۆیە کاراشنایان دەڵێن: نرخێکی گونجاو بۆ شت دابنێ، چونکێ دنیاو ئەوەی تیایەتی بارتەقای گیانی بڕواداری نابێ: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ... ئەم ژیانەی سەر دنیایە، هەموی هەر گەپو گاڵتەیەو چی تر نیە. (٦٤) العنكبوت﴾.

حەسەنی بەسری دەڵێ: گیانت تەنیا بە بەهەشت بفرۆشە، گیانی بڕوادار گران بەهایە، بەڵام کەسانێ بە نرخێکی کەم دەیفرۆشن.

بە ڕاستی ئەوانەی لە پێناوی لەدەستدانی منداڵو سامانیان، دارمانی خانوبەرەیان، سوتانی سەیارەو ئۆتۆمبێلیان، شینو زاری دەکەن، وەلێ لە تاوی دابەزینی پلەی باوەڕیان، توشبونیان بە هەڵەو تاوانو کەمتەرخەمی لە گوێڕایەڵی پەروەردیاریان پەرۆشو دڵگران نینو، هەر خۆیان لە گورە[٦٣٥] نابەن.

بەڕاستی ئەوان بە ئەندازەی ناڵەو زاریان لەپێناوی دنیای بێبایەخدا بێ بایەخن، چونکێ ئەو بابەتە پەیوەندی بە خورەوشتی بەرزو پەیامو هەڵوێستەوە هەیە:

﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمْ يَوْمًا ثَقِيلًا ... ئەوان حەزیان هەر لە دنیای بێ بەقایەو ڕۆژێ گران دەخەنە پاش خۆیانەوە. (٢٧) الإنسان﴾.

## خۆشەویستی ڕاستەقینە

بۆ ئەوەی بەختەوەر بیت هەوڵ دە یەکێ بیت لە دۆستو خۆشەویستانی خوا، دڵنیا بە سەروەری بەختەوەران ئەو کەسەیە ئامانجو مەبەستی هەرەبەرزو سەرەکی خۆش ویستنی خوای بەرزو توانا بێ، سەرنج دە ئەم وتەی خوا چەند نەرمو نیانە: ﴿...يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ... خوا خۆشی دەوێنو ئەوانیش خوایان خۆشدەوێ. (٥٤) المائدة﴾.

---

٦٣٥) خۆ ناشێوێنن/خۆ سڵ ناکەن.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ڕستەی (یحبونه) جێگای سەرسامی نیە، بەڵام سەیر لەو دەستەواژەیە دایە: (یحبهم)، هەر ئەو خوایەی وەدی هێناون ڕۆزی پێ داون، سەرپەرشتیان دەکاو پێیان دەبەخشێ، وێڕای ئەوەش خۆشی دەوێن: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ... بێژە: ئێوە ئەگەر خوداتان خۆش دەوێ، شوێن من کەون هەتا خوداش خۆشی بوێن. (٣١) آل عمران ﴾.

سەرنج دە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەڵاتە بە پێشەوا (عەلی) دەبەخشێ: پیاوێکە خواو پێغەمبەری خۆشەوێو، خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێ، ئەم پەیڤە بو بە تانجی ڕێزو قەدریو ختیە سەری.

یەکێ لە هاوەڵان ئەم سوڕەتەی خۆشدەویست: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ... بێژە: ئەو خودایە تاکە. (١) الإخلاص ﴾.

لە هەمو ڕکاتێکدا دوبارەی دەکردەوەو، بە یادی ئەو شەیدا بو، دەمی بەو یادە پاراو بو، هەستو ناخی پێ دەهەژاو ئاوەدان بو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمو: ((**حبُّك إياها ادخلك الجنّة**... خۆشویستنی ئەم سورەتە ئەتخاتە بەهەشتەوە.

﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ ... جولەکەکانو فەلەکان گوتیان: ئێمە عەولادو دۆستانی خوداین. بێژە: ئەدی چۆن لەسەر گوناهانتان ئازارتان دەدا؟ (١٨) المائدة ﴾.

(مەجنون) بە شەیدابونی لەیلا، قارون لە پێناوی ساماندا، فیرعەون لە تاو پلەو پایەیدا گیانیان لەدەستدا، کەچی حەمزەو جەعفەرو حەنزەلە، لە ڕێگای خواو پێغەمبەردا خۆیان کردە قوربانی، ئەم دو دەستەیە چەندە لێك دورن.!

## هەڵوەستەیەك

"لە ئەمریکا ساڵانە ٣٠٠ ئەفسەری پۆلیس خۆیان دەکوژن لەو ڕێژەیە دەیان تەنیا هی شاری نیویۆرکن.. لە ساڵی ١٩٨٧ی زایینییەوە تاوەکو ئێستا ژمارەی ئەو ئەفسەرانەی لە وڵاتی ناوبراو خۆیان لەناودەبەن لە زیادبوندایە)ئەم دیاردەیەش بو بە مایەی بێزاری دەسەڵاتداران‌و، (یەکیەتی نیشتمانی بۆ ئەفسەرانی پۆلیس) بە دوای لێکۆڵینەوەی داگەڕا.

دەرەنجام ئەم یەکیەتیە دەریخست کە دیاردەترین هۆکاری خۆکوژی ئەو ئەفسەرانە یەکەم: ئەو گرژی‌و ئاڵۆزیەیە هەمیشە تیایدا دەژین، بەوە ئاتاجن هەمیشە بەرگەی ئەم مەینەتیانە بگرن کە دێتە ڕێیان‌و، بەرگەی ئەم گوشارە یەك لەدوای یەکە بگرن لەگەڵ ئەوەی ڕێژەی تاوانکاریەکان لە زیادبون دایە، هەروا بەرگەی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە بگرن کە لە ئەنجامی هەڵس‌وکەوتیان لەگەڵ تاوانکاراندا دێتە ڕێیان‌و، لاشەی قوربانیان لە ژن‌و منداڵ‌و پیرو پەککەوتە دەبینن.

هۆکاری دوەم: ئەو چەکەی هەمیشە لەدەستیانە بۆ خۆکوشتن ئاسانکاریان بۆ دەکاو یارمەتیشیان دەدا. ئەوەشیان ڕونبۆتەوە کە لە سەدا هەشتای ڕوداوی خۆکوژی ئەفسەران هەر بە چەکی تایبەتی خۆیان ئەنجام دەدرێ، لە سێ ڕۆژی لە دوای یەکدا سێ ئەفسەر خۆیان کوشت، هەریەك لەوانە خۆکوشتنەکەی بە دەمانچەی میری بو".

## باری خۆت گران مەکە شەریعەت سوك‌و ئاسانە

یەکێ لەوانەی هەست‌و ناخی موسڵمان دەحەسێنێ دیاردەی ئاسانکاری‌و چاوپۆشیە لە یاسای ئیسلامیدا ﴿طه ۝١ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ... طە ئەم قورئانەن بۆ نەناردی کە توشی چەوسانەوە بی. ۝٢ طه﴾.

﴿وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ... لەبەریشت ئاسان دەکەین، هەتا ئاسانترین ڕێگە پەیدا بکەی. ۝٨ الأعلى﴾.

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... خوا ئەرکی لە توانا بەدەر، بەسەر کەسدا ناسەپێنێ. ﴿٢٨٦﴾ البقرة ﴾.

﴿ ... لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ... خودا ئەرك ناخاتە سەر کەس، مەگین لەوەندەی پێی داوە. ﴿٧﴾ الطلاق ﴾.

﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... لەم دینەش دا توشی زەحمەتی نەکردون. ﴿٧٨﴾ الحج ﴾.

﴿ ... وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ... گرانایی زنجیریان لەسەر لادەبا، کە بە وانیان شەتەك دابون. ﴿١٥٧﴾ الأعراف ﴾.

﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ... لە پاش تەنگانە خۆشی یە، لە پاش تەنگانە فەرحانی هەیە. ﴿٦﴾ الشرح ﴾.

﴿ ... رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ... ئەی پەروەرندەی هەموان! ئەرکی ئەوەندە گرانمان مەخە سەرشان وەك ئەوانەی بەر لە ئێمە لەسەریان بو. ئەی خودانی هەمولامان! ئەرکی وامان پێ مەسپێرە کە لە توانامان بەدەربێ. تۆ هەر خۆت لێماببورەو بەر بەزەیی خۆتمان بخەو بمانبەخشە. هەمو کاروبارێکی مە بەدەست تۆیەو سەریشمانخەی لەسەر ئەوانەی ناتناسن.﴿٢٨٦﴾ البقرة ﴾.

((رفع عن امتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه... هەڵەو لەبیرچونو ئەوەی بە تۆبزەکاری پێیان دەکرێ لەسەر ئۆممەتی من بە تاوان دانانرێ ((ان الدين يسر، ولن يشاد الدين احد الا غلبه... دین سوكو ئاسانە، هەر کەسێکیش ڕەقە کاری لەگەڵ دیندا بنوێنێ بێگومان بەسەریدا زاڵ دەبێ.

((سـدّدوا و قاربوا و ابشروا... كارتـان ڕێكخەن و لێك نزيك بنەوەو، مژدە بدەن.

((بعثـت بالحنيفيـة السمحة... مـن بـە ئاينێكـی پـاك و دور لـە شـيرك ناردراوم.

((خيـر دينكم أيسره... باشترينی دينداريەكەتان ئەوەيە ساناتر بێ.

لە يەكێ لە دەوڵەتەكان داوايان لە شاعيرێكی سەردەم كـرد كـە پۆسـتی وەزارەتێك بخاتە ئەستۆ، لە پای ئەوە دەستبەرداری خواستو پـەيامو پێشنيارە ڕاستەقينەكانی بێت، لە وەڵامدا گوتی:

هـەموو دنيـا بۆ خۆتـان منيـش سـەربەستيم دەوێ
ئەگـەر تەنيـاش جێـم بهێڵن سـەرم بەرزەو نانەوێ

## بنــەمای دڵ گوشـــادی

لە گۆڤاری (أهلا و سهلا) دەرچوی بەرواری ١٤١٥/٤/٣ كۆچی، گوتارێك بەناونيشانی (عشرون وصفة لتجنب القلق) بيـست چـارەڕێ بـۆ دوركەوتنـەوە لـە نيگـەرانی) بـە پێنوسی دكتۆر، (حەسان شەممی پاشا) نوسراوە. كە ئەوە هەنـدێ لـە مەبەسـتی ئـەم گوتارەيە: بێگومان مەودای تەمەن دياريكراوە، هەمو شـتێكيش بـە بڕيـارو قـەدەری خوايە، كەوايە با بەندە داخدار نەبێو، لە تاوی ئەوەی ڕوئەدا دڵگران نەبێ. بژێوی دروستكراوەكان لەلايەن دروستكارە لـە ئاسمـان، هـيچ كـەس دەسـتی پـێ ناگـاو، هـيچ هێزی دەستی بەسەرا ناڕوا، ئەگەريش خوا بيدا هيچ مرۆڤێ ناتوانێ ياساخی كا.

ڕابردوش بە خەمو خەفەتەوە بارگەی پێچايەوەو دوايـی هـاتو بڕايـەوە، ئەگـەر هـەموجيهانيش سـەر لەبـەری بـە دوای دابـڕۆنو بـی گێڕنـەوە بەلايانـدا لاناكاتـەوە. داهـاتوش هێـشتا لـەوديوی پـەردەی ژيانـەو، پەچـەی سـەر ڕوی لانـەداوە، ئێـستا كـە نەبۆتە مێوانی ژينت ئەو ساتەی بـەرەو ڕوت هـات بـچۆ پێـشوازی. بـێ گومـان چـاكە نواندن لە ڕوی خەڵكدا دڵت ئاسودە دەكـاو سـينەو ناخـت دەسـرەوێنێ، چـاكە كـاری گەورەترين پيتو فەڕو بەخششو خەڵات بەسەر چاكە كاراندا هەڵدەڕژێنێ.

یەكێ لە خوونەریتی بەرزی باوەڕدار ئەوەیە بە ڕەخنـەو پـەلاماری دەم دڕاوان[٦٣٦] هەراسان نابێ، چونكێ چەنەبازو گەزاران[٦٣٧] دەمیان لە ئاقار وتەی نابـەجێو جـوێن دان بـە پـەروەردگاری هـەمو جیهـان نەپاراسـتوە، ئـەو خوایـەی خـاوەنی ئەوپـەڕی جوانیو بەرزیو تەواویە، شكۆداریو پایەداری بۆ ناوە جوانەكانی.

## وریـــای ئەویـن بـــە

وریا بە دیمەنو نیگار نەت خەڵەفێنێ، چونكێ خەمو پەژارەیەكی دەست بـەجێو ئێشو ژانێكی هەمیشەییت بەسەردا دێنێ.

خۆ بەدورگرتن لە ئاخو ئۆفی شاعیرانو، شەیدا بونو ئەوینیان، لە دەربڕینی پشت هەڵكردنو گەیشتنو نەگەیشتنی خۆشەویستیان، یەكێكـە لـە مایـەی بەختـەوەربونی موسڵمان، بە ڕاستی ئەو هەستو نەستانە لـە ئـەنجامی دڵێكـی بـەتاڵ سـەرهەڵدەدەن ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً ... ئاخۆ تۆ ئەو كەسەت دیوە كە ئـارەزوی خـۆی دەپەرست؟ خـودا -كـە ئاگـای لـێ هەبو- ڕێـی لـێ گـۆڕیو گوێـچكەو دڵـیشی مـۆركردو لێـڵایی خـستە سەرچاوی. ﴿٢٣﴾ الجاثیـة ﴾ .

شاعیـرێك دەڵێ:

وأنا الذي جلب المنيـة طرفُـهُ      فمن المطالب والقتيـل القاتـل

مەبەستی ئەوەیە: خۆم شیاوو لـێ وەشـاوەم بـەو ئـازارو ئەشـكەنجەیەی دەیـچێژم، چونكێ خۆم هۆكاری سـەرەكیم لەوەی بەسەرم دێ.

شاعیرانێكی تری ئەندەلوسی بە ئـەوینو زۆر شـێتو شـەیدایی خـۆی دەنـازێو، لـە شیعرێكدا ئازارو ئەشكەنجەی لێك جیابونەوە دەلاوێنێ، ئەگـەر ئـەو هەسـتیارە نـاخو

---

٦٣٦) دەم شـڕ.

٦٣٧) بێ شەرمان.

سـینەی پـڕ لـە یـادو خۆشەویـستی خـواو، خواپەرسـتیو خواویـستی بوایـە، ویـڵو سەرگەردان نەئەبو ڕێگای ڕاستو دروستی ئەدۆزیەوەو ئەیگرتەبەر: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ... هەروەختێ لە شەیتانەوە دوچاری خەیالاتێك بـوی، یەك سەر پەنا بە خوا بەرە. ﴿٣٦﴾ فصلت ﴾.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ... ئـەو کەسـانەی پارێزگـارن، هـەرگا خـەیاڵی خراپیـان لـە شـەیتانەوە تـوش دەبێ، بـە گورجی یادی خوا دەکەنو بەرچاویان ڕون دەبێتەوە. ﴿٢٠١﴾ الأعراف ﴾.

(ئیبن قەیم) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (الداء والـدواء) یـاخود کتـێبی (الجـواب الكـافي لـمن سـأل عن الدواء الشـافي) بە تێرو تەسەلی ئەم بابەتەشی دەکاتەوەو چارەی بـۆ دۆزیوەتەوە، جا هەر کەسێ حەز دەکا بـا سـەرێ لـە کتێبەکـەی بـدا. چـەند هۆکـارێ دەبێتە مایەی ئەوینو دڵداری، لەوانە:

١- دڵ بەتاڵی لە خۆشەویستی خوای بەرزو بێوێنەو یادو ستایشو بەندایەتی.

٢- چاو بەر هەڵی، بێگومـان چاوەکان گەشـتەوانو دیـدەوانن خـەمو خـەمینی بـۆ دڵەکان دەهانن[٦٣٨]: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ... تۆ بە باوەڕداران بێژە، چاو داخەنو شورەیی خۆبپارێزن. ﴿٣٠﴾ النور ﴾.

((**النظرة سهم من سهام ابليس**... ڕوانینی ژنی بێگانە تیرێ لە تیرەکانی شەیتانە.

٣- کەمتەرخـەمی لـە بەندایـەتیو، یـادو نـزاو سـوننەتەکاندا ﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ... نوێژخوێنـدن (مـرۆ) لـە کـاری ناشـیرینو ناڕەوا دەپارێزێ. ﴿٤٥﴾ العنكبوت ﴾ .

---

[٦٣٨] دەهێنن/دێنن.

بەڵام هەندێ لە دەرمانی دڵداری ئەوانەی خوارەوەن: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ... بۆ ئەمە بو کە خراپەو شورەیی لێ وەپرینگێنین [٦٣٩] ئەم یەکێ بو لە عەبدە دڵپاکەکانمان. (٢٤) یوسف ﴾.

١- لەبەر دەرگای بەندایەتی خۆت بە گورێ دادەی چابونەوەو چارەسەرت لە پەروەرەندەت داواکەی.

٢- چاوت لە ئاقار ژنی بیانی داخەی‌و دامێنت لە خراپەکاری بپارێزی ﴿ ... وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ... شورەیی خۆشیان بپارێزن. (٣٠) النور ﴾.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ... هەر ئەوانەش کە شەرمی خۆ دەپارێزن. (٥) المؤمنون ﴾.

٣- پشت لە خانوبەرەو جێگاو شوێنی ئەویندارەکەت هەڵکەی، یادو باسی لەیادکەی.

٤- بە کردەی چاکە خۆت سەرقاڵکەی: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ ... ئەمان لە کاری چاکەدا بە هەڵپەبون، بە هومێدو بە ترسەوە لە بەرمان دەپاڕانەوە. (٩٠) الأنبياء ﴾.

٥- بە ڕێگای شەرعی هاوسەرێك پەیداکەی ﴿ ... فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ... دەتوانن چەندی خۆتان پێتان باشەو پێتان دەشێن ژن مارە بکەن. (٣) النساء ﴾.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا ... هەر لە نیشانانی خوایە کە لەخۆتان، هاوجوتی بۆ بەرهەم هێنان، کە پێیان بحەسێنەوە. (٢١) الروم ﴾.

((یا معشر الشباب، من استطاع منکم الباءة فلیتزوج)) ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەر کام لە ئێوە توانای پێکهێنانی خێزانی هەبێت با ژن بێنێ.

---

٦٣٩

## مافی برایەتی

یەکێ لەوانەی برای موسڵمانت دڵشاد دەکا، ئەوەیە بە خۆشەویسترین ناو لە لای ئەو ناوی هەڵدەی.

هەروەها بە ڕوی براکەتدا بگرژێیەوەو[٦٤٠] بگەشێینەوە ((**ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق**... هەر بەچاکە دەژمێردرێ ئەگەرچی بە ڕوێکی خۆشەوە بە برایەکەت بگەی)).

((**تبسمك في وجه اخيك صدقة**... خەندە لێویت بە ڕوی براکەتدا چاکەیە)).

بە هەمان شێوە براکەت هاندەی لەسەر ئەوەی لەگەڵت بدوێ - واتە دەرفەتی ئەوەی پێ بدەی باس و خواس و هەواڵی خۆت پێ ڕابگەیەنێ- لەمەڕ بارو گوزەرانی گشتی و تایبەتی، لەو بابەتانەی جێگای شەرم نیە لێی بپرسی و لێی بپێچیەوە، هەروەها بایەخ بە کاروباری بدەی ((**من لم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم**... هەر کەسێ بایەخ بە کاروباری موسڵمانان نەدات لەوان نیە)).

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ... ژن و پیاوی باوەڕدار دۆستی یەکترین. ﴿٧١﴾ التوبة ﴾.

دڵخۆشکەرێکی تر ئەوەیە: دەربارەی کاروو ومرامێك دوای بڕاوەو تێپەڕیوە بەسەریدا هەڵنەشاخێی[٦٤١] سەرزەنشتی نەکەی، بەهەمان شێوە بە گاڵتەو گەپ تەنگی پێ هەڵنەچنی: ((**لا تمار اخاك ولا تمازحه، ولا تعده موعداً فتخلفه**... برایەکەت بەهەڵە مەبەو گاڵتەی پێ مەکە، بەڵێنێکی واشی پێ مەدە سەرپێچی لێ بکەی.

٦٤٠) لێوت بە خەندە بێ.

٦٤١) هاواری بەسەردانەکەی/دەنگی بەسەر هەڵنەبڕی.

## نهێنی لە گوناهدا.. بەڵام گوناهیش ئەنجام نەدەی!

هەندێ لە زانایان دەڵێن: تاوان وەکو مۆرە بەسەر بەندەوە، بەڵام دوای ژێوانیو پەشیمانی ئەو نهێنینیانەی تێدایە: پشت شکانی خۆ بە زلزانی، زۆر داوای لێخۆشبونو تۆبە کردنو گەڕانەوەو، ڕو کردنە خواو نواندنی ملکەچیو دەربڕینی ژێوانی، ڕودانی قەزاو قەدەرو، مل کەچی نواندو بەندایەتی کردن لە پای ڕودانی ئەو قەزاو قەدەرە.

نهێنیەکی تر: ڕەنگدانەوەو وە ڕاستگەڕانی ناوو ڕەوشتە جوانو بەرزەکانی خوای بەرزو توانا وەکو: لێبوردەییو میهرەبانی خوای قەبوڵ کاری پەشیمانی.

## بە دوای ڕۆزی دابگەڕێو ڕژدو چاوچنۆکیش مەبە

بێ هاوتاییو تاکو تەنیایی بۆ خوای دروست کارو ڕۆزیدەر، کرم لەناو قوڕدا، ماسی لەناو دەریادا، باڵندە لە حەوادا، مێروله لە تاریکیدا، مار لە نێوان تاشابەرددا، ڕۆزی بە گشتیان ئەدا.

(ئیبن جەوزی) نوکتەیەکی خۆش دەگێڕێتەوە: کە مارێکی کوێر لەسەر سەری دارخورمایەك دەبێ، چۆلەکەیێ بە دەنوکی پارچە گۆشتی بۆ دێنێ، کاتێ لێی نزیك ئەبێتەوە خێرا خێرا دەجریوێنێ، ئەویش دەمی دەکاتەوەو چۆلەکە پارچە گۆشتەکەی تێ ئەخا.

گەورەیی بۆ ئەو کەسەی ئەو دو نەیارەی کردوە بە دۆست ﴿... وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ ... هەر مەلێکیش بە باڵان دەفڕێ، هەمویان کۆمەڵانێکن وەکو ئێوە. ﴿٣٨﴾ الأنعام﴾.

مەریەمە سەلامی خوای لەسەر بەیانیو ئێوارە لە پەرستگاکەیدا ڕۆزی بۆ ئەهات، پێیان گوت: مەریەمە ئەمەت لە کوێ بو؟ لە وەڵامدا گوتی: لە لایەن خواوەیە، هەر کەسێ خوا بیەوێ بە بێ هەژمار ڕۆزی پێ دەبەخشێ.

دلگران مەبە، ڕۆزی تۆ دیاری کراوە ﴿... وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ ... لە ترسی لە برسان مردن، فرزەنـدەی خۆتـان مـەکوژن، ئێمـە بژێو بە ئێوەو بە وانیش دەدەین. ﴿١٥١﴾ الأنعام﴾.

بۆ ئەوەی هەمو مرۆڤایەتی دڵنیا بێ، کە ڕۆزی دەری باوك و کۆرپە، ئەو خوایەیـە نە باوکی هەیەو نە کۆرپە.

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ ... زاروۆی خۆتـان لـە ترسـی لـە برسان مردن لە ناو مەبەن. ئێمەین ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین. ﴿٣١﴾ الإسراء﴾.

بێگومـان خـاوەنی گەنجـــینەی بـێ سـنور – شکـــۆداری و پایـەداری بـۆ ئـەو -دەستەبەری ڕۆزی کردوە، کەوایـە دڵاو دڵـی و نیگـەرانی پـێ دەوێ کـە خـوا بـۆ ڕۆزی بەڵێنی دەربێ؟!

﴿ ... فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ ... ڕۆزی لـــە خـــوا داوا کـــەن و بیپەرستن و شوکری بکەن. ﴿١٧﴾ العنكبوت﴾.

﴿ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ... هـــەر ئەویـــشـــە خـــواردنم پێـــدەدات و ئاویـــشـــم دەفریـاد دەخا. ﴿٧٩﴾ الشعراء﴾.

## هەڵوەسـتـەیـەك

"بــەڵام پلــەو کاریگــەری نوێــژ، بــۆ ئاســودەیی دڵ و، بــەهێزکردنی، بــۆ شـادی و گوشادی و چێژ وەرگـرتنی، بەرچاوترین کاریگـەری هەیـە، بـە سـای نوێـژ دڵ و گیـان پەیوەندی بە خوا دەبەستێ، بەندە لە خوا نزیك دەبێتەوەو تام و چێژ لە یـادی ئـەو وەردەگرێ، بە گفت و گۆ و وەستان لە خزمەتیدا دەسرەوێ، هەموڵاشـەو وزەو توانـای لە بەندایەتی ئەودا وەگەڕ دەخرێ، گشت ئەندامێکیش بەشی خۆی لێ وەردەگرێ، لـە تێکـەڵاوی و پەیوەنـدی و گفتوگـۆی دروسـت کراوەکـان بـە دور دەبـێ و، هێـزی دڵ و

ئەندامەکانی وا بەستەی [٦٤٢] ڕاهێنەرو [٦٤٣] وەدیهێنەری خۆی دەبێ، لەو کاتەی لە ناو نوێژە لە دەستی نەیارانی دەحەسێتەوەو داوودەرمانو توێشوو وزەیەکی وای دەست دەکەوێ، کە تەنیا ئاوێتەی دڵە پاکەکان دەبێ، بەڵام ئەو دڵانەی کە نەساخن، وەکو لاشەی ناسازن، تەنیا بۆ خۆراکێ بە دەم دەخورێ لەبارن".

ئەوسا نوێژ بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی دنیاو دواڕۆژو، وەلانانی زیانباری دنیاو دوا ڕۆژ گەورەترین هاریکارە، بەربەستی ڕێی خراپەیە، بۆ دەردی دڵ چارەیە، ڤاپرۆسی ئیرەیی [٦٤٤] لە ناو دەبا.

دڵو دەرون ڕۆشن دەکا، ڕەنگو ڕوخسار سپی دەکا، دەرو [٦٤٥] ناخ [٦٤٦] گورجو گۆڵ دەکا، ڕزقو ڕۆزی زیاد دەکا، زوڵمو ستەم بن بڕ دەکا، چەوساوەو ژێر دەستان سەردەخا، هەستی ئارەزو بازی دادەمرکێنێو، لە بەهرەکان پارێزگاری دەکا، ڕەوێنەری خەشمو قینەو، پلەو پایەی هەست سۆزەو ڕەوێنەری تەمو مژە".

## ئیسلام ئاینێکی سانایە

ئەوەی موسڵمان دڵشاد دەکا، ئەو بەهرەو خەڵاتە گەورەو بێ وێنانەیە لەم ئایینە بە خەڵات دەدرێن، کە لەو (١٠) ڕەشکەرەوانەی تاوان ڕەنگ دەدەنەوە، وەکو یەکتاپەرستیو ئەو تاوانانەی بە سای یەکتاپەرستی ڕەش دەبنەوە.

هەروەها ئەو کردە چاکانەی مایەی سڕینەوەی تاوانن، وەکو نوێژ، هەینی تا دەگاتەوە هەینی، عومرە کردن تا گاتەوە عومرەیەکی تر، حەج کردن، ڕۆژو گرتن، وێنەی ئەمانەش لە کردە چاکەکان.

---

٦٤٢) پەیوەستی/پابەندی.
٦٤٣) پەروەردگار.
٦٤٤) چاوچنۆکی.
٦٤٥) دەرەوە/
٦٤٦) ژورەوە.

بە هەمان شێوە ئەو کردەوە چاکانەی پاداشتیان دو چەندانە دەدرێتەوە، وەکو ئەوەی چاکەیەك بە دەیەو تا حەوسەدیش بگرە زۆر لەوەش زیاتر پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە.

ڕەشکەرەوەیەکی تر تۆبەو پەشیمانی دەربڕینە، کە هەرچی تاوانو هەڵەی ڕابردوە ڕەشی دەکاتەوە.

یەکێکی تر ئەو دەردو بەڵایانەی تاوان هەڵدەوەرێنن، بەندەی بڕوادار هەر ئازارو ئەشکەنجەیێ ببینێ گوناهی پێ دادەوەرێن.

یەکێکی تر لەوانەی ڕەوێنەری تاوانە نزاو پاڕانەوەی موسڵمان بۆ موسڵمانە، لە پەنهانا.

یەکێکی تریش لەو دەیانە ئەو ئێش‌و ئازارەیە دێتە ڕێی بڕوادار لە گیان کێشانا.

**تکاو نزای موسڵمانیش لەکاتی سڵاوەت لێدانا یەکێ لەوانە** تکاو نزای گەورەی هەمو دروستکراوانی خواش -درودو سڵاوی خوای بەسەرا بڕژێ- کە میهرو سۆزێکە لە لایەن ئەو خوایەی لە هەمو میهرەبانێك میهرەبان ترە، گەورەیی‌و شکۆداری بۆ ئەو، کۆتا هەمی دەیەکانە ﴿... وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ ... ئەگەر بێنە سەر ژمارەی چاکەی خودا، لە ژماردن دادەمێنن. ﴿٣٤﴾ إبراهيم﴾.

﴿... وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ ... بە ئاشکراو بە نهێنی بەهرە گەلی بەسەرتانا ڕژاندوە. ﴿٢٠﴾ لقمان﴾.

## ترست نەبێ تۆ پایە بەرزتری

(موسا) پێغەمبەر سێ جاران ترسی بەناو دڵدا هات:

جاری یەکەم: ئەو کاتەی چوە ناو کۆشکی فیرعەونی خۆ بە خوازان، موسا گوتی: ﴿... إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ... (پەروەرندەی ئێمە) ترسن هەیە لێن دەرهەڵبیێو یان تەواو لە شۆری دەرکا [٦٤٧]. ﴿٤٥﴾ طه﴾.

خوای گەورە فەرموی: ﴿قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ... هیچ ترسێکو نەبێ، من لەگەڵ ئێوەم. ئەبیەم، دەشبینم. ﴿٤٦﴾ طه﴾.

جێگای خۆیەتی بڕوادار ئەم وتەی خوای خۆی هەمیشە لەیادو لەبیر بێ کە دەفەرموێ ترست نەبێ، من دەبیسمو دەبینم.

جاری دوەم: لەو ساتەی جادوگەران داردەستەکانیان [٦٤٨] فرێدا، موسا ترسی بەناو دڵدا هات خوای گەورە پێی فەرمو: ﴿قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ... هیچ ترسێکت نەبێ، تۆ بەرزتری. ﴿٦٨﴾ طه﴾.

جاری سێیەم: ئەو هەڵەی فیرعەونو سەربازەکانی ڕاوەدویان [٦٤٩] نا، خوای گەورە پێی فەرمو: ﴿... ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ... بە دار عەساکەت (بەو بەردە) دابکێشە. ﴿٦٠﴾ البقرة﴾.

موساش فەرموی: ﴿قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ... نابێ هیچ بترسن، چونکە پەروەرندەم دەگەڵەو بەم زوانە دەروێکم لێ دەکاتەوە. ﴿٦٢﴾ الشعراء﴾.

---

٦٤٧) یان تەواو سنور ببەزێنێ.

٦٤٨) ئەو دارەی لە دەستیان دابو.

٦٤٩) سەریان لە دو نا.

## لە چـوار شـــتان خۆت بە دور بگـرە

چوار شتن ژیانێکی پڕ لە ئاستەنگو هەستو نەستێکی لێڵو تەنگ بەرهەم دێنن:

یەکـەم: لە بڕیارو قەدەری خوا تورە بونو، پێ قایل نەبونی.

دوەم: خـۆ خـستنە نێـو تـاوانو دەرنەبڕینـــی پەشـــیمانی ﴿ ... قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ ... بێژە: لە خۆتانەوە بو. ﴿١٦٥﴾ آل عمران﴾.

﴿فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ... (هـەرگا توشـی بەڵایـەك بـون)، بـەهۆی کـردەوەی خۆتانە. ﴿٣٠﴾ الشورى﴾.

سێیەم: ڕقو کینـە هـەڵگرتن لـە خـەڵکان، چـاو لـە تۆڵە گێـڕانو، چاونزێریو[650] ئێرەیی[651] پـێ بردنیـان لەسـەر ئـەو بەهرەو خەڵاتـەی لـە لایـەن خـواوە پـێیان دراوە، ﴿ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ ... یـان ئەوانـە ئێرەیـی بەمانە دەبەن، کە خوا چاکەی دەگەڵ کردون. ﴿٥٤﴾ النساء﴾.

(( لا راحة لحسود ... مرۆڤی ڕەشـك پێ بەر[652] ئاسودە نیە)).

چوارەم: ڕو وەرگێڕان لە بەرنامەی خوا ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ... هەرکەسێکیش بە ئامۆژگـاری مـن نەکـا، ژینـــی لـە تەنگـــانە دایـە. ﴿١٢٤﴾ طـه﴾

---

٦٥٠) چاوبرسێتی.

٦٥١) حەسودی/ ڕژدی.

٦٥٢) چاوتێوەبو/ چاوبرسی.

## بە پەروەردگارت دڵت بسرەوێ

دڵارامی بەندە لەوەدایە دڵی بە پەروەرێنی بێ هاودەمو بێ هاوتا ئۆقرە بگرێ.

لە چەندین شوێندا خوای گەورە - شکۆمەندی بۆ ئەو- لە کتێبەکەیدا باس لە ئارامی دەکاو، دەفەرموێ: ﴿... فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ... خودا ئۆقرەو هێمنایەتی ناردە خوارێ بۆ ناو دڵی پێغەمبەرو باوەڕدارانی (یارانی). ﴿٢٦﴾ الفتح﴾.

﴿فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ ... سا ئۆقرەو دڵنیایی ناردە سەریان. ﴿١٨﴾ الفتح﴾.

﴿ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ... پاشان خودا دڵنیایی بۆ پێغەمبەرەکەی بەڕێ کرد. ﴿٢٦﴾ التوبة﴾.

﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ ... ئۆقرەی لە خوداوە بۆ هات. ﴿٤٠﴾ التوبة﴾.

ئارامی پابەندبونی دڵە بە پەروەرێنی جیهان، یاخود ڕۆچونی هەستو ویژدانە لە باوەڕومتمانە بە خوای میهرەبان، یا دڵ هێورە بونە بە سای پشت بەخوا بەستان.

## ئارامی دامرکانی ئازارو ناسۆری[٦٥٣] دەرونەو هێورە بونە.

سرەوتنی دڵو گیانو ئۆقرە گیریو هێمن بونە، ئارامی بەشێکە لە بێ ترسیو بەرقەراری، کە بە بڕواداران بڕاوە، لە جەنگەڵی سەر شێواوی دڵاو دڵی دەریاندێنێ، لەسەر لێواری هەڵدێرانی گومانو ڤین لە دڵی دەستیان دەگرێ، دڵارامی بەندە بە پێی دۆستایەتیو، یا دوستایشی بۆ پەروەردگاری، بە پێی خۆڕاگری لەسەر فەرمانیو شوێن پێ هەڵگرتنی پەیامبەریو ﷺ دەست گرتن بە پەیامی، بە گوێرەی خۆشەویستی بۆ بەدیهێنەریو، دڵنیا بون بەوەی هەمو شتێکی لە دەستەو، ڕوی

٦٥٣) ناخۆشی.

تەنیا لە ئەو بێ‌و پشتی لە غەیری ئەو بێ، تەنیا لە خواوە پاڕێ‌و، پەرستنی هەر بۆ ئەو بێ، بەو پێیە ئاسودەو ئارام دەبێ ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ... خودا لە دنیاو سەلاّدا، بە قسەی پتەو بڕواداران توندو قایم دەکاتەوە. (٢٧) إبراهيم ﴾.

## دو وشـــەی بەهـــادار

پێشـەوا (ئەحمەد) دەفەرموێ: لـە کـاتی ئـازارو ئەشکەنجەدا خـوا وایکـرد سـودو کەڵك لە دو وشـە وەرگرم:

<u>یەکەمیان:</u> پیاوێك لەسەر ئارەق خواردنەوە بەند کرا بو، گوتی ئەی (ئەحمەد) ئـارام بگرە، تۆ لەسەر (سوننە) دارکاری دەکرێی، کەچی من چەندین جار لەسەر ئارەق دارکاری کراوم‌و، ئارامیشم لەســەر گرتوە.

﴿ ... إِن تَكُونُواْ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ... ئەگەر ئێوە لـەوان توشـی ئـازار دەبـن، ئـەوانیش -هـەروەکو ئێـوە- لـە ئێوە ئازار دەبینن، ئێوە هومێدو خوایە، ئەوان ئەوەشیان لا نیە. (١٠٤) النساء ﴾.

﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ... ســا خــۆت بگرە، بەڵێنی خودا دێتەجێ، نەکا ئەوانەی دڕدونگن، تۆ لـە ڕێـی هـەق بترازێـنن. (٦٠) الروم ﴾.

<u>دوەم:</u> کاتێ پێشــەوا (ئەحمەد) قۆڵ بەست کرابو بەرەو بەندیخانە دەبرا، عـەرەبێکی بیابان نشین بە پێشەوا (ئەحمەد) دەڵێ: ئەی (ئەحمەد)، ئارامبگرە، ئەگـەر بـێ‌و تۆ لێرە بکوژرێی هـەر لێرەشـەوە دەچیە بەهەشت ﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ... پەروەرێنیان مژدەی بەزەیی‌و ڕەزای (خۆی‌و) باغاتی وایان پێدەدا کە دەوێدا خۆشی پایەداریان دەبێ. (٢١) التوبة ﴾.

## لە بەرهەمەکانی بەلاو مەینەتی

نواندنی بەندایەتی یە بە سای دەرهێنانی گەنجینەی نزاو پاڕانەوە، یەکێ لە پیاوچاکان دەڵێ: پاكو بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی بەهۆی دەردو بەلا نزاو پاڕانەوە بەرهەم دێنێ.

ئەم وتەیەش دەگێڕنەوە کە: خوای گەورە بەندەیەك لە بەندە چاکەکانی تاقی دەکاتەوەو، بە فریشتەکانی دەفەرموێ: بۆ ئەوە تاقیم کردۆتەوە دەنگی ببیسم. بپاڕێتەوەو نزا بکا. بەرهەمێکی تر: شۆڕکردنی جڵەوی هەواو ئارەزوی سەر کەشە، چونکێ خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ... نەخێر، دیارە مرۆ سەر بزێوی دەکا. ﴿٧﴾ العلق ﴾.

قازانجێکی تر: جولانی سۆزو خۆشەویستی خەڵکانو و نزاو پاڕانەوەیانە بۆ کەسی دەردەدارو بەلابار، بێ سۆ خەڵکان هەستو سۆزیان بۆ مەردمی بەرەبەلا دەجولێو هاریکاریشی دەکەن.

سودێکی تر: بەلای گەورەتری پێ گەڕاوەتەوە، بێ گومان ئەو ڕوداوە بە گوێرەی کارەساتی گەورەتر زۆر گچکەیە، سەرەڕای ئەوەی مایەی هەڵوەرینی گوناهو تاوانەو، مسۆگەرکردنی پاداشتو خەلاتی خوای دلۆڤانە.

جا ئەگەر بەندە دڵنیا بێ ئەوە بەروبومی دەردو بەلایە، دان بە خۆی دائەگرێو هەراسان نابێ، بێ ئومێدی ڕوی تێناکاو هەڵناچێ ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ... ئەو کەسانەی خۆڕاگرن، بە تەواویو بەبێ حیساب پاداشی خۆیان وەردەگرن. ﴿١٠﴾ الزمر ﴾ .

## زانست ڕێنمایی و چارەسەرە

(ئیبن حەزم) لە کتێبی (مداواة النفوس)دا باس دەکا، کە یەکێ لە سودەکانی زانست: قەڵاچۆکردنی دڵە خورپێو نیگەرانیەو، بنەبڕکردنی خەمو پەژارەو کلۆڵیە.

ئەوە وتەیەکی ڕاستو ڕەوایە، بە تایبەت دەربارەی ئەو کەسەی زانستی خۆش دەوێو لێی دەکۆڵێتەوەو ئۆقرەی پێ وەدەگرێ، کاری پێ دەکاو لێی سودمەندو بەهرەمەند دەبێ.

جا پێویستە لەسەر فێرخوازی زانستی کاتو ساتەکانی دابەش کا، ماوەیەك بۆ دەرخ کردنو پێداچونەوەو دوبارە کردنەوە، چەند ساتێك بۆ خوێندنەوەی گشتی، چەد کاتێك بۆ داهێنانو دەرخستن، ماوەیەك بۆ کۆکردنەوەو ڕێك خستن، ساتێك بۆ وردبونەوەو تێفکرین.

## ئومێد وایە سەرەنجام خێرو خۆشی بێ

(سیوتی) کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی (الارَج في الفَرَج) تیایدا چەند وتەیەکی زانایان باس دەکا، پوختەکەی ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ڕەنجو جەورو چەرمەسەری دەبێتە مایەی گەلێ خۆش بەختیو بەختەوەری، بەڵاو مەینەتیش قازانجی وا سەرسوڕمێنو ناوازەی لێ دەکەوێتەوە، بەندە دەرکی پێ ناکا هەتاکو ئەو بەڵاو مەینەتیە نەڕەوێتەوە.

## بەختەوەری بەهرەیەکی خواییە

بە سەیرو سەمەرەی مەزانە گەردەبینی کەسانێ هەن لەسەر شۆستە پاڵدەکەون، لەبەرئەوەی کرێکارن، بەری ڕەنجی ڕۆژانەیان دەبێتە بژێوی ژیانیان، لەگەڵ ئەوەش لەگەڵ ژیاندا پێ دەکەنن، سینەو ناخیان ئاوەدانەو، بەهێزو توانادارن، دڵیشیان

حەساوەیەو کامەرانن، تەنیاو تەنیا سەبارەت بەوەیە ژن هەر ئەو ڕۆژەیان بەڕۆژی ژیان دەزانن، بە یادی ڕابردو سەرقاڵ نینەو بۆ داهاتوش دور ناڕوانن، بەڵکە ماوەی ژیانو تەمەنیان سەبارەت بە کردو کۆشیان ڕازاوەو درەخشانن[٦٥٤].

بەراوردێ بکە لە نێوانی ئەوانەو کەسانێ لە کۆشكو باڵەخانەی ڕازاوەدا کشاون[٦٥٥]، وەلێ ئەوان لەناو کات بەتاڵیو ترسو لەرزو نیگەرانیدا پەشۆکاون، سەبارەت بە خەمو پەژارە بیرو هۆشیان پرشو بڵاوەو هەمو ڕێیان لێ گیراون.

## خەڵك بە چاکە لێت بدوێ تەمەن درێژییە

مایەی بەختەوەری بەندەی موسڵمان ە، کە تەمەنی دوەمی هەبێ، ئەویشیان بە چاکە باسکردنە، ئەوانە جێگای سەرسوڕمانن، باسی بە چاکە بە بێبایەخ دەزانن، ماڵو سامانو پلەوپایەو هەوڵوگەڕیان لە پێناوی دەستەبەرکردنیدا تەرخان ناکەن.

لەمەوبەر ئەو واتاو مەبەستە ڕابرا کە (ئیبراهیم) پێغەمبەر ﷺ داوای لە پەروەردگاری کرد زمانی ڕاستی لە ناو خەڵکدا پێ ببەخشێ، ئەویشیان: بە چاکە لێدوانو، نزا بۆ کردنە.

بە کەسانێکیش سەرسامم کە سەبارەت بە کردەی جوانیان، دڵکراوەییو ماڵ بەخشینیان، سوپاسو پێزانێنیکی بێ وێنەیان بۆ خۆیان تۆمار کرد، هەتاکو جارێکیان (عومەر) پرسیار لە کوڕەکانی (هەریم)ی کوڕی (سنان) دەکا: (زوهێر) چی بە ئێوە داو، ئێوەش چیتان بە ئەو بەخشی؟

ئەوانیش گوتیان: ئەو بە شانو باڵی ئێمەیدا هەڵگوتو، ئێمەش ماڵمان بە ئەو بەخشی. (عومەر) گوتی: سوێند بە خوا ئەوەی ئێوە بە ئەوتان بەخشی ڕۆیی، ئەوەی ئەویش بە ئێوەی دابو مایەوە. ئەو سوپاسو پیاهەڵدانە ببڕای ببڕ[٦٥٦] بۆ ئەوان مایەوە.

---

٦٥٤) درەوشاوەن/ تروسکەدارن.

٦٥٥) پاڵیان داوەتەوە.

٦٥٦) تا هەتایە.

## سەرچاوەی لاواندنەوەو شیوەنەکان

لێرەدا سێ پارچە هۆنراوە هەن، تا هەتایە ناوی ئەوانیان بەرز ڕاگرتوە کە دەربارەیان گوتراوە: یەکێ لەوان کوڕی (بەقییە)ی وەزیری ناودار، کە "عەزود دەولە" کوشتی، (ئەبو حەسەن ئەنباری) بە پارچە هۆنراوە سەرنج ڕاکێش و ناوازەکەی، پێی دا هەڵدەڵێ، کە هەڵس‌وکەوت‌و جوامێری‌و بەخشندەیی‌و شان‌و شکۆی لە چەند دێڕە شیعرێکدا دەلاوێنێتەوە. دەستەواژەو دەربڕینی چەند جوانن، کۆپلە هۆنراوەی چەند ڕازاوەن، وتەی چەند پڕ واتاو چەندە نمونەی بەرچاون. ئای ئەو تاج‌و دروشمانە چەندە جێگای سەرنجدان‌و تێڕامانن!!

کاتێ (عەزود دەولە)ی بکوژ گوێ بیستی ئەو چەند دێرە شیعرە بو، فرمێسکی لە چاو هاتە خوارو گوتی: سوێند بە خوا پێم خۆشبو من بکوژرامایەو هەڵواسرا بام‌و، ئەو چەند دێرە شیعرەش بە مندا هەلگوترابایە.

(موحەممەد)ی کوڕی (حەمید)ی (توسی) لە ڕێگای خوادا دەکوژرێ، (ئەبو تەمام)یش لە چەند درێژە شیعرێکدا پەرۆشی دەردەبڕێ‌و پێیدا هەڵدەڵێ‌و بە مردنی ئەو ئاسۆی ئومێدی لێ تاریك دەبێ.

تا کۆتایی هۆنراوە بە چێژەکەی، (موعتەسیم) گوێی لەو پارچە هۆنراوەیە بو، گوتی: ئەو کەسەی ئەو هۆنراوەیەی پێدا هەڵبگوترێ ناوو دەنگی هەر دەمێنێ.

کەسێکی خانەدان‌و ڕەسەنیشم بینی، کە لە وەچەو نەژادی سەرکردەی ناودار (قوتەیبەی) کوڕی (موسلیم) بو، ئەو چاوتێرو دڵفراوانە سامان‌و پلەو پایەی بەخشی، دڵنەوایی بێ نەوایان بو، بەشداری خەمی کۆست کەوتوان بو، بۆ نەداران دەستبلاو بو، نانەری برسیان بو، پاڵپشتی لێقەوماوان بو، لەو کاتەی کۆچی دوایی کرد شاعیرێك زۆر بە سۆزەوە دەیلاوێنێتەوەو خەفەت‌و دڵپەستی دەردەبڕێ بە نەمانی پێی وایە ژیان لەدوای ئەو تەنگ‌و تارە هەروەکو بڵێی کەساێی لە پێش ئەودا نەمردبێ.

فەرمو ئەوە (ئەبو نەواس) کە دیرۆکی[٦٥٧] (خوسەیب)ی فەرمانڕەوای میسر دەنوسێتەوەو، ناوی لە ڕوپەڕی ڕۆژگاردا تۆمار دەکاو لە چەند دێڕە شیعرێك بە جوامێری‌و پیاوەتیدا هەڵدەڵێ.

دوای ئەوە خەڵکانیش سەبارەت بە (خوسەیب)و ڕۆژانی ژیانی هەر ئەو چەند دێرە شیعرە باس لێوە دەکەن.

## سەرنجێك

((پەروەردگارا ئەوەندە ترس‌و بیمی خۆتمان بخەیتە دڵەوە ببێتە بەربەستی نێوانی ئێمەو یاخی بون لە تۆ، ئەوەندە گوێ ڕایەڵی کردنی خۆتمان پێ ببەخشی بە بەهەشتی تۆمان بگەیەنێ، ئەوەندە دڵنیاو ڕاگیرمان کەی بەڵاو مەینەتی دنیامان لە سەر سوك بێ، تا گیانمان لەبەردایە لە بەهرەی بیستن‌و بینایی‌و وزەو تینمان بێبەش نەکەی، کارو فەرمانمان هەر لەدەست خۆمان بێ‌و، تۆڵەمان بۆ لە ستەمکاران بسێنی، بەسەر نەیارانماندا سەربێخی، بەڵاو تاقی کردنەوەمان ئایینمان نەگرێتەوە، وامان لێ نەکەی گەورەترین هیواو ئاواتمان دنیا بێ‌و، ئەوپەڕی سنوری تێ گەیشتنمان بێ، بە سای تاوان‌و گوناهیشمان کەسێکمان بەسەردا زاڵ نەکەی سۆزی بەرامبەرمان نەجوڵێ)).

## خوایەکی ئەوەندە میهرەبانە ستەم‌و زۆری لە کەس ناکا

کاتێ دڵنیا بوی پەروەردیارێ لە ئاسمانە دادوەرو میهرەبانە، سەبارەت بە چاکە نواندن لەگەڵ سەگێك دا ژنێکی خستە بەهەشت‌و، بە سای ستەمکاری دەرحەق پشیلەیێ ژنێکی خستە دۆزەخ، جێگای خۆیەتی دڵت شادو گوشاد بێ‌و، بەو بەڵێنەی خوا پێی داوی هەست‌و نەستت ئاسودە بێ.

---

٦٥٧) مێژوی.

بڕوانە خوای گەورە چۆن سۆزی بۆ ژنێکی داوێن پیسی (بەنی ئیسرائیل)ی دەنوێنێ، بە بۆنەی ئەوەی لە پێناوی خوادا سەگێکی تێنو تێراو دەکا.

لە لایەکی ترەوە خوای گەورە ژنێك ئەخاتە دۆزەخ، بەهۆی ئەوەی پشیلەیێ لە ژورێکدا کۆتبەند دەکا، نە نانو ئاوی پێ دەدا، نە ڕێگاشی بۆ چۆڵ دەکا بۆ خۆی بە زەوی دابگەڕێو خۆراکێ بۆ خۆی بخوا.

ئەو دادوەریە کەڵكو سودت پێ دەگەیەنێو سینەو ناخت فێنك دەکا، بەوە دڵنیات دەکا: خوای بەرزو بێ هاوتا پاداشتی لەسەر کەمیش دەداتەوەو، کردەوەی بچوکیش لە یاد ناکاو، لەسەر وردترین چاکەش بەندەی خۆی خەڵات دەکا.

(بوخار)یش ئەو فەرمودەیە دەگێڕێتەوە: ((**اربعون خصلة، اعلاها منيحة العنز، ما من عاملٍ يعمل بخصلة منها رجا و موعودها و تصديق ثوابها، الا ادخله الله الجنّة** ... چل ڕەوشت هەیە، بەرزترینیان بەخشینی بزنێکە، هەر بەندەیێ یەکێ لەوانە ئەنجامداو ئومێدی بەو بەڵێنە هەبێ کە پێی دراوەو، لە پاداشتی خوا دڵنیا بێ، بێ سێ خوای گەورە دەیخاتە بەهەشت، ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ... سا هەر کەسێ بە سەنگایی مێرولەی هەرە وردیلە، چاکەی هەبوبێ، دەیبینێ. ۝٨ الزلزلة﴾.

هەر کەسێکیش بو قورسایی مێرولەی هەرە وردیلە، خراپەی بوبێ، دەیبینێ.

﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ... بێ گومانە چاکەکان خراپەکان لەبەین دەبەن. ۝١١٤ هود﴾.

خەمی خەمناکێ بڕەوێنە، بەشی بێ بەشێ بدە، ستەم لێکراوێ سەربخە، برسیو بێ نانێ نان بدە، تێنوێتی گەرو وشکێ بشکێنە، بەشداری مەراسیمی ناشتنی مردوێ بە، دەردەدارێ دڵخۆشکەو، بەڵا بارێ دڵنەوا کە، دەستی نابینایێ بکێشەو، سەرشێواوێ ڕاستەڕێ بکە، ڕێز لە مێوانێ بگرەو، چاکە لەگەڵ دراوسێدا بکە، ڕێز لە گەورەیێ بگرەو سۆز بۆ گچکەیێ بنوێنە، خواردنو خۆراکت ببەخشەو، بە پارەو پول چاکەی بکە، وتەو پەیڤت پاڵاوتە کەو، چی تر ئازاری کەس مەدەو، پاداشتو خەڵاتیشت لە خوای خۆت چاوەڕێ کە.

بە ڕاستی ئەو ویستو مەبەستە بەرزو جوانە، گەورەترین ڕەوێنەری دەردەو ئازارو خەمو پەژارەن، مایەی ئاسودەییو دڵێکی حەساوەن.

هەر لە پێناوی خوایە کە خوونەریتی بەرزو چاکەت لەگەڵدا دەنوێنێ، گەر بهاتایە ڕەوشت جوانی مرۆڤ بوایە ئەوا کەسێکی ڕوخۆشو بۆن خۆشو جوان پۆش دەبو، خەڵکیش بە چاکە لێی ئەدوا.

## بە دەستی خۆت مێژووی خۆت بنوسە

جارێکیان لەناو (حەرەم)دا کاتژمێرێك بەر لە نوێژی نیوەڕۆ لەوپەڕی گەرماییدا دانیشتبوم، پیاوێکی بەساڵدا چو هەستایەوەو، ئاوی ساردی بەناو خەڵکیدا دەگێڕا، پەرداخێك لە دەستی ڕاستیو، پەرداخێك لە دەستی چەپەی دا بو، بەم شێوەیە ئاوی زەمزەمی دەگێڕا، کاتێ لە دەستیدا دەبڕا دوبارەی دەکردەوەو بەڕێزە پێی دادەهاتو ئارەقەی لێ دەتکا، خەڵکانیش دانیشتبونو چاوەڕێیان دەکرد بە دەستی ئەو پیرە پیاوە سەرەی ئاو خواردنیان بە بەرکەوێ، هەتا کۆمەڵێکی زۆر بە دەستی ئەو ئاویان خواردەوە، منیش سەرسامی دایگرتم کە ئەو بە ساڵداچوە بە ڕوێکی گەشەوە بە گورجو گۆڵی دەبەخشێو ئەوەندە بە ئارامو چاکەخوازە، تێگەیشتم کە خوا دەرفەت بە یەکێ بدا چاکەو پیاوەتی لەدەست دێ، ئەگەر خوای گەورە ئاسانکاری بۆ کەسێ بڕەخسێنێ، ئەویش کردەوەی جوان دەنوێنێ، ئەوەش حاڵی بوم کە خودا چاوگی بەهرەکانی لەبەردەستداو، ئەو بەندانەی خۆی لێ بەهرەمەند دەکا، کە خۆی حەزبکا، چاکەو چاکەکاری ئەگەرچی کەمیش بێ خوا دەیکاتە بەشی کەسانێ چاکەخوازنو، خێرو خۆشیان بۆ مرۆڤایەتی دەوێ، حەز بە زیانباری کەسیش ناکەن.

(ئەبوبەکر) لە پێناوی پاراستنی پێغەمبەردا ﷺ گیانی خۆی خستە مەترسی.

(حاتەم) لە پێناوی تێر بونی مێوانەکانی، بە برسێتی دەخەوت.

(ئەبو عوبەیدە) لە پێناوی حەسانەوەی لەشکری موسڵمانان، شەونخونی دەکرد.

لەوکاتەی خەڵك لە خەودا بو (عومەر) بۆ زانینی باری موسڵمانان بە ناو شاردا دەخولایەوە. لە ساڵی گرانیدا، بۆ ئەوەی خەڵك تێربێ ئەو لە برسان پشتی چەمایەوە.

(ئەبو تەلحە) بۆ بەرگری لە پێغەمبەری خوا خۆی کردە مەتاڵی تیران.

(ئیبن موبارەك) خواردنی بە خەڵك ئەداو کەچی خۆی بە ڕۆژو بو.

﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ... لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، بە هەژارو بە هەتیوو بە دیل گیراوی دەبەخشن. ﴿٨﴾ الإنسان ﴾.

## گـوێ بۆ وتـــەی خـوا هـەڵخـــە

بە سای گوێ هەڵخستن[٦٥٨] لە خوێندنی کتێبی خوا، بە دەنگی قورئان خوێنێکی دەنگ زوڵاڵ، شارەزاو زمان پاراو، خوێندنێکی بە جۆش‌و خرۆش‌و سەرنج ڕاکێش، هەست‌و نەستت بسرەوێنە، ئەوسا ڕەزامەندی خوای بەرزو بێ هاوتا وەدەست دێنیو، ئارامی بۆ ناو سینەت هەڵدەرژێنیو، هێمن‌و هەداری، فێنکاییو دڵنیایی بەسەر دڵتا دەبارێنی.

ئەگەر چی قورئان بەسەر پێغەمبەری خوادا دابەزی بو ﷺ بەڵام حەزی دەکرد کەسێکی تر بۆی بخوێنێ‌و ئەویش گوێی بۆ بگرێ، بۆیە داوای لە هاوەڵانی دەکرد بۆی بخوێننەوە، جا ئەگەر لە غەیری خۆی ببیستایە کاری تێ دەکردو، دڵی ئۆقرەی پێ دەگرت‌و، ترسی خوای لە دڵ دەنیشت‌و، دەحەساوەو دەسرەوت.

تۆش دەتوانی ئەو بە پێشەنگی خۆت بزانی، چەند خۆلەکێ، یا لە شەوو ڕۆژدا چەند ساتێ بەو مەبەستە تەرخان کەی، بە ئامێری تۆمار کردن، یا ڕادیۆ گوێ بۆ دەنگی ئەم قورئان خوێنە بگری کە حەز بە دەنگی ئەکەی‌و ئەویش وتەی خوای تاك‌و و پاکت بە گوێچکەدا بچرپێنێ.

---

٦٥٨) گوێ گرتن.

بێگومـان قاوقیـژی [٦٥٩] ئـەم دنیایـەو هـایوهوی [٦٦٠] خـەڵکان بەڵێنیـدەرن بـەوەی سەرت لـێ بشێوێنن، هێزو وزەت داڕوخێنن، زەینو هۆشت بپرشێنن [٦٦١].

تەنیا یادی پەروەردیارو کتێبی پەروەرێنت دڵارامیو هێمنیو هەداریت بـۆ دێـنن: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ... ئـــــەو کەسانەی کە باوەڕیان بە خوا هەیەو بە یادی خوا دڵیان ئارام دەبێتەوە، بـاش بـزانن کە یادی خوا ئۆقرەو ئارامی دڵانە.﴿٢٨﴾ الرعد ﴾.

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمانی بـە (ئـیبن مەسـعود) کـرد هەنـدێ لـە سـوڕەتی (النساء)ی بەسەردا بخوێنێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ گریـا هـەتاوەکو ئەسـرین بەسـەر کوڵمیدا هاتە خوارێو، فەرموی: ((**حسبك الان**... ئەوەندە بەسە)).

جارێکی تر بە لای (ابو موسا)ی ئەشعەریدا تێدەپەڕێ، کـە لـەناو مزگـەوتا گـوێی بۆ گرتو، لە بەیانیدا پێی گـوت: ((**لو رأيتني البارحة وانا اسـتمع لقراءتـك**... ئەگـەر دوێنێ منت بینیبا کە چۆن گوێم بۆ قورئان خوێندنەکەت گرتبو، (ابو موسا) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر دەمزانی تۆ گوێم لـێ دەگری، زۆر بە دەنگێکی خۆشەوە بۆم دەخوێندی)).

(ئەبو حاتەم) ئەو فەرمودەی گێڕاوەتەوە کـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەلای مـاڵی پیرەژنێدا تێدەپەڕێو لەبەر دەرگاوە گوێی لە قورئان خوێندنی ئەو پیرەژنـە دەگـرێ کـە ئـەو ئایەتـە دەخوێنـێو دوبـارەی دەکاتـەوە: ﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ... ئـاخۆ باسی بەڵای گەورەت بۆ هاتوە. ﴿١﴾ الغاشية ﴾.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرموێ: ((**نعم اتاني، نعـم اتـاني**... بـەڵێ پـێم گەیـشـت، بەڵێ پێم گەیشت.

بێگومـان گـوێ بـۆ شـلکردن تـامو چـێژی لـێ وەردەگـیرێو، گـوێ بـۆ هەڵخـستن درەوشانەوەی لـێ وەدی دەکرێ.

---

٦٥٩) هێژە هێژ/هاوار کردن.

٦٦٠) هاتو هاوار.

٦٦١) پرشوبڵاوی بکەن.

نوسەرێکی ناوداری موسڵمان گەشتێك بەرەو ئەوروپا دەکاتو سواری کەشتی دەبێ، ژنێکی یۆگسلافی شوعیش کە لەژێر نیری زوڵمو ستەمی "تیتۆ" ڕایکردبو لەگەڵی سوار دەبێ، ئەو نوسەرە لەگەڵ یاوەرانی خۆیدا نوێژی هەینی یان بەسەردا دێ، ئەویش هەڵدەستێتەوەو وتاری هەینی دەخوێنێتەوەو پێش نوێژیان بۆ دەکاو سورەتی (الاعلی)و سورەتی (الغاشیة) لە ناو نوێژەکەدا دەخوێنێ، ژنەکە زمانی عەرەبی حاڵی نابێ، بەڵام گوێ قوڵاخی [٦٦٢] ئەم ئاوازو چریکەو گوفتارە دەبێ، دوای تەواوبونی نوێژ ژنە دەربارەی ئەو ئایەتانە لە نوسەر دەپرسێ؟ ئەویش هەواڵی پێ ئەدا کە ئەمە وتەی خوای بەرزو دەستەباڵایە، ژنە سەرسامو واقو ڕماو دەمێنێ، نوسەرەکە دەڵێ: لەبەرئەوەی زمانی ئەوم نەئەزانی نەمتوانی بەرەو ئیسلام ڕێنوێنی کەم: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ... بێژە: ئەگەر مرۆو جن، گشت کۆوەبن وێنەی ئەم قورئانە بێنن، لە ڕەنگی ئەودا دادەمێنن، با هەموشیان پشتیوانی یەکتری بن. ﴿٨٨﴾ الإسراء ﴾.

بێگومان قورئان دەست بەسەر دڵەکاندا دەگرێ، گیانو ڕۆحەکان بە سای قورئان سامو هەیبەتیان لێ دەنیشێو، بەهێزوتینی کارای [٦٦٣] دڵو دەرون پێی کاریگەر دەبێ.

بە کەسانێکی جوانمەردی پێشینان سەرسامم، بە وانەش سەرسوڕماوم بە چاکە ویستی سەریان نایەوە، کە لە بەردەم تەوژمی ئاوازو چریکەی ڕاست گۆیانەی ئەم قورئانە خۆیان ڕانەدەگرتو پێی دەهەژان: ﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَـٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ... ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان ناربایەتە سەر کەژێك، تۆ دەتدی کە داهاتوەو لە ترسی خوا لەت لەت بوە. ﴿٢١﴾ الحشر ﴾.

یەکێ لەوان (عەلی) کوڕی (فوزەیل)ی کوڕی عەیاز) بو کاتێ گوێ بیستی باوکی بو کە ئەو ئایەتەی دەخوێند یەکسەر گیانی سپارد: ﴿ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾

---

٦٦٢) گوێی بۆ دەگرێ.

٦٦٣) کاریگەری/ بەکاری.

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ... ڕاشیان بگرن دەبێ پرسیاریان لێ بکرێ. چیتانە، بۆچی دە هانای یەکتر نایەن؟! ﴿٢٥﴾ الصافات﴾.

(عومەر) ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ بەهۆی بیستنی ئایەتێك یەك مانگ لەسەر جێگا نەخۆش کەوتو لە پەلوپۆ بو، وەکو کەسێکی نەخۆش دەهاتن بۆ دیدەنی، هەروەکو ئیبن کەسیر ئەمە دەگێڕێتەوە.

﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ... ئەگەر قورئانێ واش هەبا کەژی لەجێ لابردبان، یان زەوی پێ لەت کرابا، یان مردوی وەقسە هێنابان، ﴿هێشتاش باوەڕیان نەدێنا﴾. ﴿٣١﴾ الرعد﴾.

هەروەها (زەهەبی) دەگێڕێتەوە کە (عبدالله)ی کوڕی (وەهەب) لە ڕۆژی هەینیدا بە ڕێگادا دەڕۆیشت گوێی لە گەنجێك بو ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ ... کە ئەوسا لە ناو ئاگردا کێشە دەگەڵ یەکتر دەکەن. ﴿٤٧﴾ غافر﴾.

یەك سەر بێهۆش کەوتو، بەرەو ماڵ بردیانەوە، سێ ڕۆژان بە نەخۆشی مایەوەو، لە ڕۆژی چوارەم دا گیانیدا.

یەکێ لە زانایانیش بۆی گێڕامەوە کە لە مەدینەدا نوێژی دەکردو یەکێ لە قورئان خوێنان سورەتی (واقعة) دەخوێنێ، گوتی: بێ دەستی خۆم، ترس و لەرزێکی وەهام ڕێ نیشت لە جێگای خۆمەوە دەلەرزیم و دەهەژام، لەگەڵ ئەوەی گریانم بەسەردا هات و ئاو لە چاوم هەڵڕژا.

﴿ ... فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ... دەیسا لە پاش ئەم قورئانە بە کام قسە بڕوا دەکەن؟ ﴿١٨٥﴾ الأعراف﴾.

بەڵام ئەو جێ باسەمان چ پەیوەندیەکی بەلایەنی بەختەوەریەوە هەیە؟!.

بێگومان ئەو شڵەژان و ئاڵۆزیەی مرۆڤ لە بیست و چوار کاتژمێردا دەیگوزەرێنێ، بەڵێنی دەرن بەوەی بیر و هۆشی بشێوێنێ و، دوچاری نیگەرانی بێ و دایبڕمێنێ، جا ئەگەر بەرەو ماڵ گەڕایەوە، گوێ بیست و گوێ لە مستی وتەی پەروەردیاری بێ و تێی

بفکـرێ، لـە قورئـان خـوێنێکی دڵپـاکی دەنـگ زوڵاڵ گـوێ بگـرێ، زەیـن‌و هۆشـی دەگەڕێتەوە، هەست‌و نەستی وسەرخۆ دێتەوەو، هێورە دەبێ‌و دەحەسێتەوە.

من بە سای ئەو وتەیەم لە مەترسی ئەو کەسانە ئاگادارت دەکەمـەوە، کـە مۆسـیقا بە هۆکاری دڵارامـی‌و بەختـەوەری‌و ئاسـودەییان دادەنـێن، چەند کتێبێکیـشیان لـەو بارەوە نوسیوە، زۆر بەشیان بەوە خۆ هەڵدەکێشن کە خۆشـترین‌و ڕازاوەتـرین کـات‌و سـاتی تەمـەنیان ئـەو کاتەیـە گـوێ بـۆ موسـیقا دەگـرن، بەڵکـە نوسـەرانی ڕۆژئـاوا ئەوانەی لە مەڕ ڕەواندنەوەی نیگەرانی‌و دەستـەبەر، کردنـی کامـەرانی نوسـیوێتیان، مۆسیقا بە یەکێ لە هۆکاری بەختەوەری دەزانـن. ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ... نوێـژیان لـە مـاڵی خـودادا هـەر بریتـی لـە چەپڵەو فیتـو کێشانە. (٣٥) الأنفال ﴾.

﴿ ... سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ... لـە شەونـشینی خۆتانـدا، هاتـەران پاتـەرانتان بـو [٦٦٤]. (٦٧) المؤمنون ﴾.

لە ڕاستیدا مۆسیقا جێگرەوەیەکی خراپەو، گوێ بۆ گرتنی تاوانـە، لەگـەڵ ئـەوەی ئێمە پیت‌و فەرێکی وامان لە لایە کە بەسەر پێغەمبەری خـوادا ﷺ هەڵڕژاوە، ئـەو ڕاستی‌و دروستیەو ئاراستە بەجێ‌و لە جێیەمان لە دەستە، کە کتـێبی خـوای بـەرزو توانـا لـە خـۆی گرتـوە: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ... پڕوپوچ لە ڕوی ناوەستێ - چ ڕوبەڕو، چ پاشـملە - ئەمـە کارزانێـك ناردویـە کە هەر دەبێ پەسنی بدرێ [٦٦٥]. (٤٢) فصلت ﴾.

ئەوسا گوێ هەڵخستنمان بۆ قورئان گوێ گرتنێکە بـە گـوێرەی بـاوەڕداری‌و یاسـاو ڕێسای خواو سوننەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕاسـت‌و لەجێیـە ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ

---

[٦٦٤] قسەی بێماناو هیچ‌و پوچ.

[٦٦٥] پێیدا هەڵبوترێ.

إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّۖ ... دەیانبینی ئەسرین لە چاویان دەوەریٚو چونکە لە ڕاستیەکە دەگەن. ﴿٨٣﴾ المائدة ﴾.

گوێگرتنی ئەوانیش لە دەنگی مۆسیقا گوێگرتنێکی لەبیر بەرەوەو خەڵەفێنەرە، تەنیا کەسانێکی بێ ئامانجو چەپەڵکارو، سەرەڕۆ [٦٦٦] بە کاری خۆیانی دەزانن ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ... لەم خەڵکەدا ئی وا هەیە کڕیاری قسەی بێتامەو، لە نەزانی دەیەوێ خەڵك لە ڕێگەی خوا لابدا. ﴿٦﴾ لقمان ﴾.

## هەموویان بە دوای بەختەوەریدا دەگەڕێن بەڵام

زانای (ئیسکافی) کتێبێکی بە ناونیشانی (لطف التدبیر) نوسیوە، کتێبێکی زۆر پڕ واتاو، سودبەخشو، دلگیرو سەرنج ڕاکێشە، تیایدا باس لە بەدوادا گەڕانی سەربڵندیو بەختەوەریو وەدەی هێنانی خواستەکان دەکا.

هەست دەکەی زۆرێك لە کاربەدەستو دەسەڵاتداران، وێژەرانو هۆنەران، هەندێکیش لە زانایان، چەندین فێڵو تەڵەکەو، پێچو پەناو، ڕێگە چارەیان گرتۆتە بەر، هەموویان ئاسودەییو بەختەوەریو، دەستەبەرکردنی خواستەکەنیان گەرك بوە، هەتاوەکو ئەوە هەندێکن لە جێ باسی ئەو کتێبە:

لە نەرمو نیانی ڕێکخستندا، لە بێهۆشکردنی ئاژاوەدا، چاکردنەوەی لاساریێ، یاخود ئاشتەوایی کردن، چارەی کەسێکی ڕوخاو چیە، لە فێڵو تەڵەکەی ناحەزان، خەڵەفاندنی گچکەیێ بۆ گەورەیێ، وەلانانی ناخۆشێێك بە قسەیێ، لەمەڕ لابردنی ناخۆشی بە ناخۆشی، لە نەرمو نیانی ڕێکخستن دەربارەی ناخۆشی لابردن، لە هەڵسوکەوتی دەسەڵاتداریێ، لەمەڕ تۆڵەسەندنەوە لە زەوت کاری موڵکێ، دەربارەی ڕزگاربون لە بەڵایێ، دەربارەی کوشتنو خۆ لێپاراستنی، دەربارەی دەرخستنی کارێك لە پێناو شاردنەوەی کاری تردا، تا کۆتایی ئەو جێ باسانە.

---

٦٦٦) بێ ئاگام.

سەیر دەکەم هەمویان بـەدوای بەختـەوەریو دڵارامیـدا گـەڕاون، وەلـێ کـەمێکیان ئەو ڕێگایەیان دۆزیوەتەوە کە پێی بەختـەوەر بـن، سـێ سـودو کەڵکیشم لـەو کتێبـە وەدەست هێناون:

یەکەم: هەر کەسێ هەمیشە خوا ویستی لەبەرچاو نەگرێ، بەرهـەمو قـازانجی بـەرەو زیانباری وەردەچەرخێ، خێرو خۆشی بـەرەو پـەژارەو خاکە ساری وەردەگـەڕێ ﴿... سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ الأعـراف﴾... وردە وردە - بێئـەوەی بە خۆ بزانن- بەرەو تێداچونیان دەبەین.﴿١٨٢﴾ الأعراف﴾.

دووەم: ئەو ڕێگـە چارە سەختو دژوارەی زۆربەی خەڵکان لە پێناوی وەدەست هێنانی بەختەوەریدا بە دەر لەم شەریعەتە دەیگرنەبەر، بە شێوازێکی ساناترو نزیکتـر لە پەیامی پەیامبەرایەتیدا وەدەستی دێـنن، ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ... کەچی ئەگـەر وەکو نەسیحەتیان دەکـرا کردبایـان، بـۆ ئەوان چاکی دەهێناو باوەڕیشیان پتەوتر دەبو. ﴿٦٦﴾ النساء﴾.

جا خێرو خۆشی دنیاو دوا ڕۆژ وەدەست دێنن.

سـێیەم: خەڵکانێك هەن، دنیاو دوارۆژیان لە دەستداوە، گومانیـشیان وایـە کـارێکی باشیان ئـەنجام داوە بەختـەوەریان وەدەسـت هێنـاوە، کەچـی ئەویـشـیان چـو ئەمیشـیان چو، هۆکارەکەشـی بۆ ئەوە دەگەڕێتـەوە لەو ڕاسـتە ڕێگـایەی خـوا پێغەمبەرانی پێدا ڕەوانـە کـردوەو کتێبەکـانی پێـدا ناردوە ئـەوان پـشـتیان تێ کردوە، کەچی هەر ئـەو ڕێگای بـە دوادا گـەڕانی ڕاستیەو، هەڵە لـە بڕیاری دانیـــــە، ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ... قـــــسەکانی پەروەرندەت -لە بێ لایەنگریو ڕاستیدا- تەواوو بێ کەمو کوڕین، کـەس ناتوانـێ بیانگۆڕێ. ﴿١١٥﴾ الأنعام﴾.

وەزیرێـك لـە خۆشـیو نـازو گـۆزدادەی گوزەرانـد، لـە پڕێکـا خـەمێکی نادیـارو، پەژارەیـەکی بـە ئـازار یەخـەی دەگـرێ، ئـەویش هـاواری لـێ هەڵدەسـتێو شـیعرێك دەهۆنێتەوەو تیایدا ژیانی دنیا بەکەم دەنرخێنێو حەز بە ژیانی ناو گۆڕ دەکا.

## هەڵوەســتەیــەك

با موسڵمان لە کاتی حاڵ خۆشیدا: واتـە لـە کـاتی هـەبویی‌و تەندروستی‌و شـێنەییدا، نـزا بکـاو بپاڕێتـەوە، چونکێ یـەکێ لـە خورەوشـتی بـاوەڕداری یـەك بـاوەڕو[٦٦٧] سـوپاس گوزار، ئەوەیە بەر لە هاویشتنی تیر، پەڕی بۆ دروست دەکا، بەرلەوەی ناچار ببێ، هانای وەبەر خوا دەبا، بە پێچەوانەی بێ بـاوەڕی چارەڕەش‌و بـڕواداری بـێ ئاگا ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا ... ئەم مرۆیە کە تەنگانێکی دەگاتێ، ڕوهـەر لـە خـودا دەکـات‌و لەبـەری دەپاڕێتەوە. هەر کاتێکیش لەلایەن خۆی ڕا بەهرەیەکی بە ئەو گەیاند، لە بـیر دەکـا کـە دەپێشدا لەبەری پاڕاوەتەوەو شەریکانێك بۆ خوا دەدۆزێتەوە. ﴿٨﴾ الزمر﴾.

هەرکەسێ خوازیـارە لـە چـەپۆکی تەنگانـەو ژیـن‌و زاری ژیـان ڕزگـاری بـێ، لەسـەری پێویسـتە بـەدڵ‌و گیـان ڕوی لـە خـوای ڕاسـتەقینە بـێ - گـەورەیی‌و پـیرۆزی بـۆ ئـەو — بلاڵێتـەوەو سـوپاس‌و ستایـشی بـۆ بنوێنـێ، چونکێ - هـەروەکو پێشـەوا (حولەیمی) دەڵێ — مەبەسـت لە نزاو پاڕانەوە لە کاتی خۆشیدا، ئەوەیە سـوپاس‌و ستایـشی بکەی‌و دان بـە بەهرەکانیـدا بنێـی، کـار ئاسـانی‌و دەسـت گیرۆیـی‌و یارمـەتی لـێ بخوازی، داوای چاوپۆشی لە کەم‌و کوریەکانت بکەی، بە ڕاستی بەندە - ئەگەر چی هـەوڵیش بـدا - ئـەو ئەرك‌و مافانەی خوا بە سەریەوەن بێ کەم‌و کـوڕی بـەجێیان ناهێنـێ، هـەر کەسـێکیش لەو ساتەی لە هێمن‌و ئارامی دایەو تەندروسـتی تـەواوەو دەرفـەتی لـە دەسـت دایـە ئـەو هەلە بۆ خۆی نەقۆزێتەوە، ئەگینا ئەو فەرمودەیەی خوای گـەورەی بەسـەردا جێبـەجێ دەبــێ کــە دەفــەرموێ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ... هەرگا سواری کەشـتی دەبـن، بـە دڵـی پـاك لـە بـەر خـودا دەپاڕێنـەوە. ئەگـەر خـودا نـەجاتی دان‌و گەیاندنیـە سـەر وشـکانی، دەڵێن: خـودا شەریکی هەن. ﴿٦٥﴾ العنکبوت﴾.

---

٦٦٧) نەگۆڕاو.

## یا بەهەشتە، یا دۆزەخ

ڕۆژنامەکانی جیهانی هەواڵی خۆکوشتنی سەرەك وەزیرانی فەڕەنسا لە دەسەڵاتی سەرۆك (میتران)دا بلاوکردەوە.

هۆکاری خۆ کوشتنی ئەوە بو هەندێك لە ڕۆژنامە نوسانی فەڕەنسی بە ڕەخنەو پەلارو جوێن پێدان هێرشێکیان کردە سەر، ئەو هەژارو نەدارە هیچ باوەڕو ئارامیو داسەپاوی شك نەدەبرد، هیچ پاڵپشتێکی دەرك پێ نەکرد خۆی لە پەنادا وەحەسێنێو هانای وەبەر بێنێ، بۆیە تازو بو خۆی کوشت.

ئەو پیاوە بێدەسەڵاتو بێچارەی پەنای بۆ خۆکوژی هێنا ئاشنای ڕێنمایی خوایی نەبو، کە لە وتەی خوای بێ هاوتادا خۆی دەنوێنێ: ﴿وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ... لەو فێڵو تەڵەکانەش دەیکەن دڵتەنگ مەبە. ﴿١٢٧﴾ النحل﴾.

ئەو فەرمودەیەش: ﴿لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ... ئەوانیش - مەگین هەربەدەم- دەنا هەرگیز ناتوانن بۆتان بەزەڕبن. ﴿١١١﴾ آل عمران﴾.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَاهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ... بۆ ئەو قسانەش کە دەیکەن خۆڕاگر بە، لێشیان لادە بەلا لێدانێکی پەسەند. ﴿١٠﴾ المزمل﴾.

چونکێ کەسی ناوبراو کلیلی ڕێنمایی لە دەست نەبو، ڕێگای ڕاستو ڕەوانیشی لێ ون بو: ﴿مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ ... خوا ڕێ لە هەر کەس بگۆڕێ، هیچ ڕێبەری دەس ناکەوێ. ﴿١٨٦﴾ الأعراف﴾.

ئەوانەی بەدەرن لە ئیسلام ئامۆژگاریان بۆ ئەوانەی کوڵی خەمو پەژارەیان خستۆتە کۆڵ، ئەوەیە فەرمانیان پێ دەکەن لەسەر کەناری ڕوبار ڕابوێرنو، گوێ لە مۆسیقا ڕادێرن، گەمەی تاوڵە بکەنو، لەسەر بەفر خۆ بخشێنن.

بەڵام کەسانێ هەڵگری پەیامی ئیسلامن تەنیا خوای ڕاستەقینە بە شیاوی پەرستن دەزانن ئامۆژگاریان ئەوەیە: لەناو گوڵشەنی خواپەرستی لە نێوانی بانگو

قامەتدا دابنیشن، بە یادی خوای تاقانەوە دەنگیان هەڵبڕن، بۆ بڕیارو قەدەری خوا ملکەچ بن، بە بەشی خوا پێداویان ڕازی بن، پشتیش بە خوای بەرزو توانا ببەستن.

﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ... ئەدی ئێمە تۆمان سینە فراوان نەکرد. (١) الشرح ﴾.

ئەو ئایەتە لەمەڕ پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتە خوارێ، ئەو دەستەواژەیە لە دڵی پێغەمبەردا کاری خۆی کرد، هەستو نەستی بێ گرێ بو، گەشبینو، دڵ گوشاد بو، سینەو ناخی ئاوەدان بو، میهرو سۆزی فراوان بو، لە ژیانیدا کار ئاسان بو، لە ناو دڵەکاندا جێگیر بو، لەگەڵ شکۆداریدا بارسوکی بو، لەگەڵ شانو شەوکەتیدا تێکەڵی ناو خەڵکی بو، لەگەڵ شکۆمەندیدا هەمیشە خەندە لێو بو، لەگەڵ بەرزی پلەیدا لەگەڵ خەڵك تێکەڵاوبو، لەگەڵ شکۆمەندیدا هەمیشە خەندە لێو بو، لەگەڵ پایە بەرزی دا خەڵکانی خۆش دەویستو، لەگەڵ بێگانەو خۆیانەدا ئاسایی بو، هەرچی ڕەوشتی بەرزە لە خۆی گرتبو، ڕەنگو ڕوخساری کراوەو، درەوشاوە بو، زۆر بە شەرمو شکۆ بو، بە وتەی خۆشو دۆستانە ڕوخۆشو بە خەندە بو، لەگەڵ مێوانیدا ڕوگەش بو، بە بەهرەو خەڵاتی خوا دڵ شاد بو، بۆ بەخشینی بەهرەی خوایی دەست کراوە بو، بێ ئومێدی ڕوی تێ نەدەکردو، هەستی بە دارمان نەدەکرد، هەمیشە کۆڵنەدەر بو، هیوادارو، پشو درێژ بو، گەشبینی لا گرنگ بو.

ڕقی لە قوڵ کردنەوەو [٦٦٨] دەم پانکردنەوە بو، ڕقی لە فاقو بریق پێدانی قسەو تۆبزی لەخۆکردن بو، چونکی خاوەنی بەرنامەیەكو هەڵگری پەیامێك بو، پێشەنگو پێشەوای گەلو نەتەوەیەك بو، مامۆستاو فێرکاری میللەتێك بو، پەرومردەکاری خێزانێك بو [٦٦٩]، مەردی کۆمەڵگایەك بو، گەنجینەیەکی پڕ بەها بو، هەڵگری خونەریتی باڵا بو، خۆری درەخشانو، دەریای بەخشش بو.

بە کورتی: بۆ هەمو شتێ ئاسانکار بو، بە پوختی: ئەوە هەڵسوکەوتی بو: ﴿ ... وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ... گرانایی زنجیریان لەسەر لادەبا، کە بە وانیان شەتەك دابون. (١٥٧) الأعراف ﴾.

---

٦٦٨) درێژە پێدانی بێ سود.

٦٦٩) هەمو موسڵمان وەکو یەك خێزانن.

بە واتایەکی تـر ئەوەنـدە بەســە کـە: ﴿رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ... بـوا! بـۆ هەمو خـەڵك بەزەیی بو. (١٠٧) الأنبياء﴾.

﴿شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا (٤٥) وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ... (ئـــــــەی پێغەمبەر! ئێمە بۆیە ناردومانی)، شایەتو مزگێنیو ترسێنەر بی، بە ئیزنی ئەو، خەڵك بۆ خودا پەرستی گاز بکەیو چرایەکی تیشکدەر بی. (٤٦) الأحزاب﴾.

ئـەوەی لەمپـەرو بەربەسـتی ڕێـی پـەیامی سـوكو ئاسـانە: خـۆ پـێ زۆری سـنور بەزێنەکانو، بێ دینی خۆ بە ژیر زانانو، گەوجی بیدعە چیەکانو، خۆ بە زانا زانی لوت بڵندانو، دێوانەیی شاعیرانو، سـەودا سـەری گـۆرانی بێـژانو، فـڕو فیـشاڵی دنیـا پەرستانو، لاساری بـیری کاسەلێـسانە ﴿ ... فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ... ئـیتر خـودا بـە ئیزنـی خـۆی ڕێگەی ڕاستی نیشان باوەڕداران داوتێی گەیاندن ئەو کێشە لەبەرچی کـرا. خـودا بـۆ هەر کەس حەز بکا شارەزای ڕاستەڕێی دەکا. (٢١٣) البقرة﴾.

## واتــای خۆشگــوزەرانــی

یەکێ لە زیرەكو شارەزایانی ئینگلیز دەڵێ: تۆ دەتوانی لە ناو بەندی خانـەدا لـەو دیوی شیشی ئاسنیدا، هەر لە شوێنی خۆتەوە بەرەو ئاسۆ بڕوانی گوڵێك لـە گیرفانـت دەربێنیو، بۆنی بکەیو پێبکەنی، لە دەستیشت دێ ئەگـەر چـی لـەناو کۆشکدا بیـت لەسەر حەریرو ئاوریـشما بخـەویت، بـەڵام تونـدو تیـژو ڕق ئەسـتور بیـت لـە ئاسـتی ماڵو منـاڵو خاوخێزانتدا دەنگ هەڵبـڕیت [٦٧٠].

کەوایە بەختەوەری لە کاتو شـوێندا پـەیدا نـاکرێ، بەڵکـە لـە بـاوەڕو گوێڕایـەڵی خوای تۆڵە سێنو لەناو دڵدا وەدی دەکرێ. دڵـیش شـوێن تەماشـای پـەروەردگارە، جـا ئەگەر دڵنیایی تێدا بـسەپێ، بەختـەوەری لـێ هەڵـدەقوڵێو، خۆشـیو شـادی بەسـەر

---

٦٧٠)بەسەریاندا بقیڕێنی.

گیان‌و ڕۆحدا هەڵدەڕژێ، پاشان بەسەر دەوروبەریشدا دەبارێ، سەر چیاکان‌و ناو دۆڵایی‌و دەشت‌و دەریش دادەگرێ.

(ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) بەرگێکی سپی بە پینەی لەبەر بو کە بە دەستی خۆی دوری بو، لە خانویێکی سێ ژوری قوڕدا دادەنیشت، تەنیا تیکە نانێك‌و هەندێك زەیتی شك دەبرد، هەروەکو ئەوانەی مێژوی ژیانیان نوسیوە لێی دەگێڕنەوە کە حەڤدە ساڵ بو پێڵاوێکی لەپێ بو هەر پینەی دەکردو دەی دوریەوە، لە مانگێ دا یەك جار گۆشتی دەخواردو زۆربەی ڕۆژەکانی تر بە ڕۆژو بو، لە پێناوی بەدوادا گەڕانی فەرمودە دنیاو بنای لێکدا، لەگەڵ ئەوەدا هەستی بە ئاسودەیی‌و کامەرانی‌و هێمنی‌و هەداری دەکردو، بەختەوەرانە ژیانی بەسەر برد، چونکێ خۆڕاگرو سەر بڵند بو، ئامانجی ژیانی خۆی دەزانی، هەوڵ‌و گەڕی لە پێناوی سەرەنجامێ بو، خوازیاری بەخشش‌و خەلاتێ بو، چاوی لە وەدەستهێنانی بەهەشتێ بو.

ئەو خەلیفانەی لەسەردەمی ئەودا حوکم ڕانی دنیایان دەکرد، وەکو: (مەئمون)و (واسیق) (موعتەسیم)و (موتەوەکیل)' خاوەنی چەندین کۆشك‌و باڵەخانەو، زێڕو زیوو، فێڵ‌و تەڵەکەو، دەست‌وپێوەند بون، خێوی چەندین دروشم‌و نیشانەو دیمەن‌و ڕواڵەت‌و، زەوی‌و زاربون، ئەوەی ئارەزویان دەکرد لەبەردەستیان دابو، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەشکەنجەو ئازارەوە دەیانگوزەراندو، تەمەنیان لەناو خەم‌و پەژارەو، نیگەرانیدا، لە ناو شەڕو شۆڕو ئاژاوەو دەردە سەریدا، بە ڕێ دەکرد، هەندێکیان لە سەرەمەرگدا پەشیمانی خۆیان لەسەر زیادە ڕۆیی‌و سەرپێچی لە فەرمانی خوا دەردەبڕی.

(ئیبن تەیمیە)ی شێخی ئیسلام، نە پلەو پایە، نە ماڵ‌و سامان، نە خانوبەرە نە خاوو خێزان لەوانە هیچی نەبو، لە تەنیشت مزگەوتی (بەنی ئومەییە) لە ژورێکدا جێ نشین بو، ڕۆژانە یەك کولێرەی هەبو، دو بەرگی هەبوئەمیانی بە ئەو دەگۆڕی، هەندێ جار لەناو مزگەوتدا دەخەوت، بەڵام هەروەکو باس لە خۆی دەکا: بەهەشتی لە سینەی دابو، کوشتنی شەهیدی بو، بەندیخانەی خەڵوەتگا بو، شاروەدەری گەشت‌و سەیران بو، چونکێ نەمامی باوەڕی لەناو دڵدا ڕوابو، بە فەرمانی خوا لە هەمومرزێکا بەردار بو، بە یارمەتی‌و چاودێری خوا ئاو درابو، ﴿...يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ ...﴾ (تۆ ئێژی ڕونی چراکە - بە بێ

ئاگر تخون کەوتن-) تیشــك دەدا، ڕوناکی لە بان ڕوناکی. خودا هەر کەسێ حەز بکا، ڕوناکی خۆی نیشــان دەدا. ﴿٣٥ النور﴾.

﴿... كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ... خودا هەمو گوناهەکانیانی پۆشیو کاروبـاری ژیانیانی بۆ ســامان دان [٦٧١]. ﴿٢ محمد﴾.

﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ... ئــەو کەســانەش کــە هاتونــە ســەر ڕاستەڕێ، پتر شارەزایان دەکاو ترسی خوایان پتر دەخاتە دڵەوە. ﴿١٧ محمد﴾.

﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ... لــە چــارەیان [٦٧٢] تــەڕو بــەلی [٦٧٣] خۆشــگوزەرانی دەزانی. ﴿٢٤ المطففين﴾.

(ئــەبو زەڕ) خــوا لێــی ڕازی بــێ لــەناو ئــاوەدانی چــوە دەرو، لــە چــولگەدا چــادرو ڕەشـــماڵی هەڵــدا، خــاوو خێزانیــشی وەگــەڵ خۆیــدا، زۆربــەی ڕۆژان بــەڕۆژو بــو، دروستکاری خۆی دەپەرستو، قورئـانی دەخوێنـد، تـێ دەفکریو یـادی خـوای خـۆی دەکـردو نـاوی بـە پـاك ڕادەگـرت، لـە مـاڵی دنیـا تـەنیا ڕانـە مـەڕێكو، داردەستێك، قاپێكو لەگەنێك، پۆشاکی بـەریو چادری سەرسـەری شـك دەبـرد، ڕۆژێ لـە ڕۆژان دۆستو یارانی هاتنە دیدەنی، پێیان گوت: کوا دنیا؟ لە وەڵامدا گـوتی: لـەو ماڵەمـدا هیچ پێویستیم بە دنیا نیە، کەچی پێغەمبەرمان ﷺ هەواڵی پێداوین کە ڕێگایەکی زۆر سەختو دژوارمان لە ڕێدا تەنیا کەسێکی بارسوك پێیدا گوزەر دەکا.

لەگەڵ ئەوەدا، دڵخۆشو شادمان بو، ئـەوەی لـە ژیانیـدا پێویـست بـو لەبەردەسـتی دابو، وەلێ ئەوەی لە پێویست بەدەر بێ، مایەی سەرقاڵیو خەمو پەژارەو ئازارە.

لە پارچە هۆنراوەیەکمدا بە ناونیشانی: (ئەبو زەڕ) لە چاخی پازدەهەمیندا، باس لە دوریو تەنیاییو گۆشەنشینیو بەختەوەری (ئەبو زەڕ) دەکەم، باس لـەوە دەکـەم، کە بە گیانو بیروباوەڕەوە کۆچ دەکا، هەروەکو بڵێی خۆی لە شیعرەکەدا لەگەڵ خۆی دەدوێ.

---

٦٧١) بۆ ڕێك خستن، بۆ چاك کردن.

٦٧٢) لە ڕوخسارین.

٦٧٣) ناسكو لاوی، تەڕو تازەی.

## کەوایە بەختەوەری کامەیە؟!

((کن في الدنيا كأنك غريب او عابر سبيل... لە دنیادا وەکو کەسێکی نامۆ، یا ڕێبوارێك بژیێ، فطوبی للغرباء... جا نامۆیان خۆشی لە خۆیان)).

بەختەوەری لە کۆشکی پاشایانو لەشکرو سوپای زلهێزانو باڵەخانەو تەلاری (خوا پێداوان)و گەنجینەو گەوهەری (قارون)دا نیە، لە کتێبی فەلسەفەو، دیوانی شیعرو باخو گوڵشەنی جوان ڕازاوەشدا نیە.

یاوەرانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی کەم دەرامەت بون، نا گزورو تەنك دەست بون، گوزەران سەختو کەم بەش بو، وەلێ دڵشادو بەختەوەر بون.

سەعیدی کوڕی (موسەییەب) بە سای باوەڕ پتەویو، بوخاری لە (صحيح)ەکەیداو، (حەسەنی بەسری) لە ڕاستگۆییداو، (شافیعی) لە هەڵێنجانی بابەتە شەرعیەکانداو، (مالیك) لە هەستکردن بە چاوەدێری خوای گەورە داو، (ئەحمەد) لە خۆ پارێزیداو، (سابتی بەنانی) لە بەندایەتیدا، بەختەوەریان وەدەست هێنا ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ... چونکو هەرچی لە تێنوێتیو ماندوێتیو برسێتی -کە لە ڕای خودا توشیان دێ-و هەر هەنگاوێکی دەهاوێن، خوانەناسان تورە دەکاو هەرزەرڕبەیێ لە دوژمنی دەوەشێنن، گشتی خودا بە چاکەیان بۆ دەنوسێ. (١٢٠) التوبة﴾.

بەختەوەری چەکی دراو نیە بگۆڕدرێتەوە، وەلاخێك نیە بکرێ، گوڵێك نیە بۆن بکرێ، دانەوێڵە نیە بپێورێ، کوتاڵ نیە بۆ فرۆشتن دابنرێ.

بەختەوەری خۆشیو شادی دەرو نە بە سای ئەو ڕاستیەی وەخۆی هەڵدەگرێ، سا نەوەو سرەوتنی دڵە بە سای بەهرەو چاکەیێ باوەشی پێدا ئەگرێ.

ئێمە لامان وابو ئەگەر پەرە بە بەرفرەکردنی خانوبەرەو، ماڵو داراییمان بـدەین، هەرچـی مایـەی ئاسـانکاری ژیانـەو، خواسـتو ئارەزومانـە کـۆی بکەینـەوە، ئەوسـا بەختەوەرو کامەرانین، ئاسودەو حەساوەیین، کەچی ئەوانە هەموی هۆکاری کلۆڵیو خاکەساریو پەرێشانین، سەبارەت بەوەی هەموشتێك خـەمو پـەژارەو ڕەنـجو بـاجی بەدوادا گەڕانی لەگەڵە ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ... چاوت مەدە سەر ئەو شتەی کە داومانە بەدەستە گەلێ لەوانە، کە ئەمە هەر خۆشی ژیانی دنیایەو هەر ویستومانە بە ئەزمونیان بگەیەنین. ﴿١٣١﴾ طه﴾.

گەورەترین چاکار[٦٧٤] لـە جیهانـدا (موحەممـەد) پێغەمبـەری ڕێنماکار[٦٧٥] بـو ﷺ ئەویش بە نەداری دەیگوزەراندو، لە برسان چەمایەوە، قەسپو خورمـای خراپیـشی دەست نەکەوت برسـێتی پـێ بـشکێنێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە خۆشـیو کامـەرانیـەکی وا دەژیا، لـە ئاسـودەییو بەختیـاریو، سـینە شـادیو، هێمنیو ئـارامییێکی وا دادەیبردە سـەر هـەر خـوا خـۆی پـێ ئاگـادارە ﴿وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ ... قورساییشمان لەسەر شانانت لانەبرد؟ ئەوەی پشتی چەماندبوی. ﴿٣﴾ الشرح﴾.

﴿وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ... چاکەی زۆر هێژاو گرنگت لە خواوە دەگەڵ کراوە. ﴿١١٣﴾ النساء﴾.

﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ... خـودا خـۆی باشـتر دەزانـێ چ کەسـێ بـۆ پێغەمبەری هەڵبژێرێ. ﴿١٢٤﴾ الأنعام﴾.

لە فەرمودەی (صحیح)یشدا هاتوە: ((**البـر حسن الخلق، والاثم مـا حـاك في صـدرك، وكرهـت ان يطلـع عليــه النــاس**... چـاکە ڕەوشـت جوانیـە، گونـاهیش ئەوەیـە لـەناو سـینەتدا بێتو بچێو پێت ناخۆش بێ خەڵك بەسەری هەڵبێ[٦٧٦])).

---

٦٧٤) چاك كار/ڕاستكەرەوەی كار.

٦٧٥) كاری ڕێنمایی خەڵك بو.

٦٧٦) پێی بزانێ.

بێگومـان چـاكە نوانـدن شـادی دڵو، سـوكنايی دەرونـە: لـە فەرمودەشـدا هـاتوە: ((البـر طمأنينة، والاثم ريبة... چاكە دڵنياييەو، تاوانيش دو دڵیە)).

شتێكی ڕونو بەرچاوە، مرۆڤی چاكەكار لە هێمنیو هەداريـدا ژيـان بەسـەر دەبـا، مرۆڤـی بـە گومـانو دو دڵيـشی لـە جموجـوڵو ڕوداوو شـتی بـەر مەترسـی[٦٧٧] دەسـڵەمێتەوە[٦٧٨] ﴿... يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡ...﴾ هـەر هەرايـەك لـە دژی خۆيـان دەزانن. ﴿المنافقون ٤﴾.

هۆكارەكەی ئەوەيە تەنيا خراپەی ئـەنجام داوە، مرۆڤـی تاوانكـار ناچـارە دوچـاری دڵەڕاوكێو نيگەرانیو پەشۆكان بێو، لە ترسان بڕەوێتەوە.

چارەسەری ئەوانەی بە دوای بەختەوەری دادەگەڕێن ئەوەيە: هەميـشە چـاكە كـار بـن، خۆيـان لـە تـاوان دور بگـرن، بـۆ ئـەوەی حەسـاوە بـن ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ...﴾ ئـەو كەسـانەی بڕوايـان بـە خـودا هێناوە بڕواكەيان تێكەڵی ناحـەقی نـەكرد، دڵنيـايی بـۆ ئەوانـەو شـارەزای ڕای خـودا ئەون. ﴿الأنعام ٨٢﴾.

سـوارێك بـە تـاو دەهـاتو تـۆز لـە سـەر سـەريەوە بڵنـد دەبـو، دەيەويـست خـۆی بگەيەنێتە (سەعد)ی كوڕی (ئەبو وەقاس)، لە كاتێكا (سەعد) دور لە قـاوو قيـژو[٦٧٩]، دور لە گێچەڵی، تەنيا بە خۆیو خاووخێزانی، لەگەڵ ڕانە مەڕێكدا لە نـاو جەرگـەی بيابانـدا چـادرێكی هەڵـدا بـو، سـوارەكە لێـی نزيـك بـۆوە سـەير دەكـا (عومـەر)ی كوڕيەتی، كوڕە بە باوكی دەڵێ: باوكە وا خەڵك لەسەر دەسەڵات كێشەيانە، كەچی تۆ بە لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتت خەريكی. ئەويش گوتی پـەنا بـە خـوا لـە خراپـەی تـۆ، منيش دەزانم خەليفايەتی بۆ من شايـستەترە لـەوەی بـە خـۆمو بـەو بەرگـەی بـەرم بەسەر بەم بەڵام گوێم لە پێغەمبەری خودا بو ﷺ دەيفـەرمو: ((ان الله يـحب العبد

---

٦٧٧) مەترسيدار.

٦٧٨) دەڕەوێتەوە/دەترسێ.

٦٧٩) هەرا هەرا.

**الغني التقي الخفيّ...** خوای گەورە بەندەی بێ پێویستی لە خوا ترسی خۆ حەشاری خۆش دەوێ)).

بێ گومان ئەگەر موسڵمان پارێزگاری دینی خۆی بێ گەورەترە لەوەی دەسەڵاتو پایەی (کیسرا)و (قەیسەر)ی پێ بدرێ، چونکێ هەر ئایینە هەتا لە ناو نازو گۆزی بەهەشتدا جێ گیرت دەکا، بەرگریت لێ دەکا، بەڵام گومانی تێدا نیە ڕۆژێ دێ پلەو پایەت لەدەست چێ ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ... ئەم زەمینەو هەرچی وا بەسەریەوەیە لە دوا جاردا هەر بۆ ئێمە ئەمێنێتو سەر لەبەریان دەهێنەوە بۆ لای خۆمان. ﴿٤٠﴾ مريم ﴾.

## هەر وتەی پاك بۆ لای خوا بەرزە بێتەوە

هاوەڵان گەنجینەی وشەی پاراوو پیرۆزیان لەلابو، کە هەڵبژاردەی مرۆڤایەتی ﷺ بەو وشانە دەرسی دابون. هەر وشەیەکیش لە لای ئەوان لە دنیاو ئەوەی تیایدا بایەخدار تر بو، گەورەییو شکۆمەندی ئەوان لەوەدا بو، هەمو کارو فەرمانێکیان بە سەنگو ڕێزی خۆی هەڵدەسەنگاند.

ئەبوبەکر داوا لە پێغەمبەری خوا دەکا ﷺ نزایەکی فێر بکا، ئەویش پێی فەرمو: (( **قل: ربّ اني ظلمت نفسي ظلما كثيرا، ولا يغفر الذنوب الا انت، فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني، انك انت الغفور الرحيم** ... بڵێ: پەروەردگارا من ستەمێکی زۆرم دەرحەق بە خۆم کرد، تەنیا تۆش لە گوناهان دەبوری، جا بە لێخۆشبونێك لەلایەن خۆتەوە بم بەخشەو میهری خۆتم بۆ بنوێنە، بە ڕاستی تۆ بەخشندەو میهرەبانی.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عەباس) دەڵێ: (( **إسأل الله العفو والعافية...** داوای لێبوردنو تەندروستی لە خوا بکە))، هەروەها بە (عەلی) دەفەرموێ: (( **قل: اللّهم اهدني وسدّدني...** بڵێ: پەروەردگارا ڕێنماییو ڕاستەڕێم کەی)).

بە (عوبەید)ی کوڕی (حەسین)یش دەفەرموێ: ((قل: اللّهم الهمني رشدي، وقني شر نفسي... پەروەردگارا هۆشی ژیریم وەبەربێنەوەو، لە خراپەی دەرونیشم بپارێزی.

بە (شەدداد)ی کوڕی (ئەوس)یش دەفەرموێ: ((قل: اللّهم اني أسألك الثبات من الامر، والعزيمة على الرشد، وشكر نعمتك، وحسن عبادتك، واسالك قلبا سليما، ولسانا صادقا، واسألك من خير ما تعلم، واعوذ بك من شر ما تعلم، واستغفرك لما تعلم، انك انت علاّم الغيوب... بڵێ: پەروەردگارا لێت دەخوازم لە کارو فەرمان ڕاگیرمکەی، لەسەر ڕاستەڕێ داسەپاومکەی، داوات لێ دەکەم شوکرانە بژێری بەهرەی تۆ بم، بە چاکی بەندایەتی تۆ بنوێنم، داوات لێ دەکەم، لەو شەڕو خراپەش کە تۆ دەیزانی پەنات پێ دەگرم، لەوەش کە تۆ پێی ئاگاداری داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم، بە ڕاستی تۆ بە نهێنیان زۆر ئاگاداری بە (مەعاز)یش دەفەرموێ: ((قل: اللهم اعني على ذكرك، شكرك، حسن عبادتك... بڵێ: پەروەردگارا لەسەر یادو سوپاسو باش ئەنجامدانی بەندایەتیت یارمەتیم دە.

بە (عائیشە)ش دەفەرموێ: ((قولي: اللّهم انك عفو تحب العفو، فاعف عني... بڵێ پەروەردگارا تۆ خوایەکی میهرەبانی، لێبوردەییت خۆشدەوێ، دەسا لێم ببورە.

ئەوەی ئەو نزایانە لەخۆیان گرتوە: داوای ڕەزامەندیو میهرو سۆزی خوای بەرزو توانایە لە دوا ڕۆژداو، ڕزگار بونە لە خەشمو قینو جەزرەبەدانی[٦٨٠]، داوای یارمەتی کردنە لەسەر ئەنجامدانی بەندایەتیو سوپاسگوزاری خوای بەرزو بێ هاوتا.

پەیوەندی لە نێوان ئەو نزایانەدا: داخوازیکردنی ئەوەی لای خوایەو، پشت هەڵکردنە لەوەی لە دنیا دایە.

ئەو نزایە داواکاری هیچێك لەماڵو سامانی دنیای دوا بڕاو[٦٨١]، کەلو پەلو فاقو بریقی بێ بایەخو لە بن هاتوی تێدانیە.

---

٦٨٠) سزادانی.

٦٨١) کۆتایی هاتو.

## پەروەردگاری تۆ بەم شێوەیە گەلانی ستەمکار لەناودەبا، بێگومان گرتنی ئەو توند ئێش و توند ئازارە

بە راستی مایەی تێشکان و دۆڕانی بەندەیەو، مایەی پێ خلیسکان و لەدەستدانی شان و شکۆیە، کە بەندەکانی خوا بچەوسێنێتەوەو، حەق و مافیان پشێلکاو، بێ چارەو مەفەران ژێر پێخا، هەتا یەکێ لە کاراشنایان[٦٨٢] دەڵێ: لەو کەسە بترسە تەنیا خوا بە فریادڕەسی خۆی دەزانێ لە دژی تۆ.

بێگومان مێژوی گەلان نمونەی بەرچاوو زیندوی دەربارەی دەرەنجامی ستەمکاران لە بیروهزردا تۆمار کردوە.

فەرمو ئەوە (عامر)ی کوڕی (توفەیل) تەڵە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنێتەوەو دەیەوێ تیرۆری کا، پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای لێکرد، خوای گەورە لوێکی ژەهراوی [٦٨٣] لە قوڕگا شین کردو، لە تاوان هاواری دەکردو، هەر لەجێوە پێی مرد.

(ئەربد)ی کوڕی (قەیس) پێغەمبەری خوای ئازارداو، هەوڵیدا نەخشەی کوشتنی بۆ دابرێژێ، پێغەمبەری خوا ﷺ نزای لێکردو، خوای گەورە هەورە تریشقەیەکی لێداو بە خۆی و وشترەکەیەوە سوتا.

چەند ساتێکی کەم بەرلەوەی (حەجاج) (سەعیدی) کوڕی (جوبەیر) بکوژێ، (سەعید) نزای لێکردو گوتی: ئەی خوایە لەدوای من دەستی بەسەر هیچ کەسێدا نەڕوا.

دوای شەهیدکردنی، (حەجاج) دومەڵێکی [٦٨٤] لە دەستی هاتو، پاشان هەمو لاشەی تەنیەوەو [٦٨٥]، هەروەکو گابۆڕە دەیبۆڕاند، پاشان بە ئاهو حەسرەتەوە سەری نایەوە.

(سوفیان)ی (سەوری) لە ترسی (ئەبوجەعفەر)ی (مەنسور) خۆی حەشاردابو، (ئەبوجەعفەر) بەرەو حەرەمی مەککە کەوتەڕێ و (سوفیان)یش لەناو حەرەمدابو،

---

٦٨٢) شارەزایان.

٦٨٣) غوددەی ژەهراوی.

٦٨٤) گرێیەکی.

٦٨٥) تەشەنەی کردو دای گرتەوە.

(سوفیان) هەستاو دەستی بە پەردەی کەعبەوە گرتو، داوای لە خوای بەرزو توانا کرد کە ڕێگا بە (ئەبوجەعفەر) نەدا بچێتە ماڵی ئەوەوە، (ئەبوجەعفەر) بەرلەوەی بگاتە ناو مەککە لەلای بیری (مەیمون) گیانی لەدەستدا.

## هەڵوێستی ستەم لێکراوان

(ئیبراهیم)ی تەیمی دەڵێ: ئی وا هەیە خراپەم بەرامبەر دەنوێنێ من سۆزم بۆی دەجوڵێ. یەکێ لە پیاوە چاکەکانی (خوراسان) چەند دینارێکیان لێ دزی بو ئەویش دەستی کردە گریانێ، (فوزەیل) پێی گوت: بۆ دەگری؟ ئەویش گوتی: ئەوەم بیر کەوتەوە کە لە ڕۆژی سزادا خوای گەورە منو ئەو دزە بەرامبەر دەکا، منیش دڵم پێی دەسوتێ بۆیە گریام.

جارێکیان پیاوێك پاشمندە بە خراپە باسی یەکێ لە زانایانی پێشینی دەکا، ئەویش خورمای بۆ ڕەوان دەکاو دەڵێ: چونکێ چاکەی لەگەڵدا کردوم.

## وتم: منم لەبەر دەرگا

لەسەر دەرگای ڕێکخراوی وڵاتە یەکگرتوەکان لە نیویۆرك تابلۆیەك هەڵواسراوە پارچە هۆنراوەیەکی جوانی شاعیری جیهانی (سەعد)ی شیرازی لەسەر نوسراوەو، بۆ سەر زمانی ئینگلیزی وەرگێڕدراوە، کە بانگەوازی برایەتیو خۆشەویستیو یەك ڕیزی دەکا.

بەندە پێویستی بە دۆستو یاوەرێکی سودمەند هەیە کە خەمرەوێنو دڵ داسەپێنی بێ، هاوبەشی شینو شایی بێ، لەگەڵیدا گیان بە گیانی بێ.

﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ... لە خزمانم ئاریکارێکم بۆ دانێ.(مەبەست)

هاڕونی برامە. پشتی منی پێ پتەو کە. بیکە شەریکیش لە کارم. تا ئێمە زێدە پەسنی پاکی تۆ بدەین، گەلێکیش یادی تۆ بکەین. ﴿٣٤﴾ طه ﴾.

﴿ ... بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ ... (ژنو پیاوی بڕوادار) دۆستی یەکترین.﴿٧١﴾ التوبة ﴾.

﴿ ... كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ... هەروەکو بلۆکی دیواری قورقوشمن.﴿٤﴾ الصف ﴾ .

﴿ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ ... بە دڵ ئەوانی کردە هۆگری یەکتری. ﴿٦٣﴾ الأنفال ﴾.

﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ ... خاوەن باوەڕ هەموویان هەر برای یەکن. ﴿١٠﴾ الحجرات ﴾.

## پێویستە هاوەڵێکت هەبێ

بێ گومان یەکێ لە هۆکاری کامەرانی ئەوەیە: هاوەڵێکی وەهات دەست کەوێ کەڵكو سودت پێ بگەیەنێو، بە سای یاوەری ئەو بەختەوەری وەدەست بێنی.

((**اين المتحابون في جلالي، اليوم اظلهم في ظلي يوم لا ظل الا ظلي**... لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە دەفەرموێ: کوا لە کوێن ئەوانەی لە پێناوی مندا یەکتریان خۆش ویستوە، دەیانخەمە ژێر سێبەری (عەرشی) خۆم، کە لەو ڕۆژەدا جگە لە سێبەری من هیچ سێبەرێك نیە)).

((**ورجلان تحابّا في الله، اجتمعا عليه، وتفرقا عليه**... یەکێکی تریش لەو حەوت چینانەی لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا کۆدەکرێنەوە، ئەو دو پیاوەن لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆش دەوێو، لەسەری کۆدەبنەوەو، لەسەریشی جیا دەبنەوە)).

## هێمنی خوازراوێکی شەرعیو ژیریە

﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ... دڵنیایی بۆ ئەوانەو شارەزای ڕای خودا ئەون. ﴿٨٢﴾ الأنعام ﴾.

﴿ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ... (ئەو پەروەرێنەی) ئەوانی لە هەژاری بێنیاز کردو دڵنیای کردن نەترسن. ﴿٤﴾ قريش﴾.

﴿... أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا ... ئەدی ئێمە لە شوێنێکی هێمنمان دانەمەزراندون، ﴿٥٧﴾ القصص﴾.

﴿... وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ... (ماڵی خوا لە مەککە) هەر کەسێ پەنای پێ بەرێ، ناشێ لە هیچ بترسێ. ﴿٩٧﴾ آل عمران﴾.

﴿... ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ... ئەوسا کە بینێرە شوێنێ کە نەترسێ. ﴿٦﴾ التوبة﴾.

**((من بات آمنا في سربه معافى في بدنه، عنده قوت يومه، فكأنما حيزت له الدنيا بحذافيرها... هەرکەسێ بە دڵێکی ئارامەوە شەوی کردەوە، تەندروستی لاشەی تەواو بو، بژێوی ئەو ڕۆژی لەلابو، هەروەکو بڵێی دنیای بە هەمو نازو گۆزەوە پێ براوە)).**

**دڵ لە میانەی باوەڕو ڕۆچونی لە ناسینی حەقداو، لە میانەی پڕبونی بە دڵنیایی: ئاسودەو ئارام دەبێ.**

**ئاسایشی گەل: بە تەبایی‌و یەك ڕیزیەوە بەندە، بەوە بەندە کارو فەرمانیان بە دادوەرانە بەڕێوە بچێ‌و، یاساو ڕێسای خوای تێدا ڕەچاو بکرێ.**

**ترس‌و لەرزیش لەگەڵ ئاسودەییدا دوژمنن** ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ... **بە ترسەوە لەوێ ڕۆیی‌و بە نیگەرانی دەیڕوانی.** ﴿٢١﴾ القصص﴾.

﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... **ئێوە لەوان ترس‌و نەبێ‌و ئەگەر بڕوادارن دەبێ هەر تەنیا لە من بترسن.** ﴿١٧٥﴾ آل عمران﴾.

**یەکێ لە مەترسیدا بێ حەسانەوەی بۆ نیەو، کەسی بێ باوەڕیش هەمیشە نائارامەو، مرۆڤی نەخۆشیش ژیانی ژانە.**

ژیانی ئەم دنیایە چەندە کەساس‌و مایەی خاکەساریە، ئەگەر باری بە لایەك دا ڕاست بێ بە لایەکەی تری داخوارە، ئەگەر ماڵ‌و سامان هەڵبڕژێ جەستە ناسازو دەردەدارە، ئەگەر تەندروستی تەواو بێ بەڵاو مەینەتی دێتە ئارا، ئەگەر بارو گوزەرانی ژیان هەموی تەواو بێ مەرگ سەربارو بن بارە.

هۆنەرێك بە ناوی (ئەعشا) لە نەجدەوە بەرەو پێغەمبەری خوا کەوتە ڕێ ﷺ پارچە هۆنراوەیەکیشی هۆنی بوەوە تیایدا ستایشی پێغەمبەری خوا دەکاو، دەیویست موسڵمان بێ، لە ڕێگادا (ئەبو سوفیان) ڕێگای لێ گرت‌و سەت وشتری پێدا، بۆئەوەی نەگاتە خزمەت پێغەمبەرو بگەڕێتەوە ناو ماڵ‌و حاڵی خۆی، ئەویش وشترەکانی وەرگرت‌و گەڕایەوە، لە ڕێگادا سواری وشترێك بو دەیرەپاند، بەسەر سەریدا کەوتە خوارێ‌و ملی شکاو، بێ دەستمایە لە دنیاو دواڕۆژ سەری نایەوە.

بەڵام ئەو پارچە هۆنراوەی ئامادەی کرد بو بۆئەوەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بیڵێ شیعرێکی بە پێز بو ئێستاکەش هەر ماوەتەوە.

## چەند کەسی خاوەن شکۆ بونە ڕەنجەڕۆ

یەکێ لە ئاماری بەختەوەری ڕاستەقینە ئەوەیە بێ کەم‌وکوڕی‌و بەردەوام بێ، بەردەوامیش لەوەدایە لە دنیاو دواڕۆژدا، لە نهێنی‌و ئاشکرادا لە ئێستاو پاشەڕۆژدا مرۆ بەختەوەر بێ.

بەختەوەری تەواویش لەوەدایە، هیچ پەتەرێك [686] نەیشێلوێنێ، هیچ ڕق‌و کینەیەك ڕوی جوانی نەڕوشێنێ [687].

(نوعمان)ی کوڕی (مونزیر) - پاشای عێراق- بۆ گەشت‌و سەیران دەڕواو لەژێر سێبەری درەختێك مەی دەخواتەوە، (عەدی) کوڕی (حاتەم)یش کەسێکی ژیرو دانا بو ویستی بە وشەیەك پەندی دابدا، پێی گوت: ئەی پاشا، ئایە دەزانی ئەو درەختە

---

٦٨٦) مەینەتیەك.

٦٨٧) دانەڕنێ/داینەماڵێ.

چی دەڵێ؟ پاشا گوتی: چ دەڵێ: (عەدی) گوتی: دەڵێ: زۆر کەس لەژێر ئەو درەختە بەسەریان برد

ئاوی سازگاریان لەگەڵ مەیدا تێکەڵ کرد
پاشان ڕۆیشتن و ڕۆژگار بە پەندی بردن
ژیانیش هەروایە ئێستای خۆشی یەو دواجاریش مردن

(نوعمان) ژیانی لێ تفتوتاڵ بو، وازی لە مەی خواردنەوە هێناو هەتا دنیای بەجێهێشت بە ئاخ و کەساران ژیانی بەسەر برد.

بڕوانە شای ئێران ئەو کەسەی بە بۆنەی تێپەڕدانی دو هەزارو پێنج سەد ساڵ بەسەر پێکهێنانی دەوڵەتی فارسیدا ئاهەنگی دەگێڕا، نەخشەی بەرفرەکردنی سنوری دەسەڵاتی دەکێشاو، دەیویست دەسەڵاتی ڕوبەرێکی پان و پۆڕتر دابگرێ، دوا بە دوای ئەوە هەر لە بەیانیو ئێوارەیەکدا دەسەڵاتی لە کارخرا ﴿... تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ ... هەرکەس بۆ خۆت مەیلت لێ بێ دەستەڵاتی پێ دەدەیو کێش تۆ حەز کەی دەستەڵاتی لێ دەستێنی. ﴿٢٦﴾ آل عمران﴾، لە کۆشك و تەلارو نازو گۆزی دنیاوە دەرنرا، بە بێکەسیو بە بێبەشیو دورە وڵاتی گیانی لەدەستداو، کەسیش لەسەری نەگریا ﴿الدخان: ٢٥ - ٢٧ ﴿كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ... گەلێ کانیو باغاتیان لە پاش بەجێ مان. فرە کێڵگەو کۆشك و سەر سەرای بە نرخیش. خێرو بێرێکیش کە تێیدا لەوپەڕی خۆشیدا دەژیان. ﴿٢٧﴾ الدخان﴾.

بە هەمان شێوە (شاوشیسکۆ)ی سەرۆکی ڕۆمانیا ئەو کەسەی بیست و دو ساڵ فەرمانڕەوایی وڵاتەکەی کرد، تەنیا پاسەوانە تایبەتیەکانی خۆی ژمارەیان ٧٠ هەزار پاسەوان بو، لەگەڵ ئەوەدا گەل و نەتەوەی خۆی چوار دەوری کۆشکەکەیان گەمارۆداو، بە خۆیو سەربازەکانی ئەنجن ئەنجن کران ﴿... فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ

يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ... هـيـچ دەستەيەكيـشى نـەبو كـە لـە خـوداى بپـارێزىٚو خۆشـى ياريـدەى خـۆى نـەدا. ﴿القـصص ٨١﴾. دەسـتى لـە بـنى هەمبانىٚ دەرچو [٦٨٨]، دنياو دوارۆژى لەدەست چو.

لەلايـەكى تـرەوە (مـاركوس)ى سـەرۆكى فليـپين: مـاڵدارو دەسـەڵاتدار بـو، بـەڵام جۆرەها ئازارو ئەشكەنجەى بە گەلەكەى چەشت، كاسـەى سەرشـۆڕىو نەگبـەتى بـە گەلەكەى نۆش كـرد، ئەوسـا خـواى گـەورەش تـاڵايى بەدبـەختىو چارەڕەشـى وەسـەر لوتى وى كرد، لە ناو خاكو زێدو خزمو خوێشو دەسـەڵاتى خـۆى وەدەرنـرا، هـيچ پـەنا گەيـەكى نـەبو تێيـدا وەحەوێتـەوەو، بـە بێوڵـەتى [٦٨٩] سـەرى نايـەوە، گـەلو نەتەوەكەيـشى ڕێگايـان نـەدا لـە خـاكو وڵاتەكەيـدا بنێـژرىٚ: ﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ... ئەدى فێڵو تەڵەكەكانى هەموڵى پوچەڵ نەكردن؟ ﴿الفيل ٢﴾.

﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ... ئەوسـا خـودا گـيرۆدەى ئـازارى پەسـلانو دنيـاى كردن. ﴿النازعات ٢٥﴾.

﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ... ئێمـە هەريـەك لەوانـەمان بـە تاوانەكـەى خۆيـان گـرت. ﴿العنكبوت ٤٠﴾.

## دەسـەبەركردنى كردەى چاكـە تـا نجى سـەرى ژيانى بەختەوەرانـەيە

بۆئـەوەى بەنـدە ژيـانێكى بەختەوەرانـەو، ئـارامىو حەسـانەوە، دەسـتەبەركا، پێويـستە هـەوڵى وەدەسـتهێنانى كـردەى بـەردار بـداو، پێـشبڕكىٚ لـە فەراهـەمهێنانى خووڕەوشتى جوانو ڕازاوە بكا ((**احرص على ما ينفعك واستعن بالله...** لەسـەر ئـەوەى سودت پىٚ دەگەيەنىٚ پىٚدا بگرەو، داواى يارمەتيش لە خوا بكە)).

٦٨٨) واتە هيچى نەبڕا.

٦٨٩) بە نابوتىو بەدبەختى.

یەکێ لە یاوەران داوا لە پێغەمبەری خوا دەکا ﷺ کە لە بەهەشتدا پێکەوە بن: ئەویش پێی دەفەرموێ: ((**أعني على نفسك بكثرة السجود، فانك لا تسجد لله سجدة الا رفعك بها درجة**... لەسەرخۆت یارمەتیم بدە، بە سوژدەبردنی زۆر، چونکو تۆ هەر سوژدەیێك بۆ خوا ببەی بێ سۆ خوای گەورە پلەیەکت پێ بەرز دەکاتەوە.

یاوەرێکی تریش داوا دەکا پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی وای پێ بڵێ هەمو چاکەیێ لەخۆوە بگرێ ئەویش پێی دەفەرموێ: (( **لا يزال لسانك رطبا من ذكر الله**... هەمیشە زمانت بە یادی خوا پاراو بێ)).

کەسێکی سێیەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەخوازێ، ئەویش پێی دەفەرموێ: ((**لا تسبَنَّ احدا، ولا تضربن بيدك احدا، وان احد سبَّك بما يعلم فيك فلا تسبَّنه بما تعلم فيه، ولا تحقرن من المعروف شيئاً، ولو ان تفرغ من دلوك من اناء المستقي**... جوێن بە کەس مەدەو، کەسیش بە دەستی خۆت ئازار مەدە، ئەگەریش یەکێ جوێنی پێدای لەسەر ئەو خراپەیەی دەیزانی لەتۆدا هەیە، تۆ لەسەر ئەو خراپەیە جوێنی پێمەدە، کە دەزانی تێیدا هەیە، ئەوەی چاکەیە هیچی بە کەم مەزانە، ئەگەر چی لە دۆڵکەی خۆت ئاوێ بۆ یەکێ لە پەرداخێ بکەی، کە داوای ئاوت لێ دەکا)).

بێگومان ئەو مەسەلەیە زۆر پێویستی بە پێشبرکێو دەستپێشخەری هەیە: ((**بادروا بالاعمال فتنا**... بەر لە توشبونی ئاشوبو ئاژاوە، لە کرداری چاکە دەست پێشخەری بکەن)).

((**اغتنم خمساً قبل خمس**... پێنج شتان بقۆزنەوە بەر لە ڕودانی پێنج شتان)).

﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ ... پەلە بکەن بۆ گەیشتن بە بەخشینی پەروەرێنتانو بەهەشتێ. ﴿١٣٣﴾ آل عمران ﴾.

﴿ ... إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ ... ئەمان لە کاری چاکەدا بەهەڵپەبون.[٦٩٠] ﴿٩٠﴾ الأنبياء ﴾.

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ... تیرەیەکیش لە پێشەوەن، وە پێشکەوتون. ﴿١٠﴾ الواقعة ﴾.

---

٦٩٠) بەپەلەبون، چوست بون.

کاری چاکە دوامەخە، لە کردەی بەردار دامەمێنەو، کاری سودمەند پشتگوێ مەخە:

﴿... وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ... بۆ شتێ حەزی لێدەکەن با پێکەوە کێ بڕکێ بکەن. ﴿٢٦﴾ المطففين﴾.

لەوکاتەی (عومەر)ی کوڕی (خەتاب) زامدارکراو خوێنی لێ هەڵدەچۆڕا، کوڕە گەنجێکی بینی شەرواڵەکەی لەدوا دەخشا، (عومەر) پێی گوت: ((برازاکەم، شەرواڵەکەت هەڵماڵە، زیاتر مایەی لە خواترسانو، پاراستنی پۆشاکتە))، ئەوەیە فەرمان بە چاکەکردن لەسەرەمەرگدا ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ... کێ لە ئێوە مەیلی لێبێ بێتە پێشێ، یان بگەڕێتە دواوە. ﴿٣٧﴾ المدثر﴾.

لە ڕاستیدا بەختەوەری بە خەوی دورو درێژو خۆ لەیادکردن لە ناو نازو گۆزو، پشت هەڵکردن لە خواستی باڵاو، پشتگوێ خستنی کاری چاکە فەراهەم نایێ ﴿...وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ ٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ... بەڵام خودا هاتنیانی پێ خۆش نەبو، ورەی لە دڵیان بردەدەر. پێیان گوتن ئێوەش وێڕای بەجێماوان بەجێمێنن. ﴿٤٦﴾ التوبة﴾.

بەڕاستی بیرو ژیری چەپەڵکارانو دەرون نزمان پێیان دەڵێ: ﴿... لَا تَنفِرُوا۟ فِي ٱلْحَرِّ ... لەم گەرمایەدا دەرمەکەون. ﴿٨١﴾ التوبة﴾.

﴿... لَّوْ كَانُوا۟ عِندَنَا مَا مَاتُوا۟ وَمَا قُتِلُوا۟ ... (دەیانگوت) ئەگەر ئەوانە لامان مابان، نە دەمردن، نە دەکوژران. ﴿١٥٦﴾ آل عمران﴾.

بەندە بە نیگای خوا قەدەغە کراوە لەوەی لە کاری چاکە دواکەوێ: ﴿... مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ... چیتانە کە پێتان ئێژن: وەدەرکەون بۆ خەزا لە ڕای خوادا، تەمەڵنو لە جێی خۆ نابزون؟ ﴿٣٨﴾ التوبة﴾.

﴿ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ ... هێندێکی واتان دەناودان، کە لە ئانقەست خۆوە دوادەداو ناوگاتێ. ﴿٧٢﴾ النساء ﴾.

﴿ ... أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَٰذَا ٱلْغُرَابِ ... ئەی لە خۆم نەگبەتێ! چۆن نەم زانی وەك قەل بجوڵێمەوەو لاشەی برای خۆم وەشێرم. ﴿٣١﴾ المائدة ﴾.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ... چونکە ئەمانە گوزەرانی سەر دنیایان لە دواڕۆژ پتر خۆشدەوێ. ﴿١٠٧﴾ النحل ﴾.

﴿ ...وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ ... نەچن کێشەو لێپەیدا بێوسست ببنەوە. ﴿٤٦﴾ الأنفال ﴾

﴿ ...وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ ... ئەگەر دەچن نوێژدا بەستن بە تەوەزەلی هەڵدەستن. ﴿١٤٢﴾ النساء ﴾.

((**اللّهم اني اعوذ بك من الكسل...** پەروەردگارا پەنات پێ دەگرم لە تەمبەڵی)). ((**الكيس من دان نفسه وعمل لـما بعد الموت...** مرۆڤی گوستاخو وریا ئەو کەسەیە هەواو ئارەزوی خۆی بخاتە ژێرپێو کاری بۆ دوای مردن بێ)) ((**والعاجز من اتبع نفسه هواها و تمنى على الله الاماني...** مرۆڤی دەستەوسانو بێ تواناش ئەو کەسەیە، ئەوەی هەواو ئارەزوی بیەوێ خۆی لێ نەگێڕێتەوەو، لەسەر خواوە خۆزگەو ئاوات بخوازێ)).

## مانەوەو خۆشگوزەرانی لەوێیە نەوەك لێرە

ئایە دەتەوێ گەنجێکی دەوڵەمەندو لەش ساخ بیتو هەمیشە لە ژیاندا بیت؟

ئەگەر ئەو ئاواتەت لە دڵدا بێ لە دنیادا نایێتە دی، بەڵکە لە دواڕۆژدا دێتەدی، خوای گەورە ژیانی ئەم دنیایەی وا ڕەخساندوە دوایی بێو پڕ لە کەساسی بێ، بە گاڵتەو گەپو ڕابواردنێکی هەڵخەڵەتێنەریشی ناوبردوە.

یەکێ لە شاعیران لەوپەڕی تاقی لاوێتیدا هەژارو نەدار بو، ئاواتەخوازی درهەمێك بو دەستی نەکەوت، دەیەویست ژیانی هاوسەرێتی پێکبێنێ بۆی نەڕەخسا، ئەو کاتەی بە ساڵداچو، سەری سپی بو، تەنیا چەرمو هێسکی مابو، ئەوسا لە هەمو لایەکەوە بۆی دەباری، خانو بەرەو ژن هێنانی بۆ سانا بو، لە ئاهی ئەو بارە نالەبارە ئاخۆ ئۆفی هەڵکێشاو لە شیعرێکدا باس لەوە دەکا، کە حەز ناکا لەو تەمەنە ئەو نازو گۆزەی بەسەردا بڕژێ لە کاتێکدا لە تەمەنی لاوێتیدا ئاخو حەسرەتی بۆ هەڵدەکێشا.

﴿... أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ... ئەدی ئێمە تەمەنی وا درێژمان بە ئێوە نەدا کە هەر کەسێ بیویستایە، دەیتوانی پەندی لێ بگرێ؟ ترسێنەریشتان هاتە لا! (٣٧) فاطر﴾.

﴿... وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ... لایان وابو ناگەڕێنەوە لای ئێمە.(٣٩) القصص﴾.

﴿وَمَا هَٰذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ... ئەم ژیانەی سەر دنیایە، هەموهەر گەپو گاڵتەیەو چی تر نیە. (٦٤) العنكبوت﴾.

بە ڕاستی وێنەی ژیانی ئەم دنیایە وەکو ئەوە وایە، ڕێبوارێك لەژێر سێبەری دارێ وەحەسێ، دواى ئەوە بڕواو جێی بهێڵێ.

## نەیـارانی بەرنـامـەی خـوا

چەند کتێبو نوسراوەی بێ باوەڕانم خوێندۆتەوە ئەوانەی بە پەخشانو شیعر نوسین دەیانەوێ ببنە لەمپەری سەر ڕێگای بەرنامەی خوا، گوتەی ئەوانەم بەرچاو کەوتوە، کە لەسەر ئەم زەویەدا لە یاساو ڕێسای خوا لایانداوە، گەزارەیی[٦٩١] و زمان درێژی ئەوانم خوێندۆتەوە، بینیومە لەمەڕ بنەما ڕاستەقینەکانو ڕێنوێنی خوایی

---

٦٩١) بێ شەرمی.

چەند بە نارێکی سنوریان بەزاندوە، دەبینم ئەو دەم دڕاوو چەنە بازانە بە ڕێژەییێکی ئەوەندە زۆر بێ شەرمیان نواندوەو وتەی بێ بایەخیان کەڵەکە کردوە[٦٩٢] مرۆڤ شەرم دەکا نوسراوو، هەڵبەستراوو زۆر ڕەوی ئەوان بگێڕێتەوە.

لەوەش دڵنیا بوم ئەگەر مەردوم هەڵگری پەیامێك نەبێو بەرنامەیەك شك نەبا، ئەوا ئاژەڵ ئاسا دەگوزەرێنیو بەڵام خۆی لە پێستی مرۆڤدا دەنوێنێ، لە ڕواڵەتدا مرۆڤەو لە ناوەڕۆکدا چوار پێیە[٦٩٣]: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ... یان پێت وایە کە زۆربەیان گوێ شل دەکەنو تێدەگەن؟ ئەوانە وێنەی وڵساتن، بگرە لەویش گومڕاترن. (٤٤) الفرقان﴾.

لەو کاتەی کتێبەکەم دەخوێندەوە لە خۆم پرسی: باشە چۆن ئەوانە بەختەوەر دەبن لە کاتێکا پشتیان لەو خوایە هەڵکردوە، کە هەر خۆی بەرزو بێهاوتایەو بەختەوەری لە دەستی ئەو دایەو، بەو کەسەی دەبەخشێ خۆی حەز بکا؟!

چۆن ئەوانە کامەرانی وەدەست دێنن، کە پەیوەندی نێوانی خۆیانو خوایان دەپچڕێنن، دەرگای نێوانی دەرونی کزو لاوازو دەردەداریانو، نێوانی میهرو سۆزی بێسنوری خوا لە ڕویاندا دادەخەن؟! ئەوانە چۆن ئاسودەیی وەدەست دێنن لەکاتێکا خوا لە خۆیان دەڕەنجێنن؟! چۆن دڵارامی دەرك پێ دەکەن، لە کاتێکا دژایەتی خوا دەکەن؟!

وەلێ هەستم کردوە هەر لە دنیاوە ئاماری بەدبەختیو چارەڕەشی دواڕۆژیان دیارە کە گڕیی دۆزەخە، ئەگەر تۆبە نەکەنو ژێوانی خۆیان دەرنەبڕن، ئاماری تێچونو سەرشۆڕیان لە دنیاوە دیارە ئەویش چارەڕەشیو گوێ پێ نەدانو دڵتەنگی دارمانو ورە بەردانە: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا ... هەر کەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانەدایە. (١٢٤) طه﴾.

٦٩٢) خڕکردۆتەوە.
٦٩٣) ئاژەڵ.

هەتاوەکو زۆربەیان دەیانەوێ جیهان تێکچێ‌و ژیان کۆتایی پێ‌بێ‌و، دنیا لەبەریەك هەڵوەشێ‌و، ئەو ژیانەیان جێ بهێڵن.

ئەو بەرژەوەندیەی بێ باوەڕانی کۆن‌و نوێ لەسەری کۆکن: بێ‌ڕێزی نواندنە لەگەڵ خوداو، هەڵەشەیی‌و [٦٩٤] سەرەڕۆیی [٦٩٥] کردنە سەبارەت بە خوونەریتی بەرزو ڕەسەنایەتی، خۆ لە گێلی دانە لەمەڕ وەرگرتن‌و بەخشین‌و، پشت هەڵکردن لە پاشەڕۆژو، بە کەم سەیرکردن‌و گوێ پێنەدان بەو گوتارانەی دەیڵێن‌و دەینوسن‌و جێبەجێی دەکەن: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ... ئاخۆ کەسێ کە بنەڕەتی مزگەوتەکەی خۆی لەسەر هەستی خواپەرستی‌و ڕەزای خودا دارشتبێ هێژاترە، یان ئەو کەسەی کە بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری کەندالی فشەڵەو ڕوخەك داناوەو دەگەڵ ئەودا دەکەوێتە ناو ئاگرو کڵپەی دۆژەھ؟ خودا دەستەی ستەمکاران شارەزای ڕاستە ڕێ ناکا. (١٠٩) التوبة ﴾.

بە ڕاستی ئەو بێ باوەڕانە ئەگەر بێ‌و پەشیمانی خۆیان دەرنەبڕن‌و نەگەڕێنەوە، تاکە چارەیان ئەوەیە ئەو تەمەنە بێ‌نرخەو بێ‌بەهایە، ئەو ژیانە تفت‌و تاڵە کۆتایی پێ بهێنن‌و خۆیان لەناوبەن: ﴿ ... قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ۗ ... بێژە: دەك لە ڕکان بمرن. (١١٩) آل عمران ﴾.

﴿ ... فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ ... سا وەرن یەکتر بکوژن، ئەم کارە بۆتان چاترە. (٥٤) البقرة ﴾.

---

٦٩٤) کەرایەتی.

٦٩٥) بێ ئامانجی‌و بێ هەدەف.

## لە نرخ و بەهای دنیا

بێگومان تەنیا تەرازوی بەختەوەری لە کتێبی خوای گەورەداو، نرخاندن و هەڵسەنگاندنی شت لە قورئانی پیرۆزدا: نرخ و بەهای شت و، قازانج و دەست کەوتی بەندە لە دنیاو دوارۆژدا دیاری دەکەن.

﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ... خۆ ئەگەر بڕیار وانەبا، نابێ مەردم یەك تیرە بن، وامان دەکرد میچ و بان و پلەکانی ماڵەکانی ئەوانەی خودا نەناسن، لە زێویاو تەختی زێوینم دەدانێ، کە لەسەریان پاڵدەنەوە، شتی تری هەمە ڕەنگەش گشت ئەمانە هەر بۆ خوشگوزەرانی ژینی ئەم دنیان، ماڵی ئەولاش پەروەرندەت هەر بۆ ئەوانەی داناوە، کە لە خوای خۆیان دەترسن. ﴿٣٥﴾ الزخرف ﴾.

ئا ئەوە واتای ڕاستەقینەی ژیانەو، ئەوەیە قەدری کۆشك و تەلارو، زێڕو زیوو، پلەو پایەی.

هێمای [٦٩٦] بێبایەخی دنیایە کە خوای گەورە سەر لەبەری دەیداتە بێ باوەڕان و، باوەڕدارانیش لێی بێبەشن، تاوەکو سەنگ و ڕێزی ژیانی دنیا بۆ خەڵکان ڕۆشنکاتەوە.

(عوتبە)ی کوڕی (غەزوان)ی هاوەڵی ناودار، لەکاتێکا وتاری هەینی بۆ خەڵکان دەخوێندەوە زۆر لای سەیر بو کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەگەڵ گەورەترین دروستکراوی خوادا چۆن دەیگوزەراند خۆشترین و شیرین ترین کات و ساتەکانی ڕۆژانی ژیانی ئەو ساتە بو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گەڵای داریان دەخواردو لە پێناوی خوادا تێدەکۆشا، پاشان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دابڕاوەو، ئێستاکەش فەرمانڕەواو دەسەڵاتداری ناوچەو هەرێمێکە، بێگومان ئەو ژیانەی لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەسەر دەبرێ بە ڕاستی ژیانێکی بێ بایەخە.

---

٦٩٦) نیشانەی.

(سەعد)ی کوڕی (ئەبو وەقاس) واقی وڕدەمێنێ، کە لەدوای کۆچی پێغەمبەردا ﷺ فەرمانڕەوایەتی شاری (کوفە) دەکا، لە کاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ گەڵای داری دەخوارد، بۆ خۆی پێستێکی مردارەوە بوی دەکوڵاندو وردی دەکرد، پاشان لەگەڵ ئاودا دەیخوارد، جا ئەو ژیانەو کۆشکو باڵەخانەی لەدوای ڕۆیشتنو بەجێهێشتنی پێغەمبەری خواوە ﷺ دێتە بەردەست چ نرخو سەنگێکی هەیە! ﴿وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ ... دیارە دوا ڕۆژ بۆ تۆ لە دنیا چاترە. (٤) الضحى﴾.

کەوایە نهێنیەك لەو بابەتو مەسەلە دایە، ئەویشیان تەنیا پروپوچی ژیانی دنیایە ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ (٥٥) نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ... ئاخۆ ئەوان پێیان وایە ئێمە کە بە ماڵو کوڕان یارمەتیان دەدەین، هەر بۆئەوەیە کە: پەلەمانە لە چاکە دەگەڵکردنیان؟ نەخێر، ئەمانە نەزانن. (٥٦) المؤمنون﴾.

((والله ما الفقر أخشى عليكم... سوێند بە خوا ناترسێم لەوەی هەژار بن)).

لەوکاتەی (عومەر) دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە ماڵی خۆی دابو، بینی لەسەر حەسیرێك پاڵکەوتوە، شوێنەواری لە کەلەکەی دەرکردوەو، هیچی لە ماڵدا نیە تەنیا هەندێك جۆ نەبێ، کە هەڵواسرا بو، چاوەکانی (عومەر) ئەسرینی لێ هەڵڕژا.

بێگومان دۆخێکی کاریگەرە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەنگو پێشەوای تەواوی مرۆڤایەتیەو، حاڵو گوزەرانیشی بەم شێوەیە ﴿وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ ... گوتوشیانە: ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خۆراك دەخواو بە بازاڕاندا دەگەڕێ؟ (٧) الفرقان﴾.

پاشان (عومەر) - خوا لێی ڕازی بێت - پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خۆت دەزانی (کیسرا)و (قەیسەر) لە چ ژیانێکدا بەسەر دەبەن! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((أمن شك انت يا ابن الخطاب، أما ترضى أن تكون لنا الآخرة ولهم الدنيا.. ئەی کوڕی (خەتتاب) تۆ لە گومان دای؟ بەوە قایل نی دواڕۆژ بۆ ئێمە بێو دنیا بۆ ئەوان؟

بێگومان ئەو پێوانەیە هاوسانیو هاوکێشەیەکی [٦٩٧] ڕۆنو لەبەرچاوەو دابەشکردنێکی تەواوە، ئەوسا کێ حەز دەکا با قایل بێ، حەزیش ناکا با تورە بێ، هەرکەسێکیش دەیەوێ بەختەوەری لە پولو دراوو، باڵەخانەو ئۆتۆمبێلدا وەدەستبێنێو هەولو گەڕی [٦٩٨] هەر لەو پێناوە دابێ، سوێند بەو خوایەی تاکو تەنیایە، بۆی بەردەست نابێ.

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ... هەر کێ ژینی ئەم دنیایەو زەرقو بەرقی ئەوی دەوێ، ئێمە مزەی کردەوەیان -بە تەواوی- هەر لەم دنیایە دەدەینێو چیشیان لێ کەمەوە ناکرێ. ئەوانە هەر ئەو کەسانەن ڕۆژی سەلا، غەیری ئاگر، بەشیان نیەو هەرچی لە زەمین کردیان بە فیرۆ چو. ﴿١٦﴾ هود ﴾.

## کلیلی بەختەوەری

ئەگەر تۆ کەسێکی خواناس بیتو زیکرو یادی خوات لە دەم دابێو، بەندایەتی بۆ بنوێنی، ئاسودەییو کامەرانی وەدەست دێنی، ئەگەرچی لە کەلاوەیەکدا [٦٩٩] بگوزەرێنی.

وەلێ ئەگەر کەسێکی لاسار بیت، لە فراوانترین کۆشکو خانوبەرەدا بەسەربەی، هەرچی ئارەزوت لێی بێ وەدەستی خەی، دڵنیا بە سەرەنجامی ژیانت کەساسیو تفتو تاڵیە، چونکێ ئێستاکەش کلیلی بەختەوەریت لە دەست نیە. ﴿... وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُوْلِي ٱلْقُوَّةِ ... هێندن گەنجینە دابۆیێ، هەر تەنیا کلیلەکانیان گرۆیەکی زۆر بەهێزی شەکەت دەکرد. ﴿٧٦﴾ القصص ﴾.

---

٦٩٧) هاوسەنگێکی/ پێك هەڵپێکی.

٦٩٨) هەوڵ و تێکۆشان.

٦٩٩) کاولە خانو.

## هەڵوەسـتـەیـەك

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... خودا لەسەر ئەو کەسانە دەکاتەوە، کە باوەڕیـان پێ هێناوە. ﴿٣٨﴾ الحج﴾.

مەرامی [٧٠٠] ئەو ئایەتە ئەوەیە: خوا بەڵاو مەینـەتی دنیـاو دواڕۆژ لەسـەر موسڵمانان لائەدا.

"ئـەوە لـە لایـەن خـواوە هەواڵـە، بەڵێنـە، موژدەیـە، بـە بـاوەڕ دارانـی داوە، هەرچـی کۆسپو ئاستەنگە لە ڕێیاندا لائەبا، بە سای ئەو باوەڕەیان خوا لە گشت خراپـەو بـەدی بێباوەڕانو، ڕاڕاییو فێڵو فرتی شەیتانو، لە پیسیو چەپەڵی دەرونیـانو، کاروکرداری نادروسـتیان، دەربازیـان دەکـا، لـە کـاتی دابـارینی بـەڵایێ، کـە بەرگـەیان پـێ نـاگیرێ لەسەریان دەڕەوێنێو بارسوکیان بۆ دەنوێنێ، هەر هەمو بڕوادارێك بـە گوێرەی ڕێـژەی باوەڕی مافی ئەو بەرگریەو ڕێزلێنانەی هەیە، جا هەیانە پشکی [٧٠١] زۆری پـێ ئـەبڕێو، هەشیانە کەمێکی بەردەکەوێ".

یەکێ لە بەروبومی باوەڕ ئەوەیە لە کاتی مەرگەساتی دڵنەوایی بەندە دەکا، ئـاڵۆزیو تەنگو چەڵەمەی لەسەر سوك دەکا ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ... هەر کێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خۆی دەکا. ﴿١١﴾ التغابن﴾.

مەبەستی ئەو بەندە بڕوادارەیە دڵنیایە هەر کۆستێ [٧٠٢] بێتە ڕێی لە لایەن خواوەیەو، ئەوەی بەسەری هاتوە دەبوایە هەر ببێ، ئەوەی بەسەریشیدا هـەڵبڕێ [٧٠٣] ڕێـی تێناچێ بەسەری بێ، ئەوسا بۆ ئەو بڕیارو فەرمانە تاڵە ملـی کـەچ دەکـاو ڕەزامەنـدی دەنوێنـێ، ئـەو بەڵایـە جەرگاوسـەی [٧٠٤] لەسـەر سـوكو سـانا دەبـێ، چـونکێ دەزانـێ خـوا بەسـەری هێناوەو، ڕەنجی بەهەدەر ناچێ".

---

٧٠٠) مەبەستی.
٧٠١) بەشی.
٧٠٢) هەر ناخۆشییێ.
٧٠٣) تێپەڕێو نەیپێکێ.
٧٠٤) بێزارکەی.

## چۆنیان دەگوزەراند؟

وەرە با بەیەکەوە سەرێك لە بارو گوزەرانی یەك رۆژی هاوەڵێکی ناودارو پایەدار بدەین، کە کچی پێغەمبەری خواو پارچەیەك لە جگەری ﷺ خێزانو هاوسەرێتیو، ناوی (عەلی) کوڕی (ئەبو تالیب)ـە، (عەلی) لە بەرە بەری بەیاندا خەبەری دەبێتەوە، بە خۆیو بە فاتیمە ماڵیان پشکنی هیچ خۆراکێکیان وەبەردەستان نەکەوت، لەسەرمان قاپوتەکەی [٧٠٥] بە شانیدا داو لە ماڵ چوە دەر، لە کەنارەکانی شاری مەدینە دەرۆیشتو دەگەڕا، جولەکەیەکی خاوەن کێڵگەی بیرکەوتەوە، (عەلی) لە دەرگا تەنگو چکۆڵەی کێڵگەکە چوە ژورێو خۆی تێوەسمی [٧٠٦]، جولەکە پێی گوت: ئەی کابرای عەرەب وەرە هەر سەتڵێك بە دەنکە خورمایەك دەربێنە، واتە سەتڵێکی گەورەی ئاو لە ناو بیرەکە بە وشتران ڕابکێشە. (عەلی) خوای لێ ڕازی بێت دەست بەکار بو، ماوەیەك بو کاری لەگەڵدا دەکرد، هەتاوەکو هەردو دەستەکانیو هەمولاشەی ژانی دەکرد، ئەویش بارتەقای ژمارەی سەتڵەکان دەنکە خورمای پێ دەدا، دەنکە خورمایەکانی دەبردو بە لای پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرۆیشتو بەشی ئەوی لێدەداو، بە خۆیو بە فاتمەش بە درێژایی ڕۆژ بەو کەمە خورمایە دەیانگوزەراند.

ئا ئەوە بارو گوزەرانی ئەوان بو، وەلێ ئەوان وایان هەست دەکرد ماڵیان کاسەی پڕ ئاشتیەو، پڕی شادیو ئاسودەییو خۆش بەختیە.

دڵیان ئاوێتەی خووڕەوشتی ناوازەو ئەو پەیامە ڕاستەقینە بو کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕەوانە کراوە، ئەوان دڵیان بۆ کرداری چاك لەگەڕ دابو، لەو هەستە دەرونیە پیرۆزەدا دەژیان، کە ڕاستیو چەپەڵی یان پێ لێك جوێ [٧٠٧] دەکردنەوە، ئەوسا لە پێناوی ڕاستی تێدەکۆشانو، خۆیان لە چەپەڵی بە دور دەگرت، ڕاستیو

---

٧٠٥) پاڵتۆ/ کەوڵ.

٧٠٦) خۆی تێوە برد.

٧٠٧) جودا دەکردنەوە.

دروستیو نهێنی بابەتەکانیان دەرك پێ دەکردو، هەر شتەی بەسەنگی خۆیان هەڵدەسەنگاند.

(قارون) بەختەوەری لە کوێ بو، هێمنیو خۆشیو ئارامی (هامان) چی بەسەرهات، یەکەمیان چو بە ناخی زەویداو، ئەوی تریان نەفرەتی خوای پێ برا ﴿... كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ... وەك بارانێك شیناتیەکەی وەرزێری پێ خەنی بوەو بەرەبەرە وشك دەبێو دەبینی زەرد هەڵگەڕاوەو لە دوایی دا بوەتە کاوو کۆتی بەربا. ﴿٢٠﴾ الحديد﴾.

بەختەوەری لە لای (بیلال)و (سەلمان)و (عەمار) چنگ دەکەوێ، لەبەرئەوەی (بیلال) بانگی حەقی ڕاهێشتو، (سەلمان) لەسەر ڕاستی بناغەی دۆستایەتی دامەزراندو، (عەمار) پەیمانی بەجێ گەیاند ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِيٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ... هەر کەسیش وەك ئەوانە نەبن، ئێمە کارە باشەکانیان لێ وەردەگرینو لە گوناهیشیان خۆش دەبینو لەگەڵ بەهەشتیەکان دەبن وئەو بەڵێنەی کە پێیان دراوە ڕاستە. ﴿١٦﴾ الأحقاف﴾.

## چەند وتەی کاراشنایان دەربارەی ئارامگری

دەگێڕنەوە کە (ئەنوشێروان) گوتویەتی: هەمو ناخۆشیەکی دنیا دەکرێتە دو بەش: جۆرێکیان چارەی دەکرێ ئەوە نیگەرانیو دودڵی دەرمانێتی، چەشنەکەی تریان هیچ چارەو مەفەری نیە، ئەوە ئارامگری چارەسەرێتی.

هەندێك لە زاناو پسپۆڕان دەڵێن: چارەی ئەو شتەی چارەی نادۆزرێتەوە، ئارام گرتنە.

گوتراویشە: هەرکەسێك بە دوای ئارامگریدا بگەڕێ، سەرکەوتن بەدوای ئەودا دەگەڕێ.

یەکێکیش لەو پەندانەی لە ناو خەڵکیدا باون ئەوەیە کە دەڵێ: ئـارامگرتن کلیلـی ڕزگاریە، هەر کەسێ ئارامی بو هێـزو توانـای بـو، سـەرکەوتن بەرهـەمی ئارامگرتنـە، کاتێ تەنگانەو بەڵا زۆری هێنا هێمنیو هەداری [٧٠٨] لە دوا دێ.

گوتراویشە: لەو کاتەی خۆشیت بەسەردا دەڕژێ لە زەڕو زیان بترسێ، لـەو کاتـەی ناخۆشیت بەسەردا دێ ئومێدی خۆشیت ببێ، بە خواسـتنی مـەرگ پـێ لەسـەر ژیـان دابگـرە، چـەندین جـار بـە شـوێن دا گـەڕانی مـردن هۆکـاری مانــەوە بـوەو، خـۆ هێشتنەوەش هۆکاری لەناوچون بـوە، زۆربـەی جـار هـەدرینو هـەدادایی [٧٠٩] لـە لایـەن ترسو بیمەوە دێتە ئارا.

ئاپۆرە [٧١٠] ش دەڵێ: خراپە هەڵبژاردنی تێدایە.

(ئەسمـەعی) دەڵـێ: واتـای ئـەو پەنـدە ئەوەیـە: هەنـدێ ناخۆشـی لـە هەنـدێکیان سوکتـرن.

(ئەبو عوبەیدە)ش دەڵێ: واتای ئەوەیە: ئەگەر بەڵایەك ڕوی تێ کـردی، دڵنیـا بـە لەوە گەورەتریش هەیە، جا ئەوەی بەسەرت هاتوە بە کەمی بزانە.

هەندێ لە دانایان دەڵێن: پاشەڕۆژی کارەکان لە پاش پەردەدا وێك دەچن، جـا زۆر شتی ئارەزو خواز لە ناخۆشی دا فەراهەم دێ، زۆر شتی ناخۆشیش لە شتی خـوازراوو بەرچاودا وەپاش دەکەوێ، چەندین شادمانیو خۆشگوزەرانی بۆتە مایەی دەردەداری، چەندین کەسی بەڵاباریش چارەسەری لەو دەردەوەدەست هێناوە.

گوتراویـشە: زۆر بەهرەهـەن بەرهـەمی دەردو ئـازارن، زۆر بەخـشش‌و خـەڵاتیش بەروبومی ژینو ژارن.

(وەداعەی سەهمی) لە وتەیەکیدا دەڵێ: ئارام لەسەر ناخۆشی بگرە ئەگەر ئـازاری پـێ گەیانـدی، لەوانەیـە ئـەم تەمومـژە بڕەوێتـەوەو خۆشـیت بـۆ بگەڕێتـەوە، لـەژێر سەرتوێژ [٧١١] و سەرکەفیش شیرێکی بێ خڵتەیە.

---

٧٠٨) هێمن.

٧٠٩) سرەوتن و ئارامی.

٧١٠) خەڵکی ئاسایی.

٧١١) سەرتوێژو سەرکەف، بەو کەفەی سەر شیر دەگوترێ.

لە دوای ئەوەی گەلای ئومێد هەڵوەرا خوا دەروی خۆشی والا دەکا: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا ... تا ئەوسا کە پێغەمبەران ناهومێد بون، مەردەمیش وایاندەزانی، کە درۆیان دەگەڵ کردون، یارمەتی ئێمەیان بۆ هات. (١١٠) یوسف ﴾.

﴿ ... إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ... خوا دەگەڵ خۆڕاگرانە. (١٥٣) البقرة ﴾.

﴿ ... إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ... بێگومانە ئەو کەسانەی خۆڕاگرن، بە تەواوی‌و بە بێ حیساب پاداشی خۆیان وەردەگرن. (١٠) الزمر ﴾.

هەندێ لە نوسەران دەڵێن: هەروەکو خوای بەرزو توانـا، لەو ڕێگایەی هەند جارە [٧١٢] ڕێی ئەشکەنجەو ئازارە خۆشی‌و شادی دەهێنێ‌و، لەکاتی پچڕانی خواست‌و ئاڵۆز بونی ڕێگا چارەکان دەروی خۆشی دەکاتەوە، تاوەکو هەمودروست کراوەکانی هان بدا لەسەر ئەوەی هیواو ئومێدیان تەنیا بە ئەو بێ‌و، هەست‌و ویستیان بۆ پشت بەستن بە خوا یەك لاکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستەی لە گەورەیی‌و شکۆداری خۆی بۆی هەڵبژاردون، هەروەها هیچ کاتێك ڕوی خۆیان لە چاوەڕوانی حەسانەوەی ژێر سایەی ئەو وەرنەگێڕن، لە هیچ بوارو حاڵەتێك دا، بە ئومێدو خواستیان لەو ئازادیەی لێی چاوەڕێ دەکرێ خۆیان هەڵنەبوێرن [٧١٣]، هەر بەو شێوەیەش لەمەڕ ئەو ناخۆشیەی بەسەریان دێنێ دڵیان خۆش دەکا، کە بەوەندە بەلایە لێیان گەڕاوەو، بەلای گەورەتریش هەبوکە پێی گرفتار بونایە، ئەوەندە نسکۆیەشی کردۆتە بەلا گێڕەوەی کارەساتی چاوەڕوان کراوی گەورەتر.

(ئیسحاق عابید) دەڵێ: زۆر جاران خوای گەورە بەندە بە مەینەتیەك تاقی دەکاتەوە بە سای ئەو تاقیکردنەوەی لە تیاچون ڕزگاری دەکا، جا ئەو مەینەتیە بۆ ئەو دەبێتە گەورەترین خەڵات.

---

٧١٢) واباوە/ لەناو خەڵك وازاندراوە

٧١٣) خۆلانەدەن.

ئەو وتەیەش دا دراوە: هەرکەسێ بەرگەی ئازارو ئەشکەنجە بگرێ، لەو بارە نالەبارەی خوا بەسەری هێناوە ڕەزامەندی بنوێنێ، لەسەر ئەو ناخۆشیە دان بە خۆدا بگرێ، خوای گەورە پەردەی لەسەر قازانجەکەی هەڵدەداتەوە، هەتاوەکو دەرەنجام تێدەگا ئەو شتە نادیارە لە بەرژەوەندی ئەودا بوە.

لە هەندێ لە دیانەکان [٧١٤] دەگێڕنەوە کە چەند پێغەمبەرێك سڵاوی خوایان لەسەر بێ گوتویانە: ئەشکەنجەو ئازار پەند دادانێکە لەلایەن خواوە، ئەو تەمێ کردنەش زۆر بەردەوام نابێ، جا خۆشی لەو کەسەی ئارام لەسەر ئەو تەمێ کردنە دەگرێو، خۆی لەبەر ڕادەگرێ، ئەوسا تانجو زەرگەنجی [٧١٥] زاڵ بونو سەرکەوتن دەخاتە سەر، کە خوا بەڵێنی بە خوا پەرستانو دۆستانی خۆی داوە.

(ئیسحاق) دەڵێ: وریا بە بێزاری نەت گرێ، کە نیشانەی بەڵاو مەینەتی بەرەو ڕوت دێو مەرگەساتو کارەسات چڕنوکت لێ دادەگرێ، بێ گومان کامە ڕێگە دژوارە هەر ئەویانە ڕێگە چارە.

## نیەت پاکی بەرامبەر خوا بێ ئومێدت ناکا

(( انا عند ظن عبدي بي، فليظن بي ما شاء ... خوا لە فەرمودەی قودسیدا دەفەرموێ من لەگەڵ ئەوە نیەتەی بەندەی خۆمم، کە بە منی دەبا، جا چ نیەتێکم پێ دەبا بابیبا)).

هەندێ لە نوسەرانیش ئەو وتەیان گوتوە: ئومێدەواری کەرەستەو پاڵپشتی ئارامگرتنە. بە هەمان شێوە نیەت پاکی بەرامبەر بە خوا، هۆکارو کەرەستەی ئومێدەواریە، ئەو نیەت پاکیەی ڕێی تێ ناچێ مرۆ هیوا بڕ بکا، ئێمە پیاو ماقوڵو ناوداران سەرنج دەدەین، بینیومانە ئەو کەسەیان لا بەرزو بەڕێزە نیەتی بەرامبەریان پاکە، ئەو کەسەشیان لا خراپە گومانی لە ئاستیاندا خراپە، بە سای تێشکانو نشستی دڵیان پەنگ دەخواتەوەو بە ئومێدن یەکێ بەلایانەوە بچێ، چ جای

---

٧١٤) مەسیحی/نەسرانی.

٧١٥) تانج.

ئەو خوایەی لە هەموکەس بەخشندە ترە، ئەو خوایەی هەتا بە دۆستانی خۆی ببەخشیٚو ئەوانیش چاویان لە دەرگانەی ئەو بیٚو ئومێدیشیان هەر بە ئەو بیٚ، گەنجینەی بەر فراوانی دوایی نایێ.

ڕاسترین گەواهیو بەڵگە لەسەر پێخۆشی خوای بیٚ هاودەمو هاوتا بەوەی بەندەی دەست بە میهرو سۆزی وەبگریٚ، چاوەڕیٚ بیٚ لە ژێر سایەو سێبەری بەخشندەیی ئەو هەنیسکیٚ بداو وەحەسیٚ، ئەوەیە: مرۆڤ ڕزگاریو سەرفرازی وەدەست نایینیٚ، مەگەر لەدوای ئەوەی هیواو هومێدی لە هەمو شتیٚ ببڕیٚو خۆزگەو خواستەکانی بەرەو خوا بیٚ، مەگەر لەوکاتەش دەرگای ئاواتەکانی دادەخرێنو، تواناو ڕێگەچارەی لیٚ دەبڕێنو، گەورەترین دەردو بەڵای بەسەر دێن، تاوەکو هاندەرێك بیٚ لەسەر ئەوەی هەمیشە چاوو ئومێدی لە خوای بەرزو بیٚ هاوتا بیٚ، بەربەستێکیش بیٚ لەڕێی ئەوەی نیەتو گومانی بەرامبەر خوا ناپاك بیٚ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ... ئەوانەی، کە -بێجگە لە خودا- ئێوە هانایان پیٚ دەبەن، عەبدە گەلێکن وەك خۆتان. دەسا ئەگەر ئێوە ڕاستن، بانگیان بکەن با وەرامتان بدەنەوە. (١٩٤) الأعراف ﴾.

## کەسی ئارامگر باشترین بەرهەم وەدەست دێنیٚ

ئەو قسەیەش لە (عبدالله)ی کوڕی (مەسعود)ەوە دەگێڕنەوە کە دەڵیٚ: سەرکەوتنو سەرفرازی لە دڵنیاییو ڕەزامەندی چنگ دەکەویٚ، خەمو پەژارەش لە توڕەییو دو دڵی وەپاش دەکەویٚ.

هەروەها دەڵیٚ: کەسی ئارامگر بە باشترین ئەنجام دەگا.

(ئەبانی)ی کوڕی (تەغلیب) دەڵیٚ: گویٚ بیستی عەرەبێکی خێڵەکی بوم دەی گوت: بەرزترین دابو نەریتی جوان مەردان ئەوەیە ئەگەر یەکێکیان دوچاری کارەساتیٚ هات بە ئارامگری بەرگەی دەگریٚ، دڵو دەرونی خۆی وا لەسەر ئومێدی ڕزگاری ڕادێنیٚ، هەروەکو بڵێی سەرکەوتنو فریادڕەسی بە چاوی خۆی دەبینیٚ، سەبارەت

بەوەی نیەتی بەرامبەر خوای بەرزو بێ هاوتا پاکەو، پشتیشی هەر بەوی قایمە، جا هەر ساتێ دەستی بەو خو ڕەوشتەوە بگرێ، زۆری پێ ناچێ خوای گەورە پێ داویستیەکانی جێ دەهێنێو، خەمناکی دەڕەوێنێو، خۆزگەو خواستی وەدەست دێنێو، دین‌و ئابڕوو پیاوەتیشی لە جێی خۆیدا دەمێنێ.

(ئەسەمعی) لە عەرەبێکی کۆچەری دەگێڕێتەوە کە گوتویەتی: لە هێمنایی‌دا لە ناخۆشی بترسێ، لە تەنگانەشدا ئومێدی خۆشیت ببێ، زۆر جاران خۆشگوزەرانی بەرهەمی خۆزگەی مردنە، هۆکاری مەرگیش بە دوادا گەڕانی ژیانە، زۆربەی جارانیش هێمنی‌و ئارامی لە لایەن ترس‌و تۆقین هاتۆتە ئاراوە.

هەندێ لە زانایانیش دەڵێن: مەردمی ژیر کاتێ توشی نسکۆیێ هات بە دو شتان دڵنەوایی خۆی دەکا: یەکەمیان: دڵ شادە بەوەی لە دەستیدا ماوە.

دوەمیان: ئومێدی وایە لەوەی بەسەری هاتوە ڕزگاری بێ.

مرۆڤی نەفامیش: لەمەڕ بەڵاو ناخۆشی خۆی، بە دوشتان هەراسان دەبێ: یەکەم: ئەوەی داڵدەی [٧١٦] داوە بە زۆری دەزانێ. دوەم: لەوەش دەترسێ خراپتری بەسەر بێ.

گوتراویشە: خوای بێ هاودەمو هاوتا بە ناخۆشیان دروستکراوانی خۆی تەمێ [٧١٧] دەکا، تەمێ کردنی خوای گەورەش کلیلی گوێچکەو چاوو دڵەکانە.

(حەسەن)ی کوڕی (سەهل)یش پێناسەی گێچەڵ‌و ناخۆشیان دەکاو دەڵێ: بەڵاو مەینەتی: مرۆ لە گوناهان بژار دەکا [٧١٨]، نا ئاگایان وەهۆش دێنێ، بەهۆی ئارام گری خەڵاتی خوا وەدەست دێنێ، بەهرەی خوا وەیاد دەخاو، وادەو بەڵێنی خوا پێویست دەکا، قەزاو قەدەری خوای دەستەباڵاش دەستە گوڵی لێدەدا.

فەرمو ئەوە کەسێکە لای وایە ئەگەر مردن لەخۆی بەدور بگرێ لێی بەدور دەبێ، ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُواْ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلْ فَٱدْرَءُواْ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ... ئەوانەی کە خۆیان نەچوبونە خەزا، لەمەڕ هاوەڵانیان دەگوت:

---

٧١٦) لەخۆی گرتوە.

٧١٧) تەمبێ/ پەند دادان.

٧١٨) پاك دەكاتەوە.

ئەگەر بە قسەیان نەکردباین نەدەکوژران. بێژە: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆ لە مردن بپارێزن. ﴿١٦٨﴾ آل عمران ﴾.

چەند وتەیەك بۆ هێورکردنەوەی کۆستەکان: هەندێ لە بازرگانە تێگەیشتوەکان دەڵێن: سەر سەلامەت بێ، زیانی ماڵی هیچ نیە.

عەرەبیش گوتویانە: ئەگەر پشقل [٧١٩] بە ساخی دەرچێ، بەرخۆڵە لە کیس دەچێ [٧٢٠]. وتەیەکی تریشیان هەیە دەڵێن: بێ ئومێد مەبە زەویەکە لە ساختمانە [٧٢١]، ئەگەر چی لەو کاتو ساتەدا بێ نرخە.

ئاپۆڕەش دەڵێ: ڕوبارێك ئاوی لەبەر بڕوا هەردەیهێتەوە جێ.

سامستیۆس) دەڵێ: ژیریارو دینداران تەنیا بەوە گرۆی خۆیان بردۆتەوە لەو کاتەی دەسەڵاتدارو بەهرەدارن چاکە کاری دەنوێنن، لە کاتی تەنگانەو ناخۆشیشدا دان بە خۆیان دادەگرن.

## سەرنجێك

﴿... إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ... ئەگەر ئێوە لەوان توشی ئازار دەبن، ئەوانیش -هەروەکو ئێوە- لە ئێوە ئازار دەبینین. ئێوە هومێدو خودایە، ئەوان ئەمەشیان نیە. ﴿١٠٤﴾ النساء ﴾.

بۆیە لەو کاتەی بڕواداره ڕاستەقینەکان دوچاری دەردو بەڵاو نیگەرانی دێن، بە شێوەیەکی وا ئارامگریو پێ داگری، هێمنو هەداریو، جێبەجێکردنی مافی خوایان لێ وەدی دەکرێ، کە دەیەك لە دەیەك ئەوەندە

لە خەڵکی تر وەدی ناکرێ، هەر سەبارەت بەوەی دڵنیاییو باوەڕداریان هیچی خۆ لەبەرناگرێ.

---

٧١٩) پشقل/ تەرس.

٧٢٠) واتە دەبێ هەندێ شت بەقوربانی هەندێکی تر بێ.

٧٢١) لە ئاوادانیە.

لە (مەعقەل) کوڕی (یەسار)ەوە دەگێڕنەوە - خوای لێ ڕازی بێت - دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((**يقول ربكم تبارك، تعالى: يا ابن ادم، تفرغ لعبادتي املأ قلبك غنى، واملأ يديك رزقا، يا ابن ادم، لا تباعد مني، فاملأ قلبك فقرا، واملأ يديك شغلا...** خوای بەرزو توانااتان دەفەرموێ: ئەی وەچەی ئادەم، خۆت بۆ بەندایەتی من یەك لاکەوە دڵت پڕی دەوڵەمەندی دەکەم، دەستەکانت لە ڕۆژی تەژی [٧٢٢] دەکەم، ئەی ڕۆڵەی ئادەم، خۆت لە من بە دور مەگرە، ئەگینا دڵت پڕی هەژاری دەکەم، دەستەکانت ماندو شەکەت دەکەم)).

(گەڕانەوەی لای خوای بێ هاوتاو ڕو تێکردنی، قایل بون بە بەشی خۆتو ڕەزامەندی لێ نواندنی، هۆگری بە یادی ئەوو، دڵ ئاودانی بە خۆشویستنی، حەسەناوەو سرەوتن بە سای ناسینی، خۆشیو شادیو خەلاتێکی دەست بە جێن، لەگەڵ گوزەرانی هیچ پاشاو دەسەڵاتدارێکدا بە هیچ جۆرێ هاوشان ناکرێن).

## ئەگەر دەست کورتو نابوت بوی پەرۆش مەبە، سەنگو ڕێزی تۆ شتێکی ترە

(عەلی) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: هەمو کەسێ هەتا چاکە کارە ڕێزدارە. جا نرخو بەهای زانا کەم تا زۆر لە زانستەکەیدا، ڕێزی هۆنەری لە هۆنراوەکەیدا وەدی دەکرێ جا هۆنراوەکەی بە پێز بێ یا بە پێز نەبێ.

هەر خاوەن پیشەو بەهرەیەك لە لای مرۆڤەکان تەنیا بە گوێرەی ئەو پیشەو بەهرەیە هەڵدەسەنگێنرێ، ئەوسا بەندە با هەوڵ دا بە سای کردەوەی چاكو، زانستو زانیاری، بەخشندەییو بیروهزری، شارەزاییو بلیمەتی، لێکۆڵینەوەو بەردەوامی، بەدوادا گەڕانی شتی سودمەندو پێ لەسەر داگرتنی، بەرفرەکردنی هەستو ژیریو تیژ کردنی بیرو هزری، هەڵگیرسانی ژیلەمۆی ڕۆحو ئاوەدانی دەرونی، نرخو بەهای خۆی بنرخێنێ، تاوەکو قەدرو ڕێزی بەرز ڕابگرێ.

---

٧٢٢) پڕ.

## خەم هەڵمەگرە، دڵنیا بە دەتوانی لە سونگەی کتێب خوێندنــەوە پــەرە بــە بەهرەو تواناکانت بدەی

کتێب خوێندنەوە زەینو هۆش بەر هەڵ دەکا، پەندو ئامۆژگاری دادەدا، بە وتـەی نەستەق دەستی خوێنەر باڵا دەکا، زمـانی لوسو پـاراو دەکـا، بـەهرەی بـیر کردنــەوە گەشە پێ دەدا، بنجو بناوانی ڕاستی وەدەردەخاو، گومانو دو دڵی لادەبا، بۆ تـەنیایی خەم ڕەوێنە، گفتو گۆی هەستەکانو، وتوێژی شەو کۆڕانە[٧٢٢].

بۆ کەسـی سـەرنـج دەر سـەرنـج ڕاکێـشە، بـۆ شـەوڕۆیان چـرایە، هەرچـەند جارەی دوبـارە بکرێتـەوەو لێـك بدرێتـەوە، بـژار بکـرێ، درەختەکـەی بـەری دەگـرێو کـاتی هەڵچنینی دێ، هەروەها ئەو درەختە لەسەر پێی خۆی دەوەستێ، لە هەمووەرزێکا بە یارمەتی خوا وەبەر دێ، گومان لەو هەواڵە نیەو وادەو بەڵێن هەردێتە جێ.

وازهێنانو پشت هەڵکردنیش لە خوێندنەوە، لـێ دوربونـەوەو خـۆ دورخـستنەوە، گرێدانی زمانەو، کورت هەڵێنانی سروشتو، وەسـتاندنی هەسـتەکانە، خـاو بونـەوەی بیروژیریو، سەربڕینی خواستەکانە، پوکانەوەی دەستمایەی زانـستو، وشـکبونەوەی سەرچاوەی هزرەکانە، هیچ کتێبێکیش نیە کـەڵكو سـودو نمونـەو وتـەو داسـتانێکی خۆشی تێدا نەبێو، دەستەواژەیەکی هەست جوڵێنو ناوازەی لـێ پەیدا نەبێ.

سەرەڕای ئەوەش سودو قازانجی خوێندنەوەکەش لە ڕادەبـەدەرە، پـەناش دەگـرین بە خوا لە مردنی تواناو هێزو، بێ سەر بونی وزەو ورەو، ساردو سڕی ڕۆحەکان، بـە ڕاستی ئەوەیان گەورەترین دەردو بەڵایە.

---

[٧٢٢] کۆڕی شەوان.

## سەخڵەت مەبە، دروست کراوە سەرسورهێنەرەکانی خوا لەم گەردونە وەخوێنەوە

نەخش‌و نیگاری بێ وێنەی خوا لەم زەمینە ئاوەدانە سەرنج بدە، شتی ناوازەی سەرسوڕمێن دەبینی، هەرچی مەینەتی‌و کڵۆڵی هەیە دەی تارێنی، بێ گومان دڵ‌و دەرون بە بینینی دیمەنی دڵڕفێن دەگەشێتەوە.

(بوخاری)و (موسلیم) لە (جابر)ی کوڕی (عبدالله دەگێڕنەوە - خوا لێی ڕازی بێ - کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی کاروانێکی (قوڕەیش) ناردو، (ئەبو عوبەیدە)شی کردە برا گەورەمان، جۆرکە قەسپێکیشی وێداین کە هەر ئەوەندە توێشوی ڕێمان بو، (ئەبو عوبەیدە) دانە دانە قەسپی بەسەردا دابەش دەکردین.

ئەو کەسەی لە (جابر)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوتم: باشە ئێوە چیتان لەو دەنکە قەسپە دەکرد؟ ئەویش گوتی: هەروەکو منداڵ دەمان مژی، دوایی ئاومان بەسەردا دەکرد، ئەو ڕۆژە هەتا شەو بەشمانی دەکرد، هەروەها بە داردەستەکەمان گەڵای دارمان دەوەراندو تەڕمان دەکردو دەمان خوارد.

دەڵێ: لە کەناری دەریاوە دەڕۆیشتین لە ناکاو شتێکمان لێ بەدیار کەوت لەسەر شێوەی ئەو تەپۆلکە [٧٢٤] گەورەو درێژە بو، کە لە لم گرد دەبێتەوە [٧٢٥]، بۆ لای چوین سەیرمان کرد نەهەنگێکی زۆر گەورەیە. دەڵێ: (ئەبو عوبەیدە) گوتی: ئەوە مردارەوە بوە. دوایی هەر خۆی گوتی: نەخێر، بەڵکە ئێمە نێرراوی پێغەمبەری خواین ﷺ لە پێناوی خواشدا هاتوین، ئێوەش لە بێچارەییان بیخۆن [٧٢٦].

---

٧٢٤) گرد/ گومەز.

٧٢٥) خڕدەبێتەوە.

٧٢٦) لەوکاتە نەیاندەزانی کە گیانەوەری دەریایی مردار نابێ، ئەو فەرمودەیان نەبیستبو، کە دەفەرموێ: دەریا ئاوەکەی پاکە و مردارەوە بوی حەڵاڵە.

دەڵێ: ئێمەش، کەسێ سەد کەس بوین یەك مانگ لێمان خوارد هەتاکو قەڵەو بوین. دەڵێ: خۆمانم دەدیت لە ناو کلۆرایی چاوی بە ئەسکۆێ [٧٢٧] لێمان دەکردەوەو، بە سەتڵی گەورە دونگو بەزمان لێ جیا دەکردەوەو، پارچەی گەورەی وەکو گاجوتمان لێ دەکردنەوە.

(ئەبو عوبەیدە) سێزدە کەسی لە ئێمە بۆ کونە چاوێك تەرخان دەکردو، هێسکە پەراسوی لێ دەکردنەوەو ڕاستی ڕادەگرتو، بە وشتری هەرە گەورەی دەگوازتەوە، دەیڕوانی کامە پیاو لە هەمان درێژترە لەسەر شانی دائەناو ئەویش لە ژێری دەڕۆیی [٧٢٨].

گۆشتەکەشمان وشك دەکردەوەو هەڵمان دەگرت، کاتێ گەڕاینەوە مەدینە، هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سەرگوزەشتەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرموی: "ئەوە ڕۆزیەك بوە خوا پێی داون، ئایە هیچ گۆشتتان لە لایە بیدەن بە ئێمەش؟ دەڵێ: جا هەندێکمان بۆ پێغەمبەری خوا برد ﷺ ئەویش لێی خوارد [٧٢٩].

﴿... ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. ﴿٥٠﴾ طه﴾.

کاتێ دانەوێڵە بە زەوی وەردەکرێ، هەتا ئەو زەویە بە سوکی نەهەژێو نەلەرزێ دانەوێڵەکە شین نابێ، کە هەژا دەنکەکە دو لەت دەبێو شین دەبێ، ئەمەشیان بە ئامێری (ڕەختەر) تۆمار کراوە: ﴿... فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ ... هەرگا بارانمان لێ باراند دەهەژێو گەشە دەکا. ﴿٥﴾ الحج﴾.

﴿... ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە، کە بە هەمو دەسکردێ خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. ﴿٥٠﴾ طه﴾.

---

٧٢٧) کەوگیر/ چەمچە / کەوچکی گەورە / یا هەر شتێ گۆشتی پێ لێکراوەتەوە.

٧٢٨) ئەوە وا دەگەیەنێ پراسوی درێژ بوە.

٧٢٩) چونکە نەهەنگ مردار نابێ.

(ئەبو داود) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (السنن) لە باسی زەکاتی کشتوکاڵدا دەڵێ: لە (میسر) خەیارێکم پێوا سێزدە بست بو، هەروا بینیم کە بادێك [٧٣٠] دولەت کرابو لەسەر پشتی وشتر پێچرا بو وەکو دو لا بار دانرا بو.

﴿... ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

دکتۆر (زەغلول نەجار) لێکۆڵەرەوەی ئایەتە گەردونیەکان، لە لێدوانێکیدا باس دەکا، کە چەد ئەستێرەیەك هەن هەزاران ساڵە لە شوێنی خۆیان دەرچون بەرەو زەوی، خێرایشیان بە قەد تیشکی خۆرە، کەچی ئێستاکەش نەگەیشتون، تەنیا شوێنەکانیشیان ماون، ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ... دەسا سوێندم بەو شوێنانەی ئەستێرەیان لێ هەڵدێنو ئاوا دەبن. (٧٥) الواقعة﴾.

﴿... ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

لە ڕۆژنامەی "الاخبار الجدیدە" لە ژمارەی ٣٩٦ی بەرواری ١٩٥٣/٩/٢٧ز لە لاپەڕە (٢)دا هاتوە: کە (ئیمرۆ بەیانی "ئونا" وەکو کەسێکی داگیرکەر گەیشتە ناو شاری پاریس، دەیان کەسی پۆلیس بە سواریو بە پیادە پاسەوانو یاساوڵی [٧٣١] بون. بەڵام "ئونا" ئەو نەهەنگە زەبەلاحو مۆمیاکراوەی نەڕویجی بو، کە کێشی ٨٠٠٠٠ کیلۆ بو، لەسەر دە ڕاکێشەری لێکبەستراو بە بار هەڵگرێکی گەورەوە بار کرابو، بۆ ماوەی یەك مانگ ئەو ماسیە پیشان دەدرێو، ڕێگا بە خەڵکی دەدرێ بچنە ناو هورگی، کە بە کارەبا ڕوناك کرابو، بە یەك جار دە نەفەر دەتوانن بەیەکەوە بچنە ژورێ).

بەڵام سەرپەرشتیارانی پێشانگای "ئونا"و پۆلیسی شار لەسەر ئەو شوێنە پێکنەهاتن کە ماسیەکەی لێ دابنرێ، لەوە دەترسان لەسەر وێستگەی شەمەندەفەری زەمینی دابنرێو شەقامەکەدا برمێ.

---

٧٣٠) وەکو لیمۆ وایە، بەڵام چەند جارە گەورەترەو کەمێکیش تاڵە.

٧٣١) پاسەوانی بون.

ئەگەر چی تەمەنی ئەو نەهەنگە لە ١٨ مانگ تێپەڕی نەدەکرد، درێژیەکەی ٢٠ مەتر بو شەمەندەفەری تایبەتی بۆ دروست کرابو تاوەکو بەناو ئەوروپادا گەشتێکی پێ بکرێ بەڵام لە ژێریدا تەپی، دوای ئەوە ئۆتۆمۆبیلێکی ڕاکێشەریان بۆ دروست کرد کە درێژایی ٣٠ مەتر بو....

﴿... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. ﴿٥٠﴾ طه﴾.

مێرو لە هاویندا خۆراکی خۆی دابین دەکا، چونکێ لە زستاندا ناتوانێ بە دەرڕاوەربێ، ئەگەر مەترسیشی لەوە هەبێ دەنکەکە شین بێتەوە، دو لەتی دەکا، مار لە بیاباندا ئەگەر خواردنی دەست نەکەوێ، خۆی وەکو دارێك دەچەقێنێ، ئەوسا باڵندەی لەسەر دەنیشێو دەیخوا.

﴿... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. ﴿٥٠﴾ طه﴾.

(عەبدول ڕەزاقی سەنعانی) دەڵێ: گوێم لە (موعەمەر)ی کوڕی (ڕاشید)ی بەسری بو دەیگوت: لە (یەمەن) هێشوە تریێکم بینی، بارە هێسترێکی تەواو دەبو.

﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ... دارە خورمای بەرزە باڵاش بە هێشوی بزمار کوتەوە [٧٣٢]. ﴿١٠﴾ ق﴾.

هەمو دارو درەختو گژوگیایەك لە یەك سەرچاوە ئاو دەدرێن ﴿... وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِى ٱلۡأُكُلِۚ ... تامو چێژی برێکیان بەرانبەر بە برێکی تر، وە سەر دەخەین. ﴿٤﴾ الرعد﴾.

هەر ڕوەکەی بە شێوەیەکی تایبەتیش بەرگری لەخۆی دەکا، هەیە خۆی لە خۆیدا توندو بەندە، هەیانە دڕکەکانی پاسەوانە، هەشیانە تاڵو تیژە.

---

٧٣٢) بزمار کوتە، جۆرە هێشوێکە.

﴿... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەردەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

(کەمالەدینی ئەفودی) میسری لە کتێبەکەیدا بەناوی "الطالع السعید الجامع نجباء انباء الصعید" دەڵێ: لە (ادفونا)ی شاری خۆماندا، هێشوە ترێیکم بینی، قورسایی بەقەد هەشت (ڕیتڵ)ی (لەیسی)ی بو، هەریەك دەنكیشی ئەوەندەی دوازدە دەرهەم بە سەنگ بو".

﴿... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەردەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

زانا گەردون ناسەکان دەڵێن بونەوەر وەکو فودانە[٧٣٣] هەمیشە جار لە دوای جار فراوان دەبێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ... ئەم ئاسمانەشمان بەهێزی خودی خۆمان وەدی هێناو بێ سۆپەرەشی پێدەدەین. (٤٧) الذاريات﴾.

باسیش لەوە دەکەن کە وشکانی کەمدەبێتەوەو زەریاکانیش بەرفرە دەبن، ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَاۚ ...ئەم زەمینە - لە گشت لا- کەم دەکەینەوە. (٤١) الرعد﴾.

﴿... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەردەی ئێمە ئەو کەسەیە کە بە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

لە گۆڤاری "الفیصل" دا لە ژمارەی ٦٢ی ساڵی ١٤٠٢ کۆچی لە لاپەڕەی ١١٢ وێنەی کەڵەمێکی[٧٣٤] پێچراوەی لێدراوە کە کێشی ٢٢ کیلۆگرامەو، قەبارەشی یەك مەترە، بە هەمان شێوە وێنەی سەلکە پیازێکی وشکی لێدراوەو، ٢ هەتا ٣ کیلۆ گرام گران دەبێ قەبارەشی ٣٠ سانتیمەتر دەبێ.

---

٧٣٣) ئەوە منداڵ فوی تێدەکا کاولێك دەچێ.

٧٣٤) کەلەرم / کەڵەم / کەلەم.

ئـەو گۆڤـارە دوا بـە دواى ئـەوە بـاس لـە تەماتەيـەك دەكـا كـە قەوارەكـەى ٦٠ سەنتيمەتر دەبێ، ئا ئەو شتە نامۆيانە، كە لە كێڵگەى جـوتێرى مەكسيكى "جوزيـە كارمن" شين دەبن كە خاوەنى ئەزمونێكى ئەوەندە زۆرە لـە زەوىو زارو كـشتوكاڵدا وايلێكردوە پلەى يەكەمى جوتێرى وەدەست بێنێ لە مەكسيك.

﴿ ... ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرندەى ئێمە ئـەو كەسـەيە كـە بـە هەمو دەسكردى خۆى هەمو پێداويستى داوە، پاشانيش ڕێى نيشان داوە. (٥٠) طه ﴾.

لە كەللەى سەريشدا چوار شـلەمەنى هـەن؛ لـەناو دەمـدا ئـاوێكى شـيرين هەيـە بـە سوكو سانا خـواردنو خواردنـەوە ئـاوا دەكـا ئـاوى نـاو لـوت لـيچو لينجـە [٧٣٥] تـاوەكو لێنەگەڕێ تۆزو تاڵ هەوراز بچێ. ئاوى ناو چـاو سوێرە لـێناگەڕێ چـاو وشـك بـێ. ئاوى ناو گوێچكە تاڵە، لـەڕوى جرۆوجانـەوەر[٧٣٦] مەتاڵـە [٧٣٧] ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ... هەروەها لەناو خۆشتاندا (بەڵگەى زۆر هەن)، ئاخۆ لەخۆتان ناڕوانن؟ (٢١) الـذاريات ﴾.

(ئەبو فەزل- عەبـدوڕەزاق)ى كـوڕى (فـوتى) مێـژوناس، لـە كتێبەكەيـدا (الحـوادث الجامعة، التجارب النافعة في المائة السابعة)، باس لە ڕوداوەكانى ساڵى ٦٣٧ دەكاو دەڵێ: لەو ساڵە بـەرگدروێكى عەجەمى هەبو، خزمـەتكارى (ئـەمير جەمالـەدينى قەشـتمر) بو، هاوسێيەكى بەمە قەست زامدار كردبو مرد.

جـا ئـەو بەرگـدروە لـە بەرگدرويـدا زۆر زانـاو دانـا بـو، كـارى زۆر سەرسـوڕمێنى دەكرد، يەكێ لەوان، خۆى بەند كردبو، پارچە كوتاڵێكى هەڵنەبڕاويـشى لـە لابـو، لـە بەرابەرى دەرگاى ماڵى (جەمالەدين) لە كاتى ڕۆژئاوا سندوقێكى هەڵدەواسى، پاشان لە كاتى بەيانيدا سندوقەكەى لێ دەكردەوە كاتێ سەرى سندوقەكەيان هەڵدەدايەوە، دەيانبينى بەرگەكـەى هـەڵبڕيوەو، دوريـەوەو، قەديـشى كـردوە، كۆمەڵـە خـەڵكێك لـە دواى ئەو هەوڵياندا وەكو ئەو بكەن بەڵام نەيانتوانى.

---

٧٣٥) ليـق.

٧٣٦) زيندەوەرى وردەواڵە.

٧٣٧) لێناگەڕێ بچنە ناو گوێچكە.

لەگەڵ ئەوەی بەرگدرو پیاوێکی بە ساڵ داچوی شەتو خوارو باڵا کورتو پشت چەماوە بو، لە سەردەمی خۆیدا هیچ کەس لە بەرگدرویدا شانی لە شانی نەئەدا، کەسیش نەیتوانی ڕێگای ئەو بگرێتەبەر.

﴿... وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ... زۆر شتی وای فێری تۆ کرد کە تۆ پێشو نەتدەزانین. (١١٣) النساء﴾.

﴿عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ... مرۆی لە شتێ ڕاهێنا کە زوتر پێی نەزانیبو.(٥) العلق﴾.

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ... خودا ئێوەی لە پزدانی [٧٣٨] دایکتانەوە وەدەرخست، کەچی هیچو نەدەزانی. چاو گوێچکەو دڵی دانێ. (٧٨) النحل﴾.

﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ ... فێریشمان کرد زرێتان بۆ دروس بکا. (٨٠) الأنبياء﴾.

﴿بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ... نەخێر ئەوان شتێك بە درۆ دەزانن، کە هیچی لێ تێناگەییونو بۆشیان لێك نەدراوەتەوە. (٣٩) یونس﴾.

﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ آيَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ... هەر نیشانەیەکی خۆمانی نیشانی ئەوانە دەدا، لە نیشانەکەی پێشەوە گرنگتر بو. (٤٨) الزخرف﴾.

شێخ (شەهابەدین) (ئەحمەد)ی کوڕی (ئیدریس)ی (قیرافی) میسری دەڵێ: پێم گەیشت، کە "مەلیك کامل" مۆمدانێکی [٧٣٩] بۆ دروست کرا -، کە ستونێکی [٧٤٠] درێژی لە مس دروست کراوە، چەند شوێنێکی هەن بۆ ڕوناکی مۆمی تێدا هەڵدەگیرسێنن- مۆمدانەکە بەو شێوەیە بو هەر کە ساتێك لە شەو تێدەپەڕی کاتژمێرێك بە دیار

---

٧٣٨) منداڵ دان.

٧٣٩) ئەوەی مۆمی تێدا هەڵدەکرێن.

٧٤٠) وەگۆڵەکە / ڕاستو ڕاست.

دەکەوت، پەیکەری پیاوێکی لێ دەهاتە دەرێ، کە لە خزمەت پاشا وەستا بو، کاتێ دە کاتـژمێر لـە شـەو دەڕۆیـشتن، پەیکەرەکـە لـە سـەروی مۆمدانەکـە بـەدیار دەکـەوت‌و دەیگوت: خوا بە خێرو خۆشی بەیانی لە پاشادا هێنـا. ئەوسـا دەیـانزانی کـە بـەیانی داوە.

قەڕافـی دەڵـێ منـیش دەسـتکاری مۆمدانەکـەم کـردو، وام لێکـرد لـە هـەمو کاتژمێرێکـدا ڕەنگـی مۆمەکـە بگـۆڕێ، پەیکـەری شێرێکیـشی لـەناو دابـو، هـەردو چاوەکانی لـە زۆر ڕەشـیەوە بـەرەو سـپییەکی زۆر دەچـون، لەویـشەوە بـەرەو سـورێکی تاریــك، لەهــەر کاتژمێرێکــدا ڕەنگێکــی دەدا، دو وردە بــەردیش لــە دو باڵنــدە هەڵدەوەران.

کەسێك دەچۆ ژورێ‌و کەسێکی تر دەهاتە دەرێ، دەرگایـەك دادەخـراو دەرگایـەکی تر دەکرایەوە، هەر کە بـەیانی دەدا پیاوەکـە لـە سـەروی مۆمـدان بـەدیار دەکـەوت‌و، دەسـتی بـە بنـا گوێـوە بـو، ئامـاژەی بـەوە دەدا کـە کـاتی بانگدانـە، بـەڵام نـەمتوانی وەقـسەی بێـنم، دوای ئـەوە وێنـەی ئـاژەڵێکم دروسـت کـرد دەڕۆیـی بـە لای ڕاسـت‌و چەپیدا ئاوڕی دەدایەوەو، فیکەی دەکێشـاو قسەی نەدەکرد.

﴿... ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ... پەروەرنـدەی ئێمە ئـەو کەسـەیە کـە بـە هەمو دەسکردی خۆی هەمو پێداویستی داوە، پاشانیش ڕێی نیشان داوە. (٥٠) طه﴾.

تەنیا سەرپێچی پەروەردیار دڵ دەخاتە پەستی‌و تەنگی، حەسەنی بەسرایی دەڵێ: ئەی بنیادەم، (موسا) سێ جار سەرپێچی لە خدر کرد پێی گوت: وا پەیوەندی نێوانی من‌و تۆ پچڕا. بە خۆت دەڵێی چی کـە ڕۆژانـە چـەندین جـار سەرپێـچی پـەروەرێنت دەکەی، لەوە ناترسی پێت بڵێ: وا پەیوەندی نێوانی من‌و تۆ پچڕا.

## خوایـــە هــاوارە خـوایە هــاوارە

﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ... بێـژە، خـوا ڕزگـارو دەکـا لـەو تەنگانـەو لـە هەمو بەڵایەکی دیش. (٦٤) الأنعام ﴾.

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ... مەگەر هەر خـودا بـەس نیـە کـە ئاگـای لـە عەبـدی خۆی بێ؟ (٣٦) الزمر ﴾.

﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ... بێـژە، کـێ ڕزگارتـان دەکـا لـە تـاریکی وشکانیو دەریا؟ (٦٣) الأنعام ﴾ .

﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ... بڕیارنــــدا ئەوانــــەی لـــەو زەمینەدا زەبون کران، بە چاکە ومیانخوێنین. (٥) القصص ﴾.

لەمـــەڕ ئـــادەمیش دەفـــەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ... پاشـــان پەروەندەی، ئەوی هەڵبژاردو پەژیوانی قبوڵ کردو ڕێی نیشاندا. (١٢٢) طه ﴾.

بـــە نـــوح دەفـــەرموێ: ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ... خـــۆو کـــەس‌و کارەکەیمان لە خەمی گەورە ڕزگار کرد. (٧٦) الصافات ﴾.

بـە ئیـبراهیمیش دەفـەرموێ، ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ... گوتمـان، ئاگرا دەبێ ساردو بێ زیان بی بۆ ابراهیم. (٦٩) الأنبياء ﴾.

سەبارەت بـە یـەعقوب، ﴿ ... عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ... بـە شـکۆ گـشتیان بهێنێتەوە بۆ لای من. (٨٣) يوسف ﴾.

دەربارەی (یوسف): ﴿ ...وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ ...(خودا) زۆر چاکەی دەربارە کردوم، لە زیندانی دەرهێنامو ئێوەشی لەو سارایەوە [٧٤١] هاوردەوە. (١٠٠) یوسف ﴾.

داود: ﴿ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ... ئێمە لەو هەڵەی بەخشیمان، لە نزیکانی خۆمانەو گەڕانەوەی چاکی هەیە. (٢٥) ص ﴾.

(ئەیوب): ﴿ ... فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ... ئازارمان لەسەر لابرد. (٨٤) الأنبياء ﴾.

(یونس): ﴿ ... وَنَجَّيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ... لە خەمەکەمان ڕزگار کرد. (٨٨) الأنبياء ﴾.

(موسا): ﴿ ... فَنَجَّيْنَـٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ ... لەو خەمەش ڕزگارمان کردی. (٤٠) طه ﴾.

(موحەممەد): ﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ ... ئەگەر ئێوە یاریدەی نادەن، خودا بۆ خۆی دەهانای هات. (٤٠) التوبة ﴾.

﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ... چما بێ دایکو باوک بوی، ئەو پەنای پێدای؟ (٦) الضحى ﴾.

﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ (٧) وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ... ئەدی نەشارەزا نەبوی ڕێی نیشان دای؟ لە هەژاریو لە ئاتاجی دەریخستی. (٨) الضحى ﴾.

﴿ ...كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ... ئەو گش ڕۆژێ بە کارێکەوە خەریکە. (٢٩) الرحمن ﴾.

هەندێ لە توێژەرەوان دەڵێن هەمیشە لە کاردا بونی خوا ئەوەیە: لە تاوان دەبورێ، خەمو پەژارە لادەبا، هەندێ کەس بەرز دەکاو، کەسانێکیش نزم دەکا.

هەر پەڵە هەورێکەو دەڕەوێتەوە، ﴿ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ... غەیری خودا کەس پەردەی لەسەر لانادا. (٥٨) النجم ﴾.

---

٧٤١) لە چۆڵگەوە، لە گوندەوە.

## دڵ گــران مــەبە ڕۆژگار هەر جــارە بە ڕەنگــێ خۆی دەنوێنــێ

(ئیبن زوبەیر) (موحەممەد)ی کوڕی (حەنەفیە)ی لە بەندیخانەی ((عارم)) لە مەککەدا بەند کرد، چەند سەدەیەك دوای ئەم ڕوداوە بیرم کردەوە، سەیر دەکەم (ئیبن زوبەیر)و (ئیبن حەنەفیە)و بەندیخانەی "عارم" هەروەك خەون وخەیاڵێکە: ﴿... هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ...﴾ ئاخۆ هەست بە هیچیان دەکەی، یان نوزەشیان لێ دەبیسی؟ ﴿٩٨﴾ مریم .

ستەم لێکراوو، ستەم کار، بەند کاروو[742] بەندەوار[743]، کاسەی مەرگیان نۆشکرد. هەر فیرعەنێکیش موسایەکی بۆ دەبێ.

## ئەم دوانــە لەســەر پەروەندەی خۆیان کێشــەیانــە

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((لتؤدن الحقوق الى اهلها حتى يقاد للشاة الجلحاء من القرناء... سوێند بێ، هەمو خاوەن مافێك مافی دەسێنرێتەوە، هەتاوەکو تۆڵەی بزنە کۆڵە[744] لە بزنی شاخدار دەکرێتەوە)).

---

٧٤٢) ئەوەی خەڵك قۆڵبەست دەکا.

٧٤٣) بەندکراو/ زیندانی کراو.

٧٤٤) بزنی بێ قۆچ.

## خەمینی تۆ دوژمنت دڵخۆش دەکا

بێگومان نەیارانت بە خەمباریت دڵ شادن، بۆیە یەکێ لە یاساو بنەچەی[٧٤٥] ئیسلام دەمشکێنی[٧٤٦] نەیارانە: ﴿... تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ... تاوەکو دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆشیانی پێ بترسێنن. ﴿٦٠﴾ الأنفال﴾.

ئەو کاتەش کە (ئەبو دوجانە) لە شەڕی (ئوحود) سنگی ڕەپێش کرد بو بەناو ڕیزەکاندا لافی لێدەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((**انها لمشية يبغضها الله الا من هذا الموطن**... ئەوە ڕۆیشتنێکە خوا ڕقی لێیەتی جگە لەو شوێنە نەبێ. بەهەمان شێوە فەرمانی بە هاوەڵاندا لە دەوری کابە[٧٤٧] بە گورگە لۆقە[٧٤٨] غاردەن، بۆ ئەوەی شانو شەوکەتیان پێشانی بێ باوەڕان دەن.

﴿... وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ... ئەوێ ڕۆژێ باوەڕداران کەیفێ دەکەن. ﴿٤﴾ الروم﴾.

لە ڕاستیدا نەیارانی ڕاستیو دوژمنانی چاکە ویستی، ئەگەر بە ئاسودەییو کامەرانیو بەختەوەری ئێمە ئاگادار بن لە داخان دڵیان شەق دەبا. ﴿... قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ... بێژە: دەك، لە ڕکان بمرن، ﴿١١٩﴾ آل عمران﴾.

﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ... ئەگەر چاکەت بێتە ڕیگە ئەوانە پێیان ناخۆشە، ﴿٥٠﴾ التوبة﴾.

﴿... وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ ... هەر حەز دەکەن توشی نارەحەتیتان کەن. ﴿١١٨﴾ آل عمران﴾.

---

٧٤٥) بنەمای.

٧٤٦) دەمکوت.

٧٤٧) کەعبە/ماڵی خوا.

٧٤٨) نمە غاردان.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((اللّهم لا تشمت بي عدوا ولا حاسداً... پەروەردگارا هیچ چاوچنۆكو نەیارێكم پێ خۆش نەكەی)). ئەو فەرمودەیەش: ((ونعوذ بك من شماتة الاعداء... پەناشت پێ دەگرین لە چاوتێبڕی دوژمنان)).

پیاوچاكان لە پێناوی دەمكوتی ڕەشك پێ بەرانو [٧٤٩]، پەنگ خواردنەوەی چاو تێوەبوان [٧٥٠]، بە خەندەوە پێشوازیان لە ڕوداوی ناخۆش كردەوەو، ئارامیان لەسەر بەڵاباری گرتوەو، لە ڕوبەڕوبونەوەی كاری دژواردا قۆڵو بازویان هەڵكردوە: ﴿... فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْ ... هەرچەند بەڵای لەڕێی خوادا توشی هاتن، نە هیچیانی سستەوە كرد نەزەبونی ڕوی تێكردن. (١٤٦) آل عمران﴾.

## گەشبینیو ڕەشبینی

﴿... فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ (١٢٤) وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ... جا ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوە باوەڕیان بەهێزتر دەبێو كەیفێ دەكەن. ئەوی دڵیشیان ساغ نیە، حاشا دێتە سەرحاشایانو بە خوا نەناسی دەمرن. (١٢٥) التوبة﴾.

زۆرێك لە هەڵكەوتان لە بەرابەری كاری دژوارو مەترسیدار گەشبینیان نواندوەو، بە پێی یاسای خوا سەرەنجامێكی ڕۆشنیان وەدی كردوە: ﴿... وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ... ڕەنگە لە شتێك حەز نەكەن بەڵام بۆتان وەخێر گەڕێ، ڕەنگیش هەیە ئاوات بۆ شتێ بخوازن كە ئاكامەكەی باش نەبێ. (٢١٦) البقرة﴾.

---

٧٤٩) چاوچنۆكان.

٧٥٠) ئەوانەی چاویان بە خێرو خۆشی هەڵنایێ.

بڕوانـە (ئـەبو دەڕوا) دەڵـێ: سـێ شـتم خـۆش دەوێ خـەڵك ڕقـی لێیانـە: دەسـت کورتیو نەخۆشیو مەرگم خۆش گەرەکە[٧٥١]، چونکێ نەداری لوت بەرزیدا دەنـەوێنێ، نەخۆشی تاوان هەڵدەوەرێنێ، مەرگیش بە خزمەت خوای بەرزو توانات دەگەیەنێ.

کەسـانێکیش هـەن ڕقیـان لـە کەمدەرامەتیـەو بـە خراپـە بـاس دەکـەن، دەڵـێن هەتاوەکو سەگیش ڕقی لە هەژارانە.

یوسف پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر- دەربـارەی بەنـدیخانـە دەڵـێ: ﴿... ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ ... زیندانەکـەم پـێ خۆشـترە لـەوەی ئـەوان لـێم دەخـوازن. ﴿٣٣﴾ یوسف﴾.

بەهــەمان شــێوە (عەلــی) کــوڕی (جــەهم) دەربــارەی بەندیخانــە شــیعرێك دەهۆنێتەوەو نەترسی خۆی نیشان دەدا.

بەڵام (عەلی) کوڕی (موحەممەد)ی نوسەر لـە شیعرێکدا بەندیخانـە بـە کۆسـتو بەڵای گەورە دادەنێ.

خەڵکانێکی زۆریش مردنیان پێ خۆشبووەو پێشوازیشیان لێکردوە، (موعـاز) دەڵـێ: ئـەی مـەرگ خۆشـهاتی[٧٥٢]، خۆشەویـستێکەو لـە تەنگانـەدا هـاتوە، ئـەوەی ژێـوانی دەردەبڕێ سەرکەوتوە.

یەکێ تریش دەڵێ: ئەگەر مردن هات برا گەورەیە.

وەلێ هەندێکی تریش هەن لە داخی مردن ڕو مرچو مۆنن، جوێنی پـێ ئـەدەنو لەبەری هەڵدێن.

جولەکە لە هەمو کەس پتر ژیانیان خۆشدەوێ، خوای بێ هاودەمو هاوتا سـەبارەت بەوان دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡمَوۡتَ ٱلَّذِي تَفِرُّونَ مِنۡهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمۡۖ ... بێژە: ئەو مەرگەی کە ئێوە لێی ڕادەکەن، هەردەوگاتێ. ﴿٨﴾ الجمعة﴾.

---

٧٥١) پێ خۆشە.

٧٥٢) بەخێرهاتی/بەخێر بێی.

ئی واش هەیە دەڵێ:

دوای ئەو ژیانە ژیانم نیە
پاش ئەو سەرەم سەرم نیە

کوژران لە پێناوی خوادا، لەبیری پیاو مەردو چاکەکاراندا، خۆزگەو خواستێکی شیرینە: ﴿... فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ... جا لەوانە هەیانە گیانی بەخشیوەو هێندێکیشیان چاوەنۆڕن.﴿٢٣﴾ الأحزاب﴾.

ئەوەش بڵێین خەڵکێکیش ڕقی لەوە بوە بکوژرێو لەبەریشی هەڵاتوە وەکو (جەمیل بەسینە) لە شیعرێکدا ژیانو ڕابواردنی بەسەر جیهاندا هەڵدەبژێرێ.

عەرەبێکی کۆچەریش دەڵێ: سوێند بە خوا پێم ناخۆشە لەسەر پێخەفی خۆم بمرم، جا چۆن لە کونو قوژبنان لە دوای دەگەڕێم ﴿... قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ... بێژە: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆ لە مردن بپارێزن.﴿١٦٨﴾ آل عمران﴾.

﴿... قُل لَّوْ كُنتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ... بێژە: ئێوە ئەگەر لە ماڵی خۆشتان بان، ئەو کەسانەی کوشتنیان لەسەر نوسراوە، دەهاتنەوە جێی تخێڵ بونی[٧٥٣] تەرمیان. ﴿١٥٤﴾ آل عمران﴾.

بێگومان ئەو بەڵایەی دێ ناگۆڕێ بەڵام دڵو دەرون لێك جیاوازن.

٧٥٣) جێی کەوتنی لاشەی مردوان.

## دڵگیر مەبە ئەی مرۆڤ

ئەی مرۆڤ: ئەی ئەو کەسەی لە دەستی ژیان بێزاری، لە تاوانی دەردەداری، دڵت پەنگی خواردۆتەوەو [٧٥٤]، هەناسەی بە کوڵ هەڵدەمژی، ئاسۆی ڕونت لێ هەڵدێ، سەرکەوتنێکی نزیکت بەرەو ڕو دێ، دەروی خێرت لە ڕودا والا دەکرێو، دوای ناخۆشیش خۆشی دێ.

سۆزو میهری خوا لە هەمولاوە دەوری تۆی داوە، خۆری هیوا نزیکە پرشنگ بدا، داهاتویکی پڕ ئومێدیش بەرێوەیەو، بەڵێنی خواش ڕاستو لەجێیە، ﴿وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ ... خودایە بەڵێنی داوەو لێ پەشیمان نابێتەوە. (٦) الروم.

گومانت نەبێ ئەو دڵپەستیەی تۆ دەڕەوێتەوەو زامی دڵت سارێژ دەبێ، ئەوەی بەسەریشت هاتوە ئاوا دەبێ، دڵنیاش بە لەودیوی مەینەتیەکانت، سەرەوتنە، حەساوگەیە، نزارگەیە، ئاورنگ [٧٥٥] و نمەی بارانەیە. ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ﴾ ... شوکرانە بۆ ئەو خودایەی کە سەری لەسەر نەهێشتن. (٣٤) فاطر .

ئەی مرۆڤ: ئەو هەلەی ئێستات ئەو هەلەیە بە سای دڵنیایی گومانو دو دڵی برەوێنی، ئاڵۆزیو پەشێوی دڵت بەسای حەقو ڕاستی بتارێنی، بیروهزری لوێچو لارت [٧٥٦] بەهۆی ڕێنمایی نەهێڵی، چەوتە ڕێ [٧٥٧] نەگریتەبەر لە بری ڕێنوێنی.

کاتی ئەوەیە بە دەرکەوتنی ڕوخساری بەرە بەیانی ڕاستی تاریکی ئەنگوستە چاو ڕابماڵی، بە شیرینی ڕەزانوێنی [٧٥٨] تالآیی ناسۆریو ژان دابماڵی، تەمو لێڵی کێشەو ئاشوب بەو ڕوناکیە تارو مارکەی کە هەمو فرتو فێڵێك هەڵدەماڵێ.

---

٧٥٤) پەستو پربوە.
٧٥٥) خوناوکە / خوناو / شەونم.
٧٥٦) خێچو خوار.
٧٥٧) کوێرە ڕێ.
٧٥٨) ڕەزامەندی.

ئەی مرۆڤ، لەو دیوی ئەو بیابانە دێمە رۆکەی [٧٥٩] لە ڕێتانە زەویەکی پڕ بە پیتو فەڕ چاوە ڕێتانە، کە لە هەمو لایەکەوە ڕۆزی بەسەردا هەڵدەڕژێ.

ئەی مرۆڤ، لەسەروی لوتکە چیای ئەشکەنجەو ئازارو ڕەنج کێشان باخو گوڵشەنێکی درەخشانە [٧٦٠] تێراوی ڕێشنە [٧٦١]، یا لێزمە بارانە، نمە بارانێك مایەی ڕۆنبینیو [٧٦٢]، ئومێدەواریو موژدەدانە.

ئەی ئەو کەسەی خەو لە چاوت زڕاوەو شەوان هاوارو ڕۆڕۆت لێ هەڵساوە دەڵێی، ئەی شەوی درێژ ئیتر با ڕۆژت هەڵبێ، موژدەت لێبێ وا بەیانە، ﴿... أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ... ئاخۆ بەیان نزیك نیە؟ (٨١) هود﴾.

ئەو سپێدەیە ڕۆشناییو شادیت بۆ دێنێو خەمو خەمینیت دەتارێنێ.

ئەی ئەو کەسەی لە سۆنگەی کلۆڵی هەستو ژیریت لەدەست داوە، کەمێ ئارامو هێواش بە، لە پەنای کەلو [٧٦٣] ئاسۆوە سەرکەوتنت بەڕێوەیە، بەڵگەی زۆرو ڕاستو ڕەوانیش هەن گەر بتەوێ لەبەرچاوی خۆتیان بگری.

ئەی ئەو کەسەی چاوەکانت لە فرمێسك داڕژاوە، ئیتر فرمێسکەکانت بسڕە، با گلێنەکانت پشو بدەن، هێور بەوە تۆ لە ژێر میهرو سۆزو چاودێری دروستکاری ئەم گەردونەی، ئەی بەندە دڵارامبە، قەزاو قەدەری خوا بەجێ بوە [٧٦٤]، خۆشت هەڵتبژاردوە، میهری خواش بۆتۆ بوە، تێنوێتی شەکەتی ڕەویەوە، ڕەگو ڕیشاڵی ڕەنجبەری تێراو بو، لەلایەن ئەو خوایەش کە هیچ هەوڵو ڕەنجێکی لەلا بە فیڕۆ ناچێ پاداشتت مسۆگەر بوە.

---

٧٥٩) دێمە کار/ زەوی وشكو بێئاو.

٧٦٠) تروسکەدار.

٧٦١) ڕێزنە.

٧٦٢) گەشبینی/ ئومێدەواری.

٧٦٣) بەرزایی.

٧٦٤) هاتە دی.

دڵنیاو حەساوە بە: تۆ مامەڵەت لەگەڵ خوایەکە بەسەر کارو فەرمانی خۆیدا زاڵە، بەرامبەر بەندەکانیو دروستکراوانی بە سۆزو میهرەبانە، کاروباریشی زۆر بەجێیەو لە جێیە.

با دڵت بسرەوێ؛ پاشەڕۆژ خێرو خۆشیە، دەرئەنجام سانەوەیەو، کۆتا ژیان شکۆمەندیو ڕێزداریە.

دوای هەژاری دەوڵەمەندیە، دوایی تێنوێتی تێراویە، دوای جیابونەوە، بە یەکتر شادبونەوەیە، دوای پشت هەڵکردن بە یەك گەیشتنەوەیە، دوای پچڕانێ یەکگرتنەوەیە، دوای بێ خەوی خەو خۆشیە، ﴿لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ... تۆ چوزانی، لەوانەیە لە پاش ئەمە خوا شتێ تر وەدیبێنێ. الطلاق(١)﴾.

ئەی ئەوانەی لەسەر دنیا ئازار چەشتون، بە تێنوێتیو برسێتی، بە هەژاریو دەردەداریو کولە مەرگی گیرۆ دەبون، مزگێنیتان لێبێ، لەمەولا تێر دەبنو چاك دەبنەوە، شادو بەختەوەر دەبن، ﴿وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ (٣٣) وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ ... (سوێند) بەو شەوگارەش کە ڕادەکا بەو سپێدەی ڕوبەندی خۆوە لادەبا. (٣٤) المدثر﴾.

پێویستە لەسەر بەندە لە ئاستی پەروەرندەیدا [٧٦٥] گومانی باش بێو، چاوی لە خەڵاتو بەخششی بێ، ئومێدی بە میهری وەدیهێنەری بێ، بێگومان خوایەك بە وشەی (ببە) فەرمانی جێبەجێ بێ، شیاوە بەوەی باوەڕو متمانە بە وادەو بەڵێنی بکرێ، خوایەکە هەرچی بەهرەیە لەویەوە سەرچاوە دەگرێ تەنیا ئەوە زەرەرو زیان ناهێڵێو، بەخشندەیی هەمو گیاندارێك دەگرێتەوە، لە هەمو جموجۆڵێکدا لێزانی ئەو وەدی دەکرێ، لە هەمو ساتێك ڕزگاری وی دێ، لە دوای شەو بەیانی دادێنێ، لە دوای وشکە ساڵی بارانێ دەبارێنێ، دەبەخشێ تاوەکو سوپاس بکرێ، بەندەی تاقی دەکاتەوە تاوەکو ئارامگریو بێ ئارام لە یەك هەڵاوێر بکرێ، بەهرەو خەڵات دەبەخشێ تا سوپاس کردن ببیسێ، دەردو بەڵا دەنێرێ تا نزاو سکاڵای لێ داوا بکرێ، ئەوسا جێگای خۆیەتی بەندە پەیوەندی لەگەڵدا توندو تۆڵ بێ، دەستی بە

٧٦٥) پەروەرندگاری.

پەتی ئەوەوە بگرێ، داواو خواستی هەر لە ئەو بێ ﴿... وَسْـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ... ئێوە دەبێ هەر لەبەر خودا وەپارێن. ﴿٣٢﴾ النساء﴾.

﴿ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ... بە نهێنیو بە ئاشکرا هەر پەروەندەو لەبیـربێو لەبەری بپارێنەوە. ﴿٥٥﴾ الأعراف﴾ .

(عەلائی) کوڕی (حەزرەمی) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵان ڕێگایـان ون کـرد، ئاویـان بڕا، کەوتنە سەر لێواری مەرگ، (عەلاء) هاواری بـۆ پـەروەردیاری نزیکی هەڵبـڕی، داوای لە خوایەکی بیسەرو وەڵامگۆ کردو، بەو نزایە بانگی کرد: ((**یا علي یا عظـیم، یا حکیم یا حلیم**)) هەر لەجێوە بارانیان بەسەر دابـاریو، ئاویـان خـواردەوەو، خۆیـان شوشتو دەستنوێژیان گرتو، وەڵاخەکانیشیان ئاودان.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ... هـەر ئەویشە پاش ناهومێد بون لە باران، بارانە دابارێنێو دلۆڤانی خۆشی بڵاو دەکاتەوە. هەر ئەوە بۆ مەزنایەتی ئەشێ هەر پەسندی بدرێ [٧٦٦]. ﴿٢٨﴾ الشوری﴾.

## هـەڵوەسـتەیـەك

خۆشویستنو، ناسینو، هەمیشە یـادی خـوای دەسـتەباڵا، حەسـانەوەو سـرەوتن بـە سای ئەو، هەستکردن بەوەی هەر ئەو شیاوی خۆشویستنو لێتـرسانە، جێی ئومێـدو، مامەڵـە لەگـەڵ کـردنو پـشت پـێ بەسـتانە، بـە جۆرێـك دەسـەڵاتی بەسـەر هەسـتو نەسـتو، ویـستی بەنـدەدا دەشـكێ، ئـا ئـەوە بەهەشـتی سـەر دنیایـەو، خۆشـیێكی بێوێنـەیەو، بیلبیلەی چاوی دۆستانو، ژیانی خوا پەرستانە.

پەیوەست بونی دڵ بە خوای تاكو تەنیا پێ قـایلیو زمـان ڕاهـاتن بـە یـادی ئـەو: مایەی نەمانی خەمو پەژارەو، دڵگوشادیو خۆشگوزەرانین.

---

(٧٦٦) سوپاسی بکرێ.

بـە پێـچەوانەی ئەمـەش، هـیچ کەسـێك ئەوەنـدەی ئـەو کەسـەی دڵـی بـە غـەیری خواوە بەندە، یادی خوای لە بیر کردوە، بەو بەشەی خوا پێـی داوە ناقایلـە، پەسـتو دڵ پڕ لە خەم نیە، تاقی کردنەوەش باشترین بەڵگەیە.

بە کۆست کەوتوان دڵت بدەوە

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ ... فرە لەو بازێڕانەمان قڕتێ خستون کە هەر لە دەوری ئێوە بون. ﴿٢٧﴾ الأحقاف ﴾.

یەکێ لەوانەی دوچاری کارەساتو مەرگەساتی خوێناویو ڕیشە هەڵکێشان هـاتن: بەرمەکیەکان [٧٦٧] بون، کە خانەوادەیەکی بەخشندەو دەسـتبڵاو حـاڵ خـۆشو بـەنازو فیزبون، ئەو مەرگەساتەی ئەوان بو بە پەندو ئـامۆژو نمونـە، لـە کاتێکا لـەناو نـازو گۆزدا خۆیان لەیاد کردبو، لەناو جێ خـەفو پـێ خەفـی گـەرمو نـەرم دابـون، لـەناو باخو باخاتی دڵڕفێن دەخولانەوە، لـە ناکـاوێ لـەناو گاڵتـەو گەپـدا فـەرمانی خوایـان بەسـەر داهـات، هـەر لـە بـەیانیو ئێوارەیەکـدا لەسـەر دەسـتی (هـاڕون ڕەشـید)ی نزیکتـرین خـزمو خۆیـشیان پـەلامار دران‌و تێکشکێنران، کۆشـكو تـەلاریان ڕوخـا، ئـابروو شـکۆیان تکـا، کۆیلـەو دەسـتو پێوەنـدیان ڕفێنـرا، خوێنیـان ڕژا، شـانو شـەوکەتیان شـکا، دڵـی خۆشەویـستانیان پـێ زامـدار کـرا، چـاوی زا ڕۆڵـەیان [٧٦٨] لـە خوێنـزا [٧٦٩]، جا گەورەییو تاكو تەنیایی بۆ خوا، چـەندە بـەهرەو نـازو گۆزیـان لـێ زەوتکراو، چەندە فرمێسکیان بـۆ هـەڵڕژا، ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ ... سـا ئێوە دەرس وەرگرن، ئەی گرۆی خاوەن ئاوەزان! ﴿٢٧﴾ الأحقاف ﴾.

کاتژمێرێك بەرلەوەی وایان بەسەر بێ لە ناو پۆشاکی گران بەهادا لەناو بەرگی ئاوریشمیدا، کەشو فیشیان [٧٧٠] دەکردو خۆیان هەڵدەکێشـا، کاسەی پڕ ئومێدیان نۆش دەکرد، ئای لەو کارەساتە دڵ تەزێنەی هاتە ڕێیان، ئای بە چ داخێك داخکران!!

---

٧٦٧) ناوی تیـرەیەکە.

٧٦٨) مناڵیان.

٧٦٩) لە خوێن هات.

٧٧٠) خۆیان هەڵدەکێشا.

لەو ڕۆژگارە چەند ساڵانێك بە هێمنی بە سەریان برد، سەردەمێك بو، شەوو ڕۆژیان بە بێ ناستەنگ خۆف و خافڵ [٧٧١]، بەڕێ دەکرد ﴿ وَسَكَنتُمْ فِي مَسَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ... هەر چونە جێگەی ئەوانەش کە ناهەقیان لەخو دەکردو تێشگەیشتن کە چیمان بەسەر وان هێناو زۆر نەزیلەشمان [٧٧٢] بۆ گوتون. (٤٥) إبراهيم ﴾.

بەیداخی نەیارانیان لەسەر سەری دەشەکایەوە [٧٧٣]، هەمولایان بەسەر بازان تەنرایەوە [٧٧٤].

بەسەربەستی لەناو نازو گۆزدا دەلەوەڕان، چەند عەیام بو [٧٧٥] لەناو ژیانێکی بێژاندا دەژیان، تراویلکەیان بە کانیاو دەزانی، هاوسانو [٧٧٦] کیسیان کرد، لایان وابو دونگ و چەوریان زیادی کردوە [٧٧٧]، دنیایان بە جێگای مانەوە سەیر دەکردو، پێیان وابو دوایی نایێ، خەیاڵیان وابو بارمتەکە نادرێتەوەو، قەرزو قۆڵو ماڵی سپاردە بۆ خاوەنی ناگەڕێتەوە، ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ ... لایان وابو ناگەڕێنەوە لای ئێمە. (٣٩) القصص ﴾.

بەیانی لە خۆشی دابون ئێوارەیان لە ناو گۆڕدا کردەوە، لە ناکاوێك (هارون ڕەشید) رقی هەڵسا شمشێری ڕق و کینەی لێ هەڵکێشان، (جەعفەر)ی کوڕی (یەحیا)ی بەرمەکی کوشت و، هەڵیواسی پاشانیش لاشەی گڕدا [٧٧٨]، (فوزەیل)ی کوڕی (یەحیا)ی برایو، (یەحیا)ی کوڕی (خالید)ی باوکیشی قۆڵبەست کردن، ماڵ و موڵك و دارایی لێداگیرکردن، شاعیرانیش زۆر هۆنراوەیان بەسەر بەرمەکیان

---

٧٧١) بێئاگا.
٧٧٢) نمونە.
٧٧٣) دەلەرزیەوە / بای لێدەدا.
٧٧٤) گیرا.
٧٧٥) ماوەیەکی زۆر.
٧٧٦) پەڵەی مەترسیدار/وەرەم.
٧٧٧) قەڵەو بونە.
٧٧٨) سوتاندی.

داهۆنیوەتەوە، یەکێ لەوان پیاهەڵدانی (ڕەقاشی) بو، هەندێك دەڵێن هۆنراوەکە ئی ئەبو نەواسە پێیان دا هەڵدەڵێ‌و بەخشندەیی‌و دەست کراوەیی یان دەلاوێنێ.

به هەمان شێوە کاتێ (ڕەقاشی) (جەعفەر)ی بینی هەڵواسراوە لەو کاتەشدا ئەو بنەماڵەیە بە شیعر دەلاوێنێتەوە.

(هارون ڕەشید) بانگی کردو پێی وت: (جەعفەر) ساڵانە چەندی پێ ئەدای؟ گوتی: هەزار دینار. دەڵێ: فەرمانیدا دو هەزاری بۆ ببڕێتەوە.

(زوبەیر)ی کوڕی (بەکار) لە (موسعەب زوبەیری) مامی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لە کاتێك (ڕەشید) (جەعفەر)ی کوشت، ژنێك بە سواری گوێدرێژێك بە توندو تۆڵی‌و، بە زمانێکی ڕەوان گوتی: سوێند بە خوا ئەی (جەعفەر) ئەگەر ئێستا بە پەند هەڵواسراوی، بەر لە ئێستا لە بەخشندەییدا بەیداخ [٧٧٩] بوی. دوای ئەمە بە هۆنراوە لاواندیەوە.

ئەو کاتەش، کە (ئەبو جەعفەر مەنسور) (موحەممەد)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (حەسەن)ی کوشت، بە (ڕەبیع)ی دەرگەوانی خۆیدا سەرکی بۆ (عبدالله)ی باوکی ڕەوانە کرد کە لە بەندیخانەدا بو، سەری لەبەردەستی باوکی داناو، ئەویش گوتی: خوا سۆزی بۆت بنوێنی ئەی باوکی قاسم، بە ڕاستی لەوانە بوی پەیمانی خوایان بەجێ هێناو ئەو بەڵێنەیان نەشکاند، لەوانە بوی ئەو پەیوەندیە بگەیەنی کە خوا فەرمانی داوە بگەیەنرێ‌و، لە خوای خۆیان‌و ڕۆژی سەلا دەترسێن، پاشان نمونەی بە وتەی شاعیرێك هێنایەوەو ڕوی لە (ڕەبیع)ی دەرگەوانی (مەنسور) کردو، پێی گوت، بە گەورەی خۆی بڵێ:

ماوەیەك بەسەر ژیانی تاڵی ئێمەدا تێپەڕی‌و، بە هەمان شێوە بەسەر خۆش گوزەرانی ئەویشدا تێپەڕی، خاوەن بەڵێنیش خوای بێ هاوتایە!

(عەباس)ی کوڕی (ئەحنەف)یش شتێکی بەو مانایە گوتوە ـهەندێکیش دەڵێن (عەمارە)ی کوڕی (عوقەیل) گوتویەتی: هەروەکو لە (قول علی قول)دا هاتوە. بەڵام ئێستاکە: (هارون ڕەشید) لە کوێیەو (جەعفەر)ی بەرمەکی لە کوێیە؟ کوان کوژیارو کوژراو؟ فەرمانداروو فەرمان لەسەر کراو لە کوێن؟

---

٧٧٩) ئاڵا بوی.

**ئەو کەسەی لە ناو کۆشکیدا لەسەر تەختی فەرمانی دەرکرد چی بەسەرهات؟**

**ئەوەی کوژراو هەڵواسرا بەرەو کوێ چو؟ ناویان نـەما، هـەروەکو دوێنێـی تێپـەڕیو تێپەڕین، بەڵام خوایەکی دادوەرو تۆڵەسێن لەمەولا لە ڕۆژێکدا کە گومانی تێدا نیـە، نـە زۆرداریو نـە ستەمکاری تێدا دەکرێ، کۆیـان دەکاتـەوە، ﴿... عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ... (بارو گوزەرانی چینەکانی پێشو) لە دەفتـەرێك دایـە لـە لای پەروەردیارمـەو ئـەو دەیزانـێ. پـەروەدیارم نـە هـیچ شـتی لـێ گـوم دەبـێو نەهیچێشی لەبیـر دەچێ. ﴿٥٢﴾ طه﴾.**

**﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ... ئەو ڕۆژەی کە هەمو مەردم بۆ دیداری پەروەرندەی هەمو دنیا ڕادەوەستێ.﴿٦﴾ المطففين﴾.**

**﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ... ئــەو ڕۆژە ئێــوە ڕادەنــێنو هەرچــی بــۆ شاردنەوەیە لە ئێوە حەشار نادرێ. ﴿١٨﴾ الحاقة﴾.**

**بە (یەحیا)ی کوڕی (خالید)ی بەرمـەکیان گوت: باشـە پـێم نـاڵێی بۆچـی ئاواتـان بەسەر هات؟ گوتی: لەوانەیە لە نیوە شەودا نزای چەوساوەیێك گیرا بو بێو ئێمـەش لێی بێ ئاگـا بوین.**

**(عبدالله)ی کوڕی (معاویە)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (جەعفەر) بەڵابار بو، لە ناو زیندانەکەدا شیعرێکی هۆنیەوە لە شیعرەکەدا هەروەکو بڵێـی نـاو زیندانەکـە بـەژێر زەوی دادەنانێ هەر کە پاسەوانەکان بەکارێکەوە دێنە لایان پێی وایە لەسەر دونیـاوە هاتون. دێری کۆتایی هۆنراوەکە ڕشبینیو بەدبینـی تێدایە.**

**حوکمرانێکی فارس زانایەکی خۆیان کۆتبەند دەکا، ئەویش لەسەر تابلۆیـەك بـۆی دەنوسێو تیایدا دەڵێ: گومانت نـەبێ هـەر سـاتێك لـەو بەندیخانەیـە بەسـەربەرم لـە ئازادیم نزیك دەخاتەوەو، تۆش لە تۆڵە لێبونەوە نزیك دەکاتـەوە، سـا مـن چـاوەڕێی لێبونەوەی دەروی خێرم، تۆش بە ئومێدی تەنگانەی.**

لە کاتێکا (ئیبن عوباد) پاشای (ئەندەلوسی) ڕابواردنو زیادە ڕۆیی زۆری بۆ هێنـا، لەسەر ڕاستە شەقام لاڕێ بو، ناوماڵی پڕ کەنیزە بـو، سازو سـەمتورو دەف لێدانو گۆرانی دەنگی دایەوە، دوچاری مەینەتیو بەلا بو لەگەڵ ڕۆمەکان، ڕۆژێکیان لە دژی دوژمنانی ڕۆمی لە (ئەندلوس) پەنای بردە بەر (ئیبن تاشفین)ی پاشای (مـەغریب)، (ئیبن تاشفین) لە دەریا پەڕیـەوە، (ئـیبن عوبـاد)ی لـە جـەنگی دوژمنـان ئـازاد کـرد، ئـەویش زۆر ڕێـزی گـرتو پێشوازی لێکـردو، لـە نـاو کۆشـکو تـەلارو بـاخو باخـاتی مێوانداری کرد. (ئیبن تاشفین) هەروەکو شێر ناو شارو دەرەوەی شاری سـەرنج دەدا، چـونکێ شـتێکی لەدڵـدا بـو. سـێ ڕۆژی پـێ چـون (ئــیبن تاشـفین) بـە خـۆیو سەربازەکانیەوە هێرشی هێنایە سـەر ئـەو وڵاتـە بـێ هێـزو توانایـە، (ئـیبن عوبـاد)ی یەخـسیر کـردو قـۆڵ بەسـتی کـردو، موڵـکو سـامانی داگـیر کـردو کۆشـکو تـەلارو باڵەخانەی لـێ ڕمانـدو، بـاخو باخـاتی لـێ تێکشکاند، بـە قـۆڵ بەسـتی بـەرەو شـاری خۆی (اغمات) گواستیەوە، ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ... ئێمـە ئـاوا لـە نـاو خەڵکا زەمانە دەستاو دەس دەکەین. (١٤٠) آل عمران ﴾.

ئەوسا (ئیبن تاشـفین) جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەستو، بە نـاو خەڵکیـشدا بـڵاوی کردەوە کە خەڵکی (ئەندەلوس) داوایان کردوەو هەڵیان بژاردوە.

ڕۆژان هـاتنو پێپـەڕین، لـە پڕێکـا کـچەکانی (ئـیبن عوبـاد) بـە پـێ خواسـی، بـە شلۆقی، بە برسێتی، بە گریانەوە، لە بەندیخانەوە بە دیداری باوکیان گەیـشتن، کاتـێ لە دەرگاوە چاوی پێ کەوتن دەستی کرد بە گریان، پاشان ئیبن لەببانەهاتە لای ئیبن عوبادەو بە شیعرو هوۆنراوە لاواندیەوە، هۆنراوەکەش پارچـە هەڵبەسـتێکی سـەرنج ڕاکێشە، (زەهەبی) هێناویێتیو ستایشی کردوە.

(تیـرموزی) لە (عەتا) ئەو دەگێڕێتەوە، ئـەویش لـە عائیـشەوە - خـوای لـێ ڕازی بێـت - دەگێڕێتـەوە کـە (عائیـشە) بـەلای گـۆڕی (عبـدالله)ی برایـدا تێپـەڕی کـە لـە مەککەدا نێژرابو، سەلامی لێکردو، گوتی: ئـەی (عبـدالله) وێنـەی مـنو تـۆ هـەر بـەو شێوەیە، کە (موتەمیم) دەڵێ، شیعرەکەی باس لە لێك جیابونەوە دەکا پاشـان گریـاو ماڵئاوایی لێکرد.

پێشەوا (عومەر) بە (موتەمیم)ی کوڕی (نوەیرە)ی دەگوت: ئەی (موتەمیم)، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، حەزم دەکرد شاعیر بومایەو بەسەر (زەید)ی برام دا هەڵبگوتایە، سوێند بە خوا هەر نزە بایەك لە (نەجد)ەوە هەڵبکا بۆنو بەرامی (زید)م بۆ دێنێ. ئەی (موتەمیم) (زەید) بەر لە من موسڵمان بوەو کۆچی کردوەو شەهید بوە. دوای ئەوە دەستی دەکرد بە گریان.

تیرەی (بنول ئەحمەر) لە (ئەندەلوس) دوچاری کارەسات بون، (ئیبن عەبدون)ی شاعیر هاتە لایانو بە شیعر دڵنەوایی کردن:

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَـٰلِيَهَا سَافِلَهَا ... کە فەرمانی ئێمە گەیشت، ئەو جێیمان سەرەو نخون کرد. ﴿٨٢﴾ هود﴾ .

﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَـٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَـٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَـٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارًا فَجَعَلۡنَـٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِ ... هەڵبەت ژیانی ئەو دنیایە هەروەکو ئەو ئاوە وایە، کە لە حەوا دەیبارێنینو ڕوەکی جۆراو جۆری ئەم سەر زەمینەی پێ دەڕوێ، ئەو شتانەی کە مرۆڤ و ئاژەڵ دەیخۆن. تا ئەو کاتەی زەمین ڕەنگاوڕەنگ دەبێتو خۆ جوان دەکاو خەڵکی زەوی لایان وایە لە دەستەڵاتی وان دایە هەتا کاتێ فەرمانی ئێمەی دێتەسەر -جا بە شەو یان لە ڕۆژێدا- ئاوا وەکو درەوکراوی لێدەکەین [٧٨٠]، هەروەك دوێنێ هەر نەبو بێ! ﴿٢٤﴾ یونس﴾.

---

[٧٨٠] وەکو دورابێتەوە وای لێ دەکەین

## بەروبومی گەییوی ڕەزانوێنی

﴿... رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ... خودا لێیان ڕازی بووەو ئەوانیش لە خوا ڕازی بونە. (١١٩) المائدة﴾.

ڕەزا نوێنی چەند بەروبومێکی زۆری بەرفرەی باوەڕدارانەی لێ فەراهەم دێ، بە سای ئەودا هاتە کەسی ڕەزا نوێن بەرزترین پلە وەدەست دێنێ، لەناو دڵنیایی داڕۆدەچێ، بیروباوەڕی پتەو دەبێ، لە هەڵس و کەوت و کردارو گوفتاریدا ڕاستگۆ دەبێ. ئەوسا تەواو بەندایەتی بەندە لەوەدایە بڕیارو فەرمانێك كە پێی ناخۆشە بەسەری بێ.

ئەگەر بێ و تەنیا ئەوەی پێی خۆشە بۆی بێتە دی ئەوا ئاماری ئەوپەڕی دورکەوتنەوەیە لە بەندایەتی پەروەردگاری، ئەوانەش بەدەست نایەنێ کە نیشانەی تەواوی بەندایەتین - وەکو ئارامگری و، پشت بە خوا بەستن، لالانەوەو ڕەزا نواندن، خۆ بەکەم زانی و خۆ بە پێویست زانی و ملکەچ کردن، جگە لەوانەش - مەگەر ئەوەی حەزی پێ ناکەی قەدەر بۆت بڕیاریدا، جا پلەو پایە لەو قەزاو قەدەرە کە لەگەڵ هەست و ویستدا تێکدەگیرێ و ئازاری پێ دەگەیەنێ.

جا بەندە بۆی نیە دەست لە قەزاو قەدەری خوا بدا، ئەوەی دڵی بگرێ پێی قایل بێ و، ئەوەی حەزیشی پێ نەکا نا قایل بێ، بێگومان مرۆڤ بۆی نالوێ [781] بۆ خۆی چەپکە گوڵێ لێ [782] بدا، بەڵکە هەڵبژاردن هەر بۆ خوایە، هەر ئەو زاناترو دادوەرترە، پایەدارو بەرزترە، چونکێ زانایە بە پەنهان و، بە نهێنیان ئاشنایە، لە پاشەڕۆژ ئاگادارەو دەورەی بە هەمو شتێ داوە.

---

٧٨١) ناگونجێ.

٧٨٢) هەڵبژێرێ.

## قـــایلی بە قایلـــی[٧٨٣]:

با بەندە دڵنیا بێ کە قایل بونی بە پەروەردگاری بـەرزو بـێ هاوتـای لـە هەموبوارێکدا، دەبێتە هۆی ئەوەی پەروەردگاریشی لـێ قایل بێ، جا ئەگەر بەندە بە بەشە ڕۆزییێکـی کـەم لە خوا قایل بێ، خوای گەورەش بە کردەوەیەکی کـەم لـەوی قایـل دەبـێ، ئەگـەر لـە هـەمو حاڵەتێکیشدا لە خوا قایل بێ، باری خۆی ڕاست کردەوە، هەسـت دەکـا لـە کـاتی ڕازیکردنـی خواو خۆ بە کەم زانی لە ئاستیدا بـە زوتـرین کـات خـوا لێـی ڕازی دەبـێ. بۆیـە سـەرەنجی دڵپاكو نیـاز پاکـان بـدە لەگـەڵ ئـەوەی کردەوەیـان کـەم بـو، بـەڵام چـۆن خـوا لـە هـەوڵو کۆشـشیان قایـل بـو لەبەرئـەوەی ئـەوان لـە خـوا قایـل بـونو خـواش لـەوان قایـل بـو، بەپێچەوانەی دوڕوان خوا کەمو زۆری لـەوان قـەبوڵ نـەکرد، چونکێ ئـەوان بـە دابـەزینی ئایـەتی خـوا ڕوگـرژ بـونو ڕازیکردنـی ئـەویان ڕەچاو نـەکرد، خـوای گـەورەش کـردەوەی ئەوانی بە بادا کرد.

## ئـەوەی بێـزاری دەربـڕی نـاڕەزایـی وەدەسـت هێنـا :

نا قایلی دەروازەی خەمو پەژارەو دڵپەستیە، دابڕ دابڕ بونی دڵو شێوانو شـپرزە بونی هەستو نەستە، گومان بردنە بە خوا بە شێوازێك شیاوی ئەو نیە.

ڕەزامەنـدی لەوانـە هـەموی ڕزگـارت دەکـاو، بـەر لـە بەهەشـتی دوا ڕۆژ دەرگـای بەهەشتی دنیات لە ڕودا واڵا دەکا، بێگومان دڵارامی بە دژە کـاری قـەدەرو سەرپێچی بڕیاری خوا نایێتە ئـارا، بەڵکـە بـە مـل کەچیو خۆدانـە دەسـتو قـایلی بەرجەسـتە دەبـێ، چـونکو هەڵـسو ڕێنـەری کـارو فـەرمان خوایـەکی کاراشـنایە لـە بڕیـارو چارەنوسیدا تۆمەتبار ناکرێ، ئێستاش لەگەڵدا بێ بیری بەسەر هاتی (ئیبن ڕاونـدی) پسپۆڕو زانای بێباوەڕ دەکەمەوە، بۆ خۆی کەسێکی نەدار بو، بینی کەسێکی نـەزانو کـەودەن[٧٨٤] لـەناو کۆشـكو تـەلارو مـاڵو سـامانێکی بـەرفرەدا بەسـەر دەبـا، ڕوی لـە

---

٧٨٣) ڕازی بون بە ڕازی بون.

٧٨٤) بیـر کۆڵ.

ئاسمان كردو گوتی: من فەیلەسوفی جیهانم‌و بە نەداری بەسەردەبەم، كەچی ئەو نەزان‌و كەودەنە بە دەوڵەمەندی دەگوزەرێنێ، ئا ئەو بەشدانانە دادوەرانەنیە. خوای گەورە تەنیا خەشم‌و قین‌و قوڕ بەسەری‌و دەردەسەری بەسەردا هەڵڕژاند ﴿... وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ... بێ گومانە سوكایەتی ئازاری ئەولاش زۆرترەو كەسیش دە هانایان نایە. (١٦) فصلت﴾.

## سـودو قازانجی قایل بـون:

ڕەزانوێنی هێمن‌و هەداری دەستەبەر دەكا، لە كاتی كار ئاڵۆزی‌و تێكچڕژان‌و[٧٨٥] پەیدابونی گومان‌و دڵ لە دڵدان[٧٨٦]، دڵ ساردو فێنك دەكا، جا ئەو دڵە بە وادەو بەڵێنی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ متمانە دەكاو دادەسەپێ، بە زمانی حاڵیش دەڵێ: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسۡلِيمًا ... ئەمە هەر ئەوەیە كە خوداو پێغەمبەرەكەی بەڵێنیان بە ئێمە داوەو هەر بەڵێنی خوداو پێغەمبەری بیدەن، ڕاست دەردەچێ‌و ئیتر بڕواو هەستی فەرمان بردنیان پتر گەشەی كرد. (٢٢) الأحزاب﴾.

نارەزاییش دڵاو دڵی‌و، نیگەرانی‌و جەرگاوسی، پەشێوی‌و دڵنەخۆشی‌و دابڕدابڕی[٧٨٧] دروست دەكا، دڵێكی ڕقاوی‌و كیناوی‌و نیگەران‌و سەركەش‌و یاخی لێ دەردەچێ، بە زمانی حاڵیش دەڵێ: ﴿... مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ... ئەو بەڵێنەی خوداو پێغەمبەر دەیاندا هەر بۆ فریوی ئێمە بو. (١٢) الأحزاب﴾.

خاوەنی ئەو دڵانە ئەگەر بەرژەوەندیان لە شتێكدا هەبێ ملكەچانە بەرەو ڕوی دەچن، ئەگەریش داوای مافێكیان لێكرا خۆ دەبوێرن، ئەگەر نازو گوزێك ڕوی

---

٧٨٥) لێك عاسێ بون.

٧٨٦) دو دڵی.

٧٨٧) پارچە پارچەیی.

تێکردن پێی خۆشحاڵن، ئەگەر بە دەردو بەڵایەکیش تاقی کرانەوە، ڕویان بۆ ئەو لا وەردەگێڕن، دنیاو دواڕۆژ دەدۆڕێنن ﴿... ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ... دو سەرە زەرەر ئەمەیە. ﴿١١﴾ الحج﴾.

هەروەکو ڕەزانوێنی دڵارامی بەسەر بەندەدا دەبارێنێ کە لەوە باشتری پێ نابڕێ، جا هەر کاتێ ئەو هێمنیە بەسەریدا هاتە خوارێ بارو گوزەرانی دەگونجێ‌و، هەستو نەستیدا دەکەسێ، بە پێی زۆری‌و کەمی ناقایل بونیشی لەو بەهرەیە بە دور دەبێ، ئەگەریش ئەو ئارامیە لەسەری بڕەوێتەوە، سرەوتن‌و هەدادایی [788]، حەسانەوەو خۆشگوزەرانی لەسەر دەگیرێتەوە. ئەوسا گەورەترین خەڵاتی خوا کە پێشکەشی بەندەی خۆی دەکا؛ دابەزاندنی دڵارامیە بەسەریدا. گەورەترین هۆکاری دڵارامیش؛ قایل بونە بە خوا لە هەمو بوارێکدا.

## لەگەڵ پەروەرگارت دا بەربەرەکانی مەکە:

ڕەزانوێنی، بەندە لە چنگی نەیارێتی ئەو پەروەردگارە ڕزگار دەکا، کە لە هەمو یاساو بڕیارێکی بێ هاوتایە.

بێگومان بێزاری بەندە لە شتێك کە پێی ناقایلە مایەی بەربەرەکانی کردنە لەگەڵ خوادا، بنچینەی دوژمن کاری شەیتانیش لەگەڵ پەروەرگاری دا؛ ناقایلی بونە بە بڕیارو یاساو ڕێسای ئایینی‌و گەردونی.

بێ باوەڕی‌و لاملی هەر بەوەندەی دێتە دی لاساری‌و سەرپێچی کاری بکرێ، چونکێ ئەو کەسە دەیەوێ ئەو گەورەیی‌و باڵا دەستیەی دەست بەسەردا بگرێ، کە تایبەتە بە خوا، ناشیەوێ ملی بۆ پلەی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا کەچ بکا، ئەو دەیەوێ بەرامبەر فەرمانی خوا لاساری بنوێنێ‌و، سنورە یاساخ کراوەکان ببەزێنێ، لە ئاستی بڕیارو دانانی ڕوی گرژەو، مل کەچی قەدەر نیە.

---

٧٨٨) ئاسودەیی.

## بڕیارێکی تێپەڕیو فەرمانێکی دادوەرانە:

بڕیاری خوا سەبارەت بە بەندەی خۆی جێبەجێ بووە، ئەو یاسایەی بەسەریشیدا جێبەجێ کردوە دادوەرانەیە، هەروەکو لە فەرمودەدا هاتوە: ((ماضٍ فيَّ حكمك عدل فيَّ قضاؤك... ئەو بڕیارەی لەسەرە منت داوە تێپەڕیوەو، فەرمانی تۆ لەسەرە من دادوەرانەیە)). هەر کەسێکیش بە دادوەری قایل نەبێ، لە ڕیزی زاڵمو ستەمکارانە. خوای گەورەش دادوەرترینی دادوەرانەو، لەسەرە خۆی یاساخ کردوە ستەم بکا، لە ئاقار بەندەکانیشیدا ستەمکار نیە، ئەو خوایە - پاکو پیرۆزی بۆ ئەو- بە دورە لەوەی دەرحەق بە بەندەکانی ستەمکار بێ، بەڵام خەڵکان خۆیان بەرامبەر خۆیان ستەمکارن.

کە دەفەرموێ: ((عدل في قضاؤك... قەدەری دەربارەی گوناهو شوێنەواری گوناهو سزادانیشی لەسەر گوناه دەگرێتەوە، چونکێ هەردوکیان بە پێی قەزاوقەدەری خوای بەرزو بێ هاوتایە، ئەویش لە هەمو دادوەرێك دادوەرترە لەمەڕ ئەو بڕیارەی لەسەر گوناهو، سزادانیش لەسەر گوناه دەیدا.

خوای بێ هاوتا لەبەر چەند ڕازو نهێنیەك بڕیاری لەسەر گوناهی بەندە دات کە هەر خۆی پێی ئاشنایە، جاری وایە ئەوەندە بەرژەوەندی گەورەی تێدایە کە هەر خۆی پێی زاناو دانایە.

## لە ناقایلی هیچ داهاتێك بەدەست نایە:

ناڕەزایی: یا ئەوەتا لە پێناوی بە دەست نەکەوتنی شتێکی خوازراوو خۆشەویستە یا لەبەر دوچار بونی بە شتێکی ناخۆشو نەخوازراوە.

جا ئەگەر بەندە دڵنیا بو هەرچی بە سەری نێ نایێ، ئەوەی بەسەریشی بێ ناتوانێ لەبەری لادا، ئەو کاتە هیچ قازانجێك لە ناڕەزایی وەدەست نایێنێ تەنیا بەرهەمو قازانجی لە دەست دەداو، زەرو زیانیش بۆ خۆی دەستەبەر دەکا.

له فەرمودەشدا هاتوە: ((**جف القلم بما انت لاق يا ابا هريرة، فقد فرغ من القضاء، وانتهى من القدر، وكتبت المقادير، ورفعت الاقلام، وجفت الصحف**... ئەی (ئەبا هورەیرە) نوسینی قەڵەم دەربارەی ئەوەی بەسەرە تۆ دادێ وشك بۆتەوە، تازە بڕیاری خوا دراوەو، قەدەری خوا بڕاوەوەتەوەو، ئەندازەکان نوسراون، قەڵەم هەڵگیراوەتەوەو، لاپەڕەش وشك بۆتەوە".

## بێ بەلایی لە ڕەزانوێنی دایە:

ڕەزامەندی دەرگای ئاسودەیی لە ڕوی بەندە دەکاتەوە، دڵی لە ڕق و کینەو ناپاکی پاك دەکاتەوە، هیچ کەسێکیش لە سزای خوا ڕزگاری نابێ مەگەر ئەو کەسەی بە دڵێکی پاکەوە بەرەو خوا بچێ، ئەو دڵەی لە شێوان و گومان و هاوبەش پەیداکردن بەدورە، لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان و سەربازەکانی، لە ڕیسوا کردن و ئەو ڕۆبە سبەی پێکردن و [٧٨٩]، لە ترساندن و وادەو بەڵێن پێدانی بێوەی دەبێ، ئا ئەو دڵەیە تەنیا جێگای خوای تێدا دەبێتەوە:

﴿... قُلِ ٱللَّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ... بێژە: هەر خودا ناردویە. تۆ ئیتر وازیان لێبێنە با بە گاڵتەکردنەوە خۆ خەریك کەن. (٩١) الأنعام﴾.

بە هەمان شێوە ناگونجێ دڵ ساخ و بێ وەی بێ هاوکات لەگەڵ ئەوەی نا قایل بێ، هەرکاتێکیش بەندە لەمەڕ ڕەزامەندی پتەوتر بێ پتر لە بەلا بە دور دەبێ.

ئەوسا پیسی و چەپەڵی و ناپاکی: لەگەڵ ناڕەزایی بەیەکەوە بەندن. دڵپاکی و ڕاست گۆیی و دڵسۆزی: لەگەڵ ڕەزامەندی بەیەکەوە بەستراونەتەوە.

هەروەها بەدی و چاوتێبری بەروبومی ناڕەزایین.

بە دوربونی دڵیش لە چاوتێبری: داهاتی ڕەزامەندین ئینجا ڕەزامەندی درەختێکی پاکەو، بە ئاوی پاڵاوتەیی و نیەت پاکی لە باخی یەکتا پەرستیدا ئاو دراوە، قەدی

---

٧٨٩) هەڵخەڵاتاندن بە نومێدی پاشەڕۆژ.

درەختەکە بـاوەڕەو، لقەکانیـشی بـریتین لـە کـردەی چاکە، بـەری ئـەو درەختـەش بەرێکی پێ گەییو شیرینە.

لە فەرمودەدا هـاتوە: (( ذاق طعـم الایـمان من رضـي بـالله ربـا، وبالاسـلام دینـا، وبـــمحمد نبیـــا... ئـەو کەسـەی خـوای بـە پـەروەردگارو، ئیـسلام بـە ئـایینو، (موحەممەد)ی بە پێغەمبەری قەبوڵە تامو چێژی باوەڕی چەژتـوە)).

لە فەرمودەیەکی تریشـدا هـاتوە: ((ثـلاث من کن فیه وجد بهن حـلاوة الایـــمان.... سێ خەسڵەت هەن هەر کەسێ تێیدا بێنەدی شیرنایەتی باوەڕیان پێ دەچێژێ)).

## ناقـــایلـی دەروازەی گومـــانو دودڵیـــــە :

ناڕەزایی دەرگای گومانو دودڵی لە خاوەنەکەی دەکاتەوە گومان بەرامبەر بە خوا، بە قەزاوقەدەری خوا، بەرامبەر دەسـەڵاتو کـار لـە جێیـیو زانـستی خـوا، کـەم وایـە مەردمی ناقایل دور بێ لەوەی گومانی نەچێتە دڵییو بەناو ناخیدا نەچێتە خوارێ، با هەر چەنـدە دەرکی پێ نـەکا، بـەس ئەگـەر بـێو بـە تـەواوی دڵو نـاخی بپـشکنێ، هەسـت دەکـا یـەقینو دڵنیـایی لـە کـەدارە، جـا بـێ گومـان ڕەزامەنـدیو دڵنیـایی دو هاوڕێی بەیەکەوە دەستە برانە، دو دڵیو نـاڕەزاییش بەیەکـەوە بەسـترانە، هـەر ئـەو واتایەش لەو فەرمودەیە دەفامرێتەوە کە (تیرموزی) دەیگێڕێتەوە: ((ان اسـتطعت ان تعمل بالرضا مع الیقیـن، فافعل. فان لـم تستطع، فان فـــي الـصبـر علـى مـا تكـره النفـس خیـرا كثیـرا... ئەگـەر توانیـت بـە ڕەزا نـوێنی هاوکـات لەگـەڵ دڵنیـایی کـار بکەی ئەوا بیکە. ئەگـەریش نـەت تـوانی، ئـەوا بـێ گومـان ئـارامگرتن لەسـەر ئـەوەی دەرون پێی ناخۆشە، چاکەیەکی زۆری تێدایە.

ئەوسا ئەوانەی ناقایلو بێ زارن لـە ناخـەوە قـین لـە دڵـن، ئەگـەر بـە دەمیـشیان دەرنەبڕن لە دڵەوە توڕەو ترشن، گلەییو گازاندەو پرسیار گەلێکیان لـە دڵـدا گەڵاڵـە دەبێ، ئەوەی لـێ دەفامرێتەوە: ئەوە بۆ؟ ئەی ئەمەیان چۆن دەبـێ؟ ئـەوەیان بۆچـی هاتە دی؟

## ڕەزانوێنی دارایی و ئاسودەیی یە:

هەرکەسێ پڕ بە دڵ بە قەدەری خوا قایل بێ، خوای گەورە سینەی لێوان لێوی [٧٩٠] دەوڵەمەندی و بێ ڕەزایی و [٧٩١] هێورەیی [٧٩٢] دەکا، دڵیشی بۆ خۆشەویستی و گەڕانەوە لای خۆی و پشت پێ بەستنی یەك لا دەکاتەوە.

هەر کەسێکیش لەو بەشەی ڕەزانوێنی بێبەش بێ دڵی بە پێچەوانەی ئەمانە پڕ دەبێ و، لەو شتەی بەختەوەری و سەرفرازی وی تێدایە بە دور دەبێ.

سا [٧٩٣] قایلی دڵ بۆ خوایەك لادەکاتەوە، ناقایلیش دڵ لە خوا بە تاڵ دەکا، مرۆڤی جاڕس و ڕقاوی هیچ ئۆقرە ناگرێ و شپرزەو چەپرەك و شڵەژاوە، لای وایە لە برسان دەمرێ و بەشی کەمی پێ براوە، وا دەزانێ بەهرەو خەڵاتی کە منو، دەردو بەڵاشی زۆرن، وا هەست دەکا شیاوی لەوە زیاترەو، شکۆدارو پایەدارترە، بەڵام بە بۆچونی ئەو -خوا بە سوك و چروکی زانیوەو بەشبڕاوو بەرە بەڵای کردوە، زەبون و کەشەنگی کردوە [٧٩٤]، ئەوسا چۆن ئاسودەو حەساوە دەبێ، چۆن بەبێ دەردەسەری دەژیی؟

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ... چونکە ئەوان وە شوێن شتێکی وا کەوتون کە خودای تورە کردوەو بە ڕەزای ئەو ڕازی نەبون، ئەوسا ئەوییش کاریانی لێ پوچ کردون. (٢٨) محمد ﴾ .

---

٧٩٠) پڕاوپڕی.

٧٩١) بێ قایلی.

٧٩٢) هێمنی.

٧٩٣) جا / ئینجا.

٧٩٤) بارگرانی کردوە.

## سوپاسگوزاری بەرهەمی ڕەزانوێنیە:

ڕەزانوێنی ئەو ستایشە بەرهەم دێنێ کە ئەوپەڕی پلەی باوەڕداریە، بەڵکە ناوەڕۆکی باوەڕە. لە ڕاستیدا بەرزترین پلەو ئامانج سوپاس گوزاری پەروەرێنە[٧٩٥]، ئەو کەسەی لە بەهرە پێ بەخشراوەکانی خواو بڕیارو فەرمانی قایل نەبێ، لە دەست کردو سازاندنو، گرتنەوەو بەخشینی ڕازی نەبێ، سوپاسی خواش ناکا، جا ئەو کەسەی سوپاس بژێرە لە هەموخەڵك ئاسودەو خۆشحاڵ ترە.

## بێ باوەڕی بەرهەمی ناقایلیە:

ناقایلی پێچەوانەی سوپاسگوزاری لێ فەراهەم دێ، ئەویشیان سەرپێچی بەهرەکانە، جاری وایە سەرپێچی بەهرە نوێنیشی[٧٩٦] لێ وەدی دێ.

جا ئەگەر بەندە لە هەمو بوارێکدا لە پەروەرندەی قایل بێ، بە پێویستی دەزانێ سوپاسکاری بێ، ئەوسا لە ڕێزی سوپاسکارانو ڕەزانوێنان دەژمێردرێ.

ئەگەر ڕەزامەندیشی لەدەست چێ لە دەستەی ناقایلان حسێب دەکرێو ڕێبازی بێباوەڕانیشی گرتۆتەبەر.

ستەمو سەرپێچیش، کە لە بیروباوەڕەکاندا ڕودەدا کەلێنو کە لەبەر دەکەوێتە نێو ئایینەکانەوە سەبارەت بەوەیە بەندەو دروستکراوەکان دەیانەوێ خۆیان بە خوا لەقەڵەم دەن، بەڵکە پێشنیاری لەسەر خوا دەکەنو، وا دەخوازن لە ئاستی سنوری خوایان خۆیان بەربەرەلاکەن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! نەچن وەپێش خواو پێغەمبەرەکەی کەون.(١) الحجرات﴾.

---

٧٩٥) پەروەردگار.

٧٩٦) مەبەست لە بەهرەنوێن: خوایە.

## ناقایلی داوو تەڵەی شەیتانەوە

شەیتان لە کاتی نارەزایی‌و ئارەزو هەڵسان بەسەر مرۆڤدا زاڵ دەبێ‌و پێی دەوەستێ‌و، لە وێندەرێ ڕاوی دەکا، بە تایبەتیش ئەگەر نارەزایی لەدڵدا بسەپێ، ئەو هەلە وتەی وای بەسەر دەم دادێ کردەوەی وادەنوێنێ ویست‌و نیازی وا لەناو دڵیدا دادەنێ، کە خوا پێی ناقایلەو ڕقی لێیە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی مردنی ئیبراهیمی کوڕی دەفەرموێ: ((**یحزن القلب، وتدمع العين، ولا نقول الا ما يرضي ربنا**... دڵ خەفەت بارەو، چاویش ئەسرین دەڕێژێ، ئەوەی پەروەردگاریشمان پێی قایلە هەر ئەوە دەڵێین)).

هەند جارە مردنی جگەرگۆشە لەو ڕوداوانەیە وا لە بەندە دەکا نارەزایی لە قەدەر بنوێنێ، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵ دەدا لەم جۆرە بارودۆخەدا کە زۆربەی خەڵکان ناقایلی دەنوێنن، ئەوەی خوا پێی ناخۆشە دەی کەن‌و دەی ڵێن - تەنیا ئەوە دەڵی کە خودای بەرزو بێ هاوتا پێی قایلە.

ئەگەر بێ‌و بەندە لە کاتی ڕودانی ئەوەی دڵی دەوروژێنێ[797] سێ شتان سەرنج بدا، خوای گەورە سێبوری ئەدا.

یەکەمیان: بەوە ئاگادار بێ، کە ئەو خوایەی بڕیاری لەسەر داوە - شکۆمەندی‌و پایە بڵندی بۆ ئەو - کاراشنایەو دەزانێ چی بۆ بەندە باشەو لە بەرژەوەندی وی دایە.

دوەمیان: چاوی لە پاداشت‌و خەڵاتی بێوێنەو زۆری خوا بێ، هەروەکو خوا بەڵێنی بەو کەسە داوە لە بەندەکانی دوچاری کارەساتێ دەبێ‌و ئارامی لەسەر دەگرێ.

سێهەمیان: وادانێ بڕیارو فەرمان ئی خوایەو، ملکەچی‌و سەردانەواندنیش ئی بەندەیە: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ... ئا خۆ ئەوان بەزەیی پەروەرندەی تۆ دابەش دەکەن. ﴿٣٢﴾ الزخرف ﴾.

---

٧٩٧) ئازار دەدا.

## ڕەزانــوێنــی هــەواو هــەوەس دەرەوێنــێ:

ڕەزامەندی هەوەس بازی لەناو دڵدا دەتارێنێ، جا ئەو کەسەی ڕەزا نوێنە هەواو هەوەسی وەدوای ویستی خوا دێخی، ئەوەی خوا پێی خۆشەو پێی قایلە بەو شێوە هەڵی دەسوڕێنێ، ئەوسا هەواو ئارەزو لەگەڵ ڕەزامەندی هەرگیزاو هەرگیز لە ناو دڵدا بەیەکەوە جێیان نابێتەوە، جا ئەگەر دڵ لەویانو لە میانی بەش هەبێ، کامەیان زاڵە سەرکەوتن بۆ ئەو دەبێ.

﴿... وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ ... پەلەم بو زو بگەم بە تۆ، هەتاوەکو لێم ڕازی بی. ﴾.

## تێــڕامــانێــك

((تعرف الـــى الله في الرخـاء، يعرفـك في الـشدة... لە هێمناییدا خوا بناسە، لە تەنگانەدا دەتناسێ)).

(تعـرَّف) پیتی (ڕا) بە توندی بخوێنەوە (الى الله) خۆت لە خوا نزیك کەیتەوەو خۆشت بوێ، ئەوەشیان بەوە دەبێ گوێڕایەڵی بکەی، لەسەردا ڕژانی بەهرەو خەڵاتی سوپاسی کەی، لە ژێر تالآیی بڕیارو قەدەری خوا دان بەخۆت دابگری، بەر لە هاتنە خوارەوەی دەردو بەلا بە دڵێکی پاكو پالآوتەوە ڕوی تێ بکەی.

(فـي الرخـاء) لە هەبوییو نازو گۆزو خۆشگوزەرانیدا لە هەبونی تەمەنی درێژو لەش ساخی دا، دەست بکە بە خوا پەرستیو ماڵ بەخشین لە پێناویدا، هەتاوەکو بەو ڕەوشتە لەلایەن خواوە ناوت دەهێنرێو دەناسرێی.

(یعرفك في الشدة) ئەوەشیان بەوە دەبێ خوا لە تەنگانە دەرتدەهێنێو، لە هەمو ناخۆشیەك دەرگای خێرت لێ دەکاتەوەو، هەمو پەژارەیەکت لەسەر لائەبا، ئینجا ناساندنی تۆ بەو بەهرانە دێتە دی.

پێویستە لە نێوانی بەندەو پەروەرێنیدا ئاشنایەکی تایبەت هەبێ لەناو دڵی بەندەدا، بە شێوەیەکی وا هەست بکا لە کاتی نزاو سکاڵادا لێی نزیکە، ئەوسا لە تەنیاییدا دڵی پێ بسرەوێ، لە نزاو پاڕانەوەو یادو گوێ ڕایەڵیدا شیرنایەتی بچێژێ، بەندە هەم لە دنیاداو هەم لەناو گۆڕو هەم لە ڕۆژی سەڵادا بەربەستو لە مپەری زۆری لە ڕێدا، جا ئەگەر لە نێوانی بەندەو پەروەردگاری دا ناسینێکی تایبەت هەبێ، ئەوەندەی بەسە لە هانای بێ.

## چاوپۆشی لە هەڵەی دۆستان

﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ... چاو بپۆشەو فەرمان بە کاری چاك بدەو لەو نەزانا نە واز بێنە. (١٩٩) الأعراف ﴾.

ناکرێ سەبارەت بە نابەدڵی ڕەوشتێك یادو پشت لە خۆشەویستان بکرێ لە کاتێکا هەمو ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ترت بە دڵ بێ، لەبەرئەوەی شتی کەم چاوپۆشی لێدەکرێو، تەواویش هەر بۆ خوایە، (کیندی)یش دەڵێ: تۆ چۆن یەك ڕەوشتت لە هاوەڵەکەت دەوێ، کەچی خاوەنی چوار سروشتە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەرونی مرۆڤ تایبەتە بە خۆی، لەژێر دەستی خۆی دایەو بە ویستو ئارەزوی خۆی هەڵی دەسوڕێنێ، ئەو جارەش ناتوانێ لە هەر چی بیەوێ جڵەوی بگرێ، لە هەر شتێ کە پێی خۆشە وەڵامی ناداتەوەو گوێ ڕایەڵی نابێ، جا چ جای دەرونی خەڵکانی تر؟!

﴿ ... كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ... ئێوەش بەرێ هەروا بونو باوەڕیتان بە خوا نەبو، خودا ئێوەی بە بەزەیی خۆی خوێندەوە. (٩٤) النساء ﴾.

﴿ ... فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ... هیچ پاکانەی خۆتان مەکەن، بۆ خۆی باشترتان دەناسێ کە کێ لە خودا ترساوە. (٣٢) النجم ﴾.

ئەوەنــدە شــت بەســە کــە زۆربــەی هەڵس‌وکــەوتی برایەکــەت بەدڵــە، بێگومــان (ئــەبودەرادا)یــش - خــوای لــێ ڕازی بێــت - دەڵــێ: گلــەیی‌و گازانــدەی هــاوەڵ باشــترە لەوەی هاوەڵت نەبێ، کێ هەیە ببێ بە هاوەڵی تۆ هیچ کەم‌و کوڕیشی نەبێ؟!

هەندێکیش لە کاراشنایان دەڵێن: خواستنی بێ کەم‌و کوڕی، لە بێ ویژدانیە.

هەندێکی تریشیان دەڵێن: ئێمە لە خۆمان قایل نین، جا چۆن لـە غـەیرە خۆمـان قایل دەبین!!

ڕەوان بێـژانیش هەیانـە دەڵـێ: بـە سـای هەڵەیـەکی کـەم‌و تـاوانێکی چوك دەست بـەرداری کەسـێ مەبـە، لـە کاتێکـا بـە هەڵس‌وکـەوت‌و خووڕەوشـتی قـایلی‌و ستایـشی لەسەر دەکەی، چاکەو ڕێزی دەخوێنیەوەو، ڕۆشـن فکـری وەدی دەکـەی، کەچـی ئـەو هەڵـەی بـە زۆر جـوامێری‌و پیـاوەتی داپۆشـراوەو، ئەوەنـدە هۆکاریـشی لەبەردەسـتن تـاوانی پـێ بسڕێتەوە، بێگومـان تـۆ تـا لـە دنیـا هـەی کەسـێکی وات دەسـت ناکـەوێ فریشتە ئاسابێ هیچ تاوانێکی لێ ڕونەدا، دوای ئەمەش پەند لـە نـاخ‌و دەرونـی خـۆت وەرگرە، بە ویست‌و ئارەزوی خۆت هەڵناسوڕێ، چۆن دەتەوێ ئـاوا نایێتـە بەرچـاوت، بێ گومان ئەگەر بەخۆتدا بچیەوەو پەند لە خودی خۆت وەرگری، ئەوەی بە دوایـدا دەگەڕێی خەمی لەسـەر هـەڵناگری‌و، لـە ئاستی ئـەو کەسـەی هەڵەیـەکی لـێ ڕوئـەدا نەرم‌و نیانی دەنوێنی.

ئەو وتەیە ئەو قسەیەمان هەڵناوەشێنێ کە پێویـستە هاوڕێیەکـەت هەڵـسەنگێنی‌و چـوار ڕەوشـتی لــێ وەدی کـەی، چـونکێ ئـەوەی ناشـێ لێـی بێتـە دی چاوپۆشـی لێدەکرێ، ئەوەش وا ناگەیەنێ پەستی‌و خەفەت دات بگرێ، کە ماوەیـەکی پێدەچـێ هـەتا ئـەو خـوەی لـێ وەدی دەکـەی، یـا بـە هـۆی سـاتمەیەك گومانـت لـە ئاسـتیدا خراپکەی، تا ئەو کاتەی بە تەواوی گۆڕانی لـێ بـەدی نـاکرێ‌و دڵنیانیـت خـۆ بخاتـە بەرگێکی ترەوە، با ئەو ماوەیەت تایبەت بێ بە خودی خـۆت‌و حەسـانەوەی هەسـت‌و نەستت، بێ گومان مرۆڤ لەگـەڵ ئـەو دەرونـەی لـە هـەمو دەرونێـك پـتر تایبەتـە بـە خۆی هەمو ساتێك بە یەك شێوە مامەڵەی لەگەڵدا ناکـات‌و، ئـەوەش وا ناگەیـەنێ لـە دەستی بێزارەو، لەگەڵیدا دوژمن کـارە. وتەیـەکی نەسـتەق‌و پـڕ واتـاش هەیـە تیایـدا گوتـراوە:

با گومانـت لـە ئاسـتی دۆسـتو پاوەرێکدا تێکت نـەدا کـە بـە سـای دڵنیابونـت لـە ئاسـتیدا چـاكو گونجـاوی. (جەعفـەر)ی کـوڕی (موحەممـەد) بـە کوڕەکـەی دەڵـێ: ڕۆڵەکەم، ئەو دۆستو یاوەرەت کە سێ جار لێت تـوڕە بـوەو، تـەنیا قسەی ڕاستیـشی دەربارەی تۆ وتوە، بیکە بە دۆستی تایبەتی خۆت.

(حەسەن)ی کـوڕی (وەهـب)یـش دەڵـێ: یـەکێ لـە مافـی خۆشەویـستی ئەوەیـە لـە هەمبەر برایانت لێبوردە بیو، ئەگەر کەمو کوڕیەکیان هەبو چاوی لێبنوقێنی.

دەگێڕنەوە کە (عەلـی) - خوا لێی ڕازی بێ - دەربـارەی ئـەو ئایەتـە: ﴿... فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ... دەڵێ: مەبەست ئەوەیە: بێ گلـەییو گازانـدە (لـە برایەکـەت) قایـل بی. ﴿٨٥﴾ الحجر﴾.

﴿... وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا ... ئەگەر چاکەو بەزەیی خوداو لەسەر نەبا، هیچ کەسێکتان هەرگیز پاك نەدەبونەوە. ﴿٢١﴾ النور﴾.

﴿... فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ... هیچ پاکانەی خۆتان مەکەن، بۆ خـۆی باشتر تان دەناسێ، کە کێ لە خودا ترساوە. ﴿٣٢﴾ النجم﴾.

## بە هــەل زانینی کــات بە تـاڵیو تەندروســتی لە پێناوی خوا پەرســتی

پێویستە لەش ساخیو کات بەتاڵیت بە فیڕۆ نەدەی، لـە گوێڕایـەڵی پـەروەردگارت کەمتەرخـەمی نەکـەی، متمانـەی تـەواو بـە کـردەوەی ڕابـردوت نەکـەی، بـا هـەوڵو گەڕت دەستکەوتی لەش ساخیت بێ، کـردو کۆشـت هـەلی کات بـە تاڵیـت بـێ، هـەمو کــاتو ســاتێکت بــۆ نارەخــسێ، ئــەوەی فریــای نەکــەوی لــە دەســتت دەردەچــێ، بەسەربردنی کات بـە بـەتاڵی سـەر لـێ تێکچون یـا پەشـیمانی لـە دوایـە، تـەنیاییش دەرەنجامەکەی لادانە یا ئاخو ئۆف هەڵکێشانە.

(عومەر)ی کوڕی (خەتتاب)یش دەڵێ: سرەوتن بۆ پیاوان بێ ئاگایی دروست دەکا، بۆ ژنانیش هەواو ئارەزو پەیدا دەکا.

(بوزر جومهور)یش دەڵێ: ئەگەر سەرقاڵی شەکەت بێ، بێکاریش سەرچاوەی خراپەیە. هەندێ لە کاراشنایانیش دەڵێن: وریا بن لە بەسەربردنی بەتاڵی، چونکێ هەستو ژیری تێکدەداو، ئاسانی ئاڵۆز دەکا.

ڕەوان بێژانیش هەیانە دەڵێ: ڕۆژی خۆت جگە لە قازانجو داهاتێك بەسەر مەبە، ماڵو سامانیشت جگە لە چاکەو پیاوەتیدا خەرج مەکە، چونکی تەمەن کورتترە لەوەی لە شتی بێهودە بەڕێ بکرێو، سامنیش کەمترە لەوەی لە خراپەدا بە هەدەر بدرێ، کەسی ژیریارو هۆشمەندیش بەرێزترە لەوەی ڕۆژگارەکانی لە پێناوی شتێکدا بەسەر ببا سودو کەڵکی لێ ڕەچاو نەکرێو، سامانو دارایی لە شتێکدا بە هەدەر چێ، پاداشتو خەڵاتی لەسەر وەرنەگرێ.

پاراوتر لە وتەیە ئەو پەیڤەیە کە پێغەمبەر عیسا - درودو سڵاو لەسەر ئەوو پێغەمبەری ئێمە بێت- دەری دەبڕێ: چاکە لە سێ شتدا خۆی دەنوێنێ: لە ژیربێژیو، تێفکرینو، بێ دەنگیدا، جا هەر کەسێ ژیربێژی لە یادی خوا بەکارنەهێنا بێ هودە دواوە، هەر کەسێکیش تێفکرینی بێ پەند وەرگرتن بو داڵغەی لێداوە، ئەوەش کە بێدەنگیەکەی بۆ بیرکردنەوە نەبو خۆی خافڵاندوە.

## خوا دۆستی بڕوادارانە

بەندە ئاتاجی خوایەکە، پێویستی بە پشت گرو یاریدەدەرێکە، ئەو خوایەش دەبێ خاوەنی دەسەڵاتو هێز بێ، باڵادەستو بێ نیاز بێ، هەمیشە زیندو توانادار بێ.

ئەوەی خاوەندی ئەو ڕەوشتانەیە، هەر ئەو خوایەیە بێ هاوتایە، بێ وێنەو تاكو تەنیایە، هەموبونەوەری لە دەست دایە، پایەدارو شکۆدارە.

هیچ دروستکراوێ لەم گەردونەدا بەندە ئۆقرەی پێ ناگرێو، دڵی پێ دانامرکێو، تامو چێژ لە ڕوتێکردنی وەرناگرێ، مەگەر خوای بێ هاودەمو هاوتا نەبێ، هەر ئەوە پەنای بێ پەنایانە، دالدەدەری پەنا بەرانە، فریاد ڕەسی لێقەوماوو، پشتو پەنای بێکەسانە: ﴿... إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ ...﴾ لەو کاتەشدا کە هاناتان بۆ پەروەرندەتان دەبرد، لە هاناو هات. ﴿٩﴾ الأنفال ﴾ \.

﴿... وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ ... (ئـەرێ دەزانـن) كێيـە، پـەناى پـەنا بـەرەو دوژمنى ئەو پەنا نادرێ؟ (٨٨) المؤمنون﴾.

﴿... لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ ... لـە خـوا بـەدەر نـە هـيچ دۆسـتيان گـير دەكەوێو نە تكـاكـار. (٥١) الأنعام﴾.

هەركەسێكيش غەيرى خودا بپەرستێ، با هەرچەندە لە ژيانيدا خۆشى بوێو دڵى پێيەوە پابەندبێو جۆرێك تامى لێوەرگرێ، بەڵام ئەو خۆشەويستيە بۆ خاوەنەكەى ژەهرى ژيانەو، لە تاموچێژى ئەو خواردنەى خراپترە ژەهراوى كرابێ ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ... ئەگەر لە ئاسمانو زەويدا -جگە لە خوا- خوا گەلێكى تر هەبونايە، بێ شك هەردوكيان تێكدەچون. (٢٢) الأنبيـاء﴾.

## خـوداى پـەروەرێنى تەخـت، زۆر پاكتـرە لە هەرچى ئەوان بۆى دەڵێـن

بێگومان ڕاوەستانى ئاسمانو زەمين بەوە دەبێ خواى ڕاستەقينە بپەرستن، ئەگەر بێو جگە لە خوا خوايەكى تر هەبێ، ئەوا هيچ خوايـەكى ڕاسـتەقينە نابـێ، چونكێ خواى ڕاستەقينە نابێ وێنەو وێچوى هـەبێ، سـەبارەت بـەوەى جيهان بـە يـەك خـوا هەبون ڕاوەستاوەو، بە پێچەوانەش هـەموجيهان كـاول دەبـێ، ئـەوە لـە ڕوى خـوا بـە يـەك زانـين. ئەوسا شـتێكى ڕۆنو بەڵگـە نەويـستە كـە بەنـدە پێويـستى بـە خـواو پـەروەردگارێك هەيـە پـشت گـيرو دۆسـتى بـێ، ئـەوەش پەيوەنـدى بەندەيـەكى كۆتـا هـاتوە لەگـەڵ خوايـەكى هەميـشە زينـدو، پەيوەنـدى بـێهێزە لەگـەڵ بـەهێزدا، پەيوەندى هەژارە لەگەڵ بێنيازدا [٧٩٨]، هيچ گومانيشى تێدا نيە هەر كەسێك خودا بە پەروەردگارو خواى خۆى نەزانێ، چەند دروستكراوێكى تر لـە وێنـەو خۆشەويـستو ئارەزوەكان بە خواى خۆيدا ئەنێ: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ... تۆ ئەو كەسـەت دى كە هەرچى خۆى حەز بكا دەيكاتە پەرستراوى خۆى؟ (٤٣) الفرقان﴾.

---

٧٩٨) دەوڵەمەند/ بێ پێويست.

﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً ... بەدەر لە خوا، ئەوان پەرستراوێکی تریان پەرست. ﴿٨١﴾ مريم ﴾.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((**يا حصين، كم تعبد؟**... ئەی (حەسین) چەند خوا دەپەرستی))؟ (حەسین) گوتی: حەوت خوایان دەپەرستم، شەشیان لەسەر زەویدانەو یەکیان لە ئاسمانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((**فمن لرغبك ولرهبك؟**... کامەت بۆ خواستو ئارەزوو لێ ترسان داناوە))؟

(حەسین) گوتی: ئەوەیان کە لە ئاسمانە. فەرموی: ((**فاترك التي في الارض، واعبد الذي في السماء**... ئەوانەی لەسەر زەوین وازیان لێبێنەو، ئەوەیان بپەرستە کە لە ئاسمانە)).

دڵنیابە پێویستی بەندە بە خوا، لەو ڕوەی بیپەرستیو هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدا، بە هیچ شتێك ئەوەندە ئاتاج نیە، بەس ئەوەندە هەیە پێویستی خواپەرستی لە هەندێك ڕوەوە بە پێویست بونی لاشە دەچێ بە خواردنو خواردنەوە، کەچی لە زۆر لاوە بەیەك ناچن.

پێکهاتەی سەرەکی بەندە بریتی یە لە دڵو گیان، ئەوانیش تەنیا بەو خوایەی هەر ئەو خوای ڕاستەقینەیە گونجاو لەبار دەبن، لە دنیادا بە یادی خوا ئارام دەبن، ئەو دڵو گیانەیە بە ماندو بونو شەکەتی بەرەو خواوە لە ڕێدا، دەبێ هەر پێشی بگاتەوەو، بەوەش دەگونجێو دەسازێ هەر لە دنیا بەرەو خوا بێتەوە.

ئەگەر بێو بەندە بە جگە لە خوا ئاسودە بێو چێژ وەرگرێ، هەتا سەری سەر ناگرێ، بەڵکە لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی ترو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، لە هەندێك کاتو ساتدا لەم شتە تامو چێژ وەردەگرێو، لە هەندێك بواری تریشدا هەر ئەو شتەی پێی حەساوەو ئاسودە بو هیچ دڵی بۆ ناچێو چێژی لێ وەرناگرێ، بەڵکە بە سای ئەو پەیوەندیەی لەگەڵیدا هەبوەو ئێستا کە لەبەردەستی دایە دەیچزێنێو [٧٩٩] ئازاری پێ دەگەیەنێ.

---

٧٩٩) دەیئێشێنێ/ داخی دەکا.

بەڵام خوا لە هەمو سات و بوارێکدا، لە هەمو شوێنێکدا لەگەڵیداو، بەبێ ئەویش کاری ناڕوا.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((**من أرضى الله بسخط الناس، رضي الله عليه، وأرضى عنه الناس. ومن أسخط الله برضا الناس، سخط الله عليه وأسخط عليه الناس** ... هەر کەسێ بە تورەکردنی خەڵك خوا لە خۆی ڕازیکا، خوای لێ ڕازی دەبێو، وا دەکا خەڵکیشی لێ ڕازی بێ. هەر کەسێکیش بە ڕازیکردنی خەڵك خوا لە خۆی بڕەنجێنێ، خوا لێی ناقایل دەبێو، خەڵکیشی لێ ناقایل دەکا)).

ئێستاش لەگەڵ دابێ داستانی "عەکوکی"ی شاعیر یاد دەکەمەوە کە ستایشی (ئەبو دولف)ی فەرمانڕەوا دەکاو دەڵێ: هەر کە دەستت کردەوە بە بەخشش و چاکەبو بەمەبەستی بژێوی و خەڵات و پیاوەتی بو.

دوا بەدوای ئەوە خوای گەورە (خەلیفە) (مەئمون)ی بەسەردا زاڵ دەکاو بە سای ئەو هۆنراوەیە هەر لەسەر جێگای خۆی دەیکوژێ.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ... بەم چەشنە بڕێك لە ناهەقیکاران -لە سۆنگەی ئاکاری دەیکەن- دەخەینە ژێر دەسەڵاتی بڕێکی تریان. (١٢٩) الأنعام ﴾.

## چەند هێمایەك لە ڕێگای توێژەران

بەختەوەری و کامەرانی چەند ئامارێکیان [800] هەیە دەدرەوشێن، چەند هێماییێکیان [801] هەیە دەدرەخشێن [802]، بۆ پایەداری و شکۆداری خاوەن و هەڵگرانیان گەواهی دەرن [803]، بۆ ئەو کەسەی پێیانەوە ناوزەد کراوە [804] نیشانەی سەرکەوتنن.

---

٨٠٠) نیشانە.

٨٠١) نیشانە.

٨٠٢) دەتروسکێن.

٨٠٣) شایەدی دەدەن.

٨٠٤) ناسراوە/ناوی دەرکردوە.

جا یەکێ لە هێمای ئاسودەییو بەختیاری ئەوەیە: هەرکاتێ بەندە لە ڕوی زانستو زانیاریدا گەشەی کرد، خۆ بەکەمزانیو میهرەبانیشی گەشە دەکا، زانست وەکو گەوهەری بێوێنەیە، چەندی سەنگی زیاد بێو، پتر بەهادار بێ [٨٠٥]، بە قوڵایی دەریادا دەچێتە خوارێ، ئەوسا بەندە تێدەگا، کە زانست بەهرەیەکی ڕیشە داکوتاوو داسپاوە هەر یەکێ خوا حەز بکا پێی تاقی دەکاتەوە، جا ئەگەر بە ڕاستو درستی وەریگرتو بە جوانی کاری پێ کرد، خوا چەند پلەی پێ بەرزدەکاتەوە: ﴿... يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ...﴾ خوا ئەوانەی لەنگۆ باوەڕیان هێناوەو ئەو کەسانەش کە لە زانیاری بەشدارن، بە چەند پلە بەرزتریان دەکاتەوە. ﴿ المجادلة ١١﴾.

چەندی پتر زانستو زانیاری وەدەست بێنێ، ترسو بیمی لە خوا پتر دەبێ، دەترسێ لەوەی پێیەکانی بخلیسکێ، زمانی بە خراپە بدوێ، دڵی بەلادا وەرگەڕێ، هەروەکو باڵندەی وریاو بە ئاگا لەسەر هەستو چاوەدێرە، هەر کە لەسەر درەختێ دەنیشێ زوبەزو جێی دەهێڵێ، دەترسێ لەوەی ڕاوچییێك بێ پێکێو [٨٠٦] وەبەر ساچمەی تاپڕەیێك [٨٠٧] بکەوێ.

ئەو بەندەیە چەندی تەمەنی زیاد بێ، کەمتر چاوی لە دنیا دەبێ، بەبێ گومانو دودڵی دەزانێ قۆناغی ژیانی تێپەڕداوەو، بەرەو لێواری مەرگ هەنگاوی هەڵێناوەو، ئەوەندەی لە تەمەندا نەماوە.

چەندەی سامانو دارایی پتر دەبێ دەستکراوەو چاوتێر دەبێ، چونکێ ماڵ دەست خوازو [٨٠٨] سپاردەیە [٨٠٩]، خوای بەخشندە بەندەی پێ تاقی دەکاتەوە، هەبوییو خواپێدانیش بۆ چاکەنواندن هەلێکی ڕەخساوەو، مەرگیش خۆی لە مەکۆ ناوە.

---

٨٠٥) بە نرخ بێ.

٨٠٦) تێبگرێو پێی بکەوێ.

٨٠٧) جۆرە چەکی ڕاوکردنە.

٨٠٨) بەبێ بەرامبەر درابێ.

٨٠٩) ئەمانەت.

هەرچەندە شکۆو ڕێزی پتر دەبێ، پتر لەگەڵ خەڵکی تێکەڵ دەبێ بە تەنگ پێداویستیەکانیانەوە دەبێو لە ئاستیاندا خۆی پێ کەم دەبێ، چونکێ بەندەکانی خوا چاویان لە میهری خوایە، خۆشەویستترین کەسیش لەلای خوا بەسودترینیانە بۆ ئەوانەی چاویان لە میهری خوایە.

ئامارو هێمای بەدبەختی بەندەش ئەوەیە: چەندی لە ڕوی زانستەوە بەرەوپێش چێ، لوت بەرزیو خۆ پێ زۆری پتر دەبێ، ئەوسا زانیارییەکەی بێسودە، دڵی چۆڵو بەتاڵە، هەستو نەستو خوڕەوشتی توندو خەستە.

چەند زانیاری پتر بێ خۆی پێ گەورەتر دەبێو خەڵکی پێ کەمتر دەبێو لە خۆ ڕازیتر دەبێ.

لای وایە بەڕێ خۆی لە ئاوێ هێناوەتە دەرێو خەڵکی تریش لەناوچو، ئەو ڕزگاربونی لە بیابانێکی بێ مەودا دەستەبەر کردوەو، خەڵکانی تریش لەسەر لێواری هەڵدێرانن.

چەندی تەمەنی درێژتر بێ بۆ دنیاداری سورتر دەبێ، ماڵ داکەری دەست قوچێنە. ڕوداو کاری تێناکەن، لە کارەساتان پەند وەرناگرێ، بە مەرگەساتان بەئاگا نایێ، هەتا هەبویی تر بێ نان کوێرو چڕتر دەبێ، دەرونی لە خونەریتی باڵا خاپورو وێرانەیە، دەستی لە بەخشین گیراوەیە، چوختو بێ ئابروە.

چەندە ناودار بێو بناسرێ، باڵ فشو ڕۆح زل تر دەبێ، لە خۆبایيو ترسنۆکە، ویستو ئیرادەی پرشوبڵاوەو خۆی گیف کردۆتەوەو، دەستی لە خراپە ناگێڕێتەوە، بەڵام دەرەنجامی مایە پوتە: ((**یحشر المتكبرون يوم القيامة في صورة الذر، يطؤهم الناس باقدامهم**... لە ڕۆژی دواییدا خۆ پێزۆران لەسەر وێنەی مێرولە وردە کۆدەکرێنەوە، خەڵکان بە پێیەکانیان وەسەریان هەڵدەپەڕن)).

ئا ئەوانەی باسمان کردن بەسەرکردنەوەو چەند تاقیکردنەوەیێکن خوا بەندەکانی پێ تاقی دەکاتەوە هەندێکیان پێی سەربەرز دەبنو هەندێکی تریش پێی چارەڕەش دەبن.

## پلــەو پایــە تــاقی کردنەوەیـــە

چۆن دەوڵەمەندیو قەڵەم ڕەویو دەسەڵات مرۆیان پێ تاقی دەکرێتەوە، هەر بەو شێوەیە قەدرو ڕێزیش بۆ بەڵاو تاقی کردنەوەن، ئەو کاتەی پێغەمبەر (سولەیمان) - سـڵاوی خـوای لەسـەر- بـینی تـەختی (بـەلقیس)ی لەبەردەسـتە خـوای گـەورە دەربارەیـــەوە دەفـــەرموێ: ﴿... هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ... ئەمـــەش چاکەی پەروەرێنی منە، ویستی تاقیم بکاتەوە، ئاخۆ شـوکرانە بژێرم یان پێ نەزان. ﴿٤٠﴾ النمل﴾.

خـوای بـێ هاوتـا بـەهرە بـە بەنـدەکانی دەبەخـشێ تـاوەکو ببینـێ کامـەیان بـە شـێوەیێکی ڕاستو دروسـت وەریانـدەگرێو، ستایـشیان لەسـەر دەکـاو دەیانپـارێزێو، وەبەریان دێنیو، سود بەخۆیو بە خەڵکانیش دەگەیەنێ، ئاخۆ کامەشیان بـەهرەکان پـشتگوێ دەخـاو لـەکاریان دەخـا، سەرپێـچیان لێـدەکاو لـە دژی خـوای بەخـشەریان خەرج دەکا، بۆ دوژمنایەتی خوای خەڵاتکارو دەسەڵاتدار پشتیان پێوە دەبەستێ.

ئەوسـا بـەهرەکان لەلایـەن خـواوە بـۆ تـاقی کردنـەوەن، سوپاسـی سوپاسـگوزارو سپڵەیی سپڵەکار بەدیار دەخەن. هەروەکو بەڵاو مەینـەتی لەلایـەن خـوای بـێ هاوتـا تاقی کردنەوەن، ئینجا خوا هەم بە خۆشـیو هـەم بـە ناخۆشـی بەنـدەی خـۆی تـاقی دەکاتـــەوە، هـــەروەکو دەفـــەرموێ: ﴿فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلَاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ... بەڵام مـرۆ هـەر کـاتێکی پـەروەردگاری دەیخاتـە بـەر ئەزمونـەوەو ڕێـزی لـێدەگرێو بـەهرەی پێدەگەینێ، ئێژێ: ﴿ئەوا﴾ پەروەرندەم قەدری گرتم. ئەگەریش -هەر بۆ ئەزمونـێ - پەروەردیاری بژێوی لێ کەمکردەوە، ئەوسا ئێـژن: پەروەرنـدەم سـوکایەتی بەسـەر هێنام. ﴿١٧﴾ الفجر﴾.

مەبەستی ئەوەیە: هەر کەسێ خوا ماڵو سامانو نازو گۆزی بەسەردا ببارێنـێ، وا ناگەیەنێ خوا ڕێـزی لـێ نـاوە، ئـەو کەسـەش کـە خـوا ڕۆزی لـێ تـەنگ کردۆتـەوەو بەربەڵای کردوە مانای ئەوە نادا خوا سوکو چروکی کردوە.

## گەنجینەی بێ بن

بێگومان موسڵمانەتیو باوەڕداریتی، چاکەکاریو پیاوەتی، دەربەدەریو تێکۆشان بۆ خوا، گەڕانەوەو تۆبەکردنو لە خوا ترسان، بەهرەو خەڵاتی گەورەو بێوێنەن، هەر ئەوون بۆ خاوەنەکانیان گەنجینەی نەبڕاوەن، توێشوی ماڵی تا هەتایەن: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ... کاری چاك هەر ئەوەنیە ڕو دە ڕۆژهەڵاتێ بکەن یان ڕۆژئاوا. چاك ئەمەیە باوەڕیتان بە خواو بە ڕۆژی سەلایە. ﴿١٧٧﴾ البقرة ﴾.

(لە کۆتایی ئایەتەکە دەڵێ) ﴿ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾... ئەوانەن لە خوا دەترسن.

## وەرەیەك سەری لە چڵ چرا دەدا

ئەگەر بەندە وەرە بەرزی پێ بڕێ، هەموڕێگاو بانی چاکە ویستی پێ دەگەڕێ بەرەو پلەی بەرزە باڵا سەردەکەوێ.

خۆ ڕازاندنەوە بە وەرە بەرزیو، ویستو مەبەستو ئامانجی گەورە، یەکێکن لە داب ڕەفتاری موسڵمانەتی.

جا وەرە بەرزی سەرچاوەی دروست کردنی دو جەمسەری کەسایەتی تۆیە، بەسەر ئەندامانی لاشەتدا چاوە دێرە، ئەو وزەو تەوژمە گڕ گرتوەو بەهێزەیە خاوەنەکەی بەرەو خونەریتی باڵاو پێشبڕکێی ڕەوشتە بەرزەکان پاڵ پێوە دەنێ.

بە پشتیوانی خوا وەرە بەرزی خێرو خۆشییەکی نەبڕاوەت بۆ فەراهەم دێنێ، بۆ ئەوەی بەرەو لوتکەی کامڵی هەنگاوت پێ هەڵێنێ، هەستی جوامێریو پیاوەتیت بە ناو دەمارەکاندا بێنێ، لەناو گوڕەپانی کردارو زانستدا بت ڕەتێنێ [810].

---

٨١٠) پێت غار بدا.

با خەڵك تەنیا لە بەر دەرگای چاكەكاری بت بینن، دەستەكانت تەنیا بۆ كارو كردەوەی بایەخدار پان بكەوە، كێبەركێی ئەوانە بكە بە دوای كردەی چاكەدا وێڵن، پێشبڕكێی ئەوانە بكە لە كاری ناوازەدا سەروەریان وەدەست هێنا، بە شتی كەمنرخ قایل مەبە، بە دوای بەرماواندا [٨١١] مەگەڕێ، شتی بێ بەهات قەبوڵ نەبێ. بە سای خۆ ڕازاندنەوەت بە ورە بەرزی، كاروكردەی بێ سودو خۆزگەو خواستی بێ هودەت لێدا دەڕنێ، ڕەگو ڕیشاڵی سەرشۆڕیو مل شۆڕیت، ماستاو چیاتیو مەراییت [٨١٢] لێ هەڵدەكێشرێ، ئەوسا مەردمی ورە بەرزو خۆڕاگر بە تەنگانە ناشڵەژێ [٨١٣]، ئەوەی لەو بەهرەیەش دەست بەتاڵە نە وێرەكو بێ زاڵە [٨١٤]، زمانی لە گۆ [٨١٥] گیراوە.

وریا بە ورە بەرزیو خۆ پێ زۆری تێكەڵ نەكەی، چونكە جیاوازی نێوانی ئەو دوانە، وەكو جیاوازی نێوانی ئاسمانو ڕێسمانە، ورە بەرزی تاجی سەری دڵی كەسێكی سەربەستو ئازادە، بە سای ئەو دڵە هەمیشە بۆ پاكیو پیرۆزیو دەستەبەركردنی هەڵوێستی جوان مەردانە تێدەكۆشێ، كەسی ورە بەرز لە ئاهی لەدەستدانی كاری چاكە پەنجەی پەشیمانی دەگەزێو تامەزرۆی پڕكردنەوەی كەلەبەری [٨١٦] ڕابردوە، كەسی ورە بەرز لە پێناوی گەیشتن بە ئەنجامو مەبەست، پەرۆشو ئارەزومەندە، هەمیشە ڕەنج دەكێشێو كۆڵ نادا.

ورەبەرزی چەكو خشڵی كەلەپوری پێغەمبەرانە، خۆ پێ زۆریش دەردو نەگبەتی كلۆڵیو كەساسی ستەمكارانە.

ورە بەرزی هەمیشە خاوەنەكەی بەرەو لوتكە بەرز دەكاتەوە، خۆ پێ زۆریش بەردەوام خاوەنەكەی بەرەو نشێو شۆڕدەكاتەوە. جا ئەی قوتابی زانستو زانیاری، بۆخۆت نەخشەی ورە بەرزی بكێشەو لە بەری ڕانەكەی، بێگومان شەرع لە چەند بابەتێكی (فیقهی)دا كە لەگەڵ ژیانی تۆدا ئاوێتەی یەكتر بونە، ئاماژەی بە ورە

---

٨١١) ئەوەی لەبەر خەڵكی دەمێنێتەوە.

٨١٢) پان كردنەوە.

٨١٣) تێك ناچێ.

٨١٤) بێ جەرگ و ترسەنۆك.

٨١٥) لە قسە گیراوە.

٨١٦) كەلێن.

بەرزیو سەر بڵندی کردوە، تاوەکو هەردەم بۆ دەستەبەرکردنی لەگەڕدابی، بۆ وێنە: (تەیەموم) حەڵاڵە بۆ ئـەو کەسـەی ئـاوی دەست ناکەویو نوێـژی لەسـەر پێویـستە، ناچـاریش نـاکریێ بـەوەی ئەگـەر پـارەی پـێ ببەخـشرێ تـاوەکو ئـاوی پـێ بکـڕێ وەریبگـرێ، چـونکێ منـەت لەسـەرکردنی تێدایـە، کـە بـە سـای ئەمـە ورەبـەرزیو سـەربڵندییێکی بێوێنـە وەدەسـتدێنێ، لەسـەر ئـەو نمونەیـەش زۆر نمـــونەی تـر بەراورد کە.

ئینجا تکات لێ دەکەم تکا بە ورەبەرزی بایەخ بدە، لە تـەنگو چەڵەمەی ژیانـدا قۆڵو بازوی سەربڵندی لێ هەڵبکە.

## خوێنـدنـەوەی ئـاوەزو ژیریـیەکان

یەکێ لەوانەی هەستونەست دەحەسێنێو دڵو دەرون دەسرەوێنێ، وردبونـەوەو تێفکرینـە لـە بیروژیـری بیرتیـژو هۆشمەنـدان، بەڕاستی ئـەوە خۆشییێکە مـەردمی وردیـار لـە پرشـنگی ژیریارانــدا دەرکـی پـێ دەکـا. پێـشەنگو سـەروەری هـەمو هۆشمەنـدانو هەڵبـژاردەی هـەمو جیهـانیش پێغەمبەرمانـە ﷺ کـە هـیچ کەسێکی لەگەڵـدا بـەراورد نـاکرێ، چـونکی بـە نیگـای خـوا پاڵپـشتی لێ دەکـرێ، دەر ئاسـاو، موعجزەکانی شایەدی ڕاستین، بە چەند ئایەتو بەڵگەی ڕۆنو ڕەوان ڕەوانـە کـراوە، ئەمەشیان لەسەروی زیتەڵی تێگەیشتوانو، ڕەونەقی وێژەرانە.

## گەر نەخـۆش کەوتـم خـوا چاکم ئەکاتـەوە

(ئەبقرات) دەڵێ: "کەم زیانی لە زیان گەیێنەوە، باشـترە لـە قـازانجی زۆر لـە سـود گەیێنەوە".

بەهەمان شێوە دەڵێ: "تەندروستیو لەش ساخی درێژە پێبدەن بەهۆی وازهێنـان لە سستی سەبارەت بە خۆماندو کردن، هەروا بە وازهێنان لە خۆ ئاخنینی خـواردنو خۆراك".

کاراشناییانیش هەیانە دەڵێ: "ئەو کەسەی تەندروستی گەرەکە، با بەرنامەی خۆراکی ڕاستو ڕێك کا، لەسەر برسێتی نان بخوا، لەسەر تێنوێتی ئاو بخواتەوە، درێژە بداتە نێوانی ژەمەکانی، ئاوێ زۆر نەخواتەوە، دوای نان خواردن لەسەر بڕوا، هەتا نەچێتە ئاودەست خانە نەخەوێ، وریا بێ بە سگی تێرەوە نەچێتە گەرماو، جارێکیش لە هاویندا باشترە لە دە جاری زستاندا".

(حارس)یش دەڵێ: کەسێ دەیەوێ ژیانی بەردەوام بێ -ئەگەر چی کەس تاسەر ناژێ- با بەیانی زو نان بخوا، پەلە لە ژەمی ئێوارە بکا، جلی زۆر لە سەر یەك لەبەر نەکا، کەم کەمە ئاوێزانی خێزانی بێ".

(ئەفلاتون)یش دەڵێ: پێنج شت هەن جەستە دەتاوێننەوە، جاری وایە لە ناوی دەبەن: کەمدەرامەتیو دەست تەنگی، جیابونەوەی خۆشەویستی، خواردنەوەی تورەیی، بەرودادانەوەی ئامۆژگاری، پێکەنینی نەزانان بە ژیرو تێگەیشتوان".

ئەو وتەی (ئەبقرات)یش زۆر پڕ واتاو مەبەستە کە دەڵێ: "هەمو زۆرێ، لەگەڵ سروشت تێکدەگیرێ".

بە (گالینۆس)یان گوت: بۆ نەخۆش ناکەوی؟ لە وەڵامدا گوتی: "چونکێ من دو خۆراکی خراپ پێکەوە کۆ ناکەمەوە، خواردنیش دەسەر خواردنێ ناکەم، ئەو خواردەنەش لەناو گەدەم دا ناهێڵمەوە کە لە بەری بە ئازار بم".

چوار شتیش هەنە مایەی نەخۆشی لاشەن: قسەی زۆرو، خەوتنی زۆر، خواردنی زۆرو، جوتبونی زۆر.

ئەوسا قسەی زۆر: مۆخی ناو سەر کەم دەکاو بێهێزی دەکاو مرۆڤیش زو پیر دەکا.

خەوی زۆریش: ڕەنگو ڕوخساری زەرد دەکا، دڵ نابیناو کوێر دەکا، چاوان سور هەڵدەگێڕێو، لاشە تەمبەڵو تەپ دەکا، ڕەقو وشکی پەیدا دەکا، مرۆ دوچاری دەردی گران دەکا.

جوتبونی زۆریش: جەستە دادەهێزێنێو، تینو توانا لەبن دێنێ، تەڕایی لاشە وشك دەکا، دەمار نەرمو شل دەکا، مرۆ دوچاری کون گیران دەکا، بگرە هەمو لاشە گرفتار دەکا، بە تایبەتی مێشكو مۆخ چونکێ لە هەمو ئەندامەکانی جەستە پتر

هەستیارە. بێ هێز بونیشی لە بێ هێز بونی هەمو ئەندامێك كاریگەرترەو بە رێژەیەكی زۆر لە گەوهەرو كرۆكی رۆح بەتاڵ دەبێ.

ئەو چوارانە تەن‌و جەستە دادەڕمێنن: خەم‌و، دڵپەستی، شەونخونی‌و، برسێتی. ئەو چوارەش كەیف خۆشی بەسەردا دێنن: بینینی گوڵشەنی جوان، ئاوی جۆگەو روباران، دۆستان‌و خۆشەویستان، بەروبومی درەختان.

ئەو چوارەش چاوان تاریك دەكەن: رۆیشتن بە پێخواسی، چاو پێكەوتنی روی نادۆستان‌و رەزا تاڵ‌و دوژمنان، زۆر گریان‌و، زۆر روانینی دێڕی ورد نوسراو.

چواریشیان جەستە بەهێز دەكەن: پۆشینی بەرگی نەرم، خۆشۆردن لە گەرماوێكی مام ناوەنجی، خواردنی خۆراكی شیرن‌و چەور، بۆن كردنی بۆنی خۆش چوار شتیش هەن ئاوی روان وشك دەكەن، رەونەق‌و جوانی‌و رۆشنایی بزر دەكەن: درۆ كردن، بێ ئابرویی، بێ هودە زۆر پرسیار كردن، زۆر خراپەو تاوان كردن.

چواری تریش روخسار گەش‌و رو سور دەكەن: جوامێری‌و، وەفاداری، بەخشندەیی‌و، تەقوا كاری.

ئەو چوارانەش خەشم‌و قین دەستەبەر دەكەن: خۆ پێ زۆری‌و، چاو نزێری، درۆزنی‌و، ئاشوب گێڕی.

چواری دیكەش رزق‌و رۆزی رادەكێشن: شەو بێداری بۆ نوێژكردن، لە پێش بەرەبەیاندا زۆر (أستغفر الله...) وتن، لەسەر ماڵ بەخشین راهاتن، لە سەرەتاو كۆتایی رۆژدا پاڕانەوەو نزا كردن.

ئەو چوارانەش رێگا بە رۆزی دەگرن: كەم نوێژی‌و، خەوی بەیانی، ناپاكی‌و، لەش گرانی.

چواری تریش بۆ بیرو هزر زیان گەیێنن، بەردەوام ترش‌و میوە خواردن، لەسەر پشت خەوتن‌و، پەژارەو، خەفەت خواردن.

ئەو چوارەش مرۆڤ بیربڕو بیرتیژ دەكەن: دڵ گوشادی، كەم خواردنەوەو كەم خۆری، جوان رێكخستنی خواردنی شیرن‌و چەوری، فرێدانی ئەو پیساییەی بۆ جەستە بۆتە مایەی بارگرانی.

## هۆشــتان لەســەرخۆ بــێ

کەسی وردئەندێش‌و هزر تیژ هەتا چاوی نەکاتەوەو بەر پێی خۆی نـەبینێ، ورد نەبێتەوەو تێڕا نەمێنێ، چاوپێدا نەگێڕێتەوەو پاشەڕۆژ نەخوێنێتەوە، تـاوەکو جـێ پێـی خـۆی هـەموار نـەکاو، زەمیـن‌و هۆشـی وەگـەڕ نـەخا، سـەرەنجام لێـك نەداتـەوەو بـواریش بـە خـۆی نـەدا هـەنگاوێك هـەڵنایێنێ، نـەبادا پەنجـەی ژێـوانی بگـەزێ، جـا ئەگەر ئەو کارە بـە پێـی خواسـتی ئـەو ڕەخـسا، ئـەوا سوپاسـی خـوای لەسـەر دەکـاو، ستایشی بۆچونی دەکا، ئەگەریش بە ئارەزوی ئەو نەبو، دەڵێ: خوا هێنابوی، ئەویش هەرچی بیەوێ دەیکا. قایلیش دەبێ‌و خەم‌و پەژارە دای ناگرێ.

## تفــەنگ بە تـاریکیــیوە مــەنێن

مرۆڤـی ژیـرو هۆشـدار، یـەك بـاوەڕو، داسـەپاو، کاتـێ هەواڵـەکان زۆری بـۆ دێـنن، چەند پرسیارێکی لە مێشکیدا گەڵاڵە دەبن، تفەنگ بە تاریکی وەنـانێ‌و، ڕاسـتەوخۆ بڕیار نادا، بەڵکو ڕاست‌و چەپیان لە یەکتر هەڵاوێر دەکاو تاوو توێ یان دەکـاو دوبـارە بیریـان لـێ دەکاتـەوەو پـرس‌وڕا بـە کەسـانی هۆشـەنگ‌و دانـا دەکـا، بێگومـان بـیرو بۆچونێکی پێ گەیـشتو چـاترە لـە بیروبۆچـونێکی کـرچ‌و کـاڵ. گوتراویـشە: لـە چـاو پۆشین‌و بەخشیندا هەڵە بکەی، باشترە لـەوەی لـە سـزاداندا هەڵـە بکـەی ﴿فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ... جا لە کردەتان پەشیمان بن. ﴿٦﴾ الحجرات﴾.

## بڕیاری خۆت بدەو هەنگاو هەڵێنە

هەرچییێ کە من لێرەدا دەی نوسم، لە ئایەتو، هۆنراوە، لە پەندو وتەی پێشینان، لە وتەی نەستەقو بەجێو، داستان، بانگت دەکەن کە لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانتدا هەڵدەیەوە پڕ بێ لە گەشبینیو پاشەڕۆژێکی گەشەدار، کۆتا خێریو چاترین ئەنجام وەدەست بێنی.

ناشتوانی سودو قازانج لە ژیانتدا ببینی مەگەر بە چوستو چالاکیو ڕاست گۆیانە هەنگاو بنێیو ئارەزوی تەواوت هەبێ کە خۆت لە چنگی کەساسیو دڵ پەستی، کلۆڵیو مەینەتی دەربێنی.

بە یەکێ لە زانایانیان گوت: چۆن بەندە دەگەڕێتەوە؟ لە وەڵامدا گوتی: پێویستی بە قامچی ویستو ئیرادە هەیە.

بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرانی خۆڕاگرو خاوەن ئیرادەی جیاکردونەتەوە ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ... تۆش هەروەکو پێغەمبەرە لێبڕاوو نەبەزەکان، سور بە لەسەر کارەکەتو خۆڕاگر بە. ﴿٣٥﴾ الأحقاف﴾.

ئادەم لە پێغەمبەرە خۆڕاگرەکان نەبو، چونکێ ﴿... فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمًا ... لە بیری کردوپێی نەکرا پێکی بێنێ. ﴿١١٥﴾ طه﴾.

ڕۆڵەکانیشی بە هەمان شێوە ڕێو شوێنی ئەویان بزر نەکرد،ماڵیش وەما خۆی نەچێ حەرامە، بەڵام نەکەی لە تاوانکردندا چاو لەوی کەی، بەڵام لە تۆبەدا ڕێو شوێنی بزر کەی. فریادرەسیش هەر خودایە.

## ژیـان هـەر بریتـی نیـە لە دنیـا

بەختەوەری دنیا، بە کامەرانی دوارۆژەوە بەستراوەتەوە، جێگای خۆیـەتی کەسی ژیرو وریا دڵنیابێ کە ئـەم ژیانـە لەگەڵ دوارۆژ لێك گرێ دراون، ئاشکراو نهێنی، دنیاو دوارۆژ، ئەو ڕۆو سبەی بە یەکەو بەندن.

کەسێ لای وابێ ژیان هەر ژیانی ئێرەیە، کۆ دەکاتـەوەو دادەکا، خۆی بـۆ مانـەوە هەڵدەگرێ، بە ژیانێکی دوا بڕاوەوە خۆی هەڵدەواسێ، دەرەنجامیش هـەمو خۆزگـەو خواستەکانی لەگەڵە خۆیدا بۆ گۆڕ دەبا.

سەیرم بە خۆمو خەڵکانی دوروبەرم دێ: هیواو ئومێدی بێ بن، خـەونو خـەیاڵی دورو قوڵ، خۆزگەو خواستی بە گوڕو بە کوڵ، گوریسمان لـەبن دنیـادا ڕاخستوە [٨١٧]، کەچی بێ ئەوەی پرسو ڕامان پێ بکرێ، یا هەواڵێك یا مۆڵەتمان پێ بدرێ، مـردن بـەرۆکمان دەگـرێ ﴿... وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ... کەس نازانێ کاری سبەی ڕۆژێ چیەو کـەس نازانـێ لـە کامە سەر زەمین دەمرێ. ﴿٣٤﴾ لقمان﴾.

**منیش سێ ڕاستیت پێ ڕادەگەیێنم:**

یەکەم: چۆن خەیاڵی دڵارامیو حەسانەوەو سرەوتن دەکەی، لەکاتێکا لـە پـەروەرێنو یاساو ڕێساکانی لە کارو فەرمانو قەدەری ڕەزامەندی نـانوێنی، لـە بەشـە ڕۆزیو بەهرەو خەڵاتە پێ دراوەکانی قایل نی!

دوەم: ئایە ئەو خێرو خۆشیو نازو گۆزەی بەسـەرت دارژاوە بـە سوپاسـکردن مافت داوە تـاوەکو پـتر بخوازیو، جگـە لـەوانیش داوای کـەی؟!! یـەکێ منـەتی بـە کـەم نەبێ بە زۆریش نابێ.

سێیەم: باشە بـۆ لـەو بەخششانەی خـوای بەخـشەرو خـەڵاتکار کـەڵك وەرنـەگرینو ڕەنێویـان نـەیێنینو، هـەر یەکـەی لـە جێگـای خۆیـدا وەگـەڕ نەخـەینو، لـە

---

٨١٧) ئەو پەندە بۆ یەکێ بە کاردێ ئومێدی نەبراوەی هەبێ.

ناتەواوی‌و کەم‌وکوڕی بێخەوشیان [818] نەکەین‌و، لەو دنیایەدا کاریان پێنەکەین‌و، ژیانیان پێ ڕازاوەو دەوڵەمەند نەکەین؟

بێگومان بەهرەی بەهادارو خونەریتی جوان‌و لەبار، لە بیرو هزرو جەستەماندا شاراوەنە، وەلێ لەلایەن مرۆڤ گەلێکمان وەکو دوڕڕو گەوهەری ناو قوڕن، لەژێر قوڕدا داپۆشراوو شاراوەن، کەسێکی چاپوك‌و جەربەزەیان [819] دەست ناکەوێ لەناو قوڕدا دەریانبێنێ، پاکیان کاتەوەو بیانشۆرێ، بۆ ئەوەی تیشك بدەن‌و بدرەوشێن‌و بەرێزەوە بناسرێن.

## لوزەو [820]، تەزوی کارەبا چارەسەرێکی کاتیە، تاکو چەخماخەی ڕزگاری لێبدا

کتێبی (المتوارين)ی دانراوی (عبدالغنی ئەزدی)یم خوێندۆتەوە، کتێبێکی نایاب‌و سەرنج ڕاکێشە، باس لەوانە دەکا کە لە ترسی (حەجاج)ی کوڕی (یوسف) خۆیان حەشاردابو، تێگەیشتم کە ژیانیش خۆشی لێ وەدی دەکرێ‌و، شەڕو ئاشوبیش بەرژوەندی لێ ڕەچاو دەکرێ، جاری وایە تەنگانەش فراوانی لە دوا دێ.

(ئەبو عەمر)ی کوڕی (عەلاء) ئەو خوێنەرمزمان پاراوو تیشك دەرە، بوێژو ڕاستی بێژە، سەبارەت بە تەنگ‌و چەڵەمەو تاقی کردنەوەی دەبێژێ:

(حەجاج) هەڕەشەی لێ کردم‌و منیش بەرەو (یەمەن) هەڵاتم، چومە خانوێك لە (سەنعا)، شەوانە وەسەربانی دەکەوتم‌و، ڕۆژیش خۆم لە ژوریدا مەڵاس دەدا.

لە بەرە بەیانێکدا کە لەسەر پشتی خانوەکە بوم، لە پڕێکدا گوێ بیستی پیاوێك بوم کە ئەم هۆنراوەی هۆنیەوە:

زۆرجاران دڵەکان لە ترسان ڕادەچەڵەکن
لە پڕێکاوە کۆبونەوەی گرێ کوێرە ئازاد دەبن

---

٨١٨) بێ خەشیان.

٨١٩) لێهاتوو.

٨٢٠) وزە.

دەڵێ: منیش گوتم: قوتاربون. دەڵێ: بەو وشەیە زۆر دڵ شاد بوم.

دەڵێ یەکێ تریش گوتی: (حەجاج) مرد. دەڵێ: سوێند بە خوا نازانم بـە کامـەیان دڵخۆش تر بوم، بە قسەی شاعیر، کە گوتی: ئـازادبون. یـاخود بـە قـسەی کـابرا، کـە گوتی (حەجاج) مرد".

تاکە بڕیارێك، کە پەیڕەوی لێبکرێو سەرپێچی لێنەکرێ، لەلایەن ئـەو کەسـەوە دەردەکرێ، کە خاوەنێتی ئاسمانەکانو زەوی دەکا ﴿... كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ... ئەو گشت ڕۆژێ بە کارێکەوە خەریکە. ﴿٢٩﴾ الرحمن﴾.

(حەسـەن)ی بەسـرایی لـە ترسـی سـیخوڕەکانی (حـەجاج) خـۆی پـەنادا بـو، کاتـێ هەواڵی مەرگی (حەجاج)ی پێ گەیشت، بۆ ستایش نواندن سوژدەی بۆ خوا برد.

شکۆداریو پایەداری بۆ ئەو خوایەی جیاوازی خستۆتە نێوانی بەندەکانی، هەیانە لە پێخۆشی مردنیـان خـەڵك سـوژدەی شـوکر دەبـا ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ... نـە ئاسمـان شـینی بـۆ گێـڕان، نـە زەمینـیش. هەرمۆڵەتیـشیان پـێ نەدرا. ﴿٢٩﴾ الدخان﴾.

کەسانێکی تریش دەمرن، ماتەمی ماڵەکان دادەپۆشـێ، ئەسـرینی بـە خوێنیـان لـە پێناودا دتکێ، لە ئاهی مەرگیان جەرگ دەبڕێ.

(ئیبراهیم)ی (نـەخعی) لـە ترسـی (حـەجاج) خـۆی حەشـاردا بـو، هـەواڵی مردنـی (حەجاج)ی پێ گەیشت لە خۆشیان گریا.

لە ژێر سایەو میهروسۆزی خوای دلۆڤاندا، ئەو خوایەی دەبینـێو دەبیـسێ، سـتەم کارو ستەم لێکراوان، چەوسێنەرو چەوسانی لـێ دیـارە، چـەند پەناگـەو پەسـیوێك هەن بێ دەرەتان خـۆی لـە پـەناداوە حەسـێنن ﴿... وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ... هێندێکیـشتانمان کردۆتـە مایـەی ئـەزمونی هێندێ تر. ئاخۆ ئێوە خۆڕادەگرن؟ وا پەروەرندەت دەبینێ. ﴿٢٠﴾ الفرقان﴾.

بە سای ئەمـە باڵندەیـەکم بیرکەوتـەوە کـە پێـی دەوتـرێ بلبلـە سورە، لـە کاتێکا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ یاوەرانی لەژێر سێبەری دارێکدا دانیـشتبو، هـات لەسـەر سەری پێغەمبەری خوا ﷺ باڵی لێك ئەدا، هـەروەکو بڵێـی بـە زمـانی حـاڵی سـکاڵای لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەکـرد کـە پیـاوێ بەچـکەکانی لـە هێلانـەی دابـرد بـو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: **((من فجع هذه بافراخهـا؟ ردوا عليهـا افراخهـا...** کـێ سکی ئەو باڵندەیەی سوتاندوە بە بردنی بەچکەکانی؟ بەچکەکانی بدەنەوە.

(سەعید)ی کوڕی (جوبەیر)یش دەڵێ: سوێند بە خوا لەدەستی (حەجاج) ڕامکرد، هەتاکو شەرمم لە خوای بەرزو بێ هاوتا کرد. پاشان هێنایانـە لای (حـەجاج)، کاتـێ شمشێریان لەسەر هەڵکێشـا، زەردەخەنەی هاتە لێوان.

(حەجاج) گوتی: بۆ پێدەکەنی؟ گوتی: سەرسوڕماوم لە بوێری تۆ بەسەر خواوەو، لە نەرمو نیانی خواش بەسەرە تۆوە.

ئای لەو هەستە بەرزەی، لەو دڵنیابونەی بە بەڵێنی خوا، لەو ئارامیەو سـرەوتنەی بـە سـای ئـەو گەڕانـەوەو سـەرەنجامە خێـرو خۆشـیەی. بـا ئیمـانو بـاوەڕیش بـەم چەشنە بێ.

## تۆ لەگەڵ میهرەبانتـرین کەسـدا سـەودا دەکـەی

ئەو فەرمودەیەی (ئەحمەد)و (ئەبو یەعلی)و (بـەزار)و (تەبـەرانی) دەیگێڕنـەوە، ئەگـەر سـەرنجی تـۆی ڕاکێـشا بـێ بەهـەمان شـێوە سـەرنجی منیـشی ڕاکێـشاوە، کـە پیاوێکی بەساڵدا چو هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بە گۆپاڵەکەیـەوە گرتبـوە، گوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، مـن سەرپێچیو لاساری گـەلێکم بـوە، ئایـە خـوا لـێم دەبورێ؟ پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرموی: **((تـشهد ان لا الـه الا الله وان محمـداً رسـول الله؟...** گـەواهی دەدەی هـەر خـوا پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەیەو (موحەممـەد)یـش نێردراوی خوایە؟)).

گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرموی: (( فان الله قد غفر لك غدراتك، فجراتك... بێگومان خوا لە هەڵەو تـاوانی تۆی چاوپۆشی کرد)).

ڕۆیشتو دەیگوت: گەورەیی بۆ خوایە، هەر خوا گەورەیە.

چەند دەرسێك لەو فەرمودەیە وەردەگرم: لەوانە بەرفرەیی سۆزی خوای هەرە بە سـۆز، موسـڵمانبونیش تـاوانی پێـشو ڕەشـدەکاتەوە، تۆبـەکردنو گەڕانـەوە کـونو کەلەبەری ڕابردو پڕ دەکاتەوە، ئەگەر گوناهیش بەقەد کێوەکان بـن لەبـەر تـەوژمی میهری خوادا خۆناگرن، پێویستە لەسەر بەندە لە بەرابەر خوای میهرەبانـدا نیـەتو ویستی ساخ کاتەوە، ئومێدیشی بە بەخـشندەییو میهـرو سۆزی بـەرفرەو بێسنوری ئەو بێ.

## چـەند نیشانەو بەڵگـەیەك بەرەو گەشـبینی بانگێشـتت دەکـەن

لە کتێبی (حسن الظن بالله)دا دانراوی (ئیبن ئەبی دونیا)، سەدو پەنجاو یەك دەق هەیە، لە ئایەتو لە فەرمودە، هەمویان داوای ئومێدەواریت لـێ دەکەنو، پێت دەڵێن واز لە هیوا بڕانو بێ ئومێدی بـێنیو لەسـەر نیـەت پـاکیو کارچـاکی کۆڵنـەدەر بـی، هەتاکو هەست دەکەی ئـەو دەقانـەی بـەڵێنت پـێ ئـەدەن پـتڕن لەوانـەی دەتترسـێنن، بەڵگەو نیشانەی سۆزی خوازێتڕن لەوانەی هەڕەشەت لـێ دەکەن، خوای گـەورەش بـۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە.

## ژیــان هــەموی شــەکەتیــە

لە تاڵیو سوێری ژیان دڵپەست مەبە چونکێ هەروا ڕەخساوە، ژیان لەسەر کلۆڵیو دەردەسەری دامەزراوە، کەیف خۆشیو شادمانی زۆر بە کەمیو لەلا ڕا دێن. تۆ خۆت بۆ ئـەم ژیانـە دەسـازێنیو خـوای گـەورەش بـۆ دۆسـتانی خـۆی بـە مـاڵی هەمیـشەیی دانانی؟!

گـەر بهاتایـەو دنیـا خـانوی ئـەزمون نەبوایـە، جێگـای دەردو بـەڵا نـەدەبو، پێغەمبەرانو پیاوچاکانیش ژیانیان لێ تەنگ نەئەبو، ئادەم هەتا ئەو دنیایەی جێ هێڵا بە ژیانێکی پڕ لە گێچەڵ ژیا، نوح گەلەکەی بە درۆیان زانیو گاڵتەیان پێهات، (ئیبراهیم) ژانی خستنە نێو ئاگرو سەربڕینی جگەر گۆشەی هەڵدەچەشت، (یعقوب) هـەردو چـاوی لەدەسـتدا ئەوەنـدەی ئەسـرینی هەڵڕشـت، (موسـا) لـەژێر سـتەمی فرعەونو سـەر ڕەقـی دەیناڵانـد، (عیـسا)ی کـوڕی (مەریـەم) بـە دەسـت تـەنگیو بـە نەداری دەیگوزەراند، (موحەممەد) ﷺ ئارامی لەسەر هەژاریو، مـەرگی (حـەمزە)ی مـامی خۆشەویـسترین خـزمو کەسـیو، سەرکەشـی گـەلو نەتـەوەی، دەگـرت. وێـڕای ئەوانەش گەلێك لە پێغەمبەرانو دۆستانی خوا کە باسکردنیان درێژەی دەکێشێ.

ئەگەر بهاتایەو دنیا بۆ ڕابواردنو خۆشگوزەرانی دروست بکرایە نەدەبو بڕواداران بەشیان لە ئەشکەنجەو ئازار هەبوایە.

کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرموێ: ((**الدنيا سجن الـمؤمن، وجنّـة الكـافر**... دنیا بەندیخانەی بڕوادارو، بەهەشتی بێ باوڕانە)).

هاوکات لەگەڵ ئەمەدا پیاوچاکان خراونە بەندیخانەو، زانایانی ڕاستو ڕەسـەنیش دوچـاری بـەڵاو کۆسـت بونـەو، گـەورە پیـاوانی خـوا ژیانیـان لـێ تـاڵ بـوەو، بـارو گوزەرانی ڕاستگۆیان لێڵو لێخن بوە.

## سـەرنجێـك

لە زەیدی کـوڕی (ثابـت)ەوە دەگێڕنـەوە - خـوای لـێ ڕازی بێـت - دەڵێ: گـوێم لـە پێغەمبەری خوا ﷺ بو دەیفەرمو: ((**من كانت الـدنيا همـه، فـرق الله عليـه امـره، وجعل فقره بيـن عينيه، ولـم يأته من الدنيا الا ما كتب له. ومن كانـت الاخـرة نيـته، جـمع الله له امره، وجعل غناه فـي قلبـه، واتتـه الدنيا وهي راغمة**... هەرکەسێ هەوڵو گـەڕی هـەر بـۆ دنیـا بـێ، خـوا هەمیـشە هـەژاری دەکـاو، لـە دنیـاش تـەنیا ئـەوەی پێدەبڕێ بۆی بڕیار دراوە. هەر کەسێکیش دواڕۆژی مەبەست بێ، خـوا کـاری ڕاست دێنێو، دەوڵەمەندی ئەخاتە دڵەوەو، دنیای بەرەو ڕو دێو ئەویش پشتی تێدەکا)).

هەروەها لە (عبدالله)ی کوڕی (مەسعود)ەوە دەگێڕنـەوە - خـوای لـێ ڕازی بێـت - دەڵێ: **گوێم لێبو پێغەمبەری خوا** ﷺ دەیفـەرمو: ((**من جعل الهموم هما واحـدا، هـمَّ آخرته، كفاه الله همَّ دنيـــاه، ومن تشـعَّبتْ به الهموم فـي احوال الدنيـا، لـم يبـــال الله فــي أيِّ اوديتها هلك**... هەرکەسێ خەمو پەژارەی لە پێناوی ڕۆژی دوایی یەکخاتەوە، خوای بەسە بۆ لابردنی خەمو خەفەتی دنیایی، هەرکەسێکیش لەمـەڕ سـەرقاڵی بـە دنیاوە زۆر ڕێگای گرتنەبەر، خوای گەورە لە هەرشوێنێك بیفەوتێنی لای گرنگ نیە.

## مـــام نـاوەنجـێتی هۆکـاری ڕزگـــار بونـــە

بەختەوەری تەواو لەسەر سێ شتان بنیاتنراوە:

١- مام ناوەندی لە توڕەبوندا.

٢- لە ئارەزودا.

٣- لە زانستدا.

جا پێویـستە سـنورێك بـۆ ئەوانـە دابنـرێ، نـەبادا ئـارەزو زۆری بـۆ مـرۆڤ بێنـێو سنوری پێ ببەزێنێو سەرەنجام تـێ بـچێ، یـا شـەپۆلی ڕق هەڵبـستێو، بـۆ چەموشـی سەر بکێشێو، بە زەوی دابکێشێ.

((**وخيـر الامور اوسطها**... باشترینی هەمو کارێکیش مام ناوەندیەکەیەتی)).

جا ئەگەر بە ئاماژەی هێزی زانست مام ناوەنجێتی دروست بـو لـەنێوان دو هێـزدا، ئەو هەلە ڕاستەڕێ دەدۆزرێتەوە.

بـە هـەمان شێوە توڕەبـونیش هەروایـە: ئەگـەر زیـادی کـرد، لێـدانو کوشـتنی بـۆ ئاسان دەبێ، ئەگەریش کەمی کرد جۆشو خرۆشی مەردایەتی لەبارەی دینو دنیـادا نامێنێ، ئەگەر مام ناوەندیش بو، ئارامگریو مەردایەتیو لێزانی دێتە دی.

ئارەزوش وەکو ئەوانەی تـر وایـە: ئەگـەر زیـادی کـرد، خراپـەکاریو سـنوربەزێنی ڕودەدا، ئەگەریش کەمی کرد، بێ توانـاییو خاوبونـەوە پەیـدا دەبـێ، ئەگـەریش مـام ناوەندی بو، ئەوا پێ ڕەزاییو داوێن پاکیو وێنەی ئەمانەش فەراهەم دێن.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((**عليكم هـديا قاصداً**... دیارییێکی مام ناوەنجیتان لەسەر بێ ئەنجامی بدەن)).

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ... بەم شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی هەڵبژاردە. ﴿١٤٣﴾ البقرة ﴾.

## مرۆڤ چ نەریتێکی تێدا زاڵە بەوە دەناسرێ

مایەی بەختەوەری تۆیە کە ڕەوشتی بەرزت ڕەوشتی دزێوت دابپۆشێ، ئەوسا وات لێبێ زمانی خەڵك لە ئاستی تۆدا بە چاکە بگەڕێ هەتاوەکو لەسەر ئەو ڕەوشتەش ستایشتکەن کە لەتۆدا وەدی ناکرێ، خەڵکیش قەبوڵ نەکا لۆمەت بکرێ، ئەگەر چی زەمکردنیشت لێبێ، چونکێ ئەگەر ئاو بگاتە قولەتێن پیس نابێ. چیاش بە بەردێکی زیاد ناکاو، بە بەردێکیش کەم ناکا.

سەرگوزەشتەی هێرشێکی پڕ لە جنێو وتەی نەشیاوم خوێندۆتەوە کە کراوەتە سەر (قەیس)ی کوڕی (عاسم) ناسراو بە نەرمو نیانی عەرەب، کراوەتە سەر بەرمەکیە ڕێزدارەکانو، (قوتەیبە)ی کوڕی موسلیم سەرکردەی ناودار، دەبینم ئەو وتە نابەجێو پڕوپوچانە، کەس بە ڕاستی نەزانیونو بایەخیان پێ نەدراوەو، وەکو بڵقی سەر ئاو نرخێنراون، چونکو کەوتونەتە نێو دەریای چاکەکانو لەوێ نغرۆ بون، بە پێچەوانەش بینیومە لەمەڕ (حەجاج)و، (ئەبو موسلیم)ی خوڕاسانیو، (الحاكم بامر الله العبيدى) زۆر ستایش کراونو پێیاندا هەڵگوتراوە، وەلێ بەبێ نرخو بەها سەیرکراوەو بە ڕاستیش دانەنراوە، چونکێ ئەو ستایشە کەوتۆتە ژێر کەڵەك و بەردی دارماوی فێڵو چەواشەکاریو ستەمو بێدادی ئەوان، پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی دادوەری لە نێوان بەندەکانی داکردوە.

## بەم شـێوەیە ڕەخسـاوی

لە فەرمودەیا هاتوە: ((**کلٌ میسر لـما خلق لە...** هەریەکەی بۆچی دروستکراوە لەو پێناوەدا کار ئاسانی بۆ دەکرێ)).

کەوایە بۆچی بەهرەکان بەهەدەر بدرێن‌و، خونەریت‌و تواناکان لەبار ببـرێن؟!

ئەگەر خـوا شـتێکی گـەرەك بـێ هۆکاریـشی بـۆ ڕێـك دەخـا، هـیچ کەسـێکیش لـەو کەسە پتر دەرون بەزیوو هەست دابەزیو نیـە کـە بیـەوێ شـیرازەی سروشـتی بگـۆڕێ، کەسـی ژیـرو وریـاش ئـەو کەسـەیە خـۆی دەخوێنێتـەوەو، ئـەو کەلێنـەی لـە ژیـانی پەیدابو پڕی دەکاتەوە، جا ئەگەر کەم‌وکوڕی لە دێدەوانی‌و پاسـەوانی دابـێ دەچێتە وێ، ئەگەریش لە مەڕو ماڵات بەخێوکردن دابێ لەوێیە، فەرمو ئـەوە (سیبـەوەیە)ی پسپۆر لە زانستی (نەحو)دا، هەتا توانی خۆی لە فەرمودە شارەزا کردو هـەتا زەیـن‌و هۆشی مانـدو بـو، ئەوسـا خـۆی لـە (نـەحو) شـارەزا کـرد، هـەتا لێـی بەهرەمەنـد بـو بەشێکی سەرسوڕمێنی لێ فەراهەم هێنا.

یەکێ لە کاراشنایانیش دەڵێ: ئـەو کەسـەی دەیـەوێ کـارێ ئەنجامـداو لـە تواناشـی دانـەبێ، وەك ئـەوە وایـە دارخورمـا لـەنێو بیـشەڵان‌و دارو دەوەنـی کوردوسـتاندا بچێنێ‌و، داری گوێز لە بیابانی عەرەبوستاندا بچێنێ.

(حەسان)ی کوڕی (سابیت) لە بانگدان دەنگی خۆش نەبو، چونکێ ئەو بلال نەبو، (خالید)ی کوڕی (وەلید)یـش نەیئـەتوانی مـاڵ‌و مـیرات دابـەش کـا، چـونکو (زەیـد)ی کوڕی (سابیت) نەبو، زانایانی پەروەردەش دەڵێن: ڕەچاوی ڕێ‌و شوێنی خۆت بکە.

## زیرەکی پێویسـتی بە خۆپەڕاندنـەوە هەیـە

گوێبیـستی ڕادیـۆی (لەنـدەن) بـوم دەربـارەی هـەوڵی تیرۆرکردنـی (نـەجیب مەحفوز)ی نوسەر هەواڵیدا، کە دەربارەی وێـژە خـەڵاتی نـۆبڵی پـێدراوە، کتێبێکی ئەوم هاتەوە یاد کە لەمەوبەر خوێندومەتەوە، سەرم سوڕما لەو کەسە لێهاتوە، بە چ

چەشــنێك لای وا بــوە خــەیاڵ گــەورەترە لــە ڕاســتی، لەناوچــون باشــترە لەمانــەوە، بیردۆزی دەستکردی مرۆڤیش چاترە لە بنچینەو بنەمای خوایی‌و ئاسمانی ﴿... أَفَمَن يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ... دەسا کەســێك کــە ڕێبــەری ڕاستە ڕێیە، هێژاترە شوێنی کەون، یان کەسێکی بۆ خۆی بە ڕێگە نازانێ، مەگین ڕێگەی پێ نیشان دەن. ﴿٣٥﴾ یونس﴾.

ئــەوە بــو (نــەجیب) چــەند شــانۆگەرییێکی لــە بــیرو هزریــدا هەڵخڕانــد بــوو [٨٢١] نوسیبوی، هەمو توانای خستبوە گەڕ لە وێنەکێشان‌و پەخش‌و بڵاوکردنەوەی، لە کۆتاییشدا هەواڵ گەلێکی دور لە ڕاستی بون.

لە خوێندنەوەی ژیاننامەی ئەودا چەند مەسەلەیەکی گرنگم گەلاڵە [٨٢٢] کرد، کە ئەمانەن: بەختەوەری بریتی نیە لەوەی لەسەر حیسابی حەسانەوەو سرەوتنی خۆت بتەوێ خەڵکان ئاسو دەکەی، ئەمە شتێکی ڕاست نیە کەسانێ بە سای تۆوە دڵخۆش بن‌و تۆش لە خەم‌و پەژارەو دڵپەستیدا ژیان بەسەربەی، هەندێ نوسەر ستایشی هەندێ لە داهێنەرانیان کردوەو، دەڵێن: بۆ خۆی دەسوتێ تاوەکو ڕوناکی بە خەڵکان ببەخشێ، کەچی ڕێڕەوی ڕاست‌و دروست ئەوەیە کەسی داهێنەر لە خودی خۆیدا بدرەوشێ‌و بۆ خەڵکانیش بدرەخشێ، بە ڕێنمایی‌و شارەزایی‌و چاکە دڵی خۆیان ئاوەدانکەن، بۆ ئەوەی دڵی خەڵکانیشی پێ ئاواکەن.

من لە نوسراوەکانی (نەجیب مەحفوز)دا باوەڕ بە دوارۆژو جیهانی (غەیب)م نەبینی، بەڵێ وێنەو خەیاڵ‌و وروژاندن‌و سەرنج ڕاکێشان‌و دنیاو خۆ دەرخستنم چاو پێکەوت، بەڵام کوا پەیام‌و ڕاستی بەڵگەنامەو جێ مەبەست لە کوێن؟!

من دڵنیام ئەوەی (نەجیب مەحفوز) بە دوای داوێڵە خوا پێی داوە: ﴿كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ... هەمو لایان -چ ئەوان‌و، چ ئەمانە- لە خەڵاتی پەروەرندەت بێ بەش ناکەین. خەڵاتی پەروەرندەی تۆ هیچ لەمپەری لەبەر نیە. ﴿٢٠﴾ الإسراء﴾.

---

٨٢١) سازاند بو/ گەلاڵە کردبو.

٨٢٢) خڕ کردنەوە/ وەدەستم هێنا.

بەڵام گرنگ ئەوە نیە مرۆڤ بگاتە ئەو مەبەستەی بە دوای داوێڵە، بەڵکە گرنگ ئەوەیە ئەوەی خوا دەیەوێ ئەوی دەستەبەر بکا ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ...خوا گەرەکیەڕێتان بۆ ڕون بکاتەوەو لە ڕێو شوێنی پێشینانیش شارەزاوکاو پەشیمانیو لێ قەبوڵ کا. خودا زانای لە کارزانە. خودا دەیەوێ تۆبەتان لێ قبوڵ کا. ئەوانەش وا ئەکەونە شوێن هەواو هەوەس، دەیانەوێ -بە تەواوی- ئێوە لە ڕێگە لا بدەن. ﴿٢٧﴾ النساء ﴾.

مەگەر خوا ئەگینا من شایەتی چونە بەهەشتو چونە دۆزەخ بۆ هیچ کەسێ نادەم، تەنیا ئەوەی خوا بەڵگەی ڕونو ئاشکرای شەرعی لەسەر هێنابێ، بەڵام من سەرنجی کردارو گوفتارو شوێنەواران دەدەم: ﴿... وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ... بێ گومانە بە ڕاوێژی ئاخافتنیش دەیانناسی. ﴿٣٠﴾ محمد ﴾.

خۆزگە هەمو کەسێ ڕێنمایی وەرئەگرتو خۆی دەخستە ئەو بەهەشتەی پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکانو زەمینە.

وێڕای ئەوەش، مرۆڤ چ قازانجو داهاتێکی پێدەبڕێ ئەگەر بێو موڵكو دەسەڵاتی (کیسرا)ی هەبێ کەچی دڵیشی بە پڕوپوچو بەتاڵی گیرۆدە بێ؟!

هێزو توانای (قەیسەر)ی ببێ وەلێ هیواو خواستی ڕوی لە چاکەکاری نەبێ؟! بەهرەو تواناکان ئەگەر هۆکاری ڕزگاربون نەبن سودو کەڵکیان لەچیدا وەدی دەگرێ؟!

## خۆت وەرازێنە بونەوەر بە ڕازاوە دەبینی

پلەی تەواوی بەختەوەری وەدەست دێنین، کە لە ژێر سنوری بیرو بۆچونی شەرعی پیرۆزدا، لە نەخشو نیگاری ژیان چێژ وەرگرین، خوا باخو باخچە گەلێکی سەرنج ڕاکێشی ڕواندوە، چونکێ خۆی جوانەو جوانیشی خۆش گەرەکە، بەڵگەو

نیشانەی یەکتاپەرستی بونی خوا لە دروستکراوە جوانەکاندا وەخوێنەوە ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ... هەر خۆیەتی هەرچی لە زەمین دا هەیە، بۆ ئێوەی بەرهەم هێناوە. (٢٩) البقرة ﴾.

ئەوسا بۆنی خۆش‌و خۆراکی بە چێژو، وێنەو دیمەنی شۆخ، گیان‌و دڵ دەسرەوێنن، دەحەسێنن ﴿ ... كُلُوا۟ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا ... لەو بەروبومەی سەر زەمینە، کامی ڕەواو پاکە بخۆن. (١٦٨) البقرة ﴾.

لە فەرمودەشدا هاتوە: ((**حُبِّبَ الي من دنياكم: الطيب، والنساء، وجعلت قرة عيني في الصلاة...** لە دنیای ئێوەدا بەلامەوە خۆشەویست کراون: بۆنی خۆش‌و خێزان، بیلبیلەی چاویشم لە ناو نوێژدایە)).

بەڕاستی ئەو دنیا بەکەمگرتنەی بە نەزانی‌و خۆ پاراستنە ڕەشۆکیەی هەنگاوەکانی ئێمەی لە ژیانی دنیاییدا سست کرد، ڕوخساری جوانی ژیانی زۆرێك لە ئێمەی ناشیرین کرد ئەوان لە ژیانی خۆیاندا بە دڵپەستی‌و خەمینی، بە برسێتی‌و شەونخونی، بەبێ ژنی دەگوزەرێنن، پێغەمبەریشمان دەفەرموێ: ((**لكن أصوم وأفطر، وأقوم وأفتر، وأتزوج النساء وآكل اللحوم، فمن رغب عن سنتي فليس مني...** بەلام من بەڕۆژو ئەبم‌و بەڕۆژوش نابم، شەوان بۆ بەندایەتی هەڵدەستمەوەو پشوش دەدەم، ژنیش دەهێنم‌و، گۆشتیش دەخۆم، هەرکەسێکیش واز لە ڕێبازی من بهێنێ لەمن نیە))، ئەگەر جێگای سەرسوڕمان بێ، کردەوەی کەسانێ سەرسوڕمێنە، کە دەرحەق بە گیانی خۆیان ئەنجامی دەدەن! دەبینین ئەمەیان خورما ناخوا، ئەوی تریان پێ ناکەنی، یەکێ تر ئاوی سارد ناخواتەوە، هەروەکو بڵێیی نەیانزانی بێ کە ئەمانە ئازاردانی ڕۆح‌و کوژاندنەوەی ڕۆشنایی گیانن ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ... بێژە کێیە، جلکی جوان‌و خشڵ‌و بژێوی پاکژێ - کە خوا بە عەبدەکانی خۆی ڕەوا دیوە- لای وایە کە ناڕەوایە؟ (٣٢) الأعراف ﴾.

پێغەمبەرمان ﷺ لەگەڵ ئەوەی لە هەمو کەس پتر دنیای بەکەم سەیرە کرد، بەڵام هەنگوینی دەخوارد، لەبەرئەوەی خودا بۆ خواردن وەدیهێناوە: ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ... لە دەرونی شیلاوێکی هەمە ڕەنگە دێتە دەرێ، چارەی بۆ مەردم تێدایە. (٦٩) النحل﴾.

پێغەمبەری خوا ﷺ بێوەژن‌و کچی مارە کردوە: ﴿فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ... چەندی خۆتان پێتان باشەو پێتان دەشێن -لە ژنان دوان بن یا سیان پێکەوە یا چواریش بن هەر ڕەوایە- مارە بکەن. (٣) النساء﴾.

لە بۆنەی جەژنەو جگە لە جەژنەش جوانترین بەرگی پۆشیوە: ﴿... خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ... (ئەی فرزەندەکانی ئادەم) هەرگا دەچن بۆ نوێژکردن، جلکی جوان دەبەربکەن. (٣١) الأعراف﴾.

پێغەمبەر ﷺ مافی گیان‌و مافی جەستەی پشێل نەکرد، کامەرانی دنیاو دوارۆژی گەرەك بو، چونکێ بەو ئایینە سروشتیەو خوارسکە ناردراوە خوا بەندەکانی لەسەر ڕاهێناوە.

## بە سەرکەوتنێکی نزیك مژدە بدە

هەندێ لە نوسەری سەردەمی ئێمە دەڵێن: تەنگ‌و چەڵەمە -هەرچەندە گەورە بن‌و درێژە بکێشن- لەسەر خاوەنەکانیان بەردەوام نابن‌و، بەڵا باران تا هەتایە پێیەوە گرفتار نابن، بەڵکە هەتا شەوی مەینەتیەکان توندو ڕەش‌و درێژبێ، نزیکترە پرشنگی خۆری ئازادی لە کەل [٨٢٣] هەڵبێ، خێرو خۆشی‌و، هێمنی‌و هەداری‌و، ژیانێکی خۆشگوزەرانەو ڕۆشنایی پەخش‌و درەوشاوەی لەگەڵ دابێ، ئەوسا کۆمەکی‌و هاریکاری لەکن لوتکەی تەنگانەو تاقیکردنەوەدا دەگاتە جێ، دەرەنجامی هەمو شەوێکی ئەنگوستەچاویش ئەوەیە سپێدەی بەیانی لێدادێ.

---

٨٢٣) ئاسۆ/ بەرزایی.

## تۆ لە کینـە هـەڵگرتن بەرزتـری

ئەو کەسەی لە هەمو کەس خۆشحاڵترو دڵشادترە، ئـەو کەسـەیە دواڕۆژی بەسـەر دنیادا هەڵدەبژێرێ، ئەو بەهرانەی خوا لە دەریای بەخشندەیی خۆیەوە بە خەڵکانی بەخشیوە چاویان تێنابڕێ، بەڵکە پەیامی خۆشی لەلایەو نمونەی هەڵکەوتەی خێرو چاکەیە، دەیەوێ سودو کەڵك بەخەڵکی بگەیەنێ، ئەگەر گوڵیش نەبێ دڕکیش نابێ.

سەرنجی (عبدالله)ی کوڕی (عەباس) بـدە کـە ڕاڤـەکاری قورئـانو دەریـای زانـستە، چـۆن تـوانی، بـە سـای خووڕەوشـتی بـەرزو جـوانی خـۆ گونجانـدنی شـەرعیانەو دڵفراوانی، کە نەیارانی لە (بەنی ئومەیە)و (بەنی مەروان)و دەستو پێوەندەکانیان بەرەو دۆستایەتی وەربگێڕێ، ئەوسا موسڵمانان لە تێگەیشتنو زانـستی ئـەو کـەڵکیان وەرگرت، کۆڕو کۆمەڵی لـە زانـستی (فیقهو)و (تەفسیر)و چاکەو یـادەوەری پڕکـرد. (ئیبن عەباس) کارەساتی (الجمل)و (صفین)و پـێش ئەمـەو دوای ئەوەشـی پـشتگوێ خست، دەستی کرد بە بنیاتنانو چاکسازیو، ئاشتەوایی، خوێنی زامەکانی سڕی، جێی خۆی لەدڵی خەڵکدا کردەوە، بەڕاستی نازناوی (حبر الامة المحمدية)ی وەدەست هێنا.

فـەرمو ئەمەشـیان (ئـیبن زوبـەیر) - خـوای لێ ڕازی بێـت -، بـاس نـاکرێ چـەند ڕێزدارو پایەدارو خواپەرسـتو شـکۆدار بـو، ڕێگـای ڕوبەڕوبونـەوەی هەڵبـژاردو لـەو پێناوەدا تێکۆشا، دەرەنجام لە گێڕانەوەی فەرمودە دورکەوتەوەو، موسڵمان گەلێکیشی لێبونەوە، پاشان مەرگەسات ڕویدا، چونکێ خۆی لە حەرەمدا پەنادا بو، ماڵی خوایان زامدار کردو، موسڵمان گەلێکیشیان کوشتو، ئەویشیان کوشتو پاشانیش هەڵیانواسی ﴿... وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ... هەر فەرمانێ خودا بیدا دەبێ پێکبێ.(٣٨) الأحزاب﴾.

ئەوەی من دەیڵێم بۆ دەستدرێژیکردنە سەر هاوەڵانو کەمکردنەوەی پلـەو پایـەی ئـەوان نیـە، بەڵکـە لێکۆڵینەوەیـەکی مێـژویی یـەو مرۆڤـ پەنـدی لـێ وەردەگـرێو ئەسرینی پێ هەڵدەڕێژێ.

بێگومان نەرم‌و نیانی‌و، لێبوردەیی‌و چاوپۆشی، بە کۆمەڵە خەڵکێکی کەم نەبێ بە هەمو کەس نابڕێن، چونکێ داکۆکی لەوە دەکا مرۆڤ هەوەسی خۆی لەبن پێدا بپۆشێ‌و، کڵپەی خواستەکانی دامرکێنێ‌و، جڵەوی هەڵنەرو پاڵنەری توند بگرێ.

## تێـڕوانـینـێـك

ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: ((**تَعَرَّف الـى الله فـي الرخـاء يعرفـك فـي الـشدة**... ئەگەر بەندە لەکاتی هێمنایيدا پارێزگاری لە فەرمانەکانی خوا کردو سنوری ئەوی پاراست‌و، چاوەدێری مافەکانی کرد، بە سای ئەوە ناسیاوی لەگەڵ خوادا پەیدا دەکاو، پەیوەندیەکی تایبەتیش لە نێوانی بەندەو پەروەردگاریدا دروست دەبێ، ئینجا خوای گەورەش لە تەنگانەدا ئەو دەناسێ‌و، ڕەچاوی ناسیارێتی دەوری هێمنایی دەکاو، بەهۆی ئەو پەیوەندیە لە دوای مەینەتباری ئازادی دەکا، ئا ئەو پەیوەندیە تایبەتەیە وا دەکا بەندە لە خوا نزیك خاتەوەو، خۆشی بوێ‌و، ئەویش وەڵامی خواستەکانی بداتەوە)).

"ئەگەر بەندە بە پێی پێویست ئارامی گرت، بەڵای لە ئاستدا دەبنە خەڵات‌و، دەردی بۆ دەبنە بەخشش‌و، ناخۆشی دەبنە خۆشی، بێگومان خوای بێ هاودەم‌و هاوتا بۆ ئەوە تاقی نەکردۆتەوە لەناوی ببا، بەڵکە بۆ ئەوە تاقی کردۆتەوە تاوەکو بەندایەتی‌و، ئارامگری بە ئەزمون بگەیەنێ، مافی خوای بەرزو بێ وێنەیە بەسەر بەندەیەوە چۆن لە خۆشیدا دەیپەرستێ، بەو شێوەیە لە ناخۆشیدا بیپەرستێ، چۆن لەمەڕ ئەو شتەی پێی خۆشە بەندایەتی دەنوێنێ هەر بەم جۆرە سەبارەت بەوەی لە دڵیشیدا گرانە بەندایەتی بنوێنێ، زۆربەی خەڵکانیش دەربارەی ئەو کارانەی پێی دڵخۆشن بەندایەتی ئەنجام دەدەن، لەوەی دڵیشیان نایگرێ پشت هەڵدەکەن، ئەوسا لێرەدا پلەو ڕێزی بەندەکان لەیەك جیادەبێتەوەو، بە گوێرەی ئەوە لەلایەن خوای دەستە باڵاوە پلەو پایەیان دیاری دەکرێ".

## زانست کلیلی ئاسانکاریە

زانستو ئاسانکاری دو دۆستی خۆشەویستی دێرینن، بۆ سەلماندنی ئەمە دەشێ سەرێك لە دەریای زانستی زانا بە تواناکان بدەی، کە ژیانیان چەندە ئاسان بوەو، هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا چەندە سوكو لەجێ بوە! ئەوان لە مەبەست تێگەیشتنو، بە خواستەکان گەییشتنو، بە ناخی بابەتەکاندا ڕۆیشتن، لە کاتێکا دەبینی گرانبارترینی خەڵکانو، کەللە ڕەقو ڕانەهاتوترین کەسو ڕێگا سەختو دژوارترین کەس، ئەوانەن لەمەڕ زانستو زانیاری هەژارو تەنك دەستن، چونکێ ئەوان چەند دەستەواژەیێکیان بیستو سەرەدەریان لێ دەرنەکرد، چەند مەسەلەیەکیان وەبەر گوێیان کەوت پەیان پێ نەبرد، بەڵای خەواریجەکانیش هەر لەوەدابو کەم زانست بونو لێکدانەوەیان کرچو کاڵ بو، چونکێ ئەوان ڕاستەقینەیان دەرك پێنەکردو، ڕاستەڕێیان وەدی نەکرد، لە تەنکاواندا دەگەڕانو لە قوڵاییدا مەلەوانیان نەکردو، خۆیان لەناو کاری بە گێچەڵو تێکەڵو پێکەڵ خست.

## هەمو شتێ بە خوێ خوێش بە مانا

دو کتێبی ناودارم خوێندۆتەوە، سەیرەکەم هێرشێکی توندو سەختی کردۆتە سەر بەختەوەریو ئاسانکاری لە کاتێکا خوای کار لەجێ کردونی بە دیاری.

یەکەمیان کتێبی (احیاء علوم الدین)ی (غەزالی)، کە بە هاوارەوە بانگێشتی ئەو خۆ برسیکردنو بێبەرگیو پەڕپوتیو، کۆتو زنجیرکردنە دەکا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوە هاتوە لە کۆڵ هەمو جیهانی بکاتەوە. هەستاوە حەدیس گەلێکی هێناونو بەسەر یەکیدا کەڵەکە کردونو، زۆربەی هەرە زۆریشیان لاوازو هەڵبەستراون، دوای ئەمە چەند بنەماو بنچینەی لەسەر دامەزراندون پێی وایە گەورەترین هۆکاری گەیێنەری بەندەن بە پەروەردیاری.

منیش (إحیاء علوم الدین)م لەگەڵ (صحیحین)ی بوخاریو موسلمدا بەراورد کــرد، جیاکــاریو لێکــدوریێکی زۆرم وەدی کــرد، ئــەویان خــۆ ئــازاردانو ســەختو گرانــە، ئەمەشیان لێبوردەییو سوکو ئاسانە، ئینجا لە واتای وتەی خوا گەیشتم: ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ... لەبەریشت سانا دەکەین، هەتا ساناترین ڕێگە پەیدا بکەی. ﴿٨﴾ الأعلی ﴾.

کتێبی دوەمیان: (قوت القلوب)ي (ئەبو تالیب)ی مەککەیی یە، ئەویشیان زۆر بــە گەرمو گوڕی جەخت لەسەر وازهێنان لە ژیانی دنیاو خۆ لێ گۆشەگیرکردنی دەکاو، مرۆڤ هەڵدەنێ بۆ ئەوەی هەوڵو گەڕی لەکارخاو، لە ژیانی خۆش پــشت هــەڵکاو، لــە ڕێگای دەستەبەرکردنی ژیانی بێ حاڵو تفتو تاڵــدا پێشبڕکێ بکا.

دانــەری ئــەو دو کتێبانــە: (ئــەبو حامیــد غــەزالی)و، (ئــەبو تــالیبی مەککــەیی) چاکەیان ویستوە بەڵام ڕاوبۆچونیان لە تەرازوی فەرمودەو ڕەوشتی پێغەمبەردا ﷺ بێســەنگە، ئــا لێــرەدا کــەموکوڕی ڕوئــەدا، بۆیــە پێویــستە کەســی ڕێنیــشاندەر بــە ڕێگایەکە ئاشنا بێو لــە گرتنەبــەری ڕێگــادا چوســتو چاڵاکو وریــا بــێ، ﴿ ... وَلَكِن كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ... بەڵکــە ﴿ئەوانــە هــەر گوتویانە﴾: ئێوە کە فێری کتێبو خوێندنەوەی بــون، لەســەرتانە هــەر پەروەرنــدەو بناسن. ﴿٧٩﴾ آل عمران ﴾.

## دڵ فــراوانتــرین کــەس

دڵ گوشادیو ڕەزا نوێنیو گەشبینی: چەند ڕەوشتێك بون لــە مامۆســتاو فێرکــاری چــاکە کاریــدا ﷺ وەدی دەکــران، ئــەو پێغەمبــەرەی ﷺ مــوژدەدەرە، بــارگرانیو ڕەواندنــەوەی قەدەغــە کــردوە، هەســت بــە بێئومێــدیو دارمــان ناکــا، ڕەزانــوێنی لــە دڵدایــەو، زەردەخەنــەی لەســەر لێــوە، لــە بڕیــارو فەرمانیــدا ئاســانکارەو، لــە ڕێو شوێنیــدا مــام ناوەنجیــەو، شــوێن پێهــەڵگرانی بەختــەوەریان لەنێودایــە. گــەورەترین کاری ئەوە بو باری سەرشانیان سوك کاو لە کۆتو داو ڕزگاریان کــا.

## هێواش..هێواش

دەتوانی لە گوتاری هۆشیارکردنەوەدا بەو شێوەیە ئاسودەیی بەسەر گوێگراندا دابێنی، بە قۆناغ بابەتەکان بوروژێنی، گرنگترینیان باس بکەی ئەوسا گرنگی بە دوادا بێنی، ئەو ئامۆژگارەیەی پێغەمبەری خواش ﷺ کە بە (موعاز)ی ڕاگەیاند خوای لێ ڕازی بێت لەو کاتەی بەرەو (یەمەن)ی ڕەوانە کرد، پاڵپشتی لەو قسەیە دەکەن، کە دەفەرموێ: ((**فليكن اول ما تدعوهم اليه، شهادة ان لا اله الا الله واني رسول الله**... یەکەم شت کە تۆ بانگیان بۆ دەکەی، شایەتی دانە بەوەی هەر خوا پەرستراوی ڕاستەقینەیەو، منیش نێرراوی خوامە)) هەتا کۆتایی. کەوایە لە بابەتەکاندا یەکەم و دوەم و سێیەم هەیە، بۆچی بابەتەکان بەسەر یەکدا کەڵەکە بکەین و، بە یەکەوەش وەبەرچاوانیان خەین؟! ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ... خوا نەناسەکان دەبێژن: بۆچی خودا بەتێکڕایی ئەم قورئانەی بۆ نەناردۆتە خوارەوە؟ هەر بۆ ئەمە بو کە ئێمە دڵتی پێ دامەزرێنین و بەڕێك و پێکی و بە ئارامی بۆتی وەخوێنین. (٣٢) الفرقان﴾.

یەکێ لەوانەی موسڵمانان بە هۆی ئایینەکەیانەوە بەختەوەر دەکا، ئەوەیە لەژێر سایەو دروشمی ئەو دینەو، سوك وەرگرتنی فەرمان و یاساخ کراوەکانی هەست بە سرەوتن و سانەوە دەکەن، لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە هاتوە لە دڵە ڕاوکێ و پرش و بڵاوبونی زەین و هۆش و، ترازان لە بواری کۆمەڵایەتی ڕزگاریان کا.

لە یاسای ئیسلامیشدا هیچ ئەرکێك بەبێ ئامرازی نەرێ (اداة النفي) دانەنراوە ﴿... لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ... خوا ئەرکی لە توانا بەدەر، بەسەر کەسدا ناسەپێنێ. (٢٨٦) البقرة﴾.

چونکێ ئەرك قورسەو، ئایین یش بە قورسی دانە بەزیوە، بەڵکە بۆ لابردنی هاتوە.

یــاوەران داوای ئامۆژیاریــان لــە پێغەمبــەری خــوا دەکــرد ﷺ بــە فــەرمودەیێکی کــورتی وەڵام ئەدایــەوە بێگانــەو خۆیانــە ســەرەدەریان لــێ دەردەکــرد [٨٢٤]، کەوایــە ڕەچاوکردنی بـوارو ڕاسـتکاریو [٨٢٥] ئاسـانکاری دروشمـی بەرچاوی ئـەم ئامۆژگاریـە گرانبەهایە بون.

ئێمە لەوەدا هەڵەین، کە هەرچی پەندو ئامۆژیاریو دابو ڕەوشتو ڕێنوێنێیك لە هەگبەماندا هەیە لە یەك شوێندا بە گۆڕێی وەرکەین ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ... قورئانێکە بە جیاجیا ناردومانە، تا بە هێدی بۆ مـەردمی بخوێنیەوەو بەرانبەر بە پێویستی ڕۆژ بەرێمان کرد. (١٠٦) الإسراء﴾.

## کە سەبارەت بە سوپاسکردن لەسەر زۆری دەستەوسانی لەسەر کـەمی چـۆن دەتوانی ؟

بێگومـان ئـەو کەسـەی لەسـەر ئـاوی شـیرینو سـاردو سـازگار سوپاسـی خـوا نـەکا، لەســەر کۆشـكو باڵەخانــەی بــەرزو، ئۆتــۆمبیلی ئـاخر مۆدیـلو، بـاخو باخـاتی بـێ وێنەش سوپاسی ناکا.

ئەوەی لەسەر نانی گەرمو نەرم دان بە خەڵاتی خـوا دانانـێ، لەسـەر خـوانێکی بـە خواردنی بە چێژو هەمە جۆر ڕازاوەش ستایشی خوا نانوێنێ، چونکو مـەردمی بـەد نمـەكو [٨٢٦] سـپڵە کـەمو زۆری هـەروەکو یـەك دەبینـێ مرۆڤـ گەلـێ لەوانـە پـەیمان گـەلێکی تونـدو تۆڵیـان بـە خـوادا، لەسـەر ئـەوەی هـەر کاتـێ خـوا دەروی خۆشـی لـێکردنەوەو بەهرەی بەسەردا ڕژانـدن گیرفانـەکانی پڕکـردن، ئـەوجارەیان سوپاسـی خوا دەنوێنن، پـارەو پـوڵی دەبەخـشن، مـەڕو مـاڵاتی سـەردەبڕن ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ (٧٥) فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن

---

٨٢٤) تێی دەگەیشتن.

٨٢٥) واقیعیەت.

٨٢٦) بێ ئەمەك/ سپڵە.

فَضْلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ... هێندێك لە نێو ئەوانەدا پەیمانیان دەگەڵ خودا بەست کە شەرتە ئەگەر خودا لە چاکەی خۆی بەشمانی بداتێ، ئێمەش خێرو خێرات دەکەین‌و دەچینە ڕیزی پیاوچاکانەوە. کە خوا کردی‌و لە چاکەی خۆی زێدەی دانێ، ڕژدیان لەسەر کردو پشتیان هەڵکردو ڕویان وەرگێڕا. ﴿٧٦﴾ التوبة ﴾.

ئێمە ڕۆژانە زۆرێك لەم چەشنە کەسانە دەبینین، حاڵ پەشێوو داماوە، هۆشی لە خۆی نەماوە، گازاندە لە پەروەردیاری دەکا، کە بەخششی گەورەی پێ نەبەخشیوە، نازو گۆزی زۆرو زەوەندەی بە چاوی خۆی نەدیوە، کەچی لەناو لەش ساخی‌و تەندروستی‌و هەبویی دابەنازەوە دەخولێتەوە، لە گەشت‌و سەیراندایەو پشوی داوە، سوپاسیشی لەسەر ناکا، جا ئەگەر وەکو ئەوانە نەبێ کە لەناو گەنجینەو کۆشك‌و تەلاری فراواندا خۆیان لەبیر چۆتەوە دەبێ ئەو کاتە چۆن بێ؟!

ئەگەر ئاوای بۆ بچێتە سەر زیاتر لە خوای یاخی دەبێ‌و، لە ئاستی پەروەرندەی وەدی هێنەری دا پتر سەرپێچی کارو لاسار دەبێ.

پێ خواسەکەمان دەڵێ: ئەو کاتەی خوا پێڵاوێکی پێ بەخشیم سوپاسی دەکەم. خاوەن پێڵاویش سوپاسەکەی دوا دەخا هەتا خوا ئوتومبێلێکی مۆدێرنی پێ ئەدا، سپڵەییمان بەوە دیارە، دەمانەوێ دەستبەجێ بەهرەی خودا وەرگرین‌و، بە قەردیش سوپاسی کەین، ئەوەی لە خوای دەخوازین لێی بە پەلەین‌و، لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانیشی سستی دەکەین.

## سێ تابلۆ

هەندێك لە هۆشمەندان سێ تابلۆی پڕ بە هایان بەسەر پەرتوکخانەکەیانەوە هەڵواسیوە: یەکەمیان لەسەری نوسراوە: ئەو ڕۆژەی ئێستات ڕۆژە.

لە سنوری ئەمڕۆدا بژێی.

دوەمیان لەسەری نوسراوە: بیرکەوەو سوپاسگوزاریە، بیر لە بەهرەی خوا بکەوە بەسەرتەوەو، بە سوپاسگوزاری وەڵامیان دەوە.

لەوەی سێیەمیش نوسراوە: توڕە مەبە.

ئەوانە سێ ئامۆژیارین لە ساناترینو نزیکترین ڕێگاوە بە بەختەوەریت ئاشنا دەکەن، دەشتوانی لە بیرنامەی خۆتدا بیاننوسیو ڕۆژانە سەریان بەسەر دابگری.

## هەڵوەستەیەك

یەکێ لە وردیاتی نهێنی هاتنی خۆشی بەدوای ناخۆشیداو، ئاسانی بەدوای گرانیدا ئەوەیە، ئەگەر کارەساتی گەورەو توندو بەرچاو ڕەش هاتە ئاراوە، بەندە لەوە بێئومێد بو دروستکراوەکان لە هانای بێن، دڵی بە خوای تاكو تەنیاوە پەیوەست دەبێ، هەر ئەوەشیان پشت بەستنی ڕاستەقینەیە بە خوا.

بە هەمان شێوە ئەگەر بڕوادار لای وابو دوای ئەو هەمو پاڕانەوەو لالانەوەی ئاماری قەبوڵ بونو ئاسۆی ڕونی لێ بەدیار نەکەوتو، درەنگ داهات خۆری هیوای هەڵنەهات، یەك سەربەخۆیدا دەچێتەوە سەرزەنشتی دەرونی دەکاو، پێی دەڵێ: هەرچی بەسەرم هات لەڕێی تۆوە بو، ئەگەر چاکەو خێرت هەبوایە وەلامم ئەدرایەوە. ئەو لۆمەکردنەش لە زۆربەی شێوە بەندایەتیەکان لەلایەن خواوە خۆشەویستترە، ئەو سەرزەنشتەیە وا لە بەندە دەکا، خۆی لە بەرابەری خوادا بەکەم سەیرکاو، دانیش بەوە دابنێ بەو بەلایە شیاوە کە بەسەری دێو، بەوە شیاو نیە نزای گیرا بێ، هەر بە سای ئەو هەڵوێستەیە لەو ساتەدا دەستبەجێ نزای لێ وەردەگیرێو بەلای لەسەر لادەچێ.

(ئیبراهیم)ی کوڕی (ئەدهەم)ی لە خوا ترس دەڵێ: ((ئێمە واین لە ژیانێ ئەگەر دەسەلاتدارو پاشا پێی بزانێ بە شمشێر لێمان دەسێنێ)).

(ئیبن تەیمیە)ی شێخی ئیسلامیش دەڵێ: ((لە ڕاستیدا کاتو ساتی وا بەسەر دڵما ڕادەبورێ دەڵێم: ئەگەر بێو بەهەشتیان لە وێنەی ئەو ژیانەی من دابن، لە ژیانێکی خۆشدا بەسەردەبەن)).

# ئەی خەڵکینە ئاسودە بن

لە کتێبی (الفرج بعد الشدة) پتر لە سی جێباسی تیایە، هەر هەمویان هەواڵمان پێ دەدەن، کە لە سەر لوتکەی مەرگەساتی بەرچاو ڕەشدا پرشنگی هیوا هەڵدێ، لە سەروی چڵەپۆپەی مەینەتیەکان داخوری ئازادی دەدرەوشێ، ئەوەی لە هەمو کەسیش پتر دەرداروو بەڵاباروو لە خەفەتدا ڕۆچوە خوارە، لە هەمو کەسیش نزیکترە لە دەربازبونو، کار بۆ ئاسان بونو، لە تەنگانە بە دەروە چون، (تەنوخی) لە کتێبە درێژو پەسندەکەیدا، پتر لە دوسەت داستانی بۆ باس کردوین بۆ ئەوانەی دوچاری ئەشکەنجەو ئازار هاتون، یاخود لە بەندیخانە کراون یا لەسەر کار وەلا دراون، یا شار وەدەر فڕێدراون، یا دارکاری کراونو سزا دراون، یا ناچارکراوو سەرشۆڕکراون، تەنیا چەند ڕۆژێکی خایاند، لە پرێکا پێشرەوو پێشەنگی کۆمەکیو تینو تەوژمی ئازادی لەسەر لێواری بێهیوایی - کاتێ ئەوان بێئاگابون- پێیان گەیشت، ئەو خوایە بۆی ڕەوانەکردن کە بیسەرەو وەڵامگۆیە.

(تەنوخی) بە کڵۆڵو کۆست کەوتوان دەڵێ: ئارام بگرن، کۆمەڵە خەڵکانێك لە پێش ئێوەدا بەو ڕێیەدا گوزەریان کرد:

کەواتە هەر لە کۆنەوە ئەوە باوە ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ ... بێگومانە بە هەندێ شت تاقیو دەکەینەوە. ﴿١٥٥﴾ البقرة﴾، ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ... ئێمە ئەوانەی بەر لە مانیشمان بە تاقی کردەوە. ﴿٣﴾ العنكبوت﴾.

ئەوە فەرمانێکی دادوەرانەیەو خوا بەندەکانی پێ لە سەنگی مەحەك دەدا، لە تەنگانەدا لەسەر بەندایەتی تاقیان دەکاتەوە، بارودۆخیان دەگۆڕێ چۆن شەوو ڕۆژ دەگۆڕێن، کەوایە ئەو نارەزاییو گلەییو مورچو مۆنیەی پێ ناوێ ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ... ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانەمان نوسیبا، کوشتاری خۆ بە خۆ بکەن یان لە وڵاتو دەرکەون -کەمیان نەبێ- نەیاندەکرد. ﴿٦٦﴾ النساء﴾.

## چاکەکاری بەربەستی توشهاتن بە خراپەیە

جوانترین دەستەواژە، ئەو پەیڤەی (ئەبوبەکر)ی (سەدیق)ە - خوای لێ ڕازی بێت- کە دەڵێ: چاکەکاری بەربەستی توشهاتن بە خراپەیە. ئەو ڕستەیەش هەم ژیریو هەم کتێبی خواش پاڵپشتی لێ دەکەن: ﴿فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ... سا ئەگەر (یونس) پاکی خوای نەگوتبایە، تا ڕۆژی سەلا ڕادەبو، لە ورگی (ماسی)دا دەمایەوە. ﴿١٤٤﴾ الصافات﴾.

(خەدیجە)ش بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: ((نەخێر سوێند بە خوا هەرگیز خوا تەریقت ناکاتەوە، تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیێنی، بارسوکی بۆ خەڵکان دەنوێنی، سود بە هەژار دەگەێنی، لەسەر مەرگەساتی ڕۆژگار یارمەتی دەنوێنی. بزانە چۆن لەسەر پاشەڕۆژ خێری بەڵگە بە هەڵوێستی جوان دێنیتەوەو، چاکەو جوامێری سەرەتایی دەکاتە بەڵگە لەسەر شکۆو ڕێزی کۆتایی)).

لە کتێبی (الوزراء)ی (سەبابی)و کتێبی (المنتظم)ی (ئیبن جەوزی)و کتێبی (الفرج بعد الشدة)ی (تەنوخی) داستانێك هاتوە، کە ئەوە پوختەکەیەتی: (ئیبن فورات)ی وەزیر بە دوای (ئەبو جەعفەر)ی کوڕی (بوستام)دا دەگەڕاو دەیەویست ئازارو ئەشکەنجەی پێبگەیەنێ، ئینجا زۆر بەدەستیەوە گرفتار بو، دایکی (ئەبو جەعفەر)یش هەر لەو کاتەی کوڕەکەی مناڵ بو خوی پێوە گرتبو هەموو شەوێك کولێرەیەکی لەژێر سەرینی (ئەبو جەعفەر)دا دەنا هەر کە بەیانی دادەهات بۆ بەڵاگێڕی کوڕەکەی دەیکردە خێر.

دوای ئەوەی کە ماوەیەکی باش لەبەردەستی (ئیبن فوڕات)دا ئازاری چەشت، بۆ کارێکی پێویستی چوە لای (ئیبن فوڕات)، (ئیبن فوڕات) بە (ئەبو جەعفەر)ی گوت: تۆ بەخۆو بە دایکت کولێرەییێکتان هەیە؟

گوتی: نەخێر.

(ابن الفرات) گوتی: چارەت نیە هەر دەبێ قسەکەم بە ڕاست دابنێی.

(ابا جعفر)یش لەسەر شێوەی پیا هەڵدانی کاری پەسندی ژنان بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە. (ابن الفرات) گوتی: نا وانەکەی، من لە شەوی ڕابردودا پیلانم بۆ تۆ دەگێڕا، کە ئەگەر پیلانەکەم سەری گرت لە ناوت بەم، ئەو شەوە خەوتم لە خەوما بینیم چۆن بڵێی شمشێرێکم بە ڕوتی لەدەستدابو، دەمەویست تۆی پێ بکوژم، دایکت ڕێگای پێ گرتم کولێرەیەکی لە دەست دابو لە پێشە تۆ کردبوی بە مەتاڵو ڕێی لە من دەگرت نەیدەهێشت بەتۆ بگەم، منیش دەستم پێت نەگەیشتو، بە ئاگا هاتم.

(ئەبو جەعفەر) ئەوەی بە هەل زانیو لەسەر ئەو گرفتەی لە نێوانیاندا هەیە سەرزەنشتی کردو، دەرفەتی بۆ ڕەخسا لەو ڕێیەوە ئاشتەوایی بکەن، هەمو هەوڵێکیدا بۆئەوەی ڕازی بکاو گوێڕایەڵی بێ، وازی نەهێنا هەتا قایلی کردو، هەردوکیان بون بە هاوڕێ.

(ئیبن فوڕات) گوتی: سوێند بە خوا لەمەولا بەدەستی منەوە ئازار نادرێی.

## چەند پشودانێک یاریدەدەری ڕێگا بڕینن

شتێکی ڕونو لەبەرچاوە لە یاسای ئیسلامدا فراوانیو ئاسانکاری هەیە، کە ڕێ بۆ بەندە خۆش دەکا لە نواندنی بەندایەتیو ماڵ بەخشینو کردەی چاکدا دانەبڕێ، پێغەمبەرمان ﷺ زەردەخەنەی لەسەر لێو بو﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ... هەر ئەو دەخاتە خەنینو دەگرێنێ. ﴿٤٣﴾ النجم ﴾.

وتەی خۆشو بە پێکەنینی کردوەو هەمو شتی هەر ڕاست بوە، لەگەڵ (عائیشە)دا - خوای لێ ڕازی بێت - غارغارێنێی کردوە، بۆ ئەوەی یاوەرانی بێزار نەبن لەکاتی ئامۆژیاریدا، داوای ڕێگا پێدانی لێدەکرد، زۆ قوڵبونەوەو خۆ ئازاردانو ڕەقەکاری ڕەت دەکردەوەو، دەیفەرمو: هەر کەسێ لە ئاییندا ڕەقەکاری بنوێنێ، بەبێ گومانی بەسەریدا زاڵ دەبێ، لە فەرمودەی تریشدا هاتوە: لە ڕاستیدا ئایین توندو بەندە، سا بە نەرمی خۆی تێ بخەن.

ئەمەشیان هەر لە فەرمودەیە، کە دەڵێ: هەمو خواپەرستێك تورەبونێکی هەیە، ئەویش بریتییە لە گەرمو گوڕیو توندو بەندیو تیهەڵچون.

مرۆڤی گرانبـاریش مـەودای کـاری کورتـە، چـونکێ هـەر بـارودۆخی هەنوکـەی لێکدەداتەوەو، بەلای ڕوداو پێش هاتو ماوەی درێژ خایەن لا ناکاتەوە، ئەگینا کەسی ژیریار لە کارەکانیدا تخوبێکی نزیکی هەیەو نایبەزێنێ، جا ئەگەر تینو توانای گەشەی کرد تخوبی بەرفرەتر دەکا، ئەگەرنا لە سنوری خۆی تێپەڕ نادا، هەر ئەو واتایەش لەو هەواڵەی لە هاوەلان بیستراوە، دەفامرێتەوە (کە دەڵێ): بێگومان دەرونەکان ڕوتێکردنو پشت تێکردنیان هەیە، جا لەو کاتەی بەرەو ڕو دێن بە دەرفەتیان بزانن، لەو کاتەی پشتیش هەڵدەکەن گوێیان پێ مەدەن.

نەم بینیوە هیچ کەسێ لە پێواندا زیادیان کردبێو، پتر سوننەتیان ئەنجام دابێو، بۆ ڕەنج کێشان هەوڵیان دابێ، مەگەر دوای ئەمە پچڕاونو پاشە کشەیان کردوەو لە جاران بێ توانا تر بون.

لە بنەڕەتیشدا ئایین بۆ بەختەوەری هاتوە ﴿ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ... ئەم قورئانەن بۆ نەناردی کە توشی چەوسانەوە بی. ﴿٢﴾ طه ﴾.

بێگومان ئەوانەی پتر لە توانایان خۆیان ئازار داوە، پاشانیش خۆیان پێ ڕاگیر نەکراوەو، لە گۆڕەپانی هەڵکەوتدا [827] تێشکاونو پاشەکشەیان کردوە ﴿ ... وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَاۖ ... ئەو ڕەبەنیەش کە هەیانە ئێمە بۆمان نەنوسیون، بۆخۆیان دایانهێنانەوە ئەم کارەشەیان بۆ ڕەزامەندی خودا بو، بۆشیان نەکرا وەك پێویستەیێکی بێنن. ﴿٢٧﴾ الحديد ﴾.

ئایینی ئیسلامیش بەوە لە هەمو ئایینێك جیا کراوەتەوە، کە ئایینێکی مام ناوەنجیەو، سوكو سانایەو، لەگەڵ گیانو لاشەو دنیاو دوارۆژو سروشتدا دانوی دەکوڵێ ﴿ ... ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ ... ئەمە ڕەوشتێکی ڕاستە. ﴿٣٦﴾ التوبة ﴾.

---

٨٢٧) واقيع.

لە (ئەبو سەعید)ی (خودری) دەگێڕنەوە، دەڵێ: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لە هەمو کەس باشترە؟

فەرموی: ((**مؤمن جاهد بنفسه وماله في سبيل الله، ثم رجل معتزل في شعب من الشعاب يعبد ربّه**... بڕوادارێك بە گیانو ماڵی لە ڕێگای خوادا تێبکۆشێ، دوای وی پیاوێك لە یەکێ لە دۆڵاییەکاندا خۆی پەناداو خوای خۆی بپەرستێ)).

لە ڕێگایەکی ترەوە هاتوە: ((**يتقي الله ويَدَع الناس من شرِّه**... لە خوا بترسێو خەڵکیش لەدەستی بێوەی بن)).

بە هەمان شێوە لە (ئەبو سەعید)ەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرمو: ((**يوشك ان يكون خير مال المسلم غنم يتبع بها شعب الجبال ومواقع القطر، يفر بدينه من الفتن**... رواه البخاري نزیکە وای لێبێ باشترین ماڵی موسڵمانی: مەڕو ماڵاتێك بێ، لە لوتکە چیاکانو لە وەرگادا بیان لەوەڕێنێو، بەخۆیو دینەکەی لەبەر فیتنەو بەڵا ڕابکا)).

عومەر دەفەرموێ: (لە گۆشەنشینی بەشی خۆتان وەرگرن).

وتەی (جونەید)یش چەند جوانە: (ئازاری گۆشەنشینی سوکترە لە دەردی تێکەڵی).

(خیتابیش) دەڵێ: گۆشەنیشنی ئەگەر تەنیا ئەوەندە دەستکەوتەی هەبێ، مرۆڤ بەدور بگرێ لەوەی زمانی بە خراپە لە خەڵکی بگەڕێو، لە بینینی ئەو خراپانەی بەدور بگرێ کە چارەسەری پێ ناکرێ، دیارە بەهرەیەکی زۆری پێ بڕاوە.

هەر بەو واتایەش (حاکم) فەرمودەیێکی ساخ کردۆتەوە، کە لە ئەبو زەر گێڕراوەتەوە، کە دەفەرموێ: ((**الوحدة خير من جليس السوء**... تەنیایی لە هاودەمی خراپ چاترە. ئەو فەرمودەیەش فەرمودەیێکی (حەسەن) ە)).

(خیتابی) لە کتێبی (العزلة)دا باس لەوە دەکا کە: خۆ لە خەڵکی پەنادانو تێکەڵی بە گوێرەی پەیوەندیدارەکانیان دەگۆڕێن، جا ئەو بەڵگانەی مرۆڤ بۆ تێکەڵی هەڵدەنێن [828]، وا ڕاڤە دەکرێن، کە بۆ تێکەڵبون لەمەڕ گوێرایەڵی پێشەوایانی

---

٨٢٨) هاندەدەن.

ئیــسلام‌و کــارو فــەرمانی ئیــسلامدا هــاتون، پێــچەوانەی ئــەو بەڵگانــەش لەمــەڕ تێکــەڵییێکی پێــچەوانەی ئــەو تێکەڵیــە هــاتون، بــەڵام ســەبارەت بــەو کۆبونــەوەو لێکجیابونەوەی، کە بە جەستە دەکرێ، ئەگەر مەردم بزانێ بۆ تێکەڵی خۆی پێ دەژیێ‌و، لە دینی خۆی پارێزگاری پێ دەکرێ، چاتر وایە لە تێکەڵی خەڵکی خۆی بەدور بگرێ، بەڵام بەو مەرجەی بەشداری نوێژی بە کۆمەڵ بێ‌و، سڵاوی خەڵکی وەرگرێتەوەو، مافی موسڵمانان کە بەسەریەوە هەیە وەکو سەردانی نەخۆش‌و، ئامادەی ناشتنی مردوو، وێنەی ئەمانەش، جێبەجێ‌یان بکات.

تەنیا ئەوە لە مرۆڤ خوازراوە بەبێ هودە تێکەڵ نەبێ، چونکە زەین‌و هۆشی دەپرشێ‌و [829]، کاتەکانی لە کارو کرداری گشتیدا بەهەدەر دەچێ، تێکەڵبون بە خەڵکیش وەکو ئاتاجی خواردن‌و خۆراکە، بەپێی پێویست بەکاردێنرێ، هەم گیان‌و هەم دڵیش بەم جۆرە حەساوەترن، خواش لە هەمو کەس زاناترە.

قوشەیری لە (الرسالة)دا دەڵێ: ڕێگای ئەو کەسەی گۆشەگیری هەڵدەبژێرێ، ئەوەیە لای وابێ خەڵك لەدەستی ئەو دەحەسێتەوە، نەك بە پێچەوانە، چونکە یەکەمیان خۆ بەکەمزانی لێ وەدی دەکرێ، کە ئەمەش ڕەوشتی مەردمی خۆ بەکەمزانە، دوەمیشیان خۆ بە زلزانی لێ فەراهەم دێ کە ئەوەش نەریتی خۆ پێ زۆرانە. خەڵکان سەبارەت بە گۆشەگیری‌و تێکەڵی سێ بەرەیان لێ پێکدێ.

بەرەی یەکەم: کەسانێکن خۆیان پەنا دەدەن هەتا لە وتاری هەینی‌و، نوێژی بە کۆمەڵ‌و، کاری خزمەتگوزاریش تێکەڵ نابن، ئا ئەوانە بەهەڵەدا چون.

دەستەی دوەمیش: لەگەڵ خەڵکی تێکەڵن هەتا کۆڕی گاڵتەو گەپو قاوەقاو [830] و کات بەفیڕۆدانیش هەڵنابوێرن [831]، ئەوانەش بە هەڵەدا چون.

گرۆی ناوەنجی: ئەوانەن لەو شێوە بەندایەتیەی تەنیا بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێ لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵاون، بۆ هاریکاری هەر کردەیێ لە پێناوی خواو چاکەکاری بێ بۆ وەرگرتنی پاداشت‌و خەڵات بێ ئەوان تیایدا بەشدارن، لەهەر بۆنەیەك بۆ

---

٨٢٩) دەپرژێ/ بڵاو دەبێ.

٨٣٠) قسەو قسەڵۆك

٨٣١) باز نادەن.

پشت هەڵکردن و بەرپەرچی ڕێی خودا بێ و زیادە ڕۆیی لە شتی حەڵاڵ تیابێ ئەوان خۆی لێ دەبوێرن ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ... بەم شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی هەڵبژاردە. ﴿١٤٣﴾ البقرة ﴾.

## هەڵوەستەیەك

لە (عوبادە)ی کوڕی (سامیت) دەگێڕنەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((**علیکم بالجهاد في سبیل الله، فانه باب من ابواب الجنّة، یذهب الله به الغم والهم**... لە سەرتان بێ جیهاد لە پێناوی خوادا بکەن، چونکێ جیهاد دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت، خوا خەم و پەژارەی پێ دەڕەوێنێ)).

(بەڵام گاریکەری جیهاد لەسەر لابردنی خەم و پەژارە، بەپێی ناخ و دڵ شتێکی ڕون و دیارە، بێگومان هەرکاتێ دەرون پشتی لە تەوژم و هاش و هوشی گومڕایی و دەست بەسەرداگرتنی هەڵکرد، خاکەساری و پەرێشانی و کڵۆڵی و ترس و لەرزی پتر دەبێ، جا ئەگەر لەپێناوی خوا تێکۆشا، خوای گەورە خەم و خەمینی بەرەو چاپوکی و[٨٣٢] جەربەزەیی و[٨٣٣] خۆشی و شادی وەردەگێڕێ، هەروەکو خوای توانادار دەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ... ئێوە دەگژیان ڕابچن، خودا هەر بەدەستی ئێوە ئەوان توشی ئازار دەکاو ژێریان دەخاو سەرودەخا بەسەریانداو کارێك دەکا کوڵی دڵی باوەڕداران دابمرکێ. ڕکی دڵیشیان ڕادەماڵێ. ﴿١٥﴾ التوبة ﴾.

هیچ شتێ ئەوەندەی تێکۆشان لەپێناو خوا خەم و پەژارەو پەرێشانی دڵ ناڕەوێنێ، یارمەتیش هەر لە خواوەیە.

---

٨٣٢) چالاکی و چوستی.

٨٣٣) ئازایەتی.

## لەوەرگای سۆما لەم گەردونەدا

تێڕوانینی نیگاری شوێنەواری دەسەڵاتی خوا لە ئاسمان‌و زەویدا یەکێکن لە ڕێگای ئاسودەیی‌و هەدادایی [٨٣٤]، لە سۆنگەی تێڕوانین لە دروستکراوە درەوشاوەو ڕازاوەکانی خوای وەدیهێنەر - گەورەیی‌و شکۆداری بۆ ئەو - چێژ وەردەگری، بە سای ڕوانینی گوڵ‌و گوڵاڵەو، دارو درەخت، جۆگەو جۆبارو، چڕەو [٨٣٥] بیشەڵان [٨٣٦]، بەرپاڵ‌و [٨٣٧] قەدی کێوان، لە زەمین‌و ئاسمانەکان، مانگ‌و خۆرو، شەوو ڕۆژان، حەسانەوەو سرەوتن هەست پێ دەکەی، بیروباوەڕو ملکەچیت پتر دەبێ، جڵەوت بۆ دروستکاری هەرە زاڵ شۆڕتر دەبێ ﴿... فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ... سا ئێوە دەرس وەرگرن، ئەی گرۆی خاوەن ئاوەزان [٨٣٨]! ﴿٢﴾ الحشر﴾.

یەکێ لەو پرۆفیسۆرانەی باوەڕی هێناوە دەڵێ: کاتێ گومانم لە دەسەڵاتی خوا بۆ دروست دەبو، چاوێکم بە پەرتوکی بونەوەردا دەخشاند، بۆ ئەوەی پیتەکانی دەرئاساو [٨٣٩]، وەدیهێنانی تێداوە خوێنمەوەو، ژێلەمۆی باوەڕم داگیرسێتەوە.

## هەنگاونان بە نەخشە

شەوکانی دەڵێ: هەندێ لە زانایان ئامۆژگاریان کردم‌و پێیان وتم: ئەگەرچی ڕۆژێ دو دێریش بنوسی دەست لە نوسین هەڵمەگرە. دەڵێ: جا ئەو ئامۆژیاریەم لە گوێ گرت‌و، بەرهەمەکەشم دوریەوە.

---

٨٣٤) سرەوتن.

٨٣٥) داروباری چڕو پڕ.

٨٣٦) جەنگەڵستان/ دارو درەختی چڕژاو.

٨٣٧) بەرهەوراز.

٨٣٨) خاوەن عەقڵان.

٨٣٩) ئەو پەندە بۆ شتی بەپەلە بەکاردێ.

هەر ئەو واتایەش لەو فەرمودەیە دەفامرێتەوە: ((**خیـر العمـل مـا داوم علیـه صاحبـه وان قل**... چاترین کردار ئەوەیە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێ، با هەر چەندە کەمیش بێ)).

گوتراویشە: ئاوی بەخوڕ هەر لە دڵۆپ دڵۆپە پێکدێ.

هەر لەو ڕێیەوە دوچاری نیگەرانی دێین، کە دەمانەوێ بە دەرسێك ببین بەمەولاو وە کۆچێ ڕابگەینەوە [840]، ئەوسا بێزارو شەکەت دەبین و دەست لە کردار هەڵدەگرین، ئەگەر بێ و کارەکانمان یاومیاوە [841] ئەنجام دەین و، بەسەر قۆناغەکاندا دابەشیان کەین، بە هێورەیی قۆناغەکان تێپەڕ دەدەین، ئەو دەرسەیە لە نوێژ وەرگرە، شەرع پێنج کاتی لە یەکتر جودای بۆ داناوە، بۆ ئەوەی بەندە شەکەت نەبێ و پشو بدا، بە تامەزرۆیی بۆی بڕوا، ئەگەر بێ و لە یەك ساتدا کۆبکرێنەوە، بەندە لێیان بێزار دەبێ، لە فەرمودەشا هاتوە: (( **ان المُنبَتَّ لا ظهراً ابقى و الا ارضا قطع**... بێگومان ئەو سوارەی لە هاوەڵانی جێماوە نە پێیان دەگاتەوەو، نە پشتی وەڵاخەکەشی بە ساخی دێڵێ [842])).

بە گوێرەی ئەزمونیش دەرکەوتوە، کە هەرکەسێ کارەکانی بە قۆناغ بڕی بێ، ئەوەندە داهاتی وەدەستهێناوە، کە ئەو کەسەی بە یەك کەڕەت شانی داوەتەبەر وەدەستی نەهێناوە، وێڕای ئەوەی کلپەو گڕی هەستو سۆزیشی دانەمرکاوە.

یەکێ لەو سودو کەڵکەی لە هەندێ زانایانم وەدەست هێناوە، ئەوەیە، کە نوێژەکان کارەکان ڕێك دەخەن، ئەو وانەیەش لە وتەی خوا وەرگیراوە: ﴿... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ...نوێژ لەسەر خاوەن باوەڕان نوسراوێکە، وەختی بۆ دیاری کراوە. ﴿١٠٣﴾ النساء﴾.

سا ئەگەر بێ و بەندە لەدوای هەر نوێژێکدا بەرنامەڕێژی بۆ کارە دنیاییو دواڕۆژیەکانی بکا، هەست دەکا کاتو ساتێکی زۆرو بەرفرەی لەبەردەستدا.

---

٨٤٠) ئەو پەندە بۆ شتی بە پەلە بەکار دێ.

٨٤١) وردە وردە/ بڕ بە بڕە.

٨٤٢) واتە: پشتی وەڵاخەکەی بریندار دەکا.

با نمونەیێکت بۆ بێنمەوە: ئەگەر بێ‌و قوتابیەکی زانستی لەدوای نوێژی بەیانیدا بیەوێ لەهەر زانستێك خۆی حەز بکا دەرخی بکاو، دوای نیوەڕۆش بۆ خوێندنەوەیەکی گشتی ئاسان تەرخان بکا، دوای نوێژی عەسر تایبەت کا بە لێکۆڵینەوەیەکی وردی زانستی، دوای نوێژی (مەغریب) بۆ گەڕان‌و سەردانی خۆشەویستان بێ‌و، دوای نوێژی خەوتنانیشی بۆ خوێندنەوەی کتێبی سەردەمی‌و لێکۆڵینەوەو بەشداری خول‌و، دانیشتن لەگەڵ ئەندامانی ماڵ بێ، ئا ئەو بەرنامە ڕێژیە سودی پێ دەگەیەنێ، کەسی ژیریش بەهۆی چاوساغی‌و وریای خۆی کۆمەکی وەردەگرێ‌و ڕێگای بۆ ڕۆشن دەبێ.

﴿ ... إِن تَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ... ئەگەر لە خوا بترسن، ئامێری جیاکردنەوەی پاك‌و پیستان پێدەدات. ﴿٢٩﴾ الأنفال ﴾.

## تکـات لـێ دەکـەم بێ بەرنامـە بەسـەر مەبـە

یەکێ لەوانەی بیروهۆش دابڕدابڕ دەکا، ئەو زەین‌و پەشێویەیە کە خەڵکانێك تێیدا دەگوزەرێنن، ئەوان سنوری توانایان دیاری ناکەن‌و، بۆ ئەو مەبەستە تێناکۆشن، کە تێڕوانین‌و هزریان کۆدەکاتەوە، چونکو تێگەیشتن‌و زانیاری چەند ڕێ‌و ڕێچکەی هەنە، پێویستە نیشانەو دروشمەکانی دەرك پێ بکرێن‌و بزانرێن، ئەوسا مەردم یەك ڕێگای لێ هەڵبژێرێ، چونکێ یەك مەبەستی پەسندە.

بە هەمان شێوە یەکێ لەوانەی زەین پرشوبڵاو دەکاو، خەمان لەکۆڵ بار دەکا، قەرزاری‌و، داخداریە لە پێناوی سامان‌و، ئەرکی بەڕێوەبردنی ژیانە.

جا لێرەدا چەند بنەمایەك لەمەڕ ئەو بابەتە هەیە دەمەوێ باسیان بکەم:

<u>یەکەمیان</u>: ئەوەی پاشەکەوتی هەبێ هەژاری نابێ: ئەوەی لەبارەی خەرجکردن بزانێ‌و، تەنیا بۆ پێویستی ماڵی خۆی خەرج بکاو، لە زیادەڕۆیی‌و ماڵ بە فیرۆدان دەستی بگرێتەوە، هەست بەکۆمەکی خوا دەکا ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ... ئەو کەسانەی هەڵە خەرجن، دەگەڵ شەیتان دەبنە برا. ﴿٢٧﴾ الإسراء ﴾.

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ الفرقان ﴾

دوەمیان: ماڵ کۆکردنەوە لەو ڕێگایانەی حەڵاڵن، وازهێنان لە هەمو کارێکی حەڕام، لەبەرئەوەی خوا پاکەو، تەنیا پاکی گەرەکە، پیتو فەڕیش ناخاتە ناو ئەو کارو پیشەیەی بە ناپاکی ئەنجام دەدرێ ﴿ ... وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ... با زۆرایی ناپاکەکەش بۆت سەرسوڕمێن بێ. ﴿١٠٠﴾ المائدة ﴾.

سـێیەمیان: هەوڵ دان لـە پێنـاوی دەسـتەبەرکردنی مـاڵی حـەڵاڵو، پەیداکردنیشی هـەر لـەو ڕێیـەوە هـەروەها وەلانـانی بێکـاریو بێئیـشیو، خۆپاراسـتن لـەوەی کاتەکانی لە شتی پڕوپوچدا بەهەدەر بدرێن.

فـەرمو ئـەوە (ئـیبن عـەوف)ە دەڵـێ: ڕێگـای بـازارم نیـشاندەن: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ... هەرگا لە نوێژێ بونەوە، بە هەردێدا بڵاو ببنو بۆ چاکەی خودا بکۆشنو گەلێك یادی خودا بکەن، شایەتا ڕزگاریتان بێ. ﴿١٠﴾ الجمعة ﴾.

## سـەنگی تـۆ لە خووڕەوشـتو بـاوەڕت دایـە

(جولەیبیب) بە هەژاریو نەداری ژیانی بەسەر برد، بەرگو پۆشاکی ڕزیوو دادڕاو بـو، برسـیو بـێ نـانو پێخـواس بـو، سـاماندارو خـاوەن تـیرەو هـۆز نـەبو، کەلوپـەلی ناوماڵو خانوێك نەبو تێیدا وەحەسێ، دو دەستەکانی جامی ئاو پێ خواردنەوە بـون لە کانیاوو سەراوی گشتی ئـاوی پـێ دەخواردنـەوە، لـەناو مزگـەوتا دەخـەوتو، قۆڵی سەرینی ژێر سەر بو، دۆشەکی قومو چەگڵ بو، بەڵام سەرمایەی یادی پەروەردیاریو خوێندنی کتێبی خوا بو، لە جەنگو جیهادو نوێژدا لە ڕیزی یەکەم دابو، ڕۆژێکیـان بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی ئـەویش بـەناوی خـۆی بـانگی کـردو فـەرموی: ئەی جولەیبیب ژن ناهێنی؟

ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، جا کێ ژنم دەداتێ؟ نە پلەو پایەو نە ماڵو سامان؟، جارێکی تریشی بە لادا تێپەڕی، هەروەکو جاری پێشو پێی فەرمو، ئەویش هەر وەڵامی گۆڕینی دایەوە، بۆ جاری سێیەم بەلایدا ڕۆیشت، پرسیارەکەی لێ کردەوە، ئەویش وەڵامی ڕابردوی دایەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ((یا جلیبیب انطلق الی بیت فلان الأنصاري و قل لە: رسول الله ﷺ یقرئك السلام، ویطلب منك ان تزوجني بنتك... ئەی (جەلەیبیب) بچۆ ماڵی فلانە کەسی (ئەنصاری)و پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سڵاوت لێدەکاو، داوات لێدەکا کچەکەتم لێ مارە بکەی)).

ئەو پیاوە (ئەنساری)یە لە بنەماڵەو خانەوادەیەکی ڕێزدارو ناوادر بو، ئەوسا (جولەیبیب) هەستاو بەرەو ئەو ماڵە (ئەنصاری)یە بەڕێ کەوتو لە دەرگایداو، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاسپارد بو پێی ڕاگەیاند.

(ئەنصاری)یەکە گوتی: سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا بێ، باشە چۆن کچی خۆمت لێ مارە بکەم ئەی (جولەیبیب) کەچی نە ماڵت هەیەو نە پلەو پایە؟ خێزانەکەی گوێی لەو هەواڵە بو، سەری سوڕماو پرسی: (جولەیبیب)! نەدارایی‌و پلەو پایە؟ کچە بڕوادارەکەش گوێ قوڵاخی وتەی (جولەیبیب)و پەیامی پێغەمبەری خوا ﷺ بو بە دایك‌و باوکی وت: دەتانەوێ داخوازی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتکەنەوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی لەدەستە شتی وا نابێ.

ئەوسا لەسەر بنچینەیێکی پیرۆز مارەکراو هاوسەرایەتی‌و وەچەیەکی پڕ پیت‌و فەڕ، ماڵێکی ئاوەدان، لەسەر بنەڕەتی ڕەزامەندی‌و خواپەرستی بنیات نرا، بانگی (جیهاد) ڕاهێشتراو، (جولەیبیب) ئامادەی جەنگ بو، حەوت کەسی لە بێباوەڕان کوشت‌و، دوای ئەوە لە ڕێگای خوادا شەهید کرا، بە ڕەزامەندی لە خوای خۆی‌و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە ڕەزامەندی لەو بیروباوەڕەی خۆی لەپێناودا کردە قوربانی، سەری نایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای کوژراوەکاندا دەگەڕاو، ناوی کوژراوەکانیان بۆ هەڵدەدا، (جولەیبیب)یشیان لەبیر نەبو، چونکە کەسێکی ناودارو دیار نەبو، ناوی لەناو ناوان نەبو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو ئەو قەڵەباڵغیەدا

لەبیری ناکاو ناوی ئەوی هەر لەیادەو لێی دەپێچێتەوەو دەفەرموێ: ((ولكنني افقد جليبيباً... بەڵام من (جولەیبیب)م بزر کردوە)).

دەیبینێتەوە لەناو تۆزو خۆڵدا گەوزیوە، تۆزی سەر ڕوی دەتەکێنێ‌و پێی دەفەرموێ: ((قتلتَ سبعةً ثم قُتِلتَ؟ أنت مني وأنا منك، أنت مني وأنا منك، أنت مني وأنا منك... تۆ حەوت گاورت کوشتوەو دوای ئەوە کوژراوی؟ تۆ لە منی‌و منیش لە تۆم، تۆ لە منی‌و منیش لە تۆم، تۆ لە منی‌و منیش لە تۆم)).

(جولەیبیب) ئەوەندە بەهرەو بەخشش‌و خەڵاتەی بەس بو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو مەدالیاو دروشمەی پێ خەڵات کرد.

نرخ‌و بەهای (جولەیبیب) لە بڕواو ئەو پەیامەدا وەدی دەکرا کە خۆی لەپێناودا کردە قوربانی، لەوەدا بو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەویست.

هەژاری‌و نەداری‌و بێ کەس‌وکاری نەبونە بەربەستی ئەو شان‌و شەوکەت‌و دەستکەوتە بێ‌وێنەیەی، قەبوڵ بون‌و ڕەزامەندی، بەختەوەری‌و شەهیدی لە دنیاو لە دواڕۆژدا بون بە سەرمایەی: ﴿ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ... دڵیان خۆشە بەو چاکەیە، کە خودا دەربارەی کردون، شادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتونە ئەمان بەجێ ماون، هیچ ترسێکیان لەسەر نابێ‌و هیچ خەمێکیان لەبەر نابێ. (١٧٠) آل عمران ﴾.

بێگومان ڕێزی تۆ لە خووڕەوشتە باڵاکان‌و داب‌و نەریتە ناوازەکانتدا وەدی دەکرێ. کامەرانی تۆ لە بایەخ پێدان‌و ئاستی زانیاری‌و پایەداریدا دەبینرێ.

ڕۆژێ لە ڕۆژان بێ پارەو پوڵی‌و بێ ناودەنگی، نەبونە لەمپەری سەر ڕێی پێهەڵچون‌و گەورە بون‌و، پێ گەیشتن‌و سەربەرزی.

ئەوسا خۆشی لەوانەی سەنگ‌و بەهای خۆیان پێ دەزانن، خۆشی لەوانەی بە هەوڵ‌و تێکۆشان‌و مەردایەتیان، لە دو ژیاندا ئاسودە بون، دو کەڕەتان سەرفراز بون، لە دنیاو لە دواڕۆژدا.

## ئەوانە چەند ئاسودە بون

(ئەبوبەکر) - خوای لێ ڕازی بێت- بەو ئایەتە: ﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ... هەر کێش پارێزگارترینە، لێی دور دەبێ. ئەوی مالی خۆی دەبەخشێ، هەتاوەکو پاك بێتەوە. ﴿١٨﴾ الليل﴾.

(عومەر) - خوای لێ ڕازی بێت - بەو فەرمودەیە: ((**رایت قصراً ابیض فـي الجنـة، قلـت: لـمن هذا القصر؟ قیـل لي: لعمـر بن الـخطاب**... لە بەهەشتدا کۆشکێکی سپیم بینی، وتم: ئەو کۆشکە ئی کێیە؟ پێیان گوتم: هی (عومەر)ی کوڕی (خەتاب) بە)).

(عوسمان) - خوای لێ ڕازی بێت - بەو نزایە: ((**اللّهم اغفـر لعثمـان ما تقـدم من ذنبه وما تـأخـر**... خوایە لە گوناهی ڕابردو داهاتووی (عوسمان) خۆش بە)).

(عەلی) -خوای لێ ڕازی بێت- بەو فەرمودەیە: ((**رجل یـحب الله ورسوله، ویـحبـه الله و رسـوله**... پیاوێکە خـواو پێغەمبـەری خـوای خۆشـدەوێ، خـواو پێغەمبـەری خواش ئەویان خۆشدەوێ)).

(سەعد)ی کوڕی (موعاز) - خوای لـێ ڕازی بێـت-: بـەو قـەدرو ڕێـزە: ((**أهتـز لـه عرش الرحـمن**... عەرشی خوا لەبەر مەرگی ئەو لەرزی)).

(عبدالله)ی کوڕی (عەمر)ی (ئەنساری) - خوای لێ ڕازی بێت -: بەو شانو شکۆیە: ((**کـلَّمَـهُ الله کفـاحـاً بلا ترجـمان**... بـێ گواسـتنەوە ڕاسـتەوخۆ خـوا قـسەی لەگـەڵ کرد)).

(حەنزەلە) - خوای لێ ڕازی بێت -: بەو سەربڵندیە: ((**غـسـلته ملئکـة الـرحمن**... فریشتەکانی خوای میهرەبان شوشتیان)).

## ئەوانەش چەند چارەڕەش بون

خوای گەورە دەربارەی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ ... هەموسپێدەو ئێواران دەیانبەنە سەر ئاور. ﴿٤٦﴾ غافر ﴾.

لەمەڕ قارون: ﴿ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ ... سا قارونمان بەماڵیەوە ڕۆ برد بە ناخی زەمیندا. ﴿٨١﴾ القصص ﴾.

دەربارەی (وەلید)ی کوڕی (موغەیرە): ﴿ سَأُرۡهِقُهُۥ صَعُودًا ... توشی ئازارێ وای دەکەم، پێی هەڵبچێ. ﴿١٧﴾ المدثر ﴾.

سەبارەت بە (ئومەییە)ی کوڕی (خەلەف) ﴿ وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ... هاوارە لەهەر کەسێکی بە تەشەری خوسپ کەرە. ﴿١﴾ الهمزة ﴾.

لەمەڕ (ئەبو لەهەب): ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ... ئەبو لەهەب هەردو دەستی شەل بێو عەمری نەمێنێ. ﴿١﴾ المسد ﴾.

دەربارەی (عباسی) کوڕی (وائیل): ﴿ كَلَّاۚ سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ... نەخێر هەرچی ئەو دەیڵێ ئێمە دەینوسینو ماوەی جەزرەبەدانی پتر دەکەین. ﴿٧٩﴾ مریم ﴾.

## سەرنجێک

چۆن کشتوکاڵ بەرهەمی ئاوەو، سوتانیش شوێنەواری ئاگرە، ئەو دیاردانەش بەرهەمی گوناهو بێئاگایین لە یادی خوا، وەکو: تێک چونی بیرو، کەم بوار بۆ ڕەخسان، دڵ لەدەست دەرچونو ڕاستی ون کردن، لەبیرچونەوەو کات بەفیڕۆدانو پشت تێکردنی خەڵکان، نەبونی پەیوەندی لە نێوانی بەندەو پەروەردیاریو، گیرا

نەبونی نزا، دڵ ڕەقیو نەمانی پیتو فەڕ لە ڕۆزیو لە تەمەنـدا، بێبەش بـون لـە زانستو پۆشینی بەرگی زەبونی، سوکایەتی پێکردنی دوژمنانو سینە تەنگی، کات لە دەست چونو دڵ تێکچونو گرفتار بون بە سای هاوڕێی ناپـاك، هەمیـشە خـەمباریو ژیان تاڵیو بێ حاڵی.

پێچەوانەی ئەوانەش بەرهەمو هاتی خوا پەرستین".

(بـەڵام کاریگـەری داوای لێخۆشـبون، لەسـەر ڕەواندنـەوەی خەفـەتو دڵپەسـتیو پەرێشانی، تێگەیشتوانی هەمو گەلێكو خاوەنی ئایینەکان دەرکیان پێکردوە، بێگومان گوناهو تاوانیش خەمو خەمینیو ترسو لەرزیو سینەتەنگیو نەخۆشیەکانی دەرونی فەراهەم دێنن، هەتا ئەگەر بێو ئەو گرفتارانە لە گوناهیش بێـزار بـنو کوڵی دڵیـان برێژن، لە پێناوی وەدەرنانی خـەمو خەفـەت لـەناو دڵیـانو ڕەواندنـەوەی پـەژارەیان جارێکی تر پەنا بۆ گونـاه دەبـەن، جـا ئەگـەر بـێو گونـاهو تـاوان ئـەو کاریگەریـەی بەسەر دڵەوە هەبێ، هیچ دەرمانێ تیماری ناکا مەگەر تۆبەو پەشیمانی نەبێ).

لەگەڵ شوشان نەرم وەجولێن ﴿... وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ... بە تەرزێکی جـوانو ڕەوا لەگەڵ (ژنان) بجولێنەوە. (١٩) النساء﴾.

﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ... خۆشەویـستیو ئـەوینی خـستۆتە نێوانتـان. (٢١) الروم﴾.

لە فەرمودەشـا هـاتوە: ((خیـرکم خیـرکم لأهلـه، وانا خیـرکم لأهلـي... چـاترینتان ئەو کەسەیە بۆ ماڵو خێزانی چاتر بێ، منیش چاترینی ئێوەم بۆ ماڵو خێزانم.

ئەو ماڵەی بە یەکرِیزیو تەبایی ئاوەدانە، لەسەر بنەمای خۆشەویستییێکی پـڕ لـە ڕەزانوێنیو تەقواکاری بنیاتنراوە، هەر ئەو ماڵەیە بەئاسودەیی گۆشکراوە: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ... ئـاخۆ کەسـێ کـە بنـەڕەتی مزگەوتەکـەی خـۆی لەسـەر هەسـتی خواپەرسـتیو ڕەزای خـودا دارشـتبێ هێزاترە، یان ئەو کەسەی، کە بناغەی مزگەوتەکەی لەسەر لێواری کەنـداڵی فشەڵو

ڕوخەك داناوەو دەگەڵ ئەودا دەكەوێتە ناو ئاگرو كڵپەی دۆژەهـ؟ خودا دەستەی ستەمكاران شارەزای ڕاستەڕێ ناكا. ﴿(١٠٩) التوبة﴾.

## زەردەخـەنەیـەك لە سـەرەتـاوە

زەردەخەنەو خەندە لێوی ژنو مێرد بە ڕوی یەكتردا هێمای ڕوخساری گەشاوەو، ڕوبە ڕو بونەوەیەكی درەوشاوەن، ئەو زەردەخەنەیە پێش چاو خستنێكی سەرەتاییە بۆ تەبایی‌و پێكەوە ژیان: ((وتبسمك في وجه اخيك صدقة... گرژانەوەت لە ڕوی براكەتدا چاكەیە. پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر ڕوخۆش‌و بەخەندە بو.

لە سەرەتاوە سڵاوكردن: ﴿... فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ... سڵامی یەكتری بكەن، سڵامێكی پاك‌و پیرۆز لەلای خواوە. (٦١) النور﴾.

ئا بەم جۆرە خودا نیشانەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕون دەكاتەوە، شایەتا ئێوە تێبگەن.
سڵاو وەرگرتنەوەش لە یەكێ لە هەردوكیان بۆ ئەوی تریان: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ... هەر كەسێكی چاك‌و خۆشیتان لێدەكا ئێوە چاك‌و خۆشی دەگەڵ بكەن، یان وەكو ئەو وەرامی بدەنەوە. (٨٦) النساء﴾.

یەكێ تر لەو هێمایانە نزاو پاڕانەوەیە بەر لە چونەوەی ماڵ: ((اللّهم إني اسألك خير المولج وخير المخرج، باسم الله ولجنا، وباسم الله خرجنا، وعلى الله ربنا توكلنا... پەروەردگارا من داوای خێرو چاكەی هاتنەوە ژورو، بە دەركەوتنت لێدەكەم، بە ناوی خوا وەژور كەوتینەوەو، بە ناوی خواش وەدەركەوتین، پشتیشمان هەر بە خوای پەروەردیارمانەوە بەست.

قسە نەرمیش لەلایەن ژنو مێردەوە: هۆكاری ئاسودەیی نێو ماڵە: ﴿وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ... تۆ بە عەبدانی من بێژە: چی باشترە ئەوە بێژن. (٥٣) الإسراء﴾.

خۆزگە هەر کام لە ژن‌و مێرد، دەستیان لە وتەی نابەجێ‌و، هەست وروژێن‌و [٨٤٣]، دڵ شکێن هەڵدەگرت، خۆزگە هەر کامیان ڕوی جوانی کردەوەکانیان لە یەکتردا ڕەچاو دەکرد، هەریەکەیان چاویان لە ئاستی کەموکوڕی شیاوی مرۆڤ دادەخست.

بێگومان ئەگەر مرۆڤ کردە جوانەکانی هاوسەری خۆی لەبەرچاو گرت‌و، لە کەموکوڕی چاوپۆشی کرد، دەحەسێتەوەو دەسرەوێ، لە فەرمودەشدا هاتوە: ((**لا يفرك مؤمن مؤمنة، ان كره منها خلقا رضي منها آخر**... با هیچ بڕوادارێکی پیاو ڕق‌و کینە بەرامبەر هاوسەرە بڕوادارەکەی دانەگرێ، ئەگەر هەڵسوکەوتێکیشی بە ناشیرین بێتە بەرچاو لە یەکێکی تری قایل دەبێ [٨٤٤].

کێ هەیە فریشتە ئاسا بێ هەڵە بێ‌و، ڕوخساری چاکەکاری بێ پەڵە بێ: ﴿... وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ... ئەگەر چاکەو بەزەیی خوداو لەسەر نەبا، هیچ کەسێکتان هەرگیز پاك نەدەبونەوە. ﴿٢١﴾ النور﴾.

زۆربەی کێشەی ناوماڵ لە دەرئەنجامی سوێ بونەوەو تاوتوێکردنی مەسەلەیەکی نەشیاو بێ بایەخە، بە دەیان کێشەی وامزانیوە کە سەرەنجامەکەی دەست لێك بەردان بو، هەڵگیرسانی ئەو تروسکە ئاگرەش هۆکارەکەی بۆ چەند گیروگرفتێك دەگەڕێتەوە کە شیاوی باس نیە، یەکێ لە هۆکارەکان ئەوەیە: ناوماڵ شڕو شەپڕێوە، خواردن ئامادە نیە لە جێوە، لەلایەن کەسانێکی ترەوە هۆکاری ئەوەیە، ژن بە مێردەکەی دەڵێ مێوانان زۆر دێنیەوە، لیستێك لەوانە وەخوێنەوە، کە چەندین منالی بێ دایك‌و خەم‌و ناسۆری نێو ماڵی لێکەوتەوە.

ئێمە لەسەرمان پێویستە دان بە بارو گوزەران‌و کەموکوڕی خۆمان دابنێین‌و، لامان وانەبێ لەو ژیانە خەیاڵی‌و بێ وێنەیەدا بەسەر دەبەین کە تەنیا بۆ چەند تاکێکی ورە بەرزو خۆ ڕاگر ڕەخساوە لەو جیهانەدا.

---

٨٤٣) زامدار کەر.

٨٤٤) دوای ئەو فەرمودەیە پەڕستەیێك لە کتێبەکەدایە، کە مانای (یفرك... لێك دەداتە بەڵام من ئەو ڕستەیەم وەرنەگێڕاوە، چونکە لە ناوەڕۆکی مانا کردنی فەرمودەکەدا هەیە.

ئێمە مرۆڤین تووڕە دەبین و ڕق هەڵدەگرین، کەم و کورتیمان دەبێ و هەڵە دەکەین، ئێمە هەر ئەوەندەمان لە بارەدایە لەو چەند ساڵە کورتەی تەمەنماندا چەند خاڵێکی هاوبەندی لەگەڵ هاوسەرەکاندا ڕەچاوکەین تاوەکو بە ئاشتی بژین.

لە ڕاستیدا دڵ فراوانی و خۆشگوزەرانی (ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل) لەو وتەیەدا وەدی دەکرێ، کە لە دوای کۆچی (دایکی عبدالله)ی هاوسەری دەڵێ: چل ساڵ بە یەکەوە ژیایین، لە یەك وشەدا ناکۆکیم لەگەڵیدا وەدی نەکرد.

پێویستە لەسەر پیاو ئەگەر ژنەکەی تووڕە بوو ئەو بێدەنگ بێ، لەسەر ژنیش پێویستە ئەگەر پیاوەکەی تووڕە بێ ئەو لێی بێدەنگ بێ، هەتا تین و تەوژمی ڕق و کینە دەڕەوێتەوەو، هەست و نەست سارددەبێتەوەو، ئەو هەڵچوونە دەروونیە هێور دەبێتەوە.

(ئیبن جەوزی) لە (صید الخاطر)دا دەڵێ: کاتێ بینیت هاوەڵەکەت ڕقی هەڵساو دەستی بە قسەی نابەجێ کرد، پێویست ناکا قسەکانی بە پەنجان بژمێری (واتا بایەخی پێ مەدەو ڕوی بۆ لامەکەوە) لێشی بە هەند هەڵمەگرە، چونکێ وەکو کەسێکی سەرمەست وایەو نازانێ چ ڕو ئەدا، بەڵکە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێ ئارام بگرەو، دەنگی بەسەردا هەڵمەبڕە، لەبەرئەوەی شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ و، دەروونی هەڵدەچێ و، هەست و ژیری لەدەست دەچێ، هەر کاتێکیش لە بەرابەری ئەودا دانت بەخۆتدا گرت، بە خودی ئەو هەڵوێستە دەمی دەبەستی و، وەکو ئەو کەسە ژیر و وریایە دەبی بەرەو ڕوی شتێك دەوەستێ، یاوەکو ئەو کەسە بە ئاگایە دەبی سەرزەنشتی بێ هۆشێك دەکا، با ئەتۆ بە تاوانبار لەقەڵەم بدرێی، بەڵام بە چاوی سۆزەوە لێی بڕوانە، بزانە قەدەری خوا چۆن دەبێ و، لێی گەڕێ با لەنێو گێژاوی دەروونی خۆیدا بخولێتەوە.

دڵنیا بە کاتێ بەئاگاهاتەوە لە تاوی ئەوەی ڕویداوە پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ و، قەدر و ڕێزی ئارامگری تۆ دەزانێ، بەلای کەمیەوە تۆ ئەو کەسە لەو کارە ڕزگار دەکەی، کە دەیەویست لە کاتی تووڕەییدا ئەنجامی بدا بۆ ئەوە دەستی دەگری کە پێی دەحەسێتەوە.

پێویستە منداڵ لەکاتی تورەیی باوکیداو، ژن لە کاتی تورەیی مێردەکەیدا ئەو هەڵوێستە بنوێنێ، بواری پێ بدا هەرچی دەیلێ بیلێ‌و کوڵی دڵی دامرکێنێ‌و، بەهۆی ئەوە لە پرمەی گریان نەدا، ماوەیەکی پێدەچێ پەشیمانی دەردەبڕێ‌و داوای لێبوردن دەکا، هەر کاتێکیش لەسەر ئەو گوتارو هەڵوێستە بەربەرەکانی لەگەڵدا کرا ئەوا دوژمنایەتیەکە پتەو دەبێ‌و، لەو کاتەش، کە بەئاگاهاتەوە بەرپەرچی هەر هەڵوێستێك دەداتەوە، کە لە کاتی بێ ئاگاییدا لە ئاستیدا ئەنجام دراوە.

زۆربەی خەڵکانیش بە پێچەوانەی ئەو ڕێڕەوە کاردەکەن، هەر گاهێ بینیان بەرامبەریان تورەیە، ئەوانیش بە گوێرەی کردارو گوفتاری مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، ئەوەشیان پێچەوانەی دانایی‌و ژیریە، بەڵکە ئەوەی ژیری دەیسەلمێنێ هەر ئەوەبو کە گوتم، تەنیا کەسانی ژیرو داناش بە گوێیان دادەچێ.

حەز لە تۆڵە کردنەوە ژارێکی کوشندەیە لە دەرونی کەسی هەڵچودا

لە کتێبی (المصلوبون في التأريخ)دا سەرگوزەشتەو داستان گەلێکی کەسانی زۆرداری تیایە ئەوانەی نەیارانی خۆیان بە پەندبردن‌و دوچاری ئەوپەڕی ئەشکەنجەو ئازاریان کردن، لەگەڵ ئەوەشدا، کە کوشتنیان کڵپەی ڕق‌و کینەیان دانەمرکاو، دەردی دڵیان تیمار نەبو، هەتا بەسەر درەختەکاندا هەڵیان واسین، سەیر لەوەدایە کەسی هەڵواسراو دوای کوژرانی هەست بە ئێش‌و ژان ناکاو ئازار ناچێژێ، چونکێ گیانی لە لاشە جیابۆتەوە، بەڵام کوژیاری گیان لەبەر بەو هەڵواسینەی دڵی دەسرەوێ‌و ئاسودەو ئارام دەبێ. لە ڕاستیدا ئەوانەی لە داخی دوژمن‌و ناحەزانیاندا لێوی خۆیان دەگەزن‌و دڵیان گڕی گرتوە، تا هەتایە حەساوەو ئاسودە نابن، چونکو بڵێسەو گڕی تۆڵەسەندنەوە بەر لە نەیارانیان ئەوانیان هەڵکڕو زاندوە [٨٤٥].

لە هەموی سەیرتر ئەوەیە هەندێ لە خەلیفەکانی (بەنی عەباس)ی دەرفەتیان بۆ نەڕەخسا دوژمنەکانیان لە (بەنی ئومەییە) بکوژن، لەبەرئەوەی بەر لەوەی بگەنە دەسەڵات دوژمنەکانیان مردبون، ئەگەر چی هەندێکیان هەر هێسکیان مابون، بەڵام لە گۆڕەکانیان دەرهێنان‌و شلاقەیان لێدان، دوای ئەوە هەڵیان واسین‌و، دوای هەڵواسینیش گڕیان دان.

---

٨٤٥) سوتاندوە.

ئەوەیە تین‌و تەوژمی ئەو ڕق‌و کینەیەی خۆشی‌و شادی دڵان‌و ئاسودەیی‌و ئارامیـان بنبـڕ دەکا.

بێگومان کەسی تۆڵە ستێن پتر زیان بـارە، چـونکێ هـێمنی‌و ئـارامی‌و هـەداری خـۆی لەدەست داوە.

﴿... وَإِذَا خَلَوْا۟ عَضُّوا۟ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ...هەر وەختێکیش لێوجیابونەوە -لە کینەیێ کە هەیانە- سەر پەنجەی خۆیان دەگەزن. (١١٩) آل عمران﴾.

## تێـرامانـێـك

(کاتێ بەندە دوژمن بەسەریدا زاڵ بو چەوسایەوەو ئازار درا، هیچ شتێ ئەوەندەی تۆبەیەکی یەکجارەکی دادی نادا، نیشانەی بەختەوەریش لەوەدایە ئەو بیروبۆچونەی لە دڵی دایە پێچەوانەی کاتەوەو لە دژی هەوەس‌و هەڵەو تاوانی خۆی وەکاریخا، بـە چـاك سـازی دەرونـی خۆیـو پەشـیمانی لـە تـاوانی خـۆی سـەرقاڵ کـا، ئینجـا ئـەو دەرفەتـەی نابـێ بـیر لـەو بەڵایـە بکاتـەوە بەسـەری هاتوە، بەڵکـە هـەر بـەوە ڕادەگـا هەڵەکانی پـڕ کاتـەوەو نێـوانی خـۆی‌و خـوای ڕێکخاتـەوە، گومانیـشی تێـدا نیـە خـوا سەرپەرشـتی سەرخـستن‌و پاراسـتنی دەکـاو بەرگریـشی لێـدەکا، بەختـەوەری ئـەو لەدەست هیچ بەندەیەك دا نیەو، هیچ بەڵاو کوستێك چۆکی پێ دانەداو، خوداش لـە بەرژەوەنـدی بەنـدەی خـۆی چـاکتر نازانـێ، بـەڵکو ئاسـانکاری‌و ڕێنمـایی لەدەسـتی خوایـە، هەرچـی ئـەو بیبەخـشێ کـەس ناتوانـێ ڕێـی پـێ بگـرێ‌و، ئـەوەی ئـەویش بیگرێتەوە کەس ناتوانێ بیبەخشێ، ئەو بوارە بۆ کەس ناڕەخسێ، کەسیش ژێری پێ ناشکێ‌و، بە ویستی هیچ کەسێ نیەو، کەس توانای بەسـەردانیە، هێـزو توانـاش هـەر ئی خوایـە.

## لە کەسایەتی کەسێکی تردا نە توێیتەوە

سێ قۆناخ بەسەر مرۆڤدا تێدەپەڕن: قۆناخی چاولێکەری، قۆناخی هەڵبژاردن، قۆناخی داهێنان.

ئەوسا چاولێکەری: لاساکردنەوەی خەڵکانی ترەو خۆپۆشتەکردنە بە کەسایەتی ئەوان، هەڵگرتنی خوونەریتیان‌و خۆ تاواندنەوەیە لە قاوخی[846] وان، هۆی ئەو چاولێکەریەش بە گەورە هاتنە بەرچاوو زۆر بەدڵدا چون‌و پابەند بونە، ئەو بەرز نرخاندنە وا لە هەندێ کەس دەکا لە هەمو جموجۆڵێکدا، لە دەنگ‌و ئاوازو ئاوڕدانەوەداو، وێنەی ئەوانەش لاساکار بێ، ئەو دەمە لاسکەییە[847] زیندە بەچاڵکردنی کەسایەتی‌و بنبڕکردنێکی پەنهانیە بۆ خۆشیەکان.

ئای لە ژین‌و ژاری ئاوانەی بەدەستی خۆیانەوە دوچارن، ڕوی خۆیان وەردەگێڕن‌و بەرەو دواوە گوزەر دەکەن!!

یەکێ لەوان ئاوازێکی هەڵگرتوەو ئاوازی خۆی وازهێناوە، بە ڕۆیشتنی کەسێکی تر دەڕواو ڕۆیشتنی خۆی فڕێ داوە، خۆزگە ئەو لاساکاریە بۆ ئەو خوڕەوشتە بەرزانە دەبو کە تەمەنی درێژ دەکەن‌و خەرمانەی ڕێزو شکۆ هەڵدەچنن، وەکو زانست‌و بەخشندەیی‌و نەرم‌ونیانی‌و وێنەی ئەمانەش، بەڵام لەناکاوێ ئەوانەت بەرچاو دەکەوێ لە دەربڕینی پیتەکان‌و شێوەی وتاردان‌و جوڵانەوەی دەستەکان لاساکاری دەکەن!!

حەز دەکەم چەند وتەیەکی ڕابردوت بۆ دوپات کەمەوە: تۆ جیا لە خەڵك وەدیهێنراوی‌و لە شێوەیەکی تایبەتیدا ڕەخساوی، ڕێ‌و شوێنی تۆ لە خوو نەریت‌و تواناکانتدا وەدی دەکرێ، دڵنیا بە لەو کاتەی خوا ئادەمی وەدیهێناوەو تا ئەو کاتەش کۆتایی بە ژیان دێنێ، دو کەس لە ڕوخسارو لاشەدا یەك نین، بە جۆرێك ئەمەیان لەگەڵ ئەودا لە شێوەدا پێك هەڵپێك بن: ﴿وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡ ... (لە نیشانەکانی خوایە): وێك نەچونی زمانی پێ ئاخافتن‌و ڕەنگ‌و ڕوتان. ﴿٢٢﴾ الروم﴾.

کەوایە بۆ ئێمە لەگەڵ خەڵکی تردا لە شێوەو تواناو بەهرەدا یەك بین؟!

---

٨٤٦) قالك/ قاوغ.

٨٤٧) لاساکاری.

لەڕاستیدا دەنگ خۆشی تۆ لەوەدایە تەنیا دەنگ بێ، جوان دەربڕینی تۆ لەوەدایە جیاواز بێ: ﴿... وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ... لە کێوانیش ڕێگەو بانی سپیو سوری جۆراو جۆری بە ڕەنگ جیای وەدی نەهێنان؟ قەلی وەك قەلەڕەشەشیان تێدا هەیە. (٢٧) فاطر﴾.

## دڵ گوشـراوان چـاوەڕێی میهـری خـودان

وتاربێژێك زمانی ئەوەندە پاراو بو لە کاتی پێشبڕکێی پەیڤو دەستەواژەدا لە گۆڕەپانی ڕەوانبێژیدا زمانی لەنگەی نەدەکرد، بەڵکە بە ڕۆنو ڕەوانی وشەی لە دەمدا هەڵدەقوڵی.

ئەو تەنیا وتاربێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بو وتاربێژی ئیسلام بو هیچی تر. لە پێناوی بەرز ڕاگرتنی دین لەبەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنگی بە وتار هەڵدەبڕی، ئەو وتاربێژە (سابت) ی کوڕی (قەیس)ی کوڕی (شەمماس) بو، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند:﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ... ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! ناشێ دەنگتان سەر دەنگی پێغەمبەر کەوێ، دەنگیش هێند بەرز مەکەن، وەك لەگەڵ یەکترا داخێون، کە کارتان لێ پوچەڵ ببێو خۆتان بە خۆتان نەزانن. (٢) الحجرات﴾.

(سابیت) لای وابو دەربارەی وی دابەزیوە، خۆی لە خەڵکی جیاکردەوەو لە ماڵی خۆی پەناداو دەگریا، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بەدوادا گێڕاو لەبارەوەی پرسی، هاوەڵان هەواڵی ئەویان پێڕاگەیاند، ئەویش فەرموی: ((کلا بل هو من اهل الجنة... نەخێر بەڵکو لە بەهەشتیانە)). ترسو لەرزی لێبو بە مزگێنی.

(عائیشە)ی دایکی بڕواداران - خوای لێ ڕازی بێت - سەبارەت بەوەی تانەو تەشەر لە ئابڕو شکۆی پاكو پیرۆزی درا، یەك مانگی ڕەبەق بە شەووڕۆژ هەر دەگریا، هەتا نزیك بو گریان جەرگی دابڕدابڕ بکاو جەستەی پارچە بکا، خوا دەروی خێری

لەوەپودا کـردەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ... ئەو کەسانەی بۆ ژنانی باوەڕداری داوێن پاکی دورە ئاگا (سەربەخۆ) بوختان رێك دەخەن، لە دنیاش‌و لە سەلاشا، بەر نەحلەتن، جەزرەبەشیان زۆر دژوارە. ﴿٢٣﴾ النور﴾.

سوپاس‌و ستایشی خوای کردو لە جاری پێشو پاکتر دەرچو، بڕوادارانیش بەو سەرکەوتنە ئاشکرایە دڵیان شاد بو.

ئەو سێ هاوەڵەش، کە لە شەڕی (تەبوك) دواکەوتن، زەوی فراوانیان لێ وێکهاتەوەو، دڵو ناخیان لێ تەنگ بو، زانیان هیچ پەنا گەیەکیان نیە جگە لە خوا، لەلایەن خوای خاوەن پەنا - پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو- پەنادران‌و لەلایەن خوای بیسەرو فریادڕەس کۆمەکیان بەسەردا ڕژا.

## بە کام کردەوە ئاسودەی دەستی پێوە بگرە

(ئیبن تەیمیە) دەڵێ: دوچاری نەخۆشێك بوم، دکتۆر پێی وتم: خوێندنەوەو گفت‌و گۆت دەربارەی زانست نەخۆشیەکەت پتر دەکا.

منیش پێم وت: ناتوانم لەسەر ئەوە ئارام بگرم، بەڵام من ئەو زانستەی تۆ دەکەمە دادوەر، ئایە ئەگەر دەرون ئاسودە بێ‌و بسرەوێ سروشت‌و خو بەهێز نابێ‌و نەخۆشی ناڕەوێنێ؟

گوتی: بەڵێ.

پێم گوت: بەم شێوەیە دەرونی منیش بە سای زانست دەسرەوێ، هەست‌و سروشتم پێی بەهێز دەبێ‌و، هەست بە حەسانەوە دەکەم.

ئەویش گوتی: ئەو ڕێگا چارەیە لەگەڵ چارەسەری ئێمە یەك ناگرنەوە.

﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ ...پێتان وا نەبێ بۆ ئێوە خراپ دەبێ، بەڵکو قازانجە بۆ ئێوە. ﴿١١﴾ النور﴾ .

## هەریەك لەم دو دەستەیە بەشی خۆیان وەردەگرن

چەندە ئاتاجین بەوەی کۆڵ نەدەین‌و کات‌و ساتمان بەرهەم بێنین، لە کاری چاك‌و بەرهەمدارو سودگەیێن پشو درێژ بین، ئێمە ئەو رۆژە هەست بە ئاسودەیی دەکەین، کە قازانج‌و خزمەتێك، تێگەیاندن‌و وشیارکردنەوەو، پێشکەوتنێك، پێشکەش بە خەڵکی بکەین، ئەگەریش تێگەیشتین ئێمە هەروا لە گۆترە چاومان بە ژیان هەڵنەهێناوەو، بە گاڵتەو گەپ وەدی نەهاتوین‌و، نە ڕەخساوین هەست دەکەین حەساوەین.

ڕۆژێك کتێبی (الاعلام)ی (زەرکەلی)یم سەرنجدا ژیننامە گەلێکی سیاسەتمەداران‌و زانایان‌و کاراشناو بوێژان‌و پزیشکانم لە ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاواییەکان وەبەرچاوکەوت‌و، هەمویان کەسانێکی هەڵکەوتەو، کاراو، ڕۆشنا پەخش بون، هەروا یاساو بەڵێنی خوام دەرك پێ کرد لەمەڕ دروستکراوو بەندەکانی، ئەویشیان ئەوەیە، هەر کەسێك لە پێناوی دنیادا هەوڵ‌و گەڕی ببێ هەر لە دنیا بەرهەمی دەدورێتەوە، وەکو ناو دەنگ دەرکردن‌و ناسراوی، وێنەی ئەوانەش وەکو سامانداری‌و پلەو پایەو حاڵ خۆشی، هەرکەسێکیش بۆ دواڕۆژ بێ هەوڵ‌و کۆششی لێرەو لەوێ[٨٤٨] داهاتی[٨٤٩] هەڵدەگرێتەوە، وەکو سود پێ گەیشتن‌و قەبوڵ بون‌و لێ قایل بون‌و بەخشش‌و خەڵات وەرگرتن: ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ... هەمولایان - چ ئەوان‌و چ ئەمانە- لە خەڵاتی پەروەرندەت بێ بەش ناکەین. خەڵاتی پەروەرندەی تۆ هیچ لەمپەری لەبەر نیە. ﴿٢٠﴾ الإسراء ﴾.

بە هەمان شێوە ئەوەشم لەو کتێبەدا هەڵکڕاند[٨٥٠] کە ئەو بەهرەدارانەی بەرهەم‌و سودیان بۆ مرۆڤایەتی پێشکەش کردو بۆ دوا ڕۆژ هیچیان نەکرد -بە تایبەتیش ئەوانەی باوەڕیان بە خواو ڕۆژی سەڵا نەبو- بینیم خەڵکیان پتر بەختەوەر کرد لە خۆیان، گیان‌و ڕۆحی خەڵکیان پتر حەساندەوە لە ئی خۆیان، کەچی هەندێکیشیان

---

٨٤٨) لە دنیاو دوا ڕۆژ.

٨٤٩) پاداشی وەردەگرێتەوە.

٨٥٠) وەدەست هێنا.

خۆیان کوشت، هەیان بو لە ئاهی کارەساتێك هاواری لێ هەڵساو بێزاری لە ژیانی خۆی دەربڕی، کەسانێکی تریشیان بە ژیانێکی کولە مەرگیو سەنگ بە حەساری بەسەریان برد، خۆم لە خۆم پرسی: باشە چ سودی هەیە ئەگەر خەڵکانێك بە سای منەوە بەختەوەر بنو منیش بەدبەخت بم، کۆمەڵێك بەهۆی منەوە بەهرەمەندبنو بۆخۆشم دەست بەتاڵ بم؟!

ئەوەشم دەرك پێ کرد، کە هەریەك لەو ناودارانە چیان ویستوە خوا پێی داون، لەبەرئەوەی بەڵێنی خۆی دێنێتە دی، ئەوسا گروهێکیان خەڵاتی نۆبلی وەدەست هێناوە، چونکە ئەوەی گەرەك بوەو ڕەنجی لە پێناو کێشاوە، هەیان بو ناوودەنگی پەیاکرد، چونکو بەدوایدا وێڵو شەکەت بو، هەیان بو ماڵو سامانی داگرد[٨٥١] چونکی شەیداو ئەوینی بو، هەشیان بو بەندەی ڕاستەقینەی خودا بو، بۆیە ئەگەر خوا یار بێ - بەشیان لە دنیاو دوارۆژیش دابو، ئەوان بە هێڤی[٨٥٢] چاکەو ڕەزامەندی خودا بون.

بێگومان ئەوەی بە کامەرانی داپۆشراوەو، دڵنیاو پشت ئەستورە بە پەیڕەوو بەرنامەی، خۆشبەختو بەر قازانج ترە لەو کەسەی بەرچاوو ناودارەو بە سای بیروباوەڕی بەدبەختو چارەڕەشە، ئەوەش یەکێکە لەو هاوڕێژەو هاوکێشانەی ڕاستو سەلمێنراون.

بێگومان شوانە وێڵەیێکی موسڵمان، کە لە دەشتودەر ئاژەڵداری دەکا، بەهۆی دینەکەی خۆشبەختترە لە (تولوستوی) وردیارو ناودار، سەبارەت بەوەی موسڵمان تەمەنی خۆی بە ئارامیو ئاسودەییو ڕەزامەندی تێپەڕ دەدا، سەرەنجامو پاشەڕۆژی خۆی لێ دیارە، بەڵام کەسی دوەم بە ویستو ئیرادەو هەوڵو کۆششێکی دابڕدا بڕو پڕشوبڵاو ژیانی بەسەر برد، ئەو ویستو مەبەستەی کڵپەی دڵی دانەمرکاندو، پەی بە دەرەنجامی خۆی نەبرد.

گومانیش لەوەدا نیە باوەڕبون بە قەزاو قەدەر، بە سودترین داوودەرمانو گەورەترینی ئەو چارەسەرەیە لەلایەن موسڵمانانەوە، کە مرۆڤایەتی بەدەستی هێنابێو دەرکی پێ کردبێ.

---

٨٥١) کۆ کردەوە.

٨٥٢) بەهیوای.

هەتا هەندێ لەکاراشنایان دەڵێن: هیچ گاورێك لە ژیاندا بەهۆی قەزاو قەدەر ئاسودە نابێ. ئەو مەبەستەشم زۆر بۆ دوبارە کردویەوەو، بە زۆر شێوەو چەشن پێم ڕاگەیاندوی، منیش لەو کردەوەیەم دڵنیاو پشت ئەستورم، چونکێ من لە خۆمەوەو زۆرێکیش لە وێنەی خۆم دەزانم کە ئێمە باوەڕمان بە قەزاو قەدەر هەیە لەوەی پێمان خۆشە، ڕوشمان گرژە سەبارەت بەوەی پێمان ناخۆشە، بۆیە مەرجی موسڵمانەتیو بەڵگەنامەی نیگای خوایە: ((أن تؤمن بالقدر خيره و شرِّه، حلوه و مرِّه)) باوەڕت بە قەزاو قەدەری خێرو شەڕو، تاڵو شیرنی هەبێ.

## هەر کەسێ باوەڕ بە خوا بێنێ ڕێی ڕاستی نیشان ئەدا

من لێرەدا داستانێك دەگێڕمەوە تاوەکو بەختەوەری ئەوانەی بە قەزاو قەدەر ڕازین‌و، سەر شێواوی‌و ژیان تاڵی‌و دو دڵی ئەوانەش، کە لە قەزاو قەدەر ناقایلن ڕۆشنبێتەوە:

فەرمو ئەوە نوسەرێکی ئەمریکی بە ناوی (بودلی) دانەری کتێبی (بایێك لە بیابانەوە)و [853] کتێبی (پێغەمبەر ﷺ)و [854] چواردە کتێبی تریش، کە لە ساڵی ١٩١٨ی ز لە ئەفریقیای باکوری ڕۆژئاوا نیشتەجێ بو، لەوێندەر لەگەڵ کۆمەڵە موسڵمانێکی کۆچەری بیابان نشیندا دەژیا کە نوێژیان دەکردو بەڕۆژو دەبون‌و یادی خودایان دەکرد.

هەندێك لەوەی لەگەڵ ئەواندا چاوی پێکەوتوە دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێکیان گەردەلول‌و ڕەشەبایەکی سەخت هەڵی کردو، لمی بیابانی هەڵگرت‌و لە دەریای سپی ناوەڕاست تێیەڕیداو، دای لە چەم‌و زێی (روم) لە فەڕەنسا، ئەو گەردەلولە گەرمایی ئەوەندە زۆر بو، وام هەست دەکرد چۆن بڵێی موی سەرم لەبەر تەوژمی گەرمی هەڵدەوەرن، هەروەکو بڵێی لەبەر تین‌و تاوی خەریکە بەرەو شێتی بچم، وەلێ عەرەبەکان بە هیچ جۆری بەسەرەخۆیان نەدەهێناو، خۆیان سڵ نەدەکردو دەیانگوت:

---

٨٥٣) رياح على الصحراء.

٨٥٤) الرسول.

قەزاو قەدەرە. بە گورج و گۆڵی ڕویان لە کردار دەکرد، ڕیش سپی هۆزەکە دەیگوت: ئێمە زۆر شت مان لە دەست نەداوە، بۆ ئەوە دروست کراوین هەمو شتێك لەدەست دەین، بەڵام سوپاس و ستایش بۆ خوا، لە سەدا چلی مەڕو ماڵاتەکانمان ماوە، دەتوانین بەو ڕێژەیە سەر لەنوێ دەستبەکار بینەوە.

هەر لەوێ ڕوداوێکی تریشمان بەسەر هات... ڕۆژێکیان بە ئۆتۆمبێل ڕێگای بیابانمان دەبڕی یەکێ لە چوار تایەکانمان تەقی، شوفێرەکەش تا سپێری لەیاد چوبو، توڕەییم بەسەردا هات و خەم و نیگەرانی دایگرتم، پرسیارم لەو هاوڕێیانەم کرد: باشە چارەمان چیە؟ ئامۆژیاریان کردم، کە پەنا بردن بۆ توڕەیی هیچ بە هیچ ناکا، بەڵکە مرۆڤ هەڵدەنێ و بواری بۆ دەڕەخسێنێ، کە دوچاری گێلی و سەرکەشی بکا، چار نەبو ئۆتۆمبێلە کە تەنیا بە سێ تایان وەڕێ کەوت و ئێمەشی وە خۆ هەڵگرت، بەڵام زۆری پێ نەچو بەنزین بڕانیشی هاتە سەرێ و لە ڕێگادا پەکی کەوت، لەو تەنگژەیەدا هیچ کام لە هاوەڵە عەرەبەکانم هەستی نەوروژاو، هێمن و ئارامیان لەدەست نەدا، بەڵکو بە دەم ئاواز و سرودەوە، ڕێگایان گرتەبەر و بەپێ ڕۆیشتن!

ئەو حەوت ساڵەی لە بیابانەدا لەگەڵ عەرەبە کۆچەرییەکان بەسەرم برد، تێیانگەیاندم، کە ئەو دەرون بەزیوو، ڕاڕاو، سەر مەستانەی ئەمریکاو ئەوروپا شانازیان پێوە دەکەن، تەنیا قوربانی ئەو شارەستانیەن، کە لەسەر بنەمای تاڵوکەو پەلەکردن بنیاتنراوە.

من لەو کاتەی لە بیاباندا دەگوزەرێنم، بە هیچ چەشنێ هەست بە هیچ نیگەرانێك ناکەم، بەڵکە لەوێندەر هەست بە دڵارامی و ڕەزامەندی و بەرچاوتێری دەکەم و لە بەهەشتی خوادام، خەڵکانێکی زۆر گاڵتەیان بەو قەدەرە دێ، کە عەرەبەکان باوەڕیان پێیەتی، ملکەچی وان بۆ قەزاو قەدەر بەکەم دەنرخێنن.

بەڵام کێ دەزانێ؟ دەشێ عەرەبەکان ڕاستەقینەیان دەرك پێ کردبێ، من یەك لەبارێ خۆم ئەگەر بە بیرنامەی خۆمدا هەڵچمەوەو ژیانی خۆم بێنمە بەرچاو، بە ڕۆشنی دەبینم ژیانم لە چەند قۆناغێکی جیاجیا پێکهاتوەو بەگوێرەی چەند ڕوداوێك، کە هاتونە ڕێ قۆناغەکان تێپەڕیان داوە، هیچ کاتێکیش پێم وانەبوە یاخود هەر لە توانامدا نەبوە ئەو ڕوداوانە لەسەرەخۆم لادەم، جا عەرەبەکان ناویان لەو

چەشنە ڕوداوانە ناوە: (قدر) یا (قسمة) یاخود (قضـاء الله) تۆش چ ناوێك حەز دەكـەی ئەو ناوەیان لێبنێ.

پوختەی قسان: لەو كاتەی بیابانم جێهێشتوە تا ئێستا حەڤدە ساڵ بەسەرمدا تێپـەڕ بوە، ئێستاكەش لەگـەڵ دابـێ لەمـەڕ قەزاوقـەدەری خـوا ئـەو هەڵوێـستەی عەرەبـەكان دەگرمەبەر، بە ئارامیو لەسەر خۆییو ملكەچانە پێشوازی لـەو ڕوداوانـە دەكـەم، كـە نـاتوانم لەبـەریان ڕاكـەم، ئـەوەی ڕاسـتیش بـێ ئـەو ڕێگـا چارەیەی لـە عەرەبەكانـەوە دەسـتەبەرم كـردوە بـۆ هێوركردنـەوەی هەسـتو نەسـتم لـە هـەزاران داوودەرمـانی هێوركەرەوە بە ئەنجام گەییشتوترە!... هتد.

منیش دەڵێم: عەرەبـە كۆچـەریەكان ئـەو وانـەیان لـە قوتابخانـەی موحەممـەد ﷺ خوێنـدوە، مەبەسـتیش لـە پـەیامی ئـەو پێغەمبـەرەدا ﷺ ڕزگـاركردنو دەرهێنـانی خەڵكـە لـە گـومڕاییو تـاریكی بـەرەو ڕونـاكیو، تەكانـدنی تـۆزی سـەر سـەریانەو، پچڕاندنی كۆتو زنجیری دەستو قاچیانە.

نهـێنی سـەرەوتنو ئاسـودەیی لـەو پەیامەدایـە هـەر ئـەویش دروشمـی ئـازادیو سەرفرازیە، كاركردن بە بەڵگەو دان پێداهێنانە بە قـەزاو قـەدەر، مانـدو بـون لـەپێناو سەرەنجامو، هەوڵو كۆشش بۆ مەرامو، گەیشتن بە ئاكامە.

گومـان لەوەدانیـە، كـە پـەیامی خـوایی بـۆ ئـەوە هـاتوە شـوێنی تـۆ لـەم گەردونـە بەرچاوەدا دیاری بكا، تاوەكو وەت حەسێنێو، ئارامیـت بەسـەر دڵـدا بێنـێو، خـەمانت لـێ هەڵوەرێنێ، كارو كردەوەت لە بێزینگ بداو، خووڕەوشتت بەرز ڕابگرێ، بۆ ئـەوەی ئەو بەندە نمونەیەت لـێ دەرچێ نهێنی پەیدابونی خۆی دەزانێو، مەبەسـت لـە هاتنـە سەر ڕوی دنیای دەرك پێ دەكا.

## بەرنامـەو پەیـام مـام ناوەنجـی یـە

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَـٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا ... بەو شێوەیە ئێمە ئێوەمـان كردۆتـە ئۆمـەتێكی هەڵبژاردە. ﴿١٤٣﴾ البقرة ﴾.

بەختەوەری لە مام ناوەنجێتی دایە، بەم چەشنە کە نـە کەمتەرخـەمی نـە سـنور بەزێنی، نە قرچۆکیو نـە زیـادەڕەوی بنـوێنی، مـام ناوەنـدێتی بنەمایـەکی گونجـاوی خوایی یەو ڕێگا لە بەندە دەگرێ بەولاو ئەملادا لابدا.

مام ناوەنجێتی یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئاییـنی ئیسلام، لە نێوان (یەهودیـە)و (نەسرانیە)دا مام ناوەنجی هەڵکەوتوە: لە ئـایینی جولەکـەدا زانـستو زانیـاری هەیـە بەڵام کاری پێ ناکرێ، لە نەسرانیەتیشدا زیادە ڕۆیی لە پەرستندا دەکرێو پـشت بـە زانستو بەڵگـە نابەسـترێ، ئەوسـا ئیـسلام هـاتو کـردارو زانـستی لەگـەڵ خـۆ هێنـاو لایەنی گیانو جەستەو، بەڵگەی بەرجەستەو [٨٥٥] ژیری [٨٥٦] ڕەچاو کرد.

یـەکێکی تـر لەوانــەی لـە ژیانتــدا بەختــەوەرت دەکـەن مـام ناوەنــدێتی یـە، لـە بەندایەتیتدا مام ناوەند بە: نەکەی ئەوەندە خۆت شەکەتکەی خۆت لە پەلو پۆخەی، بەردەوامیو چوستوچالاکیت تارومارکەی، یا ئەوەندە شلوخاوی بنوێنی سوننەتەکان بچوێنیو، نوێژە فەرزەکان بروشێنیو [٨٥٧]، نیەیتی ئەمڕۆ بە سبەی لێبێنی [٨٥٨].

لـە بەخـشینت دا مـام ناوەنـد بـە: نەکـەی مـاڵو سـامانت بـە فـیڕۆ دەی دەسـتمایەت پڕشوبڵاوکەی ئەوسا خۆت هەژارو دەست بەتاڵکەی، دەسـتی خۆشـت نەقوچێنیو، لـە بەهرەی خوا قرچۆکی نەنوێنی، ئەوسا خۆت بەشبڕاوکەیو کردارێك بۆ دواڕۆژ نەچێنی.

لـە هەڵسوکەوتدا مـام ناوەنـد بـە: لـە نێـوان کۆشـشێکی لـە سـنور بـەدەرو شـلو خاوییێکیدا هێزەردا [٨٥٩]، لە نێوان ڕوخـسارێکی گرژومـۆنو قاقـای پێکەنینـدا، لـە نێـوان گۆشەگیرییێکی لە ڕادەبەدەرو تێکەڵبونێکی بێ سنوردا مام ناوەند بە.

مام ناوەنجی یاسای ئیسلام سـەبارەت بـە بڕیـاردان لەسـەر فـەرمانو، مامەڵـەی گـەڵ خەڵکانو، دەستگرتن بە کارو پیشان، هەر ئەوە ڕێڕەوێکی دادوەرانەیە، هەنـدە سـنور بەزێنی تێدا نیە لە خوڕەوشتدا پێوانەی سەررێژ بێو [٨٦٠]، ئەوەنـدە کـەموکوڕیش نیـە

---

٨٥٥) نەقلی.

٨٥٦) عەقلی.

٨٥٧) ماق خۆیان پێنەدەی/ بریندباریانکەی.

٨٥٨) خۆ فریودان بەو ناوەی بڵێی ئەوڕۆ نا سبەی دەیکەم.

٨٥٩) بێ تواناکەر.

٨٦٠) دەسەریوە برژێ.

دژی سەرمایەی خێر بێ، چونکە زیادگردن سنور بەزێنیو پێبردنە دەرە لە بەرێ خۆ، کەمکردنیش کەمتەرخەمیو گوێ پێ نەدانە: ﴿... فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ... ئیتر خودا بە ئیزنی خۆی ڕێگەی ڕاستی نیشانی باوەڕدارانداو تێی گەیاندن ئەو کێشە لەبەرچی کرا. خودا بۆ هەر کەسێ حەز بکا شارەزای ڕاستە ڕێی دەکا. (٢١٣) البقرة﴾.

بێگومان چاکە لەنێوان دو خراپەدایە: خراپەی زیادەڕۆییو خراپەی کەمتەرخەمی، پیاوەتی لەنێوانی دو زیان دایە: زیانی سنوربەزاندنو زیانی فەراموش کردن، حەقو ڕاستیش لەنێوانی دو نارەوایی دایە نارەوایی زیادکردنو، نارەوایی کەمکردن، بەختەوەریش لەنێوانی دو چارەڕەشی دایە: چارەڕەشی هەڵەشەیی [٨٦١] کردنو چارەڕەشی پاشەکشەکردن.

## نە ئەمیانو نە ئەویان

(موتورریف)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێ: خراپترین جۆری ڕۆیشتن، ئەوەیە مرۆ ئەوەندە خۆی شەکەت کا هەتا زیان بەخۆیو وەڵاخەکەی دەگەیەنێ.

لە فەرمودەشا هاتوە: ((**شرُّ الرعاء الحطمة**... خراپترین شوان، شوانی بێویژدانە)).

ئەویش ئەو جۆرە شوانەیە لە ئاستی سەرپەرشتی ژێردەستەکانی یا ئەوانەی خوا خستونیەتە ژێر فەرمانی نا میهرەبانو بێ باکە. بێگومان بەخشندەیی لەنێوان زێدەڕۆییو قرچۆکی دایە، ئازایەتی لەنێوان هەڵپە [٨٦٢] کردنو بێزاڵەیی [٨٦٣] دایە، نەرمونیانی لەنێوان توندوتیژیو کۆڵەواری دایە، زەردەخەنە لەنێوان ڕوگرژیو پێکەنین دایە، ئارامگریش لەنێوان دڵ ڕەقیو شینو زاری دایە، زیادەڕۆییش دەرمانی هەیە، کە ئەویش دەستگرتنەوەیە لە زیادەڕۆییو گوژاندنەوەی ئەو گڕە

---

٨٦١) هەراو هۆریا کردن/ خۆ هەڵکێشان.

[٨٦٢] خۆ فش کردنەوە.

[٨٦٣] ترسەنۆکی.

سوتێنەرەیە. دەرمانی کەمتەرخەمیش تەکانی هەنگاونانو پێ هەڵێنانەو، تروسکەی هومێــدو چــەخماخەی[٨٦٤] ورە بەرزیـــە، ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ... لـە ڕاسـتەڕێ شـارەزان کـە ڕێـی ئەوانەی، کە خۆت چاکەت دەگەڵ کردون، نەك ئەوانەی، کە وەبەر تـوڕەیی کـەوتون، نە ئەوانەش، کە لاڕێ بون. ٧ الفاتحة ﴾.

## ســەرنجێــك

هیچ شتێك لە بوندا ئەوەندەی ئارامگری گران نیە، ئینجا چ لەمەڕ خۆشی بـێ یـا لەســەر ناخۆشــی بــێ. بەتایبــەتیش ئەگــەر ماوەکــە درێژبێتــەوە، یــاخود ئومێــدی سەرکەوتن ببڕێ.

مەودای ئەو ڕێگایەش ئاتـاجی توێـشوێکی وایـە یاریـدەدەری ڕێگـابڕین بـێ، یـەکێ لەوان: ڕەچاوکردنی ڕێژەی دەردو بەڵاو پێشبینی کردنی پتر لەوەی ڕوی داوە.

یەکێکی تر ئەوەیە: چەندی بەڵا گەورەتر بێ لەوی گەورەتر هەیـە، وەکو ئـەوەی بە لەدەستدانی ڕۆڵەیەك تاقی کرابێتەوە، بـەڵام جگـەر گۆشـەیەکی خۆشەویـستـری هەبێ.

توێشوێکی تر: ئومێد وابێ هەر لە دنیا قەرەبو دەکرێتەوە.

یەکێکی تر: چاوەڕێی پاداشتی ڕۆژی دوایی بێ.

لەوانــەش: چـێژ وەرگـرتن لـەو سـتایشو پیاهەڵدانــەی خــەڵك سـەبارەت بـەوەی دوچاری بوە بە چاکە لێی دەدوێنو، چێژ وەرگرتن بە سای ئـەو خەڵاتـەی لـە خـوای بەرزو توانا وەریدەگرێ.

ئەوەش لەوانە: کە قوڕپێوانو ڕۆڕۆ، داد نادا، بەڵکە خاوەنەکـەی شـپرزەو زەبـون دەکـا.

---

٨٦٤) تیشك دان/ تروسکەدان.

جگە لەوانەش بیروزیری زۆر تویێشوی تری رەچاو کردوە، جگە لەوانە هیچ تویێشویکی رێی ئارامگریان پێ نابڕێ، ئەوسا کەسی ئارامگر پێویستی بەوە هەیە خۆی بەو تویێشوانەوە سەرقاڵ کاو، تەنگ‌و چەڵەمەی ژیانیان پێ تێپەڕدا.

## دۆستانی خوا کێن؟

چاوەڕێکردنی بانگ بە دڵێکی گەشەوەو، خۆ هەڵکوتان [٨٦٥] بۆ پێ ڕاگەیشتن بە سەرەتای دابەستن (لە نوێژی بە کۆمەڵدا)و، حەزکردن بە ڕیزی یەکەمی (نوێژو)، هەمیشە دانیشتن لە مزگەوتداو، دڵ بێ کینەیی‌و بێ خەشی‌و، پێوە دیاربونی دروشمی سوننەت‌و، یادکردنی زۆرو، ڕۆنە چون لە حەلاڵ‌و، وازهێنان لە شتی بێ‌هودەو، بەرچاو تێری‌و، شارەزا بون لە نیگای خوا چ لە ڕوی کتێبەوە چ لە ڕوی سوننەتەوەو، ڕوی خۆش‌و درەوشاوەو، ئازار پێ گەیشتن بە کارەساتی موسڵمانان‌و، پشت هەڵکردن لە دوبەرەکی‌و، ئارامگرتن لەسەر ناخۆشی‌و، بەخشندەیی‌و چاکە نواندن، لە خووڕەوشتی دۆستانی خودان.

ژیانی مام ناوەنجێتی باشترین گوزەرانە، نە دەوڵەمەندییەکی سنور بەزێن‌و نە هەژارییەکی لە بیر چوێن، بەڵکە هەر ئەوەندە هەبێ بایی بکاو بەس بێ‌و، مەبەست‌و بژێوی ژیانی پێ پێکبێ، هەرئەوەیان باشترین بژێوی‌و بەهەرمێنترین [٨٦٦] گوزەرانە.

ئەوەندە هەبێ بەسە: خانوێك تێیداوە حەسێی، هاوسەرێك دڵت ئۆقرەی پێ بگرێ، ئۆتۆمبێلێکی قەشەنگ، هەندە ماڵ‌و سامانەت هەبێ پێداویستی‌و کاری خۆی پێ جێبەجێ کەی.

---

٨٦٥) پەلە کردن.

٨٦٦) بە قازانج.

## خوا لە ئاســتی بەندەی خۆیدا میهرەبانــە

یـەكێ لـە گـەورە پیـاوانی شـاری (ریـاز) هـەواڵی پێـدام كـە لـە سـاڵی ١٣٧٦ی كۆچـی، دەســتەیێك لــە دەریــاوانی خــەڵكی (جوبێــل) بــە مەبەســتی ڕاوەماســی بــەرەو دەریــا ڕۆیــشتن، سـێ شـەوو ڕۆژان مانـەوە هـیچ ماسـیێكیان پـێ ڕاو نـەكرا، هـەر پێـنج فـەڕزە نوێژیشیان دەكرد، هەر لەولای ئەوان كۆمەڵێكی تـر هـەبون سـەریان بـە فـەڕزێ خـوای دانە دەداو نوێژ نەكەر بون، كەچی نێچیریان دەگرتو، ئەوەی بـە دوایـدا دەگـەڕان لـەو دەریایەدا وەدەسـتیان دەكـەوت، هەنـدێك لـەو دەسـتەیە گوتیـان: پـاكی بـۆ خـوا! ئێمـە هەمو نوێژێك بۆ خوای گەورەو توانا ئەنجام دەدەین‌و، هیـچ نێچیرێكیشمان پـێ نـاگرێ، ئەوانەش كڕنۆشێك بۆ خـوا نابـەن‌و ئـەوەش دەسـتكەوتی وانـە!! شـەیتان ختوكـەی [٨٦٧] لەدڵدا دروسـت كـردن، كـە واز لـە نوێـژكردن بێـنن، ئەوسـا نوێـژی بـەیانیان نـەكردو، نوێژی نیوەڕۆو ئێوارەشیان هەر نـەكرد، دوای نوێـژی ئێـواره دەسـتیان بـە ڕاو كـردەوە ماسیێكیان ڕاو كرد، هێنایانە دەرێو سكیان هەڵدڕی، مرواریێكی گران بەهای تێـدا بـو، یـەكێكیان مرواریەكـەی هـەڵگرت‌و لـەناو دەسـتیدا هـەڵگێڕو وەرگێـڕی پێكـردو لێـی دەڕوانی‌و، گوتی: پاك‌و بێگەردی بۆ خوا! لەو كاتەی گوێڕایەڵی خوامان دەكرد نەهاتـە دەستمان، بەڵام كاتێ سەرپێچیمان كرد وەدەستمان هێنا!!

بە ڕاستی ئەو دەستكەوتە جێی گومانە. پاشـان مرواریەكـەی فڕێدایـە نێـو دەریـاو، گـوتی: خــوا بۆمــان قــەرەبو [٨٦٨] دەكاتــەوە، چــونكە ئــەو كاتــە وەدەســتمان هێنــاوە كــە نوێـژمان وازلێهێنـاوە سـوێند بـە خـوا نامـەوێ، دەی بـا ئـەو جێگایـە جێبهـێڵین، كـە سەرپێـچی خوامـان تێـدا كـردوە، نزیكـەی سـێ (میـل) لـەوێ دور كەوتنـەوە، ئـا لـەوێ چادرەكەیان هەڵدا، ئەوسا بـۆ جـاری دوەم لـە دەریـا نزیكبونـەوە، ماسـیێكی تریـان ڕاو كرد، سكیان هەڵدری بینیان مرواریێك لەناو سگی ئەو ماسیەدایە، گوتیان: سـوپاس بـۆ ئەو خوایەی ڕۆزیێكی حەڵاڵی پێ بەخشین.

---

٨٦٧) وەسوەسە.

٨٦٨) پڕ كردەوە.

دوای ئەوە دەستیان بە نوێژ کردو یادی خودایان کردو پەشیمانی خۆیان دەربڕیو، مرواریەکەشیان بۆ خۆ برد.

بڕوانە سەرەتا لەناو گوناهـ و سەرپێچیدا ڕۆزیەکەیان ناپاك بو، سەرنج دە بۆ دواجار لەکاتی خواپەرستیدا ڕۆزییەکی پاکیان وەدەست هێنا. ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ... ئەگەر ئەوان بەو بەشە ڕازی بونایە، کە خوداو پێغەمبەری خودا دەیانداتیو بیانگوتا: ئێمە هەر خودامان بەسەو بەمزوانە خوداو پێغەمبەری خودا لە چاکەی خۆ بەشمان دەدەن، چ دەقەوما؟ ﴿٥٩﴾ التوبة ﴾.

بە ڕاستی ئەوەیە میهری خوا، هەرکەسێکیش لە پێناو خوا دەستبەرداری شتێك بێ، خوا چاتری بۆ لەجێ دائەنێ.

بە سای ئەوە سەرگوزەشتەیەکی (پێشەوا) (عەلی)م هاتەوە یاد - خوای لێ ڕازی بێت -، دەچێتە مزگەوتی کوفە بۆ ئەوەی دورکاتی چێشتە نوێژ بکا، دەبینێ کوڕە گەنجێك لەبەر قاپیەکەیە، دەڵێ: ئەی گەنج، هێسترەکەم بۆ بگرە هەتا نوێژ دەکەم.

(پێشەوا) (عەلی) چوە ناو مزگەوت، ئەوەشی لەدڵدا بو لە پاداشتی ڕاگرتنی هێسترەکە درهەمێك بداتە ئەو گەنجە، هەر لەو کاتەی پێشەوا چوە ناو مزگەوت، گەنجە ڕوبوە هەوساری هێسترەکەو لەسەری دەکەلی هێناو [٨٦٩] ڕۆیشتە بازاڕ بیفرۆشێ، پێشەوا هاتەدەرێ گەنجە لەوێ نەماوەو هێسترەکەش ڕێشمەی [٨٧٠] لەسەر ترازاوە، پیاوێکی بە شوێنی گەنجەکەدا ڕەوانە کردو، گوتی: بچۆ بازاڕ لەوانەیە هەوسارەکە لەوێ بفرۆشێ. کابرا ڕۆیشتو دیتی گەنجەکە دەیەوێ بە تاڵوکە ڕێشمە بفرۆشێ، لێی کڕی بە درهەمێكو، گەڕایەوەو هەواڵەکەی بە پێشەوا ڕاگەیاند، ئەویش گوتی: پاكو بێگەردی بۆ خوا! سوێند بە خوا لەدڵم دابو درهەمێکی بە حەڵاڵی پێ بدەم، بەڵام ئەو سور بو لەسەر ئەوەی بە حەڕامی وەریگرێ.

---

[٨٦٩] لەسەری هێنا خوارێ.

[٨٧٠] قەڕاسە/هەوسار.

ئەوەیـە میهـرو سـۆزی خـوای بـێ هاوتـاو دەسـتە بـاڵا، لەگـەڵ بەنـدەکانی خۆیـدا دەینوێنێ بەرەو هەر جێگایێ برۆن‌و کۆچ بکەن، لە هەر کوێدا نیشتەجێ بن: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ... ئـەتۆ لـە هەر بارێك دا بی‌و هەرچی لە قورئان بخوێنی‌و هەر کارێکی ئێوە بیکەن، ئێمە لێتـان ئاگادارین، کاتێ خـەریکی ئـەو کـارەن. هەرچـی هەیـە لـە زەمـین‌و لـە ئاسمانـا ـبـا لـە سەنگی مێرولەی هەرە وردیلەش یان ورتـر یان درشت تـر بـێ‌ـ هیچیان لە پـەروەرێنی تۆ پێوار نابێ‌و وا لە کتێبی دیاری دەردا-. ﴿٦١﴾ یونس ﴾.

## خــوا لە شــوێنێکەوە ڕۆزی بۆ بەنــدەی دەنێــرێ دەرکــی پێ ناکــا [٨٧١]

(تەنوخی) لە کتێبەکەیدا بەناوی (الفرج بعد الشدة) شتێکی لەو بابەتـە باسـدەکا: کـە پیاوێـك دنیـای لێبـو بـە چـەرمی چۆلەکە، دەرگاکـانی ژیـانی لـێ داخـرا بـون، ڕۆژێکیان وای لێهات بەخۆیو خاووخێزانی هیچیان نەبو بیخۆن.

پیاوەکە گوتی: بە خۆم‌و خاو خێزانم ڕۆژی یەکەم بە برسیاتی بەسەرمان برد، لە ڕۆژی دوەمدا کاتێ خەریك بو خۆرئاوا بێ.

خێزانەکەم پێی وتم: هەستە وەدەرکەوە، ڕۆزیێك خواردن‌و خۆراکێکمـان بـۆ پـەیا کە، وا خەریکە بمرین. دەڵێ: ژنێکی خزمم بیرکەوتەوە، چومە لایـو هـەواڵی خـۆمم پێ ڕاگەیاند.

ئەویش گوتی: هیچم لەماڵدا نیە تەنیا ئەو ماسیە نەبێ ئەویش بۆگەنیو بوە.

گوتم: ئێمـە وا خـەریکـە بمـرین بێنـە بـا بیبـەم. ماسـیەکەم بـردو سـگم هەڵـدڕی، مرواریێکم لـێ هێنایە دەرێ، بە هەزاران دینارم فرۆشت، هەواڵیشم بە خزمەکەمدا.

ئەویش گوتی: تەنیا بەشی خۆم دەوێ.

---

٨٧١) ئاماژە بۆ ئەو ئایەتە: ﴿ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ... ﴿٣﴾ الطلاق ﴾.

دەڵێ: دوای ئەوە دەوڵەمەند بوم‌و، بەو پارەیە ئاو ماڵی خۆم ڕێك خست‌و باری ژیانی خۆم پێ ڕاست کردەوەو، ڕزق‌و ڕۆزیم فراوان بو.

ئەوەش تەنیا ئاوڕ لێدانەوەی خوای بەرزو بێ هاوتا بو.

﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ... هەر بەهرەیەك ڕووتێدەکا لە خواوەیە. (٥٣) النحل ﴾.

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ ... لەو کاتەشدا کە هاناتان بۆ پەروەرێنتان دەبرد، جا لە هاناتان هات. (٩) الأنفال ﴾.

## هەر خوایە بارانێ دەبارێنێ [٨٧٢]

یەکێ لە خواپەرستە ڕێزدارەکان بۆی گێڕاینەوە: لەگەڵ خاوو خێزانیدا لە بیابان بو، بەندەیەکی تۆبەکارو خواپەرست بو یادی خوای لەدڵ دابو.

دەڵێ: ئەو ئاوەی بەلاماندا دەهات بڕا، منیش ڕۆیشتم بۆ ماڵ‌و منالّم ئاو پەیاکەم، بینیم گۆماوەکان وشك بونە، ئەو جارەش گەڕامەوە، دیسا ئەولاو ئەلامان کرد، تەنیا دلۆپە ئاوێکیشمان چنگ نەکەوت، تێنوێتی زۆری بۆ هێناین‌و، منالّەکانم زۆر پێویستیان بە ئاو بو، پەروەرێنی بە توانام کەوتەوە یاد - پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو- ئەو خوایەی لێمانەوە نزیکەو وەڵامگۆیە، هەستام تێمومم کردو ڕوم کردە ڕوگەو دوڕکات نوێژم کرد، پاشان دەستەکانم بەرز کردەوەو گریام، فرمێسك لە چاوم هاتەخوارێ‌و، بەگوڕ داوام لە خوا کرد، ئەو ئایەتەی خوام بیر کەوتەوە: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ... یا ئەو کەسەی چاترە کە هەروەختێ هومێدبڕاوێك لەبەری بپاڕێتەوە، دەهانای دێ (٦٢) النمل ﴾.

---

٨٧٢) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ ... (٢٨) الشورى ﴾.

سوێند بە خوا هەر ئەوەندە بو لە جێگای خۆم هەستام‌و، هیچ پەڵە هەورێکیش لە ئاسمان نەبو، لە ناکاوێ پەڵە هەورێك لەسەر ماڵ‌و شوێنی ئێمە لەو بیابانەدا پەیابو لە شوێنی خۆی ڕاوەستاو، لێزمە بارانی بەسەردا هەڵڕشتین، کەندو گۆمی دەوروبەرو ڕاست‌و چەپی ئێمەی پڕ کرد، ئاومان خواردەوەو خۆمان شوشت‌و دەستنوێژمان گرت، سوپاسی خوای تاك‌و توانامان کرد، دوای ئەوە کەمێك لە ماڵی خۆمان دورکەوتمەوە بینیم هەموی وشك‌و برێنەو بارانی لێ نەباریوە، ئەوسا زانیم خوا وەڵامی نزای منی داوەتەوە، جا سوپاسی خوای بەرزو دەستە باڵام کرد: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ... هەر ئەویشە پاش ناهومێد بون لە باران، بارانە دادەبارێنێ‌و دلۆڤانی خۆشی بلاودەکاتەوە، هەر ئەوە بۆ مەزنانەیەتی ئەشێ هەر پەسندی بدرێ [873]. ﴿٢٨﴾ الشورى﴾.

لە ڕاستیدا پێویستە لەسەر نزاو پاڕانەوە لە خوای بێ هاودەم‌و هاوتا پێ دابگرین، چونکە هەر خوایە - شکۆداری‌و پایەداری بۆ ئەو - دەرونەکان دەسازێنێ، ڕۆزی دەدات‌و خەڵك ڕێنوێنی دەکا، لەهانا دێ‌و خۆراگری دەبەخشێ، ئاسانکاری دەکاو کۆمەکی ڕەوانە دەکا.

خوای گەورەش باسی یەکێ لە پێغەمبەرانی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ... ژنەکەی ﴿زەکەریاش﴾مان چاککردەوە. ئەمان لە کاری چاکەدا بە هەڵپە بون [874]، بە هومێدو بەترسەوە لەبەرمان دەپاڕانەوەو لە حاند [875] ئێمە لارەمل [876] بون. ﴿٩٠﴾ الأنبياء﴾ .

---

٨٧٣) ستایش بکرێ.

٨٧٤) بەگوڕبون.

٨٧٥) لە ئاست.

٨٧٦) ملکەچ.

# خــوا چــاتری پــێــدا

(ئیبن رەجەب)و جگە لەویش دەگێڕنەوە: پیاوێك لە خواپەرستان لە (مەككە)دا دەژیا، بژێوی لێبڕاو، زۆر برسی بو، خەریك بو لە برسان بمرێ، كاتێ بە كۆڵانەیێكی (مەككە)دا دەخولایەوە ملوانكەیێكی زۆر بە نرخو گرانبەهای بینیەوە، دەستی دایێو بەرەو (حەرەم) ڕۆیی، سەیر دەكا كابرایەك بۆ ئەو ملوانكەیە بانگ ڕادێڵێ، دەڵێ: نیشانەكانی بۆ هەڵدام هەمویان تێكی دەكردەوە، ملوانەكەم داوە دەستی لەسەر ئەوەی شتێكم بداتێ.

دەڵێ: كابرا ملوانكەی بردو ڕۆیی، هەر خۆی سڵ نەكرد، نە درهەمێك نە عانەیەك پوشكەیێكیشی پێ نەدام.

گوتم: خوایە لەبەر خاتری تۆ وازم لێ هێنا، چاتر لەوەم پێ ببەخشی، دوای ئەوە خواپەرستەكە بەرەو دەریا ڕۆیشتو سواری بەلەمێك بو، باییێكی تونـد هەڵی كردو، بەلەمەكە تێكشكا، سواری تەختەیێك بو، لەسەر پشتی دەریا با بەولاو ئەولای دا دەبرد، هەتا ڕێی كەوتە دورگەیێكو لەوێ دابەزی، دیتی مزگەوتێكی لێیەو خەڵكێكی لێیە نوێژ دەكا، ئەویش نوێژی كرد، سەیر دەكا چەند پەڕە قورئانێكی لێیەو دەستی كرد بە خوێندنی، خەڵكەكە گوتی: تۆ دەزانی قورئان بخوێنیێ؟

منیش گوتم: بەڵێ.

گوتیان: دەی ڕۆڵەكانمان فێری قورئان كە.

بە كرێ دەرسم پێ گوتن، دوای ئەوە دێڕێكم نوسی.

گوتیان: منداڵەكانمان فێری نوسین دەكەی؟

گوتم: بەڵێ. بەكرێ نوسینم فێردەكردن.

دوای ئەوە گوتیان: لێرەدا كچێكی بێ باوك هەیە، كچی پیاوێكی ئێمە بـو كابرایەكی چاك بو مردو ئەو كچەی دوای بەجێهێشت، ئایە دەتەوێ مارەی بكەی؟

گوتم: شتێكی ئاساییە. دەڵێ كچەم مارە كردو، چومە لای بینیم هەمان ملوانكەی لە ملی دایە.

گوتم چیرۆکی ئەو ملوانکەی چیە؟ ئینجا سەربوردەی بۆ گێڕامـەوەو، باسـی کـرد کـە جارێـك بـاوکی لـە کڕنـۆش بردنـدا دەپاڕایـاوە، کـە خـوای گـەورە پیـاوێکی ئـاوا بکاتـە هاوسەری کچەکەی. ئەویش گوتی: دەنا من ئەو پیاوەم.

ئەوسا ملوانکەی بە حەلاڵی پێ برا، خوا چاتری پێدا، چونکێ دەستبەرداری شتێك بو لەپێناو خودا.

((ان الله طیـب لا یقبـل الا طیبـا... بێگومان خوا پاکەو تەنیا پاکیشی گەرەکە)).

## ئەگـەر داوات کـرد لە خـوا بخـوازە

میهـری خـودا نزیکـەو، بیـسەرو وەڵامگۆیـە، کـەموکوڕیش لـە ئێمەیـە، ئێمـە زۆر ئاتـاجین بـەوەی پـێ دابگـرینو داوای لـێبکەین، جاڕسو بێـزاریش نـەبین، بـا هـیچ کەس لە ئێمە نەڵێ: چەند جار چەند جار پاڕامەوە وەڵامم نەدریاوە. بەڵکە بـا نێـو چاوانمان لە سوژدەدا تۆزاوی کەین، دەممان بـەو نزایـە پاراوکـەین: ((یـا ذا الجـلال و الاکرام ... ئەی ئەو کەسەی ڕێزدارو پایەداری)). با ئەو ناووسیفاتە بەرزو پیرۆزانەی خوا بڵێینو بڵێی نەوە، هەتا خوای تـاكو تـەنیا وەڵامـی خواسـتەکانمان دەداتـەوە، یـا ئـەوەی بۆخـۆی پێـی چاکە بۆمـان ڕەچاو دەکـا، ﴿ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ ... بـە نهێنیو بە مل کەچی هەر پەروەرندەو لەبیربێو لەبەری بپاڕێنەوە. ﴿٥٥﴾ الأعراف ﴾.

پیاوێکی بانگەوازکار لە هەندێك لە پەیامەکانی خۆیدا دەگێڕێتـەوە، کـە پیـاوێکی موسڵمان بـە خێزانـەوە پـەنا بـۆ یـەکێ لـە دەوڵەتـەکان دەبـا، داوا دەکـا ڕەگەزنامـەی پێبدرێ، ئەو پیاوە بە هەمو شێوەیەك هەوڵ دەداو، توانای خۆی دەخاتـە گـەڕ، کێـی شك دەبرد کێشەی خۆی لەلا باس کرد، هەمو ڕێی لێگیرانو، دەرگای لـەڕو داخـرانو، فێڵو فرتی وێ نەمان، پاشان گەیشتە زانایەکی لە خـوا تـرس حـاڵو بـاڵی خـۆی پـێ ڕاگەیانـد، ئـەویش گـوتی: سـێیەکی کۆتـایی شـەو لەدەسـت نـەدەی، لـە پەروەرنـدەت بخوازە، چونکێ هەر خوا - گەورەییو بێوێنەی بـۆ ئـەو- ئاسـانکارە، هەرئـەوەش لـەو فەرمودەیە دەفامرێتـەوە: ((اذا سـألت فاسـئل الله، واذا اسـتعنـت فاسـتعن بـالله، واعلم ان الامة لو اجتمعـوا علـی ان ینفعـوك بشـيء، لـم ینفعـوك الا بشـيء قد کتبـه

الله لك... ئەگەر داوات کرد لە خوا داواکە، ئەگەریش پەنات برد پەنا بۆ خوا ببە، دڵنیاش بە ئەگەر هەمو خەڵك بۆ ئەوە کۆبێتەوە قازانجێکت پێ بگەیێنێ، لە دەستی نایێ مەگەر بایی ئەوەندەی خوا بۆتی بڕیار دابێ، ئەو پیاوە دەڵێ: سوێند بە خوا وازم لە چونە لای خەڵكو داوا لێکردنیان هێنا، لەسەر ئامۆژگاری ئەو زانایە بەردەوام بوم لە دوعاو نزای سێیەکی کۆتایی شەو، لە بەرەبەیاندا هاوارم دەکردو دەپاڕامەوە، تەنیا چەند ڕۆژێکی پێ چو، سکاڵا نامەیەکی ئاساییم بردە پێش هیچ ڕاسپاردەو هۆکارێکیشمان لەنێوان دا نەبو، ئەو پەیامە جێی خۆی گرت، تەنیا دوای چەند ڕۆژێك لە پڕێکا لە ماڵی خۆمدا بانگ کرامو ڕەگەزنامەکەم دراوە دەست، لەو کاتەشدا بارەکە زۆر نالەبار بو.

## خـوا دەربـارەی بەندەکـانی دلۆڤـانـە [٨٧٧]

### چەند خولەکێکی پڕ بە بایەخ:

(تەنوخی) دەگێڕێتەوە: یەکێ لەوە زیرەکانی بەغدا - تەنوخی ناوی دێنێ- هەر لەوێ زوڵم لە پیرەژنێك دەکا، مافی لێ زەوت دەکاو، ماڵو مڵکی داگیر دەکا، پیرەژن دەچێتە لای، دەگرییێو داوای لێ دەکا مافی خۆی بداتەوە، شینوزاری کاری تێناکاو پەشیمانی دەرنابڕێو تۆبە ناکا، پیرەژن دەڵێ: داوا لە خوا دەکەم تۆڵەی منت لێ بکاتەوە، ئەویش بە گاڵتەوە پێی پێ دەکەنێو، دەڵێ: سێیەکی کۆتایی شەو لەکیس مەدە. لوت بەرزیو تاوانکاری وای لێکرد ئەو قسەیە بە گاڵتەوە بکا، پیرەژن ڕۆیشتو هەمیشە لە سێیەکی کۆتایی شەودا نزای لێ دەکرد، تەنیا ماوەیەکی کورتی پێ چو، ئەو وەزیرە لەکار لادراو ماڵو سامانیان لێ سەندو، زەویوزاری دەست بەسەر داگیرا، پاشان هێنایان لەناو بازاڕ ڕایان گرتو لەسەر ئەو زوڵمو ستەمەی دەرحەق بە خەڵکی کردبوی دارکاری کرا، پیرەژنە بەلایدا تێپەڕیو، پێی گوت: ڕێیەکی چاکت نیشان دام! سێیەکی کۆتایی شەوت بۆ باسکردم، منیش هەستم کرد باشترین چارە ڕێگا بو.

---

٨٧٧) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە: ﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ ...﴿١٩﴾ الشوری﴾.

بێگومان ئەو ماوەیە لە كاتو ساتو ژیـانی ئێمـەدا زۆر بایەخـدارو گـران بەهایـە، ئەوساتە پەروەردگاری باڵادەست دەربارەی دەفەرموێ (لە حەدیسی قودسیدا): ((**هـل من سـائل فاعطیـه، هل من مسـتغفر فاغفـر له، هـل من داع فاجیبــه** ... ئاخۆ هیچ داواكارێك هەیە پێی ببەخشم، كێ داوای لێبوردن دەكا لێـی ببـورم، كـێ هەیـە داوای هەبێ وەڵامی بدەمەوە.

من ئەو ژیانەم بەسەر برد لەگەڵ ئەوەی گەنجم، گوێبیستی چـەند هـەواڵێ بـوم و، لە ژیانمدا چەند ڕوداوێ كاریان تێكردم ببـڕای ببـڕ لـەیادیان ناكـەم، هەسـتم نـەكرد هـیچ شـتێ ئەوەنـدەی خـوا - پـاكو بـێ گـەردی بـۆ ئـەو- نزیـك بـێو میهـرو سـۆزو، كۆمەكیو، ڕزگاری لەلا بێ.

لەو كاتەی كێشەی كەنداو لـە گۆڕێـدا بـو، لەگـەڵ كۆمەڵـە خـەڵكێك لـە (ئـەبها)وە بەرەو (ڕیـاز) بـە سـواری فڕۆكـە بـەڕێ كـەوتم، كاتێـك بـەرەو ئاسمـان بەرزبوینـەوە، هەواڵیان پێدان كەموكوڕییێك لە فڕۆكە پەیدا بو، بـۆ جـاری دوەم لـە فڕۆكەخانـەی (ئەبها) دەنیشێتەوە، گەڕاینـەوە ئەوەنـدەی توانیـان فڕۆكـەیان چـاك كـردەوە، پاشـان جارێكی تر بەڕێ كەوتینەوە، لە كاتێكا لە (ڕیاز) نزیـك بوینـەوە، بـە هـیچ چەشـنێ تایـەكانی فرۆكـە نەبونـەوە، یـەك كاتـژمێری تـەواو ئێمـەی لـە ئاسمـانی (ڕیـاز) دەخولانـدەوە، پـتر لـە دە جـار هەوڵیـدا، دەهاتـە سـەر فرۆكەخانـە دەیەویـست بنیشێتەوە نەیدەتوانی، جارێكی تر بەرز دەبۆوە، ترسو بیم دایگـرتینو، زۆر كـەس ورەیان بەردا، قیـژەو گریـانی ژنـان دەنگـی دایـەوە، بینـیم خـەڵك فرمێـسكی لەسـەر كوڵمەی قەتیس ماوە، وامـان لێهـات لـە ئاسمانـدا نـزیكتر لـە چـاوتروكانێك چاوەڕێی مەرگمان دەكرد، هەمو شتێكم لەبەرچاو گرت هیچیانم وەكو كردەوەی چـاك نەهاتـە بەرچاو، دڵ بەرەو خوای بەرزو توانا گەشتی كرد، بێ بایەخیو سوكو چروكی دنیـا وەدەركەوت، بە جۆشوخرۆشـەوە ئـەو زیكرەمـان دوبـارە دەكـردەوە: ((**لا الـه الا الله وحده لا شريك له، له الملـك وله الحمـد وهو على كل شيء قدير**... هەر خـوا پەرسـتراوی ڕاستەقینەیەو تاكو تەنیاو بێ هاودەمە، دەسەڵات هەر ئیویەو، سوپاس هەر شـیاوی ئــەوەو، بەسـەر هـەمو شتێكیـشدا زاڵـە))، مامۆسـتایەكی بەسـاڵدا چـو بەتەمـەن هەڵسایەوە، بـە دەنگێكی بـەرز بەخـەڵكی وت، پـەنا بـۆ خـوا ببـەنو داوای لـێبكەن، ژێوانی خۆتان دەربڕنو بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە. خوای گەورەش بەمـشێوەیە بـاس لـە

هەڵوێـستی مرۆڤـ دەکـا: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ... هـەرگا سواری کەشتی دەبن، بە دڵی پاك لەبەر خوا دەپاڕێنەوە.﴿٦٥﴾ العنكبوت ﴾.

داوامان لەو خوایە کرد وەڵامگۆی لێقەوماوانەو، زۆر بە گەرمو گوڕی پاڕاینـەوە، تەنیا کەمێکی پێچو، دوای هـەوڵی یـازدەمینو دوازدەمـین بـەبێ گرفت نیـشتینەوە، کاتێ دابەزین هەروەکو بڵێی لە گۆڕ هاتینەدەرێ، هەستو دەرون بۆ سەردەمی پێـشو گەڕانەوەو، زەردەخەنە کەوتە سەر لێوانو، فرمێـسکیش لـە چاوان کشانەوە، بزانـە میهری خوای بێهاودەمو توانا چەند بەرفراوانە.

لە ڕاستیدا ئەوەش هەر کۆمەکیو سۆز نواندنی خوای تـاكو بـێ هاوتایـەو هیـچی تر نیە.

## لە تەنگـانەدا کـێ لە فریامـــان دێ ؟

ڕۆژنامەی (القصم) - کە ڕۆژنامەیەکی کۆنەو لـە (بـیلاد) دەردەکـرا- دەگێڕێتـەوە، لاوێك لە شاری (دیمەشق) داینـابو گەشـتێك ئەنجامـدا، بـە دایکـی خـۆی ڕاگەیانـد لـە کاتژمێر ئەوەنـدەو ئەوەنـدە فڕۆکـە هەڵدەسـتێ، ئەگـەریش کاتەکـە نزیـك بـۆوە بـە ئاگای بێنێ، کوڕە گەنجە خەوتبو، دایکیشی گوێی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن بو هەواڵی دەدا: کەشو هەوا نالەبارەو تەمومژە، گەردەلولو ڕەشـەبای تونـد لـەڕێ دایـە، دایکـە سـۆزی بـۆ تاقـە کوڕەکـەی جـوڵاو دڵـی نـەهات بـەئاگای بێنـێ بـە هیـوای ئـەوەی گەشتەکەی لەدەسـت چـێ، ترسـا لـەوەی کارەسـاتێك ڕوبـدا سـەبارەت بـەوەی کـەشو هەوا بۆ گەشتکردن دەست نـادا، ئەوسـا کاتـێ دڵنیـا بـو فڕۆکـە گەشـتیارەکانی وەخـۆ هەڵگرتو فڕی، هات کوڕەی وەئاگا بێنێ سەیر دەکـا لـەناو پێخەفـی گیـانی لەدەست داوە. ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ... بێـژە: ئـەو مەرگـەی، کـە ئێـوە لێـی ڕادەکـەن، هەردەوگاتێو پاشان هەر دەتانبەنەوە لای زانـای نـەدیارو دیاران، ئەوسـا هـەر خـۆی پێتان ئێژێ چیو کردوە.. ﴿٨﴾ الجمعة ﴾.

لەبەر مردن هـەڵات کەچی دوچاری مردن هات

ئاپۆرەش دەڵێ: (کەسی ڕزگاربو لە دەریا ڕێگایەکی بۆ دەسازێ). ئەگەریش مـەرگ بوە مێوان هەرچی بێ مرۆ دەکوژێ.

## سـەربوردەی مـەرگ

(شێخ عەلی تەنتاوی) لەوانەی بیستوییێتیو بینیوێتی دەگێڕێتەوە:

لە وڵاتی شام پیـاوێ هـەبو ئۆتـۆمبێلێکی بارهـەڵگری هـەبو، پیاوێـك لەگەڵیـدا بـو لەسـەر پـشتی ئۆتۆمبێلەکـە سـوار دەبـێ، لەوکاتـەدا دارەبازەیـەکی [٨٧٨] هـەڵگرتبو، بـۆ مردوان ئامادە کرابو سەرچەفێکی لەسەر بو بۆ کاتی پێویستی، لە ڕێگا بـاران بـاریو ئـاو هـەڵڕژا کـابرای سـوار بـو چـوە نـاو دارەبازەکـەو سەرچەفەکەشی بەسـەرە خـۆی هەڵکێـشا، لـەڕێگا پیـاوێکی تـریش سـوار بـو لـە تەنیـشت دارەبازەکـەوە دانیـشتو نەیـدەزانی ئـەو دارەبـازە کەسـی تیایـەو، وایـدەزانی هـەر خـۆی لەسـەر پـشتی تۆتۆمبیلەکەیە، بارانەش هەر بەردەوام بو، لە ناکاوێ کابرای نـاو دارەبازەکـە دەسـتی دەرهێنا، بۆ ئەوەی بزانێ ئاخۆ بارانەکە کۆتایی هات یا نا؟

هەر کە دەستی دەرهێناو بەولاو ئەولادا دەیگێڕا کابرای تەنیشتی داچڵەکاو ترسو لەرز گرتی وایزانی ئەوە مردوەو زیندو بۆتەوە، خۆی لەبیـر کـردو لـە ئۆتۆمبێلـەوە کەوتە خوارێو بەسەر سەریدا کەوتو مرد.

بەم شێوەیەو بەم ڕێگەیە خوا کۆتایی بە ژیانی هێنا بو دەبوایە ئاوا بمرێ.

لەسـەر بەنـدەش پێویـستە هەمیـشە ئـەوەی لـەیادبێ مـەرگی وەخـۆ هـەڵگرتوەو، بەرەو مەرگ هەنگاو هەڵدێنێو، هـەمو بـەیانیو ئێوارەیـەك چاوەڕێی مـەرگ دەکـا، ئەو وتەی پێشەوا (عەلـی) - خوای لـێ ڕازی بێت - چەند بایەخدارو جوانو سـەرنج ڕاکێشـە، کە دەڵێ: (لە ڕاستیدا دواڕۆژ وا بەرەو ڕومان بەڕێوەیـەو، دنیـاش پـشتی لـە ئێمە کردوەو دەڕوا، ئەوسا هەوڵدەن ڕۆڵەی دواڕۆژ بنو، ڕۆڵـەی دنیـا نـەبن، چـونکێ ئیمڕۆ ڕۆژی کردارەو پرسینەوە نیە، سبەش پرسینەوەیەو ڕۆژی کردار نیە).

---

٨٧٨) ئەوەی مردوی پێ هەڵدەگرن.

ئـەو وتەيـە بـۆ ئـەوەمان هەڵـدەنێ کـە مـرۆڤ وەخـۆ بکەوێو خـۆی ئامـادە بکـاو، چاکـسازی بۆخـۆی بکـا، تـۆ بـەو پەشـیمانی خـۆی نـوێ کاتــەوەو، دڵنیابــێ کــە تێکەولێکەی [879] لەگەڵ پەروەردیارێکی هێزدارو توانادارو، بەخشندەو میهرەبانە.

بێگومان مردن داوای ڕێپێدان لە کەس ناکاو، مەکە مەکە نازانـێ، لەگـەڵ کەسـدا خۆشـدو نیـەو، بـەر لـە هـاتنی کـەس ئاگـادار ناکاتـەوە، ﴿... وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًاۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُۚ ... کەس نازانێ کاری سبەی ڕۆژێ چیەو کەس نازانێ لە کامە سەر زەمین دەمرێ. خودا زاناو ئاگادارە. ﴿٣٤﴾ لقمان﴾.

## چرکـەیێ لـێی دوا ناکـەونو پێـش ناکـەون [880]

بەهەمان شێوە (تەنتاوی) لە بیسراوو بەرچاوکەوتوەکانی دەگێڕێتەوە: پاسێك پـڕ لە خـەڵك بـو، شـۆفێرەکەی بـەلای ڕاسـتو چـەپی ئـاوڕی دەدایـەوە، لـەپڕێکا وەسـتا، خەڵکی ناو پاسەکە پێیان وت: بۆ ڕادەوەستی؟

گوتی: لەبەر ئەو پیاوە پیرە ڕادەگرم دەستی ڕادەنگێوی لەگەڵمان سوار بێ.

گوتیان: کەسـمان لـێ دیار نیە.

گوتی تەماشای کەن. گوتیان کەس نابینین!

گوتی: ها ئەوە ئێستا بەرەو ڕومان دێ لەگەڵمان سوار بێ.

هەمو تێکڕا گوتیان: سوێند بە خوا کەس نابینین! لە ناکاوێ هـەر لەسـەر کوشـنی ئۆتۆمبیلەکە شوفێر گیانی سپارد.

هەر لەوێ مەرگ بۆ مێوانیو یەخەی پێ گرت، ئەوەشی لێبو بە هۆکـار، ﴿... فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةًۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ... ئەگـەر وەخـتی مردنیـان هـات، نـە تاوێك دەکرێ پێشکەون، نە تاوێکیش دوادەکەون. ﴿٣٤﴾ الأعراف﴾.

---

٨٧٩) مامەڵەی .

٨٨٠) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە: ﴿...لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةًۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ...﴿٣٤﴾ الأعراف﴾.

مرۆڤ لە ئاستی مەترسیەکاندا ترسەنۆکە، لە پەنای خەیاڵ خاوی خواستەکانیدا خۆی پەنا دەدا، کەچی لەپڕێکا لەو پەناگەیە گیان لەدەست دەدا، ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ... ئەوانەی کە خۆیان نەچونە خەزا، لەمەڕ هاوەڵانیان دەگوت: ئەگەر بە قسەیان کردباین نە دەکوژران بێژە: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆ لە مردن بپارێزن. (١٦٨) آل عمران ﴾.

ئێمە لەوەدا جێگای سەرسوڕمانین بیر لە گەیشتنەوە خوای بەرزو دەستەباڵا ناکەینەوە، نە کۆچی یەکجارەکیمان بەخەیاڵ دادێ مەگەر ئەو ساتەی دەکەوینە ناو مەترسیەکان.

## هەرچی پەنای بۆ بەرن لە غەیری خوا، بەر پێوارە [٨٨١]

لە ساڵی ١٤١٣ ك لە (ڕیاز) وە بەرەو شاری (دەممام) ڕۆیشتم نزیکی کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ گەیشتم، لە فڕۆکەخانە دابەزیمو دەمەویست بچمە لای هاوڕێیەکم، بەڵام لەسەر کاری بو درەنگ دەگەڕایەوە، ئینجا سواری ئۆتۆمبیلێك بومو چومە ئوتێلێکی ئەوێ، کاتێ چومە ناو ئۆتێلەکە بینیم زۆر خەڵکی تیا نیەو، ڕۆژی پشوو سەردانیش نیە، لە نهۆمی چوارەم، دور لە فەرمانبەرانو کرێکاران ژورێکم بەکرێ گرتو، خۆشم هەر تەنیا بوم، چومە ژورەکەو جانتاکەم لەسەر تەختەکە دانا، چوم دەستنوێژێ بگرم، لە جێگای دەستنوێژ دەرگاکەم لەسەر خۆم پێوەدا، کاتێ دەست نوێژم گرت بۆ دەرگا چوم بیکەمەوە سەیر دەکەم گیر بوەو نابێتەوە، بە هەمو شێوەیەك هەوڵمدا بیکەمەوە، بەڵام نەمتوانی، لەناو ئەو ژورە تەنگەبەرەدا مامەوە، هیچ کەلێنو کەلەبەرێك نیە تیایدا بانگ کەم، تەلەفۆن نیە پەیوەندی بکەم، خزمێك نیە هاواری بکەم، هاوسێی یەك نیە پەنای بۆ ببەم، پەروەردیاری بێوێنەو فریاد ڕەسم بیرکەوتەوە، سێیەکی کاتژمێرێك لە جێگای

---

٨٨١) نادیارو پەنایە/ ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە ﴿ ...ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ ...(٦٧) الإسراء ﴾.

خۆمدا وەستام، بەڵام هەروەك و بڵێی سێ ڕۆژ بو، بەو ماوە کورتە ئارەقەم لێ دەچۆڕا، ناخم ڕاچڵەکا، جەستەو لاشەم هەژا، لەبەر چەند هۆیەك، لەوانە: شوێنێکی سەیرو سەمەرە بو، هۆیەکی تر ئەوەبو: لە پڕێکا وام بەسەرهات، هۆیەکی تر ئەوەبو: دەنگم بە هیچ کەسێ نەدەگەیشت خزمێك دۆستێك نەبو هەواڵی پێبدەم، وێڕای ئەوەی جێگایەکە نەشیاو بو، لە سێیەکی کاتژمێرێ چەندین پەندو یادەوەریم هاتنەوە یاد، شەپۆلی چەند ڕوداوێ بەرەو ڕوم هات.

لە کۆتاییدا کەوتە بیرم دەرگاکە بهەژێنم، بە شپرزەییو، لاشەیەکی داهێزاوو بێتوانا دەرگاکەم هەژاند، سەیر دەکەم پارچە ئاسنی بەر دەرگا، وردەوردە وەکو میلی کاتژمێر دەجوڵێ، تا شەکەت بوم دەرگام هەژاند ئەوسا وەستام، دوبارە دەستم بە هەژاندنی کردەوە هاتا شەکەتی دایگرتمەوە دیسان ڕاوەستام، بۆ دواجار دەرگام لەڕو کرایەوە.

چۆن بڵێی لە گۆڕ دێمە دەرێ، گەڕامەوە ژورەکەم، لەسەر ئەو ڕوداوە سوپاسی خوام کرد، بیرم لە بێتوانایی و کەم دەسەڵاتی مرۆڤ و، توشهاتنی بە مردن کردەوە، بیرم کردەوە سەبارەت بە خودی خۆمان و تەمەنمان کەمتەرخەمین، لە دواڕۆژمان بێئاگایین.

﴿ وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ... ترسیشو لەو ڕۆژە هەبێ کە دەوهێنێتەوە لای خودا. ﴿٢٨١﴾ البقرة ﴾.

﴿ أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ... لە هەر کوێ بن تەنانەت ئەگەر لە قەڵای زۆر قایمیش (خۆوە شێرن)، مردن دەتان دۆزێتەوە. ﴿٧٨﴾ النساء ﴾.

سەبارەت بەو باسە ڕوداو گەلێکی سەیرم خوێندۆتەوەو، شت گەلێکی سەمەرەم وەبەر گوێ کەوتوە، جاری وا بوە پیاو بەرەو مردن ڕۆیشتوە کەچی ژیان لەوە دابوە، یەکێ تر بەرەو ژیان بەڕێ کەوتوە کەچی بەچاوی خۆی مەرگی بینیوە، کەسێکی تر بەدوای چارەسەردا گەڕاوە کەچی سەری لەسەر داناوە، ئیواش هەبوە گیانی خستۆتە سەر دەستیو بەگومانی خۆی مردن چاوەڕێی بوە کەچی لەوێوە خۆری ئازادی هەڵاتوە.

سا پاکیو بێ گەردیو گەورەییو شکۆ بۆ خـوای دروست کـارو هەڵسوڕێنەرو کـار لەجێ!!

## جـاری وایـە دەردە، دەبێتـە دەرمـانی لاشـە

مێژونوسان دەگێڕنەوە: پیاوێك دوچاری ئیفلیجی هـات، لـە مـاڵی خـۆی کەوتـەوە، سـاڵانێکی دورو درێـژی بەسـەردا تێپـەڕی بێـزاریو بێئومێـدیو داڕوخـان دایگـرت، پزیشکان لە چارەسەری دەستەوسان بونو، بـە کـەسو کاریـشیان ڕاگەیانـد، ڕۆژێ لـە ڕۆژان دوپـشکێك لەبـەری خانیـەوە بەسـەر سـەریدا هاتـە خـوارێو نـەیتوانی خـۆی بجوڵێنـێ، هاتـە لای سـەری چـەند جـارە بەسـەریوەدا، هـەمو لاشـەی هـەر لـە تـەوقی سـەری هـەتا بـەری پێـی لـەرزی گـرت، هەسـتی کـرد سـەرلەنوێ گیـانی وەبـەر لاشـە دەکرێتـەوە، تەنـدروستی سەرتاپای لەشی دەگرێتەوە، بە گورجی هەسـتایەوەو لەسـەر پێیەکانی وەستا، پاشان لەناو ژورەکەیدا هاتو چو، دەرگاکەی کـردەوە، مـاڵو منـاڵی بـەرەو ڕوهـات دەبیـنن لەسـەر پێـی خـۆی وەسـتاوە، نزیـك بـو هۆشـیان نـەمێنێو، خەریك بو باوەڕ نەکەن، ئەویش هەواڵی خۆی پێ ڕاگەیاندن.

ئەوسا تاکیو پاکی بۆ ئەو خوایەی بە ژەهر چارەی ئەو نەخۆشـەی کرد!!

ئەو داستانەم بۆ هەندێ لە پزیشکان گێڕایەوە باوەڕیان کـرد، گوتیـان زرینـچکاوی ژەهـراوی لەگـەڵ کـەمێك مـادەی کیمیـاوی بـەکاردەهێنرێو، چارەسـەری ئـەو جـۆرە ئیفلیجانەی پێ دەکرێ.

سا پایە بەرزی بۆ خوای میهرەبان، هیچ دەردێکی بەبێ دەرمان نەناردوە.

## دۆسـتانی خـوا کـەرامـەتدارن

فەرمو ئەوە (سیلە)ی کوڕی (ئوشـەیم) یـەکێ بـو لەوانـەی هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوای بینیبو - درودو سڵاوی خـوای لەسـەر کەسێکی لـە خـوا تـرسو دنیـا بـە کـەم گربو:

لە پێناوی تێکۆشان لە ڕێی خوا بەرەو باکور دەکەوێتە ڕێ، شەوی بەسەر دادێ بە مەبەستی نوێژکردن بەرەو دارستانێك دەڕواو، دەچێتە نـاو درەختـەکانو دەسـتنوێژ دەگرێو، دەستدەکا بە نوێژ، شێرێك زۆر بەتاو شاڵاوی بۆ دێنێ، لێی نزیك دەبێتەوە ئەویش لەناو نوێژدایە، لە دەوری دەخولێتەوە، (سیلە)ی کوڕی (ئوشـەیم) دو ڕکـات دەکا ئەوسا سڵاو دەداتەوە، دوای ئـەوە بـە شـێرەکە دەڵـێ: ئەگـەر فـەرمانت پێکـراوە فەرمو وەرە بم خۆ، ئەگەرنا وازم لێبێنـە بـا لـە پـەروەردگارم وەپاڕێمـەوە. شـێرەکە وازی لە (سیلە) هێنا بۆخۆی نوێژ بکا، کلکی شۆڕکردو ئەوێی بەجێهێشت.

دەشتوانی کتـێبی (البدایـة والنهایـة)و جگـە لـەویش لـە کتێبـەکانی مێـژو سـەرنج بـدەی، لـە نوسـراوو ژیاننامـەی هاوەڵانـدا سەرگوزەشـتەی (سـەفینە)ی خزمـەتکاری پێغەمبـەری خـوا - درودو سـڵاوی خـوای لەسـەر - باسـکراوە، کـە بـەخۆیو چـەند هاوەڵێکی لە کەناری دەریاوە دێن، کاتێ ڕێیان دەکەوێتە بیابان لە پڕێکا شێرێك بـە گـوڕ بـەرەو ڕویـان دێ پـەلاماریان بـدا، (سـەفینە) گـوتی: ئـەی شـێر مـن هـاوەڵو خزمەتکاری پێغەمبەری خوامو، ئەوانەش هاوڕێی منن ناتوانی زیانمان پێبگەیـەنی. شێر پشتی هەڵکردو هەڵات، نەڕەیێکی لێوە هات نزیك بو ئەو ناوەی پڕکا.

تەنیا کەسێکی نەسەلێن سەرپێچی لـەو داسـتانو ڕوداوە دەکـا، ئـەگینا سـوننەتو دانـانی خـوا لـە دروسـت کراوەکانیـدا شـایەتی بـۆ ئـەم ڕاسـتیە دەدەن، ئەگـەر لەبـەر درێژەکێشان نەبوایە دەیەها داستانی ڕاستەقینەم لـەو ڕوداوانـە ڕیـز دەکـردن، بـەڵام ئەوەنـدە گوتـارە کـەڵکت پـێبگەیـەنێ بەسـە بۆئـەوەی دڵنیـات بکـا، پـەروەردەکارێکی لێزانو پێـزان هەیـە هەموپـەناو پەسـیوێك بـۆوی ناپەنایـە. بێگومـان زانیـاریو پـێ ئاگاداریو، میهروسۆزو بەسەر ڕاگەیشتنی خوای بێ هـاودەمو هاوتـا، بەسـەر خـەڵکی ڕادەگا: ﴿ ... مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ... هەتا سێ کەس بەیەکەوە چی بکـەن، دیارە ئـەو چوارەمینیانەو پێـنج بـن ئـەو شەشـەمییانەو کـەمتر بـنو زێـدە تـر بـن، لەهەر کوێ بن، ئەو هەمیشە دەگەڵیانە. ﴿٧﴾ المجادلة ﴾.

## ئەوەنده بەسه، خوا شایەدو پشتو پەنا بێ

بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا دەگێڕێتەوە: پیاوێ لە (بەنی ئیسرائیل) داوا لە پیاوێکی تر دەکا هەزار دیناری بە قەرز پێ بدا، کابرا دەڵێ: شایەدت هەیە؟ ئەویش دەڵێ: تەنیا خوا شایەدمە. دەڵێ: هیچ پشت بەستێکت هەیە؟

ئەویش گوتی: جگە لە خوا کەسێ نیە پشتی پێببەستم. ئەویش گوتی بەسە خوا پشتگیرت بێ. دوای ئەوە هەزار دینارەکەی پێدا، (بەنی ئیسرائیلی)یەکە ڕۆیی‌و ماوەو کاتێکیان دیاریکرد (بۆ گێڕانەوەی قەرزەکە)، چەمێکیشیان لەنێواندا هەبوە، لەوکاتەی ماوەی قەرزەکە هەلات، کابرا هات پارەکە بۆ خاوەنی بگێڕێتەوە، لەسەر لێواری چەمەکە چاوەڕێ بو بەلەمێك بێت لەگەڵیدا سواربێ هیچ بەلەمێکی دەستنەکەوت، شەوی بەسەردا هات‌و ماوەیەکی زۆر چاوەڕێی بو، کەسێ نەبو لەگەڵیدا سواربێ، گوتی: خوایە ئەو کابرایە داوای شایەدی لێکردم جگە لەتۆ کەسێ ترم دەستنەکەوت، داوای پشتگیرێکی لێکردم، جگە لەتۆ کەسێ ترم دەستنەکەوت، خوایە ئەو پەیامەی منی پێ بگەیەنە. دوای ئەوە دارێکی هێناو هەڵی کۆڵی، پارەکەی لەگەڵ نامەیەکدا خستە ناوو فڕێی دایە ناو چەمەکە، بە یارمەتی‌و کۆمەکی‌و میهری خوای بەرزو بێهاوتا دارەکە بە ئاودا ڕۆیی، کابرای خاوەن پارەکەش لەو بەرەوە وەستا بو چاوەڕوانی گێڕانەوەی قەرزەکە بو، چەندی چاوەڕێ بو کەسێ بەدیارنەکەوت، گوتی: جا بۆچی هەندێ دار بۆ سوتان نەبەمەوە ماڵ؟! گەیشتە ئەو دارەی پارەکەی لەناو دابو، دارەکەی دەستدایێ‌و بردیەوە ماڵ، شکاندی دەبینێ پارەکەو نامەیەکی تێدایە.

چونکێ شایەدەکە یارمەتیدا پاکی‌و گەورەیی بۆ ئەو، پشتگیرەکە بەڵێنی بەجێگەیاند، شکۆداری‌و پایە بەرزی بۆ ئەو.

﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ... ئەوانەش کە خوا بە پشتیوان دەزانن، با خۆیان بدەنە دەس خوا. (١١) إبراهيم﴾.

﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ... ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەیە، خۆتان بە خودا بسپێرن. (٢٣) المائدة﴾.

## با خۆراکت حەڵاڵ بێ نزاکەت گیرا دەبێ

(سەعد)ی کوڕی (ئەبی وەقاس) کە یەکێکە لەو دە کەسەی مزگێنی بەهەشتیان پێدراوە، دەرگی بەو ڕاستیە کرد، پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر نزای بۆکرد دەستی لە وەشاندن ڕاست بێ‌و نزای گیرا بێ، ئینجا ئەگەر نزای بکردایە هەروەکو بەیانی دادێ ئاوا نزاکەی گیرا دەبو.

عومەری کوڕی خەتاب - خوای لێ ڕازی بێت - چەند هاوەڵێکی نارده کوفە، تاوەکو لەمەڕ دادوەری (سەعد)ی کوڕی (ئەبی وەقاس) پرسیار بکەن، خەڵك بە چاکە لێی دوان، کاتێ هاتنە مزگەوتێکی تیرەی (بەنی عەبەس)، پیاوێ هەڵسایەوە گوتی: بۆ دەربارەی (سەعد) پرسیار لە من ناکەن؟ ئەو یەکسانی‌و دادوەری لە نێوان خەڵکیدا نانوێنێ‌و، لەناو خەڵکی خۆیدا ناگوزەرێنێ.

(سەعد) گوتی: ئەی خوایە ئەگەر ئەو کابرایە بۆ ڕوپامایی‌و خۆدەرخستن هەستاوەتەوە چاوی کوێرکەیی‌و، تەمەنی درێژکەی‌و، دوچاری دەردو بەڵایکەی. کابرا تەمەنی درێژ بو، بڕۆی بەسەر چاواندا شۆڕبوبونەوە، وایلێهات لە کۆڵانەکانی کوفە پەلی ئەکوتاو خۆی بە دیوارەکانەوە دەگرت، دەیگوت: پیرێکی بەر بەڵام‌و، نزای (سەعد)م لێگیرا بو.

ئەوەیان پەیوەندی هەبونە لەگەڵ خوای بەرزو توانا، دڵنیابونە بە وادەو بەڵێنی‌و، ڕاستکردنە لەگەڵیدا، بەرزو دەستە باڵایە ئەو خوایە، پەروەرێنی جیهانە. بە هەمان شێوە لە کتێبی (سیر اعلام النبلاء)دا لەمەڕ (سەعد) هاتوە: پیاوێك هەڵسا جوێنی بە (عەلی)دا - خوای لێ ڕازی بێت- (سەعد) بەرگری لە (عەلی) کردو، پیاوەکەش لەسەر وتەی ناشیرن‌و جوێندان بەردەوام بو، (سەعد) گوتی: خوایە تۆ لە جیاتی من بە فریای بگەی بەوەی حەز دەکەی. وشترێك لە کوفەوە بە خێرایی هات، خۆی خزاندە ناو خەڵك‌و گوێی بە هیچ شتێ نەئەدا، هەتا گەیشتە کابرا، پاشان لە بەردەم‌و لەبەرچاوی خەڵك بە سمەکانی پێی داکێشا هەتا کوشتی.

﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ... بێگومانە ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوە، لە ژیانی ئەم دنیایـەداو لـەو ڕۆژەشدا کە شایەتان ڕاست دەبنەوە، یاری دەکەین. (٥١) غافر ﴾.

منیش ئەو سەرگوزەشتانە بۆیە بۆ تۆ دەگێڕمەوە، تاوەکو لە ئاستی وادەو بـەڵێنی پەروەرێنتـدا بیروبـاوەڕت پتـەوتر بـێ، لێـی وەپـاڕێیو هـاواری بـۆ بکـەی، دڵنیـابی ئاوڕلێدانـەوەی ئـەو ئاوڕلێدانەوەیـە، -پـاكو بێگـەردی بـۆ ئـەو- ئـەویش لـە کتێبـە پیرۆزەکەیـدا فـەرمانت پـێ دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ... لـە بـەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم. (٦٠) غافر ﴾.

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ ... هــــەر کـاتێکی عەبـدەکانم لـە مـەڕ مـن لـە تـۆ دەپرسـن، مـن نـزیکم، هـەر کـەس هانـام وەبەربێنێ، بێ وەرامی ناهێڵمەوە. (١٨٦) البقرة ﴾.

(حـەجاج) بـانگی (حەسـەن)ی بەسـرایی کـرد بـۆ ئـەوەی ئـازاری بـدا، (حەسـەن) بەرێکەوتو، تەنیا لە هانا هاتنو ئاوڕلێدانەوەو دڵنیابون بە وادەو بەڵێنی خـوای لـە دڵدا بو، هانای بـۆ پـەروەردیاری هێنـاو، بـە نـاوە بـەرزو پیرۆزەکـانی لێـی پاڕایـەوەو هاواری بۆ کرد، خوا ویستو نیازی (حەجاج)ی کۆڕیو، ترسو لەرزی خـستە دڵـەوە، هێـشتا (حەسـەن) هـەر لـە ڕێ بـو (حـەجاج) خـۆی ئامـادە کردبـو پێـشوازی لێبکـا، (حەجاج) لەبەر دەرگا ڕاوەستاو، پێشوازی لە (حەسەن) کـردو، لەگـەڵ خـۆی لەسـەر تەختی داناو، بە نەرمو نیانی لەگەڵی دواو بە سۆزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کـردو، بۆنی خۆشی لە ڕیشیدا!!

ئەو مل پێ کەچکردنەش تەنیا لە دەستی پەروەردگاری شـکۆدارو دەستە باڵایە.

بێگومان میهرو سۆزی خوا بە هەمو جیهاندا دەگەڕێ، جیهـانی مرۆڤـ و، ئـاژەڵو، دەریاو وشکانیو، بە گیانو بێ گیانو، شەوو ڕۆژی گرتۆتەوە، ﴿ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَـٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ... هـەمو شـتێك - بـە سوپاسـەوە-

پاکانەی ئەو دەکا، بەڵام ئێوە پاکانەی ئەوان نابیسن ئەو لەسەرخۆو بە بوردنە. ﴿الإسراء ٤٤﴾.

ئەم هەواڵە بەڕاستی هاتوە: کە (سولەیمان) پێغەمبەر -سلاوی خوای لەسەر- بەهرەی تێگەیشتن لە زمانی باڵندەی پێ درابو، بە مەبەستی نوێژە بارانە خەڵکی لەگەڵ خۆیدا دەباتە دەرێ، لەو کاتەی لە ماڵەوە بەرەو جێی نوێژ دەڕۆیشت بینی مێرولەیەك دو پێیەکانی بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان لە پەروەرندەی بە توانا دەپاڕێتەوە داوا لەو خوایە دەکا دەبەخشێو خەڵات دەکا، میهرو سۆزی دەنوێنێو لە هانا دێ، (سولەیمان) فەرموی: ئەی خەڵکان بگەڕێنەوە نزاو پاڕانەوەی غەیری ئێوە بەستانە.

بە نزای ئەو مێرولەیە بارانە دارژا، ئەو مێرولەیەی (سولەیمان) - سلاوی خوای لەسەر - لە قسەی حاڵی بو، لە کاتێکا سوپای بێ شوماری بە دوای خۆی دادەکێشا، مێرو لە ئامۆژیاری خوشکانی دەکا لە جیهانی مێرولەدا: ﴿... قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ...﴾ مێرۆچەیەك مێرولەکانی دەنگدا: بچنەوە ناو کونەکان و! تا سولەیمانو لەشکری -بەبێ ئەوەی پێ بحەسین- دەبەر پێ یانودانەبەن، ئیتر کە ئەو ئەمانەی گوت (سولەیمان) بزەی هاتێ. ﴿النمل ١٩﴾.

زۆرجاران بەزەیی‌و ئاوڕلێدانەوەی خوای بێ هاودەمو هاوتا بە سای ئەو جرو جانەوەرە دێتە ئاراوە.

(ئەبو یەعلی) ئەسەرێکی قودسی دەگێڕێتەوە کە خوا دەفەرموێ: "سوێند بە دەسەلاتو گەورەیی خۆم، ئەگەر پیری پشت چەماوەو، منالی شیرە خۆرەو، ئاژەڵی گیاخۆر نەبوایە، دڵۆپەی ئاسمانم لێ دەگرتنەوە".

## هەمو شتێ بە ستایشەوە پاكانەی پەروەرێنی دەنوێنێ[882]

لە جیهانی باڵندەدا پەپو سلێمانە پەروەرندەی خۆی دەناسی، بۆ خوای خۆی ملی کەچ کرد، بۆ دروستکاری سەری دانەواند، خوای بەرزو توانا دەربارەی (سولەیمان) دەفەرموێ: ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ... (سولەیمان) چاوی بە مەلاندا گێڕا، گوتی: چۆنە پەپۆ سلێمانە نابینم، ئاخۆ خۆی دزیوەتەوە؟ لەسەر ئەمە دەبێ سزای زۆری پێ بدەم، یان ملی هەڵدەقرتێنم، یان بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ من بێنێ. ماوەیێ زۆری نەخەیاند، هاتو وتی: من شتێکم دەسکەوتوە کە دەستەتۆ نەکەوتبو، وا من لە سەباوە هاتوم، دەنگو باسێکی دروستم بۆ هێناوی. من لەوێ ژنێکم دیوە پاشایە بە سەریانەوەو خاوەنی هەمو شتێکەو تەختێکی زۆر گەورەی هەیە. دیتم کە خۆیو هۆزەکەی -بێجگە لە خودا- سوژدە دەبەنە بەر خۆرو شەیتان کردەوەکانی بۆ خەملاندون‌و ڕێگەی هەڵەی نیشان داون‌و ڕێ دەرناکەن. ﴿وەی کردوە﴾ سوژدە بۆ خودایەك نەبەن کە پێواری ناو ئاسمانەکان‌و زەوی ئاشکرا دەکاو، چی وەیشێرن‌و هەر چییێکی ئاشکرای بکەن، ئەو دەیزانێ. ئەو خودایەی کە

---

882) ئاماژەیە بەو ئایەتە: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ ...﴿٤٤﴾ الإسراء﴾.

لەو بە دەر هیچ شت بۆ پەرستن نابێ‌و ئەو پەروەرێنی تەختی هەرە مەزنە. گوتی: بەم زوانە دەڕوانین تا بزانین بە ڕاستت بو، یان تۆش هەر لە درۆزنانی. ئەم نامەیان بۆ بەرەو بۆیان باوێژەو ئەوسا تۆزێك دورکەوەو بنوارە وەڵامیان چیە؟ ﴿٢٨﴾ النمل ﴾.

پەپۆ سلیمانە ڕۆیشت‌و، ئەم داستانە دورو درێژەش ڕویداو، ئەو دەرەنجامە مێژویەشی لێ کەوتەوە، هۆی ئەم ڕوداوەش ئەو باڵندەیە بو پەروەردگاری خۆی ناسی، هەتا هەندێ لە زانایان دەڵێن: سەیرە! پەپۆ سلێمان لە فیرعەون ژیرو داناتر بو، لەبەرئەوەی فیرعەون لە هێمناییدا بێ باوەڕ بو لە تەنگانەدا باوەڕهێنانی دادی نەدا، کەچی پەپۆ سلێمانە لە هێورەییدا باوەڕدار بو، ئەوسا لە تەنگانەدا باوەڕەکەی بە کەڵکی هات.

پەپۆ سلێمان گوتی: ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ ... ﴾وەی کردوە﴿ سوژدە بۆ خودایەك نەبەن کە پەنهانی ناو ئاسمانەکان‌و زەوی ئاشکرا دەکا. ﴿٢٥﴾ النمل ﴾.

فیرعەونیش گوتی: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي ... ﴾ئەی دیوەخان نشینەکان!﴿ وا نازانم غەیر لە من خوایەکتان هەبێ. ﴿٣٨﴾ القصص ﴾ .

کەسی بەدبەخت ئەو کەسەیە پەپۆ سلێمانە لەوی ژیرتر بێ‌و، مێرولە بۆ بەرژەوەندی خۆی وریاتر بێ.

کەسی کەودەن‌و مایەپوتیش ئەو کەسەیە ڕێگا چارەی ژیانی لێ تاریك بێ‌و، هیواو ئومێدی دابڕدابڕ بێ‌و، ئەندامەکانی سەبارەت بە سودگەیاندن لەکارکەوتو بێ، ﴿... لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ... دڵیان هەیەو پێی تێ ناگەن، چاویان هەیەو پێی نابینن، گوێیان هەیەو پێی نابیسن. ﴿١٧٩﴾ الأعراف ﴾.

لە جیهانی هەنگدا میهری خودا دەبینرێ‌و، بەهرەو خەڵاتی وەبەرچاوان دەکەوێ، کۆمەکی‌و هاریکاری خوا ئەو جانەوەرە چوکەڵەو کزو لاوازە دەگرێتەوە، بەوشێوەیە خوا دەستەمۆی کردوە لە شانەی خۆی دەردەچێ‌و، بەدوای ڕۆزیدا دەگەڕێ، تەنیا لەسەر شتی پاك‌و پاراو دەنیشێ، شەیداو ئەوینی گوڵانەو، شیلەیان لێ هەڵدەمژێ،

کاتێ دەگەڕێتەوە ئەو هەنگوینەی هەڵگرتوە لە جۆرەها ڕەنگ پێکهاتوەو چارەی دەردانی تیایە، لە گەڕانەوەیدا سەری لێناشێوێو، ڕێگای ون ناکا، شانەی خۆی پێ دەزانێو، خۆی دە شانەیەکی تر ناخا، ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ... خــــوا مێشەنگوینی ڕائەسپارد، کە: لە کێوانو دارانو ئەو شوێنی هەڵی دەبەستن، شوێنی ژینی خۆت هەڵبەستە. پاشان لە گشت بەروبوو بژێوت بمژە، ئیتر بە ملکەچی ڕێگەی ڕاهێنەری خۆت بگرەبەر. لە دەرونی شیلاوێکی هەمە ڕەنگە دێتەدەرێ، چارەی بۆ مەردم تێدایە، کە لەمەشدا بۆ کەسانێ ڕادەمێنن نیشانەیە. ﴿٦٩﴾ النحل ﴾ .

ئاسودەبونی تۆ بەو سەرگوزەشتەو داستانەو، پەند لێ وەرگرتنی لەوەدایە: دڵنیابی لە پەنهانەوە میهرو سۆزێك هەیە خاوەنەکەی خوایەکی تاكو تەنیایە، تاوەکو هەر لەوی بخوازیو، تەنیا داوا لەوی بکەیو، خێرو خۆشیش هەر لە دەروازەی ئومێدی ئەو چاوەڕێکەی، ئاواش حاڵی بی ئەرکێکی شەرعیت لەسەر شانە دانراوی خوای میهرەبانەو دابەزیوی ئاسمانە، ئەویش بریتییە لەوەی کڕنۆش بۆ خودا ببەی، سوپاسو ستایشی بکەی، کارو فەرمانی خۆتی بە تەما کەی، بە دڵەوە ڕوی خۆت لەو بکەی. پێویستە لەسەرت دڵنیا بی جگە لە خوا ئەو هەمو مرۆڤ گەلە، ئەو جیهانە زەبەلاحە، تۆزقاڵێك دادی تۆ نادەن، ئەوان خۆیان هەژارن، هەمویان ئاتاجی پەروەردگارن، هەر لە بەیانی تا ئێوارە ڕۆژیو بژێوی لەو دەخوازن، لەش ساخیو تەندروستیان، کامەرانیو ئاسودەیی یان، پلەو پایەو کەلوپەلیان، لەو خوایە داوا دەکەن، هەمو دروستکراوێ موڵکی ئەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ... ئەی خەڵکینە! ئێوە بە خودا ئاتاجن، هەر خودایە بێ نیازەو هێژایە پەسندی بدرێ. ﴿١٥﴾ فاطر ﴾.

لەسەرت پێویستە بەبێ گومانو دودڵی بزانی، تەنیا خودا سەرتدەخاو ڕێی ڕاستت نیشان ئەدا، دەتپارێزێو کاروبارت بەڕێ ئەبا، پارێزگاریت لێ ئەکاو خەڵاتت دەکا، لەسەرت پێویستە ڕوی دڵت تەنیا ئاراستەی ئەو بێ، پەروەرێن بە تاك بناسیو

پەرستشت هەر بۆ ئەو بێ، داواو خواستت هەر لە ئەو بێو، ئومێدیشت هەر بـە ئـەو بێ، لەسەریشت پێویستە ڕادەی ڕێزی مرۆڤ بناسیو، دڵنیـا بـی دروسـتکراو ئاتـاجی دروستکارە، ئەوەی دوایی دەبڕێ ئاتـاجی خوایـەکی هەمیـشە زینـدوە، هـەژارو نـەدار ئاتاجی خوای بێ نیازە، هێـزو توانـاو بێنیـازی دەسـەڵاتی ڕەهـاو هەمیـشە زینـدویی تەنیا شیاوی خوان. ئەگـەر ئـەوە تێگەیـشتی، ئەوسـا بـە سـای بەندایـەتیو خۆیـەك لاکردنەوە بۆ خواو، خۆ نزیك خستنەوە لە خوا بەختەوەری وەدەست بێنـە، ئەگـەر داوای لێبوردنت لێکرد لێت دەبورێ، ئەگەر بۆ لای گەڕایەوە وەرتدەگرێ، ئەگەر لێـی پاڕایەوە پێت دەبەخشێ، ئەگەر ڕۆزیـت لـێ داوا کـرد بـە شـت ئـەدرێ، ئەگـەر داوای پشت گیریت لێکرد پشتت دەگرێ، ئەگەریش سوپاست کرد پتـرت پێ ئەدرێ.

## بە خـوای بـەرزو توانـا قایـــل بـــە

((رضيت بالله ربا، وبالاسلام دينـا، وبمحمـد ﷺ نبيـًا... خـودام بـە پـەروەردیارو، ئیـسلامم بـە ئـایینو، (موحەممـەد) -درودو سـڵاوی خـوای لەسـەر- بـە پێغەمبـەر قەبوڵە)).

ئەو فەرمودەیە ئەوە لە ناوەخۆ دەگرێ، کە ڕەزامەندی لە پەروەرنـدەت بنوێنـێ -گەورەییو بێ وێنەیی بۆ ئەو- ئینجا بە یاساو بەرنامەی قایل بیو، لە قەزاوقـەدەری ڕازی بی، جا چ خۆشی بێ یا ناخۆشی، شیرین بێ یا تاڵو سوێری.

بێگومان ئەوە ڕاست نیە باوەڕ بە قەزاو قەدەر تـەنیا خۆشـیەکان بگرێتـەوە، بـەو شێوەی هەر لەو کاتە بە قەزاو قـەدەر قایل بـی کـە لەگـەڵ خواسـتو ئارەزوەکانتـدا یەك دەگرێتەوە، ڕوگرژو ناقایلیش بـی ئەگـەر بـەگوێرەی ویـستو ئـارەزوی تـۆ ڕوی نەدا، نابێ بەندە بەم شێوەیە مامەڵە بکا.

کەسانێ هەبون لە هێمنایيدا بە پەروەردەکاریان قایل بونو، لە کاتی دەردو بەڵاش ڕوگرژ بون، لەکاتی هەبوییدا ملکەچبونو لە تەنگانەو نەبونیدا لاسار بون، ﴿... فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ ۖ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةَ ... ئەگەر

چاکەیەکی توش هات، بەوە لە خوا دڵنیایە، ئەگەر بەڵاشی بەسەر دێ، بەرەو پاش دەگەڕێتەوە دنیاش و قیامەتیشی چو. ﴿١١﴾ الحج ﴾.

عەرەبە لادێیەکان موسڵمان دەبون، ئینجا ئەگەر لە کاتی موسڵمانەتییاندا خۆشییێك ڕوی تێ دەکردن وەکو باران بارین و، گیا شین بون و، شیر زۆر بون، دەیانگوت: ئەوە ئایینێکی خێردارە. دەستیان بە ئایینەوە دەگرت و مل کەچ دەبون. ئەگەر جگە لەمەیان هاتبایە پێش، وەکو وشکە ساڵی و، بێ بارانەیی و، بێ لەوەڕی و، هەژاری و نەداری، ئەوا بەرەو دواوە دەکشانەوەو، پشتیان لە پەیام و ئایینەکەیان هەڵدەگرد.

کەوایە ئەو موسڵمان بونە بۆ هەواو هەوەس ملکەچ بونە. چونکێ کەسانێ هەن سەبارەت بەوە لە خوای بەرزو بێ هاوتایان قایلن، لای خوا هەڵدەبژێرن، تەنیا ڕەزامەندی ئەویان گەرەکەو، چاویان لە پاداشت و خەڵاتی ئەوەو، هەوڵ و گەڕیان بۆ دوارۆژە.

لە ڕاستیدا کەسێ خوا بۆ بەندایەتی هەڵی بژێرێ و، بۆ خزمەت و سود گەیاندن بە موسڵمانان ڕێزی لێبنێ و جیای کاتەوە، لەگەڵ ئەوەی بەو هەڵبژاردن و جیاکردنەوەو ڕێزلێنانە قایل نەبێ، شیاوە بەوەی تا هەتایە لەناوبچێ و، ببڕای ببڕ تێبچێ: ﴿... ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ... نیشانەکانی خۆمان پێ بەخشی بو، خۆی لێبواردن، ئەوسا شەیتان وە دوی خۆی دواکەوتە ناو ڕێزی گومڕایان. ﴿١٧٥﴾ الأعراف ﴾.

﴿ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ... ئەگەر خودا بیزانیبا خێرێکیان دەباراندایە، کارێکی دەکرد ببیسن. خۆ ئەگەر گوێ بیستنیشی پێ بدا بان، هەر ڕویان لێ وەردەگێڕاو خۆیان دەبوارد. ﴿٢٣﴾ الأنفال ﴾ .

بێگومان ڕەزامەندی دەروازەی گەورەترین دێنداریە، ئەوانەی لە پەروەرێنیان نزیك دەکەونەوە، بە ڕێنمایی خوا دڵ شادن، بۆ فەرمانی ملکەچن، بۆ یاساو بەرنامەی گوێڕایەڵن، لەو دەروازەیە دەردەچن. پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - ماڵ و دەستکەوتی شەڕی (حونەین)ی دابەش کرد، بڕێکی زۆری دایە موسڵمانە دواییەکان و سەرکردە عەرەبەکان، هیچی نەدا بە یاریدەدەران، چونکێ

دەیزانی ئەوان ڕەزامەندیو دڵنیاییو باوەڕو فەڕو چاکەی زۆریان لەدڵدا هەیە، هەروەکو بلێی گازاندەیان کرد چونکو لە مەبەستەکە ئاگادار نەبون، ئینجا پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر - کۆیکردنەوەو نهێنی ئەم کارەی بۆ ڕون کردنەوە، هەواڵی پێدان خۆی لەگەڵ ئەوانەو خۆشی ئەوێن، هەر لەبەر ئەوەش ئەو ماڵەی داوەتە ئەو کەسانە دڵیان بۆ ئیسلام ڕابکێشێ، چونکی باوەڕیان تەواو دانەسەپاوە، بەلام بە یاریدەدەرانی فەرمو: ((**اما ترضون ان ينطلق الناس بالشاء و البعير، وتنطلقون برسول الله ﷺ الى رحالكم؟! الانصار شعار، والناس دثار، رحم الله الانصار، وابناء الانصار، وابناء الانصار، لو سلك الناس شعبا وادياً، وسلك الانصار شعبا وادياً لسلكت وادي الانصار و شِعْب الانصار**... بەوە قایل نین خەڵکان مەڕو وشتریان لەگەڵە خۆیان دەبەنەوە، ئێوەش پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر - بۆ ماڵی خۆتان دەبەنەوە؟! ئەنساریەکان دروشمن، خەڵکانی تر پەڕۆی سەر دروشمن، خوا سۆزی بۆ ئەنساریەکان، ڕۆڵەکانیانو، کوڕی کوڕەکانیان بنوێنێ، ئەگەر خەڵکان شیوو دۆلاییك بگرنەبەرو، ئەنساریەکانیش شیوو دۆلاییێك بگرنە بەر من ئەو شیو دۆلایی یەی ئەنساریەکان دەگرمە بەر.

ئەوسا خۆشیو شادی دای پۆشینو، ناخی پرکردن، ئارامیان بەسەر دارژاوە، ڕەزامەندی خواو، پێغەمبەری خوایان وەدەست هێنا - درودو سلاوی خوای لەسەر -. ئەوانەی ڕەزامەندی خوایان گەرەکەو، شەیدای بەهەشتێکن پانتاییەکەی بە قەد ئاسمانەکانو زەمینە، ئەگەر بێو لە پێی ئەو ڕەزامەندیەو، لە بری ئەو بەخششو خەلاتە بێ وێنەیە دنیایان سەر لەبەری پێ بدرێ قەبوڵیان نیە.

عەرەبێکی دەشتەکی لەبەردەستی پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر — موسلمان بو، پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر - هەندێ ماڵی پێدا، ئەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من لەسەر ئەوە پەیمانم بە تۆ نەداوە.

پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- فەرموی: ((**علی ماذا بیعتني؟**... ئاخۆ لەسەر چی پەیمانت پێ داوم؟

گوتی: لەسەر ئەوە پەیمانم پێداوی تیرێك بە تیژی بەرەو ڕوم بێ بە ئێرەم کەوێ (ئاماژەی بۆ گەردنی کرد) ئەلێرەش دەربچێ (ئاماژەی پشتی ملی کرد).

پێی فەرمو: ((**إن تصدق الله يصدقك**... ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاست بکەی ئەویش بۆت جێبەجێ دەکا. شەڕ داگیرسا تیرێك بە تیژی بەرەو ڕوی هاتو دای لە گەردنی، بە پەروەردگاری شادبۆوە ئەو لە خوا ڕازی بو خواش لەوی ڕازی بو.

جارێکی تریشیان هەندێ سامانی دابەش کرد -درودو سلاوی خوای لەسەر- دایە ئەوانەی دین کرچو باوەڕ کاڵ بون، لە جیهانی چاکەکاریدا تەنك دەست بون، نەیدا بە کەسانێ شمشێریان لە ڕێی خوادا کوڵ بون، ماڵو سامانیان کردە قوربانیو، لە پێناوی جیهادو بەرگری کردن لە ڕێی ئیسلاما زامدار بون، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر - لەناو مزگەوتا هەڵسایەوەو وتارێکی بۆ خوێندنەوەو، مەسەلەکەی ڕۆشن کردەوە، پێی وتن: ((**اني اعطي اناساً جعل الله في قلوبهم من الجزع والطمع، وادع اناساً لما جعل الله في قلوبهم من الايمان -أو الخير- منهم: عمرو بن تغلب**... بۆیە بە هەندێ کەسم بەخشیوە چونکێ خوا بێئارامیو چاوبرسێتی خستۆتە دڵیانەوە، بەشی کەسانێکیشم نەداوە چونکێ خوا باوەڕ - یاخود چاکەی- خستۆتە دڵیانەوە، (عەمر)ی کوڕی (تەغلیب) یەکێکە لەوانە)).

ئەوسا (عەمر)ی کوڕی (تەغلیب) دەڵێ: ئەو وتەیەم ئەوەندە لا خۆش بو حەزم نەئەکرد بە دنیاو ئەوەی تیایەتی بیگۆڕمەوە.

بە ڕاستی ئەوە ڕازی بونە بە خوای بەرزو توانا، هەڵبژاردنی خەڵاتی خوایەو، قایل بونە بە بڕیاری پێغەمبەری خوا - درودو سلاوی خوای لەسەر - بێگومان لە لای هاوەڵێك دنیا بارتەقای وتەیەکی خۆشی پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- نرخی نیە.

گومان لەوەدا نیە پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- وا دەو بەڵێنی کۆشكو تەلارو، ناوچەو هەرێمو، باخو گوڵشەنی بە هیچ کام لە هاوەڵانی نەدا، بەڵکە پێغەمبەری خوا درودو سلاوی خوای لەسەر- بەڵێنی ڕەزامەندیو، بەهەشتو خەڵاتێکی نەبڕاوەی بە یاوەرانی ئەدا. پێی دەفەرمون: کێ ئەم کارە ئەنجام ئەداو بەهەشتی بۆ هەبێ؟

بە یەکێ تری دەفەرمو: ئەو هاوڕێی من بێ لە بەهەشتا؟ چونکێ ئەو سامانەی ئەوان بەخشییان؟ ئەو ئەشکەنجەو ڕەنجەی کێشایان، ئەو کردو کۆشەی پێش کەشیان کرد، تەنیا لە دوا ڕۆژا وەلامی ئەدرێتەوە، سەبارەت بەوەی دنیاو ئەوەی تیایەتی بەرابەر ئەو هەوڵە بێ وێنەیەی پێ ناکرێ، چونکێ بێ نرخو بێ بایەخە، بێ سەنگو بێ بەهایە.

(تیرموزی) دەگێڕێتەوە: کە (عومەر) -خوای لێ ڕازی بێت- داوا لە پێغەمبەری خوا دەکا - درودو سلاوی خوای لەسەر– ڕێگای پێ بدا بچێ عومرە بێنێتەوە، ئەویش پێی دەفەرموێ: ((لا تنسنا من دعائك يا اخي... ئەی براله، لە نزاکردنتدا لە بیرمان نەکەی.

ئەوەی ئەو قسەی کرد پێغەمبەری ڕێنماکارە - درودو سلاوی خوای لەسەر-، ئەو پێشەوایە بێ گوناهەیە لا پرەسەنی [883] قسە ناکا، وەلێ ئەو دەستەواژەیە، پەیڤێکی بە سەنگو پڕ بایەخو بێ وێنەیە، دوا بەدوای ئەوە (عومەر) گوتی: ئەوە وشەیەکە بە دنیاو ئەوەی تیایەتی نایگۆڕمەوە.

دەی تۆش بوار بەخۆت بدە بیرکەیتەوە، کە پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- بە تۆ بڵێ: براله، لە نزاکردنتدا لە بیرمان مەکە:

ئەو ڕەزامەندیەی پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- بەرامبەر پەروەرێنی نواند لە باسو لێدوانی خەڵکان زۆڕاتر بو، ئەو بە هەبویی‌و نەبویی قایل بو، لە شەڕو لە ئاشتیدا قایل بو، لەکاتی دەسەڵاتو بێ دەسەڵاتیدا، لە تەندروستی‌و نەخۆشیدا، لە تەنگانەو هێمناییدا قایل بو.

تاڵی‌و سوێری‌و جەرگ سۆزی بێدایکو باوکاتی بینی ئەوسا قایل بو ئەوەندە هەژارو دەست تەنك بو لە جۆری خورمای خراپی تێر نەخوارد، لە تاوی برسێتی بەردی لەسەر سکی پێچا، ڕبە جۆیێکی لە جولەکەیێ بە قەرز وەرگرتبو زرێیەکەی بە بارمتە لەلا دانا بو، لەسەر حەسیر دەخەوتو شوێنی لە کەلەکەی دەرچوبو، سێ ڕۆژی بە سەرا تێپەڕیوە هیچ خۆراکێ نەبوە بیخوا، لەگەڵ ئەوەدا لە پەروەردگاری

---

٨٨٣) لە گۆترە/ لە خۆرە.

جیهان قایل بو: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا ... مەزنایەتی هەر بۆ کەسێ ئەگەر حەزکا لەوە چاترت دەداتێ: باغاتێکت پێ دەبەخشێ جۆباریان بە بەردا دەڕواو چەند کۆشکیشت بۆ دادەنێ. ﴿١٠﴾ الفرقان ﴾.

لە کاتێ ڕوبەڕوبونەوەی یەکەمدا، ئەو ڕۆژەی لەگەڵ کۆمەڵو دەستەی خوادا پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - لەلایەکەوە وەستا بو، هەمو دنیاش بە پیادەڕەوو سوارەوە، بە ماڵو سامانو خۆهەڵکێشانو تڕو فیزەوە لەلایەکی ترەوە وەستابونو دژایەتیان دەکرد، ئەوسا کەش لە خوای پەروەردیاری قایل بو.

لە ساتی تەنگانەدا، ئەو ڕۆژەی مامی مردو، (خەدیجە)ی هاوسەری کۆچی دوایی کرد، بە توندترین شێوە ئازاردرا، بە درۆزن لەقەڵەم درا، ئابرووشکۆی لەکەدار کرا، بەوجۆرەی پەیامی ڕاستیان دەشێواند، پێیان دەگوت: درۆزنە، سیحربازە، جادوگەرە، شاعیرە، شێتە، ئا لەو ساتەدا لە خوا ناڕەزایی نەنواند.

ئەو ڕۆژەی لە خاكو زێدی، لە یاریگاو، جێی گاڵتەوگەپی سەردەمی منالیو، هەڕەتی لاوێتی وەدەرنرا ڕوگرژو ناقایل نەبو، بەرەو مەککە ئاوڕی دایەوەو ئەسرین لە چاوی تکا، فەرموی: ((**إنك أحب بلاد الله إليّ، ولولا أن أهلك أخرجوني منك ما خرجت**... بەڕاستی تۆ بە لای منەوە خۆشەویسترین وڵاتی خوای، ئەگەر بهاتایەو خەڵکی تۆ منیان لە تۆوە دەرنەنابوایە، دەرناچوم. گازاندەی لە خوا نەکرد لەو ساتەی ناچار کرا مەککە جێبهێڵێو، بەرەو مەدینە بکەوێتە ڕێ، کە بە هەر لایێدا بڕۆیشتایە بەربەستیان لەڕێ دانا بو، بە وڵاخی سواری ڕاویان ئەنا.

ئەو کاتەی بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی بەرەو (تائیف) ڕۆیی، بە ناشیرینترینو خراپترین شێوە پێشوازیان لێکردو وەڵامیان داوە، ئەوەندە بەردی پێ داکێشرا هەتا خوێنی لێچۆڕا، ئەو جارەش لە خوای خۆی ناقایل نەبو. لە هەمو جێگاو شوێنێکدا، لە هەمو کاتو سەردەمێکدا لە پەروەرێنی بە گازاندە نەبو. لە جەنگی (ئوحود) سەری (پیرۆزی) قرنجا [٨٨٤]، ددانی (پیرۆزی) شکا، مامی کوژرا،

---

٨٨٤) قنجا / شكا / بریندار بو.

هاوەڵانی سەریان بڕا، سوپاکەی تێك شكێنرا، ئینجا دەیفەرمو: ((**صفّوا ورائي لاثني على ربّي**... لە دواوەوە ڕیز ببەستن تاوەکو ستایشی پەروەردگارم بکەم)).

بێباوەڕانی هاوبەش پەیداکەرو، جولەکەو دوڕوان لە دژی ئەو پەیمانیان بەست، ئەو نارەزایی لە پەروەردگاری دەرنەبڕیو، لە ڕویانـدا وەستاو، کارو فەرمانی دایە دەست خواو پشتی بە ئەو بەست.

پاداشتی لە خوا قایل بونی - درودو سلاوی خوای لەسەر - بوە مایەی خوا لێی قایل بونی: ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ... بەم زوانەش پەروەرندەت چاکەی وا هات دەگەڵ دەکا، ڕازی دەبی. ﴿٥﴾ الضحى ﴾.

## زایەڵەی[885] دۆڵی نەخلە[886]

پێغەمبەری بێ گوناه - درودو سلاوی خوای لەسەر - لەو مەککەیەدا، کە جێ ماڵو جێ حاڵی بو، جێی ڕۆڵەو خاكو ولاتی بو وەدەرنرا، شار وەدەرو هەترە کرا [887]، پەنای بۆ (تایف) برد لەوێ بە دڵ ڕەقیو بە درۆ زانین پێشوازیان لێکردو بەخێریان هێنا، بە ئازاردانو بەرد لێدان، بە وتەی نەشیاو جوێندان وەڵامیان داوە.

فرمێسکی خەمی لە چاوان دەتکا، پێیەکانی لە خوێنی پاکی هەڵچۆڕا، دڵی بە داخی ئەو مەرگەساتە دەسوۆژا [888]، پەنا بۆ کوێ ببا؟ لە کێ داوا بکا؟ سکالای بۆ کێ بکا؟ لای کێ ڕازی [889] خۆی بدرکێنێ؟ بۆ ئەو خوایە هانا دەبا فریادڕەسو دەسەڵاتدارە، بالادەستو هەرە زاڵە.

---

٨٨٥) چریکە/ هاوار.

٨٨٦) ناوی ئەو دۆڵایی یە بو پێغەمبەری خوا ﷺ نزای تێدا کرد.

٨٨٧) دەربەدەر کرا.

٨٨٨) دەسوتا.

٨٨٩) نهێنی.

پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - ڕوی لە ڕوگە[٨٩٠] کردو، خواستی ڕوەو خوا کردو، ستایشی پەروەرێنی کرد، چەند ڕستەو دەستەواژەیێکی بە جۆش‌و خرۆش‌و ڕاستگۆیانە لە دەمی پیرۆزی هەڵقوڵا، نزای کردو پاڕایەوە، مەزڵومیەت‌و مەینەتیەکەی بۆ خوا خۆی گێڕایەوە، پێیدا گرت‌و ئەسرینی لە چاون هەڵڕشت.

گوێ بگرە بۆ داواکەی پێغەمبەر - درودو سڵاوی خوای لەسەر - کە لە دۆڵی نەخلە زایەڵەی بۆ خوداوەندی پەروەرندەی هەڵدەبڕێ: ((**اللّهم إني أشكو إليك ضعف قوتي وقلة حيلتي وهواني على الناس، أنت أرحم الراحمين، ورب المستضعفين، وأنت ربي، إلى من تكلني؟ إلى قريب يتجهّمني، أو إلى عَدُو ملَّكته أمري، إن لم يكن بك عليَّ غضب فلا أبالي، غير ان عافيتك هي أوسع لي، أعوذ بنور وجهك الذي أشرقتْ له الظلمات، وصلح عليه أمر الدنيا والآخرة، أن ينزل بي غضبك، أو يحل بي سخطك، لك العتبى حتى ترضى، ولا حول ولا قوة الا بك...** پەروەردگارا، بێهێزی‌و کەمدەسەڵاتی‌و بەکەم سەیرکردنم لەلایەن خەڵکەوە بە تۆ ڕادەگەیەیێنم، تۆ میهرەبانترینی میهرەبانانی‌و، پەروەرگاری بێ چارانی و، پەروەردگاری منیشی، بە کێم دەسپێری؟ بە خزم‌و کەسێ ڕوی لە من گرژ کردوە، یا بە دوژمنێك کارو فەرمانی منت خستۆتە ژێر دەستی، ئەگەر تۆ لێم تورە نی باکم نیە، تەنیا ئەوەندە هەیە بەخشندەیی تۆم بۆ من فراوانترە، پەنا دەگرم بەو نورەی تۆ، کە تاریکیەکانی پێ ڕوناك بۆتەوەو، کارو فەرمانی دنیاو دوا ڕۆژی لەسەر دامەزراوە، لەوەی رقی تۆم بەسەردا بێتە خوارێ، یاخود تورەیی تۆ بمگرێتەوە، هەتا ئەڵێی بەسە ڕازی بون بۆ تۆ، هیچ هێزو توانایێکیش نیە مەگەر بە سای تۆ)).

---

٨٩٠) قیبلـە.

## چەند خەلاتێك بۆ كۆمەڵو دەستەی یەكەم

﴿لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ... ئەو دەستە خاوەن باوەڕەی كەوا لە ژێر دارەكەدا دەگەڵتا بونە هاوپەیمان، خودایان لێ ڕازی بوە، دەیزانی چیان لەدڵدایە. سا ئۆقرەو دڵنیایی نارده سەریانو بە سەركەوتنێكی نزیك پاداشی دان. ﴿١٨﴾ الفتح﴾.

ئەو ئامانجەی بڕواداران خواستویانەو، ئەوەی ڕاستگۆیان بە شوێنیدا وێڵ بوینەو، براوەو سەركەوتوان لەسەری سوربونە لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا گەورەترو بەرزترو، سودمەندو بەهەڕمێن تر نیە.

بێگومان ڕەزامەندی لە هەموئاواتو خواستێك زۆرڕاترو بڵندترە، لە هەمو بەهرەیەكیش بەهادارترە. دەبینین لێرەدا ئایەت دەربارەی ڕەزامەندی خوا دابەزیوە، كەچی لە شوێنێكی ترا باسی لێخۆشبون دەكا: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ... هەتا خودا لە هەڵەكانی پێشوتو لەو هەڵانەی لەوە بەولاوە توشیان دێی عافوت بكا چاوپۆشیت لێبكا. ﴿٢﴾ الفتح﴾.

لە جێگایەكی تر باس لە تۆبە دەكا: ﴿لَّقَد تَّابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ ... خوا لە پێغەمبەرو ئەوانەی دەربەدەرنو ئەوانەی یاریدەدەرن، خۆش بوە. ﴿١١٧﴾ التوبة﴾ .

لەلایەكی ترەوە باس لە چاوپۆشی دەكا: ﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ ... خوا بت بەخشێ بۆ چ ئیزنت دان؟ ﴿٤٣﴾ التوبة﴾.

بەڵام لێرەدا: چونكێ هاوەڵان لەژێر دارەكە پەیمانیان بە پێغەمبەری خوادا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - خوای گەورەش لە ڕازو نیازیان حاڵی بو، سەد دەرسەد

ڕەزامەنـدی خوایـان وەدەسـت هێنـا، ئـەوان لەسـەر ئـەوە پەیمانیانـدا ئـەو ڕۆحـە خۆشەویستەیان لە پێناوی ڕەزامەندی خوای ڕاستەقینەیان بەخت کەن، بۆ ئـەوە بـو ئـەو گیانـە بەنرخـەیان، ژیـان‌و بونیـان بـە ڕەزامەنـدی خـوای تاقانـە بفرۆشـن، دەیانەویست بمـرن بـۆ ئـەوەی پـەیامی خـوا بـژیێ، ئـەوان بکوژرێن تـاوەکو ئیـسلام بسەپێ، ئەوان بڕۆن بەرنامەی خوا بمێنێ.

خـوای گـەورە لـەو بیـروباوەڕە تونـدو تۆڵـەیان‌و، ئـەو نیـازو مەبەسـتە پـاك‌و پاراوەیـان حـاڵی بـو، لـە ڕاسـتیدا شـەکەت بـون‌و شـەونخونییان کـرد، تێنوبـون‌و بـە برسـێتی بـەڕێیان کـرد، ژیانیـان تـەنگ بـو دوچـاری دەردوبـەلا بـون، بەشـیان ئەشکەنجەو ئازار بو، بەڵام خوا لێیان ڕازی بو.

لە ڕاستیدا دەربەدەرو شاروەدەر بـون، ڕەنجیـان کێشاو، دوره وڵاتو شـەکەت بـون، وەلـێ خوایان لـێ قایل بو.

ماڵ‌و منال‌و سەروەت‌و سامان‌و خانوبـەرەیان بەجێهێشت، تـالایی لێکجیابونـەوەو دەربـەدەریان چەشـت، زەحمـەتی ڕێگـاو، کولەمـەرگی کۆچـبارییان بـینی، کەچـی ڕەزامەندی خوایان دەستەبەر کرد.

ئاخۆ خەلاتی ئەو تێکۆشەرو خۆبەختکارانە لە پێناوی ئەو دینەدا: مەڕو مـالات‌و وشتـرو گـا بو؟ ئـاخۆ دەسـتکەوتی ئـەو بـەرگری کـارو شۆڕشگێڕانە لـە پێنـاوی ئـەو پـەیام‌و بەرنامـەدا: کەلوپـەل‌و سـامان بـو؟ بـۆ پێـت وایـە گـڕی دەرونـی ئـەو چین‌و دەستە هەڵبژاردەو ناوازەیە، بە پارەو پولی بـێ نـرخ‌و کۆشـك‌و تـەلاری بـەرزو بـاخ‌و باخاتی بێوێنە دەکوژێتەوە؟ نەخێر.

ڕەزامەنـدی خـوا دەردی سـارێژ دەکـردن، لێبـوردنی خـوا ئاسـودەیی بەسـەردا دەڕژانـدن، ئـەو دەسـتەواژەیە، دەرونـی فێنـك دەکـردن: ﴿ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُوا۟ جَنَّةً وَحَرِيرًا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۖ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلَـٰلُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلًا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِـَٔانِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَا۟ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا ... چـونکە ئـەوان خـۆڕاگر بـون، لـە پاداشـا بەهەشـت‌و

حەریری پێدان. لە بەهەشتا لەسەر تەخت پاڵ ئەکەونو نە تینی تاوێ دەبینن، نە سەرمایێ. سێبەری درەختەکانی بەسەریانا شۆڕبونەوەو میوەکانیان لەبەردەستە. بە دەفری [٨٩١] زێو بە چەندین زەرکی [٨٩٢] مینا، بەسەریانەوە دەگەڕێن. زەرکی زێوین کەڕاس بە قاس سازیان داون. ﴿١٦﴾ الإنسان﴾.

## با ڕوخسارت گرژ نەبێ هەرچەندە تیشکی خۆرت لێ ونبێ

پیاوێك لە تیرەی (بەنی عەباس) کەسێکی دەوڵەمەند بو، خوای گەورە خاووخێزانو مەڕو ماڵاتو سامان گەلێکی پێ بەخشی بو، ئەو ماڵو منالە لە دێی (بەنی عەبەس) لە ناو کەندێك دا، لە خانو بەرەیەکی فراوان دا دەی گوزەراند، ڕۆژێ کابرا وشتری لێ بزر بو بە دوایدا دەگەڕا، هەتا وشترەکەی دۆزیەوەو گەڕایەوە سێ ڕۆژی پێ چو، ئەو ماڵو منالەی لەناو خۆشیو هەبوییدا جێهێلا، نە باوكو نە منالْ خەیاڵی ئەوەیان نەکرد کارەساتیان بەسەردێ.

گەورەو کچکە لێ خەوتبون، لە ماڵو حاڵێکی خۆشدا پاڵ کەوتبون، باوکەش بە دوای ونبوەکەدا دەگەڕێ، لە کۆتا شەودا خوای گەورە لافاوێکی بە لێشاوی بۆ ناردن، هیچ شتێ خۆی لەبەر نەدەگرت، قوڕو بەردی ڕادەماڵی، خانوبەرەی لە بناغەوە هەڵکێشا، هەمو ماڵو سامانو خاوو خێزانی لە بن هێنا، لەگەڵ شەپۆلی ئاو گیانیان لەدەستدا، دوای هەبونیان هەر ناویان ما، هەروەکو بڵێی نەبو بن وایان لێ هات، تەنیا لەسەر زمانی خەڵك ناویان دەهات.

دوای سێ ڕۆژان باوکە بەرەو دۆڵایی یەکە گەڕایەوە، گوێبیستی هیچ دەنگێ نەبو، هەستی بە بونی کەس نەکرد، نە زیندوێ، نە هاودەمێ نەهاو دەنگێ، جێگاو ڕێگا ئاساری لەسەر پاساری نەماوە، ئەی خوایە گیان!! ئای لەو مەرگەساتە بەرچاو ڕەشە!! نە کوڕە نە کچە نە ماڵە، نە بارگەو نوێنو خێزانە، نە پارەو پوڵ، نە مەڕو ماڵات، نە چێڵو چواڵ، هیچیان دەنگو ڕەنگی نیە، بە ڕاستی مەرگەساتە!! سەرباری

---

٨٩١) جام، قاپ.

٨٩٢) کوپە.

خەمانیش: یەکێ لە وشترەکانی هەڵات هەوڵیدا بیگرێتەوە دەستی بە کلکیەوە گرتو وشتر جوتەیەکی لەدەمو چاوی داو هەردو چاوی کوێر کرد، ئەویش لەو چولگەیەدا هاواری لێ هەڵسا بە ئومێدی ئەوەی یەکێ بە فریای بگا تاوەکو بەرەو شوێنێك دەستی بگرێو هەنسکێ بدا، دوای چەند ساتێك لەو رۆژەدا یەکێ گوێی لە هاواری بو، هاتە لایو دەستی کێشا، بردیە لای خەلیفە (وەلید)ی کوری (عبدالملك) لە دیمەشق، هەواڵی پێ راگەیاندو، ئەویش گوتی: حاڵت چۆنە؟ کابرا گوتی: لە خوای خۆم رازیم.

ئەو موسڵمانە، کە هەڵگری یەکتاپەرستی یەو هەڵوێستێکی ئاوا سەنگینو گرانبەها دەنوێنێ، بو بە پەندو ئامۆژ بۆ ئەوانەی دەیانەوێ پەندو ئامۆژیاری وەرگرن، پێشەنگە بۆ کەسانێ بەدوای راستیدا دەگەرێن، کە وشەیەکی ئاوا سەنگینو گران بەها دەردەبرێ. لە خوا رازیبونیش: شایەدە

ئەو کەسەی ملکەچو رامی دەستی قەدەر نابێ، ئەگەر حەز دەکا با ژێر کۆڵێك لە زەویدا لێبدا یا پەیژەیێ بە روی ئاسمان هەڵچنێ، ئەگەریش دەیەوێ: ﴿فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ ... با بە پەتێك خۆی هەڵواسێ تا دەخنکێ، دەبا بزانێ بەم فێڵە ئۆخەی دڵی دێ؟ (١٥) الحج﴾ .

## برِیـــاردان

﴿... فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ... وەختێ لێبرِای کارێ بکەی، هەر بەتەمای خوا تێبکەوە. (١٥٩) آل عمران﴾.

﴿... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ... خودا ئەوانەی خۆشدەوێ، کە خۆیان هەر بەو دەسپێرن. (١٥٩) آل عمران﴾.

زۆر کەس لە ئێمە لەکاتی برِیار دانا دوچاری نیگەرانیو دڵەراوکێ دەبن، سەرشێوانو شڵەژانو دڵاو دڵی دایاندەگرێ، لە ئەشکەنجەو دەردەسەرییێکی

بەردەوامدا بەسەر دەبەن. لەسەر بەندە پێویستە پرس‌و ڕا بکا، فەڕو چاکەی کارو پیشەی لە خـوا داوا بکـاو، کـەمێکیش بـیری لـێ‌بکاتەوە، جـا ئەگـەر ئـەو کاتەنیـەت‌و مەبەستی خۆی یەکلاکردەوەو دەستبەکار دەبێ‌و کـاتی پـرس‌و ڕا نامێنـێ‌و پـشت بـە خـوا دەبەسـتێ‌و هـەنگاو هەڵدێنێ، لـەپێناو نەهێـشتنی دڵـەڕاوکێ‌و نیگـەرانی خـۆی یەکلادەکاتەوەو سەقامگیـر دەبێ.

پشتی پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسـەر - کاتـێ لەسـەر بـەر زەك بـو، لەمەڕ جـەنگی (ئوحـود) پـرس‌و ڕای بـە هـاوەڵان کـرد، ئـەوانیش ڕایـان وا بـو بـچنە دەرێ، پێغەمبــەری خــوا - درودو ســڵاوی خــوای لەســەر - زرێیەکــەی کــردە بــەرو شمشێرەکەی هەڵگرت.

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەوانەیە تۆبزیمان لێکرد بی؟ ئەگەر حەز دەکەی لە ناو شار دەمێنینەوە. فەرموی: ((**ما کان لنبــيٍّ اذا لبس لأمته ان ینـزعها حتی یقضـي الله بینـــه و بیــن عـــدوّه...** هیچ پێغەمبەرێ بـۆی نیـە کاتـێ زرێیەکەی کردەبەری دایبنێتەوە هەتاوەکو خوا لە نێوانی ئەو دوژمنەکەیدا بڕیارێ نەدا)).

پێغەمبــەری خــوا - درودو ســڵاوی خــوای لەســەر - بڕیـاری لەشـار دەرچـونیدا. بێگومان مەسەلەکە پێویستی بە گومان‌و دودڵی نیە، بەڵکە پێویستی بە هـەنگاونان‌و پێداگرتن‌و دڵنیابون هەیە، لە ڕاستیدا جەربەزەیی‌و [٨٩٣] ئازایەتی‌و سـەرکردایەتی لـە بڕیاردانا فەراهـەم دێ.

پێغەمبـەری خـوا - درودو سـڵاوی خـوای لەسـەر - لەمـەڕ جـەنگی بـەدر ڕاپرسـی لەگەڵ هـاوەڵان کرد: ﴿... وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ ...﴾ لە کار تەگبیـریان پێ بکــە. ﴿١٥٩﴾ آل عمران ﴾.

﴿... وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ... (ئەوانەش کە): کار گەلێکیان بە ڕاوێژە. ﴿٣٨﴾ الشوری ﴾.

ئـەوانیش ڕای خۆیـان دەربـڕی، ئەوسـا پێغەمبــەری خـوا - درودو سـڵاوی خـوای لەسەر - بڕیاریداو هەنگاوی نا، بەلای هیچ شتێدا لای نەکردەوە. بێگومان دڵاو دڵـی

---

٨٩٣) بوتێری.

مایەی تێکدانی بۆچونو، سـاردو سـڕی تواناکـانو، خۆڕانـەگریو بـەزینو، تێشکان لە ڕێگاو، پەڕەوازە [٨٩٤] بونی هـەوڵەکانە.

ئـەو گومـانو دودڵییـە دەردێکـە تـەنیا ورە بـەرزیو خـۆڕاگریو پـێ هـەڵێنانی دەرمانە.

خەڵکانێ دەناسم ساڵانێکە سەبارەت بـە چـەند بڕیـارو مەسـەلەیەکی کـچکەو بـێ بایەخ هەنگاو دەنێنو دەکشێنەوە، من وای بۆ دەچم تەنیا ڤایرۆسی گومـانو دودڵیـە کاری لەوانو دەوروبەریشیان کـردوە. ئـەوان بـۆ خۆیـان ڕێگـا بـە تێـشکان نـشستی [٨٩٥] دەدەن گیانو ڕۆحیان پێی گرفتار بێ ئەوسا دوچاری هاتن، بۆ خۆیان ئاسـانکاری بـۆ پرشـوبڵاوبونی بیـرو هزریان دەکەن، بۆیە لێیان بو بە مێوان.

هەروەکو لە فەرمودەشا هـاتوە: ((**کالشـــاة العـــائرة بیـــن القطیعیـــن مـــن الغـــنم...** وەکو مەڕی نێوان دو مێگەلە نازانێ ڕەگەڵ کامەیان بکەوێ)).

ئەوان لە تەنگانەدا دەیانگوت: ﴿... لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ ... ئەگەر بن زانیبـا شەڕو بەسەردا سەپاوە، دیارە وەدوتان دەکەوتین. ﴿١٦٧﴾ آل عمران﴾.

ئەوان لەگەڵ خـواداو لەگـەڵ خۆشـیاندا درۆ دەکـەن، ئـەوان لـە تەنگانـەدا خۆیـان حەشار دەدا، لە هێمناییشدا خۆیان دەردەخـست، یـەکێکیان دەیگـوت: ﴿... ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ ... ئیزنمان بدە با نـەیەین، نەوەك توشی گوناهان بین. ﴿٤٩﴾ التوبة﴾.

ئـەو کەسـە تـەنیا بڕیـاری دۆڕانو دارمـانی دەدا. لـە شـەڕی (ئـەحزاب)یـشدا دەیانگـوت: ﴿... إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ ... کـەسمان لەسـەر ماڵـەکانمان دانـەناوە ئاگای لێبێ، ماڵیان بێ پارێزگار نەبو. ﴿١٣﴾ الأحزاب﴾.

بەڵکە تەنیا مەبەستیان ئەوە بو لە ترسی ئەرکی سەرشانیان هەڵبێنو لـە حـەقو ڕاستی خۆیان بدزنـەوە.

---

٨٩٤) پەرتەوازە بون.

٨٩٥) دۆڕان.

## وەکو چیا بە نەهەژێی

خۆگری و داسەپاوی، ورە بەرزی و نەلەخشاوی: لە سروشتی بڕوادارانە، ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ ... خاوەن باوەڕ ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەری هەیەو توشی دودڵی نەبون. ﴿١٥﴾ الحجرات﴾.

بەڵام دوڕوان: ﴿... فَهُمْ فِى رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ ... لە گومانی خۆیاندا هاتوچۆیانە. ﴿٤٥﴾ التوبة﴾.

ئەوان پەیمان و بەڵێن دەشکێنن، لە بڕیاردانیان دودڵن، ڕوەو دواوە پشت هەڵدەکەن.

ئەی مرۆڤ ئەگەر ڕاستی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوە، دڵت پتر بە لایێکدا چو، سودو کەڵکت لەوێوە چاوەڕوان کرد، لە سەرت پێویستە بێ دواکەوتن و دودڵی هەنگاو هەڵێنی.

پیاوێك لەمەڕ تەڵاقدانی ژنەکەی دودڵ بو ئەو ژنەی لە دو لاوە تاڵایی پێ هەڵدەچەشت، چوە لای کاراشنایێك حاڵی خۆی پێ ڕاگەیاند، پێی وت: چەند ساڵە لەگەڵ ئەو ژنەدا بەسەر دەبەی؟

گوتی: چوار ساڵە.

گوتی: چوار ساڵە ژەهرێ وەسەر دەکەی؟!

بەڵێ ڕاستە چاوەڕوانی و خۆڕاگری و ئارامگری دەبێ هەبێ، بەڵام تا کەی؟ کەسی زیتەل و زیرەك دەزانێ ئەو کارە چەندی لەبارە، دەشێ یا ناشێ، سەری بە کوێ دەگاو ئەنجامەکەی چ دەبێ، ئینجا با بڕیاری خۆی بدا.

لە ژیاننامەو لێکۆڵینەوەی باری خەڵکان ئەوە ڕوندەبێتەوە، کە سەر لێتێکچون و پەشۆکان لە زۆر لاوە دوچاری مرۆڤ دێ، بەڵام زۆربەی لەو چوار ڕێگایەوە دوچاری دێن:

<u>یەکەم:</u> لە خوێندنو هەڵبژاردنی بەشی تایبەتیدا، ماوەیەك هەروا دەمێنێتەوە نازانێ چ بەشێك ڕەچاوکا.

چەند قوتابیێ دەناسم سەبارەت بە ڕاڕایی یان لەمەڕ ڕەچاوکردنی کۆلێژو بەشەکان، ساڵانێکیان بەفیڕۆ داوە، هەیانە بەر لە تۆمارکردنی ناویان لەناو گوماندا ماونەتەوە، هەتاکو ئەو هەلەیان لەدەست داوە، کەسانێکیش هەن ساڵێك یادو ساڵ دەچنە بەشێکەوە، جاری یەکەم کۆلێژی (شەریعە)ی هەڵبژاردو پاشان دەچێتە کۆلێژی ئابوری، دوای ئەوە بۆ کۆلێژی (پزیشکی) دەچێ، بەو بینەو بگرەیە تەمەنی خۆی بەڕێ دەکا.

گەر بهاتایە لە سەرەتاوە پرسو ڕای بکردایەو کارەکەی هەڵسەنگاندایەو فەڕو چاکەی لە خوا بخواستایە، ئەوسا بێگومانو دودڵی دەستبەکار بوایە، کاتو تەمەنی دەپاراستو دەستەبەری دەکرد، ئەو بەشە تایبەتیەش، کە دەیەویست پێی دەگەیشت.

<u>دوەم:</u> لە کاری گونجاودا، هەیە نازانێ چ کرداری بۆ وی پەسندە، جارێکیان لەسەر کارێك دادەمەزرێ، پاشان جێی دەهێڵێو بەرەو کۆمپانیاییێك دەچێ، لەویش دەست هەڵدەگرێو، تەواو خۆی بۆ بازرگانی یەکلادەکاتەوە، دوای هەمو شتێ لە قەلو کۆتران دەبێو هەزاری ڕوی تێدەکا، دەچێتە ڕیزی بێکارانو لەماڵی خۆی پاڵ دەکەوێ.

منیش بەوانە دەڵێم: هەرکەسێ دەروازەی ڕۆزی لێکراوە با ئەو دەروازەیە بەرنەدا، چونکێ خوا ڕۆزی ئەوی خستۆتە ئەو شوێنە، هەرکەسێکیش دەرگایەکی گرتو بەری نەدا کار ئاسانیو خێرو خۆشی لەوێوە پێ دەگا.

<u>سێیەم:</u> لە هاوسەر هەڵبژاردندا، لە هەمو شتێ پتر کە گەنجان دوچاری سەر لێتێکچونو پەشۆکان دەکا سەبارەت بە دەست نیشانکردنی هاوسەرە، دەوروبەری ئەو گەنجەش بەشداری لە هەڵبژاردنەکەدا دەکەن، باوکە ژنێکی پێ پەسندە کوڕە حەزی پێ ناکا، یاخود دایکی نایهەوێ، لەوانەیە کوڕە بەدوای ئارەزوی باوکی بکەوێ، ئەوسا ئەوەی بۆخۆی دانابو نایێتە دیو، ئەوەی پێی ناخۆشەو حەزی پێناکا پێی گرفتار دەبێ.

ئامۆژگاریشم بۆ ئەوانە ئەوەیە، تەنیا ئەو هاوسەرەی لەڕوی دینو جوانیو خوڕەوشتی پێی حەساوەن، بەهاوسەری بگرن، چونکو مەسەلەی ژنهێنان بۆ ڕۆژەك و دو ڕۆژان نیە ڕێی تێناچێ سەرەڕۆیی و هەڵەشەیی تێدا بکرێ [٨٩٦].

چـوارەم: لە مەسەلەی تەلاق سەراسیمەیی و دڵاودڵی پەیدا دەبێ، جاری وایە لێکجیابونەوەی پێ چاکە، هەندێ جاریش پێکەوە ژیانی پێ باشە، ڕۆژێکی دێتە سەرێ دەستی لێ بەردا، ڕۆژێکی تر وا دەبینێ یەکجاری پەیوەندی بپچڕێنێ، ئینجا هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ چەندە ماندویێتی و شەکەتی گیانو ڕۆحیدا دەگرێ و بیرو هزری تێکدەچێ و، کاروباری ئاڵۆز دەبێ.

لە ڕاستیدا بەندە لەسەری پێویستە بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوە کۆتایی بە تەنگژەی دەرونی بێنێ، بێگومان خوا یەك تەمەنی داوە، ئەو ڕۆژە دوبارە نابێتەوە، ئەو کاتو ساتە جارێکی تر ناگەڕێتەوە، جا پێویستە ئەو ماوەیە بە ئاسودەیی بەڕێ بکا، بەدەستی خۆی هەوڵداو، ئەو بەختەوەریە بۆ خۆی دەستەبەر بکا، ئەم ئاسودەبونەش بە بڕیاردان دێتە ئاراوە. بەندەی موسڵمانیش ئەگەر دوای پرسو ڕاو داوای ویستە فەڕی لە خوا، نیەتی یەکلاکردەوەو بوێرانە بڕیاریداو پشتی بە خوا بەست، کەسێکی بوێرو وریای لێ دەردەچێ.

با هەنگاونانت وەکو تەوژمی شەپۆل بێ، ورەت وەکو تیخی شمشێر بێ، کۆڵنەدانت وەکو بەردەوامی ڕۆژگار بێ، ڕۆیشتنو دەرچونت وەکو دەرکەوتنی سپێدەی بەیان بێ، ﴿...فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ﴾ ... ئێوەش دەگەڵ شەریکانو کاری خۆتان بکەنە یەكو کارسازیەکی وەها بکەن هیچ دودڵی تێدا نەبێ. ئەوسا پەلامارم دەنو ماوەم مەدەن. (٧١) یونس ﴿.

---

٨٩٦) گوێ پێنەدانو گۆترەکاری تێدا بکرێ.

## چـی بچـێنی ئـەوی دەدوریـــەوە

سـەیر لـەوە دایـە ئێمـە دەمانـەوێ خـەڵك نـەرمونیان بـێ كەچـی خۆمـان ڕق ئەسـتورین، دەمانـەوێ ئـەوان دەسـتكراوە بـن كەچـی دەسـتی خۆمـان دەقوچـێنین، دەمانەوێ ئەوان دۆستایەتیو برایەتی بنوێنن كەچی خۆمان بێ هەڵوێستین.

گوتراویشـە: كـێ تەواو برای تۆیـە.

## بـاجـی وتــەی بریقـــەدار

بێگومـان بەختـەوەری ئێمـە لەوەدایـە، یەكـەم جـار ئـەركی سەرشـانمان بەرامبـەر دروستكارمانو، دوەم جاریش بەرامبەر دروستكراوەكانی جێبەجێ كەین، لەگەڵ خوا پاشـانیش لەگەڵ مرۆڤـدا ئەركی خۆمان بەجێ بێنین.

گومان لەوەدا نیە كە قسە بێدەسەڵاتەو هەمو كەس پێی دەوێرێو دەتوانێ فـاقو بریقـی پـێ بـدا، بـەڵام گـرانتر لـەوە ئەوەیـە لـە قـاڵبێكی زۆر جوانـدا دابڕێـژرێو كـردەوەی بـەرزو ڕەوشـتی نـاوازەی لەگەڵـدا نـەبێ، ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ... ئـاخۆ ئێـوە، كـە فـەرمان بـەو مەردمـە دەدەن چاكەی بكەن، خۆتانی لـێ هەڵداوێرنو هەر خۆشو كتێـب خوێنـەوەن؟ دەسا چیتانە تێ ناگەن؟ (٤٤) البقرة ﴾.

ئەو كەسەی فەرمان بە چاكە دەكاو خۆشی لێدەبوێرێ، ئـەوەی قەدەغـەی خراپـە دەكـاو خۆشـی دەیكـا، لـە دواڕۆژا فـڕێ دەدرێتـە نـاو ئـاگر - هـەروەكو لـە فـەرمودەی (صحیح)دا هاتوە -، چۆن گوێدرێژ بە دەوری ئاشدا دەخولێتەوە، ئەویش بەو شێوەیە بـە دەوری ڕیخۆڵەكانیـدا دەخولێتـەوە، دۆزەخیـەكان لێـی دەپرسـن بـۆ واتلـێهاتوە، ئەویش دەڵێ: من فەرمانم بە ئێوە دەكرد چاكە بكەنو خۆشم نەمدەكرد، ئێوەم لـە خراپە قەدەغە كردو خۆشم دەمكرد.

جارێکیـان وتاربێـژی نـاودار (ئـەبو موعـازی ڕازی) هەڵسایەوە بـەخۆی گریـاو خەڵکیش گـریا، پاشـان گوتی:

**فـەرمـــان بە تەقـوا دەکـا لای وایـە تەقواکـارە**
**چـــارەی دەردی لـەلایـە کـــەچـی خـۆی دەردەدارە**

هەندێ لە پێشینان ئەگەر بیانویـستایە خێـرو چاکەیێ بکەن سـەرەتا بـەخۆیان دەیـانکرد، ئەوسـا فـەرمانیان بـە خـەڵك دەکـرد، ئـەوانیش بـە دەنگیانـەوە دەهـاتن و گوێڕایەڵیـان دەکرد.

خوێندومەتـەوە، کـە لـە چـاخەکانی مەردایەتیـدا کۆمەڵـە کۆیلـەیێك داوا لـە ئامۆژیارێك دەکەن فەرمان بە خەڵکی بکـا کۆیلە ئازاد بکەن، ویستی بـە خـەڵك بڵـێ بـەڵام بەرلـەوەی پێیـان بڵـێ لـە ماوەیـەکی درێـژدا هەنـدێ پـارەو پـولی کـۆکردەوەو کۆیلەیەکی پـێ ئـازاد کـرد، دوای ئـەوە فـەرمانی بـە خـەڵك کـرد کۆیلـە ئـازاد بکـەن، خەڵکیش چاویـان لەوی کردو کۆیلە گەلێکیـان ئازاد کرد.

## حـەسـانەوە لـە بەهـەشـــتە

﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ... ئێمـە جـسناتی مرۆمـان دەگـەڵ شـەکەتی وەدیهێنـا. ﴿٤﴾ البلـد ﴾.

لە (ئەحمەد)ی کوڕی (حەنبەل)یان پرسی: کـەی مـرۆ دەحەسێتەوە؟ ئـەویش لـە وەڵامدا گوتی: ئەگەر پێت نایە بەهەشـت دەحەستێیەوە.

ئـەم دنیایـە جێگـای بـەڵاو کارەسـاتە، جێـی کلـۆڵی و مەرگەسـاتە، جێگـای خـەم و پەژارەیـە، جێـی ئـازارو ئەشـکەنجەیە، جێـی شـلۆقی و بێزاریـــە، هـەتا نەگەیتـە بەهەشت حەسانەوەت بۆ نیە.

هاوڕێـیەکی خوێنـدنم لـە نەیجیـریا کـە پیـاوێکی سەرڕاسـت و بـاوەڕپێکراو بـو، هەواڵی پێدام، کە دایکی لە سێیەکی کۆتایی شـەودا بەئاگـای دەهێنا، دەیـوت: دایکـە

دەمەوێ کەمێ وەحەسێم. ئەویش دەیگوت: ڕۆڵە تەنیا لە پێناوی حەسانەوەتدا بەئاگات دێنم، کوڕی خۆم ئەو کاتەی چویتە بەهەشت بحەسێوە.

یەکێ لە زانایانی پێشینی، لە ناو سوژدەدا دەخەوت، هاوەڵانی پێیان گوت: پشو بە گیانی خۆت بدە. دەیگوت: حەسانەوەی ئەوم گەرەکە.

لە ڕاستیدا ئەوانەی دەیانەوێ بە سای وازهێنان لە ئەرکەکان هەر لە جێوە بحەسێنەوە، تەنیا دەیانەوێ ڕاستەوخۆ سزا بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن. گومان لەوەدانیە کە حەسانەوە لە جێبەجێ کردنی کردەی چاكو سود گەیێندا هەیە، لەوەدایە کاتەکان لەو شتەدا بەرهەم بێن کە لە خوا نزیکخەرەوەن.

بێباوەڕان دەیانەوێ هەر لە دنیا بسرەوێنو پشکی خۆیان پێ ببرێ، بۆیە دەڵێن: ﴿... رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ... ئەی پەروەردگارمان بەر لەوەی ڕۆژی قیامەت بێ، پسولەی خۆمان بدەیە. هەندێ لە توێژەرەوان دەڵێن: مەبەستی ئەوئایەتە ئەوەیە پشكو بەشی خۆمان پێ بدەی لە خێرو خۆشیو ڕزقو ڕۆزی بەر لە هاتنی ڕۆژی دوایی.﴿١٦﴾ ص﴾

﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلْعَاجِلَةَ ... ئەوان حەزیان هەر لە دنیای بێ بەقایە.﴿٢٧﴾ الإنسان﴾.

بیر لە سبەو دواڕۆژ ناکەنەوە، بۆیە کردەوەو سەرەنجامەکەی، ئەوڕۆو سبەی، سەرەتاو کۆتایی لەدەست دەدەن.

ژیان بەو شێوەیە ڕەخساوە، ئاکامەکەی دوا بڕانە، تامو چێژی تفتو تاڵە، جارە بە ڕەنگێ خۆی دەنوێنێو لە هیچ بارێکی خۆی ڕاناگرێ، جارە هەبونی جارەنەبونی، جارە تەنگاوی، جارە شێنەیی، جارە خۆشی جارە ناخۆشی.

فەرمو ئەوەش دەرەنجامەکەی: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ... پاشان دەیانگێڕنەوە بۆ لای خوا، کە سەروەری ڕاستەقینەی هەمویانە، بابزانن فەرمان هەر بەدەستی ئەوەو زوتر لە هەر حیسابگەرێ بە حیسابی گشت ڕادەگا. ﴿٦٢﴾ الأنعام﴾.

## نەرمو نیانی یاریدەدەری بە ئەنجام گەیشتنە

چەند وتەو بەڵگە لەمەڕ نەرمونیانی ڕابران، (لێرەشدا دەڵێین)، نەرمونیانی ئەو تکا کارەیە لە داواکاریەکاندا تکای ڕەتناکرێتەوە، دەکرێ بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە ئەو نمونەیە لە بەرچاو بگری، ئەگەر ئۆتۆمبیلێك بە ڕێگایەکی تەنگەبەردا بڕواو ئەملاو ئەولای دیوار بێو تەنیا یەك ئۆتۆمبێلی تێوە بچێ، تەنیا بەو شێوەیە ئۆتۆمبێلەکە دەتوانێ پێیدا گوزەرکا، شۆفێرەکە بە هێورەیی‌و وریایی‌و خۆپارێزی ئۆتۆمبێلەکە لێ بخوڕێ، لەکاتێکا ئەگەر بیەوێ بە توندوتیژی بەو ڕێگایە تەنگەبەرەدا تێپەڕێ، خۆی بەملاو ئەولادا دەکێشێ‌و، پەکی دەکەوێ، ڕێگاکەشی هیچی لێ زیادو کەم نابێ، ئۆتۆمبێل هەر ئۆتۆمبێلە، بەڵام شێوازەکە جیاوازە، ئەمەیان نەرمو نیانەو، ئەویان توندو تیژە.

ئەو شەتڵە نەمامەی لەناو حەوش‌و حەسارەکەماندا دەیچێنین، ئەگەر بێو جار لەدوای جار ئاوی بدەین ئاوەکە دەخواتەوەو کەڵکی لێ دەبینێ، بەڵام ئەگەر بێو ئەو ئاوە بە یەك جار بەو قەبارەیەوە بەسەر نەمامەکەدا هەڵبڕێژی لە ڕیشەوە هەڵیدەکێشی، ئاوەکە لە ڕوی چەندیەتەوە هەریەکە بەڵام شێوازەکە جیاوازە.

ئەو کەسەی دەیەوێ بە نەرمی جلەکانی دابکەنێ جلەکانی نادڕێ، بەڵام ئەوەی بە توندی بە هێزی خۆی بە پەلە جلەکانی لەبەرەخۆیدا دەپچڕێ، جلەکانی دوچاری پارچە پارچە بونو هەڵدڕین دێن.

نوکتەیەکی وردو سەرنج ڕاکێش لە داستانی یوسف پێغەمبەردا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - هەیە، ئەو کاتەی برایەکانی کراسەکەیان هێناوەو گوتیان گورگ خواردویەتی باوەڕیان پێ نەکرا، لەبەرئەوەی کراسەکەیان بە نەرمو نیانی لەبەرداکەند بو، ئەگەر گورگ بیخواردایە کراسەکەی پارچە پارچە دەکردو، ئاوا بە ساخی نەدەما.

ژیانی ئێمە ئاتاجی نەرمو نیانیە، لە ئاستی خۆماندا نەرمو نیان بین: ((وإن لنفسك عليك حقا... لە ڕاستیدا مافی خۆت بەسەرەخۆتەوە هەیە)). لە ئاستی

برایەکانماندا سۆز بنوێنین: ((**إن الله رفيق يحب الرفق**... خوا نەرمو میهرەبانە، نەرمو نیانی خۆشدەوێ لە ئاقار خێزاندا میهرەبان بین: ((**رفقاً بالقوارير**... لەگەڵ شوشان [٨٩٧] نەرمونیان بن.

ئەو پردانەی تورکەکان لەدار دروستیان کردونو بەسەر ڕوبارەکاندا ڕاهێشتراون، لە سەرەتای پردەکە نوسراوە: هێواش هێواش. چونکێ ئەوەی بە هێواشی بەسەر پردەکە گوزەر دەکا ناکەوێتە خوارەوە، بەڵام کەسی بە پەلە لەوانەیە بکەوێتە ناوەندی ڕوبارەکە.

لە یاداشت نامەکانی وێژەرێکی سوریدا هاتوە، کە لە شاری (السلمية)دا نیشتەجێ بو، دوچەرخێکی ئاگری [٨٩٨] هەبو دەیەویست بەو دوچەرخەیە بەسەر پردێکدا تێپەڕێ کە تورکەکان لە دار دروستیان کردبو، ئەوان بە مەبەستی ئەوە دروستیان کردبو ئەگەر یەکێ بیەوێ بە دوچەرخە ئاگرینەکەیەوە بە هێمنیو هێواشی بەسەریدا بپەڕێتەوە، ئەو کابرایە دەڵێ: بە خێرایی بەسەر پردەکەدا ڕۆیشتم، کاتێ لەسەر پردەکەوە گەییشتمە ناوەڕاستی ڕوبارەکە، ئاوڕم بە لای چەپو ڕاستەدا دەدایەوە هیچ گوێم بە خۆمو دوچەرخەکەم نەئەدا، ترسم ڕێ نیشتو سەرم گێژ بو، بە خۆمو دوچەرخەکەمەوە بۆ ناو چەمەکە شۆڕ بومەوە...ئەو داستانە هێشتا ماوێتی. لە هەندێ شارەکانی ئەوروپا، لەسەر دەروازەی باخی گوڵان تابلۆیێك هەیە لەسەری نوسراوە: لەسەرخۆبە، چونکە ئەوەی بە پەلە دەچێتە ژورێ ئەو شینا وردیە سەرنج ڕاکێشە نابینێ، ئەو گوڵو گوڵاڵە دڵڕفێنە لەژێر پێیەکانیدا ناپارێزێ، وەسەریان دەکەوێو پانیان دەکاتەوە لەناویان دەبا، سەبارەت بەوەی نەرمو نیانی نەنواندوە.

هاوکێشەیەکی پەروەردەییش هەیە دەڵێ: چۆلەکە وەکو هەنگ نەرمو نیانی نانوێنێ. لە فەرمودەشا هاتوە: ((**المؤمن كالنحلة، تأكل طيباً و تضع طيّباً، واذا وقعت على عود لم تكسره**... بڕوادار وەکو هەنگ وایە، پاك دەخواتو پاکیش بەرهەم دێنێ، ئەگەر بچێتە سەر پۆپەی گوڵانیش لقەکانی ناشکێنێ)). گوڵ هەست

---

٨٩٧) لەگەڵ خێزانەکاندا نەرم ونیان بن.

٨٩٨) مانتۆڕ، ماتۆڕ.

بە ئازار پێگەیاندنی هەنگ ناکا، بە هێورەیی شیلە هەڵدەمژێو، بە هێواشی داواو خواستی پێکدێنێ. بەلاّم چۆڵەکە لەگەڵ ئەوەی لاشەیەکی کزو لاوازی هەیە، خەڵکی لەخۆی بەخەبەر دێنێ، کە دەیەوێ لەسەر گوڵەگەنم بنیشێ، هەرکاتێکیش ویستی بنیشێ خۆی بەسەر گوڵەگەنمەکاندا فڕێ ئەداتە خوارێو ئەوانیش بەسەریەکدا ئەکەون.

ئێستاکەش لەگەڵ دابێ سەربوردەی ئەو وێنە کێشەی هیندیم هەر لەیادە، کاتێ نیگارێکی جوان لەسەر تابلۆیێك دەنەخشێنێ، پوختەی بەسەر هاتەکە ئەوە بو: وێنەی گوڵەگەنمێکی کێشابو کە چۆلەکەیێك بەسەریەوە نیشتبو، گوڵە گەنمەکە پڕ لە دەنك بو، قاچکەکەی ڕاست هەڵچو بو، جوانیش گەشەی کردبو، پاشا لەسەر دیواری دیوەخانەکەی هەڵیدەواسێ، خەڵکی دەچێتە لایو پیرۆزبایی ئەو تابلۆیەی لێدەکەنو دەستخۆشی لە دەستڕەنگینی وێنەکێشەکەش دەکەن، کەسێکی هەژارو نەداریش دەچێتە لایو لە ناوەڕاستی قەرەباڵغیەکەوە هەڵدەستێتەوەو ڕەخنە لە تابلۆیەکە دەگرێ، دەڵێ: هەڵەی تیایە خەڵکەکە دەکەوێتە مشتو مڕو، قاووقیژی لێ هەڵدەستێ چونکو پێچەوانەی یەك دەنگی ئەوان بو، پاشا بە نەرمی بانگی دەکاو، دەڵێ: ها چیت پێیە؟

ئەویش دەڵێ: وێنەی ئەو تابلۆیە هەڵەیەو، جێی خۆی نیە بخرێتە ڕو.

گوتی: لەبەرچی؟

گوتی: لەبەرئەوەی وێنەکێشەکە وێنەی چۆلەکەی لەسەر گوڵە گەنمەکە کێشاوەو، گوڵەگەنمەکەش هەروا بە ڕاستیو هەڵچویی لێگەڕاوە، ئەوەش هەڵەیە، لەبەرئەوەی ئەگەر چۆڵەکە لەسەر گوڵەگەنم بنیشێ گوڵەگەنم ئەچەمێتەوەو شۆڕدەبێتەوە سەبارەت بەوەی چۆلەکە گرانەو ئەویش بەرگەی ناگرێ.

پاشا گوتی: ڕاست دەکەی. تابلۆکەیان دابەزاندو، ئەو خەلاّتەی بە وێنەکێشەکەشیان دابو لێیان سەندەوە.

گومان لەوەدانیە کە پزیشکان نەرمو نیانی بە چارەسەر دادەنێن، ئامۆژیاری خەڵکی پێ دەکەن لە کارو کردەوەو وەرگرتنو بەخشیندا نەرمو نیان بن.

سـەیر دەکـەی ئەمـەیان نینـۆکی خـۆی بەدەسـتی خـۆی هەڵدەکێـشێ، ئـەوەیان بـۆ خۆی ددانی خۆی دەشکێنێ، ئەوی تریان پاروی لە قورگی دەگیرێ چونکێ پاروەکـەی گەورەیەو باش نایچوێ.

ئـاو هەنـدێ جار لەسـەر خۆیـەو جـاریش وایـە شـەپۆل دەدا، جـاری وایـە زریـان سەرکەش دەبێ ئەوسا شت بەسەریەکدا دەڕوخێنێ.

وتەی کەسانێکی پێشینیم خوێندۆتـەوە دەڵێن: ئامـاری تێگەیـشتنی پیـاوە کـە لـە چـونەوە مـاڵو هاتنـەدەری، لـە پـێلاو داکەنـدنو، جـل لەبـەرکردنو، سـواری وڵاخەکەیدا، نەرمو نیانی بنوێنێ.

بێ سۆ پەلە پەلو تاڵوکەکردن لە دەست بەکاربونو کـارو کـردەوەدا، بەڵێنیـدەرن بە توشهاتنی زەرو زیانو، لە دەستدانی بەهرەو قازانج، چونکە چاکە لەسـەر نـەرمو نیانی بنیات نـراوە، ((ما کان الرفق فـي شـيء الا زانـه، ومـا نـزع مـن شـيء الا شـانه... هەر شتێ نـەرمو نیـانی تێـدابێ جوانو ڕازاوەو بەرچاوە، لـە هـەر شتێدا وەدی نەکرێ قێزەونو نابەرچاوە.

بێگومـان نـەرمو نیـانی لـە هەڵسوکـەوتا گیـانو دڵ سـەری بـۆ دادەنـوێنن، نـاخو دەرون ملی بۆ کەچ دەکەن. نەرمو نیانی لە مرۆڤدا کلیلی هەمو بەهرەیەکە، دەرونی سەرپێـچی کـارو لاساری بـۆ ڕام دەبـێ، ڕقو کینـەی دڵانـی پـێ دەرەوێتـەوە، ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ... لە بەزەیی خـودا ڕایە، کە تۆ هێندە نەرمو نیانی دەگەڵیان، ئەگـەر یـەکێ دڵڕەقو تونـدو تۆسـن بـای، بڵاوەیان لـێ دەکردی. (١٥٩) آل عمران ﴾.

## سـەرنجێـك

(تەها حوسێن) خۆی وەکو کەسێکی نادیـار دادەنـێو لەگەڵی دەدوێ: (وا دەزانـێ مرۆڤێکە وەکو خەڵکان وەکو ئەوان لەدایك بوەو، وەکو ئەوانیش دەژیێ، توانـاو کـاتی لەو شتەدا خەرج دەکا ئەوان کاتو توانای تێـدا خـەرج دەکـەن، بـەڵام دڵـی بـە کـەس

خۆش نابێو بە هیچ شتێ ئۆقرە ناگرێ، کەوتۆتە نێوانی ئەو، نێوانی خەڵکانو شتی ترەوە، ڕوی دەرەوەی ئەو پەردەیە ڕەزامەندیو ئارامییە، ڕوی ژورەوەی لای خۆی ترسو لەرزو ڕو گرژیە، دڵەڕاوکێ و نیگەرانیە، لە بیابانێکی چۆڵ هۆڵدا بەبێ هاودەم دەگوزەرێنێ، بیابانێك هێمای ڕزگاری لێنیە، ڕێگای دەربازبونی نیە بیگرێتە بەر، ئاسۆیەکی شك نابا هەوڵی بۆ بداو پێی بگا).

شێخی ئیسلام (ئیبن تەیمیە) دەڵێ: ((جاری وایە بۆ چەند ساتێك حەسانەوەو ئارامییێکی وا بەسەر دڵدا دێ، دەڵێم، ئەگەر بەهەشتیەکان لەم خۆشیەدا بەسەربەن، دیارە حاڵیان زۆر خۆشە)).

(ئیبراهیم)ی کوڕی (ئەدهەم)یش دەڵێ: ((ئێمە واین لە ژیانێ ئەگەر پاشاو دەسەڵاتدارەکان پێی بزانن بە زەبری شمشێر لێمان دەستێنن)).

## نیگەرانی هیچ سودت پێ ناگەیەنێ

مەبەستم لە هێنانی ئەو جێ باسە ئەوەیە: بگەمە ئەنجامێك، ئەویش ئەوەیە، پێویستە بەندە نیگەران نەبێو، ملکەچی قەدەر بێ، بەو بەشەی خوا بۆی داناوە قایل بێو، لە ئاهی ڕابردو زویر نەبێ.

من لە قۆناغی سەرەتایی یەوە لەنێوان هاوڕێیەکانمدا حەزم دەکرد لە یەکەمەکان بم، لە پێناوی پێداچونەوەو دەرخکردن خۆم زۆر ماندو دەکرد، کاتێ کاغەزی تاقی کردنەوەکانم ئەداوە دەست، ئەکەوتمە ناو ترسو لەرزو نیگەرانی سەبارەت بە ئەنجامەکەی، لە ماڵەوە دوبارە وەڵامی پرسیارەکانم ئەدایەوەو، هەر بۆ خۆشم هەڵەچنیم دەکردو نمرەکانم دائەنا، لە تاوان نینۆکم بە ددانەکان ئەقرتاندن، پاشانیش دەرنجامەکە دەرئەکەوتو، جاری وابو دڵخۆشی دەکردمو، جاری واش هەبو دڵگرانی دەکردم، ڕۆژێ لە ڕۆژان بەبیرم نایێ نیگەرانیم هەڵەی ڕاست کردبمەوەو، نمرەکانی زیاد کردبمو، وای لێکردبم پلەی یەکەم وەدەست بێنم.

## ئاسودەیی لەگەڵ چاوتێری دایە

خانەوادەم لە باشور بەجێهێشتو، بەرەو پەیمانگای زانستی (ڕیاز) ڕۆیشتم، لەگەڵ مامەکانم دابوم و بە سەختی دەمگوزەراندو، لەناو ئەشکەنجەی خوێندنو، کاروباری ناو ماڵو، گرفتی هاتوچۆدا بەسەرم دەبرد، هەمو بەیانیەك بیست خولەك تا نیو کاتژمێر بەپێیان دەڕۆیشم، نیوەڕۆیانیش هەر بەمچەشنە یاخود ماوەیەکی درێژتریش بەپێیان دەگەڕامەوە. لە چێشتلێنانی بەیانیانو نیوەڕۆیانو ئێوارانـدا هاریکاری ئەوانەم دەکرد، کە لەگەڵیاندا دەژیام، ماڵەوەم گەسك دەداو، دەمشوشت، کەلوپەلی ناوماڵم ڕیز دەکردەوەو، چێشتخانەکەم ڕێك دەخستەوە، بە وانەکانیشمدا دەچومەوەو، بەشداری چالاکی نێو پەیمانگاشم دەکرد، لەگەڵ ئەوەی نمرەیەکی باشم بەدەست دەهێناو، پلەیەکی دڵ خۆشکەرم چنگ دەکەوت تەنیا دەستە جلێکم هەبو دەمشوشتو ئوتوم دەکردو لەبەرم دەکردەوە، ئەو بەرگەم بەرگی ناوماڵو قوتابخانەو ئاهەنگو کۆڕم بو، چونکێ ئەو بڕە پارەی پێم دەدرا کەمبو، کرێی خانوو بژێوی و پێداویستیەکانی ژیانم لەسەر ئەو بڕە پارە بو، تەنیا کەمێك گۆشتمان پێ دەکڕاو بە دەگمەن نەبوایە میوەمان تام نەدەکرد، ئێمە هەمیشە بەهۆی پێداچونەوەو دەرخکردنو خوێندنەوە سەرقاڵ بوینو، لە ماوەی مانگێ یا خود پتر لە مانگێ تەنیا یەکجار دەمتوانی بۆ حەسانەوە بەدەرکەوم، نزیکەی حەفدە جۆری وانەی خوێندنمان هەبو، وێڕای وانەی عەرەبیو ئاینی، وانەی ئینگلیزی و جەبرو ئەندازەوو جۆرەها زانستی تریشمان پێ درابو، لە قۆناغی ناوەنجیەوە کتێبی وێژەم لە پەیمانگای زانستی وەرئەگرت، هەرکاتێ دەکەوتمە ناو خوێندنەوەی کتێبی وێژە هەروەکو بڵێی لە هاونیشینانم دائەبڕام، چونکو تەواو لەگەڵیدا ئاوێتەی یەکتر دەبوین.

بۆ سەلماندنی ئەو قسەیەشم: لەگەڵ ئەوەی نەدارو تەنك دەست بوم، ماندو شەکەت بوم، حاڵ خۆشو ئاسودەش بوم، پڕ بە چاوان دەخەوتمو، ڕەزامەندیم لە دڵدا بو، هەستو نەستم حەساوە بو، پاشانیش – سوپاس بۆ خوا- ژیانم هەر بەردەوام بو، خانوبەرەیەکی فراوانو، خواردنێکی زۆرو، جۆرەهای بەرگو پۆشاكو،

گوزەرانێکی باشم وەچنگ کەوت، بەڵام ئێستاکە وەکو جاری پێشو نیم، کەوتومەتە ناو سەرقاڵیو تفتوتاڵی، ئەوەش وا دەگەیەنێ، کە هەبویی نابێتە مایەی دڵخۆشیو ئاسودەیی، هەر لەبەرئەوەوە وا مەزانە دڵ پەستیو خەمو خەمینی تۆ سەبارەت بەوەیە دەست تەنگی، یاخود لەمەڕ ئەوەیە لە ژیانتدا خۆشگوزەران نی، لە ڕاستیدا ئەم بۆچونە هەڵەیە، چونکێ زۆربەی ئەوانەی دەست کورتن لە زۆربەی ئەوانەی دەست ڕۆیشتون خۆشحاڵترن.

## پێشبینی خراپترین چاوەڕوان کراوەکان بکە

من لە یەکەمی ناوەندی بوم لە پەیمانگای (ئەبها) بەوپەڕی توانامەوە هەوڵم دەدا لەسەرئەوەی لە یەکەمەکان بمو، کێبەرکێی پلەی یەکەمم دەکرد، لەلای خۆم وامدانابو پلەی یەکەم بەدەستدێنمو کۆی نمرەکانیشم لە (٩٠) نایێتە خوارێ، بەڵام دوای هەوڵو تێکۆشانو پێداچونەوەو شەونخونیم پێشبینی چ دەکەی؟ ئەنجامەکەی دەرکەوت بەڵام لەگەڵ دەرچوەکان دابوم، لەوانەی ئینگلیزی کەوتم، ئەو وانەیە بوە هۆی دواکەوتنو تێشکانم، چونکە زۆر لەدڵم گران بو، گیانم پێی هەراسان بو، تێی نەئەگەییشتمو پێم دەرخ نەئەکرا، پارچە هەورێکی ڕەشو تاریك لە خەمو خەفەت باڵی بەسەر داکێشام، چەند شەوانێ بێ خەو بوم هاوڕێیەکانیشم ئەوەی بیویستایە سەرکۆنەی دەکردم، لەبەرئەوەی بە هیچ شێوەیەك ئەوە چاوەڕوان نەدەکرا، بەڵکو خۆم بۆ پلەی نایاب دانابو لە ڕیزی یەکەمەکاندا، هەستو سۆزم کڵپەی سەندو، دڵم تەنگ بو، سەبارەت بەوەی ئەو کارەم زۆر بەلاوە گران بو، تینی زۆر بۆ هێنام: یەکێ لە مامۆستاکانم قسەی لەگەڵدا کردمو دڵی دامەوەو هانی دام، ئینجا منیش بەو دێرە شیعرە دڵی خۆم دایەوە:

هەرچی گەیشتە تەواوی سەرەو لێژو بەرەو خوارە
بەخۆشیان هەڵناخەڵەتێ ئەوەی ژیرو هۆشیارە

دوا بەدوای ئەوە هەرکاتێ ئەو حاڵەی خۆمو بەڵگە هێنانەوەم بەو دێرە شیعرە دەهاتەوە یاد سەرسامی دای دەگرتمو لە خۆمەوە پێئەکەنیم، ئەو خەمباریەم هیچ دادی نەدامو، ئەو نیگەرانیەم هیچی لە بابەتەکە نەگۆڕی، بەڵکو ئەگەر بە خەمانم بکردایە نەمدەتوانی هەوڵ بدەمو لە دەوری دوەمیش سەرکەوتن بەدەست بێنم. بە تۆش دەڵێم: خەیاڵت بۆ ئەوە نەچێ ئەگەر لەکاتی تێشکانا دلگران بویو پەشۆکای یا داچڵەکای، بە سای ئەوە ڕاستەوخۆ سەرکەوتن بەدەست دێنی، یا پێت وانەبێ بوارەکە بە هەوەسی تۆ دەڕەخسێ، نەخێر! بەڵکە سەبارەت بەو کارەت تێشکانت چەندبارە دەبێتەوە. ئەو کاتەی دەربارەی فەرمودەی پێغەمبەر - درودو سڵاوی خوای لەسەر - مشتو مڕی بڕوانامەی (ماجستەرە)م کرد، منیش وەکو خەڵکی تر حەزم دەکرد پلەی نایاب وەدەست بێنم، خەیاڵم وابو جوان وەڵام دەدەمەوە بەباشی گفتوگۆیەکە ئەنجام دەدەم، کەچی لە پڕێکا زۆرباشەم بۆ دانرا، زۆر زیاد لە پێویست خەمو خەفەتو دڵ پەستی دایگرتم، هاوڕێیەکەم دواندمیو پێی وتم: وا دابنێ هەر بە هیچ شێوەیێ بڕوانامەی ماستەرەکەت وەدەست نەهێناوەو، لەبەر هەر هۆیەك بێ نامەی ماستەرەکەت ڕەت کراوەتەوە، جا ئەو کاتە چیت دەکرد؟! دوای ئەوە جیاوازی زانستی لە نێوان ئەو دو ئەنجامە چیە؟ کە هەردوکیان یەك واتا دەگەیێنن، ئەویش بڕوانامەی ماستەرە؟! وتەکەی بەجێ بو، هۆشم هاتەوە سەرخۆو ئاسودە بوم. جا ئەگەر پێشبینی شتێکی ناخۆشو هاتنە ڕێی ئاستەنگێکت کرد، دەرونت لەسەر قەبوڵکردنی لای هەرە خراپەکەی ڕابێنە، پاشان ئەوەندەی لە دەستت دێ خۆت ڕزگار کە. بەڵام لە پەو ڕوکەوتن[٨٩٩] و خۆ سەرزەنشتکردنو نیگەرانی، تۆزوقاڵێك دادت نادا مەگەر سینە تەنگیو پەشێوی نەبێ.

کەڵكو سودیشم لەو وانەی ماجستێر وەرگرت بەوەی گفتوگۆی (دکتۆرا)م دواخست، ئەو کاتەی گفتوگۆیەکەم خستە ڕو هەم لە ڕوی زانستیو هەم لە ڕوی یاساوە گونجاو بو، لە کاتی نزیکبونەوەی مشتومڕەکە ئامادەباشیم کردبو، وێڕای ئەوەی ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی بو بەلامەوە کارێکی گران نەبو، وەکو جاری پێشو هەراسان نەبوم. ئەوەش وامان لێدەکا خراپترینی پێشبینییەکان لەبەرچاو بگرینو،

---

٨٩٩) بەسەر ڕودا کەوتن.

لەگەڵ ترسناکترینی ئەو شتانەی چاوەڕێ دەکرێن بگوزەرێنین، پاشان لە ژیانی خۆماندا چۆك دانەدەین هەروەکو بڵێی هیچ شتێ ڕوی نەدابێ وابین.

هەر کەسێ پێشبینی ئەوە بکا لە بازرگانیەکەی هەرەس دێنێ یا هەمو سامانی لەدەست دەچێ، مەمنونە بە زەرەرێکی کەم لەبەر بچێتە دەرێ، هەر کەسێکیش پێشبینی ئەوە بکا بکوژرێ، مەمنونی خوا دەبێ بە گرتنو بەندیخانە لێی ڕزگار بێ، ئەو هەلە ئەشکەنجەو ئازاری لەلا سوك دەبێ.

## ئەگەر تواناو تەندروستیت تەواو بو، با دنیا سلاوی لێبێ

ئێمە لە ساڵی ١٤٠٠ ك لەسەر سنوری (یەمەن) لە خێوەتگایەك دابویین، کە جەنابی شێخ (عبدالعزیز بن باز) بە مەبەستی بانگەوازی کردبویەوە، منیش لەگەڵ مامۆستای تەفسیرمان لە کۆلێژی (أصول الدین) بەرەو (ئەبها) ڕۆیشتم، لە گەڕانەوەماندا بەرەو خێوەتگا ڕێگای نێوانی (ئەبها)و (توهامە)مان گرتەبەر کە زۆربەی بەهۆی تەوژمی ئاوەڕۆکان دارما بو، ئەو مامۆستایەش لەگەڵ ئەوەی لە تەفسیر شارەزا بو، بەلام لە لێخورینی ئۆتۆمبێل کۆڵەوار بو، قەبوڵیش نەبو من ئۆتۆمبیلەکە بازۆم، ئەوسا یا دڵی بە منەوە بو یا بە ئۆتۆمبیلەکەی، بەلام خۆزگە لەگەڵ ئەوەی نا شوفێر بو بە هێواشی بڕۆیشتایە، وا دەڕۆیی هەروەکو بڵێی پێشبرکێی دەکرد، هەتا خەریك بو بەرەو هەڵدێرێکمان سەرەو خوارکاتەوە، خۆم توند بە ئۆتۆمبیلەکەیەوە گرتبو گوێمان لێبو جیرەجیری لێوە دەهات. ئەوەی ڕاستی بێ من لەو شەوەدا لە نێوانی مردنو ژیندا ئەگەڕامەوە، بە توندی دو دەستەکانو دو پێو ددانەکانم بەسەریەکەوە دەگرتو دوایێ خاو دەبومەوە، قسەم لەگەڵدا دەکردو پێم دەوتو ئامۆژگاریم دەکرد، هەروەکو بڵێی هانی ئەدەم پێی لێبنێو خێراتر بێ ئاوا بو هەتا گەیشتینە دۆڵاییێکی فراوان، لەو کاتەش ئاسمان بارانی لێ دەڕژا، لە پڕێکا توشی لافاوێکی بە لێشاو هاتین، ئێمەش بە کەممان زانی، کاتێ گەیشتینە ناوەڕاستی دۆڵاییەکە تایەکانی ئۆتۆمبیلمان ڕۆچونو، وردەوردەش ئاوەکە زیادی دەکرد هەتاوەکو هاتە ناو ئۆتۆمبیلەکە، بە غار هەلاتینو ئۆتۆمبیلەکەمان بەجێهێشت بە زەحمەت لە دۆڵاییەکە دەرچوین، لە نیوە شەوڕا

هەتا بەیانی لە لێواری شیوەگەدا بەبێ خواردن‌و خواردنـەوەو لێفـو نـوێن ماینـەوە، لەبەرئەوەی ئێمە چاوەڕوانی مەرگمان دەکرد قایل بـوین بـەوەی تـەنیا بگەڕێینـەوە، وامان دانا هیچ لە گۆڕێ نیە لـە چـاو ئـەوەی چـاوەڕوانمان دەکـرد لـەناو ئـەو لافـاوە بـەخوڕەدا گیانمـان دەرچـێ، سوپاسـی خوامـان کـرد لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر چـی ئەشکەنجەو شەکەتی ڕێگاو شەونخونیمان بینی، بەڵام بـە سـاخی لێـی دەرچـوین. لـە بەیانیـدا بەفریامان گەیـشتن‌و بـەبێ بـەڵا گەڕاینـەوە. بـەو بۆنـەوە سـەربوردەی ئـەو کەشتیە جەنگیەی ئەمریکیم هاتەوە یـاد، کـە بەشـداری لـە جـەنگی جیهانی یەکـەم کرد، ئەوە بو موشەکێکی بەرکەوت‌و لە دەریای یابان ژێر ئـاو کـەوت‌و، سـێزدە ڕۆژان لەژێر ئاودا مایەوە، ئەو سەرنشینەی تیای دابو تەنیا ئاوێکی ساردو نانی وشـکی لـەلا بو، ئەو کاتەی بە زیندویی هاتەوە سەر دنیا لێیان پرسـی: گـەورەترین ئـەزمون، کـە بەدەستت هێنابێ چی بو؟ لە وەڵامدا گوتی: لـەو چـەند ڕۆژە ترسـناکەدا تێگەیـشتم، کە هەر کەسێ تەندروسـتی تـەواو بـێ‌و نـان‌و ئـاوی لـەلا بـێ، وەك ئـەوە وایـە هـەمو دنیای لەدەست دابێ.

منیش بە تۆ دەڵێم: ئاخۆ دنیا چییە؟ مەگـەر بریتـی نیـە لـە هەسـت‌و نەسـتێکی ئاسودەو جەستەیەکی بێ دەرد، مەگـەر بریتـی نیـە لـە نانـێ لـە دەمیخـەی لـە ئـاوێ نۆشیکەی، لە پۆشاکێ لەبەریکەی، هەر چیێ تر، کە لە دنیا هەیـە، جێگـای خۆیـەتی سلاوی خوا حافیزی لـێ بکەی.

باشە بۆ من‌و تۆ بەیەکەوە لـە ژیـانی خۆمانـدا لێکدانـەوەیێ نەکـەین، پرسـیار لـە خۆمان بکەین: چمان هەیەو؟ لە چیمان کەمە؟

ئەوسا تێ‌دەگەین پتر لەسەدا هەشتای نازو گۆزو بەهرەی ژیانمان لەلایـەو، کـەمتر لەسەدا بیستیش کەم‌و کوڕیمان هەیە، زۆربەی خەڵکیش هەروەکو من‌و تـۆن، مەگـەر بە دەگمەن نەبێ، کە جاری وایە بـەڵاو ناخۆشـی لـە بـەهرەو خەڵاتـەکان گـەورەترە، کەچی من‌و تۆ لە تاوی کەم‌و کوڕی دەگرین‌و لە خۆشی ئەوەی هەمانە پـێ ناکـەنین، لە ئاهی نەمانی بەهرەیەك دڵ گرانین، ئەو خێـرو خۆشـیەی دێتـە دەستیـشمان بـە بێ نرخی دەزانین، لە تاوی دەردو بەڵایێك ئاخ‌و ئۆفان هەڵدەکێشین، کەچـی لەسـەر ئەو نازو گۆزەی خوا پێی ڕەوا بینیوین ستایشی بۆ نانوێنین.

## بەر لـەوەی گـرِی دوژمـنایەتی کـڵپـە بسـتێـنێ بیکوژێنـەوە

من یەك لەبارێ خۆم لەو ژیانـە کورتو ئاساییەمدا هەستم کردوە هـەرکاتێ هـەوڵم دابـێ مافـی خـۆم بـستێنمەوەو، وەڵامـی ئـەو ڕەخنـەو تـەنگ پـێ هەڵچنینە بدەمەوە، کە دەرحـەقم کـراوە، تـەنیا زەرەرم لـە قازانجـێ پـتر بـوەو، پەشـیمانیەکەم گەورەتر بوە، بەو مانایەی: من پێم وابو ئەگەر سەبارەت بـەوەی وتەیـەکی نەشـیاوم لە کەسێکەوە پێ بگـا، یـا لـە ڕێگـای کەسـێکەوە بێـزار بکـرێم، منـیش بمـەوێ سـاخی بکەمەوەو بەدوایدا بگەڕێمو لێی بکۆڵمـەوە، مافـی زەوتکـراوم دەسـێنمەوەو قـەدرو ڕێـزم دەگێڕمـەوە، کەچی هەستم کـردوە پێچەوانە بـوەو، ئـەوەی بەدوایـدا گـەڕاوم هەڵـە بـوە، بەڵکـە لەگـەڵ ئـەو کەسـە پتـر لـە یێـك دور کەوتوینـەوەو، ناخۆشـیو ناحەزیـشمان هـەر مـاوەو بـەردەوام بـوە، ئـەو لەسـەر هەڵوێـستی سـور بـوە، منـیش خۆزگەم خواستوە بە دوای ئـەو مەسـەلەیە نەکەوتمایـە، یـا لـێم نەکۆڵیبایـەوەو لـێم نەپێـچابایەوە، چـاترینو باشـترین چـارە ڕێگـا: بەخـشینو چاوپۆشـینە، ئـارامیو خۆڕاگریو پشت تێکردنە، لەبیـرکردنی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە، هەر ئـەو مانایـەش لە نیگای ڕاسـتی خـوا دەفامرێتـەوە: ﴿ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ... چاو بپۆشەو فەرمان بە کاری چاك بدەو لەو نەزانانە وازبێنە. (١٩٩) الأعراف ﴾.

﴿ ... وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ ...با چاویان لـێ بپۆشنو لە هەڵەکانیان ببورن. (٢٢) النور ﴾

﴿ ... وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ ... ئەوانـەش کـە ڕکـی خۆیـان دەخۆنەوەو لە مەردم چاوپۆشی دەکەن. (١٣٤) آل عمران ﴾.

﴿ ... وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ... (ئەوانەش) کە لە جەنگەی تورە بونیاندا عەفو دەکەن. (٣٧) الشورى ﴾.

﴿... ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ... تـــــۆ وەرامی خراپە بە چاکە بدەوە، ئەوساکە سێ لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت. ﴿٣٤﴾ فصلت﴾.

﴿... وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ... هــەر کــاتێکیش نەزانــەکان بیــان دوێنن وەڵامی نەرمو نیانیان دەدەنەوە. ﴿٦٣﴾ الفرقان﴾.

کەوایـە: ئەگـەر لـە کەسـێکەوە وتەیـەکی نەشـیاوت کەوتـە بـەر گوێیـان، وەڵامـی مەدەوە با دە هەندەی نێتە سەرێ، ئەگەر هۆنراوەیەکی نالەبارت بەسەردا هەڵدرا، وا بزانـە هـەر نەتبیـستوە، چونکێ ئەگـەر تـۆش بـە هۆنراوەیـەك بەرپەرچـت دایـەوە خـەڵکان قسەی پێوە دەکـەنو وێـژەران گوێی بـۆ هەڵدەخـەن، ئەگـەر گوتـارێکی دڵ سوتێنت لە دژ نوسرا ڕوی بۆ وەرمەگێڕەو لـەژێر پێتـدا بیپۆشـە، وا بزانـە جگـە لـە تۆی مەبەستە، ئەگەر کەسێکی قین لە دڵو ڕەخنە گر پشكو بەلاری لێدای بێئاگایی لــێ بنوێنــە، وا بزانــە قـسە لەگــەڵ دیـواری هاوسـێیەکەتدا دەکـا. هــەر لــە کۆنــەوە پێشینان گوتویانە: خۆڕاگری لە ژێر خاك نانی خەوشو نەنگی یە.

کـە دەریـا پـڕ لە نـاوە لێـوان لـێــوی
چ باکی لــەوەیـە بــەردێ بخرێنــە نێوی

دەریا لەبەر ئەوەی ئاوی زۆرە بەدەمی سەگ پیس نابێ هەم ئاوەکە پاکەو هەم مردارەوە بوی حەڵاڵە، پیاوی سەرڕاستو خۆڕاگریش هەروایە، چەنەبازو دەمـدڕاوان ناتوانن ناوی بزڕێنن، ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ... ئەوەی لێـت بـە ناتۆرەیـە، بـۆ خۆی وەچاخی کوێرەیە. ﴿٣﴾ الكوثر﴾.

ئەوەندە پشت ئەستورە چەپەڵکاران ناتوانن ڕوخساری پاکی بڕوشـێنن، ﴿... فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ... ﴿٤٨﴾ الطور﴾.

## لە ڕێـزی هیـچ کـەس دامـەشـکێـنـە

لە ژیانی خۆمدا خوڕەوشتێکم هەڵسەنگاندووەو تاقیم کردۆتـەوە، تێـشیدا بەهەڵـە نەچوم، ئەویش ئەوەیە: پێدا هەڵدانێکی بـەجێو لـە جـێ کار لـە خـەڵکی دەکا، جا هەرچەندە لە خوا تـرس و دنیـا بەکـەمگربن و حـەز لـە خۆدەرخـستن نەکـەن، بـەڵام کاتـێ گوێیـان لـە سـتایش و پێداهـەڵگوتن دەبـێ کاریـان تێـدەکاو پێـی دڵخۆشـن، جا هەیانە زۆرو هەیانە کەم.

دانیشتنم لەگەڵ زانایانی دیندارو تەقواکار کردوە، سەیرم کرد کاتێ گوێ قوڵاخی وتەیەك دەبن ستایش و پیاهەڵدانی تیایە هەست و نەستیان نەرم و نیان و هێور دەبو، کوڵمەکانیان شەبەقی ئەدا. گومان لـەوەدا نیـە وشـەی ناسـك کـاری خـۆی لـە دڵـەکان دەکا، ئەو بەرهەم و میراتە ڕەوایەی لە پێغەمبەری ڕەوا بێژ بیستراوە ئەوەی تێدایـە، کە هـەر کەسـەی قـەدرو ڕێـزی خـۆی پـێ بـدرێ و لـە جێگـای شـیاوی خـۆی دابنـرێ، ئەوەش هەر بەهرەیەکی خوایی‌یە، کە خەڵکان بە سای تۆوە بەختەوەر بن و، بەهۆی هەڵسوکەوتی بەرزت دەرونی خۆشت ئاسو دەکەی، ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ... لـە بـەزەیی خـودا ڕایـە، کـە تـۆ هێنـدە نەرم‌ونیانی دەگەڵیان، ئەگەر یەکێ دڵڕەق و توندو تۆسن بای، بڵاوەیان لـێ دەکـردی. (١٥٩) آل عمران ﴾ .

دانـەری کتـێبی (کیـف تکسب الاصـدقاء) لای وایـە زیـادە ڕۆیـی و تێپەڕانـدن لـە ستایش و پیاهەڵدانی خەڵکان دەبێتـە هـۆی سـەرنج ڕاکێشانیان، بـەڵام مـن ئـەوە بـە بـاش نـازانم، بەڵکـە مـام ناوەنجـی و سـنوردانان لەوبـارەو باشـە: ﴿ ... قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ... دیارە خودا بۆ هەر شتێ ئەندازەیەکی داناوە. (٣) الطلاق ﴾.

نە ماستاوچیاتیو جامەلوسی [٩٠٠] کە دەبێتە هۆی لەخۆباییبونی بەرامبەر، نە ڕوگرژیو پشت تێکردن، کە بەرامبەرەکە وشك دەکاتەوە، بەڵکە خووڕەوشتی بەرزو دڵ فراوانی سەرنجی دڵان ڕادەکێشێ.

منو تۆ لە دەستمان دێ لوت بڵندی بەسەر خەڵکی دابکەینو، ڕومان بەرامبەریان گرژ بێ، بەڵام ئێمە ئەوان لەدەست دەدەین ئەوان ئێمە لەدەست نادەن، چونکە جگە لە منو تۆ کەسێکی تریان دەست دەکەوێ باوەشیان بۆ بگرێتەوەو، سۆزیان بۆ بنوێنێو، لە ڕویاندا بە خەندە بێ ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ... باڵت شۆڕ کە بۆ ئەو بڕوادارانەی، کە شوێنت کەوتون. (٢١٥) الشعراء﴾.

مایەی بەختەوەری ئێمەیە دڵی خەڵکان بەلای خۆماندا ڕابکێشین، چونکێ ئەوانن خاوەنی سۆزو خۆشەویستین، نزاکارو سوپاس کارن، شایەتی دەرانی خوا لەسەر زەویدا ئەوانن. ﴿ ...وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ... بۆ مەردم قسەی باش بکەن.(٨٣) البقرة﴾

لە تەمەنی خۆمدا کەسانێکم ناسیوە بەهرەی ئاوێتەبونیان زانیوە، ئەوسا دڵەکان چەندە تامەزرۆ بونە لە دەورەیان کۆببنەوە، گیانو ڕۆحەکان هەروەك گەڵای شەنگە بی، کە بە هۆی باو بۆران هەڵدەوەرێ بەسەریاندا داباری ون، لە هەر شوێنی دابەزی بنو بەرێ کەوتبن دیدەو سۆمای خەڵکییان شوێن کەوتوە، لە ڕوی خەڵکدا ڕوخسار گەش بون، زمان پاراوو دڵ پاكو بێگەرد بون، ئای لە بەختەوەری ئەوان!! ئای لە ئاسودەیی خەڵکانیش بە سای وان!!

دوای ئەوەی خوای گەورەو توانا مۆڵەتی بە بەندەی خۆیدا، بەندەش دەتوانێ جێگای خۆی لە دڵی خەڵکدا بکاتەوە، ئەو بەهرەیەش نە بە گەنجینەی قارونو، نە بە ملكو دارایی (سولەیمان)و نە بە خەلافەتی (هارون ڕشید)یش دەکڕدرێ، بەڵکە بە نیەتێکی پاكو ڕاستکردن لەگەڵ خوادا، بەهۆی چاکەویستی بۆ خەڵکانو خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر – بە سەرزەنشتکردنی هەواو هەوەسو بەکەم زانینو بەسەر ڕۆیشتنی فەراهەم دێ.

---

٩٠٠) مەرایی / مامە حەمەیی / پان کردنەوە.

گومان لەوەدا نیە، کە خووڕەوشتی جوانو ڕازاوە مرۆڤ ماندو دەکا، سەبارەت بەوەی ڕێگاکەی سەرەو هەوارازە، بەڵام بەدخوییو بەدسروشتی هەکارێکی ئاسانە، سەبارەت بەوەی ڕێگای سەرەو نشێوە، هەڵگەڕانو هەوراز چونیش سەختو گرانە، شۆڕبونەوەو دابەزینیش سوكو ئاسانە.

بە هەمان شێوە تامی ژیانم چەشتوە قازانجێکم لێ فەراهەم هێناوە، کە سودو کەڵکی بۆ تۆو خەڵکانی تریش هەبێ، ئەویش ئەوەیە، ڕێز لە بەهرەی خەڵکان بنێیو، دان بە توانایان دابنێی، لەسەر خواستو ئومێدیان هانیان بدەیو، دەست بەسەر هەوڵو کۆششیان دانەگریو، کیانوبونیان نەسڕیتەوە.

هۆکارێك لەو هۆکارانەی ژیانی خەڵکی تاڵ دەکاو، هەستو ناخیان لێخن دەکا: کەسێکە تەنیا خۆی دێتە بەرچاو، هەر تەنیا خۆی ئەستێرەی درەخشانو، بورجی بەرزی ئاسمانە، هەر خۆی هەڵکەوتەی ڕۆژگارو پیتو فەڕی کاتەکانە، جگە لەوی جێی سەرزەنشتو ڕەخنەیە، بێ کەڵكو بێ بەهرەیە.

لەگەڵ کەسانێدا هەستامو دانیشتم بە هەر حاڵ بە پێی تواناو لێهاتوییان لە چاکەدا هەوڵیان ئەدا، منیش وامدەزانی ئەوانە خۆیان دەناسن، خۆیان لێ ناگۆڕێو زیاد لە بەڕێ خۆیان پێ ڕاناکێشن، بەڵام کاتێ لێیان وێکەوتم، سەیر دەکەم زۆربەیان لایان وایە هەوڵو گەڕیان لە سەروی تێگەیشتنی خەڵکانەو، بەرزترە لەوەی خەڵك بیری لێ کردۆتەوە.

دەبینم قوتابیەك چەند نامیلکەیێکی چکۆڵەی نوسیوە دەیەوێ بەپەلە خۆی پێبگەیەنێ، لەسەر ئەو هەوڵەی سوپاسی دەکەم، سەیر دەکەم زیاد لە پێویست درێژەی پێ دەدا، کە ژمارەیەکی زۆری لێ بلاوکراوەتەوە، چۆن خەڵك پێشوازی لێکردوەو، ئەوەندەو ئەوەندەی لێ فرۆشراوەو، لە زۆر لاوە سوپاسی کراوەو، فلانو فلان بە پەسندیان داناوە، سەرسام بوم بەوەی مرۆڤ چەندە خۆپەسندە، کردو کۆشی خۆی چەند بەرز دەنرخێنێ، ئەوانەش، کە دانی پێدانانێنو بە زۆری سەیر ناکەنو ڕەخنەی لێ دەگرن چەندە دەیانبوغزێنێ.

گوێبیستی کاسێتێکی تریش بوم ئەوەش بە هەر حاڵ کەسێکی ناسراوو ناودار نەبو، منیش ویستم، سوپاسی بکەمو هانی بدەم تاوەکو لەسەر کاری خۆی بەردەوام

بێ، بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ داکرد، هەر کە کاسێتەکەم باسکردو ستایشم کرد، ئەو هەلەی بە هەلێکی ڕەخساو زانی، سەرەتا لە خوای تواناو باڵادەست پاڕایەوە کە بەو کاسێتە سود بە هەمو خوشك‌و برایەکی موسڵمان بگەیەنێ‌و بەروبومی گشتگیر بێ، هەروەکو بڵێی ئەو کاسێتە خۆرهەڵات‌و خۆرئاواو، هەمو کون‌و قوژبنێکی گرتبێتەوە، دوای ئەوە پێی وتم، چەند جار ئامادەی کۆڕەکە بویو چۆن بو، زۆر قسەی تریش لەو بابەتانە، کە پێشبینی ئەوەم نەدەکرد ئەو قسانە بکا، تێیگەیشتم، کە دەرونی مرۆڤ چەند هەندی تواناو بواری خۆی نرخ‌و بەها بۆخۆی دادەنێ، بەلایەکی چەند گەورەیە کەسێکی لێ ڕاست بێ سەنگ‌و ڕێزی بە کەم هەڵسەنگێنێ‌و بنرخێنێ.

گوێبیستی وتارێك بوم‌و بۆ خۆم ئامادەی کۆڕەکە بوم، منیش سوپاسی وتاربێژەکەم کرد، ئەوسا هەواڵی پێدام کە ژمارەیەکی زۆر ئامادەی وتارەکە بوەو، زۆر گریانی تێدا بوەو، کەسانێکی زۆریش لەسەر دەستی ئەو گەڕاونەوە.

کەواتە وریابە هەر چۆنێك بێ لە پلەو پایەی هیچ کەس دامەشکێنەو، لە قەدرو ڕێزیان دامەبەزێنەو، سوك‌و چروکیان سەیر مەکە، ﴿... لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ ... با هێندێکیان گاڵتە بە هێندەکان نەکەن، لەوانەیە ئەوانەی گەپیان پێدەدەن، لە گەپدەرەکان باشتر بن، ژنیش هەروا، لەوانەیە ئەوانەی دەبنە گاڵتەجار، لەوی گاڵتەیان پێدەکەن پەسندتر بن. ﴿١١﴾ الحجرات﴾.

یەکێ لەوانەی تۆ خۆشەویست دەکا لەلایەن خەڵکانەوە، ئەوەیە بەرەو ڕویان بچی‌و بایەخیان پێبدەی‌و لەمەڕ بەهرەو توانایان هانیان بدەی، هەر ئەوەش نەخشەو ڕێبازی قورئانە: ﴿وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ ... ئەو کەسانە مەتۆرێنەو دەریانمەکە، کە گشت شەوەکی‌و ئێواران هانا دەبەنەبەر خوای پەروەرێنیان. ﴿٥٢﴾ الأنعام﴾.

﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ ... تــۆ هــەر دەگــەڵ ئەوانەبە، کە سبەینانو ئێواران بۆ دیداری پەروەرنـدەیان بـە نـزانو تـەنیا ڕەزای ئەویان دەوێ. (٢٨) الكهف﴾.

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ (١) أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ (٢) وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ... گـرژ بـو، ڕوشـی وەرگێڕا! کە بێ چاوەکە هاتە لای. تۆ چوزانی! بەشکە ویستی پاکبێتەوە. (٣) عبس﴾

لە مێـژودا باسکراوە، کـە ئـەوەی بـۆ هـۆی موسڵمان نـەبونی (جەبەلـە)ی کوڕی (ئەیهەم) ئـەوە بـو سـەنگـو ڕێـزی خـۆی پـێ نـەدراو، کە پێویـست بـو بـەم شـێوەیە بایەخی پێ نەدرا، بە گومانی خۆی.

(تـەها حوسـێن)یـش لـە کتێبەکەیـدا بـەناوی (الأیـام) دەگێڕێتـەوە: مامۆستایەکی (ئەزهەر) لە کاتی وەرگرتنیدا تاقی دەکاتەوە، ئینجا پێی دەڵێ: ئـەی کوێر سوڕەتی (الكهف) بخوێنە ئەو قسە لە گوێچکەی (تەها حوسێن)دا دەزرینگایـەوەو دەیهەژانـدو دەی لەرزاندو ئازاری پێ دەگەیاند، دەرەنجامەکەی ئەوە بـو بـە جوێن پێـدانو قـسە پێوتنو ڕەخنەلێگرتن هێرشی کردەسەر (ئەزهەر)و، تا هەتایە ڕوی لەوێ نەکردەوە.

کێ هەیە خۆی پێ کەم بێو هیچ سەنگێك بۆ خۆی دانەنێ؟ کێ هەیـە لای وا بـێ هـیچ نیـەو شـیاوی بـاس نیـە؟ هـیچ کەسـێ بـەم چەشـنە نیـە، هـەمو کـەس خـۆی خۆشـدەوێ، هەمویان بـایی خۆیـان ڕێـزی خۆیـان دەگـرنو، گـشتیان نـرخو بـەهای خۆیـان دەوێ.

سەرنـج دە کاتێ لـە هـەر کۆڕو دانیـشتنێك یـەکێ بـدوێ بینیوتـە هـیچ کـەس بـە وشەی (من) ڕاناوی خۆ دواندن، ناوی خـۆی هێنـابـێ[٩٠١] بڵـێ: گوتم، دەچـوم، ڕوبـەڕو بونەوەم کرد، پێم گوترا، پەیوەندیم پێوە کـرا. ئـاخۆ مـنو تـۆش دەمانـەوێ - بـەبێ گوێ پێدان- ئەو ئارەزوو خواستانە دابماڵینو، ڕازە دەرونیـەکان بنبـڕکەین؟! مـن لـە پۆلی دوەمی ناوەندی بوم لە پەیمانگای (ڕیاز)، دەستم لە شیعران وەرئەرداو بایەخم پێ ئەدا، چەند بڕگەیەکم لـە گۆڤـاری پـەیمانگادا نوسـی بـو هەنـدێ لـە مامۆسـتایان

٩٠١) بەڵکو وەکو ڕێزێك دەڵێن ئێمە وامان کرد/ وا دەڵێین.

سوپاسیان کردم، پێم وابو وەکو (ئەبو تەمام) یـا (موتەنـەبی) یـاخود کـەمێك لـەوان باشتـرم.

جارێکیان پۆلە قوتابیەك لە پەیمانگاییێکی ترەوە سەردانیان کـردین، ئاهـەنگێکیان بۆ ساز دراو، داواشیان لە من کرد هۆنراوەیـەك پێـشکەشکەم، سـەبارەت بـەوەی هـیچ کام لە قوتابیان هۆنیار نەبونو، یاخود وەکو من خوازیاری هۆنراوە نەبون، بۆیە بـە تایبەتی بەملی من داهات ﴿..فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ..(دنیابو) ئاوتان دەستنەکەوت، خوڵێکی پاك پەیدا بکەنو ڕوخـسارو دەسـتەکانتانی پـێ بهـەنون[٩٠٢]. ﴿النساء: ٤٣﴾.

هۆنراوەکەشـم خـستە بەرچاوی مامۆسـتای وێـژە لـە پـەیمانگا، بـە هۆنراوەکەیـدا هـەڵگوتو، دەربـڕینو وشـەکانی بـەرز نرخانـد، منـیش بـاوەڕم کـردو، لام وابـو زۆر سـەرنج ڕاکێشو نـاوازەو بێوێنەیـە، بـەڵام کاتـێ گـەورە بـومو، وێـژەم تـام کـردو، شیعرم ناسی، بە خۆمو هۆنراوەکەشم پێکەنیم. کە ئەمەش یەکێکە لە بڕگەکانی:

**لێـت بێ سـڵاو ئـەی پە یمـانگـەی خۆشـەویسـتیـم**
**بە خۆشـەویسـتی ئاوەدانی ئومێدی هەستو نەسـتم**

مـــنو تـــۆ چ مـــان پـــێدەبڕێ کەســـایەتی خـــەڵکان دابـــڕمێنین، خـــۆ ئـــەوان لـــە بەرەوپێشچونیان دوا ناکـەون، تـەنیا خواسـتو ئارەزویـان لـێڵ دەکـەینو، نـەیارێتیو ڕەنجاندنیان دەستەبەر دەکەین.

کەوایـە تـۆ هـەر ئەوەنـدەت لەسـەرە ستایـشی ڕوی درەوشـاوەی ژیـانی خـەڵکان بکەییو، بە خونەریتی بەرزیاندا هەڵبڵێی، بەهرەو چاکەیان بلاوێنیو، چاویـشت لـە خراپەو کەموکوڕیان بنوقێنی.

---

٩٠٢) پێ داماڵن.

## چ بچێنی هەر ئەوە دەدوریەوە

هەندێ لە کاراشنایان دەڵێن: ئەوەی چاو لە هەڵە دەگێرێ: وەکو مێش وایە کە تەنیا لەسەر برینان دەنیشێ، کەسانێکیش هەن بە وشەی (بەڵام) گرفتارن هەر کاتێ باسی یەکێکی لەلا بکرێ، دەڵێ: کەسێکی چاکە بەڵام، دوای وشەی (بەڵام) گوێ بگرە چی بەدوادا دێ: جوێن پێدان‌و وشەی ناشیاو زمان درێژی‌و بەدگۆیی‌و ڕیسوا گۆیی: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ... هاوارە لە هەرکەسێکی بە تەشەری خوسپکەرە. (١) الهمزة﴾.

﴿هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ ... هەر تانە لە خەڵك دەداو قسە بۆ ئەموئەو دەبا. (١١) القلم﴾.

﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ... پاشملەش خراپەی یەكتر مەبێژن. (١٢) الحجرات﴾.

دڵنیا بە ئاسودەیی من‌و تۆ بەندە بە ئاسو دەکردنی کەسانی ترو، دڵخۆشکردنیان، بەندە بە دانان بە بەهرەو تواناو چاکە کاریان. سەرنجیشم داوە بە پێی ڕێزگرتن مان لە خەڵك‌و بایەخ پێدان‌و دان پێداهێنانمان بە چاکەیان، قەدرو ڕێزو بایەخ پێدانی ئەوان دەستەبەر دەکەین.

بەگوێرەی پشت تێکردن‌و خۆ دورخستنەوەو لا لوتیمان، خۆ لادان‌و پشت هەڵکردن‌و لاساری ئەوان هەست پێ دەکەین. ﴿جَزَآءً وِفَاقًا ... پاداشێکە هەمبەر بە کردەوەیان﴾. (٢٦) النبأ﴾.

ئەو کەسە زیرەك‌و دانایە کێیە لە ئێمە دەیەوێ خەڵك قەدرو ڕێزی بگرێ‌و، کەچی خۆی حەز دەکا خەڵك بە سوك‌و چروك بزانێ؟!

پێی خۆشە خەڵك قوربان قوربانی بۆ بڵێ‌و، کەچی هەوڵ دەدا پێیان لەسەرسەری دابنێ؟! ئەگەر وابێ تەرازوەکە لاسەنگە، ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ... هاوارە لە سوك فرۆشان. (١) المطففين﴾.

# ڕەنجـی خـەڵـك بـەرز بنرخـێـنـە

لـە پەیوەنـدی کۆمەڵایەتیـدا ئـەوەم دەسـتەبەر کـرد، کـە ئـەوەی شـیاوی هاوڕێیەکەتە، بـەم چەشـنە پێشوازی لێبکـەی، هـەم خـۆت هـەم ئـەویش بەختـەوەر دەکەی، بـۆ نمونـە: بـەو نـاوەی پێـی خۆشـە بـانگی بکـەی، ئـەویش ئـەو ناوەیـە پێـی ناسراوە یاخود بە نازناو بۆی دانراوە.

هیچ کەس لەو کەسە ڕەزا تاڵو ساردو سڕتر نیە، کە بە ڕانـاوی نەزانـدراو بـانگی براکەی خۆی دەکا، دەڵێ: هۆی لەگەڵ تۆمـە، یـاخود هـۆی کـابرا. ئـاخۆ پێـت خۆشـە یەکێ لە ئاستی نـاوی تـۆدا خـۆی گێلـکا، یـا بـە نـاڕێکی نـاوی تـۆ هەڵدا، یـا نازنـاوت بشێوێنێ؟ پێم وا نیە پێت خۆش بێ!

شێوازی خۆ گێل کردنو داشکاندن واتای دڵ ئەستوریو ڕەزاگرانیو هەست ساردی دەگەیەنێ.

چەند جاران کاتێ پیاو وەژورێ ماڵێ کەوتۆتەوە، بینیوەتی هاوسەرەکەی ناو ماڵی ڕێك خستوەو، ڕوخساری ماڵەوەی ڕازاندۆتەوەو، بۆنو بە رامی خۆشـی بـەناو مـاڵدا پڕشـاندوە، کەچـی ئەوانـەی هـیچ لەبەرچـاوان نـەگرتوەو، تـەنیا بـە وتەیـەکیش سوپاسو پێـزانینی خـۆی دەرنـەبڕیوەو، لـە ڕاستیدا ئـەم هەڵسوکەوتە داڕوخانـدنی وزەو تواناو بە با هەڵکردنی بایەخ پێ دانە.

کەواتە سەنگو قەدری جگە لە خۆت بەهەند هەڵبگرەو بەرزی ڕابگرە، سوپاسو پێزانینت لە ئاقار کردەی خەڵکی دەربڕە، بە نیگاری جوانو ڕازاوەدا هـەڵبڵێ، بۆنی خۆشت پێ خۆش بێو، کاری چاکت پێ چاك بێ، ڕەوشتی بـەرزو جـوانو، هـۆنراوەی سەرنـج ڕاکێشو، نوسراوو کتێبی بە پێز، بە پەسند لە قەڵەم دە، بۆ ئەوەی ناوت لـە لیستی وەفـادارو دڵسۆزانو جوامێران تۆمار بکرێ.

## بارگــرانی لاســاکــاری مەخــەرە ســەر شــانــت

لە مەککەدا گوێم لە (عومەر ئەباڕیشــە) بو کە هۆنراوەکەی پێشکەش کرد:

ئەوەی ڕاستی بێ ئاوازی خۆش‌و جوان پێشکەش کـردن‌و بەرچاوخـستنی سـەرنجی ڕاکێشام، هۆنـراوەکەو شێوەی دەربڕینیشم لەبەرکرد، لەلای خۆمەوە هۆنـراوەیێکیـشم هەڵبەسـت‌و لـە ئاهـەنگێکی پـەیمانگای زانـستی هەڵسامەوە هۆنراوەکـە پێـشکەشکەم، ویستم بە پۆشتەی (ئەبا ڕیشــە) خۆم بپۆشم‌و چۆنی دەردەبڕی ئاوا دەربـبڕم، بـەڵام من (ئەبا ڕیشـە) نەبوم، بە گرانی دەرمدەبڕی‌و بێزارو ساردسـڕ بـوم، لـە دوای ئـەوە وازم لە دەمـە لاسکەیی هێناو، بە گوێرەی سروشتی خۆم هۆنراوەم دەخوێندەوە.

دیمەنی ئەو ئیمام‌و پشنوێژەی لە یەکێ لە مزگەوتەکانی شاری (جدە) کە نوێـژم لەدوا کرد، وەکو من بو، لە کاتێکا نوێـژی خـەوتنانم لـەدوا دەکـرد، دەیەویـست وەکـو قورئــانخوێنێکی نــاودار قورئــان بخوێنــێ، بــەڵام بەداخــەوە، دەنــگ‌و ئــاوازی تێــك نـەدەکردەوەو جیـاواز بـو، جەسـتەی ئـەو پێـشنوێژە تێـك دەهـەژاو، دەنگـی دەگـیراو هەناسەی نەئەدا، من لە تاوی ئەو شپرزەیی‌و نالەباریەی ئـەو کـە دەیەویـست بارێـك هەڵبگرێ لە توانای دانەبێ، لەجێی خۆمەوە ماندووشـەکەت بوم، تەواویش دڵنیـابوم کە خوای بێهاودەم‌و بێوێنە، هەر کەسەی بەهرەو تواناو سروشتێکی پێ بەخـشیوە، هیچیان بەهیچ ناچن: ﴿... لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ... بۆ هەر کۆمەڵێك لـە ئێوە ڕێو شوێنێکمان داناوە. ﴿٤٨﴾ المائدة﴾.

تۆ ئەگەر بتەوێ داهێنان‌و پێـشکەوتنێك وەدەسـت بـێنی هـەر ئەوەنـدەت لەسـەرە بـەپێی بـەهرەو سروشـتی خـۆت ڕێگــا بگریەبـەر: ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ... بێژە: ڕەفتاری هەر کەسێ بە پێی ئاکاری خۆیەتی. ﴿٨٤﴾ الإسراء﴾.

ئینجـا دەنگــت وە دەنگــی کــەس مەچــوێنە، زمانــت لــە وتوویـژدا وەکـو ئــەوان مەلەنگێنە، وەکو ئەوان دامەنیشـەو هەنگـاوت وەکو وان هەڵمێنــە، بۆئـەوەی خـۆت لە چنگی کۆیلایەتی لاســاکاری‌و، خۆ وێ چواندن دەربێنی‌و، باجی دەمە لاسکەییش

نـــەدەی. بێگومـــان ســـەرنج ڕاکێـــشانو ڕازاندنـــەوەو تـــامو بـــۆ پێـــوەرکردنی تـــۆ لەسەربەخۆییو داهێنانو کاریگەری خۆتدا بەرجەستە دەکرێ، لەوەدا وەدی دەکرێ بە تەنیاو سەربەخۆ بخەیە بەرچاوو پێشکەشـیکەی.

## ئەگـەر بارێکـت پێ هـەڵـناگرێ شـانی مـەدە بـــەرێ

لـە شـاری (ئـەبها) وتـاری هـەینیم دەخوێنـدەوە، زۆربـەی وتارەکانیـشم لەمـەڕ ژیاننامەی پێغەمبەری خوا بو - درودو سلاوی خوای لەسەر - خـەڵکیش بـە شـتێکی ئاسایی یـان دەزانـیو ئـەو پێشنیارەیان لا پەسـند بـو، جارێـك داوام لێکـرا بـاس لـە کێشەی گرانـی مـارەیی بکـەم، لەبەرئـەوەی خـەڵك پێویـستی پـێ بـو، ئـەو بابەتـەش پێویـستی بـە نمونـە هێنانـەوەی زینـدو باسـکردنی ڕوداوی نـاو خـەڵکی بـو، منـیش بەزۆری وایە لەو بابەتانە چالاك نیم، سەبارەت بەوەی بـەهرەو توانـاو چاپوکی مـن لـە بابـەتی (سیــرە)یـە بـەوەش ئاسودەو ئـارام دەبم، ئەوسـا وەڵامـی داخوازییەکـەم دایــەوەو ڕاســتەوخۆ وتــارێکم لەســەر گرانــی مــارەیی خوێنـدەوە چـەند ئایــەتو فەرمودەیەکم خوێندەوەو بەملاو ئەولادا دەڕۆیشتمو، هەوڵم ئـەدا جۆرەهـا بابـەتو باسو خواسی بێنمە نـاوێ، ئەوسا وتارەکـەم پتــر دابــڕ دابـڕو پارچـە پارچـە ئـەبو، ئارەقەم لـێ هەڵچۆڕاو، ئامـاری پاشەکشـەو ساردبونەوەم لـێ دیـار بـو، کۆتـاییم بـە وتارەکە هێنا، بەڵام نەمتوانی ناونیشانێك لەژێر تیشکی ئاسۆیەك هەڵبژێرم بیخەمە پاڵ ئەو وتارەم، کە ناوەکە وەکو ناوەڕۆکی پڕشو بلاو ساردو سڕ بـێ، دوای وتارەکـە دڵنیـا بـوم، کـە چـاکتر وایـە بـۆ مـن لـەبارەی شـتێکەوە بـدوێم لێـی وریـا بم، لەمـەڕ بابــەتێك وتــار بخوێنمــەوە تێیــدا چــالاك بم، هەســتو نەسـتی خـۆم لـەژێر بـاری ماندوێتیو شەکەتی خۆ ئازاردان دەربێنم. لە پەیامی خواشــدا هـاتوە: ﴿... أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ... منیش مایەی بارگرانی نیم.(٨٦) ص﴾.

پێشــەوا (عومەر)یش دەڵێ: خۆ ئازاردانمان لـێ قەدەغە کراوە.

ئێمـە ئەگـەر کامـەرانیو ئاسـودەییمان گـەرەك بـێ، بمانـەوێ بەرهـەمی جـوان بـۆ خەڵکان پێشکەشکەین، پێویستە ئەو کارو کردەوەیـە ئەنجامـدەین، کـە لـە توانامانـدا

هەبێ‌و، بەجێی خۆیو لە جێی خۆی پێمان دەستەبەر بکرێ، لە فەرمودەشدا هاتوە: ((ان الله یحب من احدکم اذا عمل عملا ان یتقنه ... خوا لە ئێوەی دەوێ، ئەگەر کردارێکتان ئەنجامدا بە ڕێك‌وپێکی ئەنجامی دەن)).

لەبەرئەوەی ڕێك‌و پێکی دڵ‌و دەرون لە دەردی پەشیمانی ڕزگار دەکا لە کێشەی سەرزەنشت‌و، گەڕاندنەوەی ڕاسپاردەکان بۆ لای خاوەندیان ناخ‌و دەرون دەحەسێنێتەوە.

## ئەو ژیانەی خۆت بێ بەرنامە بەڕێ مەکە

ڕۆژێ لە ڕۆژان دوازدە تەفسیرم بەیەکەوە کۆکردنەوە: تەفسیری: (طبري، ابن کثیر، بغوي، زمخشري، قرطبي، في الظلال، شنقیطي، رازي، فتح القریب، خازن، ابي مسعود، قاسمي...) پاشان بڕیارمدا ڕۆژانە ئایەتێك لە هەمو تەفسیرەکان سەرنجدەم، لە ئایەتی یەکەمەوە دەست پێ بکەم، ئەوسا دوەم پاشانیش سێیەم، بەمجۆرە هەتا هەر دوازدە تەفسیرەکە تەواو دەکەم، دوای ئەوە لە خۆم پرسی: باشە چیم لەبیر دەمێنێ هیچ شتێ نامێنێ، مەگەر واتای کتێبێك، کە بەزۆری وایە دەیزانم، بەڵام هەستم بە بێزاری‌و بێتوانایی کردو پاشەکشەم کرد، هۆکاری ئەوە بو ئەو جۆرە ڕێڕەوەی کتێب خوێندنەوە سەرکەوتو نیە، ڕێك‌و پێکی تێدا نیە، بەڵکە پەلەپەل‌و سەر پێیی یە.

## ئاخۆ دەتەوێ بە هێورەیی‌و هێواشی سودو کەڵك وەرگری؟

بەهۆی زۆری چاوگ‌و سەرچاوە سەری خۆت مەشێوێنەو بیرو هزرت مەپرشێنە، ناخ‌و دڵت شەکەت مەکە، بەڵکە پێویستە لەسەرت بەدوای پیلان‌و هەنگاوێکی سوك‌و ساناو سەرکەوتودا بگەڕێی، کە لە تاڵوکەو بێزاری دورتخاتەوەو، سەقامگیری‌و خۆڕاگریت پێ ببەخشێ، با هەرچەندە بەرهەم‌و داهاتەکەش کەمبێ، وەلێ کەمی بەردەوام بنەمایەکی ڕەسەنە.

پەسندترین کردەوەش بە لای پێغەمبەری خواوە - درودو سڵاوی خوای لەسەر ئەو کردەوەیە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێ، با هەرچەندە کەمیش بێ.

## پەرەدان بە نازو گوزی دنیا ئێوەی خافڵاند[٩٠٣]

دوای ئەوەی برە پارەیەکم کۆکردەوە، بە گەرمو گوڕێکی بێ وێنە بەرەو پەرتوك خانەی گشتی ڕۆیشتم، بڕیارمدا لە هەموجۆرە کتێبێك نوسخەیەك بکڕم، لەبەرئەوەی زۆر شەیداو ئەوینی کتێب بوم، سەر ڕەفەکانم پڕ لە کتێب کردبو لە هەمو بوارێکەوە، هەتاوەکو دەیەها کتێبم لە زانستی دەرونناسیو، وردیاتی (اصول الفقه)و، کتێبی بێوێنەی ڕۆشنبیری گشتی کڕی بو، ویستم دەست بە خوێندنەوە بکەم نەمزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم، کامەیان هەڵبژێرمو کامەیان هەڵبوێرم، سەیر دەکەم زۆریان یەکتر دوبارە دەکەنەوە، ئەوەی لەو کتێبەدا هەیە لەوی تریشیاندا هەیە، سەیرم کرد کۆمەڵە کتێبێك بە پێی پێویست سودم پێ ناگەیەنن، کۆمەڵێکی تر وتەی بێ واتاو وشەی بێ مانایان تێدا، چەند ساڵێکم بەسەردا تێپەڕی دەیان کتێب هەر لەسەر ڕەفەی خۆیان بونو یەکێکیانم لێ نەجوڵاند، تەنیا هەبونو ڕێزکردنو بەسەریەکدا کەوتنیان مایەی نیگەرانی من بو، هەتا ئەو کاتەی لەگەڵ کۆمەڵە زانایەکی وریاو دەستەیێك لە پیاوانی دانا دانیشتمو، حاڵو گوزەرانی خۆم بۆ باسکردن، بە ڕێگایەکی ڕاستو دروستیان ئاشنا کردم، کە ئەو کتێبانەی چاوگو سەرچاوەو بناغەن لە گشتیان بەهەرمێنترن، دەستیان پێوە بگرمو سودیان لێ وەرگرمو لێیان وردبمەوەو لێیان بکۆڵمەوە، ئەوانەی تریش وازلێبێنمو بۆ بەدوا گەڕانێكو هەر شتێکی تر هەڵیان بگرم. ئەوسا ئەو بۆچونەم لا پەسند بو، دڵم ئۆقرەی پێ گرتو، هەستو نەستم پێی ئاسودە بو.

جا ئەگەر تۆ پەرتوکخانەیەکت هەبو، ئارەزوی خوێندنەوەو سودوەرگرتنت هەبو، کامە کتێبی سەرچاوەو سودمەندترین کتێبە خۆیان پێوە سەرقاڵکەو دەستیان پێوە بگرە، بۆ ئەوەی لە چنگی زەین بڵاویو سەر لێ تێکچونو کات بە تاڵی ڕزگارت بێ.

---

٩٠٣) ئاماژەیە بۆ ئەو ئایەتە: ﴿أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴿٢﴾﴾ التكاثر.

﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ... شـانازیتان بـە فرەیـی ﴿مـاڵو منـاڵ﴾ ئێوەی بە خۆیەوە خافڵاند. ﴿٢﴾ التكاثر﴾.

بەو بۆنەوە چەند قوتابیەگی زانستیم بیرکەوتەوە دەربـارەی کتـێبی نـاوازەو کـەم وێنـەیان پرسیار دەکـردو، بـە دوای نوسـراوی نـامۆدا دەگـەڕانو، هەمیـشە خـەریکی کۆکردنەوەی کتێب بون، کەچی خوێندنەوەیان کەم بو، سـەبارەت بـە شـارەزاییان لـە بنـچینەو بنـەمای کتێبـان کـەم دەرامـەت بـون، هـەوڵو کۆشـشیان تـەنیا دەوڵەمەنـد کردنی پەڕتوکخانەکەیان بو، مەبەستیان سەرسوڕماندنی کەسانێ بو کە ناوی کتـێبی وای بۆ بێنن وەکو سمرخو شامەل بێ، یاوەکو گۆگردی سور بێ، لەوانیش هـەبو بـەوە داخدار بو تەفسیری (مقاتل)ی کوڕی (سـولەیمان)ی چـنگ ناکـەوێ، کەچـی تەفـسیری ئیبن کەسیری بـە تـەواوی نەخوێندۆتـەوە، لـەوانیش هـەبو ئـاخی بـۆ کتـێبی (فوائـد تمَام) هەڵدەکێشا کەچی دەربارەی (فتح الباري) تەنیا ناوەکەیو نـاوی دانـەرو ڕەنگـی بەرگەکـەی شـارەزا بـو، ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ... لەوانیـشدا ئـی وا هـەن کـە نەخوێنـدەنو بێژگـە ئـارەزو، لـە کتێـب سەردەرناکەن، ئەمانە هەر لە خەیاڵاتو گوماندان. ﴿٧٨﴾ البقرة﴾.

خۆت بە کوێرە ڕێی یان سەرقاڵ مەکەو ڕاستەڕێ لەبیـر مەکـە، لـەدوای جۆگـەلان مەڕۆو پشتیش لەسەرو چاوان هەڵمەکە. مایـەی هۆشمەنـدو بـیر تیـژی یـە: گرنگتـر دەسـت پـێ بکـەی ئەوسـا خـۆت بـە گرنگیـەوە سـەرقاڵـکەی، هـەر کەسـێکیش بـە خواستو مەبەستان ئاشـنا نـەبێ ڕێـی لـێ دورو درێـژ دەبـێو، باربەرەکـەی شـەکەت دەبێ، خۆشی ماندو هیلاك دەبێو، دەستیشی لە بنی هەمبانی دەردەچێ.

## تاوەکو ئەوپەڕی ئاسودەیی و ژیان بەسەر بەی

- باوەڕ ڕەوێنەری پەژارەیەو، لابەری ئەشکەنجەیە، بیلبیلەی چاوی یەکتاپەرستانو، دڵنەوای خواپەرستانە.
- ئەوەی چو چو، ئەوەی ڕابرا لەدەست چو، لە دو چوان مەچو، چونکە لەبەرچاو نەماو ون بو.
- لەو بەشە ڕۆزیەی بۆت دانراوە، لەو چارەنوسەی هەر دێتە ئاراوە ڕەزامەندی بنوێنە، هەمو شتێ بە بڕیارو قەدەری خوایە، واز لە بێزاری بێنە.
- ئاگادار بە دڵ بە یادی خوا دەسرەوێ، تاوانی پێ هەڵدەوەرێ، خوای نهێنی زانی پێ ڤایل دەبێو، دەردی پێ سارێژ دەبێ.
- چاوەڕێی سوپاسی کەس مەبە، پاداشتی خودات بەسە، کەسێ چاوچنۆکو سپڵەکارو ڕقەکارە کارت پێی نەبێ.
- کاتێ بەیانیت کردەوە چاوەڕێی ئێوارە مەبە، لە سنوری ئەو ڕۆژەدا ژیان بەسەر بە، کردو کۆشت لە پێناوی چاك سازی ئەمڕۆژمت دا بخەرە گەڕ.
- داهاتو بەلاوەنێ هەتا دێ، خۆت بە سبەی سەرقاڵ مەکە، چونکە ئەگەر ئەوڕۆت باش بێ سبەینێشت لەبار دەبێ.
- دڵوسینەت لە ڤایرۆسی چاوچنۆکیو ڕقوکینە چاك بکەوەو، ڕکابەری فڕێ بدە.
- تەنیا بەمەبەستی کاری چاکە لەگەڵ خەڵکدا تێکەڵ بەو، دانیشتوی ماڵی خۆت بەو، کەمێك لە خەڵکی دور بە.
- باشترین هاوەڵ کتێبە، ئینجا لەگەڵ کتێبدا بدوێو، هاوڕێی زانست بەو، لەگەڵ زانایان تێکەڵ بە.
- بونەوەر لەسەر یاسا ڕەخساوە، تۆش وریا بە ناوماڵو پەرتوکخانەت، بەرگو پۆشاكو ئەرکی سەرشانت ڕێكو پێك کە.

- بەرەو دەشتودەر دەرکەوە، لە مێرگو گوڵشەنی جوان ورد بـەوە، ڕوی خـۆت بـە لای جوانکاری نەخشو نیگاری وەدیهێنەردا لاکەوە.
- لەسەر پێکانـت بـڕۆو وەرزش ئـەنجام دە، خـۆت لـە تەمبـەڵیو سـستی بپارێزەو، پشت لە بێکاریو بەتاڵی هەڵکە.
- مێژو بخوێنەوەو، بیر لەسەر سوڕمێنەکانی بکەوەو، لـە سـەیرو سـەمەرەکانی ورد بەوەو، گوێت بۆ هەواڵو داستانەکانی بگرە.
- ژیـانی خـۆت نـوێ کـەوە، بـا شـێوازی گوزەرانـت هەمـە جـۆر بـێو، ئـەو ژیانـە هەڕەمەکیەی بە سەری دەبەی بیگۆڕە.
- واز لەو شتانە بێنە کە بە ئاگا کەرەوەن وەکو چایەو قـاوە، وریـا بـە خۆشـت لـە خواردنی دوکەڵو نێرگلە بە دور خەوە.
- بـە خـاوێنی پۆشـاکت بایـەخ بـدەو، خـۆت بـۆن خۆشـکە، ڕوکـاری خـۆت ڕێـکو پێککەو، سیواکو گولاویش لەبیـر مەکە.
- هەندێ لەو کتێبانەی دوچاری ڕەشبینیو بـەدبینیو داڕوخـانو هـەرەس هێنانـت دەکەن، مەیانـخوێنەوە.
- ئەوەت لـەیاد بـێ کـە پـەروەردیارت فـرە لێبوردەیـەو، ژێـوانی تـۆی قەبوڵـەو، لـە بەندەی خۆی چاوپۆشی دەنوێنێو، خراپە بە چاکە وەردەگێڕێ.
- لەسـەر بـەهرەی ئـایینو ژیـری، تەندروسـتیو بـەرگو پۆشـاك، بیـستنو بینـایی، ڕزقو ڕۆزیو ماڵو مناڵو جگە لەمانەش سوپاسگوزاری پەروەردیارت بە.
- ئاخۆ نەت بیستوە خەڵکانێ هەن هەستو ژیری یا تەندروسـتییان لەدەسـت داوە، یاخود کۆت بەندی زیندانن، یا بەربەلان یا بەدەست ئیفلیجی گرفتارن؟!.
- لەگەڵ قورئاندا ژیان بەسەر بە، لەبەریکەو بیخوێنەوەو لێی وردبەوەو گـوێی بـۆ بگرە، لە ڕاستیدا بۆ لابردنی خەمو پەژارە گەورەترین چارەسەرە.
- پشتت بە خوا ببەستەو کارو وەرامت بەوی بسپێرە، بە فەرمانی ئـەو قایـل بـەو، هانـا بـۆ لای ئـەو ببـە، لـە ژێـر سـایەی ویـدا خـۆت پـەنادەو ئـەو بـۆ تـۆ بەسـەو سەروزیادە.

- ئەوەی زوڵمی لێکردی چاوپۆشی لێ بنوێنە، ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندوی پەیوەندیەکە بگەیەنە، ئەوەی بێبەشی کردوی پێی ببەخشە، دەرحەق بەو کەسەی خراپەی لەگەڵ دا کردوی نەرمو نیانی بنوێنە ئاسودەییو کامەرانی وەدەست دێنی.
- ئەو دەستەواژەیە چەند بارە بکەوە: (لا حول ولا قوة الا بالله) بێگومان دڵت ئۆقرەی پێ دەگرێو، بارو گوزەرانت دەسازێ، باری سەر شانت سوك دەبێو، خوای گەورە پێی ڕازی دەبێ.
- داوای لێخۆشبون زۆر بکە، ڕزقو ڕۆزیو ماڵو منداڵو زانستی سودبەخشو ئاسانکاری بەدوادا دێو، دەروی خێرت لێ دەبێتەوەو، تاوانی پێ هەڵدەوەرێ.
- لە بەهرەو تواناو ڕوخسارت لە ماڵو حاڵو گوزەرانت ڕەزامەندی بنوێنە، هێمنیو هەداریت بەسەردا دەرژێ.
- دڵنیابە دوای ناخۆشی خۆشی دێ، ئازادیش دوا بەدوای چەوسانەوە دێ، بارو سەردەمیش هەر لە یەك شێوەدا ڕاناوەستێ، ڕۆژگاریش دەستاو دەستی پێ دەکرێ.
- گەشبین بەو لە ژین هیوا بڕ مەبە، نیەتو گومانت لە ئاستی پەروەردەکارتدا [٩٠٤] جوان بێو هەمو خێرو خۆشیێك لەویەوە چاوەڕێ کە.
- بەوەی خوا بۆی بڕیار داوی دڵت بسرەوێ، چونکە تۆ بەرژەوەندی خۆت نازانی، جاری وایە بەرژەوەندی تۆ لە تەنگانەدایە نەك لە هێمنایی.
- مەینەتی لە خوات نزیك دەخاتەوەو فێری نزاشت دەکا، خۆ پێ زۆریو لوت بڵندیو بە خۆ نازیت لەسەر لائەبا.
- تۆ لە ناخی خۆتدا چەندین گەنجینەی پڕ بە هات هەلگرتوە، چەندین سەرچاوەی بەهرەت لەلایەن خواوە بەسەردا هەڵڕژاوە.

---

٩٠٤) پەروەردگارت.

- چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بنوێنەو، خێرو خۆشی بۆ مرۆڤایەتی پێشکەش کە، تاوەکو بە سای دڵنەوایی نەخۆشێ، پێ بەخشینی هەژارێ، سۆز نواندنێ لە نێوانیاندا حەسانەوەت چنگ کەوێ.
- خۆت لە بەدگومانی بپارێزە، بیروبۆچونی نەخۆش‌و، خەون‌و خەیاڵی پڕوپوچ لەبیری خۆت فڕێ.
- دڵنیابە هەرتۆ بەربەلانی، هیچ کەس نیە لەخەم ڕەخسیبێو [905]، هیچ مرۆڤێ نیە بێ دەردی سەر بێ.
- گومانت نەبێ دنیا خانوی تاقیکردنەوەو دەردو بەلاو ئازارو ئەشکەنجەیە، هەرچۆنێ بێ لەگەڵیدا بگوزەرێنەو لە خوا کۆمەکی بخوازە.
- لەوانەی پێشەخۆت پەند وەرگرە کە بە ڕێڕەوی مێژودا گوزەریان کرد ئەوانەی بێبەش کران، کۆت بەندکران، ئازاردان، بە پەند بران، دوچاری ئەشکەنجە هاتن‌و، بەربەلا بون‌و، کوژران.
- بە هەر کام لەوانە گرفتار بی، دڵشکاو خاکە سار بی، پەڕاگەندەو پەرێشان بی، برسی‌و بێ نان‌و هەژار بی، دەردەدارو قەرزار بی، پاداشتت لە خوا وەردەگری.
- دڵنیابە تەنگانە چاوو گوێچکە دەکاتەوە، کەفوکوڵی هەوەسان دادەمرێنێ، دڵیش زیندو دەکاتەوە، پاداشتی بەندە زۆر دەکا، خودا وەبیر دەخاتەوە.
- پێشبینی ڕوداوان مەکەو، چاو لەدوای بەلایان شل مەکە، ملکەچی پڕوپاگەندە مەبەو، هەواڵی نادروست باوەڕ مەکە.
- زۆربەی مەترسی چاوەڕوانکراو نایێتە دیو، هەواڵ گەلێکی ناخۆشیش بەجێ نابێ، خودا بەسەو، کۆمەکی‌و چاودێریش لە دەرگانەی ئەودا چاوەڕێ کە.
- لەگەڵ کەسانێکی ڕەقە کارو چەپەڵکارو چاوتێوە بو دامەنیشە، چونکو ئەوان گیان‌و ڕۆح وێلك دێننەوە، ئەوان نوێنەری پەیامی ناخۆشی‌و هەڵگری خەم‌و پەژارەن.

---

٩٠٥) لەدەست خەم حەساوەبێ.

- بەر لە دەستپێکردنی نوێژی بەکۆمەڵ ئامادە بە، زۆریش لەناو مزگەوتدا بمێنەوەو، خۆت وا ڕابێنە دەستپێشخەری لە نوێژ بکەی، تاوەکو بەختەوەری دەستەبەرکەی.
- خۆت لە تاوان بپارێزە، چونکە گوناه چاوگی مەینەتیو کلۆڵی یە، هۆکاری کولەمەرگیەو، دەروازەی بەڵاباریو ناخۆشیە.
- لەسەر ئەم نزایە بەردەوام بە: ﴿...لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ... لە غەیری تۆ هیچ خودایێ شك نابەم، پاکیو بێ عەیبی بۆ تۆیە، من لە ڕیزی ناهەقان بوم..)) نهێنیەکی سەر سوڕمێنی تێدایە سەبارەت بە ڕەواندنەوەی پەرێشانیو، هەواڵێکی پڕ بایەخی لەخۆ گرتوە لە مەڕ لابردنی مەینەت باری. ﴿٨٧﴾ الأنبياء ﴾.
- بە هۆی وتەی بێ واتاو قسەی بێ مانا کە سەبارەت بە تۆ گوتراوە، هەراسان مەبە، چونکێ خاوەنەکەی ئازار دەدا تۆ ئازار نادا.
- وتەی ناشیرینی دوژمنانو جوێندانی ڕەشك پێ بەرانی تۆ، لە پای سەنگو ڕێزی تۆیە، ئاماری ئەوەیە تۆ هەی، کەسێکی خاوەن بەهرەی.
- دڵنیابە ئەوەی بە خراپە لێت دەدوێ، چاکەی خۆی بەتۆ دەبەخشێ، تاوانت لێ هەڵدەوەرێنێو، ناوو دەنگت پەیدا دەکا، ئەوەش بەهرەیەکە خەڵاتت دەکا.
- لە نواندنی بەندایەتیدا خۆت ئازار مەدە، دەست بە سوننەتەوە بگرەو، لە خواپەرستی زیادەڕۆیی مەنوێنە، مام ناوەنجێتی هەڵبژێرەو، بەقەد بەڕی خۆت پێ ڕاکێشە.
- با یەکتاپەرستیت هەمیشە پاكو بێگەرد بێ، تاوەکو سینەو ناخت بسرەوێ، ئینجا بە ئەندازەی پاكو پاراوی یەکتاپەرستیو پاكو بێگەردی ئاسودەییت بەسەردا دێ.
- کەسێکی دەرون قایمو جەربەزە بە، خۆ ڕاگربە، تۆ خاوەنی ورەو وزەیەکی پڕوپاگەندەی جەرگ بڕو دڵتەزێن ویستو مەبەستت لەگۆڕ نەنێن.

- وریا بە کەسێکی دەست کراوە بە، چونکە ئەو کەسەی دەستکراوەیە سینەو ناخی ئاوەدانەو کراوەیە، ئەوەی ڕژدو دەست قوچاوە سینە تەنگو دڵ تاریکە، هەستو نەستی ئاڵۆزاوە.
- بەڕوی خەڵکیدا بگەشێوە خۆشەویستییان وەدەست دێنی، بە نەرمی بیاندوێنە جێی خۆت لە دڵیاندا دەکەیتەوە، بێفیزبە لە ئاستیاندا، بەرێزەوە سەیرت دەکەن.
- وەرامی خراپە بە چاکە بدەوە، لەگەڵ خەڵکدا نەرمونیان بە، گڕی ڕقەبەری بکوژێنەوە لەگەڵ نەیارانتدا ئاشتەوایی بنوێنەو، دۆستو خۆشەویستانت زیادکە.
- گەورەترین دەروازەی بەختەوەری پارانەوەی دایكو باوکە، ئەوسا هەوڵدە بە سای چاکە لەگەڵداکردنیان نزات بۆ بکەن تاوەکو ببێتە قەڵایەکی توندو بەند لە هەمو ناخۆشیەك بتپارێزێ.
- خەڵکت بەو ڕەوشەی خۆیان قەبوڵ بێ، ئەوەی لێیانەوە ڕوئەدا چاوپۆشی لێ بنوێنە، دڵنیاشبە ئا ئەوەیە دانانو بڕیاری خوا سەبارەت بە ژیانو نەریتی خەڵکان.
- لەناو خەیاڵدا مەگوزەرێنە، بەڵکە لەگەڵ بەرچاو بینیدا ژیان بەسەر بە، تۆ دەتەوێ خەڵك بارێکی وا هەلگرن کە بۆخۆت پێت هەڵناگرێ، دەسا کەسێکی دادوەر بە.
- ژیانێکی ئاسایی بەسەربە، زیادە ڕۆو سنوربەزێنو لوت بەرز مەبە، هەر کاتێ جەستە نازو گۆز بەخۆیەوە ببینێ، گیانو ڕۆح خۆی وێك دێنێ.
- دەست بەو نزاو پاڕانەوانە بگرە کە بە چەند بۆنەیێکەوە تایبەت کراون چونکێ ئەو نزایانە پارێزگاری لە تۆ دەکەنو دەتپارێزن، ئەوەندە کارسازیو ڕێنمایەی تێدایە کاروباری تۆ ڕێك دەخەن.
- کارەکانت دابەشکەو لە یەك کات ئەنجامیان مەدە، بەڵکە ماوە ماوە ئەنجامیان دەو، جار بەجار پشو بدە تاوەکو بەرهەمەکەت چاكو لەجێ بێ.

- سەرنجی کەسانێ بدە لە تۆ بەرەو خوارن لەمەڕ لەش و لارو ڕەنگ و ڕوخسارو، خانوبەرەو، ماڵ و منداڵ و، پلەو پایەدا، بۆ ئەوەی بزانی تۆ لە سەرەوەی هەزاران کەسانی.
- دڵنیابە هەرکەسێ تۆ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەی، وەکو دۆست و براو، خزم و کەس و، منداڵ و خێزان، بێ کەم وکوڕی نین، خۆت وا ڕابێنە لەگەڵ گشتیان بگونجێی.
- ئەو بەهرەی پێت بەخشراوە، ئەو زانستەی پێی ئاسودەی، ئەو ڕۆزیەی بەسەرتدا ڕژاوە، ئەو کارو پیشەی شیاوی تۆیە لەدەست خۆی مەدە.
- ئاگاداربە هەستی هیچ تاکێک و کۆمەڵێك بریندار مەکە، با زمانت پاك بێ و وتەو پەیڤت پاك و پاراو بێ و، خەڵك لە دەستت بێوەی بێ.
- بزانە پشو درێژی مایەی سڕینەوەی هەڵەکانەو، نەرم و نیانی داپۆشینی تاوانەو، دڵفراوانیش پۆشاکێکی بەر فرەیەو کەم وکوڕی دەشارێتەوە.
- ماوەیەك بوار بەخۆت بدە کاروبارت هەڵسەنگێنی و، بەخۆتدا بچیەوە، بیر لە دوارۆژت بکەیەوەو، کاری دنیات ڕێك و پێککەی.
- پەڕتوکخانەی ناو ماڵەکەت باخێکی بەرهەمدارەو گوڵشەنێکی پڕ گوڵزارە، جا لەگەڵ زانایان و دانایاندا، لەگەڵ وێژەرەوان و شاعیراندا بە خۆشی تیایدا بگوزەرێ.
- ڕۆزی حەڵاڵ وەدەست بێنەو لە حەرام خۆت بپارێزە، دەست لەبەر خەڵکی پان مەکەوەو، بازرگانیش چاترە لە فەرمانبەری، بە ماڵی خۆت مامەڵە بکەو ژیانێکی مام ناوەنجیانە بەسەر بە.
- بەرگێکی ئاسایی بپۆشە، نەوەك پۆشاکی کەسانێکی لوت بڵند، یاخود بەرگی کەسانی داماوو نەدار، وەکو خەڵکی ئاسایی بەو بە پۆشتە شان و باڵت دەرمەخە.
- ڕق دامەگرە چونکە تورەیی ئارەزو دەوروژێنێ، خوورەوشت دەشێلوێنێ و هەڵسوکەوت دەڕوشێنێ و، خۆشەویستی تێکدەداو پەیوەندی دەپچڕێنێ.

- جار بەجار گەشت ئەنجام دە تاوەكو ژیانت نوێ بێتەوە، جیهان گەلێكی تر ببینەو، دروشمو نیشانەی تازە سەرنج بدەو، شارو شارۆچكەی تر بگەڕێ چونكێ گەشتو گەڕان دڵ خۆشكەرە.
- یادەوەرییێك لە باخەڵی خۆتدا هەڵگرە كاروبارو كاتو ساتی خۆتی پێ ڕێكو پێككەی، وادەو بەڵێنت بێنێتەوە یادو، پێشنیاری تێدا تۆماركەی.
- تۆ لە سڵاوكردنا دەستی خۆت وەپێش بێخەو، بە خەندەوە پێشوازی لە خەڵك بكە، بە گەورەشیان بنرخێنە، بۆ ئەوەی جێی خۆتیان لە دڵدا بكەیتەوەو بە لایانەوە خۆشەویست بی.
- متمانەت بەخۆ هەبێو پشت بە خەڵكی مەبەستە، مەزەندەت وابێ ئەوان نەیاری تۆنە نەك لە بەرژەوەندی تۆنە، لات وابێ تەنیا خوات لەگەڵدا، بە دۆستانی كاتی هێمنایی هەڵمەخەڵەتێ.
- كارو پیشەت دوا مەخەو، ئەورۆ بە سبەی بە ئەركەكانت مەكە [٩٠٦]، خۆت لە وشەی (لەمەودوا) بپارێزە، چونكی ئەوە هێمای تێشكانو دۆڕانە.
- سەبارەت بە بڕیاردان دڵ لەدڵ مەدە، وریا بە لە نواندنی هەڵوێستدا ڕاڕایی نەنوێنی، بەڵكە ورە بەرزو یەك بڕیاربەو هەنگاو بنێ.
- تەمەنی خۆت لەوەدا بەفیڕۆ نەدەی لەمەڕ ڕەچاوكردنی تایبەتمەندیو كارو پیشەدا هەر جارە بە لایێدا غاردەی، چونكێ ئەوە وا دەگەیەنێ هیچت بە هیچ نەكردوە.
- بە ڕەشكەرەوەكانی تاوان دڵت بسرەوێ، وەكو كردەی چاكەو، كارەساتو، تۆبە كردنو، نزای موسڵمانانو، سۆزی خوای میهرەبانو، تكا كردنی پێغەمبەرمان، - درودو سڵاوی خوای لەسەر -.
- دەستت لە خێر مەگێڕەوە، هەرچەندە بە كەمێكیش بێ، خێرو چاكە تاوان هەڵدەوەرێنێو، دڵ دەسرەوێنێ، خەم دەڕەوێنێو، فەڕو پیت دەبارێنێ.

---

٩٠٦) مەڵێ ئەورۆ نا سبەی ئەو كارە ئەنجام دەدەم.

- (موحەممەد)ی پێشەوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - بکە پێشەنگی ڕێگات، بە ڕاستی هەر ئەو پێشڕەوی بەختەوەری‌و، ڕێ نیشاندەری سەرفرازییە، بەرەو ئازادی‌و لوتکە ڕێنماکارە.
- بڕۆ سەردانی نەخۆشخانە تاوەکو بەهرەی تەندروستی بناسی، بچۆ دیدەنی بەندیخانە هەتا بەهرەی ئازادی وەدی کەی، سەرێك لە شێتخانە بدە بۆ ئەوەی بە بەهرەی ژیری ئاشنا بیت، چونکە تۆ لە ناو نازو گۆزی زۆردای بەڵام دەرکی پێ ناکەی.
- بە شتی کەمبایەخ مەڕوخێ، کێشەکە لە خۆی گەورەتر مەکە، خۆت بپارێزە لەوەی کارەکان بە دێوەزمە سەیرکەی‌و زیادەڕۆیی لە ڕوداوان بکەی.
- کەسێکی سینە فراوان بە، ئەوەی ئازارت دەدات بڕو بیانوی بۆ بێنەوە، بە دور بە لەوەی چاو لە تۆڵە بگێڕی، بۆ ئەوەی بە ئارامی‌و هێورەیی ژیان بەسەربەی.
- بە سای ڕو گرژی‌و دڵ پەستیت دوژمنانت دڵ خۆش مەکە، ئەوان هەر ئەوەیان لە تۆ دەوێ، کەوایە ئەو ئاواتە گەورەی هەیانە دەربارەی تاڵکردنی ژیانی تۆ، مەیهێنە دی.
- لەناو ناخی خۆتەوە کورەی دژەکاری‌و ڕق‌و کینە سەبارەت بە خەڵکان‌و نەویستی کەسانی تر، هەڵمەگیرسێنە، چونکە ئەوە هەمیشە خۆ ئازاردانە.
- لە کۆڕو دانیشتنتدا گران‌و سەنگین بەو، تەنیا دەربارەی چاکە بدوێ، ڕوگەش بەو، لەگەڵ دانیشتوانتدا بەڕێزبەو، گوێت شلکەو، قسەیان پێ مەبڕە.
- وەکو مێش مەبە کە تەنیا لەسەر برینان دەنیشێ، بەدوربە لەوەی باس لە شەرم‌و ئابروی خەڵك بکەی‌و، دەربارەی خەوش‌و نەنگییان [٩٠٧] بدوێی، بە هەڵەیان دڵخۆش بی‌و بەدوای پەڵەیان دابگەڕێی.
- باوەڕدار سەبارەت بە لەدەستچونی دنیا دڵ گران نابن‌و، بایەخی پێ نادەن، بە سای کارەساتەکانیشی ناشڵەژێن، لەبەرئەوەی دنیا بێ نرخ‌و بێ بایەخەو کۆتایی دێ‌و دەبڕێتەوە.

---

[٩٠٧] عەیب و عاریان.

- لە ئەوین و دڵداری بەدوربە، لە خۆشەویستی حەرام پشت هەڵکە، چونکە مایەی نەخۆشی دڵ و ئازاری گیانە، بەرەو خواو یادو گوێ ڕایەڵی ئەو ڕابچڵەکێ.
- چاو بەرهەڵدان بەرەو حەرام خەم و پەژارەت بەسەردا دێنێ و هەستت دەوروژێنێ، کەسی بەختەوەریش ئەو کەسەیە لە پەروەردیاری بترسێ و چاو لە ئابڕوی خەڵك نەگێڕێ.
- ژەمەکانی خواردنت ڕێك و پێك کە، خواردنی بە کەڵك بخۆ، زۆر خۆریش مەبە، لەسەر تێریش مەخەوە.
- لەکاتی ترسان لە ڕوداوێ لای هەرە خراپەکەی پێشبینی بکە، پاشان خۆت وا ڕابێنە قەبوڵت بێ ئەوسا هەست بە هێمنی و حەسانەوە دەکەی.
- ئەگەر پەت توند بو دەپچڕێ، ئەگەر شەو ڕەش هەڵگەڕا ڕۆژی بەدوادا هەڵدێ، ئەگەر کارو وەرامت لێ وێك هاتەوە فراوانی لەدواوە دێ، مەینەتییێکیش بەسەر دو خۆشیاندا زاڵ نابێ.
- لە میهری میهرەبان بیرکەوە، میهری بۆ خراپەکارێك نواند سەبارەت بەوەی سەگێکی تێراو کرد، چاوپۆشی لە یەکێك نواند کە سەت کەسی کوشت، دەرگای تۆبەی لەسەر پشتە بۆ کەسانێ ژێوانی خۆیان دەردەبڕن، بانگی گاورەکانی کرد بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە.
- دوای برسێتی تێرییە، دوای تێنوێتی تێراوییە، دوای نەخۆشی لەش ساخیە، دوای نەبونی هەبویی یە، دوای پەژارەش دڵ خۆشیە، ئەوەش ڕێساییێکی تا هەتایی یە.
- بیر لەم سوڕەتە بکەوە: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ... ئەدی ئێمە تۆمان سینە فراوان نەکرد؟ ﴿١﴾ الشرح﴾. لە تەنگانەدا وەبیرەخۆتی بێنەوە، دڵنیاش بە گەورەترین داودەرمانە لەکاتی ناخۆشیدا.
- سەبارەت بە نزای تەنگانە تۆ لە کوێ خۆت حەشار داوە، کە دەڵێ: ((**لا اله الا الله العظيم الحليم، لا اله الا الله رب السموات، رب الارض رب العرش الكريم**... هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لە خوای بەدەسەڵات و نەرمونیان، پەرستراوی ڕاستەقینە نیە جگە لە پەروەردیاری ئاسمان و زەوی و تەختی پیرۆز.

- تـورە مەبـە ئەگـەر تـورەش بـوی پـەنا بگـرە بـە خـوا لـە شـەیتانو بـێ دەنگـی بنوێنەو، جێگای خۆشـت بگۆڕە، ئەگەر لە پێوە بـوی دانیـشە، دەسـتنوێژ بگـرەو، زۆر نزا بکە.
- لەمەڕ کۆستو بەڵا هەراسان مەبە چونکێ مایەی وزەی دڵەو، تامی چاکبونەوەی پێ دەچێژی، تینو توانات پێ دەبەخشێو، فێری ئارام گریت دەکاو، شانو شکۆت بەرز ڕادەگرێ.
- پێـدا هەڵـچونەوە بـە ڕابـردودا گـەوجیو نەفامیـە، وەکـو هاڕینـەوەی ئـاردو بڕینەوەی پوشـکەی دارە، وەك ئەوە وایە کۆنەکا بەباکەی.
- لە ڕودانی کارەساتدا لای ڕۆژهەلاتەکەی ڕەچاوکە، چاوت لـە وەرگرتنـی پاداشـت بێ، دڵنیاش بە لەوە ناخۆشتر هەیە، بە بەلاباران دڵـت بدەوە.
- ئەو بەلایـەی بـۆ تـۆ بـێ بەسـەرتدا هـەڵنابرێ [908]، ئـەوەی بەسـەرەتۆش نـێ سـەر دەکـاو تـۆ ناپێکـێ، ئـەوەی تـۆی پـێ دوچـار دەبـێ قەڵـەمی لـێ وشـکەوە بـوە، ناشتوانی لەبەر قەدەری خوا ڕابکەی.
- زەرەرمەنـدیت بـەرەو قـازانج وەرچـەخێنە، لـە لیمـۆ خۆشـاوی شـیرین بـسازێنە، مشتێ شەکر لەناو ژەهراوی ژیانکەو، لەگەڵ ناڵەباری خۆتدا خۆت لەبارکە.
- لە میهری خوا هیوا بڕ مەبەو، لە سۆزی خـوا بـێ ئومێـد مەبـە، کۆمـەکی خـوات لەیاد نەچێ، چونکێ یارمەتی خوا بە پێی پێویست دادەبازێ.
- ئـەوەی پێـت ناخۆشـە زیـاتر بەرژەوەنـدی تێدایـە لـەوەی پێـت خۆشـە، تـۆ لـە پاشەڕۆژ ئاگادار نـی، چـەندین خۆشـی لـەژێر تـوێکڵی ناخۆشـیدا سـەریان هەڵـدا، چەندین بەهرە لە پاش پەردەی مەینەتیدا هاتنە ئارا.
- جڵەوی خەیاڵت توند بگـرە بـۆ ئـەوەی لـە دۆڵایـی کلۆڵیـدا دوچاری سەرکەشیت نەکا، هەوڵدە بیـر لە بەهرەو بەخششو خەلاتی خەلات کراوت بکەیتەوە.
- لە شڕو شەپڕێوی پەڕتوکخانەکەتو قاوو قیژی ناو ماڵەکەت خۆت بـەدور بگـرە، هێمنیو هەداریو ڕێکوپێکـیش ئاماری بەختەوەریە.

---

[908] لەسەرت تێناپەڕێ.

- نوێژ چاکترین یارمەتیدەرە لەسەر کاری گران، دەرون بەرەو ئاسۆو لوتکە بەرز دەکاتەوە، گەشتو گوزار بە گیانو ڕۆح دەکا لە ئاسمانی ڕۆشناییو سەرفرازیدا.
- کاری بە سودو بەردار دەرون لە چنگی خەونو خەیاڵی پڕوپوچو، هەستو نەستی تاوانکاریو، خواستو ئارەزوی حەڕام دەردێنێ.
- بەختەوەری درەختێکە بە ئاوو هەواو توێشوو ڕۆشنایی باوەڕ بە خواو ڕۆژی دوایی ڕواوە.
- ئەو کەسەی خاوەنی خوو نەریتێکی ساخو گونجاوە، ڕەوشتی بەرزە، هەم خۆی بەختەوەر کردوەو خەڵکانیش بە سای وی بەختەوەرن، هەستو نەستیشی لەبارو ڕەخساوە.
- با دڵت کەمێك وەحەسێ چونکە دڵیش ماندوو شەکەت دەبێ، جۆرەها شێوازی لەگەڵدا بەکاربێنەو، زانست گەلێکو چەندین چەشنی زانیاری بۆ دەستەبەرکە.
- زانست دڵ دەسرەوێنێ، بیرو هزر بەرفرە دەکا، ڕوبەرێکی والا لە ڕوی دەرون دەکاتەوە، ئەوسا خەمو خەفەتو دڵ پەستی لەکۆڵ دەکاتەوە.
- سەرکەوتن بەسەر کۆسپو تەگەرەداو، زاڵ بون بەسەر ناخۆشیەکاندا مایەی بەختەوەرین تامو چێژی رزگاربونو خۆشیو شادی دەربازبون بە چەشنێکە هیچ خۆشیەك لەگەڵیدا بەراورد ناکرێ.
- ئەگەر خوازیاری وەکو خەڵك ئاسودە بی بەم شێوەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە کە پێت خۆشە هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکەن، کەلوپەلیان بەکەم مەنرخێنەو، لە سەنگو ڕێزیان دامەبەزێنە.
- ئەگەر مرۆڤ خۆی بناسێو، ئەو زانستەش کە شیاوی ئەوە بیزانێو بە جوانترین شێوە پێی هەڵستێ، تامو چێژی سەرکەوتنو بردنەوە دەچێژێ.
- زانیاریو شارەزاییو تاقیکردنەوە گەورەترین دەستمایەن، چونکە کەیفخۆشی بە سامان ئاژەلانەیەو، ئاسودەبونیش بە زانیاری مرۆڤانەیە.

- ئەگەر لە ژن‌و لە مێرد یەكێكیان تووڕەبو با ئەوەی تریان بێدەنگ بێ، با هەر كامیان ئەوی تریانی بە كەموكوڕیەوە قەبوڵ بێ، گومان لەوەدا نیە هیچ كەس بێ خەوش نیە.
- هاونشینی چاك‌و ئومێدەوار بارگرانیت بۆ سوك دەكا، دەروازەی هیوا دەخاتە سەر پشت، مەردمی بەدبینیش دنیات لەبەر چاوان تاریك دەكا.
- هەر یەكێ خاوەنی هاوسەرێك‌و خانوێك بێ‌و بە ئەندازەی پێویستی ماڵی هەبێ ئەوپەڕی خۆشگوزەرانی پێ بڕاوە، لەوە زێتر تەنیا مایەی خەم‌و پەژارەیە، ئەوسا با سوپاسی خوا بنوێنێ‌و قایل بێ.
- ((من أصبح منكم آمنا في سربه، معافى في جسده، عنده قوت يومه، فكأنما حيزت له الدنيا.... هەر كەسێ بە دڵێكی ئارام‌و لەشێكی ساغەوە بەیانی كردەوە، بژێوی ڕۆژێی هەبو، هەروەكو دنیای پێ بڕا بێ وایە)).
- ئا ئەوانەش بنچینەی ڕەزامەندین: ((من رضي بالله ربّاً، وبالاسلام دينا، و بمحمد ﷺ رسولاً، كان حقا على الله ان يرضيه... هەر یەكێ قایلبێ بەوەی خوا پەروەردیاری بێ‌و، ئیسلام ئایینی بێ‌و، (موحەممەد)یش - درودو سڵاوی خوای لەسەر - پێغەمبەری بێ، دەبێتە حەق‌و مافێك بەسەر خواوە قایلی بكا.
- بنەمای سەرفرازییە، كە خوا لێت ڕازی بێ‌و دەوروبەریش پێت قایل بێ‌و، دەرونیشت قایل بێ‌و، كردەی بەرداریش فەراهەم بێنی.
- خواردن مایەی بەختەوەری یەك ڕۆژە، گەشت‌و گوزار مایەی بەختەوەری هەفتەیەكە، ژن هێنان مایەی بەختەوەری مانگێكە، ماڵ‌و دارایی مایەی بەختەوەریساڵێكە، بەڵام باوەڕ تا هەتایە بەختەوەری دەستەبەر دەكا.
- خواردن‌و خواردنەوەو خەوتن لەگەڵ ژن مارەكردن ئارام‌و ئاسودەت ناكەن، بەڵكە كردەوە كامەرانیت بۆ دێنێ، هەر كردەوەش بو پلەو پایەی بۆ جوامێران لەسەر گۆی زەوی پەیدا كرد.

- هەر كەسێ بۆی بڕەخسێ كتێب وەخوێنێ بێگومان بەختەوەرە، چونكێ لە گوڵشەنو باخی جیهان میوە دەچنێو، لە دەوری سەرسوڕهێنەرەكانی دنیا دەخولێتەوەو، كاتو شوێنیان بەسەر دەكاتەوە.
- وتووێژی گەڵ دۆستان ڕەوێنەرە بۆ خەمان، گاڵتەو گەپێ بێ درۆ هەستو نەست دێنێتەوە سەرخۆ، گوێ هەڵخستن بۆ هۆنراوە، زەین جۆش دەداتەوە.
- خۆت ئەو كەسەی بە تێڕوانینت ژیانی خۆت دەڕەنگێنی، ئەوسا ژیانت لە دەرەنجامی تێڕوانین تە، كەوایە چاویلكەی تاریك لە چاوان مەكە.
- یادی ئەوانە بكەوە خۆشتدەوێن، تەنیا چركەیێكیش لە ژیانی خۆت بۆ كەسانێ تەرخان مەكە حەز بە چارەیان ناكەی، چونكە ئەوان نە بە تۆو نە بە خەمو پەژارەی تۆ ئاشنا نین.
- ئەگەر خۆت بە كردەی بەردار سەرقاڵ كرد هەستو نەستت دەسرەوێ، دەرونت ئاسودە دەبێ، هێمنیو هەداری داتدەپۆشێ.
- بەختەوەری لە بنەماڵەو پلەو پایەو زێڕو ئاڵتوندا وەدی ناكرێ، بەڵكە لە ئایینو لە زانستو خووڕەوشتو دەستەبەركردنی ئەقڵو ژیریدا وەدی دەكرێ.
- بەختەوەرترین بەندەی خوا بەلای خواوە دەستكراوەترینیانە لەمەڕ چاكەوە، ئەوەیانە لە هەموویان پتر چاكەی بەسەر دۆستانەوە هەبێو، سەبارەت بەوە بە جوانترین شێوە سوپاسی بكرێ.
- ئەگەر بە سای ئەو كاتو ساتەی بەردەستت نەحەسێیتەوە چاوەڕوان مەبە حەسانەوەت لە ئاسۆوە بەسەردا بێتەخوارێو لە ئاسمانەوە دابڕژێ.
- سەركەوتنو بەرهەمی كردەوەو ئەو فەڕو چاكەی پێشكەشی دەكەی سەرنج بدە، دڵت پێ بسرەوێو، سوپاسی خوای لەسەر بكە، بێگومان ئەوە یەكێكە لەوانەی سینەو ناخت فراوان دەكا.
- ئەو خوایەی خەمی دوێنێی لەكۆڵ كردیەوە خەمی ئەوڕۆو سبەینەشت بە تەمای ئەوە، ئینجا پشتت بەوی ببەستە، ئەگەر ئەوت لەگەڵ دابێ لە كێ دەترسێی؟ ئەگەر ئەویش نەیارت بێ كێت لە یارە؟.

- لە نێوانی تۆو دەوڵەمەندەکاندا یەك ڕۆژ هەیە، بەڵام دوێنێ ئەوان هەست بە تام‌و چێژی ناکەن، سبەینەکەش نە بۆ تۆیەو نە بۆ ئەوان، بەڵکە تەنیا ئەمڕۆیان لەبەردەستە، ماوەی ئەمڕۆش چەند کورتە!
- شادمانی ناخ‌و دەرون چاپوك دەکا، دڵ ئاسودەو ئارام دەکا، هاوسەنگی لە نێوانی ئەندامانی جەستە دروست دەکا، هێزو وزە دەستەبەر دەکا، ڕەونەق بە ژیان دەبەخشێ، تەمەن بەهرەمەند دەکا.
- دەوڵەمەندی‌و ئاسایش‌و تەندروستی‌و خواپەرستی کۆڵەکەی بەختەوەرین، نە مەردمی بێ دەستمایە، نە ترسەنۆك، نە نەخۆش، نە بێباوەڕ حەساوە نین، بەڵکە لە ناخۆشیدا دەگوزەرێنن.
- هەر کەسێ بە هاوسانی ئاشنابێ ئاسودەیی دەرك پێ دەکا، هەر یەکێ ڕێگای مامناوەندێتی بگرێتەبەر سەرفرازی بەدەست دێنێ، هەر کەسێ ئاسانی هەڵبژێرێ سەرکەوتن بەشی دەبێ.
- تەنیا وشەی: (ئێستا) لە کات‌و ساتی ڕۆژگاردا وەردەگیرێ، لە فەرهەنگی بەختەوەریشدا تەنیا واژەی: (ڕەزامەندی) وەدی دەگرێ.
- ئەگەر بە کارەساتێك گرفتار بوی پێشبینی لەوە خراپتر بکە بارسوکیت بۆ دروست دەبێ، بیر لەوە بکەوە کە بە خێرایی تێدەپەڕێ، گەر بهاتایە ئەشکەنجەو ئازاری بەڵاباری نەبوایە چاوەڕێی حەسانەوەو هێورەییت نەدەکرد.
- ئەگەر کەوتیە ناو تەنگانە بیرکەوە چەند جارە دوچاری ناخۆشی هاتی‌و خوا دەربازی کردی، لەو هەڵەدا هەست پێ دەکەی ئەو خوایەی جاری یەکەم فریاتکەوت بۆ جارێکی تریش لە فریات دێ.
- ئەو کەسەی دەرحەق بە ڕۆژی ژیانی ستەمکارە ئەو کەسەیە ماوەی ئەو ڕۆژە بە فیڕۆ بدا لە دانەوەی مافێك، یاخود بەجێهێنانی فەرزێك، یا دەستەبەرکردنی جوامێرییەك، یا پەیداکردنی سوپاسێك، یا فێربونی زانستێك، یا گەیاندنی پەیوەندی خزماتیەك، یا ئەنجامدانی چاکەیەك خەرجی نەکا.

- پێویستە هەمیشە کتێبێکت لەدەست دابێ یا لەلات بێ، چونکێ زۆر کاتو سات هەن بێهودە بەڕێ دەکرێن، کتێبیش چاترینی ئەوشتانەیە کاتیان پێ دەپارێزرێو، ڕۆژگاریان پێ ئاوەدان دەکرێ.
- ئەو کەسەی قورئانی دەرخ کردوەو شەوو ڕۆژ دەیخوێنێ، لەناو بێزاریو وەڕەسیو بەتاڵی نانالێ، چونکو ئاسودەیی هەمو ژیانی ئەوی گرتۆتەوە.
- لەخۆتەوە بڕیار مەدە تاوەکو هەمو بوارەکانی مەسەلەکە تاووتوێ نەکەی، پاشان فەڕو چاکە لە خوا بخوازەو پرسو ڕا بە دۆستان بکە، جا ئەگەر سەرکەوتنت وەدەس هێنا پیرۆزت بێ ئەگەرنا پەشیمانی نیشان مەدە.
- مەردمی ژیر دۆستانی زۆر دەکاو نەیارانی کەم دەکاتەوە، بێگومان دۆستیش بە ساڵێك دروست دەبێو دوژمنیش هەر بە ڕۆژێك پەیدا دەبێ، جا خۆشی بۆ ئەو کەسەی خوا لە دڵی خەڵکدا جێی کاتەوە.
- بۆ خواستی دنیاییت سنورێك دیاری بدە کە بۆی بگەڕێیتەوە، ئەگینا دڵت دابڕدابڕ دەبێو، سینەت تەنگو، بارو گوزەرانت وێرانو خاپور دەبێ.
- پێویستە ئەو کەسەی بەهرەی خوا بەسەریەوە دیارە، بە سای شوکرانە ڕاگیریانکاو، بەهۆی خواپەرستی بیانپارێزێو، سەبارەت بە ملکەچی نواندن ڕەنێویان بێنێ، تاوەکو ئەو بەهرانەی هەر لەلا بمێنێ.
- هەر یەکێ بە سای پارێزگاری دەرونی پاڵاوتە بێ، بەهۆی باوەڕ بیروهزری بێخەوش بێ، سەبارەت بە چاکە خووڕەوشتی بدرەخشێ، خۆشەویستی خواو خەڵکیش وەدەسدێنێ.
- ئەگەر بێینە سەر ڕاستی مرۆڤی تەمبەڵ دوچارە بە شەکەتیو دڵ پەستی، وەلێ ئێشکەری تێکۆشەر هەر ئەوە دەزانێ چۆن دەژێیو، ئاشنایە بە بەختەوەری.
- ڕابواردنو بەسەربردنی ژیان چەندین ئەوەندەی خۆی بەڵاو مەینەتی فەراهەم دێنێ، بەڵام نهێنی لەوەدایە چۆن ژیرانە دەتوانین ئەم چێژە دەستەبەرکەین.

- ئەگەر ژن هەمودنیای لەبەردەست دابێ‌و، چی بڕوانامەی جیهانیە بەدەستی هێنابێ، هەرچی شکۆو ڕێزە پێی بەهرەدار بێ هاوکات لەگەڵ ئەوە بێ هاوسەر بێ هەژارەو نەدارە.
- ژیانی کامڵ لەوەدایە لاوێتی لە خواستەکاندا بەسەربەری، جوامێریت لە هەوڵ‌و تەقەلادا خەرجکەی، پیریت لەبیرکردنەوەدا تێپەڕدەی.
- زل لە چاوی خەڵك دامەبینەو کاریتە لە چاوی خۆتدا فەرامۆشکەی، چونکە تۆ هێندە عەیبەت زۆرن تەمەنت بایی ڕاستکردنەوەی ناکا، کەوایە سەیری نەنگی خەڵك مەکە.
- کتێبێك بیرو هزرت ڕوناك بکاو، دڵ‌و ناخت بسرەوێنیێ‌و، سینەت وەحەسێنیێ‌و، زەینت بنەخشێنێ، لە کۆشك‌و باڵەخانە گەڵێ سودبەخشترە.
- چاوپۆشی‌و لێبوردەیی لە خوا دەخوازم، ئەگەر تۆ ئەم دوانەت خەلاتکرا ئەوا هەرچی ئاسودەیی هەیە پێت بڕا.
- گەر خێوی حەوت دەنکە خورماو کولێرەیەك‌و پارچە حەسیرێك بوی لە ژورێکدا کتێبی خواشت هاوڕێ بو، بڵێ سلاو لە دنیا.
- کامەرانی لە قوربانیدان‌و پشت هەڵکردن لە ئارەزوەکانە، لەوەدایە دەستت لە خراپە بگریەوەو لە چاکەدا بەر هەڵدایکەی، لە خۆویستی‌و خۆپەرستی خۆت بە دورخەی.
- پێکەنینێك مامناوەنجی بێ سینە شادو گوشاد دەکاو، تین‌و وزە بە دڵ دەبەخشێ.
- خواپەرستی بەختەوەریی‌یەو، گونجان‌و چاکبون سەرکەوتنە، هەر کەسێکیش بەردەوام یادی خوای لەدەم دابێ‌و، هەمیشە داوای لێخۆشبون بکاو، بەرامبەر خوا خۆی زۆر بە پێویست بزانێ ئەوە یەکێکە لە پیاوچاکان.
- چاترین هاوەڵ‌و دۆست ئەو کەسەیە لێی دڵنیایی‌و پێی ئاسودەی، ناخۆشی خۆی لەلا هەڵدەڕێژی‌و لە خەمی تۆ بەشدارە، نهێنیشت دەپارێزێ.

- نەگەی پێشبینی بەختـەوەر بـونێکی گـەورەتر بکـەی لـەوەی تێیـدای، جا ئـەوەی هەتە بە بێنرخی سەیرکەی، چاوەڕێی ئەو بەڵاو کۆستەش نەکەی کە لـە ڕێـدا، جازو بەزو خەمان لەخۆ بارکـەی.
- خەیاڵت بۆ ئەوە نەڕوا هەمو بەهرەیەکت لـە دەسـتە، بەڵکـە خـوا زۆری پێـداوی، بەڵام گەر لات وابێ هەرچی بەهرەو خەڵاتە پێت بڕاوە، ئەوە خەیاڵت خاوە.
- خانوبەرەیـەکی فـراوان‌و، ڕۆزی‌و بـژێوی لـە ئەنـدازەو، هاوسـەرێکی لەبـەر دڵـو، هاوسێیەکی گونجاو.. چەند بەهرەیەکن خەڵکـانێ زۆر پێی نائاشـنان.
- هونەری لەبیـر خۆ بردنەوەی ناخۆشی بەهرەیە، یادکردنـەوەی بـەهرەی خـواش چاکەیە، بێ ئاگـایی نواندن لە هەڵەو پەڵەی خەڵکـان پیاوەتیە.
- تام‌و چێژی چاوپۆشی خۆشترە لە تۆڵەکردنەوە، خـۆ مانـدوکردنیش خۆشـترە لـە بێکـاری، چاو تێریش پڕ بەهاترە لە مـاڵ‌و سـامان، تەندروسـتیش لـە پـارەو پـوڵ بەهەرمێن ترە.
- تـەنیایی لـە هاونـشینی خـراپ چـاترە، هاونـشینی چـاکیش باشتـرە لـە تـەنیایی، گۆشە گیـریش بەندایەتییەو، بیـرکردنەوەش خواپەرستییە.
- گۆشەنیشـینی جیهانی بیرو بۆچونەکـانە، زۆر تێکـەڵیش نەفامیـە، پـشت بەسـتن بە خەڵك گەوجییە، هانا وەبەردنیشیان بەدبەختییە.
- بەدخویی ئازار دیتنەو، ڕق هەڵگرتن ژار خواردنـە، باسکردنی خـەڵك لـە پـەنادا ناشیـرینەو، چاو گێڕان لە هەڵەی خەڵك چاوشـۆڕیـیە.
- سوپاس کردن لەسەر بـەهرە خەشـم‌و قـین پـاڵ پێـوە دەنـێ، وازهێنـان لـە گونـاه وزەو تینی دڵەکانە، سەرکەوتن بەسەر نەفسدا خۆشی‌و شادی پیاوچاکانە.
- نانە وشکەی گەڵ هێمنی بە چـێژترە لـە هـەنگوینی گـەڵ تـرس‌و لـەرز، چادرێك لەگەڵ بەرگی بەرت خۆشترە لە کۆشکی بە دەردو بەڵا.
- تام‌و چێژی زانـست بەردەوامـە، هەمیـشە سـەربەرزییە، ناوبـانگی هـەر دەمێنـێ، تام‌و چێژی ماڵ‌و دارایش هەر سـەرێکە، پلـەو ڕێـزی دوا بڕاوەیـە، نـاوودەنگی تـا سەر نیە.

- حەسانەوە لە ژێر سایەی دنیـا منالآنەیـە، خۆشحاڵ بـون بـە سـای بـاوەڕ پـیشەی جوامێرانەیــە، خزمــەتکردنی مــاڵ سەرشـۆڕیيەو، کـارکردن لــە پێنــاو خــوا سەربەرزی یە.
- ڕەنجێ لە پێناو هیمەت بـەرزی بـێ خـۆش‌و شـیرینە، مانـدوبون لـە پێنـاو مـەرام حەسانـەوەیە، ئارەقەی ئیشـکردن میسـك‌و گـولآوە، بلآوبونـەوەی بـاس بـە چـاکە خۆشــترین بۆن‌و بەرامە.
- بەختەوەریت لەوەدایە کە قورئانەکەت دڵنەوات بێ، کردەوەشـت ئاواتـت بـێ، نـاو مـاڵـت مزگەوت بێ‌و، چاوتێریت گەنجینەت بێ.
- ئۆقرە گرتن بە خواردن‌و خۆراك‌و ماڵ‌و سامان کاری منالآنەیە، ئاسـودە بـون بـە باسی بە چاکە پیشەی گەورە پیاوانە، کردەی چاکەش سەر بڵندییێکە کۆتایی نایە.
- شەو نوێژ ڕەونەقی ڕۆژە، چاکە ویـستن بـۆ خـەڵك ئامـاری دڵپـاکیـیـە، چـاوەڕێی لێبونەوەی دەروی خێریش بەندایەتییە.
- بەڵاو مەینەتی چوار هونەری تێدایە: چاو لە پاداش بون، ئارامگری‌و خۆڕاگرتن، ناوودەنگ ڕۆیشتن بە چاکە، چاوەڕێی میهری خودا.
- خێرو خۆشی دنیاو دواڕۆژە، کە نوێژت بە کۆمەڵ بـێ‌و، ئـەرك‌و واجبـەکانت بـە جێ بێ، موسڵمانانت خۆشبوێ‌و، واز لە گوناهان بێنی‌و، حەرام نەخۆی.
- وریابە نەبی بە سەر چونکە سەرژانی زۆرە، لەسەر ناودەنگ پێ دامەگرە چونکە باجی گرانە، بەرچاوتێریش لەگەڵ بێ ناو دەنگی ئاسودە بونە.
- کات بەفیـڕۆدان‌و، دواخـستنی تۆبـەو، پـشت بەسـتن بـە خـەڵکان‌و، دایـك‌و بـاوك ئازاردان‌و، بەدەر ڕاوەرکردنی نهێنیان، هێمای گەوجی‌و گەلۆرییە.
- مردنــی دڵ بـەوە دەناسـرێ، کـە خاوەنەکـەی بەندایـەتی نـەنوێنێ‌و، دەسـت لـە گوناهان هەڵگاو، گوێ بە ناو ڕۆیشتنی بە خراپە نەدا، لـە سـزای خـوا نەترسـێ‌و، پیاوچاکانیش بە هەند هەڵنەگرێ.

- ئەو كەسەی لەناو ماڵی خۆیدا نەحەسێتەوە لە شوێنێكی تریش ئاسودە نابێ، ئەوەی ماڵو خێزانی خۆی خۆشیان نەوێ هیچ كەسێ خۆشی ناوێ، ئەوەش كە ئەمرۆی بەهەدەر دەدا سبەینێشە لەدەست دەچێ.
- چوار شتن بەختەوەری دەستەبەر دەكەن: كتێبێكی سودگەیێن، ڕۆڵەیێكی دەستەوەرە، هاوسەرێكی لەبەر دڵ، هاونشینێكی بۆ خوا گونجاو، خوای گەورەش وێڕای هەموانە.
- پوختەی ئەو شتانەی ژیریاران هەوڵی بۆ دەدەن، باوەڕو زانستو تەندروستین، ئاسایشو ئازادیو گەنجیو دەوڵەمەندین، بەڵام كەم وایە هەمویان بە یەكەوە بێنە دی.
- هەر لە ئێستاوە ئاسودەو ئارام بە تۆ بەڵێنی مانەوەت پێ نەدراوە، دڵنیا نیت لە ترسو لەرزی ڕۆژگار بێوەی بیت، سا خەمت بۆ ئێستا نەبێو خۆشیو شادیت بە قەرز بێ.
- باوەڕێكی ڕاستەقینەو، ڕەوشتێكی جوان، ژیری تەواو، لاشەیەكی ساخو، خۆراكێكی بە چێژ باشترین سەرمایەن لە جیهاندا، جگە لەوانە سەرقاڵییە.
- دو بەهرەن كە بزرن: تەندروستی لاشەو، ئاسایشی وڵات، دو بەهرەش لەبەرچاون: باسی بە چاكەو زاڕۆڵەی دەستەوەرە.[909]
- دڵێكی درەوشاوە ڤایرۆسی ڕقو كینە دەكوژێ، دەرونێكی ڤایلو ڕەزا جڕو جانەوەری ڕكابەری فڕێ دەدا.
- هێورەیی باشترین ڕێ خۆشكەرە، تەندروستی باشترین داپۆشەرە، زانست بە چێژترین خۆراكە، خۆشەویستی بەسودترین دەرمانەو، عەیب پۆشیش جوانترین پۆشاكە.
- كامەرانی: ڕەوێنەری دەردەسەریو، لابەری دوژمنكارییە، مایەی ئەنجامدانی كردەی چاكەیەو، سەركەوتنە بەسەر هەواو ئارەزوەكاندا.

[909] گوێ ڕایەڵن گوێ لەمست.

- ئـەو ڕێگایـەی بـەرەو ماڵتـە لـە هـەمو ڕێگایـێ لـە مەترسـی دورتـرە، ئـەو ڕۆژەی کردەی چاکی تێدا ئەنجام دەدەی بە پیتو پێزتـرین ڕۆژە، ڕەشـترین کـاتو سـاتی ڕۆژگاریش ئەو کاتەیە دژ بە یەکێ خراپەیێ ئەنجام دەدەی.
- ئەگەر مرۆڤێك جوێنی پێدای ئەوا بزانـە لـە ئاسـتی پـەروەردیاریان گـەزارەیی [910] دەنوێنن، ئەو خوایە دەستەباڵایەی لـە نەبونـەوە وەدی هێنـاون ئـەو جـارەش لـە بونیدا گومانیان هەیە، لـە برسـێتی تێـری کـردون جگـە لـەو سـوپاس دەکـەن، لـە ترسو بیم پاراستونی ئەوسا بەرهەڵستی دەکەن.
- گۆی زەوی بەسەر سەرتەوە هەڵمەگرە، پێشت وانەبێ خەڵك منو تۆیان گەرەکـە، تەنیا پەسیوو هەڵامەتێك مەرگی منو تۆیان لەبیـر دەباتەوە.
- هێمنیو هـەداری بژێوی‌یـە، نیـشتمانە، حەسـانەوەو ئارامییـە، دور لـە بـەڵاو، لـە ناخۆشی ڕزگاربونە، نواندنی ستایشە لە بەرابەری بـەهرەکانو، خواپەرسـتی یـە بە درێژایی ڕۆژگـار.
- ((كن في الدنيا كأنك غريب او عابر سبيل... لەو دنیایەدا هـەروەك کەسێکی نـامۆ یا ڕێبـوارێ بگوزەرێنـە))، ((وصـل صـلاة مـودع... نوێـژ بکـە وەکـو نوێـژی ئـەو کەسەی ماڵ ئاوایی لە دنیـا دەکـا))، ((ولا تكلـم بكـلام تعتـذر منـه... قـسەیەکی وانەکەی بیانوی بۆ بهێنیـەوە))، ((واجـمع اليـأس من ايـدي النـاس... ئـەوەی لـە دەستی خەڵك دایە تەواو لێی بێ ئومێد بە)).
- دنیا بە کەم بنرخێنە خوا خۆشی دەوێی، ئەوەی لە دەستی خەڵك دایە بە سـوکی سەیر کە خەڵك خۆشی دەوێی، بە کەم قایل بەو، کـارت بـە قورئـان بـێ، تۆشـەی کۆچی یەکجارەکی ئامادە کەو لە خوا ترست هەبێ.
- مەردمی بـەر ڕقو نەویـستراو ژیـانی نیـەو ئـەوەی بەرهەڵستی بکـرێ ناسـێتەوە، ئـەوەی تاوانبـارە لـە هێمنایـیدا بەسـەر نابـا، خراپـەکاریش کـەس خۆشـی نـاوێ، کەسی درۆزنیش بە چاکە باسی ناکرێت، مرۆی بەڵێن شکێنیش بڕوای پێناکرێ.

---

٩١٠) بێ شەرمی.

- ((عجبا لأمر المؤمن إنَّ أمره كله خير وليس ذلك لاحد إلا للمؤمن إن أصابته سراء شكر فكان خيرا له، وإن أصابته ضراء صبر فكان خيرا له... کاری بڕوادار سەرسوڕمێنە هەمو کارو فەرمانی چاکەیە، ئەوەش تەنیا بۆ باوەڕدار شیاوە، ئەگەر خۆشیەکی پێگەیشت سوپاسگوزارە بە چاکە بۆی دائەنرێ، ئەگەریش دوچاری ناخۆشییێ بو ئارام دەگرێ بە چاکە بۆی دەژمێردرێ)).
- زەردەخەنە کلیلی بەختەوەری یە، خۆشەویستیش دەرگاکەیتی، شادمانی گوڵشەنێتی، باوەڕ ڕۆشنایی‌و هێمنی‌و هەداری شورەکەیتی.
- ئاسودەیی: ڕوخسارێکی ڕۆشنا پەخشە، باخێکی درەخشانە، ئاوێکی شیرن‌و سازگارە، کتێبێکی سودبەخشە هاوکات لەگەڵ دڵو دەرونێك بەهرەبژێر بێ‌و، پشت لە تاوان‌و ڕو لە خێر بێ.
- مرۆی لەش ساخ لەسەر بەردێك دەخەوێ لای وایە پەڕەی ئاوریشمە، نانی جۆ دەخوا وادەزانێ گۆشت‌و پلاوە، لە زنج‌و کۆلێتێك دا نیشتەجێیە پێی وایە کۆشك‌و تەلاری پاشایە.
- مرۆی ڕژدو قرچۆك بە هەژاری دەگوزەرێنێ یاخود بە دەوڵەمەندی دەمرێ‌و بەری ڕەنجی بۆ دوای خۆی دەبێ، پاسەوانی سامانەو ناحەزو دزێوی بەرچاوی خەڵکە، لە خوا بە دور دەبێ‌و لە هەمو جیهان ناوی دەزڕێ.
- منال لە ماڵ باشترە، تەندروستی لە دەوڵەمەندی چاترە، هێمنی لە خانوبەرە بەهەڕمێن ترە، تاقی کردنەوەش لە پارەو پوڵ گرانبەهاترە.
- لەمەڕ شادی سوپاسکار بە، سەبارەت بە خەم ئارامگر بە، با بێ دەنگیت تێفکرین بێ‌و، ڕوانینت پەند وەرگرتن بێ‌و، گفتوگۆت یادی خوا بێ‌و، ژینت خواپەرستی بێ‌و، لە مەرگ ترست نەبێ.
- وەکو ئەو باڵندەیە بە لە بەیانی‌و ئێوارەدا خودا ڕۆزی پێ ئەدا، پشتی بە کەس نابەستێ‌و بایەخ بە سبەینێ نادا، جوڵەو سێبەری سوکەو، هیچ کەسیش ئازار نادا.

- هەر یەکێ لەگەڵ خەڵکـا زۆر تێکەڵ بێ بە سوك سەیری دەکەن، ئـەوەی ڕژدیـان بـۆ بنوێنـێ ڕقـی لێدائـەگرن، ئـەوەی لـە ئاسـتیاندا نـەرمونیان بـێ بـە گـەورەی دەگرن، کەسێ پیاوەتیان لەگەڵدا بکا خۆشیان دەوێ، ئەو کەس چاوی لـە دەسـتی ئەوانە وەبەر کینەیان دەکەوێ.
- گەردون لە گـەڕ دایە، شـەوەکان هەواڵ گەلێکیان لە خۆ گرتوەو ڕۆژگـار دەسـتاو دەسـتی، پـێ دەکـرێ، ناشـێ لـە ڕەوشـێ بـارودۆخ ڕابوەسـتێ، خـوای دلۆڤـانیش هەمیشە لە کـار دایە..، کەوایە بۆ دڵـت پەنگی خواردۆتەوە؟!.
- چۆن زاتی ئەوە دەکەی لە بەردەم قاپیەی کاربەدەستان هەڵوەسـتە بکـەی کەچـی جڵەوی ئەوان بـە دەسـتی پـەروەرێنی جیهانـە؟! مـاڵو سـامان لـە کەسـێکی نـەدار دەخوازیو داوا لە قرچۆکێك دەکەی، سـکاڵا وەلای زامداری دەکەی!!
- لـە بەرەبەیانـدا چـەند پـەیامێك بـەرەو بارەگـای خـوا ڕەوانەکـە: مەرەکـەبی نوسینەکە بریتی بێ لە فرمێسکو، کوڵمەکانت لاپەڕە بن و، پەیامنێرەکەت گیـرا بون بێ..ئەوسا چاوەڕێی وەلامدانەوە بە.
- لەناو کڕنۆشدا ڕازی خۆت بـۆ خـوا بدرکێنـە، چونکێ هـەر ئـەو بەسـەر ئاشـکراو نهێنیـدا ئاگـادارە، یـا ئـەو نهێنیـە هـەر لـە بـەینی خـۆتو ئـەو بـێ، چـونکە خۆشەویـستی گـەلێك نهێنی تێدایـە، خـەڵکانیش ڕەشـك پـێ بـەرن و خۆیـان بـە خاوەن مـاف دەزانن.
- پاکی بۆ ئەو خوایـەی ئـەوەی ملکـەچی بـۆ دەنوێنـێ سـەر بڵنـدی دەکـا، ئەوەی خـۆی بـە ئاتـاجی ئـەو دەزانـێ دەوڵەمەنـدی دەکـا، ئـەو خوایـەی لـێ پاڕانـەوەی قەدرو ڕێزە، سەر بۆ دانەواندنی سەربەرزییە، پشت پێ بەستنی بێ منەتی یە.
- ئەگـەر خـەمێك یەخـەت بگـرێ، بـە سـای پـەژارە بـارو گوزەرانـت لـێخن بـێ، مەرگەسات ڕو لە ماڵو خێزانت کـاو جـەرگت ببڕێ، بـێ ئومێـد مەبـە، لەوانەیـە خودا دوای ئەوە کارێ بە ئەنجام بگەیەنێ.
- ئەوە دەستەواژەیەت لەیاد نەچێ: ﴿... حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... خوامان بێ بەسمانـەو چـاترین پاڵپـشتمانە. ﴿١٧٣﴾ آل عمـران﴾. ئـەم نزایـە گـرێ ئـاگر

دادەمرکێنیێو، نغرۆ لە خنکان دەردێنیێو، ڕاستەڕێی پێ دەدۆزرێتەوە، پەیمانو بەڵێنی توندو تۆڵی لێ وەدی دەکرێ.

- خۆشی لە تۆ ئەی باڵندە: دەچیە کەناری ڕوباران، لەسەر چڵی درەختان دەنیشی، تامی جۆرەها میوە دەچێژی، ترسو لەرزت لە پێش نیەو، بەسەر دۆزەخیشدا ڕانابوری، ئەوسا تۆ لە مرۆڤ حاڵ خۆشتری.
- شادمانی هەلێکی ڕەخساوە، کلۆڵی ڕەشکەرەوەی تاوانە، ڕق داگرتن گرگرتنە، کات بەتاڵیش بێ هودە بەسەربردنە، بەندایەتیش بازرگانیە.
- دوێنی ڕابرا، ئەمڕۆش بەرەو ئاوابونە، سپێدەش نەبۆتە مێوانی ژین، تۆش ئێستاکەت دەستەبەرکەو، لە پێناوی خوادا بەڕێیکە، ئەوپەڕی قازانج دەکەی.
- ئەگەر قەڵەم خەمڕەوێنت بێو، مەرەکەب کانیاوت بێ، کتێب هاودەمو هاوەڵت بێ، ماڵت خاكو نیشتمان بێو، بژیویت گەنجینەو گەوهەر بێ، جێی خۆی نیە لە ئاهی لەدەستچونێك دڵت پەست بێ.
- لەوانەیە سەرەتای کارو وەرام دلگرانت کاو کۆتایی یەکەی دڵ خۆشتکا، هەروەکو هەورو هێڵێك سەرەتاییەکەی بروسكو هەورە تریشقەیەو دواجاریش ڕێژنەو نمەی بارانەیە.
- داوای لێخۆش بون قفڵەکان دەکاتەوەو، هەستەکان دەسڕەوێنیێو، ناپاکی دەڕەوێنێ، سەرەتای پەیدابونی ڕۆزی یەو، دەروازەی ئاسانکاریە.
- شەش شت شیفادەرو چارەسەرن: زانستو خواپەرستی دەوڵەمەندیو پیاوەتی چاوپۆشیو تەندروستی.
- ئاخۆ کێ بێ کاتێ لێقەوماو هاواری بۆ کرد وەڵامگۆ بێ؟، کاتێ نغرۆ هانای بۆ برد دەهانای بێ کە لێی پاڕاینەوە لابەری پەژارەبێ؟ ئەو کەسە تەنیا خودایە.
- لە مشتومڕی بێ ئاکامو، کۆڕو کۆبونەوەی گاڵتەو گەپو، هاوەڵی گێلو نەفام خۆت بەدور بگرە، بێگومان هاوەڵ دەستت دەکێشێ، خوی خراپیش ڕێت پێ دەگرێ، چاویش هەروەکو دزە.

- خۆ ڕازاندنەوە بە جوان گوێگرتن، قسە بە خەڵك نەبڕین، بە نەرمی دوانو، ڕەوشتی نەرمو نیان چەند ملوانکەیێکی قەدرو ڕێزن بەسەر سینەی جوانمەردانەوە هەڵواسراون.
- خاوەنی دوچاوو دو گوێو دو دەستو دو پێو یەك زمانی، خێوی ئاسایشو هێمنیو باوەڕو هەلگری قورئانی..ئەی مرۆڤ کوا بەو بەهرانە دەزانی؟ ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ... دەیسا ئێوە لە کام چاکەی پەروەرندەو حاشا دەکەن؟. (٢٥) الرحمن ﴾.
- تۆ بەسەر پێیەکانتەوە گوزەر دەکەیتو چەند کەسیش پێ قرتاون، بەسەر قاچەکانتەوە دەوەستی کەسانێکیش قاچ بڕاون، تۆبە پڕی چاوەکانت دەخەوی خەڵکانێکیش لە تاو ئێشو ژان خەو لە چاویان تۆراوە. تۆ تێرو تەسەلی وێڕای تۆش کەسانێ برسیو بێ نانن.
- لە کەڕیو لاڵیو کوێری بە دوری، گوڕیو بەڵەكو شێت نی، بە سیلو نەخۆشی شێر پەنجە گرفتار نی، ئاخۆ سوپاسکاری پەروەردیاری؟!
- دەردی ئێمە لەوەدایە ئیمڕۆمان پشت گوێ دەخەینو بە سبەینێ بایەخ دەدەین، ئاخۆ ژیریو دانایی لەوەدایە؟!
- خەڵك کە توانجت تێدەگرن نیشانەی ئەوەیە ڕێزت دەگرن، وای لێدەفامرێتەوە کە تۆ سەبارەت بە زانستو زانیاری پلەو پایەو ماڵداری لەوان بالاتری.
- خۆ پۆشین بە پۆشتەی خەڵکانی تر، تاوانەوە لە قاوخی انداو، جوینەوەی بنێشتی وان بنبرکردنو سڕینەوەی دروشمی کەسایەتیە.
- ﴿ ... قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ... هەر تیرەیەك جێی وەخواردنی خۆی دەزانی، (٦٠) البقرة ﴾ .

﴿ وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ... هەر لایە شوێنێکیان هەیە ڕوی تێدەکەن، (١٤٨) البقرة ﴾.

((ڕەگەڵ کەوتە مەبن)) ﴿صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَاءٍ وَاحِدٍ ... ڕەزو زەوی‌و زارو دارخورمای لێك جوداش، گشت لە یەك ئاو پاراو دەبن. ﴿٤﴾ الرعد﴾.

- لەدوای ئەسرین خەنـدە وەرینـە، لـەدوای پـەژارە دڵ سـرەوینـە، لـەدوای ناخۆشـی خۆشی یە، لەدوای بەڵا خەڵاتە، ئەوەش ڕێڕەوێکی نەگۆڕو بنەمایەکی گشتگیـرە.
- بڕوانـە مەگـەر ئـەوەی دەیبـینی بـەڵا بارنیـە، ئـەوەی بەرچاوت دەکـەوێ کۆسـت کەوتو دەردەدار نیە، لە هەمو شیوێ ناڵەو هاوارە، لەسەر هەمو کوڵمێ فرمێسکە، لە هەمو دۆڵاییێك (بەنو سەعدێك هەیە).
- دەنگـی ئـەو کەسـەی چاکەت دەژمێـرێ، خۆشـترە لـە چـریکەی باڵنـدەو، سـروەو شنەی بەری بەیان، خۆشترە لە سەهەندو سێبەری درەختو دەنگـو ئاوازی نەی.
- ئەگەر بە ناچاری لەسەر خواردنەوەی ئاوی گەرم سوپاسـی خـوات کـرد، لـە کـاتی خواردنەوەی ئاوی سـازگار هەمو ئەندامێکت دەڵێ: خوایە سوپاس.
- هەرزانتـرین جۆری بەختەوەری کە لە بازاڕی ژیریاراندا هەڕاج بکرێ وازهێنانـە لە شتێ، کە پەیوەندی بەتۆوە نیە، گرانبەهاترین کـاڵا بـە لای خەڵکەوە ئەوەیـە بە خەڵکەوە هۆگر بی‌و خەڵك بە تۆوە هۆگر بێ.
- خـۆت بـەدور بگـرە لـە پـەژارە چـونکە مایـەی ژیـن‌و ژارە، بـێ توانـایی مەنوێنـە چونکە مردنە، تەمبەڵ مەبە تەمبەڵی سەرشۆڕی یە، لە ڕاڕایی بەدوربـە چـونکێ ڕاڕایی گەندەڵی یە.
- هاوسێی خراپ لە تەنیایی مرۆ خراپتـرە، چاکە نوانـدن لـە کۆشـكو باڵەخانـەی بەرز بەرزترە، باسی بە چاکەش سەربەرزی یە.
- هەریەکێ خاوەنی بەرنامەیەك بێ ڕێنمایی بکا، ژیری هـەبێ کاروبـاری ڕێـك بخـا نەژادێکی ببـێ پێـی سـەربڵندی بـێ‌و، بـە شـەرم‌و شکۆ ڕوی سور بـێ، بـە ڕاسـتی چەندین بەهرەو خەڵاتی پێ بڕاوە.

- هەر یەکێ واز لە دوبەرەکی بێنیٚو، خۆی لە لوت بڵندی بپارێزێ، درۆزن نـەبێو، بە قەزاوقەدەر قـایل بێو، لە ئیرەیی[٩١١] بەدوربێ، خوا وا دەکا لە دڵی بەنـدەکانی جێی وەکـا.
- هەر کەسێ دەسـەڵاتو فـەرمانڕەوا بـە سـوك بزانـێ دنیـای لەدەست دەچـێ، ئـەو کەسەش، کە گاڵتەی بە زانایان بێ دینی دەدۆڕێنێ، ئەوەش کە هـاوڕێی خـۆی بـە کەم بنرخێنێ پیاوەتیو ڕێزی نامێنێ، ئەو کەسە کە خودا بـە هەنـد هەڵنـەگرێ دنیاو دواڕۆژی لە دەست دەچێ.
- خەڵك کە ئاتاجی تۆیە بەهرەی خوایە سـا بێـزاری لـێ مەنوێنـە ئـەگینا دەبێتـە خەشـمو قـین، دڵنیـاش بـە خۆشـترین ڕۆژت ئـەو ڕۆژەیـە خـەڵك ئاتـاجی تـۆ بـێ نەوەك تۆ ئاتــاجی خەڵك بی.
- بەر لەوەی خەوت بەسەر چاودا بێ لە خەڵك لێبوردنـت بـێ، حـەوت جـاران دڵـی خۆت بە چاوپۆشی نواندن پاكو پاراوکە، هەشت جـارانیش دڵـی خـۆت بـە تـۆزی لێخۆشـبون تۆزاوی کە ئەوسا کە شیرنایی باوەڕ دەچێژی.
- زانست دڵنـەوایی تەنیایی یە، هاوڕێی دەمی بێکەسی یە، پاسەوانو ئێـشکگری بـێ هاودەمی یە، هێمـای ڕێگـای ڕێنمـایی یـە، هاریکـاری تەنگانەیـەو، توێـشـوی ڕۆژی دوایی یە.
- ئەو کەسەی خاوەنی دڵێکی کەچو چاوێکی بـە فرمێـسكو دەرونێکی ئاوەدانـە، چ باکی لەوە دێ بەرگـو پۆشـاکی دڕاوەو پێـڵاوی لە پێ نەماوە.
- پشت هەڵکردن لە خـواو ڕوکردنـە دنیـا هۆکـاری خـەمو پەژارەیـە، ئەوەیـە وا لـە مرۆڤ دەکا بیخاتە بەندیخانەیێکی تـا هـەتایی، نـە ئـەو زیندوەیـە ئومێـدت پێـی بێو نە ئەو مردوەشــە شینو واوەیلای بۆ بکرێ.
- باشترین دارایيو سامان کانیاوێکی بە خوڕە لە زەوییێکی بە پیتدا، ئەگەر خـەوتی ئـەو لـە شـەونخونیدا، ئەگـەر لـەوێ نـەبوی ئـەو ئامادەیــە، ئەگـەر دنیاشـت بەجێهێشـت ئەو لە دوای تۆ گەنجینەیە.

---

[٩١١] حەسودی.

- بەشی خۆت لـە بـێدەنگی وەرگـرە، چونکە مرۆڤـی کەمـدو بـە هەیبـەتو سامە، مرۆڤی بێ دەنگ خۆشەویسـتەو، زمانیش بەڵای سـەرە.
- خۆشـی ژیـان بریتییـە لـە: تۆشـەی ڕۆژی سـەلا، یـا ڕێکخـستنی بـژێوی، یـا چێـژ وەرگرتن بە حەڵاڵی، یا پەرەپێـدان بـە ژیـریو، ڕازاندنـەوەی دڵو دەرون، وێـڕای ئەوە کات بە فیـڕۆدانە.
- خۆ بەدورگرتن لە تێکەڵی، لە مرۆڤی ڕەشك پێ بەرو، زمـان شـڕو، غەیبـەتکارو، ڕەزا گرانو، لوت بڵندو، خۆپەسند دەتپارێزێ، ئەوەندە قازانجەشت بەسە.
- ناتوانی کامەرانی دەستەبەرکەی سـەبارەت بـەوەی لـە شـارێکەوە بـۆ شـارێکی تـر گەشتو گوزارکەی هاوکات لەگەڵ ئەوەی خەمان لەخۆ بارکەی، بەڵام کە جار لـە دوای جار پەرە بە هزرت بدەی ئەتوانی خۆت ئاسودەکەی.
- ئەگەر دڵ ئاوەدان بێ دواڕۆژی لەلا ڕۆشن دەبێ، شەوی بەلاوە جەژنو ئاهەنگەو، خـەڵکی بـەلاوە دۆسـتو خۆشەویـستە، کـەلاوەی بـە لاوە کۆشـكو باڵەخانـەی ڕازاوەیە.
- ئەوەش لە میهرو سۆزی خواوەیە لە ئاستی بەندەکانی، کە هەر کەسێ گوێڕایەڵی بێ دڵی دەوڵەمەند دەکا، ئەگەر تەنیا چەند تیکە نانێکی لـە خـوان بـێ لای وایـە دنیای لەبەردەستدایە.
- ژیان بریتیە لە: لـەش سـاخی، گـەنجو لاوێتـی: ئەومیـە تەندروستیت تـەواو بـێ، جوامێری لەوەدایە خۆڕاگر بی، بەخشندەیی: هێمای تەقوا کارییە، خواپێداویش: ئاماری ڕەسەنایەتییە.
- دۆڕاوترین کـەس ئـەو کەسـەیە بیـەوێ لـە شـکڵو شـێوەی خۆیـدا نـەدیترێ، ئـەو کەسەش کە لە ئاستی قەزاو قەدەردا ڕوی گـرژەو، لـە بەشـە ڕۆژی خـۆی لالـوتە، دڵو دەرون تەنگـو تریسـکە.
- ئەوەی هـاوەڵی مزگەوتـە لـە قورئـان کـەڵك وەردەگرێ، دۆستی ڕاستگـۆی چنگ دەکەوێ، زانستی سـودمەند فێر دەبێ، سۆزی خـوای میهرەبـانو وتـەی نەسـتەقو جوانو تۆبەی یەك جارەکی پێ دەبـڕێ.

- ئەو کەسەی بە ڕۆژو بێ چێژ لە خواردن وەردەگرێ، ئەوەی شەونوێژی هەبێ خەوی شیرن‌و خۆش دەبێ، ئەوەی هەوڵداو تێبکۆشێ سوپاسکاری زۆر دەبێ، ئەوەی پلەو پایەشی هەبێ ڕەشك پێ بەری زۆر دەبێ.
- ئەو کاتە بە ئاسودەیی بەسەر دەبەی کە لاشەو هزرو هەست‌و ژیریت لە هەمو کۆت‌و زنجیرێك ئازاد بێ‌و، تەنیاو بەس بەندەی خودا بی.
- بەختەوەر ئەو کەسەیە، ئەو شتە لەبیرە خۆی باتەوە کە بە هیچ چەشنێ ڕێی تێناچێ چارەی بکا، ئەو کەسەیە چاکەی لەگەڵدا کراوی لەیاد نەکا، خراپەی دەرحەق کراوی لەبیر دەکا.
- ئەوەندەی بەشە ڕۆزی بۆ دانراوت جێگای تۆ پێدەزانێ تۆ ئەوەندە جێگای وی نازانی، هەروەکو سێبەر بە دواتەوەیە، ژیانیشت کۆتایی نایێ هەتا تەواو ڕۆزی خۆت نەخۆی.
- کەسی نەدار ئەو کەسەیە ئاتاجی دەستی قرچۆك بێ، هەژاریش ئەو کەسەیە زۆری بە کەم سەیرکا، مەردمی کوێریش ئەو کەسەیە عەیب‌و نەنگی خۆی نەیێتە بەرچاو.
- هەر کەسێ گەییشتە ئەوپەڕی ئاوات با چاوەڕێی ئەوپەڕی ناخۆشی بێ، تەنیا خواناسان نەبێ ئەوان سەرەنجامیان ڕەزامەندی خواو چونە بەهەشتە.
- شایستەترین کەس بە زۆربونی بەهرە، هەرە سوپاسگوزاریانە، شیاوترینیان بە خۆشەویستی، ئەوەیانە بەخشندەیەو، ڕو بە خەندەیەو، لە ئازاردان دەست گرەوەیە.
- شادی ئاتاجە بە هێمنی، ماڵ‌و سامان ئاتاجە بە بەخشین، پلەو پایە ئاتاجە بە یارمەتیدان، گەورەیی ئاتاجە بە ملکەچی.
- تەنیا ماندوبون حەسانەوە وەدەست دێنێ، ئاسودەیی دەرك ناکەی هەتاوەکو کۆشش نەکەی، تەنیا سەبارەت بە خووڕەوشت خۆشەویستی دەستەبەر دەکەی.

- زارۆڵە لە سامان گرینگ ترە، نەریتی جوان لە پلەوپایە بەرزترە، جەربـەزەیی[٩١٢] لە شارەزایی سـودمەندترە، تەقوا كاری لە شـكۆداری بەهەرمێن ترە.
- هەرچی بەر گوێت كەویٚ دڵت بەدوای نەكەویٚ، خۆشەویستیت بۆ هەمو هاوەڵێك نەبیٚ، ئارەزوشت بە دوای هەمو خۆزگەییێدا وێڵ نەبیٚ.
- تەنیا لە خەڵوەتدا ئاسودەییم دەرك پیٚ كرد، تەنیا لـە خواپەرسـتیدا هەسـتم بـە ئارامی كرد، تەنیا لە وەفاداریدا خۆشەویستیم وەدی كرد، تەنیا لە ڕاست گۆییـدا پەیم بە متمانە برد.
- ئەشیٚ تیكە نانێك لە چەندین خواردن بیٚ بەشـت كـا، تـەنیا دەربـڕینی وشـەیەك چەندین نەیارت بۆ دروسـت كـا، تاوانێـك لـە گـەڵێك بـەهرە بیٚ بەشـت كـا، تیلـە چاوێك چەند ئاهو حەسرەتێكت پێشكەش كـا.
- با خۆشەویستیت ئەویـنداری نەبیٚ، ڕكت لە سـنور بـەدەر نـەبیٚ، ژیانـت ڕابـواردن نـەبیٚ، بیــركردنەوەت بـۆ ئـاخ هەڵكێـشان نـەبیٚ، ویـستو مەبەسـتت پلـەو پایـە نەبیٚ.
- هەر كەسـە ئاغای ماڵی خۆیە هیچ كـەس بـە سـوك سـەیری ناكـا، كـەس دەسـگرو پێگری نیە، هیچ زۆرداریٚ ملی پیٚ كـەچ ناكـا، هـیچ ڕژدو چاوچنۆكێك دەرگـا لـە ڕوی داناخــا.
- هــەر ڕۆژیٚ لــە نــەرمو نیانیــت زیــاد بكــاو، زانــستێكت فێــر بكــاو، ڕێــی تاوانــت پیٚنەداو، پەرە بە ژیریت بداو، ورەی بەرزت پیٚ بدا پڕ بایەختـرین ڕۆژتە.
- ژیان هەلێكی ڕەخساوە تا لە دەستمان نەداوە قەدرو ڕێزی نازانین، تەنـدروستیش تاجێكە لەسەر سەری لەش سـاغانە تەنیا كەسانی دەردەدار دەیبینن.
- كەی ئەو كەسە ژیانی ژیانە كـە خـاوەنی كـوڕێكی لاسـارو، هاوسـەرێكی نالـەبارو، هاوسـێیەكی بـە ئـازارو، هاوڕێیـەكی ڕەزا گـرانو، دەرونێكـی سـەركەشو، هـەواو هەوەسێكی جڵەوكێشــە.

---

[٩١٢] ئازایەتی.

- مافی پەروەردیارت لەسەرە، مافی خۆشت لەسەرە، دوچاوەكانت مافیان لەسەرتە، مافی خاوخێزانت لەسەرە، مێوانت هەقی لەسەرتە، جا هەر خاوەن مافێك بەشی خۆی پێ بدە.
- هەر كە بەیانی داهات بە تێڕوانین چێژ لە جوانیو گەورەییو ڕۆشنایی وەرگرە، گەشبینیو هیوات پێ دەبەخشێ.
- سەرەتای بەیانی لەكیس مەدە چونكە پیتو فەڕ لەوێدایە، سا كردەو كارو، یادو قورئان خوێندنو، خوێندنەوەو، دەرخ كردنو، كتێب نوسینو، گەشتو گوزارت لەو كاتەدا ئەنجام بدە.
- كەسێكی مام ناوەنجی بە، هەموار بەڕێدا بڕۆ، دروستكار لە خۆت قایلكەو، سۆزت بۆ دروستكراوان بنوێنە، نوێژی فەرز بەجێی خۆیو لە جێی خۆی بەجێ بێنەو، با زیادە نوێژیش تۆشەی ڕێت بێ ئەوسا كە لە ڕێ شارەزای.
- كار لە جێی ئەوەیە: كۆتا تەمەنت خێر بێو، وتەو پەیڤت ڕێكو پێك بێو، كارت لەبارو گونجاو بێو، لە زۆرداری بەدور بیو، دیدەنی خزمو خوێشت نەبڕی.
- چەند وشە هەن بەهرە لە بن دێنن، چەند هەڵەو تاوانێك سەرشۆڕی بەرهەم دێنن، چەند جار لە تەنیاییدا شیرنایی وەدی دەكرێ، ئەو كەسەش كە، (بە مەبەستی چاكە) گۆشە گیرە لەو گۆشەگیریەدا سەر بڵندی پێ دەبڕێ.
- ((المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده، والمؤمن من آمنه الناس على دمائهم واموالهم))، ((والمهاجر من هجر ما نهى الله عنه... موسڵمان ئەو كەسەیە موسڵمانان لە دەستو زمانی بێ وەی بن، بڕواداریش ئەو كەسەیە خەڵكان لەمەڕ خوێنو ماڵیان لێیان نەترسن))، ((ئاوارەش ئەو كەسەیە لە قەدەغە كراوەكانی خوا دور كەوتبێتەوە)).
- باشترین ماڵت ئەوەیە سودت پێ بگەیەنێ، باشترین كردەوەت ئەوەیە سەربەرزتكا، چاترین خانوبەرەش ئەوەیە تێیداوە حەسێی، چاترین دۆستیشت ئەو كەسەیە ئامۆژیارت بێ.

- ئەگەر یەکێ نەبێ رژدیت پێ بەرێ دیارە تۆ کەسێکی بێ خێری، ئەگەر کەسیش هاوەڵت نەبێ دیارە بێ خوورەوشتی، ئەگەر هیچ ئاینێکیشت نەبێ دیارە بێ پەیرەوو پرۆگرامی.
- بە سای یادکردنەوەی چاکەکانت دەرونت ئاسودە بێ، بەهۆی گەڕانەوەت لە تاوان بسرەوێ، بە سای ڕەوشتە باڵاکانت خۆت بگەیەنە چڵەپۆپەی ژیان.
- قەڵەوی مایەی بێ ئاگایی یە، هورگنی زیرەکی دەتارێنێ، زۆر خەوتن دەبێتە هۆی کەوتن. زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ، ختوکە (وسوسە) ئازارو ئەشکەنجەت بۆ دێنێ.
- کاربەدەستی وەکو شیر خواردنی مناڵ شیرینەو، دەستبەرداریشی وەکو لە شیر تۆراندنێ تاڵە، تامو چێژی پلەو پایە بەهۆی لەسەر کار لادانێ لە کونەلوتاندا دێتەوە، کورسیش بە هەمو لایاندا دەسوڕێ.
- گەشتکردن لەگەڵ خۆشەویستانو، دورکەوتنەوە لە نەیارانو، ڕزگاربون لە چەپۆکی ناحەزانو، بیرکردنەوە لە ڕزگاربون: خۆشیو شادی ژیانن.
- چاکە نواندن مەردمی ئازاد بۆ خۆی دەکاتە کۆیلە، پیاوەتی دەستی مرۆڤ دەبەستێ، نەرمو نیانی دوژمن لە داخان دەمرێنێ، ئارامگری پۆلی ئاگر دادەمرکێنێ.
- ئەو کاتەی دنیا بە بێنرخ سەیر دەکرێ لە هەمو شتێ پتر بێ سەنگ دەبێ، ئامێری پێداویستیش ئەگەر پێویستیت پێی نەبێ زۆر بێ نرخو هەرزان دەبێ.
- ئەگەر خەمی بژێوی سبەینێت لەبەرە، بۆ بەیانی لێ داهاتنت کێ بۆت بەڵێنی دەرە؟، کە لە ئاهی ڕوداوی دوێنێ سوێت دەبێتەوە، ئاخۆ کێ ڕابردوت بۆ دەگێڕێتەوە؟
- بوار بۆ ڕەخسانێکی کەم باشترە لە سامانێکی زۆر، بێ دەسەڵاتی هاوکات لەگەڵ سەربڵندی، چاترە لە پلەو پایەیەك هاوکات لەگەڵ سەرشۆڕی، سستی لەگەڵ خواپەرستی، چاترە لە توندوتیژی هاوکات لەگەڵ سەرپێچی.

- مرۆی چاوتێر پاشایە، کەسی زیادە ڕۆ لاسارە، مرۆڤی تورەو ترش شێتو شوارە، ئەو کەسەش کە هەڵپەیە [٩١٣] کەسێکی هەڵەشەیە [٩١٤]، ئەوەی ڕژدو چاوچنۆکە زاڵمو ستەمکارە.
- یادی خوا پەروەرێن قایل دەکا، مرۆڤ بەختەوەر دەکا، شەیتانی دەم کوت دەکا، خەمو پەژارە لادەبا، تەرازو پڕ خێر دەکا.
- ئەو کەسە کامەرانە تەمەنی درێژەو کرداری چاکە، ئەو کەسە کاری بەجێو لە جێیە ساماندارەو دەست بەخێرە، ئەو مەردمە پیرۆزە چەندی زانستی زیاد بێ پتر لە خوا دەترسێ.
- ئەو کەسەی بایەخ بە خەڵکی دەدا پاداشتی بەوە دەدرێتەوە: خەمی خۆی بیر چێتەوە، خەڵاتی ئەو کەسەی خزمەتکاری خودایە: ئەوەیە خەڵك لە خزمەتی دایە، وەڵامی چاکەی ئەو کەسەش پشتی لە دونیا بکا: ئەوەیە بە لێزمە ڕۆزی بەسەریدا هەڵدەڕژێ.
- ئەگەر تەندروستیت تەواو بێ بەهرەی کەمیشت پێ زۆر بێ، ئەگەر تۆبەو پەشیمانی دەرنەبڕی دەبێ تاوانی چوکیش بە گەورە بگری، ئەگەریش دڵێکی پاكو پاراوت نەبێ خواپەرستی زۆریشت پێ زۆر نەبێ.
- دڵخۆشبون بە دنیا کارێکی منالانەیە، دڵخۆشبون بە سای ئەوەی بە چاکەکار ناسراوی کارێکی جوانمەردانەیە، چاوتێبڕین لەو بەهرەو خەڵاتەی لە لایەن خوایە پیشەی چاکە کارانو دۆستانی خوایە.
- ڕاستگۆیی دڵارامییە، درۆش گومانو دو دڵیە، شەرمو شکۆ پارێزگارییە، زانستیش بەڵگەیەو، ڕون کردنەوە ڕازاندنەوەیە، بێ دەنگیش لێ زانێیە.
- شیرنایی زاڵ بون: تاڵیو سوێری ئارامگریت لەبیر دەباتەوە، تامو چێژی سەرکەوتن ئێشو ژانی چەوسانەوەت لە کۆڵ دەکاتەوە، کاری دڵسۆزانە ئارەقەی نێو چاوانت دەسڕێتەوە.

---

[٩١٣] بەتاڵوکەیە.

[٩١٤] شڵەژاو، نارێك، بە ئامانج نەگەیشتو.

- خۆشـترین شـت لـە ژیانـدا خۆشویـستنی خودایـە، بـە تـامو چـێژترین بـەهرە لـە بەهەشـتا دیـتنی خوایـە، بـە بـەروبوترین کتێـب کتـێبی خوایـە، دڵـسۆزترین دروستکراوی خوا پێغەمبەری خوایە - درودو سڵاوی خوای لەسەر -.
- مەردمی خۆشبەخت ئەو کەسەیە پەند لە ڕابردوی وەرگرێو، بەخۆیدا بێتـەوە، توێشوی گۆڕی لە هەگبـەدا بێو، لە ئاشکراو نهێنیـدا هەسـتی لەسـەر چاوەدێری خوا بێ.
- ڕژدی مایەی سـەرشۆڕییە، چاوبرسێتی ڕیسوایی یە، دەسـت قوچێنی سـوکایەتییە، سەرشـۆڕی بێئومێدییە، بێ ئاگایی پەردەی (نێوانی بەندەو خوایە).
- ((أحفظ الله يـحفظك، أحفظ الله تـجده أمامك، تعّرف إلـى الله فـي الرخـاء يعرفـك فـي الشدة، إذا سـألت فاسـأل الله، وإذا أسـتعنت فاسـتعن بـالله... پارێزگاری لـە فـەرمانی خـوا بکـە خـوا دەتپـارێزێ، پاێزگـاری لـە فـەرمانی خـوا بکـە لـە جێـوە هەست بە کۆمەکی ئەو دەکەی، لـە هێمناییـدا خـوات لـەیادبێ ئـەو لـە تەنگانـەدا تۆی لەیـاد دەبێ، سا ئەگەر داوات کرد لە خـوا بخـوازە، ئەگـەر داوای یارمەتیـشت کرد پشتت بەوی ببەستە)).
- کاتو ساتی خۆشگوزەرانیت بکە تۆشەی چاخی بەڵا باریـت، تەمـەنت لـە پێنـاوی گوێ ڕایەڵی پەروەردیارتدا بەڕێکـە، ماڵی ڕەشیش بۆ ڕۆژی ڕەش.
- چـەندین جـار چـێژ وەرگـرتن ئەنجامەکـەی گەسـتنی پەنجـەی پەشـیمانییە، پاشـەڕۆژی تاوانیش سەرشـۆڕییە، گونـاهیش ڕەوێنـەری بەهرەیـەو، پێکـەنینیش گریەو شـین بەدوای خۆیدا دێنـێ.
- بـە سـای شـوکرانە بـەهرە خـۆ دەگـرن، بـەهۆی کوفرانـەش سـەقامگیـر نـابن، دنیـاش، کـە دڵخۆشـت دەکـا ڕۆژێ دێ، کـە کـۆچ بکـا، گـەر چاکەشـت لەگـەڵ بکـا فێڵێشـت لـێ دەکـا!.
- ساغیو سەلامەتی لە دو گەنجینان یەکێکە، کـەم خـواردنیش مایـەی تەندروسـتی لاشەیە، بارسـوکیش لەمەڕ گوناهان حەسانەوەی گیانو ڕۆحـە، دورکەوتنەوەشـت لە ڕکەبەری کـاتو سـاتت دەپارێزێ.

- خولـەكێكی ئەشـكەنجە بارتـەقای ڕۆژێكـە، ڕۆژێكـیش لـە خۆشـیدا ئەوەنـدەی خولەكێكە، شەوی شادیش هەر زۆر كورتەو، ڕۆژی مەینەتیش دورو درێژە.
- نارەحەتی خۆشگوزەرانیت دەخاتـەوە یاد، برسـیاتیش خواردنـت لا خۆشەویـست دەكا، بەندیخانـە ئازادیـت لا بـە نـرخ دەكا، دەردەداریـش شـەیدای تەندروسـتیت دەكا.
- ئەم سێ دەرمانە بە پزیشكی خۆت بزانە: حەسانەوەو دلگوشادیو پارێزی دانـان لە هەندێ خۆراك، خۆشت لەو سێ دوژمنە بە دور بگرە: ڕەش بـینیو خـەیاڵاتو بێ ئومێدی.
- بەختەوەری لەوەدایە دەرون بگاتە ئەوپەڕی كامڵی، سەركەوتنیش ئەوەیە دەرون بەرهەمی كردەوەكانی بدورێتـەوە، قـازانجو سـودیش ئەوەیـە دنیـا لـە خزمـەتی بێو بەرەو ڕوی بێ.
- لـە پێـشی بەرەبەیانـدا دابنیـشەو، دو دەسـتەكانت بەرزەوەكـە، دو چاوەكانیـشت بكەوەو بڵێ: پەروەردگارا ئەو دەستمایە كەمـەم لـێ قـەبوڵ كـەو پاداشـی تـەواوم پێ بدە.
- ئازادبونیش لـە چنگی ئەشكەنجەو ئـازارو پـیری بـەهرەی خوایـە، هـەتاكو تێنـو نـەبی ئـاو مەنۆشـە، هـەتاكو برسـیش نـەبی نـان مـەخۆ، تـاوەكو مانـدوش نـەبی مەخەوە.
- هەر كێ هێمنو لەسـەرخۆ بـێ بـە خۆزگـەو خواسـتی دەگـا ئـەو كەسـەش كـە بـە چاكە بایـەخ بـدا سـەركەوتنی لـێ پیرۆزە، پەلـەو تاڵوكـەش بـێ ئاكامـە، ئـاواتو خۆزگەی نالەجێش دوڕانە.
- خوا چیت بەسـەر دێنـێ پێـی قایل بـە، ئـەو بـارو گوزەرانـەی خـوا بـۆی هێنایـە ئاراوە ئاوات مەخوازە لە كۆڵت بێتەوە، چونكە ئەو لە تۆ شارەزاترە بە تۆ، لە تـۆ بە بەزەیی ترە بەرامبەر تۆ.
- هەر بڕیارو فەرمانێكی خوا بێ هودە نیە، هەتاكو گوناهو تاوانیش بەو مەرجەی تۆبەو پەشیمانی لـەدوا بـێو، ملكەچیو داوای لێخۆشـبونی لـێ بـەپاش كـەوێو، لوت بڵندیو خۆ پێزۆری پێ بڕەوێ.

- هەمیشە داوای لێخۆشبونت بێ، چونکە خودا لە شەوو ڕۆژدا بەهرەو خەڵات گەلێکی هەن، ئومێد وایە لەو خەڵاتانە یەکێکت پێ ببڕێو، تا ڕۆژی دوایی پێی ئاسودە بێ.
- خۆشی بۆ ئەو کەسەی کە بەهرەی بەسەردا ڕژا شوکرانەی لەسەر بکا، کاتێ تاقی کرایەوە ئارامی لەسەر بگرێ، ئەگەر تاوانی لێ ڕودا داوای لێخۆشبون بکا، ئەگەر ڕقی داگرت هێور بێتەوە، ئەگەر بڕیاریشیدا دادوەرانە بێ.
- زمان بونەوو، گەشەکردنی ژیریو، ڕۆشنبونەوەی هزرو، لاچونی پەژارەو، کەڵك وەرگرتن لە ئەزمونو، بە دەست خستنی بەهرەکان: یەکێکن لە سودو قازانجی خوێندنەوە.
- لە ئاکامی پاڵاوتەییو دەربڕینی پەشیمانیو گەڕانەوە لای خوا، لە ئەنجامی پشت بەستن بە خواو، ئارەزو هەبون لەوەی لە لایەن ئەوەو، ترسان لە سزاو جەزرەبەی، هەروا خۆشویستنی - گەورەییو شکۆ بۆ ئەو - دڵ تۆشەی[٩١٥] وەردەگرێ.
- دەست لەو نزایە بەرمەدە: ((يا ذا الجلال و الاكرام))، لەسەر ئەمەشیان بەردەوام بە: ((يا حيّ يا قيوم برحمتك استغيث)) تاوەکو دڵارامیو دلگوشادیو سەرکەوتن وەدەست بێنی.
- ئەگەر یەکێ ئازاری دای بیر لە بڕیارو قەدەری خوا بکەوە، بەهرەو بەخششو خەڵاتی چاوپۆشیو نەرمونیانیو ئارامگری وەیادخەوە، بزانە ئەو چەوسێنەرەو ئەتۆش چەوساوەی، تۆش لەوی خۆشحاڵ تری.
- بڕیاری خوا جێبەجێیەو، ئەجەلیش نەسەر دەکاو نە کورت دەکا، ڕۆزیش بڕیاری لێ دراوە، کەوایە خەفەتباری لەپێناو چی؟ دەردەداریو هەژاریو بەڵاباری پاداشی لەسەر دەدرێ خەمو پەژارە بۆچی؟

---

٩١٥) توێشوو.

- لە دنیا بەهەشتێك هەیە هەر كەسێ نەچێتە ناوی ناچێتە بەهەشتی دواڕۆژ، ئەویشیان یادی خوداو گوێڕایەڵیو خۆشویستنو دڵ پێیەوە پابەند بونو ئۆقرە پێوەگرتنی خودایە - پاكو بێ گەردی بۆ ئەو -.
- خوا لە هاوەڵان ڕازی بێ، چونكە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەویان كردو، لە سنورە یاساخ كراوەكانی خۆیان پاراستو، لە خوای خۆیان قایل بون، چونكێ خوا بە ئاواتی گەیاندنو لە ترس دڵنیای كردن.
- ئەو كەسە چۆن دڵپەست دەبێ كە پەروەردیارێكی باڵا دەستو لێبوردەی هەبێ، عەیب پۆشو ڕۆزی دەربێ، ببینێتو ببیسێ، هەرچی كارو فەرمانە بە دەستی ئەو بێ؟
- میهری خوا فراوانەو دەرگای ئەو لەسەر پشتە، چاوپۆشی ئەو خەڵاتەو، بەخشندەیی بێ پچڕانەو، ژیوانیو گەڕانەوەی لاگیرا دەبێو، نەرمو نیانی بێسنورە.
- دلگران مەبە چونكە بڕیاری خوا دراوەو، فەرمانی پیادە كراوەو، نوسراوەكە وشك بۆتەوەو، لاپەڕە پێچڕاوەتەوەو، تاوان چاوپۆشی لێ كراوەو، پاداشتیش مسۆگەر بوە.
- با كردەت جوان بێو، ئومێدت سنوردار بێ، ڕو لە كار كەو، لە سنوری ڕۆژی خۆت دا بژێی، قەدرو ڕێزی تەمەنت بزانەو، زمانت پاكو پاراو بێو، مەرگیشت لەبەر چاو بێ.
- هیچ شتێ ئەوەندەی كتێب بە سود نیەو، ئەوەندەی گۆڕ ئامۆژیار نیەو، ئەوەندەی گوناه مایەی بێزاری نیەو، ئەوەندەی دنیا بە كەم گری مایەی شكۆو پایە بەرزی نیەو، ئەوەندەی چاوتێری مایەی دەوڵەمەندی نیە.
- بە ئەندازەی ورە بەرزیو بایەخدانو خۆڕاگریت ژیان نامەت تۆمار دەكرێ، شكۆمەندیش هەروا لە گۆترە دەست ناكەوێ، بەڵكە بە لێهاتوییو هەوڵو قوربانی چنگ دەكەوێ.

- کارو وەرام بە گران مەزانە باری سەرشانت سوك دەبێ، با خەمت لە پێناو دوارۆژدا یەکە خەم بێت [٩١٦]، بۆ ڕۆژی چاوپێکەوتنی گەڵ خوای بە توانا ئامادە بە، لە هەمو شتێکی بێ هودە بە دور بە.
- زۆر ڕۆچون لە شتی حەڵاڵ یەکێکە لەوانەی مرۆ بێزار دەکا، وەکو قسەی زۆرو زۆر خواردنو زۆر نوستن، تێکەڵاوی بێ هودەو پێکەنینی زۆر ئەوانەش هۆکاری پەژارەن.
- لە ناو ئاهو حەسرەتان مەتاوێنەوە، بە سای گریانو ئاخو ئۆف خۆتان مەکوژن، بە شینو ڕۆڕۆو قوڕ پێوان خۆو تیکە تیکە مەکەن، ﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ ... هەتا ئێوە بۆ شتێ لە دەستو دەچێ خەم نەخۆن. (٢٣) الحديد ﴾.
- خودا بۆ ئێوە بەسە، کارتان ڕێکخاو چاوەدێریتان بکا، بەڵاتان لەسەر لاداو بتان پارێزێو ترستان نەبێ، ﴿ ... حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... (ئەی پێغەمبەر!) بۆ تۆو بۆ باوەڕدارانێ شوێنت کەوتون، خودا بەسە. (٦٤) الأنفال ﴾.
- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا ... بێ سۆ خودا وێڕای خۆپارێزانە. دوژمنانیان سەرکوت دەکا، دەردو بەڵایان لادەبا، لە ئەشکەنجەو مەینەتی دەیان پارێزێ. (١٢٨) النحل ﴾.
- ﴿ ... لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ... خەمت نەبێ! ئێمە خودامان دەگەڵە. دەمان بینێو قسەو دەنگمان دەبیسێ، بەسەر دوژمندا زاڵمان دەکاو، کار ئاسانیمان بۆ دەکا، خەمو دڵپەستیمان لائەبا. (٤٠) التوبة ﴾.
- ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ... ئەدی ئێمە تۆمان سینە گوشاد نەکرد؟ ئاخۆ دڵکراوەو فراوانمان نەکردو، ڕوگەشو شادو ئارامـمان نەکردو، ئاوەدانو حەساوەو دڵنیامان نەکرد؟!. (١) الشرح ﴾.

---

٩١٦) تاکە خەم بێت.

• ﴿... وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ... لەو فێڵو فرتانەش کە دەیکەن، دڵتەنگ مەبە. ﴿١٢٧﴾ النحل﴾. ئێمە بۆ فێڵی ئەوان بەسین، داوو تەڵەی ئەوانت لە ڕێدا پوچەڵ دەکەینەوە، ئازارو ئەشکەنجەی ئەوانت لەسەر لادەبەین سا دڵت پەنگ نەخواتەوە.

• ﴿... وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا ... با سستی ڕوتان تێ نەکاو خەمیش مەخۆن. ﴿١٣٩﴾ آل عمران﴾. ئێوە لە ڕوی باوەڕو بەرنامەوە بەرزترن، ئێوە لە ڕوی یاساو مێژودا پایەدارترن، لە ڕوی پشت گیرو ئایدیۆلۆژەوە، لە ڕوی دابو نەریتو خوڕەوشتەوە شکۆدارترن.

• ﴿... إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ ... پەروەرندەت بەخشینی زۆر بەرفرەیە. ﴿٣٢﴾ النجم﴾. لە گوناهباران چاو دەپۆشێ، تۆبەو ژێوانی قەبوڵە، هەڵە بە کەم دەنرخێنێو، تاوانیش دەسڕێتەوە، خەتا دادەپۆشێو، ئەوەی بگەڕێتەوە لای دەیبورێ.

• ﴿... وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ ... ناهومێدیش مەبن لە بەزەیی خودا. ﴿٨٧﴾ یوسف﴾. ڕزگاری ئەو نزیکە، بەزەیی ئەو ڕاستەوخۆیە، ئاسانکاری دێنێتە دیو، بەخشندەیی بەر فرەیەو، چاکەشی گشگیرە.

• ﴿... وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ... (خوا) هەر خۆی لە گش بە بەزەییەك دڵسۆزترە. ﴿٩٢﴾ یوسف﴾. چارەسەر دەکاو چاکدەکاتەوە، جیادەکاتەوەو هەڵدەبژێرێ، دەپارێزێو سەرپەرشتی دەکا، چاو دەپۆشێو لێبوردەیە، ڕێز لێدەنێو نەرمو نیانی دەنوێنێ.

• ﴿... فَاللَّهُ خَيْرٌ حَافِظًا ... چاکترین پارێزەر خودایە. ﴿٦٤﴾ یوسف﴾. کەسی ون بو دەپارێزێ، ئاوارە بوان بۆ وڵاتیان دێنێتەوە، سەرشێواو ڕاستەڕێ دەکا، دەردەداران سارێژ دەکاو، نەخۆش چارەسەر دەکا، تەمومژی خەمانیش دەڕەوێنێتەوە.

- ﴿... وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ ... هـەر خۆتـان بـە خـوا بـسپێرن. ﴿٢٣﴾ المائـدة﴾ . كـارو وەرامتان بەوی بـسپێرن، ڕازو نیازتـان بـەوی بگـەیێنن، ئەوسـا بـە كۆمـەكی ئـەو قایل بنو، بە چاوەدێری ئەو دڵارام بن.
- ﴿... فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ ..هیچ دور نیە خودا ڕۆژێ سەرتان بخا.﴿٥٢﴾ المائدة﴾. گـرێ كـوێرە دەكاتــەوە، بـارگرانی مەینەتیـەكان لـەبیر دەباتــەوە، شــەوی درێــژ دەتارێنێ، دڵو دەرون دەسرەوێنێو، بارو گوزەران دەسازێنێ.
- ﴿... لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ... تۆ چزانی، لەوانەیە لە پاش ئەمە خوا شتێ تر وەدی بێنێ. ﴿١﴾ الطلاق﴾. خەمو خەفـەت هـەڵوەرێنێو، پەرێـشانی بتارێنێ، خاكە ساری بڕەوێنێ، گرانباری سوك بكاو، دوران نزیك خاتەوە.
- ﴿... كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ... ئـەو گـشت ڕۆژێ بـە كارێكـەوە خەریكـە. ﴿٢٩﴾ الـرحمن﴾. مەینـەتباری لادەبـا، لـە گونـاه چاوپۆشـی دەكـا، ڕۆزیو بـژێوی دەدا، نــەخۆش چارەســەر دەكــا، بــەڵاباران تیمــار دەكــا، دڵ شكــستان دەلاوێنــێو، كـۆتو زنجـیر دەپچڕێنێ.
- دوای هــەژاری ماڵــداری یــە، دوای نەخۆشــی لــەش ســاخی یــە، دوای خــەمباری دڵـشـادی یـە، دوای تەنگــانە فراوانیــە، دوای كوتبەنـدی ئـازادی یە، دوای برسـی بونێ تێری یە، ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ... خوا زو لـە پـاش تەنگانـە فـەرحانی دێنـێ. ﴿٥﴾ الشرح﴾.
- لەمەولا بـوار دەگـۆڕێ، دڵو دەرون دەسـرەوێ، نـاخو سـینە گوشـاد دەبـێ، كارەكـە ئاسان دەبێو، گرێكوێرە دەبێتەوەو، هەوری خەمانیش دەڕەوێتەوە ﴿... فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ... جا ئارامگری باشترە. ﴿٨٣﴾ یوسف﴾.
- ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ ... سـا تـۆ خـۆت بـدە دەس كەسـێ كـە هــەر زیندوەو نامرێ. ﴿٥٨﴾ الفرقان﴾. بۆ ئەوەی گوزەرانت باش بێو، حاڵـت خـۆش بـێ،

مـاڵو سـامانت پـارێزراو بێو، خـاوو خێزانـت لـەژێر چاوەدێری بێ، پاشـەڕۆژت گەشەدار بێو، داری خۆزگەت بەرداربێ.

- ﴿... حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ... ئێمــە هــەر خودامــان بــێ بەسمانــەو ئــەو چاترین پشتو پەنامانە. ﴿١٧٣﴾ آل عمران﴾. ئەم نزایە کۆستو پەژارەمان لادەبـاو، خەمی گەورەمان دەڕەوێنێ، تاوانمان هەڵدەوەرێنێو دڵمان دەسازێنێو، عـەیبو عارمان دەتارێنێ.
- ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ... ئێمــەین کەوەســەرمان خــستی، بــەو سەرخــستنە بەرچـاوە. ﴿١﴾ الفـتح﴾. ڕێنماییمــان کــردیو هەڵمانبــژاردی، تۆمـان پاراسـتیو دانمەزرانـدی، سـەرمان خـستیو ڕێزمـان گرتـی، بـە هـەمو شـێوەیەکی جـوان بـە ئەزمونمان گەیاندی.
- ﴿... وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ... خواش لـەو خەڵکـەت دەپـارێزێ. ﴿٦٧﴾ المائـدة﴾. دوژمن دەستی پێت ناگا، خۆ بە خوازانـان دەسـتیان بەسـەرتدا نـاڕوا، چـاوی چـاو پیسان کارت تێ ناکـا، ڕق داگران بەسەرتدا زاڵ نابنو، زۆردار ڕیشە کێشت ناکـا.
- ﴿... وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ... چـاکەی زۆر هێـژاو گرنگـت لـە خـواوە دەگـەڵ کـراوە. ﴿١١٣﴾ النـساء﴾. وەدی هێنـای ڕۆزی پێـدای، فێـری کـردیو تێـی گەیاندی، ڕێی نیشاندای، کارو وەرامـی سـازاندی، ڕێنمـایی کـردیو پەنـدی دادای، تۆی پاراستیو سـەری خـستی، سەرپەرشـتیو، چاوەدێریشی کردی.
- ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ... هـەر بەهرەیـەك ڕو تێـدەکا لـە خواوەیـە. ﴿٥٣﴾ النحـل﴾. بونـەوەری وەدی هێنــاوەو ڕۆزی داوە، گوێـچکـەی داوەو چـاوی داوە، لـەش سـاخی داوەو ڕێـی ڕاسـتی دیـار داوە، ئــاوی داوەو نـانی داوە، هـــەواو هەناسـەی بەخـشیوەو دەرمـانی داوە، بـەرگو پۆشــاکو خانوبەرەشـی بـە مرۆڤـ ڕەوا بینیوە.

- ئەگەر داوات کرد لە خوا بخوازە، ئەوسا کە هەست بە کۆمەگیو هاریکاریو ڕێنماییو کارلەجێی دەکەی، هەست بە یارمەتیو ڕزگاریو سەرکەوتنو دەستگیرۆیی دەکەی.
- پشتمان بە خوا بەست، بە ئایینەکەی باوەڕمان هێنا، بە دوای پەیامبەری ئەو کەوتین، گوێمان بۆ وتەی هەڵخست، بە بانگەوازی ئەو کۆبوینەوە، سا خودا لەگەڵمانەو دڵت پەنگی نەخواتەوە.
- بێ گومانە خودا کێ حەز بکا سەریدەخا، پلەوپایەی بەرزدەکا، سەرپەرشتی کارو وەرامی دەکا دوژمنی سەرشۆڕدەکا، نەیاری دەمکوت دەکاو، ئەوەی پیلانی بۆ بگێڕێ سوکی دەکا.
- ((لا حول ولا قوة الا بالله...)) هێزو توانا هەر بە خوایە، ویستو دەسەڵاتو توانا، دەست گیرۆییو سەرکەوتنو فریاکەوتن، یارمەتیو کۆمەکیو هێزو وزە تەنیا لە لایەن خوای بە تواناوە دێنە ئاراوە.
- ﴿أَلَمْ نَجْعَل لَّهُۥ عَيْنَيْنِ ... ئەدی ئێمە دو دیدەمان پێ نەداوە؟ (٨) البلد﴾. تاوەکو کتێبی ئەم گەردونەی پێ سەرنجدا، پەرتوکی نەخشو نیگار وەخوێنێ، چێژ لەم دیمەنە جوانانە وەرگرێ، بۆ ئەوەش کە سۆماو بیلبیلەی لەناو مێرغوزاری ژیاندا وەخولێتەوە.
- ﴿وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ ... زمانێکیشو دو جوتە لێومان (پێ نەداوە)؟ (٩) البلد﴾. تاوەکو بە ڕاستو ڕەوانی بدوێ، وتەی سەرنج ڕاکێش دەربڕێ، وشەو دەستەواژەی پڕ بەهای بەدەمدابێو، ڕازی ناو دڵی بدرکێنێ.
- ﴿... لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ... ئەگەر شوکرانە بژێر بن، بۆو زیاد دەکەم. (٧) إبراهيم﴾. ئینجا زانست تان بەر فرە دەکا، ژیریتان پانو پۆڕ دەکا، پیتو فەڕ دەخاتە ڕۆزیتانو سەرکەوتن تان مسۆگەر دەکاو خێرو خۆشیتان زۆر دەکا.

- ﴿... وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ... بـە ئاشـکراو بـە نهـێنی بـەهرە گـەلی بەسەرتانا ڕژاندوه. ﴿٢٠﴾ لقمان﴾. بە گشتیو بە تایبەتی، لە دنیاو لە دوارۆژدا، لە سامانو لە خێزاندا، لە بەهرەو گیانو لاشەدا.
- ﴿... وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ... کاری خۆم بە خوا دەسپێرم. ﴿٤٤﴾ غـافر﴾. سکالآی لای ئەو دەکەم، نهێنیم لای ئەو ئەدرکێنم، نیەتم لە ئاستیدا چاك دەکەمو، پشتم بەوی دەبەستم، لە کۆمەکی ئەو دڵنیا دەبمو، بە بڕیاری ئەو قایل دەبم.
- ﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ ... خودا دەربـارەی عەبـدانی بـە ڤیانـە. ﴿١٩﴾ الـشوری﴾. لـە هەژاریدا بژێویان ئەدا، لە نەبونیدا بە فریایان دەگا، کە داوای لێخۆشبونیان کـرد پەشـیمانیان قـەبوڵ دەکـا، ئەگـەر نەخۆشـیش کـەوتن چـارەیان دەکـا، ئەگـەریش دوچاری گرفتێ هاتن بەڵایان لەسەر لائەدا.
- ﴿ ...لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ...نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا ناهومێدبن. ﴿٥٣﴾ الزمر﴾. دەرگای ئەو هەمیشە والآیە، پەردە لە ڕودا ناخا، گەنجینەی لە بن نایـە، هـەرگیز پەتی ناپچڕێو بەهرەو خەڵاتی کۆتایی نایە.
- ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ... مەگەر خودا بەس نیە کـە ئاگـای لـە عەبـدی خـۆی بـێ؟ ﴿٣٦﴾ الزمـر﴾. خـەمو خەفـەتی بـە تـەمای ئـەوە، لـە ناحـەزان دەیپـارێزێ، ئەوانەی پیلانی بۆ دەگێڕن ڕێیان لـێ دەگرێ، لەوانەش کە دەیانـەوێ ئـازاری پـێ بگەیێنن پەنا دەدرێ.
- ﴿... فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ ... ڕۆزی لـــە خـــوا داواکـــەن. ﴿١٧﴾ العنکبـــوت﴾. سەرچاوەی گەنجینەو خەزێنە لای ئەوە، هەر خێرو بێرێ هەیە بە دەستی ئەوە، هەر خۆی والآ دەستو ڕزگارکارو چاکە کـارو زاناو دانایە.
- ﴿... وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥۚ ... هەرکێش بڕوای بە خودا بێ، دڵی شارەزای خـۆی دەکا. ﴿١١﴾ التغابن﴾. ناخۆشی لەسەر لادەبا، چاوپۆشی لە گوناه دەکا، ڕِقو کینـەی دەڕەوێنێو، ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکاو، هەنگاوەکانی ڕێك دەخا.

- ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ... ﴿١١﴾ المائدة﴾، ئێوە مردوبون گیانی بەبەرداکردن، گومڕابون ڕێنوێنی کردن، نەداربون تێری کردن، نەزانبون فێری کردن، چەوساوە بون سەریخستن.
- چەند جاران داواتکردو پێی بەخشی، چەند جار تکاتکردو خاتری گرتی، چەندین جار هەڵەت کردو چاوپۆشی لێکردی، چەندان جار بارگرانی لەسەر سوك کردی، چەند کەڕەت هاوارت بۆ کردو وەڵامی دایەوە.
- سڵاوەت لێدان لەسەر پێغەمبەری بێ هەڵە - درودو سڵاوی خوای لەسەر - خەمو پەژارە دەڕەوێنێو، زامی دڵ سارێژ دەکا، فرە چاکە وەدەست دێنێو، دەروی زانست واڵا دەکا.
- دەستتان بەرەو خواوە بەرزکەن، ڕازی خۆتانی لا بدرکێنن‌و، ڕوی پێداویستی لەو بکەن، ڕۆزی لەوی بخوازن‌و، سکاڵای حاڵتان لای ئەو بکەن، ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ... لە بەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم. ﴿٦٠﴾ غافر﴾.
- ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ ... یا ئەو کەسەی چاترە کە هەروەختێ هومێد براوێك لە بەری بپاڕێتەوە دە هانای دێ. ﴿٦٢﴾ النمل﴾. بەڵاو مەینەتی لادەباو، ئەوەی زەبون‌و شەکەتی دەکا لێی دەڕەوێنێ، خواستەکانی دێنێتە دی‌و، ئەوەی خولیاو ئەوینێتی پێی دەبەخشێ.
- بە سای ئابرووشکۆی خۆت چاکە لەگەڵ هەژارانی ڕەوشتدا بکە، ئەگەر توانجیان تێگرتی یا جوێنیان پێدای یا ئازاریان دای بە هەندیان هەڵمەگرە چونکە پاداشت لە خواوەیە.
- ئەگەر گەشتیارانی دەریا ترسیان ڕێنیشت هاوار دەکەن: خوایە هاوارە، ئەگەر ونبو لارێ بو دەنگ هەڵدەبڕێ: خوایە هاوارە، ئەگەر بەندکراو خەم دایبگرێ هاواری لێ هەڵدەستێ‌و دەڵێ: خوایە هاوارە، ئەگەر نەخۆش ورەی بەردا دەچریکێنێ‌و دەڵێ: خوایە هاوارە.

- ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ... خودا یـەکی بێ نیـازو جێ نیـازە. ﴿٢﴾ الإخـلاص﴾. گەردون سەرلەبەر هانای بۆ دێنێ، هەمو مـەردمێ بـە هـەر ڕەنـگو زمانـێ لەمـەڕ هـەمو پێداویستیێ لێی دەپاڕێتەوە، هەمو دروستکراوێکیش ئاتاجی ئەوە.
- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... چـونکە خـودا سـەروەری ئـەو کەسـانەیە کـە باوەڕیان پێ هێناوە. ﴿١١﴾ محمد﴾. ڕێیان بۆ ڕۆشن دەکا، ڕاستە ڕێیـان نیـشان دەدا، ڕێنماو شارەزایان دەکا، لە گومڕایی لایان دەدا، بە زانست ئاشنایان دەکا.
- ئـەی خەڵکینـە! لەگـەڵ شوشـان[٩١٧] نـەرمو نیـان بـن، دڵـی خـەڵکان مەشـکێننو، سۆزیان بۆ بجولێننو، هەستو نەستیان مـەوروژێنن، بـۆ هـەمو جیهـان نمونـەی خێرخوازی بنو، چاکەیان لەگەڵدا بنوێنن.
- ڕقـت بخۆوە، لە خراپەو هەڵەی دەرحەق گراوت ببـورەو چـاو بپۆشـە، بێئاگـایی لە خەتاکان بنوێنەو، عەیبو نەنگی بشارەوە ئەوسا کـە خۆشەویـستتـرین کـەس دەبی بەلایانەوە.
- دەرگـاو کلیلـت هـەبێ، زورێـك هـەوای بکێـشێ، دڵێـشت ئاسـو دەبـێو، تـەقواو خواپەرستیت ببێ، سەرکەوتن بە شت دەبێ.
- زێدە هەبویی سەرقاڵی‌یە، وێـڕای پێویـستی بـارگرانی‌یـە، بـە پـاکی ژیـان لەگـەڵ ژیانێکی ئاسایی چاترە لە ڕابواردنێکی شاهانەو زیادەڕۆیی.
- هەستی پیلان گێڕیت نەبێو، لە دژی خەڵکان خۆت لـە مـەکۆ مـەنێ، گومانیـشت وانەبێ خەڵك بەتۆوە سەرقاڵن، بەڵکە هەریەکەیان بە کارێکەوە خەریکن.
- ﴿ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ ... خودا لە ئازاری ئەوان ئـەتپارێزێ. ﴿١٣٧﴾ البقـرة﴾. فێڵو فرتیان پوچەڵ دەکاتەوەو هەڵی دەوەشێنێ، هێزو وزەیان تێك دەشـکێنێو، تـینو توانایان لە بن دێنێ، شانو شکۆیان دەڕەوێنێ.
- ﴿ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ ... سا ئۆقرەو دڵنیـایی نـاردە سـەریان. ﴿١٨﴾ الفـتح﴾. زامو بـرینی دڵیـان سـاڕێژدەکا، گـڕی دەرونیـان دادەمرکێنـێ، ناخیـان دەحەسـێنێو، هەستو نەستیان دەسازێنێ.

---

٩١٧) لەگەڵ خێزانەکان.

- ((**الكلمة الطيبة صدقة**... وتەی خۆش چاكەیە))، چونكە دڵی پێ شاددەبێ‌و، دەرونی پێ دەسرەوێ، برینەكان تیمار دەكاو، ڕق‌و كینە لادەباو، واتای ئاشتی دەگەیەنێ.
- ((**تبسمك في وجه أخيك صدقة**... خەندە لێویت بە ڕوی براكەتدا چاكەیە)). چونكێ ڕوخسار ناوو نیشانێكە دەخوێندرێتەوەو، ئاوێنەی دڵە، سەرەتای مزگێنی‌و دێدەدوانی[٩١٨] ناخ‌و دەرونە.
- ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ... تۆ وەرامی خراپە بە چاكە بدە. ﴿٩٦﴾ المؤمنون﴾. ئەمەشیان بەوە دەبێ چاو لە تۆڵەسەندنەوە نەگێڕی، قسە خۆش‌و توك نەرم بی، خراپەی دەرحەق كراوت پشت گوێ خەی، لە هەڵس‌و كەوتا نەرم‌ونیان بی.
- ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ... ئەم قورعانەن بۆ نەناردوی كە توشی چەوسانەوە بی. ﴿٢﴾ طه﴾. بەڵكە بۆ ئەوەی گیان‌و ڕۆحت ئاسودە بێ‌و بسرەوێ، بە سای ئەوە بچیتە ناو گوڵشەنی سەرفرازی‌و، بەهەشتی كامەرانی بەشت بێ.
- ﴿... وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ ... لەم دینەشدا توشی زەحمەتی نەكردون. ﴿٧٨﴾ الحج﴾. بەڵكە بارسوكی‌و ئاسانی‌یە، لە قورسی‌و گرانی بەدورەو، لە ئازارو شەكەتی پارێزراوە.
- ﴿... وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ ... گرانایی زنجیریان لەسەر لادەبا، كە بە وانیان شەتەك دابون. ﴿١٥٧﴾ الأعراف﴾. دوای بەدبەختی بەختیار دەبون، دوای شەكەتی حەساوە بون، دوای ترس‌و بیم بێ ترس بون، دوای دڵ توندی شادمان بون.
- ﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ... گوتی ئەی پەروەرێنی من! پشو درێژترم بكە، كاریشم لێ سانا بكە. ﴿٢٦﴾ طه﴾. ئەوسا كە بەر پێیەكانم دەبینم، بەدڵ هەست بە ڕێنمایی دەكەم، دەستم بە توند گیردەكەم، لە ژیانمدا سەركەوتن وەدەست دێنم‌و دوای مەرگیشم ڕزگار دەبم.

---

٩١٨) شارەزا.

- ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ... لەبەریشت هاسان دەكەین، هەتا هاسانترین ڕێگە پەیدا بكەی. ﴿٨﴾ الأعلى﴾. جا پڕ بە دڵ بەندایەتی پەروەرێنت دەكەیو، لەناخەوە گوێڕایەڵی دەكەیو، لە پێناویدا بەڕاستی كۆشش دەكەی، ئەوسا كە سزای ئەم ڕێیە شیرینەو، تاڵایی یەكەی هەنگوینە.
- ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... خوا ئەركی لە توانا بەدەر، بەسەر كەسدا ناسەپێنێ. ﴿٢٨٦﴾ البقرة﴾. بەدەر لە توانا ئەركی نەخستۆتە سەرشان، بەڵكە بەپێی تواناو، بە ئەندازەی لێهاتوییو، بارتەقای وزە فەرمانی داوە.
- ﴿ ... رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ... ئـەی پـەروەردیارمان! ئەگـەر شتێكمان لەبیرچو لێمان مەگرە. ﴿٢٨٦﴾ البقرة﴾. ئێمە جاری وایە بە جوڵە دەكەوینو، جاری واشە بێئاگاین، زەینمان دەپرشێتو، هۆشمان لای خۆ نامێنێ، سا چاوەڕێی سۆزی تۆین پەروەردیارا.
- ﴿ ... أَوْ أَخْطَأْنَا ... یا (ئەگەر) تیا بەهەڵە چوبین (لێمان مەگرە). ﴿٢٨٦﴾ البقرة﴾. ئێمە بێ هەڵە نینو لە گوناهانیش بەدور نین، وەلێ چاومان لە قاپیەی تۆیەو، هومێدمان بە سۆزی تۆیە.
- ﴿ ... رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ... ئەی پەروەردگاری هەمو لامان! ئەركی وامان پێ مەسپێرە كە لەتوانامان بەدەر بێ. البقرة﴿٢٨٦﴾. نەوەك بێتوانایی بمانگرێو، دڵو دەرونمان كپ بێ، بەڵكە لە سەرمان سوك كە هەروەكو كردت، لەسەریشمان سانا بكە هەروەك وەڵامت داینەوە.
- ئێمە هەڵە بارو تاوانبارین، كەمو كوڕی لە ئێمەیەو گوناهمان لێ ڕوئەدا، تۆش خودایەكی لێبوردەو بەخشندەی، دلۆڤانو دە هەندەی، ﴿ ... وَٱعْفُ عَنَّا ... بمانبەخشە. ﴿٢٨٦﴾ البقرة﴾.

- لە ژێر سایەی سۆزی تۆدا بەختەوەرین، بە هیواو ئومێدەوارین، سەبارەت بە میهری تۆیە کردەوەمان گیرا دەبێ‌و، گوزەرانمان لەبار دەبێ، ﴿... وَٱرۡحَمۡنَآۚ ... وەبەر بەزەیی خۆتمان بخە. (٢٨٦) البقرة﴾.
- ((**بعثت بالحنيفية السمحة**... من بە ئاینێکی پاك‌و پاراوەوە نێرراوم)). تەنگ‌و چەڵەمەو فاق‌و بریقی تێدا نیە، ئەشکەنجەو بارگرانی تێدا نیە، بەڵکو خووڕەوشتەو لەگەڵ سروشتدا گونجاوە، سوك‌و سانایەو زیادە ڕۆیی تێدا نیە.
- ((**اياكم والغلوّ**... وریا بن سنور مەبەزێنن)). بەڵکە شوێن (سوننەت) بکەون‌و دەستی پێوە بگرن، سەرو گوێی بۆ زیاد مەکەن، ئاسانکار بن‌و توندی مەکەن، مامناوەنجی بن‌و سنوربەزێنی مەکەن، چۆنە بەم شێوەیە پەیڕەوی لێبکەن.
- ((**امتي أمة مرحومة**... ئۆمەتی من ئۆمەتێکە بەزەیی بۆ نوێندراوە)). پەروەردیاری سەرپەرشتیارە، پێغەمبەری گەورەی پێغەمبەرانە، ئاینی جوانترینی ئاینانە، ڕێکترین پەیڕەوو بەرنامەی هەیەو باشترینی ئۆمەتانە.
- ((**ذاق طعم الإيمان من رضي بالله ربا، وبالإسلام دينا، و بمحمد ﷺ رسولا**... ئەو کەسەی خودای بە پەروەردیارو، ئیسلامی بە ئایین‌و، (موحەممەد)ی بە پێغەمبەر قەبوڵە تامی باوەڕی چەشتوە، ئا ئەم سێیانە بنەمای ڕەزامەندی‌و بنچینەی سەرفرازین)).
- لە ڕوگرژی خۆت بەدور بگرە، چونکە دەروازەی خەم‌و پەژارەیەو، مایەی دابڕدابڕبونی دڵ‌و پرشوبڵاوبونی هۆش‌و، تێکچونی گوزەران‌و بەفیڕۆچونی تەمەنە.
- ڕەزامەندی هێمنی‌و هەداری دەبارانێ‌و، حەسانەوەو سرەوتن دەهێنێ‌و، ئارامی‌و ئاسودەیی بە دڵ دەبەخشێ‌و، ژیان‌و گوزەران دەڕەنگێنێ.
- ڕەزامەندی دڵ دەپارێزێ لە گەندەڵی‌و لە ناپاکی، لە گرژی‌و لە ناخۆشی، لە گازاندەو لە گلەیی، لە جاڕسی‌و هەراسانی‌و بێزاری.
- هەر کەسێ بە خوا قایل بێ دڵی پڕ دەکا لە باوەڕو ڕۆشنایی، لە خۆشەویستی‌و دڵنیایی، لە چاوتێری‌و ڕەزانوێنی، لە هێمنی‌و دەوڵەمەندی، لە تۆبەو پەشیمانی.

- ئـەی هـەژارای نـەدار: جـوان ئـارام بگـرە، تـۆ حەسـاوەی لـە دەسـتی ڕاوە پـارەو، خزمەتی سامانو داگردنی پوڵو دراو، لە پاسەوانیو نۆکـەری مـاڵو، زەحمـەتیو نارەحەتی لێپرسینەوەی خوداوەند.
- ئـەی ئـەو کەسـەی چاوەکانت لەدەسـت داوە: مـژدە بـێ بەهەشـت لـە پـای نرخـی چاوی تۆیە، دڵنیابە لە بری ئەوە خوا ڕوناکی خستۆتە ناو دڵت، لە بینـینی شـتی ناحەزو چاوپێکەوتنی شتی پڕوپوچو نالەبـار پارێزراوی.
- ئەی دەردەواری بەڵابار: گەر خوا یـار بـێ لـە گوناهـان پـاك بویتـەوەو، لـە تـاوان دورکەوتیەوە، نەفسی گەورەت نزم بـو، لـوت بڵنـدیت نـەوی بـو، نـەفسو هـەوات داشـکایەوەو، دڵت ئاو درایەوە.
- بۆچـی بـیر لـە شـتی نـەبو دەکەیتـەوەو ئـەوەی هەیـە سوپاسـی لەسـەر ناکـەی، بەهرەی بەردەست لەیاد دەکەی، حازری بە ناحـازر دەدەی، چـاو لـە مـاڵی خـەڵك دەبڕی ئەوەی بەردەستیشت بە هەند هەڵناگری.
- ((كن فـي الدنيا كأنك غريـب... هەروەکو کەسـێکی نـامۆ لـە دنیـادا بگوزەرێنـە)). تەنیا تیکە نانێكو قومە ئاوێكو، بەرگو پۆشاكو چەند ڕۆژانێکی کەمو چـەند شەوێکی بەهەژمار بەشی تۆیە، ئیتر ژیان کۆتایی دێو ئەو گۆڕەی دەوڵەمەندترین کەسو هەژارترین کەس لێی دەنێژرێ جیاوازیان لەنێواندا ناکرێ.
- پاشا لە تەنیشت خزمەتکار، سەرکردە لە هاوسێی جوتیار، شاعیری نـاودار لەگـەڵ هەژاری بـێ کـەسوکار، دەوڵەمەنـد لەگـەل پەککەوتـەو بێـچارەو نـەدار، لـە گـۆڕ دەنرێن، وەلـێ لـەناو گـۆڕدا بـەپێی کـردەوەی هەمـەجۆرو پلـەی دواڕۆژ هـەڵاوێر دەکرێن.
- ئەگەر ڕۆژێکی نوێ سـەری لـێ هەڵـێنای بڵـێ بـەخێر بێـی ئـەی مێـوانی بـەڕێز، ئەوسا بەهۆی جێبەجێ کردنی ئەركو واجبی سەرشانت، بە نوێکردنەوەی تۆبـە لە گوناهـەکانت پێـشوازی لێبکە، نەکـەی ئـەو ڕۆژەت بـە تـاوانو خـەمو خەفـەت ناشـیرینکەی، چونکە ئەوەی چو ناگەڕێتەوە.

- ئەگەر رابردوت هاتەوە یاد بیر لە رِوی درەوشاوەی دیرۆکت[٩١٩] بکەوە تاوەکو دڵت شاد بێ، ئەگەریش ئەو رۆژەت کەوتە یاد بیر لە بەرهەمی بکەوە ئاسودەیی هەست پێدەکەی، ئەگەر بیریشت لە داهاتو کردەوە خەونە خۆشەکانت بێنەوە یاد، هەتا گەشبین بی.
- تەمەنی درێژ خەرمانەیێکە لە ئەزمون، زانکۆیێکە لە زانست، ویستەگەیێکە لە زانیاری، هەر رۆژێکیش بەسەر تەمەنتدا رابرێ وانەیێك لە ژیان وەردەگری، تەمەن درێژیش بۆ کەسانێ کە تێدەگەن پیتو فەرە.
- پێویستە کەمێ ترس هەبێ هێمنیت بەیادخاتەوەو، لەسەر نزاو پارانەوە هەڵتبنێ، لە سەرپێچیکردن بتگێرِێتەوەو، لە مەترسیێکی گەورەتر رێت لێبگرێ.
- پێویستیشە نەخۆشیێك هەبێ تەندروستیت یادخاتەوەو، ریشاڵی خۆ پێ زۆریو ڤایرۆسی خۆ پەسندی هەڵبکێشێ، تاوەکو دڵت لە خەوی بێئاگایی بە ئاگا بێنێ.
- ژیان کورتە تۆش بە سای ژیان تاڵی کورتتری مەکەوە، دۆستو خۆشەویست کەمە تۆش لەمەرِ سەرزەنشتکردن مەیدۆرِێنە، نەیارانیش گەلێکن تۆش بە سای بەدخویی ژمارەیان زۆر مەکە.
- لە بەردەوامیو کۆڵنەدان وەکو مێرولە بە، سەدجار بەسەر درەختێکدا هەڵدەگەرِێو بەر دەبێتەوە، دیسان سەر دەکەوێتەوە هەتا دەگاتە سەری، ئەوسا تۆش بێزارو شەکەت مەبە.
- هەروەکو هەنگ بە، پاك دەخواو پاکیش فەراهەم دێنێ، ئەگەر بکەوێتە سەر پۆپەی گوڵانیش روخساریان نارِوشێنێو، لقەکانیشیان ناشکێنێ.
- فریشتە ناچنەماڵێك سەگی لێبێت، جا چۆن دەچنە ناو دڵێك سەگی بەدگومانیو ئارەزوبازی تێدا بێت.

---

[٩١٩] مێژوت.

- لە چەقە خانەکـان [٩٢٠] خۆت بە دور بگرە، چونکە هەر بە نرخێکی هەرزان دینی لـێ دەفرۆشرێ‌و، پیـاوەتی لەدەست دەدرێ، لـەوێدا ئابرووشکـۆ لەژێـــر پێـــی بێ ئابرواندا دەکەوێ.
- کـات تێدەپـەرێ‌و، خـۆر دەخولـێتـەوەو، مـانگ دەڕواو، بـاو زریـان هەڵـدەکـا، تەنیا پێشبـرکێ لە ئارادایە، کاروانی ژیان لەسەر تـۆ ڕاناوەستێ تـۆش مەوەستە، ﴿سَابِقُوٓاْ ... پێشبڕکێ بکەن. ﴿٢١﴾ الحديد﴾.
- ﴿وَسَارِعُوٓاْ ... پەلەبکەن. ﴿١٣٣﴾ آل عمران﴾ . بە گـوڕ بـەرەو لوتکـە هـەنگاو بنـێ، سەربەرزی بۆ ئەو کەسەیە بۆ بەرزایی سەردەکەوێ، سەرکەوتن بـەوە دەستـەبەر نـاکرێ لەسـەر کاسـەو لەگـەنی زێـڕ دەور بـدرێ، بەڵکـە فرمێـسك‌و خـوێن‌و شـەونخونی‌و شـەکەتی‌و ماندوێتی‌و برسێتی‌و ڕەنجی دەوێ.
- ئارەقەی کرێکارێ بـۆن خۆشـترە لـە بـۆن میـسکی پاڵکـەوتوێ، هاشـەی هەناسـەی ماندو شـەکەتێ خۆشـترە لە ئـاوازی گۆرانی تەمبەڵـێ، کولـێرەی برسـی‌و بێ نانێ بەچێژترە لـە گۆشـت بـەرخی خـوا پێداوێ، ﴿وَسَارِعُوٓاْ ... پەلەبکەن. ﴿١٣٣﴾ آل عمران﴾.
- ئـەو جـوێن‌و توانجـەی لـە دەمـی ڕەشـك پـێ بەرانـەوە [٩٢١] دەرحـەق بـە کەسـانی لێهاتوو بەهرەمەندان دەگوترێ هەروەکو بڵێی دەنگی تەقـەی خۆشـی یـەو، چۆن بڵێی بێ بەرامبەر ڕێکـلامێکن گوزارشـت لە سەرکەوتن دەدەن.
- سـەرکەوتن‌و پێـشکەوتن هـەقی بـە بنەماڵـەو نـاوودەنگ‌و ئاسـتی دەسـتکەوت‌و ڕاهێنـان نیـە، بەڵکـە ئـەو کەسـەی خـاوەنی ورەیێکـی بـە تـەوژمو، نـاخێکی دەوڵەمەندو، ئارامێکی جوانە، بە مەرامی بەرزی دەگـا.

---

[٩٢٠] شوێنی چەقەچەق.

[٩٢١] لەدەمی حەسودانەوە.

- لە تاوی ناخۆشیەکان ترس نەتگرێ بزانە شێر پەلاماری مێگەلێك نێچیر دەدات‌و نرکەی لێوە نایێ، لە دوای خواست‌و مەبەستت بێزار مەبە، بزانە درندە نێچیرەکەی لەناو ئاگریش بێ دەردێنێ.
- هەر بە قسەی خۆت مەکە لەمەڕ کاروباری ژیانت، بەڵکە پرس‌و ڕات هەبێ چونکە بۆچونی دوان لە ئی یەکێك بەهێزترە، چۆن ئەگەر دو پەت لێك بهاڵێن بە هێزو توندو بەندترن.
- هەر ڕەخنەیەك ڕوی تێکردی بە دوژمنایەتی مەزانە، بەڵکە بێ گوێدانە مەبەستی خاوەنەکەی کەڵکی لێ وەرگرە، چونکە تۆ ڕاستکردنەوەت زیاتر پێویستە لە پێداهەڵگوتنت.
- هەر کێ لە مەبەستی خەڵك تێ بگا دەحەسێتەوە، بە سای بەدگۆی ئەوان هەراسان نابێ‌و، بە ستایش کردنیشیان باڵی لێ نایێ، چونکە ئەوان بە کوڵێك هەڵدەچن‌و، بە فوێك دەنیشێنەوە، بە پێی ئارەزو دەجوڵێن.
- لات وانەبێ بەڵاو کۆست لە گەیشتن بە خواستەکان ڕێت لێ دەگرن، چەندین کەسی بەهرەمەند ئەگەر چی کەڕو کوێروشەت‌و خوار بون، بەڵام بە مەرام گەیشتن، کەواتە لاشە دەور نابێنێ بەڵکە ورەو غیرەت جێی دەگرێ.
- ئومێدا وایە کە خودا لێت دەگرێتەوە بەزەیی پێت دابێتەوە، ئەگەر لە خواستت ڕێت پێ دەگرێ چاکەو قازانجی بۆت بوێ، کە لە مەبەستت دوات دەخا یارمەتیت بدا، چونکە ئەو لە تۆ لەمەڕ بەرژەوەندی تۆ شارەزاترە.
- ئەگەر پەژارەیێ بۆ مێوانت وا بزانە پارچە هەورێکی کەمە لە هاوێنداو دەڕەوێتەوە، با گرمەی نەتترسێنێ‌و، هەورە تریشقەی نەتتۆقێنێ، جار وادەبێ بارانەی بۆت ببارێنێ.
- هەفتەی جارێك بە خۆت‌و خاوو خێزانت گەشتێ بکە، چونکە پتر چاویان دەکاتەوەو، ژیانتان نوێ دەکاتەوەو، بێ ئومێدی‌و بێزاری پێ دەڕەوێتەوە.
- هەر کێ لە ماڵی خۆی ئاسودە نەبێ لە هیچ شوێنێ ناحەسێتەوە، دڵنیاش بە شیاوترین جێگا بۆ دڵارامی‌و هێورەیی‌و دوری لە ئاستەنگ‌و ناخۆشی ماڵی خۆتە.

- زانــستو ڕۆشــنبیری شــکۆو ڕێــزی هــەر دەمێنــێ، بــە تایبــەت بــۆ ئــەو کەســانەی فیـرکاری خەڵكو دانەری کتێبن، بەڵام قەدرو ڕێزی پلـەو پایـە خـۆی ڕانـاگرێو، وەکو کەفـی ســەر ئاوە.
- بـیرو زەیـن ئەگـەر وەگـەڕ نــەخرێ بــەرەو خانــەی مەرگەسـات دەچـێ، ئەوسـا ئەشکەنجەو ئـازار ڕادەکێـشێ، جا هـەروا بەرهەڵدای مەکە بەڵکە لـە شـتی سـود بەخشدا بەکاری بێنە.
- یەکێ لەوانەی حاڵ دەشێوێنێو دڵ ڕەق دەکـا تێکەڵبونە لەگەڵ خەڵكداو، گـوێ گرتنە لە گوتەی پڕوپوچیانو، زۆر مانەوەیە لەناویان، هیچ شتێکیش ئەوەنـدەی بەسەربردن لەگەڵ بەندایەتیو زانستدا بەردار نیە.
- باشترین ڕێگا کە بیگریە بەر ڕێگای مزگەوتە، بێ کێشەترین ڕێ ڕێگـای چـونەوە ماڵتــە، ناخۆشــترین ڕاوەســتان ئەوەیــە لەبــەردەم دەســەڵاتدار ڕادەوەســتی، گەورەترینو چۆنیەتیش گڕنۆش بردنە بۆ خوای تۆڵەسێن.
- گوێ هەڵخستن بۆ قورئان بە دەنگێکی خـۆش، یـادکردنی خـوا بـە دڵێکـی ئامـادە، بەخشین لە ماڵێکی حەڵاڵ، ئامۆژیـاری کـردن بـە زمـانێکی پـاراو سـفرەو خـوانی دەرونن، باخو گوڵشــەنی دڵــن.
- خووڕەوشتی جوانو جوامێرانە، لە ڕوخساری جـوانو چـاوی ڕەشو کـوڵمی سـور جوانتــرە، چونکە جوانیو شۆخو شەنگی ناوەکی لە جوانی دەرەکی بەرچاوترە.
- کـردەی چاکە لـە دەرەنجامی خـراپ دەتپـارێزێ، هێـزو وزەی ژیـری لـە خلیـسك پــێبردنی هــەواو هــەوەس دەبێتــە بەربەســت، چەکوشــی ئــەزمون لــە هــەزار ئامۆژگاری بەهێزترە.
- ئەگەر هـەزاران مـەردم ببـینی کـە سـەرقاڵی گاڵتـەو گـەپو تەمـەن بەفیـڕۆدانن، سوپاسی خوا بکـە لەسـەر ئـەو بـەهرەی پێـت بـڕاوە، چونکە بینـینی بەربـەڵایان شادیە بۆ دورە بەڵایان.
- ئەگەر کەسێکی بێ باوەڕت بینی سوپاسی خوا بکـە کـە موسـڵمانی، ئەگـەر چـاوت بە خراپەکارێ کەوت سوپاسی خوا بکە کە تەقوا کاری، ئەگـەر کەسـێکی نـەفامت دیت سوپاسی خوا بکە کە دەزانی، ئەگەر کەسێکی دەردەدارت بینی سوپاسـی خـوا بکە کە دورە دەردی.

- خۆر لە بەرژەوەندی تۆ دروست کراوە ئەوسا خۆت بە تیشکەکەی پاککەرەوە، با لە پێناوی تۆدا هاتۆتە ئاراوە جا کەڵك لە هەواکەی وەرگرە، چۆم و ڕوبار لە قازانجی تۆ ڕەخساوە سا چێژ لە ئاوەکەی وەرگرە، میوەو بەروبوم لەبەر خاتری تۆ وەدی هێنراوە دەی تۆش تامی لێ وەرگرە، سوپاسی ئەو خوایە بەرزو بێهاوتایەش بنوێنە کە چاکەی لەگەڵدا نواندوی.
- کەسی نابینا بە هیوای دیتنی نیگاری جوانە، مەردمی نەبیسەریش بە ئومێدی بیستنە، ئەوەی لە جێگا کەوتوە خولیای ئەوەیە چەند هەنگاوێ هەڵێنێ، لاڵ و بێ زمانیش شەیدای دەربڕینی چەند وشەیێکە، کەچی تۆ دەبینی و دەبیسی و دەڕۆیو دەوێژی.
- پێت وانەبێ کەس لە ژیاندا بێ کێشەیە، هەیە خانوبەرەی هەیە بێ ئۆتۆمبێلە، هاوسەری هەیە بێ کارو ئیشە، گەدەی ساغەو حەزی لە خواردنە بێ خواردنە، جۆرەها خواردنی لەلایە پارێزی بۆ دانرایە.
- مزگەوت بازاڕی دوارۆژە، کتێب لەگەڵ تەمەندا هاوڕێیە، کردەوە دڵنەوای ناو گۆڕە، ڕەوشت بەرزی ئاتاجی گەورەیی و ڕێزە، بەخشندەییش جوانترین پۆشاکە.
- خۆت لە کتێبی خوانەناسان بەدور بگرە، چونکە نیازیان گلاوەو دڵ پیس و لێخن دەکەن، ژاریان تێدایەو گیان دەکێشن، پەڵەیەکن دڵ دادەپۆشن، هیچ شتێکیش ئەوەندەی نیگای خوا بۆ تۆ گونجاو نیە، دەرونت پاك دەکاتەوەو، دەردی تۆ تیمار دەکا.
- لە کاتی توڕەبوندا بڕیار مەدە نەوەك پەشیمانی بتگرێ، چونکێ کەسی توڕە ڕاستی لەدەست دەداو، هۆشی لەکن نامێنێ و، تێفکرین دەدۆڕێنێ.
- پەژارە ون بو ناگێڕێتەوە، ترس داهاتو ناگونجێنێ، نیگەرانی سەرکەوتن بەرهەم نایێنێ، بەڵکە دڵی ڕازی و دەرونی ساغ دو باڵی بەختەوەرین.
- هەتا ڕێز لە خەڵکان نەگری لێیان مەخوازە ڕێزت بگرن، لەمەڕ ئەو تیشکانەی دوچارت هاتوە خەڵك سەرزەنشت مەکە، بەڵکە خۆت بە تاوانبار بزانە، ئەگەر حەزیش دەکەی خەڵك ڕێزت بگرێ بۆ خۆت ڕێزی خۆت بگرە.

- ئەگـەر خـاوەن کۆڵـیت [٩٢٢] دڵنیـا بـێ ڕۆژێ دێ کۆشـكو باڵەخانـەکان دەڕوخـێن پێویستە بە کۆڵیتەکەی قایـل بـێ، ئەگـەر خـاوەن پوشـاکیدا دڕاو گومـانی لـەوەدا نیــە کــە ڕۆژێ دێ بــەرگی ئاوریــشــم دادەڕزێ جێگــای خۆیــەتی لــە بەرگــە دادڕاوەکەی گـازاندەی نەبێ.
- هەر کەسێ هەرچی ئارەزوی بیەوێ بەدوای کەوێ، دڵی دابڕدابڕ دەبـێ، کاروبـاری لـەبار دەچـێ، خـەمو پـەژارەی زۆر دەبـێ، چـونکە دەرون هەڵخەڵەتێنـەرەو هـەر فەرمانی بە خراپەیەو خواستەکانی بێ سنورە.
- ئەی ئەو کەسەی زاڕۆڵەت لەدەست داوە: خودا کۆشکی سوپاسگوزاری لە بەهەشـتا بۆت داناوە، ئەی ئەو کەسەی لە دنیادا بەشت بڕاوە: بەشی تۆ وا لە بەهەشـتی تـا هەتایی چاوەڕوانە.
- باڵندە لەناو هێلانەیدا ڕۆزی بۆ ناباریێ، شێر لەناو لانەیدا بژێوی نایێتە بـەردەم، مێرولـە لـەناو کونەکەیـدا دانەوێڵەی بـۆ نـاڕژێ، بەڵکە هـەر کامیـان بـە شـوێن بژێویاندا دەگەڕێن، دەسا تۆش هەوڵت بە هەوڵی ئەوان بێئەوەی بەوان بڕاوە بە تۆش دەبڕێ.
- ﴿... يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ ... هــەر هــەرایەك لــە دژی خۆیــان دەزانــن. (٤) المنـافقون﴾. لـە چـاوەڕوانی هـەمو بەڵایـەك دان، بـەر لـە هـاتنی مـەرگیان دەمـرن، پێـشبینی هــەمو کارەســاتێك دەکــەن، لــە گــشت خــەیاڵو جموجــۆڵو دەنگێــك دەترسێن، چونکە ناخیان پڕشوبڵاوەو دڵیان بەتاڵـە.
- ئەگەر خودا تۆی لەسەر بارو حاڵەتێك جێگیـر کـردی جگـە لەمـە داخـواز مەکـە چونکە ئەو لە بارەی تۆ زانایە، ئەگەر هەژاری کردی نەڵێی خۆزگە دەوڵەمەنـدی دەکردم، ئەگەر نەخۆشی کردی نەڵێی خۆزگە چارەی دەکردم.
- ئومێد وایە لە دواکەوتنی گەشـتەکەتدا بەرژەوەندی هەبێ، لە نـەبونی هاوسـەردا فەڕو پیت هەبێ، لەوەی فەرمان بەریت بۆ نەڕەخسـاوە قازانجت بێ، چونـکە خوا دەزانیو تۆش نازانی.

---

٩٢٢) زنج، کوخ، خانوێکی زۆر سادە.

- بەرد لە درەخت بەهێزترە، ئاسنیش لە بەرد بەهێزترە، ئاگریش لە ئاسن بەهێزترە، باش لە ئاگر بەهێزترە، وەلێ باوەڕیش لە بای سەخت بەهێزترە.
- هەر بەڵایێ دوچارت بێ وانەیەکەو لەیاد ناکرێ، هەر ئاستەنگێ کە دێتە ڕێت لەناو بیرتدا هەڵدەگیرێ، بۆیە لەناو هزردا دەبێتە پەیامێکی تا هەتاییو پشتگوێ ناخرێ.
- سەرکەوتن چەند تنۆکێکە لە دەرەنجامی ئەشکەنجەو ئازارو زامو برینو مەرگەساتدا پاڵێوراوە، دۆڕانیش چەند دڵۆپێکە لە ئاکامی سستیو تەمبەڵیو بێ توانایيو شلو خاویدا پارزنراوە[٩٢٣].
- ئەو کەسەی سورە لەسەر پەیداگرتنی ناوو دەنگێکی کاتیو، هەوڵ نادا ناوی بەرز ڕابگیرێو، نایەوێ زانستی بەسودو کردەوەی چاکە دەستەبەر بکا، تەنیا کەسێکی ساویلکەو بێ ورەیە.
- (( **یا بلال، اقم الصلاة، ارحنا بها**... (پێغەمبەری خوا -درودو سلاوی خوای لەسەر- دەفەرموێ) ئەی بلال، قامەت بۆ نوێژ دابەستن بکەو، بە سای نوێژبمان حەسێنەوە))، چونکە نوێژ داباریني ئارامی یە، ڕوباری هێمنیو هەداری یە، نزە باییکی پاکو فێنکە، بەسەر دەروندا هەڵدەکا، گڕی ترسو کڵۆڵی کپ دەکا.
- ئەگەر سەرپێچی پەروەردیارت نەکردو، دەرهەق بە کەس ستەمت نەکرد، پڕ بە چاوەکانت بخەوە، خۆشی لە خۆت بەشێکی گەورەت پێ بڕاوەو، هیچ نەیارێکت نیەو هەوڵت بە فیرۆ نەداوە.
- خۆشی لەوەی کە شەو دەخەوێ خەڵك بۆی دەپاڕێتەوە، قوڕ بەسەریش بۆ ئەو کەسەی کاتێ شەودەکاتەوە خەڵك نزای لێدەکا، مژدە بۆ ئەوکەسەی جێگای خۆی لەدڵی خەڵکدا کردۆتەوە، دۆڕانیش بۆ ئەوکەسەی زمانەکان نەفرەتی لێدەکەن.
- ئەگەر لە دادگای دنیا دادەوەریت دەرك پێ نەکرد داواکەت بەرەو دادگای دوارۆژ بەرزکەوە چونکە لەوێ فریشتە شایەتن، داواکە پارێزراوەو، داد پرسیش خوایەکی هەرە دادوەرە.

---

٩٢٣) پالاوتەکراوە، پاڵێوراوە.

• ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ... سا ئێوە یادی من بکەن، تا منیش لەبیرتان نەکەم. ﴿١٥٢﴾ البقرة﴾. ئەگەر یادی خودا هەر ئەوەندە سودەی هەبێ بەسە، ئەگەر هەر ئەوەندە قازانجەی هەبێ کە خوداش یادی تۆ بکا بەسە، ئای لەو شکۆو رێزە، لەو گەورەیی‌و سەربەرزییە

• مژدەت لێبێ.. دەستنوێژ گرتن بەشێکە لە باوەڕ، تاوان هەڵدەوەرێنێ‌و، بە تەواوی گوناهان دەشۆرێنێ، خاوێنت دەکاتەوەو ئامادەت دەکا بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو خوایەی زاڵە بەسەر هەمو دەسەڵاتێکدا.

• خۆشی لەخۆت نوێژ تاوانی رابردو دەسڕێتەوەو، ئەوانەی ئێستاش رەشدەکاتەوەو داهاتوش دەسازێنێ، خاوەنەکەی لە کۆتبەندی دەکاتەوەو، بیلبیلەی چاوەکانە.

• ئەو کەسەی بۆ ئەوە تێدەکۆشێ خەڵك رێزی بگرێ‌و رەخنەی لێ نەگرێ، بە زۆری وایە لە بەدبەختی‌و چارەرەشیدا دەگوزەرێنێ، گەرانیش بەدوای خۆدەرخستن‌و ناوودەنگدا لەگەڵ بەختەوەریدا تێکدەگیرێن.

• تەنیا تێڕوانین‌و لێکۆڵینەوە دەربارەی هونەری شادی بەس نیە، بەڵکە پێویستی بە جموجۆڵ‌و کردو کۆشش هەیە وەکو ئەوەی هەمو رۆژێ ماوەیێ بەپێ بڕۆی، یا گەشت بکەی، یا بەرەو شوێنی دڵگیر بچی.

• زۆر جاران مێشولە بەڵا ریشی شێر دەبێ‌و، دەیەوێ هەراسانی بکا ئەویش هیچ بایەخی پێ ناداو روی بۆ لا ناکاتەوە، چونکە سەبارەت بە مەبەستێکی گەورەتر سەرقاڵە.

• لەمەردمی بەدبین خۆت بپارێزە، چونکە تۆ گوڵی پێشان دەدەی ئەو دڕکەکەت پێشان دەدا، تۆ ئاوی بۆ دێنێ ئەو شتی پیست بۆ لەناو دەردێنێ، تۆ بە روناکی خۆردا هەڵدەڵێی ئەو بێزاری لە گەرمایەکەی دەردەبڕێ.

• ئاخۆ بە راستی بەختەوەریت گەرەکە؟! دور بەدوای دامەڕۆ، هەر لە خودی خۆتدا وەدی دەکرێ، لە داهێنانی بیرو هزرت، لە بۆچونی جوانت‌و، ویستی گەشبینت، لەو دڵەتدا کە بە چاکە رۆشن بوە، وەدی دەکرێ.

- بەختەوەری گوڵاوو بۆنی خۆشە تۆ ناتوانی بە دەوری خۆتدا بیپرشێنی، ئەگەر لەپێشدا چەند دڵۆپێك بەسەرەخۆتدا هەڵنەڕژێنی.
- دەردی ئێمە لەوەدایە ڕۆژانە پتر لە سەت کەڕەت لە غەیری خوا دەترسین: دەترسین بەدوا کەوین دەترسین هەڵە بکەین، دەترسین پەلە بکەین، دەترسین فلان تورە بێ، دەترسین فیسار قەڵسی.
- خەڵکانێکی زۆر لایان وایە هەرچی خۆشی یە لە بەین دەچێ، بەڵام هەرچی خەمو پەژارەیە جێگیر دەبێ، ئەوان باوەڕ بە مەرگی شادی دەکەن، کەچی لە مەرگی پەرێشانی سەرپێچی دەکەن.
- کەسانێك لە ئێمە وەکو ماسی کوێر وایە لەناو دەریادا دەخولێتەوە لای وایە لە جامێك ئاو دایە، ئێمە لە جیهانی باوەڕدا لەدایك بوین کەچی باوەشمان لە کێوی مەینەتیو کلۆڵیو دژایەتیو ترس داوە.
- ژیان خۆشە، بەڵام ئەو خەڵاتو دیاری یە پێویستی بە یەکێ هەیە شیاوی بێ، ئەوانەش کە ژیان بۆیان پێدەکەنێو ئەوان دەگرێن، ژیان بۆیان دەگرژێتەوەو ئەوانیش ددانیان جیڕ دەکەنەوە شایستەی ژیان نین.
- ڕاوچییەك کۆترێك دەخاتە ناو قەفەس ئەویش دەست دەکا بە ئاواز خوێندن ڕاوچی گوتی: ئێستاکەی وەختی خوێندنە؟! ئەویش گوتی: هەر سات لەدوای سات ڕزگاری بەڕێوەیە.
- بە کەسێکی دانایان گوت: بۆ ناچیە لای پاشا بە تورەگە ئالتون دەبەخشی؟ گوتی: ترسم لەوە هەیە ئەگەر تورە بو سەرم بپەڕێنێو، لەناو یەکێ لەو تورەگانەدا بە دیاری بۆ هاوسەرکەم بنێرێ!!.
- باشە بۆچی گوێت بۆ حەپەی سەگان دەگری بۆ ئاوازی بولبول گوێ هەڵناخەی؟! بۆچی تاریکی شەو دەبینیو، سەیری جوانی مانگو ئەستێرەکان ناکەی؟! بۆ لە تاوی ژانی پێوەدانی هەنگ هاوار دەکەی، کەچی شیرنایی هەنگوین لەیاد دەکەی؟!.

- باوکە ئادەم لە سەرپێچی تۆبەی کرد ئەوسا پەروەردیاری ڕێنمایی کردو هەڵیبژاردو بەرزی کرد، پێغەمبەرو شەهیدو پیاوچاكو زانا گەلێکی لە پشتی ئەو خوڵقاند، وای لێهات لە سەردەمی پێش تاوان پایە بەرزتر بو.
- نوح پێغەمبەر (سڵاوی خوای لەسەر - بە ناڵەو هاوارەوە چریکەی هەڵبڕی: خوای بەخشندە هاوارە، خوای دلۆڤان هاوارە، بە قەد چاوتروکانێ کۆمەگی خوا گەیشتە جێ، وەکو بورکان لافاو هەڵسا، سەرکەوتو بەسەر دوژمندا زاڵ بو، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بون سەرشۆڕو نغرۆ بون.
- یونس پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر - لە ناخی دەریاوە لەناو سێ تاریکایی دابو، ڕاستەوخۆ بە پەلە پەیامێکی بەرزکردەوە، دان پێداهێنان بە تاوانو داوای لێبوردنی تێدا بو، چونکە پەیامێکی ڕاستگۆیانە بو هەروەکو خێرایی تیشکی خۆر کۆمەکی گەیشتە جێ.
- داود پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر - بە سای فرمێسکی هەڵەکانی سڕیەوە، پۆشاکی تۆبەکردنی سپی کردەوە، چونکە کوتاڵەکەی لەناو مینبەردا چنرا بو، بەرگدروەکەش کەسێکی دەس پاك بو، پاککردنەوەی ئەو پۆشاکەش لە پێش بەرەبەیان دابو.
- کاتێ کارو وەرامت لەسەر گران بو، پەژارە تەنگی پێ هەڵچنی، بێ ئومێدی ڕوی تێکردی، چاوەڕێی ڕزگاری بە.
- ئەگەر دەتەوێ خوا کلۆڵیت لەکۆڵکاتەوە کەم تا زۆرێك ئومێدت لە هەمو دروستکراوێ ببڕە، هیوات بە هیچ کەس نەبێو، بە غەیری خوا دڵت وابەستە نەبێ.
- دەرونت وەکو ئەو شلەمەنی یە وایە کە پەرداخەکەی بە ڕەنگی خۆی دەڕەنگێنێ، جا ئەگەر دەرونت ئاسودەو قایل بو جوانیو خۆشبەختیو شادمانی هەست پێدەکەی، ئەگەریش ڕەشبینو تەنگو تروسك بو بەدبەختیو خراپەو ناشیرینی وەدی دەکەی.
- ئەگەر گوێڕایەڵی خوا بوی، بە بژێویت قایل بوی، لەمەڕ لەدەستچوەکە دڵنەوا بوی، ئەوا بە هەرچی خواستی چاکەیە گەیشتیو، بەسەر مەبەستت ڕاگەیشتی.

- هەر کێ باخی یادو باوەڕی لە سینەدا بێو، گوڵشەنی زانستو ئەزمونی لەلا بێ، جێی خۆی نیە سەبارەت بە لەدەستچونی دنیا هەراسان بێ.
- هەر کەسێ شادمانی بۆ ئەوە دوا دەخا هەتا کوڕە بزربوەکەی دێتەوە، یا خانوییێك پێکدێنێ، یاخود لەسەر کارێکی شیاودا دەمەزرێ، ئەو کەسە تەنیا بە تراویلکە سەری شێواوەو بە زیندە خەونان هەڵخەڵەتاوە.
- بەختەوەری لەوە دایە: زۆر لێکدانەوەت نەبێ، بە پڕوپاگەندەی ترسناك باوەڕ نەکەیو، پشت لە پێشبینییەکان هەڵکەی.
- خەندە لێوی: جادوێکی حەلاڵەو، سەرەتای خۆشەویستی یەو، ڕاگەیاندنی برایەتی یە، پەیامێکی ڕاستەوخۆیە ئاشتیو تەبایی وەخۆ هەلگرتوە، خێرو چاکەییێکی قەبوڵ کراوە، مانای ئەوە دەگەیەنێ خاوەنەکەی کەسێکی قایلو دلارامو خۆڕاگرە.
- داوات لێ دەکەم لە شپرزەییو شلۆقیو بێسەروبەری بەدوربە، هۆکارەکەی بۆ وازهێنانو پشتتێکردن لە ڕێكوپێکی دەگەڕێتەوە، چارەسەریشی ئەوەیە مرۆ بەرنامەیەکی جوانی هەبێ ڕاستێتیو ڕاهێنانی تێدا وەدی بکرێ.
- ئەگەر دوچاری تەنگژەو بەلاییێك هاتی دلخۆشبە بەهەر ڕۆژێك لەو ناخۆشیەدا بەسەری دەبەی، چونکە ئەو بەلایە کورت دەبێتەوەو سوك دەبێ، چونکە ناخۆشی تەمەنێکی هەیە وەکو تەمەنی مرۆڤە زیاتر نیە.
- پێویستە تۆ لەمەڕ خواستی دنیایی سنورێکت هەبێ نەیبەزێنی، بۆ نمونە چاوت لە خانوێك هەبێ لێی دانیشی، ئۆتۆمبیلێك پێت لە عەرزێ بکاتەوە، بەلام بەرهەلدانی هەواو هەوەس بەسەر هەر شتێدا کە حەزدەکا مایەی بەدبەختی یە.
- ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ... ئێمە جسناتی مرۆمان دەگەڵ خەمان وەدی هێنا. (٤) البلد﴾. نەخشە دانانی خوایە بۆ ئەو مرۆڤە گۆڕانکاری بەسەردا نایێ، هەر لە هەولو ڕەنجو ئەشکەنجەدایە، پێویستە دان بەوە دابێنێ جی لەبارە دایەو، لەگەڵ ئەو ژیانەیدا بگوزەرێنێ.

- ئەو کەسەی ڕۆژگاری خۆی لە گاڵتەو گەپو ڕاوکردن بەسەر دەبا وادەزانێ خۆی بەختەوەر دەکا، نازانێ لە دەرەنجام نرخەکەی ئەوەیە هەمیشە دڵ پەستو بەردەوامو غەمگین دەبێ، چونکێ هاوسەنگی نێوانی ئەرکەکانو ڕابواردنی پشتگوێ خستوە.
- هەرچی لە ژیانتدا پێویست نیە لە خۆتی بەدور بگرە، هەتا ئەو کاغەزانەی بە زیادە لە گیرفانت دایە، یا لەناو پەرتوکخانەکەت دایە، لەبەرئەوەی هەر شتێ لە پێویستی بەدەربێ -جا لە هەر بوارێك بێ- زیانبەخشە.
- هاوەڵان بەختەوەرترین کەس بون چونکە هەرچی بەسەر دڵیاندا دەهاتو ختوکەی لە دەروندا دروست دەکردنو کەمبایەخ بو تیایدا قوڵ نەدەبونەوە، بەڵکە ئەوان بایەخیان بە بنەمایەکان دەداو، بە خواستی باڵا سەرقاڵ بون.
- پێویستە لە ئەنجامدانی بەندایەتی بە وردی بایەخ بدەی، لە زانستی بێ تێگەیشتنو، نوێژی بێ ترسو، قورئان خوێندنی بێ تێفکریندا هیچ سودو کەڵك نیە.
- ﴿... وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ ... کێش پاکن بۆ پاکانن. (٢٦) النور﴾.

کردارو گوفتاری پاك، هاوسەری پاكو خونەریتی پاك شیاوی کەسانی هەڵبژاردەو پاکە، بۆ ئەوەی بە سای ئەو بەیەك گەیشتنە بەختەوەری ڕاستەقینەو ئۆقرەگیریو بە ئاکام گەیشتن بێتە ئاراوە.

- ﴿...وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ ...ئەوانەش کە ڕکی خۆیان دەخۆنەوە. (١٣٤) آل عمران﴾.

ڕقیان لەناو سینە دەنێنەوە شوێنەواریان لێ بەدیار ناکەوێو جوێن نادەنو وتەی نەشیاو دەرنابڕنو خەڵك ئازار نادەنو دوژمنایەتی ناکەن، بەڵکە پێ لە نەفسی خۆیان دەنێنو چاو لە تۆڵە ناگێڕن.

- ﴿... وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ... ئەوانەش کە لە مەردم چاوپۆشی دەکەن. (١٣٤) آل عمران﴾.

ئەوانیش ئەو کەسانەن چاوپۆشیو لێبوردەیی دەردەبڕن، ئەوانەی ئازاریان داون ئازادیان دەکەنو داوای تۆڵەکردنەوە ناکەنو بەخشینیان ڕادەگەیەنێن،

نەك هەر ڕقی خۆیان بخۆنەوەو بەس بەڵكە نەرمونیانیو چاوپۆشیان لێ بەدی دەكرێ.

- ﴿... وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ... خوا چاكە كاری خۆش دەوێن. ﴿١٣٤﴾ آل عمران﴾.

ئەمانیش ئەوانەن دەرهەق بەوانەی ستەمیان لێكردون چاو دەپۆشن بەڵكە وێڕای ئەوەش بە سامانو پلەو پایەو جوامێریان چاكەیان لەگەڵدا دەكەن نەیاریان خراپە دەنوێنێ ئەوانیش چاكە دەنوێنن، بۆیەش پلەی چاكەكاری گەورەترین پلەو پایەیە.

- دەقاو دەق ئەو كارە دیاری بكە، كە بەختەوەرت دەكا. ئەو حاڵەتو بوارانەی بەوپەڕی بەختەوەریت دەگەیێنن لیستێكیان لێ تۆمار بكە: ئاخۆ دوای چاوپێكەوتن لەگەڵ كەسێكی تایبەت ئاسودەی؟ یاخود دوای ڕۆیشتنت بۆ شوێنێكی تایبەت؟ یا دوای جێبەجێ كردنی كارێك بە تایبەتی؟ ئەگەر بەشێوەیەكی سادە ئەزمونێكی باشت بەئەنجام گەیاند، لەناو لیستەكەتدا بنوسە. دوای هەفتەیەك هەست پێدەكەی لیستێكت پڕكردۆتەوە لەو بۆچونانەی بەختەوەرت دەكەن.

- لەسەر ئەو كارانەی دڵخۆشكەرن پێ دابگرە: دوای ئەوەی ئەو كارانەی بەختەوەرت دەكەن پێیان ئاشنا بوی، هەرچی كارو فەرمانی ترە لەبیری خۆتدا وەدەرێ یان بنێ.

ئەوسا ئەو شتانەی ئاسودەت دەكەنو ئەوانەش كە لە بەختەوەری بەدورت دەخەن لە یەكتر هەڵاوێریان بكە. بۆ ئەوەی هەوڵدانت لەپێناو بەختەوەریدا لە ئەنجامی ئەزمونێكی دڵخۆشكەر بێ لە خودی خۆیدا.

- تا ئەو ساتەی تۆ لەسەر ڕاستە شەقامی خوای، خۆت پێ قەبوڵو ڕاست بێ: زۆر گرنگە بگەیە ئەو ئاستەی متمانەت بە خۆت هەبێو، لە خۆت قایل بیو، ئەو ڕەخنەش كە بەرەو ڕوت دەبێتەوە بایەخی پێ نەدەی، لەڕاستیدا بەختەوەری لەو دڵەدا نامێنێ كە هەست بە هەڵەو دۆڕان بكاو گومانو دو دڵی تێدا بێ.

- خزمەتی خەڵکان بکەو کردەی چاکە ئەنجام بدە: بە تەنیاییو بە لاچەپی مەژیێ، چونکە تەنیایی چاوگی کەساسی یە، ئەو کاتەش کە تێکەڵ بە خەڵكو خاوو خێزانت دەبی هەرچی خاکەساریو مەینەتباریو کڵۆڵی هەیە نامێنێ، ئەو کاتەش کە خزمەتێك پێشکەش دەکەی. ئەگەر لە ماوەی دو هەفتەشدا خزمەتی خەڵك بکەی وەکو چارەسەرێکی چۆنییەتی مەینەتی دانراوە.
- هەمیشە خۆت سەرقاڵکە: پێویستە - بە زیتەڵیو وریایی - هەوڵدەی پتر تواناکانت بەگەڕ بخەی. ئەگەر خۆت بە ڕەنێوهێنای کاری سەرنجڕاکێش سەرقاڵکەی، زیاتر خۆت بەختەوەر دەکەی، تەمبەڵیش گەشە بە مەینەتی دەدا.
- دژایەتی کەساسیو کڵۆڵی بکە: کاتێ کارو وەرامێك بێزاری کردی، هەڵسە بە ئەنجامدانی کردەوەیەکی لاشەیی کە حەزی پێدەکەی هەست دەکەی باری هۆشو دەرونیت دێتەوە سەرخۆ. دەشتوانی خۆت بە کارێکەوە خەریککەی کە لەپێشدا خۆت پێوە خەریك دەکردو هەستت بە ئاسودەیی دەکرد، وەکو ئەوەی خۆ لەسەر ئەنجامدانی وەرزشێکی تایبەت ڕابێنی، یا لەگەڵ دۆستانت گەشت بکەی.
- بێئومێد مەبە لەسەر ئەوەی کارێکت بە تەواوی پێ ئەنجام نەدراوە: دەبێ بزانی گەورە پیاوان بێ کار نابن. کەسانێ هەن وا دەزانن هەتا هەمو کارێکیان بە ئەنجام نەگەیێنن متمانەیان بەخۆ نیەو بەختەوەر نابن. ئەو کەسەی هەستیش بە بەرپرسیارێتی دەکا دەتوانی بەبێ سستی نواندن ئەندازەییێکی گونجاو لە کارەکانی ئەنجام بدا، لە هەمان کاتیشدا لەبەرئەوەی کەمتەرخەمی نانوێنێ دەتوانێ چێژ لە خۆشی ژیان ببینێ.
- لەمەڕ بەربەرەکانیو ڕوبەڕوبونەوەدا زیادە ڕۆیی مەکە: دڵنیابە هەر دڵڕەقیت بۆ دەمێنێ، بە تایبەتیش ئەو کاتەی لەسەر کردارێك پێشبڕکێ لەگەڵ یەکێ ئەنجام دەدەی بێ ئەوەی هەلو مەرجێکت بۆ خۆت ڕەخساندبێ تێیدا وەحەسێیو وچان بدەی.
- هەستو نەستت کۆتبەند مەکە: کپکردنی هەست دەبێتە هۆکاری ئاڵۆزی، دەبێتە بەربەستی هەستکردنیش بە بەختەوەری. هەستو نەستت سەرکوت مەکە. بەڵکە بە شێوازێکی گونجاو ئەو هەستە دەربڕە کە بە وزەی دەرون لە ناخەوە هەڵبقوڵێ.

- باری هیچ کەس مەخە ئەستۆی خۆت: زۆر جاران خەڵك بە سای کوێرەوەری کەسێکی تر هەست بە بارگرانیو، هەناسە ساردیو، تاوانباری دەکەن، ئەگەر چی بۆ خۆیان لەو کەساسی یە بە دورن. بێنەوە یادت کە هەمومرۆڤێ لەمەڕ خۆی بەرپرسیارە، سۆز نواندنو هاریکاریش مافدارێتیو سنوری هەیە. ئەوەش بزانە کە مرۆ بە ویژدانی خۆی دەزانێ، ﴿... وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ... هیچ کەس باری گرانی هیچ کەسێکی تر ناگرێتە کۆڵ. (١٦٤) الأنعام﴾.
- بێ چەندو چون بڕیاری خۆت بدە: ئەو کەسەی بۆ ماوەیەکی دورو درێژ بڕیارەکانی خۆی دوا دەخا، ئەوا چەند کاتو ساتێكو چەند ڕۆژێكو چەند مانگێك لە ماوەی بەختەوەری خۆی دوا دەخا. ئەوەشت لەبیرنەچێ شتێکی بەڵگەنەویستە کە دەرکردنی بڕیار لە ئێستاوە ئەوە ناگەیەنێ کە لێی پاشگەز نەبیتەوە، یاخود تاووتوێی نەکەی.
- ڕێزی خۆت بزانە: لەو کاتەی دەتەوێ بەرەو کارێك هەنگاو بنێی ئەو پەندە وەیادخەوەو پەندی لێ وەرگرە، کە دەڵێ: ((ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ ڕێزی خۆی دەزانێ)) بۆ نمونە ئەگەر تەمەنت گەیشتە پەنجاساڵی ویستت وەرزشێك ئەنجامدەی، بیر لە ڕۆیشتن، یاخود یاری تێنس، یا مەلەوانی بکەوە، بیر لە یاری تۆپی پێ مەکەوە، بەردەوامیش هەوڵدە گەشە بە لێهاتویت بدەی.
- بزانە چۆن خۆت دەناسی: بەڵام خۆ هەڵکوتان بۆ هەڵلوشینی[٩٢٤] ژیان بێئەوەی بوار بۆ خۆت بڕەخسێنی لە پێناوی ئەوەی ئەرکی سەرشانو کارو وەرامت لە ژیاندا ڕاستکەیتەوە، ئەوەیان ئەوپەڕی گەوجیو نەفامی یە. ئا ئەوانە کەسانێکن نە بە توانای خۆیان دەزانن، نە خۆیان دەناسن.
- لە ژیانی کردەیی خۆتدا بە ویژدان بە: ئەگەر توانیت بەشێك لە کاتت کار بکە، (ئیغریقی)یەکان باوەڕیان وایە کە مرۆ ناتوانێ مرۆڤایەتی خۆی بپارێزێ، ئەگەر کاتی بەتاڵو بێئیشی بدۆڕێنێ.

---

٩٢٤) فوتاندن، بەهەڵپەخواردن.

- بۆ ڕوبەڕوبونەوەی مەترسییەکان ئامادەبە: تاکە ڕێگا بۆ خۆشگوزەرانی پەلاماردانی ئەو شتە ترسناکیانەی ژیانە کە چاوەڕێ دەکرێن، فێر نابی هەتا ئەو کاتەی بە وەرەیێکی بەرزەوە ڕوبەڕوی ترسناکیەکان نەبیەوە، بۆ نمونە هەوڵدە خۆت فێری مەلەوانی بکەی بۆ ئەوەی ڕوبەڕوی مەترسی خنکان ببیەوە.
- هیچ گرێ کوێرەویێ نیە مەگەر ڕۆژێ دێ بکرێتەوە، هیچ کۆتو زنجیرێ نیە مەگەر ڕۆژێ دێ بپچڕێ، هیچ دورێك نیە مەگەر ڕۆژێ دی نزیك بێتەوە، هیچ ونبوێك نیە مەگەر ڕۆژێ دێ بگەڕێتەوە..بەلام ئارامگرتنی دەوێ.
- ﴿... ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ ... پەنا بەرنە بەر نوێژان‌و خۆڕاگر بن. ﴿١٥٣﴾ البقرة﴾.

ئارامگری‌و نوێژ تۆشەی ڕێگاو سوتەمەنی ژیانن، کلیلی ڕزگاری‌و دەروازەی ئومێدن، هەر کەسێکیش لەسەر نوێژ بەردەوام بێ‌و هەمیشە ئارامگر بێ، مژدەی پێبدە بە سەرکەوتنێکی نزیك‌و ڕزگاربونێکی ئاشکراو بەیانیدانێکی ڕاستەقینە.

- بیلال فەلاقەکراو دارکاری کراو ئازار دراو ڕاکێشراو فڕێ درا کەچی ویردی سەر زمانی: یەك خوا یەك خوا بو، چونکە ئەو وانەیە فێرکرابو: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ... بێژە ئەو خودایە تاکە. ﴿١﴾ الإخلاص﴾.

کاتێ چوە ناو بەهەشت ئەو ڕەنجەی کێشای بە کەمی نرخاند، ئەوەی کە پێشکەشی کرد پێی هەرزان بو، چونکە ئەو کالایەی لەپای ئەو ڕەنجەدا بە چەندان پلە لە نرخەکەی گرانتر بو.

- دنیا چیە؟ مەگەر بریتی نیە لە پۆشاکێك ئەگەر گرانبەها بو تۆ خزمەتی دەکەی‌و ئەو خزمەتت ناکا؟ یا بریتی نیە لە هاوسەرێك کە ئەگەر جوان بێت خۆشەویستییەکەی دڵت ئازار دەدا؟ یا بریتی نیە لە سامانێك کە ئەگەر زۆر بو دەبیە پاسەوانی؟.. ئا ئەمەیە خۆشی یەکەی دەبێ نارەحەتی‌یەکەی چۆن بێ؟
- هەمو هۆشمەندان بە سای زانست‌و ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایە هەوڵی دەستەبەرکردنی بەختەوەری دەدەن، بەلام ئەوەی لە هەمویان پتر کەڵك لە بەختەوەری وەردەگرێ ئەو کەسەیە خاوەن باوەڕە، چونکە بەختەوەری ئەو لە هەمو حاڵەتێکدا بەردەوامە هەتا بە پەروەردیاری دەگاتەوە.

- بەختەوەری لەوەدایە دەرون لەو نەخۆشیانە پارێزراوبێ کە گرێ لە دڵ دەدەن وەکو: گومانو دو دڵیو ڕاڕاییو هەواو ئارەزو گلەییو گازاندەو نارەزایی.
- ژیریارترین کەس ئەوەیانە لە هەمویان زۆرتر پاساو بۆ خەڵکی دێنێتەوە، کردارو گوفتاریان بە جوانترین شێوە لێك دەداتەوە، هەر ئەویشە خۆیو خەڵك دەحەسێنێتەوە.
- لەمەڕ ئەوەی پێت دراوە چاوتێر بە، بە بەشی خۆت قایل بە، ئەو بەهرەو خەڵاتەی پێت دراوە ڕەنێوی بێنە، وزەو توانات لە شتی بەسودمەند بەکاربێنە، لەسەر ئەو نازو گۆزەش کە پێت ڕەوا بینراوە ستایشی خوای لەسەر بنوێنە، ﴿... فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ... چەم پێدای، وەری بگرەو لە شوکرانە بژێران بە. ﴿١٤٤﴾ الأعراف﴾.
- ڕۆژێ سەرتاسەر تەنیا بە قورئان خوێندن، یا تێفکرین، یا دەرخکردن، یا کتێب نوسین بەسەر مەبە، بەڵکە چەندین شێوە کردار ڕەچاو بکەو، کرداری هەمە جۆری تێدا ئەنجام بدە، بەم چەشنە دەرونت کاراتر دەبێ.
- نوێژکردن کارەکان ڕێك دەخات ئەوسا لە دوای هەمو نوێژێ کارێکی سودمەند ئەنجام بدە.
- ئەوەی پەروەردیار بۆ بەندەی خۆی هەڵدەبژێرێ خێرو چاکەی لەوەدایە، چونکە هەر ئەو لەمەڕ بەرژەوەندی بەندە لە بەندە شارەزاترە، هەر ئەو بە بەزەیی ترە سەبارەت بە بەندە لەو دایکەی لێی پەیدا بوە، بەندە هەر ئەوەندەی لەدەست دێ بە فەرمانی پەروەردیاری قایل بێ، کارو فەرمانی بەوی بسپێرێو، کۆمەگی پەروەردیار دروستکارو سەرپەرشتیاری خۆی بەس بێ.
- لەبەرئەوەی بەندە بێهێزو بێ دەسەڵاتە نازانێ لەودیوی جیهانی نادیار چی هەیە، ئەو تەنیا ڕوکاری کاران دەبینێ. بەڵام ناوەرۆکی کارەکان هەر پەروەردیار پێی ئاگادارە، چەندین ناخۆشی بون بە خۆشی، چەندین بەڵا بون بە خەڵات. خێرو خۆشی لەناو ناخۆشیدا شاراوەیە.

- باوکە ئادەم لە دارەکەی خواردو سەرپێچی پەروەردیاری کرد ئەویش بۆ سەر زەوی دابەزاند، ئەگەر تەنیا ڕوکاری ئەو مەسەلەیە سەرنج بدەی دەبینی ئادەم خۆشیو نازو گۆزی بەهەشتی بەجێهێشتو خۆی دوچاری کێشەو بێشەی دنیا کرد، بەڵام سەرەنجامی ئەو کارە پاشەڕۆژێکی گەورەو خێرو خۆشییەکی بێ وێنە بو، بێگومان خودا تۆبەی قەبوڵ کردو ڕێنوینی کردو هەڵیبـژاردو، کردی بە پێغەمبەر، لە پشتی ئەو چەندین پێغەمبەرو زاناو شەهیدو پیاوچاكو خواپەرستو خێرخوازو تێکۆشەری خولقاند، پاكو بێگەردی بۆ خوا ئەو دو ئایەتە چەندە لێك جیاوازن: ﴿... ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا ... (گوتمان: ئادەم!) خۆتو ژنت، لە بەهەشت بنو، هەرچی لە هەر شوێنی دەیخۆن نۆشی گیانو. ﴿٣٥﴾ البقرة﴾، ﴿ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ... پاشان پەروەردیاری، ئەوی هەڵبژاردو پەژیوانی قبوڵ کردو ڕێی نیشاندا. ﴿١٢٢﴾ طه﴾.

بارو گوزەرانی یەکەمجاری دامەزرانو خواردنو خواردنەوە بو، زۆربەی خەڵکانیش ئەوانەی هیچ خەمیان لەبەر نییەو پاشەڕۆژیان گەرەك نیە حاڵو گوزەرانیان بەو شێوەیە، بەڵام بارو گوزەرانی ئادەم دوای ئەوەی خوا هەڵیبژاردو ڕێنمایی کردو کردی بە پێغەمبەر حاڵەتێکی زۆر گرنگەو، پلەو پایەیێکی بەرزو بەرێزو پیرۆزە.

- بزانە داود پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر - دوچاری هەڵەیێك هات پەشیمانی دەربڕیو گریانی هات، خوای گەورە گەورەترین بەهرەی لەگەڵ دانواند، وەکو بەندەیێکی گوێڕایەڵی ملکەچی لە خوا ترسی خۆ بە کەمزان خوای پەروەردیاری خۆی ناسی، کە هەر ئەوەش مەبەستە لە بەندایەتیکردندا، بێگومان یەکێ لە پایەکانی خواپەرستی ئەوەیە تەواو بۆ خوای بەرزو توانا ملکەچ بی.

پرسیاریشیان لە ئیبن تەیمیەی شێخی ئیسلام کرد دەربارەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا - درودو سڵاوی خوای لەسەر - کە دەفەرموێ: (( **عجبا للمؤمن لا يقضي الله له شيئا الا كان خيراً له**... حاڵی بڕوادار سەرسوڕمێنە، خوا هەر بڕیارێ بدا لەمەڕ ئەو بە بەرژەوەندی تەواو دەبێ. گوتیان: ئاخۆ ئەو فەرمودەیە ئەو بڕیارەش دەگرێتەوە کە بەندە دوچاری گوناه دەبێ؟ گوتی: بەڵێ، بەو

مەرجەی ئەو تاوانە پەشیمان بونـەوەو تۆبـەکردنو داوای لێخۆشـبونو ملکەچـی بەدواوە بێ.

ئەوەی ڕونو لەبەرچاوە ئەوەیە توشهاتنی بەندە بە گوناه نـاخۆشو نالـەبارە، بـەلاَم ئەگـەر ئـەو مەرجانـەی ڕابـردوی تێـدا بـێ ناوەڕۆکەکـەی بەرژەوەنـدیو چاکەیە.

- ئـەو بـەهرەی خـوا لەگـەلْ (موحەممـەد)ی پێغەمبـەری خـوادا نوانـدی -درودو سلاَوی خوای لەسەر- ڕۆنو لەبەرچاوە، چونکە هەرچی ئەشکەنجەو ئـازارێ هاتـە ڕێی بو بە مایـەی خۆشـیو شـادی، کاتـێ گەلەکـەی بـە درۆیـان زانـی، دژایـەتییان کردو سەرپێچییان کـرد، بـە سـای ئـەوە جیهـادو تێکۆشـــان بـەرپا بـو، هـەوڵ درا دیـــنی خـــوای ســـەرکەوێو قوربـــانی لـــە پێنـــاودا درا، ئـــەو جەنگانـــەی خـــودا پێغەمبەرەکەی تێدا سەرخست، چەند خاكو ولاَت ئـازاد کـرا، چـەندین بـاوەڕدار بە پلەی بەرزی شەهیدی گەشتنو بەهەشتی پانو بـەرین بـۆ بـە شـوێنیان، گـەر بهاتایـەو بـێ بـاوەڕان ئـاوا بەرهەڵـستییان نەکردایـە ئـەو خێـرو بێـرە زۆرەو سەرکەوتنە بێ وێنەیـە نەدەهاتـە ئـاراوە، کاتـێ پێغەمبـەری خـوا -درودو سـلاَوی خـوای لەســەر- لـە مەککـەوە شـاروەدەر کـرا ئەگـەر ڕوی دەرەکـی سـەرنج بـدرێ کارێکی ناخۆش بو، بەلاَم ناوەڕۆکەکەی پڕی سـەرفرازیو بـەهرەو چاکە بـو، بـە سای ئەو کۆچکردنە دەوڵەتی ئیسلامی پێکهێناو چەندین یاریدەدەری پەیـدا بـو، باوەڕدارو بێباوەڕانیش لەیەك جیابونەوە، ئەو کەسەی لەگەل باوەڕەکەی ڕاسـتی کردو تێکۆشاو جیهادی کرد لەگەڵ درۆزنان لێك هەلاَوێر کـران. ئـەو کاتـەش کـە پێغەمبـەری خـوا -درودو سـلاَوی خـوای لەسـەر- بـەخۆیو هـاوەلاَنی لـە جـەنگی (ئوحود) تێشکان ئەگەر ڕوی دەرەوەی وەخوێنین زەرەرو زیانی تێدا بـو نـاخۆش بو، بەلاَم قازانجو بەرژەوەندی وای لـێ بەدەرکەوت کە باس ناکرێ، وەکو ئـەوەی: هەندێ لە موسڵمانان خۆپەسندییان لەدڵدا دروست بو بەهۆی ئەو سەرکەوتنەی لە جەنگی بەدر بەدەستیان هێنا بو جا ئـەو خۆپەسـندیەیان لەدڵدا نـەما، پـشت بەخۆ بەستنو تەنیا بڕواو متمانە بەخۆبونیان نەما، خوا چـەندان شـەهیدی لـە ناو موسڵماناندا هەڵبژاردو بە پلەی شەهیدی گەیاندن، وەکو حـەمزەی سـەرداری شەهیدانو، موسعەبی پەیامنێری ئیسلامو، عەبدوڵلاَی کوڕی عـەمر بـاوکی ئـەو

جابرەی کە خودا قسەی لەگەڵدا کردو جگە لەمانەش، دووڕوەکانیش لەم جەنگەدا بەدیار کەوتن‌و، نهێنییان بە دەر ڕاوەر کراو، ئابرویان چو، ڕیسوا کران... زۆر حاڵەت‌و بواری تری ئەو پێغەمبەرە بەراورد کە - درودو سڵاوی خوای لەسەر - کە ڕوکاریان ناڕەحەتی بوەو، ناوەڕۆکیشیان خێرو خۆشی بۆ موسڵمانان تێدا بوە.

- هەر کەسێ بزانێ خودا خراپەی بۆ بەندەی خۆی ناوێ بەڵاو مەینەتی لەسەر سوك‌و ئاسان دەبن، پێشبینی میهری خوا دەکاو، ئەوەی بەسەری هاتوە بە مزگێنی دەزانێ، متمانەی بە سۆزو بەخشندەیی‌و چاکەویستی خوا پتەو دەبێ، لەو ساتەدا پەرێشانی‌و هەراسانی‌و سینە تەنگی نامێنێ‌و، کارو وەرامی بە پەروەردیاری باڵا دەسپێرێ، ئەوسا ڕوی گرژ نابێ‌و گازاندەی نابێ‌و نارەزا نابێ، بەڵکە هەتا ئەو کاتەی پاشەڕۆژی بۆ ڕوناك دەبێتەوەو، تەم‌و مژی کڵۆڵی دەرەوێتەوە، ئارام دەگرێ‌و سوپاسی خوا دەنوێنێ.
- پێغەمبەر نوح - سڵاوی خوای لەسەر - لە ڕێگای بانگەوازیدا نۆ سەدو پەنجا ساڵ ئازار درا، کەچی بە هومێدی پاشەڕۆژی لە پێناوی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی بۆ ڕێبازی یەکتاپەرستی بە شەوو ڕۆژ بە نهێنی‌و ئاشکرا کۆڵی نەدا، هەتاوەکو پەروەردیاری سەریخست‌و دوژمنیشی بە لافاوێ لەناو برد.
- ئیبراهیم پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر - خرایە نێو ئاگر، خودا ئاگری بەسەردا کردە ساردێکی بێ زیان‌و، لە دەستی نەمرودو گەلەکەی پاراستی‌و ڕزگاری کردو، خوا بەسەریدا زاڵ کردن، بۆ تا هەتایەش دینەکەی لە زەمیندا جێگیر کرد.
- موسا پێغەمبەر - سڵاوی خوای لەسەر - فیرعەون هەوڵی لەناو بردنیدا چەندین پیلانی بۆ گێڕدرا، جۆرەها نەخشەی ئازارو دەردەسەری بۆ کێشرا، کەچی خوا بەسەر فیرعەونیدا زاڵ کردو دار عەساکەی پێ بەخشی کە جادوەکانی هەڵلوشی، بە سای دەرئاسایێك (موعجیزەیێك) دەریای بۆ لەت بو پێیدا قوتار بو، بە یارمەتی خودا دوژمنەکەشی سەرشۆڕو نغرۆ بو.

- پێغەمبەر عیسا -سڵاوی خوای لەسەر- بەنی ئیسرائیلی‌یەکان دژایەتییان کردو، سەبارەت بە دایکی پاکی‌و ئابروو شکۆو پەیامەکەی ئازار دراو، ویستیان بیکوژن، خوا بەرەو لای خۆی بەرزی کردەوەو بە کۆمەکی خۆی سەریخستو، دوژمنانیشی بە سەرشۆڕی گەڕانەوە.
- پێغەمبەری ئێمە (موحەممەد) -درودو سڵاوی خوای لەسەر- جولەکەو فەلەو موشریکەکان ئازاریاندا، جۆرەها ئەشکەنجەی بینی، بە درۆزنیان لەقەڵەمداو بەرەنگاری بونەوە، جوێنی پێ دراو وتەی نەشیاوی بەرامبەر گوترا، بەرپەچیان دایەوەو، گاڵتەیان پێ کردو بە سوك سەیر کرا، بە شێتو شاعیرو جادوگەرو سیحر بازو قسە هەڵبەست تۆمەتبار کرا، وەدەرنراو دژایەتیکراو هاوەڵانی کوژراو شوێنکەوتوانی بە پەند برا، لەمەڕ ئابروی خێزانی تۆمەتبار کرا، چەندین شێوەی مەینەتی پێ چێژرا، بە پەلاماردان ترسێنرا، چەندین قۆناغی تاڵو سوێری تێپەڕدا، هەژار بو برسی‌و بێ نان بو، سەرو ڕوخساری دەخوێن هاتو زامدار بو، ئەبو تالیبی مامی لەدەستدا کە پاڵپشتی بو، خەدیجەی هاوسەری بەجێی هێشت کە دڵنەوای بو، لەگەڵ هاوەڵانیدا لە شیوێکدا گەمارۆ درا هەتا وای لێهات گەڵای داریان دەخوارد، لە ژیانی خۆیدا مەرگی کچەکانی بینی، لەبەر دەستیدا ئیبراهیمی ڕۆڵەی گیانیدا، لە جەنگی (ئوحود) تێشکا، لاشەی حەمزەی مامی تیکەتیکە کرا، چەند جار هەوڵی تیرۆر کردنی درا، لەبرسان بەردی لەسەر سگی پێچا، جاری وابو قەسپی خراپو نانی جۆ نەبو بیخوا، خەمو خەفەتی چەژتو کاسەی ئەشکەنجەی نۆش کرد، لەگەڵ هاوەڵانیدا زۆر بە توندی ترس‌و لەرز دایگرت، خەریك بو دڵیان ژێر هەڵبێ، چەند جار لەدژی بەرژەوەندی ئەو بارودۆخەکە دەرەخسا، بە فڕو فیشاڵی لوت بڵندان‌و لاساری ستەمکاران‌و بێ شەرمی‌و گەزارەیی ئەعرابەکان تاقی کرایەوە، بە خۆپەسندی دەوڵەمەندان‌و، ڕق‌و کینەی جولەکان‌و، داوو تەڵەی دووڕوان، خراپ‌و وەڵامدانەوەی خەڵکان، دڵی ئێشا، پاشان سەرەنجامیش هەر بۆ ئەو بو، سەرکەوتن هاوپەیمانی بو، بردنەوە هاوشانی بو، ئەوسا خوا دینەکەی زاڵ کردو، بەندەی خۆی سەرخستو، هەر خۆی ڕیزی کۆمەڵانی کوفری پەرتو پێوار کرد،

نەیارانی سەرشـۆڕو ڕیـسـوا کـردو دەمکـوت کـرد، ﴿ ... وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ...

خوا لەسەر کاری خۆی زاڵە، بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە لـێ نەزانن.(٢١) یوسف ﴾.

- بڕوانە ئەبوبەکر بەرگەی ئەشکەنجەو ئازاری گرت، لە پێناوی دینەکەیدا گرانـی بە سوك هەڵگرت، مـاڵو سامانو پلـەو پایـەی بەخـشیو، ئـەوەی گرانـەو ئـەوەی هەرزانە لە ڕێی خوادا خەرجی کرد، هەتا نازناوی ڕاستگۆی دەستەبەر کرد.
- عومەری کوڕی خەتاب دوای ئەوەی ژیانێکی پڕ جیهادو تێکۆشـانو قوربانیـدانو دەست تەنگیو دنیا بەکەمگریو دادوەری کردن لەنێوان خەڵکدا تۆمار کـرد، لـە ناو میحرابدا لاشـەیان خەڵتانی خوێن کرد.
- عوسمانی کوڕی عەففان لە کاتی خوێندنی قورئان سەر بـڕدرا، لـە پێنـاوی پـەیامو بیروباوەڕیدا گیانی کردە قوربانی.
- عەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب دوای ئـەوەی چـەند هەڵوێـستی مەردانـەو شـکۆو ڕێـزو بـەهای نوانـدو قوربانیـداو نمونـەی بـەرگریو فیـداکاریو ڕاسـتگۆیی بـو لـەناو مزگەوتا تیـرۆر کرا.
- حوسێنی کوڕی عەلی بـە شمـشێری سـتەمو تـاوان کـوژراو، خـوا بـە پلـەی بـەرزی شەهیدی گەیاند.
- سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر زانـای لـە خـوا تـرس بـە دەسـتی حـەجاج کـوژراو ئـەو تاوانەی کەوتە ئەستۆ.
- (ئیبن زوبەیر) لەسەر دەستی حەجاجی کوڕی یوسـفی سـتەمکار لەناو حەرەمـدا خوا بە پلەی بەرزی شـەهیدی گەیاند.
- پێشەوا ئەحمەدی حەنبەل لەسەر هـەقو ڕاستی دارکاری کراو خرایە بەندیخانە، بە سای ئەوە بو بە ڕێبەری ئەهلی سـوننەو جەماعە.
- (واسـیق) پێـشەوا ئەحمـەدی کـوڕی نەسـری خـوزاعی بانگـەوازکار بـۆ سـوننە، دەکوژێ، هەر سەبارەت بە گوتنـی قسـەی هەق.
- ئیبن تەیمیەی شێخی ئیسـلام بەند کراو لە خاوو خێـزانو دۆسـتانو کتێبـەکانی قەدەغە کرا، خوا ناوودەنگی بڵاوکردەوە بە هەمو جیهاندا.

- پێشەوا ئەبو حەنیفە لەلایەن ئەبو جەعفەری مەنسور دارکاری کـرا.
- ســەعیدی کـوڕی موســـەییەب زانـای خوانـاس، لەلایـەن کاربەدەسـتی مەدینـە فەلاقە کرا.
- مالیکی کوڕی ئەنەس پێشـەوای (دارول هیجرە) لەلایـەن فـەرمانڕەوای مەدینـەوە ئـازار درا.
- پێشـەوا (عبداللە)ی کوڕی عەون زانای فەرمودەناس لەلایەن بیلالـی کـوڕی (ئـەبو بوردە) شـولاقەی لێدراو ئـازار درا.
- ئەگـەر لەسـەری بـڕۆم ئەوانـەت بـۆ ڕیزکـەم کـە بـە لێـدانو کوتـانو کوشـتنو ئازاردانو وەلانانو زیندانی کردن بەربەڵا بـون، درێـژەی دەکێـشێو ئـەو هـەویرە ئاوی زۆر دەوێ، بۆیە بەوەندەی کۆتایی پێ دێنم.

لە بەرواری ٢٠٠٥/١٠/٨ دەستم کرد بە وەرگێڕانی

لە بەرواری ٢٠٠٦/٩/٦ کۆتاییم پێ هێنا

# ناوەڕۆك




ئەم کتێبە

بریتیە لە ئەزموونە زیندووەکان و نموونە گەشەکان و پەند و سەربردە دڵڕفێنەکان و، ئەدەبی بەرز و وتەی بەنرخی پیاوە مەزنەکان لە پێغەمبەران و هاوەڵان و شوێنکەوتوان و زانایان و، دانایان و هۆشمەندان، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، ئەوانەی ڕاستەقینەیان مەبەست بووە. تا دڵنەوایی ئەو کەسانە بێت، کە تووشی کارەسات و نەهامەتی و ڕەشبینی بوون لە ژیانی مرۆڤایەتیدا.

نوسینگەی تەفسیر

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
ت: 2518138
موبایل: 07504605122
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

بەرگ: أمين مخلص